رۆمان

# كاكەڕەش

٧

## پاشای شەو







حازمی عەلی كوتك

چاپی یەكەم

ناوی کتێب: کاکەڕەش

بابەت: ڕۆمان

نووسین: حازم عەلی کوتک

پێداچوونەوە: خالید فاتیحی و هێمن زەندی

دواپێداچوونەوە، پەراوێز و ڕێکخستن: ئارارات ئەحمەد

تایپ: ڕابەر ڕەشید و هەندرێن شێخ ڕاغب

دیزاینی بەرگ: هەڵمەت حازم عەلی کوتک

چاپی یەکەم: ٢٠٢٤

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ٢٠٥٠ی ساڵی ٢٠٢٣ی پێ دراوە

سپاسگوزاری ئەو هاوڕێیانەم:

- نووسەر و لێکۆلەر بوار نوورەدین
- نووسەر و وەرگێڕ ڕابەر ڕەشید
- نووسەر و فۆلکلۆریست ئارارات ئەحمەد
- نووسەر و وەرگێڕ خالید فاتیحی
- نووسەر و شاعیر هێمن زەندی
- نووسەر و شاعیر بەکر ئاڵەیی

که بۆ لەدایکبوون و فرچکدانی ئەو کتێبە، ڕەنجی فەرهادیان لەگەڵ کێشاوم.

# ١

لە تاریکایی شەوانی نمەنمەی بارانباردا، دەستی تۆڵەکردنەوەی دەوەشاند. ئەوەی دەسەلماند کە شەو قەڵای مێردانە. دایکی کە ژانی لە دایکبوونی ئەو کوڕەی هاتبوویێ، شەوێکی ئەنگوستەچاوی بارانـاوی بوو. لە بنەبانی خانوویەکی بنمیچ ڕەشی گڵین، بە دیار چرا ڕەشکەیەکەوە چاوی بە تاریکایی هەڵهێنابوو. ڕەنگە هەر ئەوەش بێ وایکردبێ کە ئەوەندە عاشقی شەوە و، تاریکی بە قەڵایەک دەزانی بۆ ئەستاندنی مافەکانی. بۆیە، ڕەنگی شەوی گرتبوو، هاوڕێکانی نازناوی (پاشای شەو)یان لێنابوو!

خۆر، تازە خەریکە خەفتیانی ئەوە دەکات گەردنی خۆی هەڵدەکێشێو خۆی لەگەڵ داری دێدەوانی[١] جووت دەکات. تیشکە ئاڵتوونییەکەی، وەک کەڵافە ئاوریشمێکی زەردباو، خۆی لە سەری زورگەزراوی دەئاڵاند. پڕشنگی خۆر ئەو دەرودەشتە بەپیت و بەرەکەتەی مەملەکەتی گەنم و هەتاوی زێڕەوشان[٢]

---

١. داری دێدەوانی: تاقەدارێکە دەکەوێتە سەر بڵندایی چیای دێدەوان، لە باشووری خۆرهەڵاتی شاری هەولێر. لە زۆر حەیران و بەستەو سەردولکە ناوی هاتووە.

٢. زێڕەوشان: زێڕاو، زێڕکفت.

دەکرد! نــەورەکان[١] بۆنی ئــاردو بۆنی ژیان دەدەن. لەو کاتەی تیشــکی ڕۆژ بەلاری و لەســەر تەنیشــت لە لاسکی قەرســیل و تۆڵەکەو گیاوگۆری دەوری ئاوایی دەچەقی، ئەو دڵۆپە خوناوانە بەجۆرێک دەدرەوشانەوە، چەندین ڕەنگیان دەنواند. وەک ئەوە وابوو کریستاڵ و دوڕ و یاقووت، لەو ئاقارەی تۆدرابێت[٢].

هەموو گردو گردۆلکە مەخمەرییەکانی ئەو ناوچەیە، هیچیان نەماون دەیان حەیرانی سەرچیایی بەسەردا هەڵنەدرابێ! دەنگی بەلۆرەی کچ و ژنانی ئاوایی لەو ئاقارە، زایەڵەی دێت و لە گوێیاندا دەزرنگێنەوە. بن هەر پنجەخڕنووکێک جێی گەرمەلانی چەندان کەروێشک بووە.

کارێزو ســەراو و دەراو نەماوە کارمامزە چاو ڕەش و شــاخبەتەنیەکانی[٣] ناوبەندانــی[٤] زووری، چێشــتاوی خۆیــان لــێ نەخواردبێتــەوەو گوفکی گیامامزەیان[٥] نەقرتاندبێ. کەندەڵانەکان، کون و هێلانەی ســەدان، ئەتۆ بڕێ هەزاران بارانبڕەو ڕەنگاڵەیان[٦] تێدا خۆشــکراوە. کەسێک لە بیری نییە ژیان لە کەینێوە لێرە دەســتیپێکردووەو کەسیش نازانێ ئەو ژیانە کەیو چۆن لە دار دەکرێتــەوە و دەپێچرێتەوە. چونکە کردنەوەی ئەو نهێنیو تەلیســمە پەرجوو

١. نەور: نزماییەکی کەمە لە پارچەزەوییەکدا کە چواردەورەکەی بڵندترە لە نەوراییەکە.

٢. تۆدرابێت: تۆوکرابێت، چێندرابێت.

٣. شاخبەتەنی: قۆچ یان شاخی کارمامز کە هێندە ڕەشە وەک ئەوەی تەنی بنی سێڵ و مەنجەڵی تێهەڵسوابێت.

٤. ناوبەندان: نێوەڕاستی گردۆڵکەکانی بناری زورگەزراو.

٥. گیامامزە: گیایەکە وەک جاترە وایە، لە دەشتی هەولێرێ شین دەبێ، بە زۆری مامز دەیخوات و حەزی لیبەتی.

٦. بارانبڕە و ڕەنگاڵە: دوو باڵندەی کێوییێن.

ئاسایە لە توانا ئەفسانەییەکانیش بەدەرە. مەگەر هەر خودا بزانێ ئەوُ دەشتە پان و بەرینە چەند شۆڕەسوارو مەردی مەیدان و قۆچاغی بەدەست و قامی لەنێو خۆیدا ونکردووە! یان چەند شێرەژنی خانەدان و چەلەنگ و چەند عاشقی بێمرادی وەک کەریم و ستی و حەسەن و مریەمی[1] لە ئامێز گرتبێت!

پێدەشتێک، هەتا چاو بڕ دەکا پڕاوپڕ لە سەربوردە و بەسەرهاتی فەرامۆشکراو، هەرچەندی لێی ورد دەبیەوە هەموو دۆڵەکانی ناوبەندانی زوورگەزراوی، وەک پاوانێکی دەست نەخوردە، بوونەتە تاقچکەی حیکایەتە نەنووسراوەکان.

لەگەڵ گزنگی ڕۆژێ، ئاسمانی ئەو گوندە قەوغەیە، دوکەڵی ناندین و ئەستوورک برژانو چا سازکردنی ماڵەکان، توێژاڵێک ڕەنگی شینی لەسەر داوێستاوە. باعەی کارو بەرخو بۆڕەی مانگاو گۆلکی لە دایک دابڕاو و حەپەی سەگو ڕاوێچکەو نووسکەی تاژی چوارپەل بە خەنەو حیلەی ئەسپو حرمەی ماینو زەڕەی نێرەکەرو زۆڕەی هێستری ئالیک پێ نەدراو و گمەی کۆتری مەستو میاوەمیاوی پشیلەو قووقەی کەڕەباب و گاڕەگاڕی مریشکی بە هێلکەو قلولوی عەلەشیشو ئاوازی لاوانەوەی کابان لەکاتی دۆشینی مانگا، چ ئاوازێکی خۆزایی دەڕژانده سەر پەردەو تۆڕی هەستەوەریی خەڵکی ئاواییو، جۆماڵی خانەکانی مێشکی دەکردن!

کیژوکاری گوندی، هەر بابایە بەرامپیلەکەی ڕاست و چەپ لە خۆی گرێدەداو پیشەقانەکەی لەسەر شانی داناوە، بەدەم جوینی دوایین پارووی قاوڵتی، خۆی

١. کەریم و ستی+ حەسەن و مریەم: چوار عاشقی بێمرادی دەشتی هەولێرێن. چیرۆک و بەسەرهاتیان، ڕۆماننووس کەریم کاکە، لە دوو ڕۆماندا باسی کردوون و گێڕاونیەتەوە.

دەگەیەنێتە سەر ئەو تولەڕێیەی بەرەو بناری زوری[١] هەڵدەکشێ. خۆی تێکەڵ بە ڕەوەی کارمامزان[٢] دەکات.

بە هۆی ئاونگی سەر قەرسیل و گیاوگۆری قەراغ ڕێ، ناتوانن لە ڕێگاکە لا بدەن بۆ ئەوەی دەلینگو داو و تەشکەڵیان تەڕ نەبێت.

پەڕەسێلکەکان وەک خوشکی زاوابن و سەمای لە پێش بووکێ بکەن، خۆیان دەخەنە سەر تەنیشـــتو، ئەمبەرو ئەوبەری ڕێگاکە دەکەن، هەر یەک تۆزی ماوە باڵیان لە کراسی کیژەکان بسوون، وەک فرۆکەی مەشق خۆیان دەخستە سەر تەنیشـــتو لا باڵێکیان لە زەوی نزیک دەکردەوە. کچ و ژنانی ئاوایی کە دەگەنە بناری زورگی، ڕۆژوبان گەرم دەبێت، ئاونگی سەرگیاو دەغڵ و کوریکە زەردەکان لە شـــەرمی تیشکی خۆر دەچۆڕێنەوە سەر ڕەگی پنجە گیاکانو خۆیان حەشار دەدەن. حریتەحریت و قاقای وروژێنەری کچان لە کاتی قونجینو ڕاکوشـــینی لاڕانو ســـمتی یەکتری، نوقرچان لە کەفەڵی یەکتر دەدەن و خۆیان هەڵدەدەنە ســـەر شـــانو ملی یەکتر، وەک بیانەوێ قەڵڵای ئەو هەموو گەمەو لاقرتیانە بکەنـــەوە لە رابردوو لە کونجی ژوورەکان لە کیســـیان چووە. زرمەو خرینگەی بازنی دەســـتی پەنجە بەخەنان لەو کاتەی کۆرەمستی خۆشەویستی لە شانی یەکتـــر دەدەن، خرمەی بازنەی قۆڵیان و بەرموورەیان، بۆنی خەناوکەی قەنەفری بـــە مۆری و مەرجان و حەتۆتە[٣] گەوار گـــەوار، بۆنێکی مێیینانەی لە دوای

---

١. زوری: کورتکراوەی زورگەزراو.

٢. ڕەوەی کارمامزان: ئاماژەیە بە کچانی گوندی.

٣. حەتۆتە: گیاسۆتکە کە گیایەکی بۆنخۆشە لەنێو خامێک دەدورا و ژنان بۆ بۆنخۆشی بە بەرۆکی خۆیانەوە هەڵدەواسی.

بەجێ دەما. ئەو نێوە پڕ پڕ ببوو لە بۆنی ژن، بۆنی ژیان، بۆنی مێ، تخوبی زەوییەکان وەک هێڵێکی بە تەناف کێشراو، سەوزایی دەغڵودانی جووتیارەکانی دەکرد بە دوو بەش، ئاسمان وەک دەریاییێکی شین شین، پەڵەیەکی پێوەنییە. ئەو ساڵە، بەهارێکی زۆر تەڕ بوو، چونکە هەموو عەسران ڕێژنەبارانێکی لێدەدا، جووتیارەکان دەیانگوت: بۆتە چل عەسرە، واتا چل ڕۆژ لەسەریەک باران باریووە، دەغرودان کێروشکەی دەکرد[1]، قەرسیلەکان بەسەریەکدا کەوتوونو قۆپەنی سەر شارە مێروولەکان بەرزبوونەتەوە. ڕۆژانە خەڵک بەو ئاقارەی وەردەبوون بۆ تۆرکەو کەنگرو کاردیو دۆمبەران و پیفۆکو قێزبەلەو زارگەزەوی و سێوەڕۆکو...

لە ناوبەندانی زورگەزراوی، چەند قەلەڕەشماڵێکی شوانکارەو خاوەن مێگەلەمەڕەکان هۆبە هۆبە ڕەشماڵیان هەڵداوە، کولین و کۆتانیان[2] بۆ کاریلەو بەرخە ساوا جیاکردۆتەوە، کوریکە زەردەو حاجیلەو کەنێر ملیان داوەتە یەک، وەک نەوحاجی[3]، کەشیدەی زەردیان بەستووە. حاجی سمایل لە بەردەرکی ڕەشماڵێ، خەریکی هۆنانەوەی کڵاوی بە کوریکە زەردەیە بۆ نەوەکەی، بۆ ئەوەی کڵاوێکی قوتی بۆ بهۆنێتەوە. سەمەی نادر ڕاوچی، ئەو ڕۆژە چووبوو سەری دەغران بدا، گەورەکوڕ بوو، بوخچەی نەکراوە بوو، چونکە خوشکی نەبوو ژن بە

---

١. دەغرودان کێروشکەی دەکرد: دەغڵ و دان کەروێشکەی دەکرد. شەپۆلی جوڵانەوەی دەغڵ و دان بەهۆی با یان بای شەماڵەوە.

٢. کولین و کۆتان: شوێنێکی بەلاوەی بە چیغ جیاکراوەیە لەنێو ڕەشماڵ، بەمەبەستی گەرمبوون، کا و قەسەڵی تێدەکرا، بۆ کارو بەرخی ساوا بەکاردەهات.

٣. نەوحاجی: حاجیی نوێ کە یەکەمساڵی بێ بووەتە حاجی.

ژنەی پێبکاتو، ماڵی دنیاشـــی نەبوو ژنێ بە ماڵ بێنێ، بەڕەبەنی مابوویەوە. ڕۆژانە دەچووە دیار دەغرودانی خۆیانو تەماشای گەنمی دەکرد، کە دەگەڕایەوە لێیان دەپرسی: ئەوســـار گەنم یەک و چەند دەبڕی؟ جۆ بڕشتی چۆن دەبێت؟ دەیگوت: دەغر ئەوســـاڵ زۆر غوردە[1] گەنمەکەی مە، هەرچەندی تەماشای دەکـــەم، لەناو قۆپەنەکانیدا چارۆگ زەردێکی لەنێو ڕاوەســـتاوە[2]! ئەگەر بێ ئافات بێت و لە سنو کیســـەڵە پارێزراوبێت! خوا پشتیوان بێت ئەو زستانەی دادێت، چیدیکە بەتەنێ نانووم، بووکی ســـاڵێ دەست بە خەنە لەو ماڵەی خۆم بە کابانی دەبینم، لە ئێســـتاوە هەرێتان پێدەدەم کفتەو ترشـــێکتان دەدەمێ و شایی و دەهۆڵ و زوڕناتان بۆ دێنم، دەبێت حەوت شەو و حەوت ڕۆژان هەڵپەڕن!

---

١. غورد: خورد، تێکچڕژاو. لەو دەشتە پانو بەرینەی قەراجو کەندێناوەو شەمامک و سەنیەو مرکیەی لە بەرڕێ و پشتڕێ، چەند جۆرێک گەنم دەچێندرا: ١) ڕەشگوڵ (ڕەشگور): جۆرێک بوو کە برژانگەکانی ڕەش بوون، بۆ ساوارو بروێشو گەنمەکوتاو بەکاردێت. ٢) قەندەهاری: جۆرێک بوو کە بنەتۆوەکەی لە (قەندەهار)ەوە هاتووە. قەندەهار کە (کەندەهار)یشی پێدەڵێن، هەرێمێکی وڵاتی ئەفغانستانە و پایتەختەکەی قەندەهارە. ٣) سابیربەگی: جۆرێکی دیکەی گەنم بوو، لەوانەیە ئەوەی کە بۆ یەکەمجار هێناویەتە کوردستان یان بەرهەمی هێناوە، ناوی سابیربەگ بووبێ. ٤) سیمینتۆ: بۆمان ساغ نەکرایەوە ناوەکەی لە چییەوە هاتووە. ٥) ئەکسادی: ئەو جۆرەی کە لەم ڕۆژگارەدا زۆر باوە و بەرهەم دێت، بەرهەمێکی زۆر بەڵام زۆر بێکەڵکە، بەهای خۆراکیی چارەگێکی گەنمەکانی زەمانی زووی نییە. ٦) گوڵپووت: گورپووت، گەنمێکە، گوڵەکەی بێ برژانگە. ٧) حومێرە: حومێرە، بچووککراوەی (احمر- سوور)ە، بە کوردی دەبێتە سوورکەڵە. جۆرێکی دەنکگەورەی ڕەنگسوورە.

٢. لەناو قۆپەنەکانیدا چارۆگ زەردێکی لەنێو ڕاوەستاوە: بە کینایە بە مانای ئەوەی گەنمەکەم پارەی ژنێکم بۆ دەکات.

حومێره[١]، کوڕە نێوەنجیەکەی حاجی سـمایلی، بۆیـە بە حومێرە بانگ دەکرا، چونکە ڕەنگی وەکو گەنمی حومێرەی جوان بوو. حومێرە جۆتە تاژییەکی چوارپەل بەخەنەی گوێ بە ڕیشـۆری لە ڕسـتێیە[٢]. لۆ ڕاوی کەروێشـک و کارمامـزی دەچێتـە بناری زورگەزراوی. کەیفیشـی بە خەجـە کۆفی قیتێ دەهات، بۆیە زەینـێ خۆی دەدایە کیژۆکاڵی گوندی بـۆ کێهەلای بچووبانایە، ئەویش ئەسـپی زینو لغاو دەکردو دەکەوتە سـەر خانێ زینیو جۆتە تاژی لە ڕسـتێ دەکرد، بەرێ خۆی دەدایە ئەو شوێنەی کیژۆکاڵی سێ گوندان لە ئاقاری دەگەیشتنە یەکتری و تێکەڵ دەبوون.

هەر لەگـەڵ یەکەم گزنگی ڕۆژێ، لـەو کاتەی تازە تیشـکی زێڕینی ڕۆژێ خۆی لە دەلاقـەی ژوورەکان وەرپێچا، حومێرە ئەسـپەکەی لە تەویلەی دەرهێنا، ئەسـپێکی کەوێتی قاپڕەشـی سم کۆتکی گوێ مقەسـی نێوچاوان تەختی نێو قـەد زراوی قـاپ مامزی. لەوکاتەدا حومێرە دوو ناو لەپەدەسـتی لە پشـتی ئەسـپەکەوێتی دا، ئەو شـەپانە ئاماژەبـوو بۆ ئەوەی کە چەنـد تەڕادێکی پێ بکات، ئەسـپی تاییـن چونکە جۆخـۆرەو دەمێکە لە تەویلـەی نەهێندراوەتە دەرەوە، چەنگی دەدا عاسـمانێ و قەستی سەرپشتی هەورانی دەکرد! بەجۆرێک غروری خۆی نیشـان دەدا پیاو لە فرمەو حیلاندنی، هێدمەگرتی و سامی لـێ

١. حومێرە: ئاماژەیە بە کوڕە نێوەنجییەکەی حاجی سمایل، لەبەرئەوەی کە جوانیی ڕەنگو ڕوحساری لە گەنمی حومێرە چووە، بۆیە بەو ناوەوە بانگ دەکرا.

٢. ڕست: چەند داوەبەنێکی ڕەنگاوڕەنگی بەیەکەوە بادراوە، بە ئەندازەی پەنجەی دەست ئەستوور و، نزیکەی پێنج مەتر درێژە، لە ئەڵقەی قەڕیتە (قەڵێتە)ی ملی تاژی هەڵدەکێشرێ، لە کاتی دیاردیکردنی (تەماڵ)ی کەروێشک، ڕستەکە بۆ تاژی شل دەکرێ بۆئەوەی بەدوای نێچیرەکە بکەوێ.

دەنیشت. حومێرە بنزین‌و زینی لەسەر پشتی داناو ناوتەنگەی لێ شەتەک دا، قوشقنی[١] لەبن کلکی داخست، لغاوی خستە زاری‌و پێی لە ڕکێبی ناو کەوتە سەرخانێ زینی، چوارناڵەی پڕ لە غروری ئەسپی کەوێتی سەرکەش، لەگەڵ یەکەم ئاوزینگ لێدان، هەروەک چۆن برووسک هەور شەق دەکات‌و نەهەنگ ئاوی دەریا دەبڕێ، ئاوا هەوای ئەو ئاقارەی شەق دەکردو بەناویدا تێدەپەڕی. تاژییەکان لە خۆشی چوونەئاقاری، جلیتبازی دەکەن. عارد زۆر قوڕ نییە، بەڵام وشکیش نییە، فەریکە. وەک تیر لە کەوانی دەربچێ، ئەسپی جۆخۆر لە گەوەی[٢] سووراپەوە، وەک تارمایی خەریکە لە چاوان ون دەبێت، کلک‌و سەری کردۆتە یەک، بەجۆرێک سەری بەرزکردۆتەوە پشتی سەری‌و بژی بەسینگی حومێرەوە نووساوە. حومێرە خۆی بە بژییەوە گرتبوو، ئەسپی تاین کلکی وەک دووپشک قیت کردۆتەوە، جار جار دەگاتە پشتی حومێرەی، لەگەڵ تەوژمی بای، لفکی جەمەدانی حومێرەی و مووی کلکی ئەسپەکەوێتی، بەیەکەوە لوول دەخۆن و تێکەڵاو دەبن، ئەو سەرو کلک قیت کردنە، نیشانەی ئەسپی ڕەسەن و حدودە. دەنگی چرپەی چواربەل و فرمەی، تێکەڵاو بەیەکتری بووینە، لغاوی زاری پڕ لە کەف بووە، کونە لووتی بوونەتە زووڕنا، بەشی هەناسەو فرمەی ناکات، لەگەڵ هەر بازێکی، چوار تۆپەڵە قوڕی لە سمی دەبوونەوە، دوو تۆپەڵە قوڕ دەکەوتنە

١. قوشقن: پارچەیەکە لە زین. ڕۆڵی پاڵووی کورتان دەبینێ، سەرێکی بە دواوەی زینەکەوە بەندە و سەرەکەی دیکەی ئەڵقەیەکی قایشی پێوەیە کلکی ئەسپەکەی بەنێودا دێننەدەرێ، بۆ ئەوەی لە نشێو (سەربەرەژێر)ان، زینەکە نەخزێتە پێشەوە. درێژییەکەی نزیکەی ٦٠ شەست سم درێژەو، گورج و شۆڕییشی پێدەکرێ.

٢. گەوە: ڕێیەکی پێچاوپێچی ئاسۆیی، بە قەدی گرد یان کێوێکدا.

عەرزیو دوو تۆپەڵە قورِ هێشـــتائـە هەوای بوون، هەموو تۆپەڵە قورەکان مۆری نار و شەشبزماریان[١] پێوەبوو، لە دوای خۆی گڵۆز گڵۆز کەفی سپی پەشمەک ئاســای، لە بەینی هەردوو ران و کەفەڵی دەکەوتنە خوار. کەفی سپی و ئارەقەی نێوگەڵی، گونەرەشەکانی سپی کردبوو، شەلاڵی ئارەقەی بوویوو، رەش هەڵگەرِابوو، ئەسپی کەوێتی تاڵە بەلای جەرگییەکی تۆخدا دەینواند. بەجۆرێک دەیفرِماند و گەرم داهاتبوو پێیەوە دیاربوو فتراقی تەرِادانێی[٢] دانەکەوتبوو. لە دوای خۆی لەسەر رێگاکە ئەو تۆپەڵە قورانەی بە سمە کۆتکییەکانی[٣] هەڵیدابوون و جێ مابوون، وەک یاریزانی باشـــی تاوڵە مۆرەی هەڵدابێت، هەموویان دوو شەشـــیان هێنابوو بە جووتە.

حومێرە لەسەر گردێک لە ئەسپەکەی دابەزیو لغاوی لە زاری ئەسپەکەی دەرهێنا، بۆ ئەوەی ئەسپەکە بلەوەرێ. دەستی لە بناگوێی ناو دوو سێ حەیرانی سەرچیایی هەڵدا:

## کیژێ حەیران چەندم گازکردی[٤] لەناوبەندانێ
## قازی بەستۆرەی، قەتێی پیرەکوێستانێ

١. شەشبزمار: ناڵی وڵاخی بەرزە، بە شەش بزمار دادەکوترێ.

٢. تەرِاد: تەرِادانێ. غاردان بە ئەسپ بۆ شوێنێکی مەودا نزیک و چەرخە لێدان و گەرِانەوە بۆ شوێنی پێشوو. زیاتر مەبەست لە کارەکە خۆنمایشکردنی ئەسپسواری و سوارچاکییە.

٣. سمە کۆتکییەکانی: سمی کۆتکی یان سمکۆتکی، بەو ئەسپە دەگوترێ کە سمەکەی بە ئەندازەی کۆتک (دەفری دارین، بادی) گەورەبێ.

٤. گازکردی: بانگکردی، بانگم کردی.

**ئەتو ناوێ خوای، نەرمۆکە نەرمۆکە شۆڕبەوە جێی شەوڕاموسانێ!**

لەدوایی خەجە کۆفی قیت بە بەلۆرە و حەیران وەلامی دەدایەوە:

**هۆووە هادەر، هۆووە هادەر**
**ڕاوکەری لە ڕاوێ**
**بەس پەلاران باوێ**
**کوڕی خارم ناوێ**



**سواری لەسەر زینی**
**زۆر برند ڕادەمینی**
**گراوی خۆت نابینی**



**سواری لەسەر زوری**
**گەلەکم لێ دووری**
**لۆ هێندە مەغرووری**
**با بڕۆین لۆ مەخمووری**



**سواری لەسەر گردی**
**تیژ هاتی و ڕابردی**

زۆرم هێناو بردی



سواری ماینی شێیە
تاژیت لە ڕستێیە
دۆست ناوی خەجێیە
دەرمانی شەوێیە



سواری لە شینبۆزی[١]
لەسەرڕا زۆر قۆزی
لە بنەوە ئارۆزی[٢]



ئەسپەکەت کەوێتە
تاژیت بە قەرێتە
کوڕەتیم حەیران شێتە



لێم ڕاوەستە جارێ
با بگەینە بەهارێ

١. شینبۆز: ڕەنگی ئەسپێک کە سپات (شینێکی کاڵ) بێ.
٢. ئارۆز: ئاڵۆز، هاڵۆز.

دەبمە بووکی ساریێ



مارتان لە بناری
زۆرم پێ قەرداری
ئەگەر چوویە شاری
لۆ من بکڕە دیاری



ڕەشمارتان لەوبەری
پشتدێن شار کودەری[١]
نەینۆکان[٢] ڕادەگری



لەناو کوریکە زەردان
لە پاش داخ و دەردان
نەبتە دەست لێك بەردان
هۆووە هادەر، هۆووە هادەر



لەگەڵە تۆمە هۆهۆ ڕاوکەری لە ڕاوێ
چیدی پرچك و پەلاران ماوێ
گراویەکەی تۆ قورینگەکێ شاپەڕ بەخوناوە دێتەوە سەر

١. شار کودەری: شاڵ کودەری.
٢. نەینۆک: ئاوێنە.

**گۆمێ شیرناوێ.[١]**

**سێرەی لێ مەگرە بەشینکەکەی[٢] چەخماخ سارمی حەیران گۆرانی.**

**نە تاژی و تولانێ بەردەێ، هێدی هێدی بیگرە بە شەداوێ.**

حومێرە لغاوی ئەسپەکەی بەقەرپوزی زینی وەکرد و ئەسپەکەی ڕاتەوراند[٣] بۆ ئەوەی بلەوەڕێ، لە لێواری ئەو کەندەی بەدەوری گردەکەدا گەوەی دەکاتو دەسوڕێتەوە. چەند شوێنێکی پێ شک دێت سالانە دۆمبەرانی لێ دەڕوێو هەڵدەتۆقێ، خاکەکەی لماوییە دانەقەتێی[٤] لێ شین دەبێت، ئەوەش نیشانەی هەبوونی دۆمبەرانە لەو شوێنانە. چەند درزێکی هەڵتۆقینی لە عەرزەکە بەدیکرد، هەموویان دۆمبەلان بوون، هەر زوو دەستەسرەکەی پڕ کرد لە دۆمبەران و گەڕایەوە سەر گردەکە بۆ شەڕە بەندان لەگەڵ خەجەی. ئەوەی ئەو ڕۆژە لە زاری خەجە کۆفی قیتێ هەڵدەوەری و دەچۆڕایەوە، نەباتو ڕاوی هەنگوینو خواردنی شاژنی هەنگە، ئاوی حەیات دەڕژێنێتە سەر

١. گۆمێ شیرناوێ: بەو چاڵاوە دەگوترێ کە باراناوی تێدا کۆدەبێتەوە، بەراود بە ئاوی هێندێک لە بیرەئاوەکانی ئەو سنوورە، شیرینترەو خەڵک ئاوەکەی بۆ خواردنەوە بەکاردەهێنن.

٢. شینکە: جۆرێک چەک بووە.

٣. ڕاتەوراند (ڕاتەوراندن): بەستنەوەی وڵاخ بە گوریسێکی درێژ لەنێو گیاوگۆڵ و پووشدا، بەمەبەستی لەوەڕ.

٤. دانەقەتێ: گیایەکی بەهارییە، ئەو شوێنانەی کە ئەو گیایەی لێبێ، ئاماژەی بوونی دومەران (دومبەلان)ـە لەو شوێنە.

هەستەوەریو رۆحی نێرینەیی حومێرەی، گوڵاوپرژێنی عیشقێکی بێ ئامانی دەکرد. چەپکەگوڵێکی شاهانەی بە دەستی فریشتەکاندا دەنارد بۆ عاشقەکەی. کیژەکان هەریەکەیان پاشــۆلی[1] پڕکردبوو لە کەنگرو کاردیو ڕستە پیفۆکو قێزبەلە، بەرامپیلەکانیان کردە تێلەگە و لە پشـــتی خۆیان هەڵدا، قریوەیەکی گردبوونەوەیان کــرد، گوتیان درەنگە وا چاکە بەرەو مـــاڵ بینەوە. خەجە کۆفی قیــت گوتی: هێشــتا زووە، یەک لە کچەکان گوتی: درەنگــە، تەیارە قوون بە دوکەڵەکە وەک هەر ڕۆژێکی دیکە لۆ لای حەجێ ڕۆیشت، ئەو تەیارە قوون بە دوکەڵە درۆی ناکات، هەموو ڕۆژێ لە یەک میقاتی دێو دەڕواتە لای حەجێ، خۆزیـــە بە خۆزیداران لەناو ئەو تەیارە قوون بە دوکەڵەی بوومایەو خوا حەجی بە نسیب کردبامایە، ئەوجا لەوێش مردبامایە، مرازم حاسڵ دەبوو، بێ سوئال و جواب یەکسەر لۆ بەهەشتێ! خەزار هاتە نێو قسانو بە پاڕانەوە گوتی: توخوا بەرلـــەوەی بگەڕێنەوە ئەو کاولبووەی[2]، با پێچە شـــایێکی بکەین، هەندێک هەڵپەڕین. خەجە کۆفی قیت گۆرانیمان بۆ بڵێ. دیارە هەموویان پەســـەندیان کردو مجێزیان لە شـــایی بوو. خـــەزار، ئەو گەورەکچە بوو بابـــی داینابوو بۆ خـــۆی ژن بە ژنەی پێ بکات. چونکە کوڕی نەبوو بۆی بە ژن بدات، ســـوێندی خواردبوو: بەشم لە هەر چوار مەزەبی خوای بڕا بێت، سوێند بە شێخ نورەدینی بریفکانـــێ، کەس ناتوانێ خەزارێ لەو ماڵـــەی بە بێ ژن بباتە دەرێ هەتاوەکو ژنێکی نەیەتە جێگای، کەس ســـەری لەگەڵ بە بالیفێ ناکات، ئەگەر پرچی بە سپی بهۆنێتەوە، مەگەر بمرم ئەوجا بێ ژن لەو ماڵەی دەڕوا!

١. پاشۆل: بەرامپێل (بەرهەڵبێنە) کاتێک پڕ لە شتە و بە بەرزگو سینگدا هەڵواسراوە.

٢. کاولبوو: مەبەستی نێو گوندەکەیان بووە.

خەزار، هەتا دەســت هەڵێنــی کەرەگەت، مێوژی خواردبا لــە گەردنێیرا دیاربوو، چاوێکی مەست دەتگوت تازە تارمایی خەو لەسەر پێڵووی چاوەکانی لادراوە، دوو برۆی کەوانی، هەمیشــە ئامادەی ئەنگاوتنن، دوو مەمکی قیت لەسەر ســینگی هەڵتۆقیبوون وەک ئێستا نا ئێستا کراسە ڕەشەکەی بدڕێنن و خۆیان ڕەها بکەن لەو پاوانە دەســت نەخوردە. گەندەمووی قۆرو مەچەکو لاجانگو پووزی هەڵماڵدراوی، تۆبەی تۆبەکارانی دەشکاند! مردووی لە قەبری تاریک دەردێنا، تریقەی پێکەنینو قووڵبوونی چەرخەی ڕوومەتی، ســۆفی و مریــدی خانەقایان لە دین وەردەگێڕا. گفتولفتی، ئارەزووی لــێ دەتکا، جووتە کەزیی پڕو ئەســتووری، لەســەر گرمتەی[١] ســمتی لەکاتــی لەخۆهەڵدان لە شــایی، وەک دەروێشــی ئەحوار گەرم جەزم بووبوون، لەسەر هەردوو گردی ســمتی ئەوبەر ئەوبەریــان دەکردو هەرجــارەی بەلایەکــدا دەکەوتن، کاتێک گرێی کەزیەکانی لەسەر ســمتی دەخزاو هەڵدەبەزینەوە موچڕکو گوردێکی پێدا دەهــاتو گورگەئاوڕێکی دەدایەوە، بە خەیاڵ و ئارەزووی ئەوەی دەســتی نێرینەیەک بێت لە ســمتی بســووێ، بە ئومێدی ئەوەی ببێتە دەرگایەک بۆ ئەوەی بەختی هەڵقەنێ، چێژی لە لێکخشاندنی گۆی مەمکی و کراسو لێوی سوخمەکەی و هەڵبەزینەوەی کەزیەکانی سەر سمتی وەردەگرت.

بۆیە تاو لە تاو بە جۆش و خرۆشتر لە خۆی هەڵدەدا، بەجۆرێک گۆی مەمکی هەڵدەبەزیەوە وەک ئێســتا کراسەکەی بدڕێ، گوارەکانی سەمایان دەکرد، هەموو لەشی نوقمی چێژێکی خەیاڵاوی ببوون و، کەوتبووە دنیای خۆی!

---

١. گرمتە: شوێنی گۆشتن کە لە شوێنەکانی دەوروبەری تورتتر و بەرزترە. بەدەر لە سمت، بۆ ڕوومەت و ڕانیش بەکاردێ.

هێندە بە حەسرەت و تامەزرۆی ئەوەبوو دەوی بە گۆزەی لەزەتەوە بنێ تاوەکو قۆڕەی لە بنی دێنێ. ختوکەی شیرینو تەزووی بەتامی بە مێشکدا دەهات، لێ تاساو بوو لە نێوانی ئارەزووێکی گڕگرتوو و دەستگرتن بە نەریتە باوەکانەوە، هەناسەی ئەوتۆی بۆ سندم کردنی ئارەزووەکانی هەڵدەکێشا، دوور نەبوو جغارەی پێ بە ئاگر بێت. لە ناکاو لەسەر ئاسووگەی، چەند ئەسپسوارێک بەدیارکەوتن، ئەوانیش مشیری ڕەفعەت ئاغاو خورامەکانی بوون. مشیر ئاغا تازە ناجیەخانی خوشکی خۆی کوشتبوو، بە تۆمەتی ئەوەی لەگەڵ حەمەی، کە شوانیان بوو، دەستی تێکەڵ کردووەو یەک لە قەرەواشەکانی حەساری ئاغای، بە چاوی خۆی دیویەتی، حەمەشوان لەناو کۆزی بەرخان، ڕوومەتی سۆری گورگوری ناجیەی، وەک سێوی لاسوور داوەتە بەر ڕاموسانێ. ئاغا هەر بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بداتە کوشتنی خوشکەکەی، لە گوندی بڵاوی کردبۆوە کە گوایە ناجیە دووگیان بووەو زگی پڕبووە لە حەمەشوانی.

شەوێک یەک یەدەگ فیشەکی دەمانچەی چواردەخۆری لە سینگو مەمکی ناجیەی خاڵی کردەوە، بێ خەبەر لەوەی هیچ میرغەزەبێکی سەربڕ ناتوانێ تخوبی عیشق سنووردار بکاتو، بە بێنووی پلەبەندی مرۆڤەکان، ناتوانێ ڕێگر بێ. لەو شەوەدا خۆشەویستییان سەربڕی و عیشق وەک کۆترێکی شاباڵ بەخوێن، لە شەقەی باڵیدا بۆ پەرپەرۆچکەی ئاسمانێ. پیاوەکانی خۆی ڕاسپارد کە نابێت لە گۆڕستانی گوندی بنێژرێ، نەبادا گوناهبار بێت لە بەرامبەر پیاوچاکانی گۆڕستانەکە. بۆ خۆپاراستن لەو گوناهە فەرمانی کرد، لەسەر گوفەکی گوندی بینێژن. گۆڕەکەی دوو بەرابەری گۆڕی ئاسایی، قوڵ بکەن، نەبادا مشیر ئاغا بکەوێتە بەر لێزمەی توک و نزای ئیمانداران و پیاوچاکان.

لە دوای کوشـــتنی ناجیەی خوشـــکی، ناوی خۆی بیســـتبۆوەو شانازی بە نێرایەتی خۆی دەکرد کە بوێریی مرۆڤکوشتنی لە زاتیدا هەیە. نە تەنها لەناو کرمانجـــەکان، بەڵکو لەناو ئاغاواتی ناوچەکەش بە دەســـتکەرەوەو مرۆڤکوژو ئاغایەکی بە هەیبەت و دەســـەڵاتداریان ئەژمار دەکرد، ئەوەش هێندەی دیکە بای لە پێستی کردبوو.

تەماشای بەرپێی خۆی نەدەکرد، هەر لە هەوران ڕادەماو خەڵکی کرمانجی نەدەخوێندەوە.

خـــەزار کە چاوی بە مشـــیر ئاغای کەوت چاوی تاریـــک بوو، چاوی چووە پشـــتی ســـەری لە حەیفان، بە دیتنـــی بکوژی ناجیەخانی دەستەخوشـــکی، ئارامی لـــێ بڕاو بەرگەی تێڕامانی نەبوو، گوتی کیژینە شـــاییەکەی بەردەن خۆمان خڕبکەینەوە هەتاوەکو ئەو ســـەگبابە نەگەیشتۆتە ئێرە، هەی لە دەوی بابی بڕیم! هەرچەندجـــاری چاوم بەو زاڵمەی دەکـــەوی، وا دەزانم تازە ناجیەی کوشتووە. هەی لەبەر دەلینگی دەرپێم مری.

هەر دوور بە دووری، کە مشـــیر ئاغا بینی کیژوکاڵی گوندی شـــاییەکەیان بەرداو هەر بابایـــە خەریکی کۆکردنەوەی تێلەگە[1] پـــڕ لە کەنگرو کاردی و پیفـــۆکو تۆرکـــەو قێزبەلەکانیان، چاوی چووە پشـــتی ســـەریو خوێنی لە چاوەکانی زا، تێگەیشت کیژوکاری گوندی بە دڕندەو بەدخووی دەزانن، خۆشییان لە ســـەرو فەســـاڵی نایە. لە داخان شـــێت و هار ببوو، پتت لێدابایە دەتەقی! دەیویســـت، لەباتیی دڵڕاگرتن و دەست بەســـەرداهێنان، ترس و تۆقین لە دڵی

١. تێلەگە: کاتێک بەرانپێل (بەرهەڵبێنە) پڕدەکرێ لە گیاوگۆڵ یان هەرشتێک و لە پشتێ هەڵدرا، پێیدەگوترێ تێلەگە.

مسکێن و کرمانجی هەژاردا و بەتایبەتییش ژنان، تۆو بکات! بێئاگا لەوەی کە زەبروزەنگ، توڕەتریان دەکات، ڕقیان ئەستوورتر دەکات.

کاتێک مشیر ئاغا گەیشتە لایان، دنیایەک جنێوی سووکی پێدان، ئاوری لــە چاوەکانی دەباری، گوتی: دەبێت بابــی هەمووتان تەمبێ بکەم، دەزانم بە فیتی چ ســەگبابێکی ئەو شــاییەتان بەردا، ئەویش دەگەیەنمە سزای خۆی! مەخسەدیشــی لەو ســەگبابەی، حومێرەی حاجی ســمایلی بوو، دەبێت ئەو دڕکەی لە بنی پێی دەربێنم، لۆ حەفتێ پشــتی بابــی تەمبێی بکەم، لە ژنان کەمتریم ئەگەر بەســەریەوە بچێ، با لۆی لەنێو دوو نانی گەرم بێت هەتاوەکو کاتی خۆی دێت، ئەو کوڕانەی حاجی ســمایلی هەر کارەکی دەیکەن لە زیددی مەیــە[1]، دوێنێ حومێرە کەروێشــکی لە لانێ دۆزیوەتــەوە دیاردی کردووە، نەیگۆتیە «دیاردی نۆکەری ئاغای خۆم پێدەرێن!» خۆ ڕەفعەت ئاغای بابم ئەو قەبیحاتەی بزانی، کەوڵی دەکات. کەروێشکی بە سامۆتەی زینی وەکردیە، هەر بۆئەوەی لە هەیبەتی ئاغاتــی مە، کەم بکاتەوە، نەمرم دەبێ کوڕەکانی حاجی سمایلی لۆ حەوت پشتیان تەمێ بکەم، نەوەکو کرمانجەکان چاویان لــێ بکەن! ئەوانە کۆمەنیستن، فەرمەسۆن و بێدینن، خەرکمان لــێ هاندەدەن سوخرەمان بۆ نەکەن، بیستی چواری[2] نەدەن. ئەو چەند ڕۆژەی چوو، کوڕەکچگەی حاجی ســمایلی ئەوەی ناوی کاکەڕەشــە، قەسەم بە خوای دەمکوشــت، بەڵام خوای بەقوربانی خەرکی بکات کەوتنە بەینێ‌و نەیانهێشت بیکوژم.

١. لە زیددی مەیە: لە دژی ئێمەیە. مە: ئێمە.

٢. بیستی چوار: چوار لە بیست، لە هەر بیست ڕیەگەنم لە بەرهەمی جوتیار، چوار ڕیەگەنم بۆ ئاغایە، لە سەدا بیست.

لە کاتی ئەو قسانە، بە خۆیو خورامەکانی هەر چواردەوری کیژۆکاڵی گوندیان گرتبـــوو، خەجەکۆفی قیت هەر ئەوەندەی گوت ئاغـــا ڕێگامان بدە بڕۆینەوە، خۆ ئێمە حومێرەی فەقیرمان هەر نەدیتییە! مشیر ئاغا بەو پشتگرتنەی خەجەکۆفی قیتێ لە حومێرەی حاجی سمایلی، هەر بەجارەکی شێت و هاربوو، لغاوی لە زاری ئەسپی توندکردو دوو ســێ نووکە ڕکێبی لە قەبرغەی ئەسپی دا، ئەسپی تایین چەنگی دەدایە عاسمانێ، کیژۆکاڵی گوندی خۆیان لەبەر سینگەئەسپان لا دەدا، کردیان بە زروکەو چریکە. بە چەپۆکەئەســپان کەوتنە ســەر تێلەگە گیاکانیان، چەنــد بەرامپیلیان، هەر دڕاند! ئەوجا، ئاوزینگی لـــێ دا دوو ســێ تەڕادی لە دەوری کیــژۆکاری گوندی کردو لێیدا ڕۆیشـــت، خورام بەدوایـــەوە، ئەو ناوە وەک مەیدانو پاشماوەی جەنگی لێهات.

مشـــیر ئاغـــا، لەوکاتـــەوەی ناجیـــەی خوشـــکی دابـــووە بەردەمانچان و حەمەشوانی بە زیندوویی لەناو ئاخوڕی ئەسپی زیندەبەچاڵ کردبوو و ئاخوڕی ئەسپی لەسەر دروســـت کردبوو، لە بەرامبەر هەر ناڕازیبوونێکی بچووکیش، پڕکێشی قرتەی دەمانچەو کوشتنی بەرامبەرەکەی دەکرد.

لەســـەر جێ جۆخینان، قاشـــوانێ[1] گەرم بوو، کاکەڕەشـــی کوڕەگچکەی حاجی ســـمایلی، قاشۆی لە گۆی داو گۆ بە سینگی مشـــیر ئاغای کەوتبوو، مشیریش یەکسەر قرتەی دەمانچەی ترازاندبوو، جنێوی بە کاکەڕەشی دابوو،

---

١. قاشوانێ: یارییەکە، خەڵکی گوندی لە کاتی بێکاری و بەگشتی لە وەرزی زستاناندا دەیکەن. وەک یاری تۆپێن، گۆلی هەیە. یارییەکە بە (قاشۆ) و (گۆ) ئەنجام دەدرێ. قاشۆ: داردەستێکە سەرێکی چەماوەتەوە لە کاتی وەشاندن لە گۆیەکە دەدرێ بەرەو گۆڵەکە. گۆ: تۆپێکی دارینی بچووکە.

کاکەڕەش دەســت گەرمانەو چاو نەترســانە دەمانچەی هەڵکێشابوو بە مشیر ئاغای گوتبوو پیاوی خۆت بناســە ئەمن حەمەشــوانی غەریبو بێچارە نیم ئاخوڕی ئەسپم لەسەر دروست بکەی، لەسەر کوتکو سنگی خۆت داسەکنێ، ئەگەرنا لۆ هەموو ئاغای دزەییانت تەمبێ دەکەم! ئەو جوابجەنگییە، ئارامیی مشــیر ئاغای ڕووخاند! ئاخر کوڕەکانی حاجی ســمایلی لەنێــو کرمانجەکان یەکجار خۆشەویســت بوون، هەمیشــە لە هەرەوەزو هاریکاری جوتیارەکاندا بوون، بۆیە ڕیشســپی کەوتنە بەینو نێوبژیان کردن. بە مشیر ئاغایان گوت: نابێ لەبەر درت بێو لە دری بگری، کاکەڕەشــیش کــوڕی ئەو گوندەیەو دەبێ وەک برا بچووکی خۆت ســەیری بکەی، دەبێت ئاغا دری گەورە بێت، ئەوە نییە پێشنیان گوتویانە ئەوەی حوشترەوانی بکات دەبێ سەردەرەی دەرگای برند بێت! مشــیر ئاغا، هەر بۆ ئــەوەی تەریق نەبێتەوە ئاغایەتیی خۆی نیشــان بدات، دەیگوت: خوات بە قوربانی ئەو پیاوە ڕیشســپیانە بکات، دەنا دەمزانی چیت لێدەکەم! لەبەرخۆشــیەوە دەیگوت لە ژنان کەمتر بم ئەگەر ئەو ناماقوڵییەت بەســەرەوە بچێ! ئەو غەرەزەشی هاتە ســەر کۆنە غەرەزەکانی دیکەی، لەبەر خۆی دەیگوت: با لۆت لەنێو دوو نانی گەرم بێت!

کاکەڕەش، کاتێک ئەو هەموو زوڵم و غەدرو چەوســاندنەوەیەی ئاغاکانی دەبینی، نێڵەی شــەپۆلی تۆڵە لە ناخیدا مەوجی دەدا، بەڵێنی بە خۆی دابوو تۆڵەی ئەو هەموو ســووکایەتی و کەرامەت شــکاندنە لە ئاغاکان بکاتەوە. چەلەنگــیو ئازایەتیەکەی بابی ئەوەی دەکرد کارێکی ئاوای لەدەســت بێت. بۆیە هەمیشە لە پەیوەندی توندوتۆڵدا بوو لەگەڵ ئەو گەنجانەی یاخی بوون و ئازایەتی لە زاتیاندا هەبوو، پەیوەندییەکی بەرفراوانی لەگەڵ پیاوە بەوەجەکانی

هەموو ناوچەکە پەرەپێدەدا بۆ ڕۆژی خۆی. بێ ئەوەی هیچ کەس هەستی پێ بکات، بە جوتیاری و ئاژەڵداری خۆیەوە خەریک بوو. هێندەی لەبارەی (مەجید شانەشینی) ناوچەی کەرکوک لە براگەورەکانی خۆی بیستبوو، هەر زوو زوو دەیانگوت ئەوشەو مەجید شانەشینی فلان ئاغای دارکاری کرد، ماڵی فلان ئاغای سووتاند، تفەنگی بە ماڵی شێخەکانی کەرکوکەوە نا، بۆیە کەوتبووە ژێر کاریگەری دەستوەشێنیی مەجید شانەشینی، چونکە هەمیشە لە دژی زوڵم و زۆری سیستەمی دەرەبەگایەتی و نادادی حکومەت دەستی دەوەشاند!

تەواوی مسکێن و ڕەعیەت، لە سوخرەو بێگارو بێدادیی ئاغاکان، شپرزە و ماندوو بوون، ڕق و زوخاویان هەڵدێنایەوە، لێ کاکەڕەش، لەوان جیاوازتر بوو، دەیویست دڵۆپ دڵۆپ خوێنی خۆی ببەخشێ تاوەکو خەڵک بە چاوی خۆیان ببینن خۆرەتاویان لە کاملاوەیە! هەست و سۆزو غرور دەبنە هێزی پەرچەکرداری مرۆڤە لەخۆبووردوەکان، لە تاریکە شەوگارانی نم نمەی بارانبارینەدا گڕی تۆڵە باڵی پێ دەگرت. بەڵام هەموو جارێ حاجی سمایلی بابی دەیگوت: کورم پیاو دەبێت ئارام بگرێ، ئەو بەربەرەکانێیە بەس لەسەر شانی ئێمە فەرز نەکراوە. دەزانم، ئەوەی بەرگەی ئەو چەوسانەوەیە بێ ئامانە بگرێ، دەبێت حەوت پەراسووی لە ئۆمەتی محەمەدی زیاتر بێت. هەوڵ بدەن: چاوتان بێتەدەر بەڵام دەنگتان نێتە دەر!. مەبەستی حاجی سمایل لەو ئامۆژگاریانە بۆ ئەوەبوو کوڕەکانی بپارێزێ، چونکە لە خەڵکەکەی ڕانەدەبینی هەتا کۆتایی پشتیان بگرنو چەورەیی[1] بۆ ماڵی ئاغای نەکەن! حاجی سمایل،

---

١. چەورەیی: ملکەچی و پەشیمانبوونەوە و خۆڕادەستکردن. بە زۆری بۆ ئەوانە بەکاردەهات کە خۆیان لە ماڵی ئاغا دەهاویشتەوەو پاکانەیان بۆ خۆیان دەکرد.

پیاوێکی چوارشانەی تێکسڕماوی بەژن مامناوەند بوو، ڕەشئەسمەرێکی بەلای ڕەشـــیدا بوو، بەرلەوەی تەوافی ماڵی خودا بـــکاتو ببێتە حاجی، دەیانگۆتێ سمایلەڕەش. تازە مووی لـێ سپی ببوون خەریک بوو سەروڕیشی ماش و برنج دەبێت، چاوەکانی بەلای قاوەییدا بوو، جلی سەڵتەو کەوای دەپۆشیو کەشیدەی حاجیایەتیەکەی وەک پشتێن لە پشتی دەبەست، کراسی بە کلکە ئەنگوچکی لەبەردابوو، هەتا بلّێی میهرەبانو بـــە بەزەیی بوو، هێندە ئارام بوو بە هەوەنتە تووڕە نەدەبوو، لەنێو گوندی دەیانگوت حاجی سمایل گێرەی قونجرکانی لەسەر زگی بکەی، تووڕە نابێت، بەڵام وەکی تووڕە دەبوو، بەر لە هەرشـــت ئەنگوچکی کراســـەکەی دەکردەوەو دووبارە لـــە زەنگە[١] و مەچەکی خـــۆی توندی دەکرد، هەتاوەکو دەستی نەوەشاندبا سارد نەدەبوویەوە، کە دەستیشی دەوەشاند زەرێکی دەکرد، واتا دەســـتڕەش بوو، لە گەرمەی گەورەترین شەڕدا گوێت لە جنێوێکی نەدەبوو!



---

١. زەنگە: جومگەی نێوانی دەست و باسک.

# ٢

پاشـــنیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شـــەممەیە، ڕەشماڵێک لەســـەر پێنج ئەستوونان هەڵدراوە، مافوری سەرەنازو لبادی لاکێشی لـــێ ڕاخراوە، پێش دەرکی ڕەشماڵ ئاوڕشێن کراوە بۆ ئەوەی تۆزوخۆڵ لە مێوانەکان نەنیشێ، کتری گەورە گەورە لەسەر ئاگردانـــی دەکوڵێ‌و فیرەی لوولەی دێ‌و هەڵمی لە لوولـــەی دێتەدەر، جار نا جار سەرقاپەکەی بڵند دەکات، چادانەکان پڕاوپڕ لە چای دێمکراو، جگەرەی قامیش، بە ســـێنیان داندراوە، لە چاوەڕوانی میوانەکاندا چەند مەســـینەو دەستشۆر[1] ئامادەو ڕیزکراوە، دوو پەشتەمار بەسەر چیغی ڕەشماڵەکەدا هەڵواسراون، گەورەو گچکەی ماڵی زاوای دەســـتەونەزەر لە خزمەتی میوانان ڕاوەســـتاون. لە هەموو گوندەکانـــی دەوروبەر، ئەوانەی بانگهێشـــت کراون بۆ ســـەر شـــایی و لە دوایان گەڕاوەتـــەوە، پەیتا پەیتا ئامادە دەبن، هەتا کات هەڵدەکشـــێ ژمارەی میوانەکان لە زیادبووندایە، ئەوانەی مەڕدارن هەر یەکەو گیســـکێک یان کاوڕێک بەدیاری

١. دەستشۆر: دەفرێکی پان و قوڵی لێواردارە. لە مس یان فافۆن دروست دەکرێت. سەرقاپێکی مەیلە و قوچەکی بۆ شوێنی سابوون تێدایە، لە پێش یان دوای نانخواردن دەبرێتە پێش میوان بۆ دەستشۆرین.

لەگەڵ دەستی خۆیان دێنن بۆ ماڵی زاوا بۆ ئەوەی بارسووکییان بۆ بکەن لە خەرجی. ئەو دوو کەسەی ڕاسپێردران بچنە ماڵی بووکێ، فاتەگەڕۆک وەک بەربووک[1] لەگەڵ خۆیاندا ببەن، هەروەها شوێنی گۆڕینەوەی بووکەکان[2] دیاری بکەن، لە چ کاتێک بگەنە ئەو شوێنەو لەگەڵ خۆشیان لە گەڕانەوە، بارگەی بووکەخانیش بێنن کە بریتییە لە سندووقێکی بۆراق و باولێک و جاجمێکی دوولا و بەڕەکی نەخشینو لبادێکی دوو نەفەری و مەسینەو دەستشۆر و فانۆس و وێنەیەکی کیژی کافرۆشی. ئەو کرمانجانەی لە گوندەکانی دەوروبەرڕا دەهاتن، زۆربەیان دەیانگوت واچاکە سەرێکی ماڵی حاجی سمایل بدەین، ئاخر لەگەڵ کوڕەکانی نێوانیان زۆر خۆش بوو، کە دەگەڕانەوە بن ڕەشماڵێ، کوڕەکانی حاجی سمایلیش لەگەڵیان چوون بۆ ژێر ڕەشماڵێ، ئاغاو کرمانج ئامادە بوون بەرلەوەی زووڕناژەنو دۆڵەنگێوەکان بگەنە لای ڕەشماڵێ، مشیری ڕەفعەت ئاغای فەرمانی کرد بچن نیشانەیەک دابکەن، کاتی تفەنگانێیە. نیشانە داکرا، بەر لە هەمووان مشیری کوڕی ڕەفعەت ئاغای چەند تفەنگێکی گرتە نیشانەکەی، نەیپێکا. هەرچی ئاغاو نۆبەتداری ئاغایان هەبوو، تفەنگیان گرتنە نیشانەکەی، کەسیان نەیانپێکا، رەفعەت ئاغا، لە قاران سمێڵی خۆی دەکرۆشت! کاکەڕەشی

---

١. بەربووک: ئەو ژنە بەتەمەنە بوو کە ڕۆژێک بەر لە بووکگواستنەوە، دەچووە ماڵی بووکێ بەمەبەستی ڕێکخستنی بووک و هێندێک ئامۆژگاریی پێویستی شەوی بووکێنی. ڕۆژی بووکگواستنەوە لەگەڵ بووک دەگەڕایەوە. بەربووک، بەگشتی خزم یان ناسیاو و جێ متمانەی ماڵی زاوای بوو و لەلایەن ئەوانەوە ڕادەسپێردرا.

٢. شوێنی گۆڕینەوەی بووک: لە مابەینی ئەو دوو ماڵەی ژن بەژنەیان دەکرد، بە ڕەزامەندیی هەردوولایان شوێنێک دیاری دەکرا، بۆ گۆڕینەوەی بووکەکانیان و لەوێ هەریەکەو کچی خۆی ڕادەستی ماڵەکەی دیکە دەکرد.

حاجی ســـمایلی کە نیشانشکێنێکی دیاری ئەو ناوچەیە بوو، دوور ڕاوەستابوو تا هەموویان لە نیشانەکەی کشانەوە، بەس تەماشای دەکردن، دیاربوو کرمانجەکان زۆریـــان پێ خۆش بوو ئەو نیشـــانە، کاکەڕەش بیهەنگێـــوێ، هەموویان داوایان لێکـــرد ئەویش خـــۆی تاقیکاتەوە، بۆ ئـــەوەی بزانن ئەویش دەســـت و تفەنگی چۆنە! هەندێکیان دەیانزانی نیشانەشکێنیەکەی بە جۆرێکە جغارەی هەڵدەگرێ! چەند جاری دیکە پێیانەوە دیووە چ ئەنگێوەیەکە! لەســـەر داخوازی کرمانجەکان کاکەڕەش فیشەکی لێخوڕییە بەر تفەنگێ، پشتی بە سنگی ڕەشماڵێوە دا، چاوی خستە سەر سێرەی تفەنگێ و هەناسەی خۆی ڕاگرت، بڕیاری دابوو دەبێت بە دڵی برادەرە کرمانجەکانی بێت، قامکی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگی توند کرد، لەگەڵ تەقینی یەکەم فیشەک نیشـــانەکەی هەڵگرت. ئەغرەبی کرمانجەکان هاواریان کرد : ئافەرین کاکەڕەش هەر بژی بەڕاستی کوڕی بابی خۆتی، بەڕاستی ئەنگێوەی! ئاغاکان زۆر بێتاقەت بوون، بە تایبەتی مشیر ئاغا، پێیان وابوو شەرمەزارییەکی گەورەیە بۆ ئەوان لە شکاندنی ئەو نیشانە بەسەریاندا شکانی شکۆی ئاغایانەی خۆیان دەبینی. مشیر ئاغا ویستی ئاژاوەیەک بخوڵقێنی بە بێنووی ئەوەی گۆیا کاکەڕەش لە ئاکاری کرمانجانەی خۆی لایداوەو لەگەڵ شکاندنی نیشانەکە دەبوو بڵێ «ئەگەر نامناسن نۆکەرو خزمەتکاری ڕەفعەت ئاغام دەڵێنێ».

لەوکاتەی ڕەفعەت ئاغا زانی نیشـــانەکە کوڕە کرمانجێک شـــکاندوویەتی، نەخاسمە کاکەڕەشی حاجی سمایلی! زۆر هەراسان بوو، هەستایە سەرپێ و گوتی:

کوڕینـــە بە پیاوەکان بڵێن با بڕۆینـــەوە دیوەخانێ، نێو ئەو گەجەرو گوجەرەی لەبۆ مە نابی! دەستی لە پشت قوونی گرتو تەسبیحە دەنک گەورە کارەبابیەکەی بە ڕقەوە دوو دەنک دوو دەنک ئاودیوو دەکرد، ترقەی لێوەدێنا. چەند هەنگاوێک

لە ڕەشــماڵەکەی دوور نەکەوتبوونەوە دروســت لەو کاتــەدا، کۆلارەیەک[١] لە هــەوای لەنگەری گرتبوو باڵەکانی بڵاوکردبوو، بێ ئــەوەی بیانبزێوێ، جوڵەی لە خۆی بڕیبوو، تووەمەز چاوەڕوانی ئەوەبوو، ئەو جووجەڵە مریشــکانەی لە ترسی کۆللارەو باشــووکە خۆیان خزاندبووە بن باری داکیان، بێنە دەرەوەو یەکیان بڕفێنێ و خواردنی ئەو ڕۆژەی مســۆگەر بکات. یەک لــە کرمانجەکان گوتی کاکەڕەش دەی توخــوا بزانین ئەو کۆللارەی دەئەنگێوی؟ ڕێک ڕاوەســتاوەو جوڵەی ناکات! کاکەڕەش ئەوجارە بە دەمانچەی سێرەی لێگرت، تەقەو هێنانەخوارەوەی کۆللارەی، یەک بوو! لە بەدبەختیی کاکەڕەش، وەک بیەوێ ڕق و بوغزی ئاغاکان بەرامبەر بە خۆی ئەســتوورو چەند قات بکات، کۆللارەکــە بەخوارەخوار کەوتە بەردەمی ڕەفعەتــی، هەر هەمــوو ئاغاو خزمەتکارەکان ســمێڵ و لێویان لە کاکەڕەشــی دەکرۆشــت، ئازارێک لە ناخــەوە غروری ئاغایانەی دەکرۆشــتن، بە یەک دەنگ دەیانگوت: لە ژنان کەمتر بین ئەگەر ئەو سووکایەتیەت بە سەرەوە بچێ! دەبێت بۆ حەوت پشــتی سمایلەڕەشــی دۆمانیت تەمبێ بکەین! ڕەفعەت ئاغا هەزار جنێوی ســووکی بە خزمەتکارو نۆبەتدارەکانی خۆی دا، سەدجاری گوت خۆزگە ســەگم نان دابا و ئەنگۆم نان نەدابــا، هەرئێکەتان بە قــەدەر ماکەرێکی زاون، نەتانتوانی ئەو نیشــانەیەی بئەنگێون، کوڕە کرمانجێکی کڵاش خوار نیشانمان بەسەردا بشکێنی، هەزار حەیف خزمەتکاری وەک ئێوەم هەبێت!

---

١. کۆلارە: ئەو باڵندە گۆشتخۆرەیە کە خۆراکی ڕۆژانەی جوچکەی مریشک و باڵندەی دیکەیە. هەر کە لە ئاسمان بیندرا، مریشی جوچکەدار قففەیەکی لێوە دێ، بەئاماژەی بوونی مەترسی و، بە بیستنی ئەو دەنگە، جوچکەکان دەخزێنە بنباڵی دایکیانەوە، ئەگەرنا، کۆلارەکە دادێتە سەر جوچکەیەک و دەیڕفێنێ.

بە چاو و بە مەزەندەی ئاغاکان، کاکەڕەش پێی زۆر لە بەرەی مسکێنایەتیی خۆی زیاتر ڕاکێشابوو، لە سنووری خۆی زۆر ڕەت ببوو، ڕۆژ بە ڕۆژ کۆڵی تاوانەکانی قورستر دەبوو. لەبەرئەوە شەو و ڕۆژ خەفتیانی لەنێوبردنیان دەکرد، وایاندەزانی ئەگە ئەویان لەکۆڵ کردەوە چاوی کوڕەکانی دیکەی حاجی سمایلی و جوتیارە کرمانجەکانی بندەستیان، دەشکێنن. کاکەڕەش هەستی بەو مەترسییە کردبوو کە لەسەر ژیانی هەیە، برازایەکی عازەبی هەبوو بە ناوی شەهلا، توانی براکانی ڕازی بکات شەهلای بدەنە هیدۆی، بۆ ئەوەی خزمایەتیەکە قایمتر و تۆختر بکەنەوەو برایەتییان توندوتۆڵتر بێت. لەوە بەدووا شەوو ڕۆژ هیدۆی لەگەڵ بوو، وای لێهاتبوو ئەگەر یەکێکیان بە تەنێ ببینرایە دەیانگوت ئەدی ئەوەکەی دیکە لە کوێیە؟! وەک دووانەیان لێهاتبوو! کاکەڕەش زۆر سەرسام بوو بە دەستگەرمی و دەستوەکەریی گەرماوگەرمی هیدۆی، زۆرجار دەیگوت ئەگەر هیدۆم لە پشت بێت، هەموو ئاغای دزەییان، چەندن ئەوەندی دیش بن، زەفەرم پێ نابەنو ددانیان لێم ڕۆناچێ! هیدۆ بارتەقای دە زەلامانە، لەو شوێنە هەستیارانەی گومانی دەست لێ وەشاندنیان دەکرا، هیدۆ هەرگیز لە نزیک کاکەڕەشی ڕانەدەوەستا، دایم و درهەم چەند شۆقاوێک دوور دەکەوتەوە بۆ ئامادەبوون لە کاتی هەر ڕووداوێکی لەناکاو و دەستەو ڕست، لە زۆر پیلانی لەنێوبردن کاکەڕەشی دەپاراست، دەستگەرمییەکەی جێی سەرسووڕمان بوو، قەتیش بە سەهوو نەدەچوو، کوڕی گۆنگەڵە گەرمەکان بوو!

زووڕناژەنو دۆڵەنگێو گەیشتنە بەر دەرکی ڕەشماڵێ، پێش هەموو شتێک، وەک هەمیشە زووڕناژەنەکە حەیرانێکی سەرچیایی بە زووڕناکەی بەسەر گوندیدا شۆڕکردەوە. گەردنی زووڕنای بەرەو عاسمانێ هەڵکێشا، ئاوازێکی

نەفەسدرێژی بەرەو ناو کیژو کاری گوندی لێدا. وەک ئەوەی پێیان بڕێ خۆیان بخزێننە نێو گەڕی داوەتو دیلانێ. زووڕناژەنێکی هەندە کارامەو مەعلان بوو، زوڕنای لێدەدا پشووی دەخواردەوە. کیژو کوڕی ئاوایی دەمێک بوو لە چاوەڕوانی دۆڵو زووڕنایدا بوون، کیژان لە ڕۆژی خەنەبەندانەکەیەوە نێو لەپی دەستو سەرپەنجەیان لە خەنەی نابوو، وەک خۆ ئامادەکردنێک بۆ ئەوەی دەستیان لەناو دەستی کوڕان بنێن. ڕەشبەڵەک گیرا، هەر ژنو کیژی ئاوایی بوو لە دوایەڕا دەستی پیاوەکانیان لە یەک دەترازاندو خۆیان دەخزاندە نێو شاییێ، تا وای لێهات هیچ کوڕێک بێ دۆ[١] نەمایەوە. هەیدۆ، هەیدۆی جاحێڵان، ئاگری بەردا دنیایێ، شایی ڕەشبەڵەک ئەوسەر تا ئەوسەری گۆڕەپانەکەی گرتبوو. شاییەکە، ئەوسەری دیار نەبێ، خزمی حەوت گوندان بەشدارە. دۆڵەنگێو هەرچەندی لە شاییو هەڵپەڕینی ئەسمەرێ فارسی دەڕوانی، ناچار دەبوو لە پێش ئەسمەرێ شایی بچەقێنێ[٢] و ڕایگرێ، چۆکی لە ئەرزی گیر

---

١. دۆ: کچ یان ئافرەتێک بوو کە خزمی نزیکی یەکێک لەو پیاو یان جاحێڵانە بوو کە دەچووە نێو شایی ڕەشبەڵەکەوە. جا، ئەوەی ئافرەتێکی وای لەگەڵ بوایە، ئەوە بێمنەت دەچووە دەستی یەکێک لەو کچ یان ئافرەتانەی کە لە شاییەکەدان، پیاوێکی نزیکی ئەو ئافرەتەیش دەچووە دەستی ئەو کچەی کە لەگەڵ ئەو پیاوەدا هاتۆتە نێو شاییەوە. زۆرجار کە چاوەش شاباشی لە پیاوێک وەردەگرت، پارەکەی بڵند دەکرد و بە بەردەمی شاییەکەدا غاری دەدا و بە دەنگی بڵند دەیگوت: شاباااااااااش بەسەر فلانکەسیدا و بە قوزی دایە بێ دۆیەوە! ئەوە جنێو و پلارێکی دۆستانە بوو، یانی ئەوانەی کە دۆیان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە و لە دەری شاییەکەن و بۆیان نییە هەڵپەڕن، با هەر زیتەی چاویان بێت!

٢. شایی بچەقێنی: شایی بچەقێنێت، داکوتانی شاییەکە لەپێش ئەو کەسەی کە لە هەموو شاییەکەرەکان شاییزانترە.

دەکرد، دەیویست دۆڵەکەی بدڕێنێ، ئاخر کەس شایی ئەسمەرێی پێ نەدەکرا. هەرچەنـــد جاری لە خۆی هەڵدەدا گوارەی پێنج گۆی لە گوێ دەهاتنەوە ســـەر چەرخەی ڕوومەتی، گوارە وەک دەروێشـــی ئەحواڵگەرم جەزم بووبوون، تەکانو ڕاجفڕینی مەمکان، سنجاقی ســـوخمانیان لێک ترازاند، ئای خوایە! شایی و ڕەشبەڵەکی ئەو دەشـــتی دزەییایەتیەی هەولێرێ چ مەحشەرێکە! ئەغڵەبی ئەوانـــەی تۆبەیـــان نەدەکردو نەدەچوونـــە ژێرباری تەریقەتو دەروێشـــی، لە سۆنگەی ئەوەیەوە بوو لە خۆیان ڕانەدەبینی شایی نەکەن!

دەروێـــش ســـەدیق، تازە لەســـەر دەســـتی غەلیفە مشـــلاوی تەریقەتی وەرگرتبوو، تۆبەی کردبوو تۆبەیەکی لەژێر فشـــارو نابەدڵ، لە نزیک شاییەکە لەســـەر بەردێک کە سەربێری مەڕدۆشین بوو، دانیشتبوو، لەگەڵ ریتمی دۆڵ و زوورنایدا شـــانی دەبزاوتن، لە ترسی شکاندنی تۆبەکەی نەیدەوێرا بچێتە نێو گەڕی داوەتێ، لەبەرخۆی دەیگوت:

دایکەکەت دەگێم غەلیفە مشلاو، ئاخر ئەمن ئی تۆبەکردنێو تەریقەتو دەروێشـــایەتیەم! وا خەریکە لەتاو ئەو شاییەی بەزگ بدەم و بمرم دە وەڵڵاهی ئەو شاییە لە بەهەشتێ نیە! شـــاباش دەستی پێکرد، پارە بەناو گەڕی شاییدا بڵاوکرایەوە، پێشبرکێی شـــاباش هەتا دەهات گەرمتر دەبوو هەر بابایە لەگەڵ شاباشی ئەو کەســـەی کە خۆشـــی دەوێ یەک یەدەگ فیشەکی دەمانچەی بەرەو حەوای دەتەقاند. کیژان زیاتر گەرم دەبوون لە شـــایی. منداڵان خەریکی کۆکردنـــەوەی قەوانو پێکـــەوە گرێدانی کلکە ئەنگوچکی ژنـــان بوون. لە ژێر ڕەشماڵێ، کەرەمستانێ گەرمە، هەر کە حومێرەی حاجی سمایلی دەستەگوڵی لێدەدا، فیشـــەکە دەمانچەکەی دەدیتەوە، حەیرانێکی بەسۆزی بۆ ئامادەبوان

دەگوت، کاتێک مەلای بەیانی بانگی دا، ئەوجا زانییان شـەو تەواو بووە هەر ئەوەندە پێ ڕاگەیشتن گورگەخەوێکی بەیانیان بکەن‌و بگەنەوە ژێر ڕەشماڵێ، بۆ ئەوەی نەبادا خاوەنی شاییەکە گلەییان لـێ بکات، خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچنە شوێنی دیاریکراو، بەپەلە نانی چێشـتێیان خوارد، کچی خۆیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ شـوێنی دیاریکراوی گۆڕینـەوەی بووکەکان، هەردوو ماڵەبووک گەیشتنە یەک، هەر لایەنەو هەوڵی دەدا شوێنی خۆیان بەرزتر بێت لە شوێنی لایەنی بەرامبەر و ناچاریان بکات زیاتر بە پیلیانەوە بێن‌و خۆیان ماقووڵتر لە بەرامبەرەکەیان نیشان بدەن.

گرژی دروسـت بوو، کەسی وا هەبوو بە هیچ شێوەیەک پەیوەندیدار نەبوو بەو کێشـەیە، کەچی خۆی سـوورو شین و ڕاسـت و چەپ دەکرد، دەیگوت هەرگیز جێگای قەبوڵکردن نییە! شـوێنی ئەوان لە شوێنی ئێمە بەرزتر بێت، مەگەر ئێمە پیاو نین ئەو سەرشـۆڕییە قەبووڵ بکەین؟! لەناکاو شـەڕەخڕکە دەسـتی پێکرد، بووکەکان لە دوورەوە لەگەڵ بەربووکەکان بوون بە تەماشاکەر. شەڕەخڕکەیەکە سەگ ساحێبی خۆی نەناسێتەوە، دەڵێی جەنگی مەغلوبەیە! خڕکەبەردێـک بە خالیکەو پەراسـووی مەلای کەوت، پەلـەواژ بۆوەو کەوتە گۆڕێ، کەوای هەڵگورجایە[1] سەر تەوقی سەری، دەرپێی شەعادەی[2] کەوتە ئـەو گۆڕەی، لەهۆش خۆی چوو، هەندێک ئاویان بە دەمووچاویدا پرژاند وەک

---

١. هەڵگورجا (هەڵگورجان): هەڵماڵدران. هەڵکشانی جلوبەرگ بۆ بەشی سەرەوەی جەستە.

٢. شەعادە: پارچەخامێکی زۆر سپییە بۆ کراس و دەرپێی پیاوانە بەکاردێت، ئێستا (تیترۆنی سپی)ی پێدەڵێن.

جوچکە پەرەسێلکەی زاری بەیەک دادەدا، یەک لەولای دەیگوت ئەوهاتان پێ باشە ئەوە وارسی پێغەمبەرمان لەدەست زەڕبوو، یەکی دیکە دەیگوت بەفەخری عالەم فەراقێ ڕەشی لێدەبڕێ، جارێکی دیکە باپیرم لە قەبری ڕاست بێتەوە، مەلا ڕاست نابێتەوە ئیدی نانی کەرت ناکاتەوە! یەکی دیکە دەیگوت بە مەرەدی کابرای گۆڕین دەچێ کاری کراوە، وای لە خۆمان بێ ئیمامێ، ڕیشسپیەکان کەوتنە بەینەوە، شەڕەکە هێور بوویەوە، بەڵام عەزە خڕە بێ ئەوەی خزمی هیچ یەک لە دوو لایەنە بەشەڕهاتووەکە بێت، بەهیچ بەرزەفت نەدەکراو لە بەردەفڕکێ نەدەکەوت، دەیگوت بە هیچ شێوەیەک قەبووڵ ناکەم ئێمە لە نشێوی بینو ئەوان لە هەورازی بن! کوڕێکی گەنج دیاربوو کورتەک و شەروارەکەی هەریەک لە ڕەنگێکی بوو، لە گوندێکی دوورەوە هاتبوو، خوارزای لایەنەکەی دیکەبوو، دەیانگوت بە تەمای کیژە بچوکەکەی خاڵیەتی، ئەوەی لە بووکێ بچووکترە، خۆی لە عەزە خڕەی نزیک کردەوە، لەناکاو خۆی بە عەزە خڕەی دادا، یەکتریان گرت، بە کۆرەمستان زۆریان لە دەموقەپۆزی یەکتری دا، بەسەر عەزە خڕەیدا کەوت هەرچەند گەوزی دەیاندا، هەر شتێکیان ڕای چەنگی دەکەوت، لەسەرو گوێلاکی یەکتریان دەدا، هەتا بنی کەندێ غلۆربوونەوە کڵاو و جەمەدانی هەردووکیان لە گۆڕەپانی جەنگ جێمابوو. ئەو گەنجە پرچی درێژبوو دیاربوو، تۆبەکاری تەریقەتو دەروێش بوو. عەزە خڕە قەپی لە گوێی گرتبوو خوێنی لە بناگوێی دەچۆڕایەوە، بە جەمەدانیەکەی سەرو گوێلاکیان پێچایەوە، یەکتریان کەلوکرۆم کردبوو، بە جۆرێک، خەڵک ئاوا لە دوژمنی بابەکوشتەی خۆی ناکات! دەروێش گوێی براو ئەحوالی گەرم بوو، بەجۆرێک جەزم بووبوو هەتاوەکو ساکینیان کرد بەرد شەقی برد. بووکەکانیان بە یەکتری

گۆڕییەوە. هەتاوەکو گەیشـــتنەوە، بەدەم ڕێگاوە هەرچی جنێوو تۆمەتی دزێوە بە ماڵی بووکێو خەڵکی گوندەکەیانیان هەڵواســـی بێ ئەوەی هیچ حورمەت و حیســـابێک بۆ بووکەخانێ دابنێن. دەیانگوت خەڵکی ئەو گوندەی هەموو بێ دەرپێـــن! هەر لە ڕێگا برینی بریندارەکانیان پێچایەوە، تۆزو خۆڵی ئەو شـــەڕە دەســـتەویەخەیان لە خۆیان دادەکاند، هەتاوەکو لە یەکتری ون بوون هەرەشەو پەنجەیان لە یەکتری هەڵدەشەقاند، هەر لایەنەو بەرەو گوندی خۆی بەڕێوەبوو. کاتێک لە بستووی گردی چەقەلان[1] بە سەرکەوتن، گوندیان لـێ بە دیارکەوت، هەواڵێک لە شایی ڕەشـــبەڵەک و زووڕناژەنو دۆڵەنگێو نەبوو، نزیک بوونەوە، بینییان غەلیفە شمشێرێکی بەدەستەوەیە نووکی شمشێرەکەی بەرەو ئاسمانێ بەرزکردۆتەوە، لەوسەر بۆ ئەوســـەری گۆڕەپانی شاییەکە وەسەما کەوتبوو، بە ئاواز و ریتمی دەفەی دەســـتی دەروێش فەتە پاسکیلدزی، هەڵدەپەڕی، وەک فەرماندەیەکی براوەی گۆڕەپانی جەنگ خۆی نمایش دەکردو مەیدانی لە خەڵکی گوندی دەخواســـت، وەک دەعبایەکی غەریب بە داب و کولتووری کوردەواری بە تایبەتی گوندنشـــینان، خۆی نمایش دەکرد. وەک فەتحی قەڵای خەیبەری کردبێت، ئەو ژن و کچانەی چەندین ڕۆژ بوو خۆیان بۆ ئەو شـــاییە تاسولووس دابوو، بەڵێنیان بەدڵخوازی خۆیان دابوو لەو شاییە ڕەشبەڵەکە بچنە دەستیان و لەگەڵیـــان هەڵپەڕن، هەمـــوو ئومێدو ئارەزوویان هەڵـــوەری، بەچاوی خۆیان بینییان گەڕی ڕەشبەڵەکیان وەک لیزگەی مرواری و یاقوت پسێندرا. بە ناچاری

---

١. گردی چەقەران: گردی چەقەڵان. گردێکە دەکەوێتە باشووری گوندەکەی ماڵی حاجی سمایلی بابی کاکەڕەشی. شەوان تورگ و چەقەڵی لـێ کۆدەبێتەوە. تورگ: گیانلەبەرێکی کێویی گۆشتخۆرە، شێوەی لە چەقەڵ دەچێت.

لەسەر دیواری حەسارەکانیان سەرەتاتکێیان بوو، هەناسە سارد لە گۆڕەپانی شاییەکەیان دەڕوانی. بە دوو چاوی خۆیان دەیانبینی گۆڕەپانی شاییەکە بۆتە مەیدانو گۆڕەپانی ڕمبازی غەلیفەو دەروێشان، کوڕە گەنجە بێ چارەکانیش لە داخی بێماف کردنیان لە هەڵپەڕین، شان بەشانی کچان دۆشداماون، پووشکان لە عەرزی وەردەدەن، بێچارە ماون. غەلیفەش بانگهێشتی پیاوانی گوندی دەکرد بۆ ڕیزی تەریقەتو تۆبەکاری و دەروێشایەتی. بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی سوێندی دەخوارد شێخەکەی ئاگای لەو تۆسقاڵە تۆزانەش هەیە لە دەوری ئەو کۆلکە تیشکانەی دەڕژێنە نێو ماڵەکانمان کە خەڵکی ئاسایی بەحاڵ بە چاو دەیانبینین! کەچی شێخ لەگەڵیان دەدوێ! ئەوانەشی کە لە بۆتەی ئەوینی خوداناسیدا قاڵ ببوونەوە، بەجۆرێک لە جۆرەکان کەوتبوونە ژێر کاریگەری تەوژمی ئەو لێشاوەی تەریقەتە، کە داب و ڕەسمی گوندنشینانی هەڵدەتەکاند. ئەوەی تەریقەتی وەرنەدەگرتو نەدەبوو بە دەروێش، بە هەڵگەڕاوەو گوناحباریان دەزانی. شێخایەتی و بڵاوکردنەوەی تەریقەت لەو چەند ساڵەی دووایی، زۆر زۆر ببوو، لە گوندەکانی ناوچەکە باوباوی تۆبەکردنو دەروێشییە، تەریقەت بازاڕی گەرمە. هەر تەریقەتەی چەند شێخێک و هەر شێخەی چەند غەلیفەو مریدو دەروێشێکی لە خۆی کۆکردۆتەوە. کەم کەس ماوە تۆبەی نەکاتو نەبێتە مریدی شێخێکی تەریقەت، مەگەر چەند کەسێکی کەم، بە هەنجەتی ئەوەی کە ناتوانن ئەو دەستنوێژی تۆبەیە ڕابگرن. تەنانەت نابێ نەزەریش بکەن، هەندێکیش لەوانەی تۆبەیان نەدەکرد، شێخەکان بە شیوعی و مولحیدو مونافیق لە قەڵەمیان دەدان.

هەر کەسێک پەڵپی ئەوەی دەهێنایەوە کە گۆیا تۆبەی پێ ڕاناگیرێو تۆبە

دەشکێنێ، شـێخو غەلیفە یەکسـەر دەیانگوت ئەوە فیتی کوڕەکانی حاجی سـمایلییە، بە خۆیان بێ باوەڕن هیچ، نیوەی خەڵکی ئـەو گوندەو گوندەکانی دەوروبەریشـیان بە خۆیانەوە گومڕا کردووە، ئەوانە بە شەرعی ئیسلام دەبێت سـەریان بپەڕێندرێ. غەلیفـە ماوەیەکە هەرچەند جارێـک هیدۆی دەبینی دەچێتە بن کلێشەی و خۆی لـێ نزیک دەکاتەوە، لە بناگوێی دەخوێنی داوای لـێ دەکات خودا هیدایەتی بدات، بەڵکو تۆبەی بکاتو بگەڕێتەوە. دیارە تا ڕادەیەک کاریگەریی لەسەر دروستکردبوو، کەوتبووە ژێر قورسایی قسەکانی غەلیفـەی، بۆیە هیدۆ نیوە بەڕاسـتی و نیوە بە گاڵتە بە کاکەڕەشـی گوت: ئەرێ ئێمەش بۆ تۆبـەی نەکەینو نەبین بە دەروێـش؟ لەلای کاکەڕەش ئەو داواکارییەی هیدۆی چاوەڕوانکراو بوو، گوتی: ئەتۆ ئامادەیی و تایبەتمەندیی دەروێشـایەتیت بە زیادەوە تێدا هەیـەو کەرایەتییەکەت دەیگەیەنێتێ، هەر دەڵێی خودا لەکاتی دروسـتکردنتدا چەکوچی بۆ دەروێشـایەتی لێداوی! لەو کاتەیدا کاکەڕەش، دەیویست ئەوەی بە هەیدۆ و ئەو چەند جاحێلەی لەوێ بوو، بڵێت «ئێستا وڵات ڕەشەشەوی نەزانییە، لە زانست و شارستانیەت داماڵدراوە، دابونەریتو دەسـتووری خۆیشمان لە دەستداوە، کۆمەڵگا وەک باربەر لە ژێر بـاری نەزانیدا نرکەوناڵەیەتی، لە لایەک سـوخرەو بێـگاری دەرەبەگایەتی و چەوسانەوەمان، لە لایەکی دیکەوە پەتای نەخوێندەواری و سەرباری ئەوانەش، تەریقـەت وەک مۆرانە هەنـاوی کۆمەڵگایان هەلاهەلا کـردووە! بەداخەوە، سـەری گێژمان لەنێو جوغزی ئەو گێژەلوولکە هێندە گێژە سەر دەرنابا و ڕێگا دەرناکا، بەدوای دەریچەشدا ناگەڕێین، نامانەوێ نوێژ بەرەو قیبلەی ڕزگاربوون دابەستین. تاوەکو ئێستاش لەگەڵدا بێت خەڵکانێک هەن لە مابەینی شکـو

یەقین دۆشداماون، ئاگاهیو بوێری ئەوەشیان تێدا نییە لەو کۆتو زنجیرە خۆ ڕاپسکێنن، خاوەنی خۆیان و هەست و نەستی خۆیان بن، ئەو دەست بە کڵاووەگرتنەش ڕۆژ بە ڕۆژ لە سەرکەوتن دوورترمان دەخاتەوەو کۆمەڵگا لە زەلکاوی نەزانیدا نغرۆ دەکات، هەر بۆ ئەوەی لە ژێر پەردەی دڵکوێریدا ماتو سەرگەردان نەمێنین پێویستیمان بە لێگەڕینو بوێرییە، لەسەر شانی هەموومانە بەدوای شوناسی چینایەتیو نەتەوەیی خۆماندا بگەڕێین، کە دەمێکە ونمان کردووە. درێژەی بە قسەکانیدا: خەڵکینە فریوی جادووگەرانەی ئەو شێخانە مەخۆن کە خۆیان لەسەر ئێوەی هەژار بە هەیبەت کردووە، تەسبیحو بەرماڵ و دینو تەریقەتیان وەک پەشتەمارێک بۆ داپۆشینی عەیب و ڕازە پیسەکانیان دەوێ، لە پەنایدا هەرچی نارەوایەتییە دەیکەن، ئەگەر ئێوە پێتان وایە خواپەرستی بێ نیازو نەزەرپاکن، نابێت بکەونە دوای ئەوانەی نان لەسەر کەوری گەوجاندنتان دەخۆن... کورت و کرمانجی، پێیان دەڵێ مرۆڤی وشیار، ئەقر و ماریفەتەکەی ڕێی پێ نادات وەکو کۆیلەیەک دەست و پێی هیچ کەسێک ماچ بکاتو پێڵاوەکانی بلێسێتەوە. شێخەکان ئەوەی پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن بەوەی کە ژیانی دنیا خەراباتە! بۆچی جێی دوو ڕبە گەنم عاردیان لە خوێنی خەرکی وەکینگۆ لەکن بە بەهاترە!؟ ئاخر کێ دیویەتی شێخێک بەش و بایی چەند پشتێکیان زەوی لە دوای خۆی جێ نەهێشتبێ!؟

هیدۆ و ئەو گەنجانەی مەیدانی شاییەکەیان لێ داگیرکرابوو، بەو قسانە ئاسوودەییان بە هەموو گیاندا گوزەری دەکرد، لەوە حاڵی بوون کە لێرە بەئاگابوون تاوانە، دەبێ باجی بۆ بدەی!

ئەو بەخەبەرهێنانەی ڕەعیەتی ڕەشوڕووت لەلایەن کوڕەکانی حاجی

سـمایلی و چەند کەسێکی بوێرو بەئاگای ناوچەکە، ڕۆژ بە ڕۆژ، ورد و درشتی دانە دانەی ئەو قسانە، دەگەیشتەوە بەر گوێی ئاغاو شێخەکان. ئاغاو شێخەکان کاریگەرییان لەسـەر چەنـد مەلایەکی ناوچەکە کردبوو، بـۆ ئەوەی لە کۆڕو بۆنە کۆمەڵایەتییەکان و خوتبەی ڕۆژی هەینی، سـەری زمان و بنی زمانیان هێرشکردنە سـەر کوڕەکانی حاجی سمایل و هاوشـێوەکانیان بوو، دەیانگوت ئەوانە لە دین هەڵگەڕاونەتەوەو کافرو فەرمەسۆنن، نە بە براگەورایەتی ئاغای قایلن و نە باوەڕیان بە تەریقەتو تۆبەکردن هەیە، دەروێشـەکان بە کەمعەقڵ دەزانن، دووعاو نووشـتوویان پێ فرۆفێڵە. تەوقەی لەگەڵ ژنان دەکەنو دەرێن کچی سەرپشـتی لانکێ نابـێ مارە بکرێ، منداری گونـدی هان دەدەن بچنە مەکتەبێو عیلمی شەیتانی فێربن!

لە ناکاو لە دووڕیانێ، تۆپەڵە ڕەشـایەتییەک چاوی هەمووانی بۆ لای خۆی وەرگێـڕا، تەپوتۆزێکی زۆری لە دوای خۆی بە با دەکـرد کاتێک نزیک بوویەوە، پیکەبێکی جەمسـی بوو، خەڵک وەک شـەڵخەی مێشـهەنگوین خۆیان بە یەکتـری هەڵواسـیبوو، بـە جۆرێک نەتدەزانی ئـەو پیکەبـە چ ڕەنگێکە کە دەروێشـەکان سـواری بووینەو خۆیان پێ هەڵواسیووە. شـێخ لە پێشەوە سوار بووەو دەروێش لە دوایە، سـەر چەنچو بۆنیت و لاتەنیشتەکانی دیارنییە، بە هۆی کەڕەسیسـەی دەروێشـان ئاڵای سـەوزی گەورە گەورەی لێو بە ڕیشوو هەڵدراوە، نووسـینو هێماکان گوزارشـتیان لە قەوارەی تەریقەتەکـە و خاوەنەکەی دەکرد، کەزیو پرچی دەروێشـان بەدەم بـاوە لە زکرێکی گەرمدایـە، لەگەڵ ڕاتەکاندنی سـەریان، پرچیان بە بایەکە شـانە دەکردو کەفیان لە لالێو مەییوەو وەک ماست وشـک هەڵاتووە. هەر بە هاتنی ئەو هێزە بە سەرۆکایەتی جەنابی شێخی، ورەی

غەلیفەو دەروێش فەتە پاسـکیلدزی، بەرزبوویەوە، یەک بە خۆیان دەیانهاڕاند! ئەوەش ئاماژە بوو بۆ دڵگەرمییان، چاویان دەسـووڕاند و بە بنی چاوی لە خەڵکی ڕادەمان، دەلعازی[1] هاتنی شـێخ، بوو بە هەواڵێکی گەرمی وا، هەموو ئاوایی خرۆشـاند. ماڵی بووکێ، باب و براگەورەی زاوای، گۆریە و دەستەسـڕ و ئاوێنەی دووڕوو و دێخونیان وەک دەست و دیاری بەسەر ئەوانەدا بەخشییەوە کە بە دوای بووکێـدا چوو بوون. لەو کاتەدا خەڵکی گوندی خەریکی پێچانەوەی ڕەشـماڵ و پاشماوەی شـاییەکە بوون، پیکەبی پڕ دەروێش لە دەوریان سووڕاو ئیستاپێکی وای کرد، دەروێش هەموو بەسـەریەکدا کەوتن، ئەوانەی سەر بۆنیتەکە بە چەند هەنگاوێک لەپێـش پیکەبەکە وەک گرۆرە بەن غل بوونەوە. لەوکاتەی دابەزین، بەس شـێخ دەناسـرایەوە. تۆپەڵی دەروێشـان، بە هۆی خۆڵ و تـۆزی ئەو ڕێگا خۆڵەپۆتەی پێیدا هاتبوون، کوڕی خۆشیان نەیاندەناسینەوە! قیسی[2] دانیان، وەک قوڕیان تێهەڵسـوابێ! هێندێکیان خەریک بـوون تۆزو خۆڵەکە لە خۆیان دەتەکاند، بەڵام شـێخ کە بینی تۆزەکە لەو دەنیشـێ، تێـی ڕاخووڕین: مەکەن هەی بێ ئەقڵـی جاهیلینە! ئەو تۆزە کە لێتان نیشـتووە هەر دنکێکی هەزارو یەک گوناهتان دەسـڕێتەوە، ئەوە خۆڵـی ڕێی تەقواو خواپەرسـتییە پێتانەوە نیشـتووە! شەوی ئەمشـەو لەگەڵ جەددو ئابادم لە خەڵوەتدا بوومە نزام کردووە هەر دەروێشـێک لەو ڕێگایە چ زەحمەتو ئازارێک ببینـێ هەمووی بە تەقوا بۆیان بنووسێ! هەندێکیان، دەیانهولاندو لە عەرزی لەنێو خۆڵ خۆیان دەگەوزاند بـۆ ئەوەی ئەو خۆڵ و تۆزەی لێیان بۆتەوە، لێیان بنیشـێتەوە! خەڵکی ئاواییش،

---

١. دەلعازی: دەلحازی، دەرلەحزە، دەمودەست. وشەکە لە بنەڕتدا (در لحظه)ی فارسییە.

٢. قیسی: هەتتا، تەنانەت.

هەر بابا بوو لە ســـەر دیواری حەسارەکان و لاکۆڵانەکان هەواڵی هاتنی تەشریفی شـــێخیان بە گوێی یەکتریدا دەدا. گوند، کشـــومات نە ڕەشماڵ و نە شایی و دۆڵ و زوڕنا ئاســـەواریان لـــێ بەجێ نەماوە، ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچێ، ئێوارەی ڕۆژی هەینییـــە، لە پێش ماڵـــی حاجی ئەحمەدی عەوڵ چینکـــۆی، لبادێک و چەند بالیفێک بۆ شـــێخی دانراوە، جامێکی فافۆنی پڕ لە ئاویان بۆ شـــێخی هێنا، لە دوای چەند بسمیللایەک ئاوەکەی خواردەوە، جامەکە زۆری ئاو تێدا مابوو فەتە پاســـکیلدز جامەکەی وەک غەنیمەتێک بەدەســـتەوە بوو، بۆ ئەوەی پاشماوەی شـــێخی بخواتەوە، لە کاتێک دەروێش عەولا دەلوو خۆی خۆشکردبوو پاشماوەی ئاوەکە بخواتەوە، هەریەکەو لایەکی جامەکەیان بەدەســـتەوەبوو چاویان لە یەکتر سوور دەکردەوە بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی دەستی لە جامەکە بەربدا، لەو کاتە لەو کێشمەکێشە ئاوەکەیان لە دەست ڕژاو بەشەڕ هاتن، شێخ تێیرا خوڕین متەقیان نەکرد، لـێ لە بنەوەڕا مۆڕەیان لێک دەکرد. لەو ڕۆژەوە دەروێش فەتە پاسکیلدزو دەروێش عەولا دەلوو ببوونە قانڕی[1] یەکتری، شێخ نەدەبوو لێیان خافڵ بێت. چونکە بەرانگژی یەکتر دەبوون و یەخەی یەکتریان دەگرت. هەندێ بڵێی یەک و دوو خەڵکێکی زۆر لە شێخی کۆبوونەوە، بە تایبەتی ئەوانەی منداڵی نەخۆشیان هەبوو، یان خەڵکیان بە گرانەتاو نەخۆشییەکانی دیکە کەوتبوو، ژنی ئاوا هەبوو منداڵەکەی لەســـەر دەستی بوو، دەیگوت یا شێخ بەڵکو تفی لە زاری بکەی بۆ ئەوەی شـــەوان بخەوێ، منداڵ هەبوو قەبز بوو، هەبوو میزی گیرابوو بە باشـــی میزی بۆ نەدەکرا. بەجۆرێک خەڵک لە نۆرەی ڕاوەســـتا بوون بۆ ئەوەی هەریەکەو

---

١. قانڕ: دژ بە یەکتری، دژبەر، دوو کەس یان دوو گیاندار غەرەز لەیەکتری هەڵدەگرن و درێژەی پێدەدەن.

تفێکیان بەربکـەوێ، ژن هەبوو منداڵی نەدەبوو تیلمە پشـتێنێکی پێ دەدرا، تاوای لێهات شـێخ بێزار بوو نە تفی لە زاری ماو نە پشـتێنی بە پشتییەوە ما هێنـدەی وەک متفەرک لە پشـتێنەکەی بکەنەوە، خەڵکی ئـاوا هەبوو تەنها خوڵی بن پێڵاوەکانی دەبرد. ئایشەشـەنگ بەر لە چوار ساڵ مێردەکەی لە کاتی بیرلێـدان لە یادی چووبوو مەنجەڵە بچووکەکە بکاتە سـەری، شـۆڕبوبۆوە نێو بیرێ، بەردێکی بەسـەردا کەوتبوو گیانی لەدەستدا بوو، ئایشەشەنگ بەو جۆرە ببووە بێوەژن، بەڵام هەر لە یەکەم سـاڵ، تازییەی ڕەواندبوویەوە، دەست و پەنجەو پێـی لە خەنەی دەنا، خۆی نوێ کردبوویەوە، دڵتەڕ بوو، بەخۆیدا دەهات و دەچوو خۆی تاسولووس دەدا، لە گوندی ئەگەر یەکێک زۆری خۆ شۆردبا دەیانگوت بووی بە ئایشەشەنگ ڕۆژێ دووجار خۆت لەبەر ئاوێ دەنێی و ناهێڵی سەرشۆرک بەر کەس بکەوێ! دەیانگوت سـوێندی بخۆی ئایشەشەنگ بیست و چوار سەعات کەزی تەڕە هێندەی خۆی بشـوات، سوێندت لـێ ناکەوێ! ئەو بابانکۆرە دەڵێی سـۆنەیە بۆ ئاوێ! بۆنـی خەناوکەی قەنەفرو مێخەکبەنـدی، کۆڵانی پڕ دەکردو خەڵکـی مەندەهۆش دەکـرد. جارێک لە گوندی، منداڵێک پـارەی دیتبۆوە کە بۆنی قەنەفرو گوڵاوی لێهاتبوو، یەکسەر بانگی کوڕەکەی ئایشەشەنگێی کردبوو پارەکەی لە دەستی نابوو، ئەویش گوتبووی ئەو پارەیە چییە، منداڵەکە گوتبووی ئـەوە پارەی داکتە لێی کەوتـووە، ئەویش گوتبووی چۆن دەزانـی ئەو پارەیە ئی داکمە؟ منداڵەکـە گوتبووی ئەوە نییە بۆنی دایکتی لێدێت! پارەی داکت نەبێ پارەی کەس لە گوندی بۆنی مێخەکـو گوراوی لـێ نایە!

ئایشـە شـەنگ بە شـێخی گوت: یا شـێخ بە قوربانی جەددو ئابادت بم چارەیەکم بکە، ئەو کوڕەم شـەوان وڕێنەی دەکاتو قسان دەبزوڕکێنێ، بۆ بەیانی

دەڵێ دایە ئەو پیاوە کێیە شەوان لەگەڵ تۆدا دەخەوێ؟ ناچارم دەستی بەسەریدا دێنمو بســـمیللا دەکەم و چەند ئایەتەلکورسی بەسەردا دەخوێنم، کەچی شەوی دواتر دیســـان قسان دەبزوڕکێنێ. ئەو ڕۆژە، نازانم ئەو تەسبیحەی لە کوێ دەست کەوتبـــوو بۆ ئـــەوەی دڵنیام بکات کە درۆ ناکات گوتی دایە ئەو تەســـبیحەم لە گیرفانی ئەو پیاوە دەرهێنا کە شـــەوێ شەروارەکەی داکەندبوو لەگەڵ تۆ خەوتبوو بۆ ئەوەی دڵنیابی درۆ ناکەم. دەڵێی جندۆکە دەســـتیان لـــێ وەشاندووە، دەترسم تووشـــی پەندێکم بکات، بۆ ئەوەی حاڵی لـــەوەی خراپتر نەبێت بە قوربانت بم یا شێخ نوشتووێکی بۆ بکە. شێخیش کشتەکێکی بە دەزووی ڕەش و سپی بۆ کرد بە ڕەشبەڵەک، نوشتووێکیشی لە کاغەزێکی باریکـو درێژ بۆ نووسی، نووسینەکە هەمـــووی پیتی لە پاڵیەک هەڵوەشـــاو بوو، تەنها پیتی کـــوردی نەبوون، هەتا وەکـــو خوارەوەی کاغەزەکە پیتەکان ڕیزکرابوون، لامی وا هەبوو کەوتبوویە ســـەر تەنیشت، نوون هەبوو سەرمە قولاتی لـــێدابوو کەوتبوویە سەردەم، سین هەبوو لە پاو ڕوو کەوتبوو کەسێک نەبوو ڕاستی بکاتەوە، میم هەبوو ماری لە گەردنی هاڵابوو، هەندێک ژمارەو ســـەری مارو پەنجەرە هەتا خوارەوەی پارچە کاغەزەکە، دەتگوت دێوجامەی[١] ڕاوەکەوێیە، لە خەتی بزماری دەچوو، شـــێخ نەیدەتوانی

١. دێوجامە: پارچەپەڕۆکێکی ڕەنگاوڕەنگە، نزیکەی مەترێک بەرز و پانیەکەی باڵەزەلامێک دەبێت. لە هەردوو لای ڕاست و چەپ دوو دار بە باری بەرزییەوە لێدەبەسترێت و دەچەقێندرێت. لە نێوەڕاستەکەی، کونێک هەیە بۆ لوولەی تاپڕ. کەوڵەڕێویی بەسەرەوە دوراوە. وێنەی مار و پشیلە و ئەو گیاندارانەی کەو لێیان دەترسێ، کێشراوە. کاتێک کەو ئەو دێوجامەیە دەبینن، لەجیاتیی بفڕن و خۆیان دەربازکەن، کەچی کۆدەبنەوەو دەجغێنن، لەوکاتەدا ڕاوچی لە کونەکەوە سێرەیان لێدەگرێت و ڕاویان دەکات. جغەجغ: دەنگێکی نائاساییە، لە حاڵەتی ترس و شەڕو بەرەنگاربوونەوەدا لە کەو دەردەچێت.

وەک خۆی دووبارەیان بکاتەوە. بەجۆرێک قرشەشکێنی کردبوو وەک نووسراوێک بێتو لە قیمەکێش درا بێت، هەندێک پیتی ئینگلیزی بەگەڵ ئەو حەشاماتەی کەوتبوون هیچ ئەسڵ و فەسڵیان دیار نەبوو، چەنگێک بۆرو ئاماژەی پرسیارو خاڵ و هێمای سەرسوڕمانی بەسەردا پرژاندبوو، وەک کونجی بە کولێرەیدا بکەی هەر بابایە جێگای خۆی کردبوویەوە.

وێنەی هەردوو چاوی ئایشەشــەنگێی لە کۆتایی نووشــتوەکە کێشابوویەوە. شێخ بە ئایشەشــەنگێ دەڵێ: ئەو کشتەکەی[١] لە باسکی کوڕەکەت ببەستەو تا ســەر زەنگەی بێت. ئەو نووشتووە قەزمەنووشــتیەش[٢] لە شەمێی بگرە بە کوتاڵێکــی بەکارنەهاتوو بەرگی بکە، بە دەزووی ســپی بیدورە بەدەســتێکی بە دەستنوێژ لە ئاوێی هەڵکێشــە ئاوەکەی دەرخوارد بدە. نوشتووەکەی لە قۆرنجی لای چەپــی بدوورە، بە هیمەتی جەددی باپیرم شــەوان تــا بەیانی دەخەوێ، گای لە دیار بگرووی بە ئاگا نایەتەوە. شــێخ هێندە خــراپ نەپێچراوەتەوە نەزانێ چ باســە! ناڕاستەوخۆ بە ئایشێی گوت: شەوان کێشەت بۆ دروست ناکات دڵنیابە! ئایشەشــەنگ دەڵێ یا شێخ ئەو نووشتوو و کشتەکە سەر قەڵەمانەکەی چەندە؟ شێخ دەڵێ فرووجێکی ڕەشی بێ نیشان، هەر ئێستا کە چویەوە ماڵێ، بۆم سەربڕەو بە چەلاوی خۆی لێی بنێ، لەگەڵ پلاوســاواری بە ڕۆنی زەنگ، بۆ نانی شێوان دێم بۆ ماڵەکەت. هەر بۆ ئەوەی بەرەکەت بڕژێنمە ناو ماڵەکەت لەلای تۆ نان دەخۆم.

---

١. کشتەک: دوو داوەدەزووی ڕەش و سپییە، شێخ بە دەم بادانەوە دوعای لێدەخوێنێ. هەرچەندە کشتەک و نوشتوو لێک جیاوازن، بەڵام دایم پێکەوە ناویان دێ و دەگوترێ: نوشتە و گشتەک.

٢. قەزمەنوشتی: نوشتەی سێگۆشەکراو.

ناچمە ماڵــە دەوڵەمەندەکان، بۆیـــە دێمە ماڵی بێوەژنێــک دەمەوێ ئیکراهی نەفس بکەم و دەســـت بەســـەری منداڵی بێ داک و بابدا بێنم. ئایشەشەنگ بە پەلەو بە هەرەداوان دەگەڕێتەوە ماڕێ، هەندێ بڵێی یەک و دوو هەمووو خەڵکی گوندی تێدەگەیەنێ کەوا شـــێخ بە هەمـــوو گەورەیی و عەزەمەتی خۆی، بۆ نانی هێوارێ دێتە ماڵی ئەوان، ئەو هاتنەش دەبێتە پاڵپشتێکی کۆمەڵایەتی بۆ پاکی ئایشەشەنگ. مریدەکان، هەر بابایە دەڵێ ئەوە شێخە، بەو زاتە دەڵێن شێخ، لەو هەموو ماڵە دەوڵەمەندەی گوندی ناچێتە ماڵی کەس و، هەر بۆ ئیکراهی نەفس دەچێت لە ماڵی بێوەژنێک و منداڵێکی هەتیو نانی دەخوا، ئەوەیە خۆشەویستی بۆ منداڵێکی هەتیو دەســـت بەسەریاندا دەهێنێ. شـــێخ، بەرلەوەی بەرەو ماڵی ئایشەشەنگێ بکەویتە ڕێ، دەروێشەکان دادەمەزرێنێ بۆ نانخواردن. شێخ بانگی حاجی ئەحمەدی عەولا چینکۆی دەکاتو پێیدەڵێ نان و شـــێوت ســـازکردووە بۆ دەروێشەکانم؟ ئەویش دەست لەسەر سینگ دەڵێ بەڵێ یا شێخ یەک مەنجەڵی زنجیردار ماشێنەمان لەسەر ئاگرییەو چوار ژنیش نانی گەرمیان بۆ دەکەن. شێخ دەڵێ دەبێ دەروێشەکانم تێربن ئەمشەو کۆڕی زکر زۆر گەرم دەکەین، چونکە ئەو گوناهـــە گەورەی لەو دوو ڕۆژە لەو گوندەدا کـــراوە، لەلایەن دۆڵەنگێو و زوڕناژەنو ئەوانەی شایی ڕەشـــبەڵەکیان کردووە، بە زکرێکی گەرمی وا نەبێ گەرمی بگاتە حەوت تەبەقەی ئاســـمانێ، ئەو گوناحە ناشۆرێتەوە! گوناحەکە هێندە کەبیرەیە، هەموو گوندی غەرقی گومڕایی کردییە، بە هەوەنتە پاک نابێتەوە!

شـــێخ دوو دەروێش لەگەڵ خـــۆی دەبات بۆ ماڵی ئایشەشـــەنگێ، یەکیان دەروێش عەولا دەلوو کە هێشـــتا ئاسەواری شێتبوونەکەی پێوەماوە، کڵاوێکی لەسەریە، نوشتووی هەموو شێخو مەلای ناوچەکەی پێوە دووراوە، بەجۆرێک،

ڕەنگی خۆی تێدا ون بووە. کڵاو و شانو پیلی، هێندەی نوشتوو و کشتەک پێوە هەڵواسراوە بە دەردی داری سەرچاکانیان بردووە! دەروێشەکەی دیکە، دەروێش بیلالـە کە چاوێکی کوێرەو گوێیەکانی هیچ نابیستێ، تۆپی لە بناگوێی بتەقێنە گوێی لێدەبێت و نابێت! هەردووکیان بەجۆرێک ئەمبەرئەوبەری دەرگای حەساری ماڵی ئایشەشەنگی دەگرن بە شمشێرەوە، وەک پاسەوانی دەرگای کۆشکی پاشاین بن، بەبێ ئاگاداری شێخی ڕێگا بە کەس نادەن بچێتە ژۆرێ. هەرچەندە ئایشەشەنگ فەرمووی کردنێ بۆ ئەوەی بێنە ژۆرێ، هەر نا بێنە حەسارێ. وەلێ بێسوود بوو، شێخ گوتی لێیان گەڕێ شوێنی خۆیان دەزانن کوێیە! ئایشەشەنگ دەرگای ژوورەکەی خستۆتە سەرپشت، شێخ داوو و تەشکەری خۆی هەڵدەکات و بەدەم بسمیللا بسمیللا وە ژۆرێ کەت. بۆنی بخوورو گوڵاوپرژێنی ژوورەوە مرۆڤی مەندەهۆش دەکات، دوو دۆشەکی لەسەر یەک بۆ جەنابی شێخی ڕاخستووە، سێ لای بە بالیف هەڵچنیوە تەنها لای پێشەوەی کراوەیە، دیوارەکان چەند پەردەیەکی سپی نەخشێندراوی دەستچنی پێ هەڵواسراوە، لە وێنەکاندا کۆتر دەندووکیان لەناو یەک ناوە بە ئاماژەی عەشقێکی ئاگرین، وێنەی چەند دڵێکی ئەنگاوتە بە تیری سەر بە قولاب و سەرکردنی خوێنێکی سوور دڵۆپ دڵۆپ، وێنەیەکی کیژی کافرۆشی لە لای چەپی دیوارەکە هەڵواسراوە، ئاوێنەی قەد دیوار، کاتێک ئایشەشەنگ ئاو بۆ شێخی دەهێنێ، یان دەستشۆرو پەشتەمارو مەسینە، یان هەر شتێکی دیکـە، بەلای ئاوێنەکەدا ڕەت دەبێت بۆ چەند جار لە ئاوێنەکە سەیری خۆی دەکات، بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ دەبێتە جێگای سەرنجی شێخی. دووبارە دەچێتە بەردەرگای حەساریو داوا لە دەروێشەکان دەکات بێنە ژوورێ، ئەوان پێیدەڵێن

دڵنیابــە ئێمە نایەینــە ژووریّ، چونکە ئێمە زاتی ئەوەمــان نییە لە حزووری شێخی خۆمان دابنیشین، بە هۆی گەرمیو شەوقی نووری نێوچاوانی، بەرگەی تێڕوانین و نزیکبوونەوەی ناگرین! شــێخ ســەرنجی دەکەوێتە سەر ئەو کل و کلدانەی لەسەر ســندووقە بۆراقەکە دانراوە، بە ئایشەشەنگ دەڵێ دیارە کلی ســوبحانی لە چاوت دەکەی؟ ئایشەشەنگ بە نازو خۆبادانێکەوە دەڵێ: بەڵێ. شــێخ دەڵێ چاوڕشتن بە کل سووننەتە، وەرە هەندێک کلم لە چاوان بکە. خۆی پشتەوشــکێن کردەوە بۆ سەر بالیفەکان، ئایشەشەنگ بەدەم بسمیللا بسمیللا بە دەســتی من نەبێ بە دەستی ئایشەو فاتمان بێ، چاوی شێخی پڕ کل کرد. ئایشەشــەنگ بە هەموو بوونییەوە بە بینینی چاوەژێر پیاڵەییەکانی شــێخی حەزێک لە گیانی دەگەڕا کە لە قووڵایی چاوەکانی شێخیشدا هەبوو، سێنیەک خواردنی لە پێش شــێخی دانا، بریتی بوو لە پڵاوســاواری بــە ڕۆنی زەنگ و گۆشــتی فرووجەکەی بە تەواوی چەلاو و چەند چلە تەڕەپیازێکو ماســتاوی سەر بە کورک، شــێخ نەیدەزانی لە ئاکاری مێیانەی ئایشەشەنگ بڕوانێ یان لەو خواردنە بە چێژەی کە بۆ کەم کەس ئامادە دەکرێ. شــێخی بێچارە، ئەگەر لە ترسی قســەی خەڵک نەبوایە خۆی ڕەها دەکرد لە دەست شێخایەتی و ئەو جلوبەرگەی کە ساڵەهایە بۆتە ڕازپۆشی، فڕێدەدا. ڕەفتاری مێیانەو ورووژێنەری ئایشــە شەنگێ، ئۆقرەی لەبەر بڕیبوو، بۆ ســێیەم جار ئایش گوتی فەرموو یا شێخ نان و چێشتەکە ســارد دەبێتەوە. کوڕە دوازدە ساڵانەکەی ئایشەشەنگێ، بەرامبەری شــێخی دانیشــتبوو بە ئومێدی ئەوەی هەرچی زووە شێخ دەست بکێشــێتەوە، سێنییەکە بۆ خۆی بەرێتە ئەولاو لە بەرماوەی شێخی تێر بخوا. بەردەوام دووعای دەکرد شێخ لەبەری بمێنێتەوە. شێخ دەستی کرد بە نانخواردن

بە بســـمیللاوە هەرچەند پارووی بادەدا، چەند جارێـــک لە بنی لەنگەریەکەی دەســـوو بۆ ئەوەی تا دەیگەیەنێتە ناو زاری دەنکە ســـاواری لـــێ هەڵنەوەرێ. بەدەم گووشـــینی پاروەوە، ڕۆنی زەنگ لە قامکە چووکەی دەتکایەوە. کوڕەکەی ئایشەشەنگێ بەجۆرێک سەیری پارووەکانی شێخی دەکرد، خەریک بوو بۆ ئەو خواردنە بەچێژە سوێی ببێتەوە. لە خەیاڵی ئەوەدا بوو ئاخۆ شێخ کەی دەست لە خواردن دەکێشێتەوەو چەندی لەبەر دەمێنێتەوە، چونکە ئەوەی هەیە هەمووی لە پێش شـــێخی داندراوەو هیچی دیکە شـــک نابات زگی برســـی تێر بکات. لەگەڵ هەر پاروویێکی کە شێخ بۆ زاری دەبرد منداڵەکە خۆی بەرز دەکردەوە بۆ ئەوەی سەرنجی لەنگەرییە پڵاوەکە بدات، بزانێ زۆری تێدا ماوەتەوە، کە شێخ پاروەکەی دەخســـتە نێو دەوی و قووتی دەدا، مندارەکەش خیزی[١] و ئاوی ناو زاری لەگەڵ قووتدانی پارووی شـــێخی قووت دەدا. ئایشەشەنگ کاتێک بینی کوڕەکەی ئاوا ســـەرنجی لەسەر پارووەکانی شـــێخییە، گوتی ڕۆڵە ئەوە بۆ ئاوا سەیری یا شێخی دەکەی؟ دەڵێی پاروەکانی دەژمێری، شێخ لە خواردنی دواین پاروویدا بوو، گوتی ئایشـــەخان ئەوە تەماشـــای پارووە نانەکان ناکات، سەیری ئەو نقێمانەی سەر ئەنگوستیلەکانم دەکات کە هەریەکەیان گەوهەرو مرواری تاقانەن، هەمیشـــە دەدرەوشێنەوە. هەرکەسێک سەیریان بکات چاوی پێی تیژ دەبێتو بینایی ڕۆشـــن دەکاتەوە، چیرۆکی ئەو نقێمانە، بۆ خۆی داســـتانێکە، یەکەمیان لە بەســـرایێ کاتێـــک دەچووینە زیارەتی ماڵی خـــودا بۆ حەجێ، متەســـەڕفی بەســـرایێ کوڕەکەی باری دەروونی تێکچوو بوو، کاتێک زانییان

---

١. خیزی: لیکی نێو زار. کاتێک خواردنێکی خۆش لەبەرچاو دەخورێت، نێو زار ئاودەکات و لیکی تێدا کۆدەبێتەوە.

ئەمن لەگەڵ ئەو کاروانە حاجیەم بەرەو ماڵی خودا، متەسەرف لەگەڵ چەند ئەفسەری پایە بڵندو چەند پۆلیسێک هاتن بۆ شوێنی مانەوەمان، کەوتنە تکاکردن ئەو کوڕەی بۆ چاک بکەمەوە، کوڕەکەیان هێنا بەردەمم دایاننا، ئەمنیش هەندێک دوعای تایبەتیم بۆ خوێند، داوام لە جەددی باپیرم کرد یارمەتیم بدات، ئاخر باپیرم جارێک تووڕەی دەکەن ئەویش پیاڵەی چای لە پێش دەبێ لە ڕقان پیاڵە پڕ لە چایەکە هەڵدەداتە بن میچی خانووەکەو نەعرەتەی لێدەدا، پیاڵە بە پڕ چاوە دێتەوە سەر ژێر پیاڵەکە، باپیرم پێی گوتم بڕۆ ژێر دەریا نەهەنگێک لەژێر دەریایە گەوهەرێکی مرواری تاقانەی لەناو زگیدایە، ئەو گەوهەرە مرواریيە دەربێنە، ئەو کوڕە چاک دەبێتەوەو تەلیسمەکە بەتاڵ دەبێت و جندەکان چیدیکە زەفەری پێ نابەن. ئەمنیش شمشێرەکەم هەڵگرت و ویستم بڕۆم پێیان گوتم یا شێخ ئەوە بۆ کوێ؟ گوتم دەستنوێژ دەشۆم ئێستا دێمەوە، گوتیان ئەوە چامان بۆ داناوی سارد دەبێتەوە. کاتێک بە خۆم نەزانیبوو باڵم گرتبوو لەسەر دەریا بووم، خۆم نقومی ژێر دەریا کرد، قەدەرێک بوو بەدوای نەهەنگەکەدا دەگەڕام لە کۆتاییدا دیتمەوە، هاواری کرد: ئەی بەنی ئادەم! هەرچی بێتە ئەو شوێنە گیانی سالم دەرنابا! ئەمنیش نەعرەتەم لێدا، کەوتینە بەرامبەری یەکتری، زاری هێندە گەورە بوو بە ئاسانی ئەو گوندەی بە زەلام و گاو گۆلکو مەڕوماڵاتەوە قووت دەدا!

ئایشەشەنگ چاوی لە چاوە پڕ کلەکانی شێخی بڕیبوو، جارجار دەیگوت ئەە بە قوربانی جەدت بم!

ناچاربووم ئەوسەر ئەوسەری شمشێرەکەم گرتو چوومە نێو زاری، دەستی بە قووتدانم کرد، هەتاوەکو زیاتر قووتی دەدام بەو شمشێرەم دەبوو بە دوولەت

تاوەکو لە کلکی دەرچووم، ئەو نقێمە گەوهەرە تاقانەیەی دەبینی لە بن پەڕەی دڵی نەهەنگەکە دەرمهێنا. کاتێک گەڕامەوە لای مەتەسەڕفو ئەفسەرەکان و حەجاجەکان، ئەو چایەی لە پێش مەتەسەرفی بوو هێشتا هەڵمی لێهەڵدەستا، سارد نەبووبوویەوە. ڕیشم ئاوی دەریای لێ دەتکایەوە! هەموویان سەرسام بوونو دەیانگوت چ زوو دەستنوێژت شووشت! بێئاگا لەوەی قەدەرێکە لە بنی دەریای شەڕی گەورەترین نەهەنگم کردووە. دەستێکم بەسەری کوڕی مەتەسەڕفی داهێناو هەستایەوە سەرپێ و دەستی ماچ کردم. لەو کاتەی ئێمە مەتەسەڕف و پۆلیسەکانمان بەڕێ دەکرد چەند دەریاوانو ماسیگرێک بە هەرەداوان هاتنە لای مەتەسەڕفی پێیان گوت: گەورەم دەریا ڕەنگی ئاوەکەی سوور سوورە بۆتە خوێن، توومەز خوێنی ئەو نەهەنگە مەلعوونەی بوو کە من کوشتبووم. بۆیە گوتم بگەڕێنەوە لای خوای ئاوەکە ڕوون دەبێتەوە.

نقێمی دووەم، ئەو ڕەشەیان لە ئەستەمبۆڵێ بووم، کاتێک والی هاتە شوێنی حەوانەوەم، نازانم چۆنی زانیبوو من چووم بۆ ئەستەمبوڵ. هات و گوتی دەستم داوێنت یا شێخ ئەتۆم لە ئاسمانان دەویست ئێستا لە ئەرزیم بەدەست کەوتووی. گوتم پێم بڵێ داواکاری و کێشەت چییە؟ والی خۆی هاوێشتە سەر پێڵاوەکانم و گوتی یا شێخ چۆنت بۆ دەگێڕمەوە ئاوایە. ژنەکەم کاتێک لەسەر لێواری حەوزی باخەکەم جلوبەرگی خۆی دادەکەنێ و دەچێتە ناو حەوزەکەی بۆ مەلەکردنێ، قەلەڕەشێک لەسەر جلەکانی دەنیشێتەوە، لە گیرفانی فستانەکەی یاقوت و مرواری ڕەشی تێدابووە، قەلەکە دەریهێناوەو قووتی داوە، لەوکاتیەوە ئێمە هەر قەلەڕەشێک دەکوژین، سیقەدانەو ناو هەناوی دەگەڕێین هیچیان ئەو قەلەی گۆڕین نین، دەستم دامێنت ئەگەر وا بڕوات

ژنەکەم لەدەســت دەدەم، بەڵێن بێت هەر کاتێک دۆزیتەوە یاقوتێکی ڕەشــی بۆ خۆت لــێ هەڵگرە. ئەمنیش لە ژوورێکی تاریک، هەندێک خروەم کێشاو مناجاتم کرد چاوم لەسەریەک دانان، دۆزیمەوە. پێم گوتن ئەو قەلەڕەشە چۆتە چیای قافێ، ڕۆژێ سێ جاران لەسەر قوللەی قاف جیقنە دەکات، قەلەڕەشێکی نێرەیە خاڵێکی سـپی بە قەدەر نیو لیرەیەک لەســەر تەپڵی سەرییە، ئاوا بە ئاســانی نایگەمێ، مەگەر، سیمرغێک هەیە ساڵی یەکجار دێتە دەرێ دەبێت مســەخەری بکەم بە سواری ئەو ســیمرغەی بگەمە قوللەی قاف، قەلەکەی بکوژمو یاقوتەکەی لە سیقەدانەی دەربێنم ئەوجا ژنەکەت چاک دەبێتەوە!

لەوکاتەی ئایشەشــەنگ هەموو ئەندامەکانی جەستەی ببوون بە گوێ بۆ ئەوەی بزانێ چۆنو لە کوێ جەنابی شــێخ ئەو ســیمرغە مسەخەر دەکاتو بە چەند قۆناغەرێ دەگاتە قوللەی قافو قەلەڕەشــەکە ڕاو دەکاتو ئەو یاقوت و مروارییە ڕەشە لە سیقەدانەی قەلەڕەشەکەی دەردێنێ و ژنی والی ئەستەمبوڵ چاک دەبێتــەوە. لەلایەکــی دیکە کەوتبــووە ژێر هەســتێکی ورووژێنەری ئارەزووەکانی لە ئاکامی ئەو تێڕوانینە قووڵە ناوەخندارەی شــێخی بۆ گەردنو ســینگو مەمکو بەلەکو پووزی وەک تووری تەڕ، ژیان بۆ ئەوان ببووە ئەو چرکە ســاتە داخراوە کە نیگاکانیان لە پێڵووی چاوی یەکتردا وردوخاش دەکرد. گرمەو شــەقوهۆری ئەو هیربارانەی[1] ئایشەشەنگ لە دوای نانخواردن لەبەر دەرگای داینابوون بۆ شــۆردن، قسەو ڕستەکانی وەک مقەس بڕین. چۆڕاوگەی شیلەی هەنگوین ئاسای تێڕامانەکانیانی قوت کرد. ڕاپەڕین بۆ ئەوەی بزانن لە

١. هیربار: هەوڕ و ئامان، قاپ و کەوچک و مەنجەڵ و... کە لە فافۆن و مس دروست کرابن.

دەرێ چ ڕوویدا، بینییان دەروێش بیلالە کوێر لەنێو قاپ و سێنی و هیربارەکان کەوتۆتە سـەر گازەڕەی پشـتێ، توومەز لەوکاتەی دەروێشێک هاتووە لەلایەن غەلیفەوە نێردراوە بە شـێخ بڵـێ دەمێکە ئەو خەڵکە ئامـادەی زکرو جەزم بوونن، چاوەڕوانی جەنابی شـێخی دەکەن، دەروێـش بیلالە کوێریش گوتوویە لێرە بوەسـتە لەلای دەروێش عەوڵا دەلووی، بۆ خۆم شێخی ئاگادار دەکەمەوە، ئەویش بە قسـەی دەکات. دیارە دەروێش بیلالە کوێـر وەک چۆن ڕاهێندراوە نابێت ڕوویەڕوو بۆ حزوری جەنابی شـێخی بڕوات، پاشەو پاش کشاوەتەوەو لە کاتێک بەلای چـاوە کوێرەکەیدا قوناوقون کەوتۆتە نێو ئـەو هیربارو قاپ و قاچاغەی بۆ شـۆردن دانراوە، ئایشەشـەنگ قیتی دەکاتەوە، هەر پاشەوپاش پەیامەکە بە شـێخی ڕادەگەیێنێ، شـێخ دەڵێ دەکو ملت بشکێ و چاوەکەی دیکەشت کۆرە بێت وەکو ئەو هەموو هیربارەت قووپاندەوە. بڕۆن بە غەلیفەی برێن زکرەکەی دابەسـتێ، بۆ هێندە لە مەرامی شـێخی خۆتان بێ خەبەرن، ئەمـن بەبێ حیکمەت نییە لە ماری ئەو هەتیوەی ماومەوە، ئەو ژنە جادووی ڕەشی لێکرایە دەبێت نوشتوو و دووعایەکی تایبەتی بە دڵی خۆمی لۆ بکەم، ئەو دوعایە لە ڕووناکی بەتار دەبتەوە، ئێسـتا خەریکـە مانگ خۆی لە پەنا بـداتو ئاوابێت، ئەو کات فانۆسـەکە دەبێ بکوژێتـەوە. بۆئەوەی بەتاریکی (دوعای گرێچنی) لۆ دەکەم، لە دوایی دێمەوە لای زکرەکە، نەبادا دەروێشـێک بە هۆش خۆی نەیەتەوە. ئایشەشـەنگ لە خەیاڵی دوعای گرێچن کە شـێخ بەڵێنی پێدابوو، هەردەم نا دەم سەری دەبردە دەرێ و دەیگوت مانگ ئاوا بوو، یا شێخ فانۆسی بکوژێنمەوە؟ شێخ گوتی ئەو مندارە با بچێتە لای دەروێشەکانی بەردەرگای، نەبادا پریشکی دوعای گرێچنی بەربکەوێو پێستی ئالوودە بێت،

دوعای گرێچن نابێت کەسـی لە دیار بێت، نەخاسـمە مندار. لە دوای ئەوەی شـێخ دوعایەکی گرێچنی بە دری خۆی بۆ ئایشەشەنگێ کرد، خۆی خڕکردەوە مارئاوایی کرد. دەروێشەکانی بەردەرگای کەوتنە دوای شێخی، دەروێش پڕچیان کردۆتەوە دەنگی دەف و سـەڵاوات دەچێتە پەرپەرۆچکەی ئاسـمانێ، زەرگو شمشـێرو خەنجەریان بەدەستەوە وەک ئامادەکارییەک بۆ گەرمکردنی کۆڕی زکرو جەزم بوون، غرمەی دەروێشـانو دەنگی دەف و زڕەی پڕپڕەو ئاڵقەی دەوری دەففەکان زرینگەی شمشـێرو زەرگ و خرمەخرمی پیاڵە خواردن، دەروێشێک شووشـەی فانۆسـەکەی خوارد، حاوحاو نرکەو نەعرەتەی دەروێشان دەنگێکی سامناکی بەو نێوەی بەخشیبوو.

دەروێش ڕەمەزان، سـاڵێک زیاتر بوو تۆبـەی کردبوو، لە چەندان زکرو کۆڕی دەروێشان بە دەفلێدان بەشـداری کردبوو، دەفێکی گەورەی پێبوو، قایشی ڕاست و چەپـی لە خۆی قایم کردبوو، بە جۆرێک خۆی قایشـپێچ کردبوو، بۆ دەسـت بەئاو گەیاندن کاتی پێویسـت بوو، تاوەکو ئەو هەموو قایشو قرۆشەی لە خۆی دەکاتەوەو پاشان دەیبەستێتەوە. ئەو ئێوارەیەش لە ماڵی حاجی ئەحمەدی عەوڵا چینکۆی، زۆریان ماشێنە خواردبوو، بەرلەوەی کۆڕی زکر زۆر گەرم بێت، دەروێش ڕەمەزان چوو بۆ ئاودەسـتی تەکییەی، بـۆ ئەوەی خۆی خاڵـی بکاتەوە، نەبادا لـە کاتی جەنگەی زکـردا تینی بۆ بێنی. دەفەکەی لە پشـتی خۆی بە دیواری ئاودەستەکە هەڵپەسارد، خۆی خاڵی و ئاسـوودە کرد، قایشوقرۆشی بەستایەوەو ڕۆیشتەوە نێو کۆڕی ڕەفیقانی دەروێشو حزوری شێخی. دەروێش جەزم بوون هەر بابایە خۆیان لێک دەداو ملیان لە یەکتر دەنا، دەروێش ڕەمەزان دەففەی بە پڕپڕەی هەڵدەسـووڕاندو برندو نەوی دەکرد، باڵی پێ گرتبـوو، دەروێش غرمەیان دەکردو

تۆپ دەبوون و لێک براوەبوونو ملیان لە یەکتری دەنا، حاجی ئەحمەدی عەولّا چینکۆی، ئەو ئێوارەیە یەک مەنجەری زنجیرداری ماشێنە بۆ دەروێشان لێنابوو، لەوەی دەترسا ئەگەر دەروێش لە ئەنجامی ئەو حاوحو و هەڵبەزو دابەزو مل بە ملەی یەکتر برسی ببنەوە، رەنگە دووبارە شێخو باوە غەلیفە ئەرکی تێرکردنەوەی دەروێشانی بخەنەوە سەر ئەستۆ، بۆیە لەبەر دەروێشەکان دەپاڕایەوە دەیگوت بیکەنە ڕاهی خودای و خاتری پێغەمبەری، تێروپڕتان خواردییە، خۆتان برسی مەکەنەوە، خوا بەردار نییە، بەو شەوەی کەس نانو شێوی ئەو هەموو دەروێشەی پێ ئامادە ناکرێتەوە، خواردن بەرگەتان ناگرێ!

وشکەسۆفی وا هەبوو، لەسەر خۆڵ مەلەی دەکرد خەبەری لە دەریا نەبووا دەروێش ڕەمەزان دەفەی بە پرپرەی ئەڵقەداری هەڵدەسووڕاندو لێیدەدا ئەمان لێدان! لەوکاتەدا کوڕی زکریان گواستەوە بۆ حەساری تەکییەی کە تۆزێک لێژ بوو، فەتە پاسکیلدز شمشێری لە زگی خۆی دابوو لە تریقەی پشتی دەرچووبوو، دەروێش هەبوو زەرگی لە تەوقی سەری چەقاندبوو، کەسی وا هەبوو دوو زەرگی ڕاست و چەپی لە لغاوەی خۆی دابوو، دووبەدەری کردبوو. شەو ڕاشکا، حاجی ئەحمەدی عەولّا چینکۆی بەس لە خەمی ئەوەیدابوو دەروێش برسی ببنەوەو تێرکردنیان بخەنە سەرشانی وی. فەتە، خوێنی لە برینەکەی دەچۆڕایەوە، شێخ هەندێک خۆڵەپۆتی بەرپێی دەروێشەکانی بە برینەکەی داکردو گوتی: یان ژن سەیری زکرەکەیان کردووە، یان یەکێک قالبی پیسەو غوسلی لەسەرەو غوسلی دەرنەکردووە! سەلیم کە خوارزای حاجی سمایلی بوو، لە سەرەتای زکرەکەوە لەوێ ئامادەبوو، هەرچەندە تۆبەی نەکردبوو، دەمێک بوو ببووە جێگای سەرنج و گرنگی پێدانی غەلیفەی. باوە غەلیفە بە سەلیمی دەڵێ بزانە تێکەڵبوون

لەگەڵ تەریقەت چۆن ڕوحیانەتی مرۆڤەکان دەباتە حەوت تەبەقەی ئاسمانیو کەشکەڵانی فەلەک و لە عەرشی عەزیم نزیکت دەکاتەوە. بە قسەی خەڵکی مولحیدو فەرمەسۆن مەکە، مەبەستی کوڕەکانی حاجی سمایلی بوو، چونکە ئەوانی بە هۆکاری تۆبە نەکردنی سەلیمی دەزانی، زکرەکە بەرەو ساکین بوونو هێوربوونەوە دەچێو دەروێش هەمووی پاڵکەوتوونو لە ماندوویتی دەهێرژێنو کەفیان بە لالغاوەیدا شۆڕبۆتەوە، ئەوەی مل نادات ساکین بێت فەرحانی برادەری سەلیمیە تازە تۆبەی کردووە، دەیەوێت وا لە باوە غەلیفەی بگەیەنێ کە چۆن پاک بۆتەوە لە گوناهانو چەند بە پاکی تەریقەتی وەرگرتووە، ئەحواڵی چەند گەرمە، بەجۆرێک جەزم بووە، بە کەس ساکین نابێت. هەرچەند جارێ دەڵێ حەی حوو، باوە غەلیفەی لەگەڵ خۆی ڕادەماڵی بۆ بەر دەرگای تەکییەی، هەرچەندی دەستی بەسەری دادەهێنێو هاواری شێخی گەورە دەکات دەڵێ ساکین! فەرحان ساکین! لەگەڵ فەرحانی بێ سوودە، چونکە دەیەوێت باوە غەلیفە تێبگەیەنێ کە لە گوناهان پاک بۆتەوە.

سەلیم دەزانێ فەرحان درۆ دەکات، وەک خۆی نیشان دەدات ئاوا دڵگەرم نییە. ئاخر، ڕۆژی پێشی شاییەکە بە یەکەوە چوبوونە کاڵەکو تەرۆزی دزینێ لە بێستانی عەیشەبێوەژنێ. شەوێ بە یەکەوە چوونەتە ژوانی کچان، کێرا بەو دەمودەستەی بوو بە ئیمامی ڕەببانی! سەلیم دەستی وەستایەتیشی هەبوو، زەرگێکی بچووکی دروستکردبوو، بە قەدەر بستێک دەبوو، بەڵام هێندە تیژی کردبوو کەس نەیدەوێرا لەسەر پەنجەی خۆی ڕایبگرێ، لەناو کالانێکی نابوو لەبەر پشتێنی، چووە لای باوە غەلیفەی گوتی باوە غەلیفە بۆ فەرحانی نادەی بە من بۆت ساکین بکەم، ئەمن چاکتر شارەزایمە، ئەتۆی بە هیلاکدا. باوە

غەلیفە پیلی فەرحانی دایە دەست سەلیمی. ئەگەر دوو حاوحووی کرد، سەلیمی ڕەتاند بـۆ خوارێ، ئەویش بە ئەسـپایی زەرگەکەی بەر پشـتی دەرهێناو نووکە زەرگێکی لە گرمتەی سمتی فەرحانی داو گوتی ساکین! هەی دایکەکەت دەگێم! فەرحان، چونکە جەزم نەبووبوو، هەر مەبەستی خۆڵ لەچاوکردنی غەلیفەی بوو، بەشەڕهات لەگەڵ سـەلیمیو هۆشی لەسـەر ئەوەی نەما کە جەزم بووە، خوێن بە لاسـمتو ڕانی فەرحانیدا چۆڕایەوە. سـەلیم لە پەناوە بە باوە خەلیفەی گوت فەرحان هەر بە ڕووکەش تۆبەی کردووەو دەروێشە، دەنا لە هیچ کارێکی ناشەرعی ناپرینگێتەوە. غەلیفە زۆر سوپاسی سـەلیمی کردو گوتی بەس ئەوەندەم لە تۆ دەوێ پێـم بڵێی فەرحانت چۆن سـاکین کرد، ئەمن ئەوە چەند سـاڵە غەلیفەم، نەمتوانی ساکینی بکەم، لە ئێوارەوە هەرچەندی پێی دەڵێم ساکین! بابم ساکین! تەقەی لەسەریەوە نایەو هەر دەڵێی لەگەر ویشم نییە!

لەگەڵ ئەنگوتنی بەیان، بەو سـبەینەی سـاڵحانە هێشتا خێرو شەڕ دابەش نەکراوە، دەروێشـەکان لە تەکیەی بەسەریەکدا ترشاون، بۆن ئارەقەو بۆنی پێڵاوان تێکـەڵاوە. چەند چەکدارێکی میری کە ژمارەیان خۆی لە دە کەسـێک دەدا، لە ژێـر دارتووەکەی حەسـاری تەکیەی بوونە گڕێ و تۆپ بوون، سـەرچەکدارەکان پیاوێکـی ڕەقەڵەی بەژندرێژ بوو، بە ناوی حەماغـا پیاوێکی تێرئاقڵ نەبوو، لە خراپەکاری نەدەپرینگایەوە. دەروێشـەکانی شـێخی و چەکدارەکانی حەماغای تێکەڵاو بوون، وەکو باراشـی مزاشـیان[١] لێهات، بە هۆی ئەو هەموو ڕمبازی و حاوحووی جەزمبوونی شـەوی ڕابردووی دەروێشـەکان، ئەو حەسارە دەتگوت

---

١. مزاش: تێکەڵەیەک بوو لە گەنم و جۆ.

جەنگی مەغلوبـــەی لێکراوە. دارتووەکە چەند پڕیشـــکە خوێن بە قەدەکەیەوە مابوو، پاشـــماوەی ئیستیکان و پەرداخ‌و شووشـــە فانۆسە خوراوەکان، ئەو نێوەی بریســـکرێژکردبوو، کورد گوتەنی: «دەتگوت شـــێتی لـــێ گایـــراوە!» بە هۆی بۆنئارەقەی دەروێشـــان، کەس ناتوانێ سەر بە ژووردا بگرێ، پشتیان سپی بووە. یەک لە خزمەتکارەکانی ڕەفعەت ئاغای هاتە حەساری تەکیەی، بە حەماغاو بە شـــێخی گوت: ئاغام سڵاوی بۆتان هەیە، فەرمووی با تەشریفتان بێتە دیوەخانێ بـــۆ قاوەڵتی نانی بەیانی، بفەرموون بەندە لە خزمەتتانڕا دێم بۆ دیوەخانێ، ئاغام چاوەڕێتان دەکات، قاوەچی قاوەی ئامادەیە. لە دیوەخانێ، ڕەفعەت ئاغا پێشوازی لێکردن، قاوەچی ســـەرو قاوەی تاڵی بۆ لە فینجانی کـــردن‌و لە دوای نانخواردن، لەسەر پرسە گرنگەکانی ڕۆژ کەوتنە قسەکردن، لەکاتی گفتوگۆی بەینی ڕەفعەت ئاغاو شـــێخی، هاتنە سەر باسی ماڵی حاجی سمایل و کوڕەکانی، وەک گەوارەی بەهارێ، ناکرێ ماڵی حاجی ســـمایلی نەگرتەوەو ئەوەنـــدەی بتوانن دامودەزگای حکومەت و خەڵکی کاربەدەســـتیان لـــێ هان بدەن‌و بە مەترسییان بزانن! ئاغا گوتی: کوڕەکانی حاجی ســـمایلی شیوعین، بێدین‌و ئیمانن، خەڵک هان دەدەن لە دژی ئێمە. فێریان دەکەن هیچ جیاوازی نییە لە بەینی کرمانجەکان‌و ئاغاکان، هەردووکمان هەر مرۆڤیـــن. ئاخر لەوەتای دنیا هەیە گـــەورەو بچووکایەتی هەر هەبووەو هەر دەشـــبێ. فێریان دەکەن ســـوخرەو بێگارمان بـــۆ نەکەن، منداڵیان بنێرنە فێربوونی عیلمی شـــەیتانی، بە کوردی دەیانەوێ ڕەوشـــت‌و دین‌و گەورەو گچکایەتی نەهێڵن. بەسەری شـــێخی ئەگەر مشووریان نەخۆین سەو شوانمان دێتەوەو کەرمان بە دەنگی ناڕوا! شێخیش بە نۆرەی خۆی گوتی: ئەوانە مولحیدو گومڕان، ناهێڵن خەڵک تۆبەی بکەن و ببنە دەروێش. کۆســـپەی دروست دەخەنە

بەردمـــی تەریقەتی. لەو ناوچەیە، ئەوانەی تۆبەیان نەکـــردووە، زۆربەیان لە ژێر قسەی کوڕەکانی حاجی سمایلیدان و، نابن بە دەروێش.

ئەو قسانەیان تازە نەبوو، بەڵام ئەوجارە نیازیان ئەوەبوو حەماغای هان بدەن شتێکیان بەرامبـــەر بکات. چونکە تۆزێـــک کەرەپیاو بوو. ئاغاو شـــێخ، زۆر جاری دیکە ئەو باسەیان بە یەکەوە کردبوو، بەس ئەوجارە ئامانجیان لە گەرمکردنەوەی باسەکە ئەوەبوو حەماغاشیان لـــێ هان بدەن. بۆ ئەوەی بەڵکو ئەویش فشارو ترساندنو حکومەتیان لـێ تیژ بکەن. بەڵکو بەچۆکیاندا بێنن و بیانهێننە بن باری خواستەکانی خۆیان، واز لە هاندانی کرمانجان بێننو چاویان نەکەنەوە کە هەقی ڕەعیەت و مسکێنان چییە. حەماغا، هێندە وردو زرنگ نییە هەســـت بەو پڕوپاگەندانە بکات، گوتی: ئێستا کە هاتم بۆ ئێرە، کیژێکی زۆر جوان ڕێشـــمەی ماینەکی کەوێتی قاپڕەشـــی بەدەستەوە بوو، لەســـەر کۆل و بیری ماڵی حاجی ســـمایلی ماینەکەی ئاودەدا، بینیم ڕۆیشتەوە حەساری ماڵی حاجی ســـمایلی، ئەگەر بزانن ئەوە کچیەتی یان بووکیەتی؟ ڕەفعەت ئاغا ئەو قسە تەڕاوزانەی[1] لە خوای دەویست، باسی کچی ماڵێ حاجی سمایلی بە پارەش بایە دەیکڕی. لە کەرێێتی حەماغاشـــی ڕادەبینی بەقسەی بکات، بۆیە گوتی ئەوە نەوەی حاجی سمایلیە، ناوی گوڕێیە ئەمان گوڕێ، چ گوڕێ دەرێی تۆپی گوڕییە، ئەگەر بە تەمای ژنی دیکە بێنی، ئەوا لە کرمانجان لە گوڕێت باشـــتر دەستناکەوی. حەماغـــاش لـــە هەرزەگۆیەکی خێڵەکی زیاتر شـــتێک نەبوو، ئەو داوایەشـــی لەو پاشـــخانە خێڵەکییە ناهۆشیارییە سەرچاوەی گرتبوو، هێندە هۆشیار نەبوو بەراوردی چینایەتیو دژایەتی ماڵی حاجی سمایلی لە دژی چەوسانەوەی دەرەبەگایەتی تاووتوێ

---

١. تەڕاوز: ڕەپستە، دەغڵ و دان کە لەکاتی خۆیدا تۆو نەکرێ. کینایەیە بە قسەی بێ جێ و ڕێ.

بکات. گوریّ کچێکی جوانی سوورو سپی دەتگوت بەفرو خوێنە تێکەڵاو بەیەکتری کراون، مێوژی خواردبا لە گەردنی دیاربوو، تەبەش[1] پان، چاو گەورە، کەزیو پەرچەم شێ، شەوقی چاوەکانی، شەڕی دەگەر ئەستێرەکان دەکرد! گرشەی چەرخەی ڕوومەتە بەرزەکانی سیمای مانگیان تاڵان کردبوو. گوریّ هەر لە ماک و بنچینەدا بەلای سۆزداری و هەستی ئارەزووی مێینانەدا نەدەچوو، وەک لە هەر کچێکی عازەبدا بە ڕێژەی جیاجیا هەیە، هەڵسوکەوتی مێینانەی نەبوو. ئەوەندەی خولیای ماڵداری و کابان چاکی بوو، نیو هێندە لە خۆی نەدەخەفتی، بێ ئەوەی هیچ بەخۆیدا بێت تەنها جوانێکی خۆڕسک بوو، هەر ئەو جوانیەش بۆی ببوو بە بەلا. خەڵکێک داوایان دەکرد، کە ئەو بەس بە ناوهێنانیان قەڵس و تورە دەبوو، ماموژنی زۆرجار پێیدەگوت قوڕ بەسەری ئەو پیاوەی دەبێتە دەستگیرانو مێردی تۆ، بە خوای مریشکەک دانی نەخوات پێت گرنگترە فریای بکەوی، نەک مێردەکەت حەوتوویەک نانی نەخواردبێت بەقەدەر مریشکەکە گرنگی پێ نادەی، کچی خۆم گوتمان کچێکی حەرێم گرانی، بەرام خۆ دەبێت وەکی کچان بڕەک خۆت تیفتیفە بدەی.

ڕەفعەت ئاغا گوتی ئەگەر خۆت ساغکردەوە هەر لەوڕۆ زووتر نییە جەنابی شێخی دەنێرینە داخوازی گوریّ، لە گورێت چاکتر دەست ناکەوێت، کوڕە بە خۆشی نا بە ناخۆشی! حەماغا گوتی باوەڕ ناکەم بەو داوایەم ڕازی بن، کاکە ئەوانە ئاغایان لە ناو زگی بێت خۆ داوێنە ناو بەحریّ! ڕەفعەت، هەر لۆ ئەوەی بوو، بەو داواکارییە ناماقوڵ و لەو ڕێ تێنەچووە، لە پەسا وەکو تیری ژەهراوی داباڕێنێتە سەر غروری کرمانجانەی حاجی سمایل و کوڕەکانی. بە

---

١. تەبەش: توێڵ، تەوێڵ، نێوچاوان.

ئومێدی ئەوەی لەگەڵ حەماغای کە چەکداری هەیەو پیاوی میبریە، دووچاری کێشەیەکیان بکات، هەرچی بیکات لێپێچانەوەی لەلای میری نییە. ڕەفعەت ئاغا دەڵێ: دەبێت مەمنوونیش بن، کەرە کرمانجی کلاش خواری دەست ڕزیو و بێ ئەسڵ و فەسڵ، کەوا نەجیبزادەو ئاغایەکی وەجاغزادەی وەک بەڕێزت بە کچیان ڕازی بیتو ببیە زاوایان!

لە دیوەخانــێ وەدەرکەوتن بۆ ئەوەی حەماغا بچێتــەوە لای چەکدارەکانی و شــێخ بچێتە لای حاجی ســمایلی بۆ جێبەجێکردنی ڕاســپاردەو داواکاری حەماغای بۆ داخوازی گوڕێ. دروســت لەوکاتەدا تیشــکی چاویان لە حاجی سمایلی چەقی، دیتیان لە لای کۆل و بیری خۆی، لاقی شکاوی بزنێک دەگرێتەوە، هەرســێکیان بە یەکەوە گوتیان لەوەی چاکتر نابێت، یا شێخ هەر ئێستا بە بەر گوێی حاجی ســمایلی هەڵبێنەو بزانە تامی زاری کوە! هەر لەوێ هەرسێکیان لە یەکتری جیابوونەوە، حەماغا لۆ لای چەکدارەکانیو ڕەفعەت ئاغا لۆ ژووری دیوەخانێو شێخ بۆ لای حاجی سمایلی. شێخ سەلامی لە حاجی سمایلی کرد، حاجی ســمایل بە گفتولفتێکی زۆر خۆش ســلاوی شێخی ئەستاندەوە: یاخوا بەخێربێیت یا شێخ خێروبەرەکەتت لەگەر خۆت هێنا. هەندێک گلەییو شۆخی تێکەلاو کردو گوتی ئەوەی تۆبەکارو دەروێشو مریدی ئێوە نەبێت سەراسووی ناکەنو ســەردانی ناکەن، خۆ ئێمە ئەگەر تۆبەش نەکەینو نەبینە دەروێشیش دەتوانین میوانداریتان بکەینو نانێکتان بۆ ســاز بکەین، بۆ ئەوەی نمەکمان بکەن و لە نزاکانتان بێبەش نەبین. شــێخ گوتی لەبەر ئیشوکاری موسوڵمانان ســەرقاڵم و دەرفەتم نییە، لەوکاتەدا دوو دەروێشە پاسەوانەکەی شێخی، واتە

عەوڵا دەلوو و بیلالەکوێر لە لای کەروکەی بیرێ[1] بە جووت ڕاست و چەپ ڕاوەستابوون. شێخ گوتی: لاقی بزنەکەت هەڵبەستەوەو ئێستا کارێکم کەوتۆتە لای تۆو داواکاریەکم هەیە، پێویستە بە یەکەوە قسەی لەسەر بکەین. حاجی سمایل لە فکرو خەیاڵی ئەوەدابوو ڕەنگە داوای لێ بکات نانی نیوەڕۆ بۆ دەروێشەکانی ساز بکات، گوتی: ئەمن لە ئیشەکەم بوومەوەو تەواو. هەندێک نانەڕەقەی لە بەردەمی بزنەکە ڕۆکردو دەستی خۆی شووشتەوەو بەرامبەر شێخی ڕاوەستاو گوتی: ناکرێ، ناجایزە لەدەرێ بوەستین، تەشریفت کەرەمکە بفەرموو بچینە ژوورێ. شێخ ئەوەندە بە سادەو کەمبایەخ لەو داوایەی دەڕوانی وەک داوای جامێک ئاو بکات، گوتی حاجی تۆش تەمەنێکت هەیە، ئەوەی کچی هەبێت داخوازیکەری بۆ دێتو ئاساییە کچیش بۆ بە مێرددانێیە! ئەو داوایەی کە قەت بیری بۆی نەدەچوو، گوێیەکانی ئامادەی بیستنی نەبوون، تاساندی، ڕەنگێکی هێناوبرد خەریک بوو خوێنی بمەیی، داواکارییەک کە هیچ ڕێگای تێناچێ، خزمایەتی لە نێوانی دوو توێژی جیاوازو دوو پێکهاتەی دژ بە یەک کە ئاسمان و ڕێسمانیان بەینە. لەوکاتەی گوتی گورێی نەوەت بدەی بە حەماغای، هەردووک چاوی حاجی سمایلی ئەبڵەق بوون، بەڵام وەسەرەخۆی نەینا. هەرچەندە خەنجەرت لێ دابوایە خوینی لێ نەدەهات، لێ پیاوی قاڵبووی نێو ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان و گەنجینەی ئەزموونەکان وەکو گۆمی مەنگ خۆی شلوێ نەکرد، زۆر بە ئارامی و سادەیی گوتی ئینشائەڵڵا خێردار دەبێ خودا بەخێری بگێڕی، منیش کوڕو براو برازام هەیە

١. کەروکەی بیرێ: دیوارێکی یەک مەترییە کە هەردوو قاناتی بیرێ بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

وەک نەریتـــی باب و باپیرانمان خۆ دەبێت کۆیـــان بکەمەوەو پرس و ڕایان پێ بکەمو ڕەزامەندی هەموو لایەکیان وەربگرم. ئەوەندە بە ئارامی وەڵامی شێخی دایەوە، شـــێخ باوەڕی کردبوو داواکارییەکەی ســـەردەگرێ، بەدەم خواحافیزی و چاوەڕوانی وەڵامی تۆم، حاجی ســـمایلی جێهێشت. بە پەلە گەڕایەوە تەکیەی، بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە پڕ لە ئومێدە سەرکەوتووە، بە گوێی حەماغایدا بدات بۆ ئەوەی پاداشتی گرانبەها وەک سەرقەڵەمانەی دوعاکانی وەربگرێت و حەماغا سمێڵی چەور بکاتو مزگێنی لـێ وەربگری.

حاجی ســـمایل تـــەواوی ئەو ڕۆژە لە فکـــری ئەوەدا بوو چـــۆن و لە کوێرا دەست پێبکات؟ ئەو هەواڵە بە کوڕەکانی بڵێت بۆ ئەوەی کوڕەکانی بە ئاسایی وەریبگرنو هەڵنەچن، ڕاهێنانی لەسەر شێوەی ئەو ڕستەو دەستەواژانە دەکردو پاش و پێشـــی بە قســـەکان دەکردو خۆی لەگەڵ ڕادێنان، دەترسا کوڕەکانی بەو داوا نابەجێیە هەڵبچن وەک سووکایەتی بیبینن. شەوێ کوڕەکانی هەریەکەو لە ئیشـــی مەڕداری و کشتوکاڵو ئەوەی پێی سپێردرابوو، گەڕانەوەو هەموویان کۆبوونەوە. لەدوای نان و چا خواردن، حاجی سمایل گوتی کوڕینە کارم پێتانە. حاجی ســـمایل هەرکاتێک تەمـــای بڕیاردانی گرنگی هەبایـــە، ئەنگوچکی کراســـەکەی دەکردەوەو توندتر لە جـــاری بەرێ، ئەنگوچکی کراســـەکەی لە زەنگە و مەچەکی خۆی شـــەتەک دەداو دەیبەســـتەوە، بۆیە کوڕەکان هەموو ئەندامەکانی جەســـتەیان بوو بە گوێ. کوڕەکانی هەرســـێکیان دانیشتوون و گوێیان گرتووە، گوتی: کوڕەکانم وەک دەزانن لە گەرمەی هەندێک پێشـــهاتدا ئەقڵ و فکر حوکم ناکەن، هەست و سۆزو غرور دەبنە هێزی ورامدانەوە. وەک دەزانن هەرکەسێک کچی عازەبی هەبێت داواکاریشی دەبێت...

کوڕەکان بە بیســـتنی ناوی ئەو داخوازیکەرەی گوریێ، وەک لەسەر تەلاریکی بـــەرزی چەند نهۆمی کەوتبنە خواریێ، هەموویان واقیان وڕما، بۆ ماوەیەک لەناو بێدەنگییەکی وەڕزدا پیشیان دەخواردو بیریان لە هۆکاری ئەو داخوازییە دەکردەوە. حاجی سمایل، زەمەن ئاســـەواری خۆی لەسەر ڕوخســـارو ڕەفتاری جێهێشتبوو، ئەزموونی ژیان زۆر زۆر دەرســـی دادابوو، هەر بۆ ئەوەی ئەو بێدەنگییە بشکێنی، گوتـــی: ڕۆڵەکانم دەزانـــم حەماغا لە کوێـــڕا قورمیش کراوەو ئـــەو تەڵەیان پێ تەقاندووە، ئێمە خەڵکی کاســـبین، مرۆڤی ژیر ئەگەر دەســـتی کەوتە بن بەردی ئاشـــی، دەبێت بزانێ چۆن دەســـتی خۆی دەردێنێ، ئەگەر نەزانێو هەڵەشە بێتو بڕیاری عەجوولانە بدات، لە جیاتی ئەوەی دەستی دەربێنی پەنجەکانی دەقرتێن. حاجی سمایل گوتی: کوڕەکانم ئەوەندەی ئەمن ئەقڵم پێیدا بشکێ و بە باشی بزانم، وا چاکە ئێمە هەر لە ئێســـتا چاکتر نییە خەریکی دۆزینەوەی خزمێکی خۆمان بین، ئەگەر هەر لە هۆزەکەی خۆشمان بێت هەر باشتر، کەسێک بێت پێمان شەرم نەبێت ژن بەژنەی لەگەڵدا بکەین بۆ کاکەڕەشی، چونکە گوریێ هەر لە زووەوە هێشتا عـــازەب نەبووبوو داندراوە بۆ کاکەڕەشـــی بەژن بدرێ، ئێمـــە تەنها کارەکە خێراتر بکەین، گرنگ نییە دەوڵەمەنـــد بێت یان هەژار، تەنها ئەو کوڕەی دەبێتە زاوامان و گوریێ دەدەینێ و دەبێتە هاوسەری گوریێ، دەم چەفت نەبێ، بەجۆرێک نەتوانێ دەستگیرانەکەی خۆی بپارێزێو بەخێوی بکاتو خاوەندارێتی لـێ بکات. کاتێک کچی ئێمە مێشـــی نێری پێ هەڵنەگەڕاوە، قابیلی ئەوەیە بیدەینە کوڕێکی باش. لێتان ناشارمەوە ئەگەر گوریێ تاقە یەکجار حەماغای بدیتبایەو ئامادەبایە مێردی پێ بکات، ئێســـتام لـــێ مارە دەکرد. چونکە دڵی گوریێ و ڕازیبوونی زۆر گرنگە، بەڵام ســـەرەڕای ئەوەی حەماغا ژنی هەیەو گوریێ لە تەمەنی کچەکەی خۆیەتیو

بـــۆ تاقە جارێکیش نەیدیتووە، ئەو داواکارییە بۆ خزمایەتی نییە هێندەی نیەتی سووکایەتییە، تەنها تەگبیری ڕەفعەت ئاغایە بۆ ئەوەی سووکایەتیمان پێ بکەن و حەماغامان بەگژدا بکات. دەبێت چاوەڕوان و ئامادەی هەر پێشهاتێک بین، ئەوان هەموو ڕێگایەکی ترس و تۆقاندن و بەگرتدانو تۆمەت بۆ دروستکردنو تەماعیان نیشان داین بۆ ئەوەی بە چۆکماندا بێنن، ئەوەش دەچێتە هەمان چوارچێوەوە، بۆیە پێم باشە ڕای هەرسێکتان وەربگرم.

هەرچەندە کوڕەکانی حاجی ســـمایلی، پیاوی بە وەج بوون، خاوەنی کەســـایەتی بەهێزو دەستکەرەوەبوون، بەڵام قسەی کاربڕو یەکلاکەرەوە کاکەڕەش دەیکرد، چونکە ڕاســـتە برای بچووک بوو وەلـــێ پێش زەمەنی خۆی کەوتبوو، دۆســـتو دوژمن حســـابیان بۆ دەکردو لە بڕیـــاردان زۆر ئارامو هێدی بوو. حوســـێن، کوڕە گەورە بوو گوتی: پیاو لە سەنگەرێکدا بکوژرێ باشترە نەک لە زۆنگاوێک، بە هێواشی نغرۆ بیتو بخنکێیت، ئەوکات دەبیـــە لۆمەکاری عەبدان، وەک دەڵێن لۆمەی عەبدی لـــە عەزابی قەبری گرانترە. ئەوانە قەت چـــاوی خزمایەتی ئێمەیان نییە. حومێرە، کوڕی ناوەنجی بوو گوتی: گەر هەزار هێندەش بەدبەختیو چارەڕەشـــی وەکو چەتە بێتە سەر ڕێم لە بەربەرەکانێی زوڵم و سەتمکاران دەست هەڵناگرم، ئەو داوایە، هەر ئەو چەوســـانەوەی فەلاح و ئاغایە، بەرام بە بارێکی دیکەو لە قاوغێکی دیکەدا. کاکەڕەشـــی کوڕی لە هەمووان بچووکتر گوتی: ئەو شکۆیەی لە هەندێک مردندا هەیە لە هەموو ژیانێک دەســـتناکەوێ، دڵنیام ئەوەش تێدەپەڕێنین، ئێمە لەگەڵ ئەوانە ئاســـمانو ڕێسمانمان بەینە، ئەدی ناڵێن لە ئاسمانان بانگ دەکەن ئاوکوف، ئێمـــە هەرگیز ئاوکوفی یەکتر نین. قســـەکانی هەرســـێکیان بە حاجی ســـمایلی باوکیشیانەوە یەک ماناو یەک مەغزایان هەبوو، ئەویش ئەوەبوو بە هیچ شێوەیەک

ڕێی تێ ناچێ کە حەماغا مەبەستی خزمایەتی بێت لەگەڵ ئێمەی کرمانج، تەنها بە فیتی ڕەفعەت ئاغای هەڵدەپەڕێو مەخســەدیانە سووکایەتیمان پێ بکەن، لە کاتێکدا هیچ ئاغایــەک ئامادە نییە کچەکەی خۆی بداتــە کرمانجێک، ئەگەر کەزی ســپی لە ماڵە بابان بهۆنێتەوە! لە ئێســتادا چەندان کچە ئاغا بەو دەردەی چــوون، ئەوجا حەماغا ژن و منداڵی هەیەو گورێ لە تەمەنی کچەکانی خۆیەتی، بە خوای گورێ بزانی بە چارۆگەکەی خــۆی دەخنکێنێ. هەمووان ئەو تەگبیرەیان پەسەند کرد، لەگەڵ خزمێکی خۆیان ژن بە ژنەی بکەن بۆ کاکەڕەشی، هەر لە پێش ئەو داواکاریەش، گورێ دەستنیشان کرابوو بۆ کاکەڕەشی بە ژن بدرێ، ساڵ و مانگـو ڕۆژ لەسەر کەس ڕاناوەســتێ، چەرخ و خولی خۆی لەسەر کەس یەک ناخات. بۆ مەبەستی ژن بە ژنەکە، خێزانی چەند خزمێک لە گوندەکانی دەوروبەر دەستنیشان دەکەن، ئەوانە بۆ ئەوە دەبن خزمایەتییان لەگەڵ نوێ بکەینەوە، بابەتەکە دادەخەن تــا ئەوکاتەی کاکەڕەش بــە کچی یەک لەو خزمانــە ڕازی دەبێتو ئەوانیش بۆی دەچنە داخوازی و ژن بە ژنەکە سەر دەگرێ.

بە باشــیان زانی وەڵامێکی خەڵەتێنەر بە شــێخی بۆ حەمەغا بنێرنەوە، بە نیەتی خافڵاندن، تا ئەوکاتەی ژن بەژنەکە بۆ کاکە ڕەش دەکەن.



# ٣

ساڵ وەرسووڕایەوە، بەهارێ خەڵکی ئاوایی خەریکی تەداروکاتی جەژنن لە لایەک، لەلایەکی دیکەش خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ دروێنەی جۆی، جۆزەردانەو جۆ پێگەیوە. تەنها لە شوێنە نەورەکان پەڵەی ڕەشبەڵەکی چەند قانەفەریکێک[١] ماوە، ئەگەر نا لە هەمووی کاتی دروێنەی جۆیە. لە دوای خواردنی برنج و قەیسی جەژنەی، داس و قەرانگ[٢] و قەیناغەکانیان[٣] لە بن ساپیتەی بانی کردەوەو هەسان و ڕونیان ئامادەکرد. کوڕانی حاجی سمایلی، ئەوەندە

١. قان: پەڵە، پارچە. بۆ ڕووبەری گەنم و زەوی و... بەکاردێت. قانەفەریک: پەڵەگەنم یان پەڵەجۆیەک کە دانەکەی بەتەواوی ڕەق نەبووە و هێشتا نەرمە.

٢. قەرانگ: قەڵانگ. ئامێرێکە لە شێوەی داسی دروێنە، دەمەکەی ئاسنە و کلکەکەی دارە، وەک داس دەمەکەی تیژ نییە، بۆ کۆکۆدنەوەی سواڵەی گەنم لەکاتی دروێنە، بەکاردێت.

٣. قەیناغ: چوار دانە پەنجە دەستکێشی تەنەکەیە، تەلێکی پێنج سەنتیمی بەسەر نوکەکەیەوەیە، سەپان و درەوان لەکاتی دروێنەدا لە پەنجەی دەستی چەپی دەکات، بۆ ئەوەی سوارە (سواڵە)ی گەورەتری پێ هەڵبگیرێت.

بەکارن لە کشتوکاڵ و مەڕداری و ئیشوکاری گوندنشینی، هەر مەپرسە، بە چەند ڕۆژێک سوارەی جۆیان[١] بە پێوە نەهێشت. هەر هەموویان دووریەوە، خەریکی کێشانەوەو قرشەشکێنن چەند قۆناغێک لە پێش خەڵکین. سێ برا، سێ پاڵەوان لە ئیشوکاری گوندی. ئێستا زۆربەی خەڵک دروێنەی جۆی تەواو کردییە، مەگەر یەکێک نەخۆشی هەبێت لە ماڵێ یان گرفتاریی بۆ پەیدا بووبێت، دەنا هەندێک لە جووتیـــارەکان خەریکی گێرە کردنن. یەک لەو خزمانەی حاجی ســـمایلی کە ماڵیـــان لەوبـــەری ڕووباریە، ئـــەو بەیانییە کوڕی یەک لەو خزمانە بە ســـواری هێســـترێکی قولەی[٢] بارەبان[٣] لە بەردەرگای حەســـاری ماڵی حاجی سمایلی دابەزی. لەو کاتەدا، حاجی ســـمایل خەریکی مژاندنی بەرخەمێشکەیەکی[٤] بوو، سڵاوی لـــێ کرد، حاجی سمایل وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی سڵاوەکەی ئەستاندەوەو بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکرد، فەرمووی کردە ژوورێ بە منداڵێکی گوت جڵەوی ئەو هێسترەی لەو میوانەی وەربگرەو هێسترەکەی ئاودەو هۆ لەسەر ئەو ئاخوڕەی ئەولای بیبەســـتەوەو ئالێکی لەبۆ ڕۆکە. لەســـەر لبادێکی لاکێشە دانیشتن، جامە ئاوێکی شەوییان لەسەر کوندەرانی[٥] بۆ میوانی هێنا. «یاخوا

١. سوارەی جۆی: سواڵەی جۆ.

٢. ئێستری قولە: ئەو ئێسترەیە کە ڕەنگی نارنجییە لە مابەینی سوور و زەرد. ئەو ڕەنگە لە ئەسپ و ماین پێیدەگوترێ (شێ) لە ئێستر پێیدەگوترێ (قولە) بە لامی سووک.

٣. بارەبان: هێسترێکی بەتوانا کە باری زۆر قورس هەڵبگرێت.

٤. بەرخەمێشکە: بەرخەمێژکە. ئەو بەرخەیە کە دایکی نەماوە، مەڕێکی بەشیری بۆ دەگرن بۆئەوەی بیمژێ.

٥. کوندەران: کوندەڵان. دوو لادیواری یەک مەترییە، داری بەسەردا ڕایەڵ کراوە

بەخێربێی سەرچاوی مامی خۆت، دەی بابت و خزمان چۆنن؟ هەموو لایەک بێ مزەرەتن[١]؟ حاڵ و ئەحواڵتان؟ کەستان لێ نەخۆش نەکەوتییە؟ لەگەڵ جۆ دروونان چۆن بوون؟ جۆتان گێرە کردییە؟ »، وەڵامی ئەو ڕێژنە پرسیارەی مام حاجی سمایلی دایەوە، لێ دواپین پرسیار بۆی بوو بە هەلێک داوا و مەقسوودی هاتنەکەی عەرزکات: مام حاجی! بابم گەلەک سڵاوی لێدەکردیو ئەحواری دەپرسی، بابم و برا گەورەکەم بە نەخۆشی گرانەتای کەوتوون، بانگی شەوتاشمان لۆ ڕاهێشتوون، کەچی هەر چاک نەبوون، یەک چەپکو یەک سوارەمان لە تەبارەی[٢] جۆی خۆمان نەدووریوەتەوەو لەو ئاقارەی[٣] گوندی خۆمان، بەس تەبارەی جۆی مە نەدووراوەتەوەو بای لێدەدا، بابم گۆتی لۆ ئەو عیشانە پیاو ڕوو لە خزم و برادەری خۆی دەنێو داوای یارمەتی دەکات، ئەگەر بەیانی دوو لە کورەکان بنێری لۆ زبارەو یاریدەمان، زۆر مەمنوون دەبین، چونکە خەڵکی سێ گوندانمان دێنە یاری[٤]، بە ڕۆژو دانێک دوو ڕۆژ تەواوی دەکەن، بەرام ئەگە هاتن داس و قەیناغی خۆیان بێنن، نەبادا ئەوانەی مە، بەشمان نەکەن، چونکە زبارەکی گەورەیە! حاجی سمایل وەک ڕەوشتی هەمیشەیی خۆی، لە قۆراییی دریەوە دەرێ: وەی بەسەر هەردوو چاوم، یارمەتی خزمان بێ و بە کوڕی من

---

و قەسەڵی لەسەر ڕادەخەن بۆ لەسەرداناني دۆدان و کوندەی ئاو بۆئەوەی شەوی بێت. بەسەر کوندەکانیشەوە سێبەرێک دروست دەکەن.

١. بێ مزەرەت: بێ مزەرەد، بێ موزەڕەد: بێ زیان، بێ کێشە و ناخۆشی.

٢. تەبارە: پەڵەگەنم و جۆی نەدوورواوە.

٣. ئاقار: مەزرا، دەرو دەشت.

٤. دێنە یاری: دێنە یاریدە، دێنە یارمەتی، دێنە کۆمەک.

بکرێ، هەر منەتی تێدا نییە، چ لە سبەینێ زووتر نییە، حومێرە و کاکەڕەشی کوڕم دەنێرم لۆ یاریتان، هەتتاوەکونێ ئاخیر سوارەتان لەگەر نەدوورن، نابێ بێنەوە. هەر بۆ خۆشیەش گوتی: بە بابت برێ حەز دەکات سەری خانوو و سەری لەودەی کاشیان پێ سواق بدات، ئەوجا بیاننێرنەوە لۆ من، بەیانی وەکات[1] لەسەر تەبارەی جۆی حازرن دەستت لەبن سەرت بێت و هیچ خەمت نەبێ منداری مە لە دروێنەی ئازان.

بەیانییە، هێشتا ڕۆژ تیشکی زێڕینی نەڕژاوەتە سەر ئەو دەشتە پانوبەرینەی دزەییاتی، سەپانی سێ گوندان کۆبوونەوەو لە چەند قۆران[2] دەچنە گازی دروێنەی[3]، زرینگەی داس و چرپەی پوولەکەی سەر قەیناغان فرکەی سوارەی هۆنراوەو چرپەی قەرانگی تێلەکێشان[4] هەر مەپرسە چ مەحشەرێکە، حریتەحریتی مەلۆکێشان ئاوازێکی تایبەتی بەو ئاقارەی داوەو پاڵنەرێک بوو بۆ خۆنمایشکردنی ئازایەتی سەپانەکان. تەبارەی جۆیەکەی لە نزیک گوندییە، حومێرە ی حاجی سمایلی چووە بەر بەری دروێنەی ڕوو لە گوندی گازەکی دوورو درێژی لێدا، چەند سەپانێکی بە ڕاماڵ و دەنگخۆش لەگەڵی چوونە گازێ، هەر کە دەستی بە گۆرانی گازێ کرد، سەپانو تێلەکێش لەو دەنگ و سەدایە هەموو واقیان ورمابوو، هەر بەو ئاوازەش سەپانەکان بۆیان دەگێڕایەوە. بۆ دەربڕینی پێخۆشیی

---

١. وەکات: یەکسەر، ڕاستەوخۆ، دەستبەجێ.

٢. لە چەند قۆران: لە چەند قۆلان، لە چەند لاوە.

٣. گازی دروێنەی: گاز: بانگ، کە لێرەدا مەبەست لە گۆرانیی دروێنەیە.

٤. تێلەکێش: ئەو ژنەی کە مەلۆی لە دوای سەپانان هەڵدەگرێتەوە، جا ئەگەر جۆ بێ دەیکات بە گیشە، ئەگەر گەنم بێ دەیکات بە گەلاوێژ.

ئەو گۆرانیانە، سەپانەکان وەک نیشاندانی هونەرێکی درووێنە، سوارەکانیان دەهۆنییەوەو هەتتا دەستیان تێیدا بوو بۆ پشتەوە هەڵیان دەدا، تێلەکێشی مەعەلان لە هەوا دەیانگرتەوە، فرکان فرکانێکە مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، هەر سەپانەو توانای پشت ڕاست نەکردنەوەی خۆی نیشانی سەپانەکانی دیکە دەدا، هونەری راماڵ و گەوزی گەورە و هۆنینەوەی سوارەی مەلۆ، تێلەکێشەکان لە پێشبڕکێی خڕکردنەوەی سوارەو مەلۆو گیشەدانان، خۆیان ڕادەنا. شەش تێلەکێش مەلۆی هەڵدەگرنەوە، بەرامپیلیان لە پشتیان توندکردو گازو گورینگیان بەسەر کەمەریان شۆڕکردەوە، کلکە ئەنگوچکیان لە زەندو باسکیان شەتەک دا، لەچکەو هەوریبیان لە دەموچاویان پێچاوە، تەنها چاویان بەدەرێومیە بۆ ئەوەی پێستی دەموچاویان لەبەر تیشکی هەتاوێ ڕەش نەبێت. دەست و پەنجەیان لە خەنەی گرتووە، هەم بۆ ئەوەی لایان جوانەو هەم بۆ قایمبوونی پێستیان بۆ ئەوەی لەگەڵ دڕکودار ناو لەپی دەستیان بریندار نەبێ‌و نەڕووشێ و نەرمی خۆی لە دەست نەدا. هەندی برێی یەک و دوو، گیشە لەناو پەرێزێ قەپاغ کران، پەرێزە جۆ پان بووەوە، چریکەی گۆرانی حومێرەی حاجی سمایلی و قریوەی سەپانان زۆربەی ژن و کچی گوندی هێنا سەربان و لا کۆلان و بەرهەیوانان، گەردنی خۆیان هەڵدەکێشا بۆ نەوەی بزانن ئەو سەپانەی گۆرانی گازێ دەڵێ، کێهەیە! لە یەکتریان دەپرسی ئەو سەرپاڵەیە کێ و کوڕی کێیە؟ خەڵکی کامە گوندییە و ئایا ژنی هێناوە؟ ژنەکەی جوانە؟ ژنی بەدڵی خۆی هێناوە؟ سەرجەلەی تەواویان دەپشکنی‌و ڕەچەڵەکیان لە ڕەگەوە دەردێنا. یەک لەو ژنانەی زۆر سەرسامە بەو دەنگ و سەدایەی حومێرەی، بووکی سالێی ئاغای گوندییە، تازە لە مەسڵەتێکدا سەر بە هەوێ درابووە کوڕی ئاغای، واتا لە (بەدەل خوێن) و بە نابەدڵی بە مێرد درابوو، خۆی بە ئاوکوف و

قابیلی مێردەکـــەی نەدەزانی، بۆیە دایمە چاولـــەدەرو دڵبەخەم بوو، لەگەڵ هەر گۆرانییەک وای دەزانی مەبەســـت لێی ئەوە. چووبووە سەربانی لە بەرهەیوانی کۆشـــکێ کە دروست دەیڕوانییە تەبارەو ســـەپانەکان، ئەو دەنگ و ئاوازە نێرانەی حومێرە و گێڕانەوەی سەپانەکان، هەموو هەست و ئارەزووی بووکە خانیان بەجۆش هێنابوو، لەناو بەندەکان خـــۆی دەبینییەوە، هەروەک کتومت گۆرانییەکە بۆ وی گوترابێ، لەگەڵ هەر بەندێکی، بووکەخان وای خەیاڵ کردبوو ئەو گۆرانیانە بۆ ئەو چارەنووسە ڕەشە نەخوازراوەی وی و ئەوانەی وەکی وین، گۆترایە.

بەند بە بەندی بۆ بێمرادی و چارەڕەشـــی ئەو دانـــراوە، بە تایبەتی کاتێک گوێی لێبوو حومێرە دەیگوت:

**لە کوێم دیتو لە کوێم دیت، لە بنە بناری کۆیێ**
**ئاورم داوە چاوبازە، یار لە پەرێزە جۆیێ**
**مەمکی ڕاستەی گۆوواینە[1]، لەبەر هەرمی مەرۆیێ[2]**
**پەرچەم ئارمووشی خاسە، هاتیتە سەر برۆیێ**



**لە کێم دیتو لە کێم دیت، لە شینکەی نۆغەرانێ[3]**
**یارم کۆترە باریکە، خۆم گرتم لە هێلانێ**

---

١. گۆواینە: گواون، ئەنگواون، شەمزاون، ئەزیەتیان گەیوەتێ.

٢. هەرمی مەرۆیێ: هەڵمی مەڵۆیێ.

٣. شینکەی نۆغەرانێ: شوێنێکی دیارو ناسراوە لە گوندی نۆغەرانی سەر بە هەولێر.

**بێ تالعێ من مەعلوم بوو، دەفڕی دەچووە عاسمانێ**
**دوو عەشیرەت تێکبەربن ئەوشەو بۆت دێمە ژوانێ**
**قورپی گوارانی ترازاند لەسەر جێ ڕاموسانێ**



**لە کێم دیت و لە کێم دیت، لە گاوەرەو کەنداری**
**یارێ من کارمامزە جێی خۆشکرد لە نساری**
**دەستت لێ هەڵناگرم ببیە داکێ منداری**
**بسك و کەزی تێکەڵ بوون لەگەڵ لفکێ هێزاری[1]**
**سوێندم بە کەلاموڵلای ئەتۆ لە گولەی خەساری!**

بووکەخـــان هەر بە جارەکێ ئاگری گرت، لەوەی زێتر خۆی پێ ڕانەگیرا، بانگی کارەکەرەکەی کرد، پاکەتە جغارەکی (پۆر مەلیک) و یەکی (گۆردی فلاکی) لەنێو دەستەسـرێک گرێداو دایە دەســتی کارەکەرەکەیو گوتی: « گوێ بدە من، ئەو دەستەسرەی بۆ ئەو سەرپاڵەی کڵاوە سپییەکەی لەسەرییە، بەرەو پێی بڵێ ئاغاژن سەلامەت لێ دەکات، ئەو دیارییەی بۆ ناردی ئەمنیشی نیشان بدە بڵێ ئەو ژنەی لەبەر دەرگای هەیوانێ کۆشکی بۆی ناردووی، دەڵێ درم زۆر بە خەمە کەس ئاگای لە دری کەس نییە، دەبێت هەتاوەکو درۆینە تەواو دەبێت گۆرانیم بۆ بڵێ، ئەگەر نا قەت گەردنی ئازاد ناکەم، لە ڕۆژبازاڕی قیامەتێ لەســەر پردی سیراتێ نایەڵم بپەڕێتەوەو یەقەگیری دەبم، وەک ماری لە ملی دەهاڵێم!» کارەکەرەکە ڕۆیشــت

---

١. هیزار: مێزەرێکی دروستکراو بە هەوری، تایبەت بە ژنان. نێوچاوانەکەی بە دەرزیلە و کۆترۆکەو، کڵاوەکەیشی بە قەرەپول نەخشاوە.

هەتاوەکو لای حومێرەی گیر نەبوو، بە سـرتە بەگوێیـدا چرپاند: « ئەو دیارییە لەلایەن ئاغەژنم بۆ تۆ ناردراوە، ئەها لە کوێ ڕاوەسـتایە تەماشـامان دەکات لە بەرهەیوانێ کۆشـکێ!» ڕاسپاردەکەشی بێ زیادو کەم پێگوت. حومێرەش دوور بەدووری بە ئاماژەی ڕازیبوون بۆ داواکارییەکەی، دەسـتی بۆ لەسەر چاوی دانا، ئەویش لە کۆشـکێرا ئەو قۆڵ و باسکە سپیە پڕ لە بازنەی بۆ بڵند کرد، هێندەی دیکە حومێرەی ورووژاندو حەیران کرد، کەیفی گۆتنییێ هەسـتابوو، ئەو باسـک هەروەشـاندنەی لە زەینی حومێرەی ببوو بە تابلۆیەکی هەندە جوان، قەت لەبەر چاوی لانەدەچوو!

وەختـی نانـی چێشـتێ، داسـەکانیان سـووین، هەسـانو ڕۆنیـان لە یەکتری وەردەگرت، ناسـکەنان و هەرمیشـکی[1] بـە ڕۆنەکەرەیان خوارد، بە کەوچکەدارەکانـی نـاو کۆتکە دۆیەکان تێـر نەدەبوون، بۆیـە کۆتکە دۆیان بەسـەری خۆیانەوە کرد، هەتاوەکو قۆڕەیان لـێ بڕین! هەستانەوە قەیناغیان لە قامکەکانیان هەڵکێشـان. حومێرە و چەند سـەپانێکی دەستەبژێر چوونە بەربـەری دروێنەی، چوونە گازێ. حومێرە تیلەچاوەکی هەر لەسـەر هەیوانی کۆشـکێ و دیمەنی گۆرینە، ئەویش هەموو لەشی کردووە بە گوێ، بۆ ئەوەی بزانێ ئەوجارە چۆنی پێدا هەردەرێو چ بەندێکی بۆ ئامادەکردووە، چۆن کرووزەی لە جەرگـو هەناوی هەڵدەسـتێنێ. یەک لە سـەپانەکانی برادەری حومێرەی، هەموو هەسـتو خوسـتی کەوتبووە سـەر بووکەخانێ کۆشـکی ئاغای، بە

---

١. هەرمیشک: کولێرە، نان، ئەستوورک، هەرکامیان بێ، وەک تێکوشین لە تەشت یان لە لەگەندا ورد دەکرێ و ڕۆنی زەنگی بەسەردا دەکەن و تێکی هەڵدەشێلن، تایبەتە بە نانی قاوەڵتی.

حومێـــرەی گوت: چەنـــد بەندێکی دیکەی بۆ بڵێـــی دوور نییە وەکو خەجێی ســـیامەندی، لە کۆشـــکێ خۆی فڕێبدات! حومێرە ئەو جارە ئەو چەند بەندەی بۆ هەڵدان:

**کاکە سەرێ من دێشی، غەمێ لە درم گەلەکە**
**دەچمە چیای قەرەچوغی، لە من بە ملەکە ملەکە**
**ڕاوکردن لەکوێ خۆش بوو، ڕوارەو غەرابە لەکە**
**ئەشقێ سێ کیژان لێدام عەیشێو گورێ و فاتەکە**
**لە داکێم دادەبڕی کار مامزێ کوڕەکە**



**لە کێم دیت و لە کێم دیت، دیتم لە بەرهەیوانێ**
**شەوقی ئاوێنەم داێ خۆی خزاندە جێژوانێ**
**ڕوومەت وەك تۆپی گوری، دامە بەر ڕاموسانێ**
**ماندیم دەحەسێنتەوە دەستڕی نازدار حەیرانێ**
**چبکەم دەستم ناتگاتێ، بیکەین گەوز گەوزانێ!**



**هە دارە دارە، دار لە داران هەربردی**
**بەراییێ کەنگرکەران، گەییە ئاوێ بن بەردی**
**سینگت تەختو ڕەوڕەوە وەستاکاران لێ کردی**
**تالعێ تو گەلە ڕەش بوو لە بەدەل خوێنیان بردی**

## ڕووی بابی مەلای ڕەش بێ کو لە گولەی مارە کردی!



ئـــەو دوو ڕۆژە تاوەکو دروێنەی جۆی تەواو بوو، حومێرەی حاجی ســـمایلی گۆرانی گازێی لێ نەبڕاو بە تەواوی دەنگی نوسابوو، سەپانەکان هەر هەموویان پشـــتی کورتەکەکانیان، لەبەر ئارەقەی، هەمووی سپی بوو بوو وەک دۆی پێدا کرابێت. ئەوانەشـــی کەڕکیان لەبەربوو، ئارەقە لە بـــن کەڕکی هاتبووە دەرێ. خاوەنـــی هەرەوەزەکە، بۆ ســـەربڕانەی تەواوبوونی دروێنەی، دوو گیســـکی لە عەرزیـــدان. لەو دوو ڕۆژەی لـــەو گوندەی بوون، کاکـــەڕەش چاوی بە کچێکی منداڵکاری تازە پێگەیشـــتوو کەوت، هەتا دەســـت هەڵێنـــی کەڵەگەت، دوو چاوی شین، سادەو بێ فرت و فێڵ، پرسیاری کرد: ئەوە کچی کێیەو ناوی چیەو بـــە تەمانە بە مـــاری دنیایێ بدەن، یان ژن بە ژنەی پـــێ دەکەن؟ گوتیان: ئەوە کچی یەک لە خزمەکانـــی خۆتانەو ڕەچەڵەکی هۆزی ئێوەیەو بۆ برایەکەی بە ژنی دەدەن. ڕۆژی دوایی کاتێک گەڕانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، کاکەڕەش چووە تەنیشـــت دایکی دانیشـــت، دایکی زۆری خۆ بەقوربان کرد، ئاخر ئەو کوڕەی هێشـــتا ژنی نەهێناوە، لە هەمووان خۆشەویســـتترە! کاکەڕەش دوو ســـێ جار دەیویســـت بە دایکی بڵێ کە دڵی، کچێکی گرتووە، لـــێ لەبەر قەرەبارغیی دەوروبەر، دەیگێڕایەوە، دایکی حاری بوو کاکەڕەش دەیەوێ قسێکی بکات، لە دایکی زیاتر کەس گوێی لـێ نەبێت، دایکی گوتی دەی ڕۆڵە بزانم چت دەوێ؟ ئەویش گوتـــی کە لەو گوندەی ئەوبەری ڕووبـــاری، کچی یەک لە خزمەکانی خۆیانـــی بینیوەو زۆری بە دڵییـــە، ئەگەر بە باوکم و کاکە حســـێنم بڵێی بۆم بچنە خوازبێنی. دایکی لە خۆشـــییان هەر پێـــی بە عەرزی نەدەکەوت، هەر

زوو ئەو باســەی بە حاجی سمایلی و حســێنی براگەورەی گوت، ئەوانیش ئەو خێزانەیان زۆر بەدڵــی بوو. لە کاتی چوونە داخــوازی، کاکەڕەش چەند بارەی کردەوە: ئاگادار بن، ئەوەی ئەمن نیازمە لێمان نەگۆڕن و کچێکی دیکەم لــێ مارە بکەن، ناوی کچەکەو شــێوەی، وەک ڕسمێکی خستە زەینیان، گوتی ئەو کچــەی ئەمن دیاریم کردیە، لە هەر هەموویــان باڵای بەرزترە. دایکی گوتی: ڕۆڵە ناکرێ ئەتۆ تەنها لە خەمی خۆتدا بیت ئەدی ئەو کوڕەی گوڕێی دەدەینێ خۆ دەبێ بزانین کوڕێکی چۆنە؟ داخۆ ســەقەتە، ئەقڵــی تەواوە! هەموویان بە کاکەڕەشیشــەوە گوتیان قســەکەت تەواوەو هەروا دەکەین، خۆ گوڕێمان لە دەشتێ نەدیتیتەوە! پێش هەموو شتێکی، دەبێ گوڕێ جێ و ڕێی خۆش بیت! خۆ ناکرێ لە کۆلکەی بڕەوینەوە بەسەر بەرازیدا بکەوین!



# ٤

دروســـت ئەو ڕۆژەی ژنیان لە کاکەڕەش مارەکرد، ســـەرنج و نیگای خەڵکی ئاوایی کەوتە ســـەر ئەو قەمەرەیەی هاتە گونـــدی و منداڵە هورتکەی ئاوایی بەدوای کەوتن.

لە دوای گوندبەدەرکردنی، هەرچەندە دایکی لە ژیاندا نەماوە بە شـــەرمەوە سەری نایەوە، وەلـــێ ئێستاش قســـەکانی دایکی لە گوێدا دەزرینگێنەوە بە هەمان ئاوازی بەرایییێ و دەست لە سینگ کوتانەکەی لەبەرچاویەتی، کاتێک دەیگـــوت: ئـــەە دایکت کوێربێت ڕۆڵە بـــۆت لاڵ بم، بە خوای چـــاوەزار کاری لێکردی! ئاخر چەندم هاوارکرد بە شـــەوێ تەماشای ئاوێنەی مەکە، پێشینان بەلاش نەیانگوتووە ئەوەی بە شەوێ تەماشای ئاوێنەی بکات، دەکەوێتە وڵاتی غەریب و غوربەتان، هەرکەسێک بە شەوێ تەماشای ئاوێنەی بکات، ون دەبێ.

لە دوو بۆ سێ کەسی هاوتەمەنی خۆی زیاتر، کەس لە گوندی نەیناسییەوە، ئەوانیش زۆر بەباشی نەیانناسییەوە، تەنها بە چاوەکانی تۆزێک شێوەیان دەکردو نەدەکرد. ڕاســـتە نەختێک بە شـــوانەی دەچێ، ئاخر چل و حەوت ساڵ کەم نییە، عومرێکە! باوکی زۆر پیرو بێهێز بووە، زەمەن ئاســـەواری خۆی لەسەر ڕوخساری داناوە، ســـۆمای چاوە کەنەفتەکانی هەتەر نـــاکات، هەر لێی ورد دەبێتەوەو بۆنی

دەکات، دەڵێ: تۆخوا ئەتو کێی؟ بۆنی شوانەت لێدەکەم! ئەویش دەڵێ: نا، شێخ سیراجەدینم... ئاخر کێ هەیە باوەڕ بکات شوانەی پازدە ساڵی، ئێستا ئاوا گۆڕاوە بە شێخێکی کەڵەگەتی شەســـت و دوو ساڵی بەویقار! شێوەو ڕوخساری گوندی بە تەواوی گۆڕاوە، گردەکان زۆر بچووک بوونەتەوە و کەندەکان پڕ بوونەتەوە. دیارە زۆر ڕووداو لەوکاتەی ڕوودەدەن مرۆڤ زۆر بە قورسیان لـــێ دەڕوانێ و سەری لـێ تێکدەچێت و سەرەدەری لـێناکات، وا هەست دەکات کۆتایی دنیایەو گەیشتۆتە بنبەست، کەچی نازانێ بۆی هەیە ئەو ڕووداوە بۆی ببێتە کردنەوەی دەروازەیەکی دیکە بۆ دەســـتپێکی ژیانێکی نوێی وا، ڕەنگە زۆر لە ژیانەکەی پێشووی باشتر بێت. ئەویش هەر هیچ نەبێت ناوەکەی لە شـــوانەی قادر قاوەچی، یان شـــوانەی سەگگێ، بۆتە شـــێخ سیراجەدین، خەڵکیش دەســـتی بۆ بە سینگی وە دەنێن‌و دەست و پێی ماچ دەکەن!

کەم کەس ناوی شـــوانەو شـــێوەی چیرۆکـــی گوندبەدەرکردنەکەی دەزانن. ئەویش هەر بەو مەبەســـتی نەناســـینەوە، چل و حەوت ســـاڵی ڕەبەق ڕووی لەو گونـــدەی نەکردەوە. ئێســـتا خەڵکی گوندی وا دەزانن خـــوا دەرگای خێری لـــێ کردوونەتەوە زاتێکی ئـــاوا نەجیبزادەو بە نوور و نـــەزەر و بە ویقار وەک بەرەکەتێک لە ناکاو ڕژاوەتە سەر گوندەکەیان!

لـــە دوای پرســـیاری ماڵی قادر قاوەچـــی، منداڵێک هەر بـــە غار کەوتە پێشـــیان. بەو پاشـــنیوەڕۆیە، قەمەرەکەی لە بەردەرگای ماڵـــی قادر قاوەچی ڕاگرت. لە پێشـــەوە شێخ ســـیراجەدین و لە دواوە ژن و منداڵەکانی دابەزین‌و دوو کێڵـــی بەفری لە ســـندوقی قەمەرەکەی لەگەڵ چەند میوەو شـــەکرۆکەی منداڵان، بە شـــۆفێرەکەی دابەزاند. مقۆ مقۆ لـــە نێو گوندی پەیدابوو: ئەرێ

ئەو شێخە بە ویقارە میوانی کام لە ماڵەکانە؟ هیچ کەس بیری بۆ ئەوە ناچێت، ئەو شـێخە هەمان کـوڕە نۆبەرەکەی قادر قاوەچییە کـە بەر لە چل و حەوت ساڵ گوندبەدەرکرا. ئێستاش ئەو شێخەیە کە هەموویان دەستی ماچ دەکەن و داوای متفەڕکی شاڵەکەی لــێ دەکەن! ئەوکات زۆری بۆ گەڕابوون لەناو بیرو کەندڕو زەندۆڵان، هەندێکیش دەیانگوت شۆفێری لۆرییە گەورەکان فڕاندوویانەو بردوویانە بـۆ کوێت و لای حەجێ. هەندێک دەیانگووت بە نەفرەت بێت، باش بوو لە یەخەی گوندەکەمان بۆوە. سەڵتەو کەوایەکی ڕەشی قەترانی لەبەربوو، شـاڵێکی سەوزو لەچکەیەکی سپی بەسەر لاجانگـو ڕوومەتی بەرداوەتەوە بۆ ئەوەی ڕێگای نەزەری لـێ بگری. مێزەرێکی ڕەشی لەسەر لەچکە سپییەکەی لەسـەری پێچاوە، سـەعاتێکی بە زریزەی لە لێوی عەبا بەسـیم چنراوەکەی قایم کردبوو، چەند ئەنگوسـتیلەیەکی گەورەو سـەر بە نقێمی گرانبەهای لە پەنجەکانییە، ڕیشـێکی کۆرپەکراوی ماش و برنج بەلای سپیدا، هێشتۆتەوە. لێواری عەباو سـەڵتەکەی بە ئاوریشم و سیمی بریقەدار چندراوەو بریسکەی دێ، هەر دەڵێی زێڕی سـەر دوکانانە! تەسـبیحێکی نەرجیلی سـەدو یەک دەنکی لە ملی کردووە.

جامێکـی فافۆنی پـڕ لە بەفراویان بـۆ هێنا، بەر لـە خواردنەوەی چەند فووێکی لە ئاوەکە کرد، وەک بۆگەی لــێ بکات، چەند بسمیللایەکی بەسەر ئاوەکەی وەرکرد، دەمی بە لێوی جامەکەوە نا، جامەکەی بەحاڵ لە لێوی کردەوە، هێشـتا قومێکی گەورەی ئاو لە گوپیدابوو، خەڵکەکە عافیەتبارانیان کرد، بە بنی چاوی لە خەڵکەکەی ڕادەما بزانێ کەسیان دەناسێتەوە، زۆر بە هەستیاری هەڵسوکەوتی دەکرد، تەنانەت یەک ئەنگوستیلەی لە پەنجەی خۆی با نەدەدا

تاوەکو چەند بسمیللایەکی نەگوتبایە.

مام قادر قاوەچی بینایی چاوەکانی لەدەستداوە، وەک تازە کوڕەکەی ببینێ لە ئامێـــزی کردو بە دەنگێکی کزو لەرزۆک تێکەڵاو بە گریان گوتی: بەخوای بۆنی شوانەت لـێ دێ، شێخ سیراجەدین هەر بە سرتە بەگوێی باوکیدا چرپاند: ناوم شـــێخ ســـیراجەدینە. ئەویش گوتی شـــوکر بۆ خوا کوڕەکەم بۆتە شێخی بەرماڵیێ تازە بشمرم ســـوێم لە خۆم نابێتەوە! پیاوە پیرو کەنەفتەکانی گوندی، چیرۆکی پەراگەندەبوونو گوندبەدەرکردنی شوانەی پێشدا و شێخ سیراجەدینی ئێستایان دەزانی، بەڵام نەیاندەناسییەوە.

بەر لە چل و حەوت ساڵ، ئەو سەردەمی شوانە تەمەنی پازدە ساڵێک بوو، شـــوانی مێگەلەمەڕێکی گەورە بوو، کە خۆی لە سێ ســـەد سەر مەڕ دەدا. مێگەلی مەڕی قادر قاوەچی بەناوبانگ بوو، دێڵەسەیەکەی بای خواردووە[١]. شـــوانە شـــەوو ڕۆژان دەژمێرێ بۆ ئەوەی لە دوای شەســـت ڕۆژ دێڵەسەگەکە بترەکـــێ[٢]، چونکە ئەگەر گوجیلەکانی زیاتر گۆڵ بن بە شەســـتو پێنج ڕۆژ دەترەکـــێ، بەڵام ئەگـــەر گوجیلەکانی زیاتـــر دێڵ بن، شێســـت ڕۆژ دەترەکێ، ئەوکات بە کەیفی دڵی خۆی دوو گوجیلە ســـەگ نیشـــان بکات و بە دەستی خۆی بیعاملێنێ و پەروەردەیان بکات. کاتێک دێڵەســـەگەکە دەترەکێ، شوانە دێڵەسەگێکی شـــینی دەو ڕەش و گۆڵێک لە گوجیلەکان ڕادەگری و دەیانکات بە ســـەگی خۆی. بەجۆرێک ئەو دوو گوجیلە سەگە دەعاملێنێ و پەروەردەیان

١. بای خواردووە: دێڵەسەگ دوای ئەوەی گۆڵەسەگ لەگەڵی جووت دەبێت.

٢. بترەکێ (ترەکین): زایینی هێندێک ئاژەڵی مێیینەی وەکو سەگ، پشیلە، چەقەڵ و... کە چەند بەچەکەیەک بە یەک زگ دادەنێن.

دەکات دەبن بە بەشێک لە جەستەی شـــوانەی، ڕۆژ تا ئێواریّ بەدوایانەوەیەو مەڕیان بۆ دەدۆشـــێ و شیرەکەیان دەداتێ، شـــەوانیش زۆرجار لەسەر دامێنی قاپوتەکەی دەخەون، هەر کاتێک خەڵکی گوندی شـــوانەیان دیتبا سەگەکانی بەدواوە نین، جێگای پرســـیار بوو، چونکە قەت بۆ یەک چرکەش لە شـــوانەی دانەدەبـــڕان، کە ناویشـــیان دەهێنا دەیانگوت شـــوانەو ســـەگەکانی. ڕۆژێک مارێکی شـــینی گاینجی[1] ژاردار بـــە گۆلەکەیـــەوە دەداتو حەیاتی ڕەش دەدا. ئەگـــەر ئەو ســـەگە نەبایە مارەکە بە شـــوانەیەوە دەدا، ســـەیەکە خۆی کردە قوربانی شـــوانەی. شـــوانە زۆری بۆ خەمبار بوو، سەبووری و فەرامۆشی ئەویشـــی خستبووە ســـەر دێڵەکە، شـــوانەو دێڵەکە بە جووت بۆی دەگریان. ئەو دێڵەسەگە زۆر متووی شـــوانەی دەبێت و پاسەوانی مێگەلەمەڕەکەی بۆ دەکات، شەوین[2]و شـــیوەخواری[3] لەگەڵ دەکات، شەو و نیوەشەوان ڕێی لە گورگان دەگرت قەت نەیهێشـــت گیسکێکشی بخۆن. کەس نەیدەتوانی لەگەڵ شوانەی بەشـــەڕ بێت، ســـەگەکەی برینداری دەکرد، چەندین جار شوانەکانی گوندی هەر بۆ تاقیکردنەوەی، بەرانگڕی شـــوانەی دەبوون، دێڵەســـەگ خۆی پێدا دەدان شوانەی دەپاراست.

دەســـتپێکی ئەو ڕۆژەی، سەر نویشتی شـــوانەی گۆڕی و لە شوانەی قادر قاوەچیرا کردی بە شـــێخ سیراجەدین، یەک لە ڕۆژە گەرمە تاقەتپڕووکێنەکانی

---

١. گاینجی: گانگێو، گانەنگێو. ئەو مارەیە کە ژارەکەی زۆر پیس و کوشندەیە، ئەگەر بە (گا)وە بدا دەیئەنگێویّ (دەیکوژێت).

٢. شەوین: لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵات بە شەو.

٣. شیوەخوار: لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات لە دوای بانگی شێوان بە درەنگەوە.

هاوینــــێ بوو، کاتێک لەو پەرێزەی خوار گونــدی، مەڕەکەی بڵاوبووبوونەوەو لەو ئاقارەی تاقو جووت بووبوون. شــوانە خۆی هەڵکوتا بۆ بەرسێبەری کەندەرانی سۆر[1]، پاشــنیوەڕۆیەکی درەنگەو سـێبەری کەندەرانی ســوور خۆی لێک کێشاوەتەوە مێوانان داڵدە دەدات، دێڵە سەگەکەی، پێی لە شوێن پێی شوانەی دادەنێ‌و وەکو قیری کەوای ســپی[2] لە یەخەی نابێتــەوەو بە هیچ باران لێی جیانابێتەوە. دێڵەســەگەکە بە بایەو ئارەزووی جووتبوون لەگەڵ گۆڵەسەگێک، ئارامی لێهەڵگرتووە! لە حەژمەتی ئەوەی لەو دەشــتە چۆڵەی، گۆڵەسەگێک شــک نابات ئارەزووی لێهاتنی[3] دابمرکێنێتەوە، ئەندامی زاوزێ و پاشــووی لە کەندەرانەکەی دەســووی‌و خۆی پێ دەخورێنێ بۆ ئەوەی کوڵوکۆی ئارەزووی جووتبوونی بەو جۆرە دابمرکێنێتەوە، شــوانەش هەست دەکات دێڵەسەگەکەی چێژ لە خوراندنی ئەندامی مێینەی خۆی دەبینی‌و ئاوا سفتوسۆی دادەمرکێ، بۆیە، شــوانە دەکەوێتە خوراندنی بنکلکی سەگەکەی، سەگەکەش لاقی لێک بڵاودەکات و کلکەسوتەی لەبەر شوانەی دەکات!

عەولا شــێت، دوو ســاڵ بوو تێکچووبوو، هەر بە تەواوی شــێت بووبوو، لە ئۆمەرمەندان‌و چاک و پیرو شــێخ و مشــایەخی ئەو نێوەی نەماوە پەڕۆی کەســک و نوشــتوو و ئەبو دووجانەو حەمایلبەندی خۆی، بە کڵاو و لاشــانی

---

١. کەندەرانی سۆر: کەندەڵانێکە گڵەکەی سوورەو کەوتۆتە باشووری گوندەکەی ماڵی شوانەی.

٢. قیری کەوای سپی: پێوەچەسپانی شتێک، بابەتێک بە کەسێکەوە بەجۆرێک لێی نەبێتەوە، وەک چۆن قیر بە کەوای سپییەوە دیارە و لێی نابێتەوە.

٣. لێهاتن: جووتببونی گۆڵەسەگ لەگەڵ دێڵەسەگ.

عەولا شـێتیەوە هەڵنەواسیبێ! وەلـێ، بەقەدەر تۆسقاڵێک کاریان لە عەولا شـێتی نەکردبوو، ڕۆژ هەتا ئێوارێ دەچـووە ئەو ئاقارەی، جۆرکێکی خامی بە نیفۆی[1]، بەدەسـتەوە بوو، تاوەکو ئەو جۆرکەی پڕ نەکردبا لە قالۆچە و بۆ نێو گوندی نەیهێنابایەوە، نەدەهاتەوە گونـدی. زۆرجار تخووبی ئاقاری گوندەکانی دەوروبەریشـی، بۆ خڕکردنەوەی قالۆچـەی زیاتر، تێدەپەڕانـد. قالۆچەکانی دەهێنایـەوە گوندی و بە کۆڵانەکاندا پەرشـوبڵاوی دەکـردن. خەڵکی گوندی، بەدەست قالۆچەکانی عەولاشێتی بە زاڵە هاتبوون، زۆرجار لەکاتی نانخواردنێ دەهاتنە سەر سەبەتەی نانیو دەکەوتنە نێو خواردنەکانیان!

لە چارەی ڕەشـی شـوانەی، ئەو ڕۆژە عەولاشـێت جۆرکـی قالۆچانی پڕ نەکردووە، لەو ئاقارەی ئەو دەشـتە پانو بەرینە لـە گەرمان وەک تراویلکە لە بەرچاوی هەڵدەچێ، شەلاڵی ئارەقە بووەو زاری لە تینوان وشک بووە، بەجۆرێک خیزی و لیـکاوی لە زاری بڕاوە قورگی خۆی پێ تەڕ بکاتەوە. لوتوبزوت چاوی دەکەونە سـەر ئەو مێگەلە مەڕەی لە کەنداری سـۆر بڵاوبـووەو دەلەوەڕێ، کاتێـک نزیک دەبێتـەوە، بـە کەرەمەڕەکەیرا دەزانی ئەو مەڕە ئی شـوانەی قادر قاوەچییە، دەزانێ لەسـەر پشـتی کەرەکەی، تێڕی پڕ لە دێمکەئاوی[2] لێیەو ئاوی سـاردی دەستدەکەوێ، لە خنکان و تەریفەبوون[3] ڕزگاری دەبێت.

---

١. نیفۆ: نیفۆک. ئەو شوێنەیە لە شەڵوار یان دەرپێ کە دۆخینی تێهەڵدەکێشرێ.

٢. دێمکە: لە پارچە خێوەت یان چەرمی خۆشکراوی ئاژەڵ سازدەکرێ بەمەبەستی ئاوتێداهەڵگرتن بۆ مەزرا و دەشتودەر. کونێکی بچووکی هەیە بۆ ئاوتێکردن و لێدەرهێنان.

٣. تەریفە: تینوێتییەکی لە ڕادەبەدەری نزیک لە خنکان لەتینوان.

بـــەرەو وێ ملدەنێ، بەجۆرێک شـــەپڕێو بووە بە لاپـــەلاپ لاقی تێکدەهاڵێن، ئەو تۆزەی لەگەڵ هەنگاوەکانی لە قەســـەڵەکان بەرز دەبێتەوە، هێندەی دیکە گەرووی وشـــک دەکەن، ئارەقـــە بەنێوچاوانی و لاملیدا ڕێچکەی بەســـتووە، قۆڵتـــی هەردووک چاوەکانی پڕ لە ئارەقە بووە، ئـــەو، قالۆچە کۆکردنەوە وەک ئەرکێک و کەسابەتێک دەبینی. ئەو، لەلای گرنگـو جێی بایەخ نییە خەڵکی گوندی لەبەر قلۆچـــان خەریکە ماڵەکانیان بار بکـــەن! قالۆچە دەکەوێتە نێو شیرو ماستـو دۆی بەردەمیان، ئاخر ئەو گوندە بەجۆرێک ڕەش دەچێتەوە لەبەر قالۆچان، هەر شەقاوێکی ناو گوندی، پێت لەسەر قالۆچەیەک دادەنێی! ڕۆژی خوای نییە عـەولاشـــێت جۆرکێک قالۆچە بە کۆڵانەکانـــی گوندی وەرنەکات و ڕۆژبێری ناکات، بەهەر نرخێک بێت، دەبێ جۆرکێک پڕ قالۆچە بکات! خەڵکی ئاوایی، لەبەر پێهەڵگەڕانی ئەو قالۆچانەی، زۆرجار لە خەوی شیرین ڕادەپەڕن چەند شـــەپێک لەنێو چاوانو لاملو ســـینگی خۆیان دەکوتن و هەڵیاندەدان. چەند جار لە تەشـــتی هەویـــری قالۆچەیان دەرهێناوە! جـــاری وا هەیە منداڵ لەناو لانکێ لە نیوەی شـــەوێدا دەزیرپێنێو دایکی خەبـــەر دەکاتەوە، کاتێک دەسترازەی دەکەنەوە قالۆچە چۆتە ناو کراس یان کۆچکی سەری. خەڵکی گوندی دەیانگوت یان دەبێت گوندەکەی بۆ عەولاشـــێتو قالۆچەکانی چۆڵ بکەین، یان دەبێـــت بچینە لای باوکـو براگەورەکەی، بۆ ئـــەوەی چارەیەک بدۆزینەوە. ڕۆژ نەبوو بە باوک و براگەورەکەی عەولاشێتی نەڵێن و گازاندەی نەکەن. ئەوانیش دەیانگوت ئێمە چی بکەین! شـێتەو شێتیش تەکلیفی شەرعی لەسەر نییەو جێی گلەیی نییە! خەڵکی گوندی دەیانگوت ئێ کاکە بیبەنە سەرچاکـو پیران دوعـاگۆیان شێخ و مەشایەخان، هەرنا بیبەنەوە بۆ ئۆمەرمەندان ئەبودوجانەی

بۆ دروســـت بکەن، کەمتەرخەمن ئەگەرنا شێخی ئاوا پەیدابووە شێت و هاری لەماڵێ چاک دەبێتەوە! لەگەڵ هەر جارێک گلەیی و گازاندان، ژمارەی نوشتوو کشتەک و دووعا حەمایل کراوەکانی سەرشانو کورتەک و کڵاوی عەولاشێتی زیادیان دەکرد، بەجۆرێک، شـــوێنی بەتاڵ لە کڵاوەکەی نەماوە نوشتووی نوێی پێوە هەڵواســـن. ئەو هەموو نوشـــتوو و متفەڕکە نەیانتوانی عەولاشێتی لە قالۆچەگرتن ساردکەنەوە. ئەگەر خەڵکی ئاوایی لە ڕۆژێکدا بیست قالۆچەیان بکوشـــتبایە، ئەوە لـــە بەرامبەردا عەولاشـــێت چەند ئەوەنـــدەی دیکەی لۆ دەینانەوە! بۆ هەر ڕۆژێک، عەولاشـــێت جۆرکەکەی هەمیشە قالۆچەی نوێی تێدابوو، لە قالۆچەی هەمەجۆرو ڕەنگاوڕەنگ!

عەولاشێت، خۆی هەڵدەکوتێ بۆ ئەوەی بگاتە کەرەمەڕەکەی شوانەی قادر قاوەچی و لە تێرەکەی ســـەر پشـــتی، دێمکە ئاوەکە دەربێنی و خۆی لە تینوان ڕزگار بکات. تا دەگاتە مێگەلە مەڕەکە زۆر پەرێشـــان و شـــپرزە دەبێت، ئەو، دیقەت و چاوی هەر لەسەر کەرەمەڕەکەیە، دەبینی لە سێبەری کەنداری سوور، کەرەکە وەستاوە. چاوی ڕەشکەو پێشکەی دەکات و خەریکە سۆمای هەردووک چاوەکانی لە دەســـت بدات. هەرچۆنێکی بێ خۆی دەگەیەنێتە سەر کەنداری سوور، دەبینی شـــوانە خەریکی خوراندنی بنکلکی سەیەکەیەتی، سەیەکەش لاقی پاشـــووی لە یەکتر بڵاوکـــردوون و بە ئاماژەی ڕازیبوون و پێخۆشـــبوون، کلکەســـۆتەیەتی! لەناکاو دەنگی حەپینی ســـەگەکەی و دەنگی عەولاشێتی تێکەڵ بە یەکتر دەبن، عەولاشـــێت دەڵێ هۆ شـــوانەی قادر قاوەچی سەگباب ئەوە ســـەگەکەت دەگێی؟! شوانەش قسەی عەولاشـــێتی بەهەند وەرناگری و لێی بە بەنیەوە ناکات، دەڵێ: ئای عەولا بەخێر بێی! شـــوانە خۆی دەناســـێ و

هەرگیز بیر لە شـــتی ئاوا ناکاتەوە، کە لەنێو خەڵکی قێزەون و بێزلێکراوە. وەرە عەوڵا بزانم قالۆچەت زۆر گرتووە؟ دەبینی عەوڵا شێت لە تینوان بەحاڵ نووزەی دێت، هەر زوو دێمکەئاوەکە لە تێڕێ دەردێنێ‌و بەسەر دەوی عەوڵایەوە دەکات، هێنـــدە بە پەلە ئاوەکەی دەخواتـــەوە، نیوەی بە دەندەرەی[1] ســـینگی خۆیدا دەڕێژێ. لە دوای ئەوەی عەوڵاشـــێت پشـــووی دێتەوە بەر، بە شوانەی دەڵێ: بچمەوە بە باوکت دەڵێم ژنێکت بۆ بێنی بۆ ئەوەی چیتر سەی نەگێی! شوانەش پێدەکەنێ و گوێ بە قسەکەی نادات، دەڵێ: عەوڵا بزانم قالۆچەت زۆر گرتوونە! عەوڵاش دەڵێ: ئەرێ بەڕاســـت شوانە بەسەری بابت پێم بڵێ قالۆچە لە کێهان لای زۆرە؟ چونکە ناچمەوە گوندی تاوەکو جۆڕکم پڕ لە قالۆچە نەکەم‌و بۆ گوندی نەبەمەوە، ئەورۆ زۆر ماندوو بووم، دەڵێی قالۆچە قاتییە لەو ئاقارەی!

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، عەوڵاشـــێت لە دوای ئەوەی جۆڕکە قالۆچەکەی لە گوندی بە کۆڵانەکانـــدا بڵاودەکاتەوە، جۆڕکەکەی قەد دەکاتو لـــە گیرفانی داوێ وەک ئامادەکارییەک بۆ ڕۆژی دوایی، ســـایلی هەموو ڕۆژەکانی دیکە. عەوڵاشێت لە ماڵی خۆیان دەڵێ شوانەی قادر قاوەچی لەبەر سێبەری کەنداری سۆر سەیەکەی خۆی دەگا! هیچ کەس لەماڵەوەیان نە باوەڕ دەکاتو نە گرنگی بەو قسە سەقەتەی عەوڵاشـــێتی دەدەن، چونکـــە ڕۆژانـــە لەو وڕێنەو قســـە حەلـــەق و مەلەقانە دەردەفرتێنێ‌و کەس لێی ناکڕی. باگۆی قســـەکانی نادەنەوەو تیلکی تێوەرنادەن. ئاخر ئەو خەبەرە بێ جێوڕێیانەش کڕیاری خۆی هەر دەبێ و دەتوانێ بە ئاســـانی گـــەورە و کەمی و زیادیی بکات، جوان بیرازێنێتەوە و دەرخواردی خەڵکی بدات!

---

١. دەندەرە: شوێنێکە لە نێوەندی سینگی مرۆڤ، دروست بەینی هەردو مەمک. کە ڕەقەنە و هیچ گۆشتی پێوە نییە، بەس بە پێست داپۆشراوە.

بێ ئەوەی بیر لە ئەنجامەکەی بکاتەوە. قسێکی ئاوا، کاتێک دەکەوێتە بەرگوێی فاتە گەڕۆکی، بەجۆرێک ترش و خوێی دەکات، گوێگر بە دەنگ و ڕەنگ ئیشەکە دەبینێ و لەزەینیدا تۆماردەبێت. زۆرجار لە دوای دەستاو دەست و زارەوزارکردنی خەبەری وا، وەستای یەکەمی خەبەرەکە، قسەی خۆی ناناسێتەوە! بەجۆرێک، باوەڕ ناکات ئەو چیرۆکە هەر ئەو چیرۆکی گۆڕینی لەمەڕ خۆی بێت!

فاتە گەڕۆک، زۆر گرنگی بەو هەواڵانە دەدات کە باسی جووتبوون و سواربوون‌و شتی وای تێدایە، لەگێڕانەوەو نەخشاندنیان، وا لە گوێگر دەکات بە چاوی خۆی کردەکە ببینێ. دەیەوێ خەون و خەیاڵ و بۆشاییە سێکسیەکانی خۆی، بەو هەواڵانە پڕ بکاتەوە. فاتە گەڕۆک لەوسەری گوندی بۆ ئەوسەری گوندی، ماڵبێری نەدەکرد. زۆرجار، ڕۆژی بە بەرەوە دەماو ماڵەکانی تەوادەکرد، ناچار دەبوو هەندێکیان لە نووکەوە وەرد بداتەوەو پێیاندا بێتەوە. دووبارە مەجلیسی بۆ گەرم دەکردنەوە. فاتە گەڕۆک ببووە ماسی بێ کێرد، لەو گوندەی لە کوێ گوێگری قسەکانی هەبوایە ڕووی لەوێ دەکرد، ئەو ئاواییەی لە زەق زەقە نابوو، لە دوای ئەوەی مێردەکەی کە نۆبەتداری ئاغایان بوو، شەوێک دەکوژرێ، لەوە بەدواوە فاتە ئەو خووەی گرتبوو، لەسەر دەستو مستی خۆی دانیشتبوو. خەڵکی ئاوایی، بەهۆی زمان و بوختانەکانیەوە، هەترەشیان لێی چووبوو، هەواڵەکانی زۆر گەورە دەکرد، بۆیە لە ترسی ئەوەی بوختانێکیان بۆ دروست بکات، زۆربەی خەڵکی ئاوایی مادەلاییان لەبەردەکرد، دەیانگوت هەر قسەیەک ئەگەر کەوتە سەر زاری فاتە گەڕۆکی، یانی کەوتە زاری شارێکی و

سەنەگەی[١] لەسەر هەڵناگرێ تاوەکو ئەنجامێک وەدەست نەکەوێ!

هیزارێکی بە پوولەکـەو کۆترۆکە[٢] و دەرزی لەسـەری بوو، زنجیرێکی بەژێـر چەناگەیەوە بـوو، نێوچاوانی هیزارەکـەی بە دەرزیلـەی ڕەنگاوڕەنگ نەخشێندرابوو، تەپلی سەری کڵاوی هیزارەکەی، قەرەپوولی حەوت دەوڵەتانی پێوەبوو، گیرفانی دایم و درهەم پڕ بوو لە حەتۆتە و گیابەندو بێژان و گوڵەباخو شـەبو زنجەفیلی وشـککراو و هـارڕاو، حەوتدەرمانەشـی[٣] بۆ منداڵی بەبۆنکەوتوو لەلا دەسـت دەکەوت. دوو بسـکی لووسـی بادراو و لوول لە بن هیزارەکـەی بە لاجانگیدا هاتوونەخوار، سـەریان وەکو ماری ڕەش خسـتۆتە سەر مەمکە گەورەکانی. ڕاستە تەمەنێکی بەڕێ کردبوو، لـێ خۆی هەر بە ژنێکی تەڕلووس نیشـان دەدا. هەردووک چاوەکانی پڕ پڕ لە کلی سـوبحانی کردبـوو، قوژبنی چاوەکانی کلاوی لێدەتکا دوو سـێ ددانی کیفزێڕ کردبوو بۆ ئەوەی لە کاتی پێکەنین ببریسـکێتەوە. کراسـێکی گوڵباتمانی بە باخەڵی لەبەردابوو باخـەڵ و دامێنی یەک بوون، کەوایەکی مەخمەرو بنکەوێکی بە لۆکەی لێوچندراو بە ئارمووش[٤] و سـیمی قەزمەنووشتی، ڕستێک مەرجانو

---

١. سەنەگە: وازنەهێنان و دەست هەڵنەگرتن لە یەکێک، لە شتێک، سەرنج خستنەسەر یەکێک بە چڕی.

٢. کۆترۆکە: پەیکەری زۆر بچوکی کۆتر یان پەپوولەو... بۆ جوانی بە دەرزیلە لەنێوچاوانی هیزار قایم دەکرێ.

٣. حەوتدەرمانە: دەرمانێکی میللیی بوو لە حەوت گیای وەک: ڕازیانە، زەنجەفیل و... لەگەڵ هارڕاوەی چەند گیایەکی دیکە، سازدەکرا، دەدرا بەو منداڵانەی کە بە بۆن دەکەوتن.

٤. ئارمووش: ئاوریشم.

مێـــرووی[١] هەمەڕەنگی زۆر کۆنی حەمایل کردبـــوو، دەیگوت ئەو مێروانە جادووی ڕەشـــیان لـــێ خوێندراوە هیچ چاوەزارێک کاری لـــێ ناکات. چەند ڕســـتە توێکڵە پڕتەقاڵ و قەنەفرو مێخەکبەنـــدی لە ملی کردبوو، هەرکە بای بەلایدا ڕەت دەبوو، ئەو دەوروبەرەی پڕ لە بۆنی خۆش دەکرد، بێ ئەوەی بیبینن، دەیانزانی ئەوە فاتەگەڕۆکە بەو نێوەیدا ڕابرد!

فاتە، لە حەژمەتی بێمێردیو خنکانی هەوەســـەکانی، خووی دابووە قسە هێنانو بردنو بوختان داتاشین بۆ خەڵکی ئاوایی.

ئەو بەیانییەی مانـــگای دەبرد بۆ گاڕانێ، چیلکەدارێکی بەدەســـتەوەبوو جارجار بـــە میهرەبانـــی وەحەی لـــە مانگایەکـــەی دەکـــرد، چیلکەدارێکی خۆشەویستیی لە قالچەی مانگایەکەی دەدا. لەوکاتەدا کەوتە بەرچاوی عەزەی قەســـابو بە فاتەی گوت: مانگایەکەت نافرۆشی؟ فاتەش هەردوو دەستی لە بن هەنگڵی خۆی نابوو، هەندێک خۆی ناسکـو دەستنەخوردە نیشانی عەزەی قەساب دا، بەحاڵ لێوەکانی لەســـەریەک ترازاندنو زۆر بە نەجیبزادانە گوتی دەیفرۆشـــم بەس ئەمن نانم لەسەر سێرێ نەســـۆتایە، ماڵی خۆم هەرزانفرۆش ناکەم و ئەگەر کڕیاری باش هەبێت، ماڵی خۆم لەســـەر پشت دەفرۆشم! عەزە گوتی: ئێ زۆر باشـــە ئێمەش لەســـەر چۆک لێت دەکڕیـــن! فاتە گوتی: ئای فەڕت بزربێت عەزەی قەساب یاخوا خۆرەچەرەت[٢] لـێ بکەوی! قسەی خۆت هەر دەکەی، قسەت هەموو بە لەقەمن![٣]

---

١. مێروو: مۆری، مورووو.

٢. خۆرەچەرە: خۆرکە. ناوی میللیی دەردێکە. تووکێکە ژنان لە نێرینەی دەکەن.

٣. لەقەم: بەتوێکڵ و مانادار.

ئەو شــەوە هەتا بەیانی، هەرچەند جاری بە ئاگا دەهات، بیری لەو قسەیەی عەزەی قەساب دەکردەوەو دیمەنی خۆ هاوێشتنە سەرپشتی خۆیو هاتنە سەر چۆکی عەزەی قەسابی تێکەولێکە دەکرد! خۆزگەی دەخواس عەزەی قەساب، ئەو قسەیەی هێنابایە مەیدانی کردن و کرداریّ!

فاتە خۆی بۆ ساغ نەدەکرایەوە لە مابەینی ئارەزووی مێینیانەی خۆیو ئەو قسە هێنان و بردنەی نێو خەڵکی ئاوایی!

فاتە نێوکی خەڵکیشــی دەهێنایەوە، قاوەی بۆ کچو کوڕانی گەنج دەگرتەوە، جگەگورگـو قوزەکەمتیاریشــی لەکن دەســتدەکەوت، زۆربەی ئەو بووکانەی دەگوازرانەوە، فاتەگەڕۆک دەبوو بە بەربووکیانو ئامۆژگاری ســەرجێیکردنیان لەگــەڵ زاوادا دەکــردن کە چــۆن بتوانن ببنــە جێگای چێــژو دڵ ڕازیکردنی زاوای! جگەرەکێشــێکی وەک مارمژ وابوو، قوتوەکــەی، بەیانیان پڕدەکرد لە جغارەی قەمیشــی عەقراوی، هەرکاتێک خۆشناو تووتنیان دەهێنا بۆ گوندی، فاتەگەڕۆک لە هەر گونییە تووتنێک، پەڕە سیغارێکی بافرەی[1] دەپێچایەوە، کاتێــک جغارەکەی بە ئاگــر دەکردو مژێکــی قووڵی لێــدەداو دووکەڵەکەی بۆ ناو ســییەکانی هەڵدەمژی، هەســتێکی لە تامــی تووتنەکە ڕادەگرتو بۆ ئەوەی هەســتی پەرت نەبــێ، هەردووک چاوی لەســەریەک دادەنان. ئینجا مژی دووەمی هەڵدەمیســی و دوکەڵی لە کونە لووتــی دەهێنانەوە، دەیگوت ئەو تووتنە ئــی حاجی عەلی هەرتەلێیە، ئەوەیــان بنپەلکە[2] و بەکارنایێ،

١. بافرە: جۆرێک دەفتەری پەڕەسیگار بوو، بچووک بوو، بە دەست لوول دەکرا و دەپێچرایەوە، تووتنی تێدەکرا و دەکرا بە جگەرە بۆ کێشان.

٢. بنپەلک: ئەو گەڵایانەی کە بە قەدی دارکەتووتنەوە بوون هەر لە سەرێوە

ئەوەیان بێشەمایە[١]، ئەوەیان بۆندارە، ئەوەیان تووتنی ئێنێو مژدەدینانە، بەو جۆرە هەموو تووتنەکانی لێک جیادەکردنەوە، تووتنناسێکی لێزان بوو. هەر جغارەکی دەیکێشا سۆتەکەکەی لەسەر لەپی دەستی ڕۆدەکردو هەڵیدەدایە ناو زاریو دەیخوارد. هیچ سۆتەکێکی جغارەی وەپاش نەدەدا.

فاتە، ئەورۆ بازاڕی لە هەموو ڕۆژانی ڕابردوو خۆشترەو هەگبەکەی دەنگوباسی گەرمی تێدایە، بەجۆرێک گەرمە وەک چێشتی سەر ئاوری هەڵمی لێ هەڵدەستێ. فاتە لە حاڵی وادا، ئەگەر دەستی لەناو زێڕیشدا بێت وازی لێدێنێ، بەس بۆ ئەوەی دەستێکی جوان بە خەبەرەکەیدا بێنێ و وا بیرازێنێتەوە دڵ و هۆشی ئەوانەی گوێی بۆ دەگرن، بەلای خۆیدا ڕابکێشێ. ئەو هەواڵەش بۆ فاتەی هێندە گرنگە وەک ئەوەی مێشی لەدارێدا دیبێتەوە، ئاوا بوو!

بەرلەوەش هیچ باس و بابەتێک بەنێو خەڵکیدا گەورە و بڵاوبکاتەوە، کلێشەی ڕستە سوێندێکی تایبەت بە خۆی هەبوو، لە پێشەوە وەک دەستپێک دەیخواردن: لەسەر بەرماڵی پێغەمبەری زینام لەگەڵ بابی خۆم کردبی، ئەو قسەی دەیکەم ڕاستەو هیچ درۆی تێدا نییە، بە خوای کەس لە زارم نایبیستێ، لە بن باڵی خودام شتێک بە چاوی خۆت نەیبینی گوناحە باسی بکەی، ئەیەڕۆ

---

هەتا خوارێ، هەر بەشەیان جۆرێک ناوی هەبوو: ئەوەی کە لە سەری سەرەوە و گۆپکەکەیەوە بوو گوڵی تووتنەکە لەگەڵ چەند گەڵایەک کە پێیاندەگوت (وەچە) ئەوەیان زۆر بێکەڵک بوو. بەدوای ئەودا ئەو گەڵایانە بووون کە پێیاندەگوت (سەرپەل، سەرپەلک) ئەو جۆرەیان لە گەڵاباشەکانی بوون. بەدوای ئەودا (نێوپەلک) و ئینجا (بنپەلک) و لە بەشی بنەوەیشی چەند گەڵایەک بەهۆی گەرماو هەڵم و ئاوەوە سوور هەڵدەگەڕان پێیاندەگوتن (سورکە) ئەوەشیان بێکەڵک بوو.

١. بێشەما: جۆرێک تووتنی نایابی بۆندارە.

کافرستانییە ئەو ساڵ خوا غەزەبمان لێ دەگرێ، باوەڕ ناکەم دەغرودانمان شین بێت، ئای هەشمان بەسەری، چاکە ڕۆژ ناگیرێ‌و لەباتی بارانێ تەوورداس ناباری، ئاخیری زەمانییە، ئەوەی نەماندیبوو دیتمان، ئاوا بڕوا منداڵمان تووکی لـێ نایە، ئەو خوایە لە ژۆری سەرییەو بۆ خۆی شاهیدە قەت حەز ناکەم غەیبەتی موسـوڵمانان بکەم، توخوا لە زمانی من مەیگێڕنـەوە گوناحبار دەبم، دەڵێن عەولاشێت لە قالۆچە گرتنێ لە ئاقاری، لەبەر سێبەری کەنداری سۆر، بە چاوی خـۆی دیتیتی، ئۆی ئۆی خوایە بە زمانی من نەبێت، شـوانەی قادر قاوەچی مەڕەکـەی لە پەرێزێ کردییە، ئای خوشـکۆرە دەزانن چەنـد گوناحە بۆ ئێمە ئەو قسـانە بگێڕینەوە! بە هەردوو دەستی یەخەی بنکەوێیەکەی ڕادەتەکاند، خۆی بەری دەکـرد وەک گوناهەکان لە خۆی بتەکێنـێ، دەیگوت حۆدە حۆدە ئەسـتەغفیرولڵا ئەستەغفیرولڵا بە زمانی من نەبێت خوایە، دەڵێن کوڕێژگە زەکەری لەناو لەشـی دێڵەسـەگەکەی دابـووەو لە حاڵی خۆیانـدا بوونە. بە سـەگەکەی وەبووەو بەری نەداوە تاوەکو بەدێمکان ئاویان بە دێڵەکەیدا کردووە. ئەیـەڕۆ توخوا بە زمانی منـی مەگێڕنەوە، چونکە من بە خۆتان دەمناسـن ژنێکی لە خواترسـم، بوختانکردن کارو پیشـەی من نییە. ئامادەم بمرم بەس غەیبەتی کەس نەکەم، ئامۆژگاریتـان دەکەم پێغەمبەر خوا لێی خۆش بێت دەڵێ عەیبی موسـوڵمانان داپۆشن. خێرتان دەگاتێ، بە خوای کەس لەو زارەی منی گوێ لێنابێت.

چەند سەرەژنێک لە خەڵکی ئاوایی، زۆرجار سەرکۆنەی فاتەگەڕۆکیان دەکرد لەسەر ئەو قسـەو بوختان هێنان و بردنە لە ناو خەڵکی ئاوایی، پێیاندەگوت: کچێ سـەرو بابانت لە هەشێ نێن دەست هەڵگرە، هەتا کەنگێ تەمبێ نابی؟

بەو بوختـــانو تێکدانی ماڵی خەڵکـــەوە بوو مێردەکەت کـــوژراو خوا ئاوای بەســـەرهێنایو ماڵی لێتێکدای! فاتەش لەبەرخۆیـــەوە دەیگوت: نەخێر خوا ماڵی منی تێکدا، بۆیە منیش دەستم کرد بە تێکدانی ماڵی خەڵکی.

جغارەکـــی داگیرســـاند، لەگەڵ مژلێدانـــی و هەســـتراگرتن و بیرکردنەوە، بە مێشـــکیداهات وا چاکـــە لە ڕێگای مەلاژنـــێ ئەو هەواڵـــە بگەیەنێتە مەلای ئاوەدانی. بە ئومێدی ئەوەی لە ڕێگای مەلای بگاتە گوندەکانی دەوروبەریش، هەر بەپەلە جغارەکەی لە نیوەی کوژاندەوەو هەیپێی لێکرد بۆ ماڵی مەلای ئاوەدانی. بڵاوکردنەوەی هەواڵەکەی لە جغارەکێشـــانەکە پێ مەســـەڵەحەتتر بوو. مەلاژن زۆری بەخێرهاتن لـــێ دەکات و گلەییبارانی دەکات: خوشـــکم بۆ وابێ ڕەحمیو سەرمان لـێ نادەیو سەراسومان ناکەی؟ فاتەگەڕۆکیش دەڵێ: بە خوای مەلاژن لە ماڵی نایەمە دەرێو حەزم لە قســـەو قســـەڵۆکان نییە، زەمانەکە خراپ بووە، لەنێو خەڵکی بگەڕێی تووشـــی غەیبەتی موســـوڵمانان دەبی، بە خۆت دەزانی ئەمن کەیفم بە قسان نایە، غەیبەتیش هەر باس مەکە! نامەوێ گوناحبار بم، بە غەوسی ماڵ لە بەغدایێ ئەوە چەند ڕۆژە دەرگای ماڵی کەسم تاریک نەکردیە[١]، ئێستاش ئەگەر لەبەر پرسیاری شەرعی نەبایە پێچکەم نەدەهات بۆ ئێرە، بەخۆم شەرمێ لە مامۆستای دەکەم ئەو پرسیارانەی لـــێ بکەم ئەتۆ وەکی خوشکێکی

---

١. دەرگای ماڵێ کەسم تاریک نەکردیە: لە ڕۆژگاری کۆندا کە هۆدە پەنجەرەی نەبووە، بۆ ڕووناکایی کەڵک تەنها لە دەرگا وەرگیراوە، بۆیە، کاتێک کەسێکی دراوسێ یان غەوارە سەری بە دەرگادا کردبێ، ژوورەکەی تاریک کردووە. جا ئەو کەسەی کە ماوەیەکی زۆر بووە نەچووەتە هیچ ماڵێک، گوتویەتی: دەمێکە دەرگای ماڵی هیچکەسێکم تاریک نەکردووە!

لە دایکو بابی دەبێت ئەو زەحمەتەم بۆ بکێشـــی پرســـیارە شـــەرعیەکەم بۆ لە مامۆســـتای بکەیو وەڵامەکەشم بۆ وەربگرەوە، مەلاژن گوتی: زۆر باشە بەچاوان، ئەدی مەلای ئاوەدانی ئەگەر وەڵامی پرسیاری شەرعی خەڵکی نەداتەوە، خەڵک چ مەجبوورن زەکاتو سەرفترەی بدەنێو بەخێوی بکەن، خوشکۆرە خەڵکی ئاوایی هەقی خۆیانە پرســـیاری شـــەرعی بکەن! فاتەگەڕۆک گوتی: مەلاژن بە خۆت شـــایەدی ئەمن تاقەتی قســـە هێنان و بردنێم نییەو ڕقم لەو کەسەیە غەیبەتی خەڵکی دەکات. بەو خوایەی لە ژۆری سەری ئاگای لە جوولەی مارو مێروویە، بەو قورعانەی مەلای مێردت لەسەر ڕانی خۆی دانایە، ئەو قسەم هێندە پێ ناخۆشە لە زاری من بڵاوبێتەوە، دەڵێی لەسەر ڕوانم ڕادەکێشن، چیبکەم دەست لە جەرگی خۆم دەنێم، بەڵام ناچارم دەبێ بزانم لەڕووی شـــەرعی تەکلیفی ئێمە چییە؟ لێت ناشـــارمەوە ئەوە چەند ڕۆژێکە ئەو قســـەو قەبیعاتە وەکو ئاگرو پوش لە گوندی بڵاوبۆتـــەوە، هەموو ماڵێکی گرتۆتـــەوە، لە دوای ئەو گوناحـــە کەبیرەیە، نازانم خەڵکـــی ئاوایی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و ســـەرفترەمان بە بەردەکەوێ یان نا؟ ئاخر ئەوەی نەماندیتبوو دیتمان، ئەوەی نەمانبیستبوو، بیستمان. خوشکۆرە کافرســـتانی ڕابووە، نازانم شادەی ڕوو لە کێهان لای بێنم بۆ ئەوەی گومڕا نەبم، بە خوای هەموو خەڵکی گوندی دەڵێن، مەلاژن لە ڕووی شـــەرعی لە مەلای زیاتر عیلمی لە سینگیدایە!

بۆ گرنگ نیشـــاندانی هەواڵەکە، ســـەیرێکی هەر چوار دەوری خۆی کردو لـــە دەرگای ڕوانی بۆ ئـــەوەی دڵنیابێتەوە لە خۆی و لـــە مەلاژنێ زیاتر کەس گوێبیستی قسەکان نییە: دەڵێن عەولاشـــێت لە ئاقاری لە کاتی کۆکردنەوەی قالۆچـــان نازانم کێی دیکەشـــی لەگەڵ بـــووە، بە چاوی خۆیان شـــوانەی قادر

قاوەچیان دیوە دێڵەسەگەکەی خۆی گاوە، لەبەر سێبەری کەنداری سۆر، هەر کە چاوی بەوانە کەتیە، ویستوویەتی خۆی خڕ بکاتەوە. بەڵام کار لە کار ترازاوە، ئۆی خوایە بە گوناح و غەیبەتمان بۆ نەنووسی. بە قوربانت بم مەلاژن با مامۆستا لەناو ئەو کتێبە ئەستوور ئەستوورانە لۆم تەماشای کتێبێ بکات، بزانێ خەڵکی گوندی چۆن لە گوناحان پاک دەبینەوە. شوانەی قادر قاوەچی چۆن غوسڵی لێ دەردەچێت و لە ڕووی شەرعی چۆن سزا دەدرێ؟!

مەلاژنیش کەوتە بن بارەکی خەمان، شەوێ لەسەر جێگای، ئەوەی فاتەگەڕۆک بۆی باس کردبوو هوردو باریک هەمووی بۆ مەلای مێردی گێڕایەوە. مەلاش بەدەم ئەستەغفیروڵڵا ئەستەغفیروڵڵا! خوایە پەنامان بدەی و مەحفوزمان بکەی، شەیتان زەفەرمان پێ نەبات، ئەوە گوناحی کەبیرەیە، هەتتا لە کەبیرەش هەراشتترە! دەبێت چەند مەلایەکی دیکەش ئاگادار بکەم هەموومان پێکەوە موتتەفیق بڕیاری لەسەر بدەین.

لە دوای چەند دانیشتن بە هاوکاری چەند مەلایەکی دوازدە عیلم بڕیاری ئەوە دەدەن دەبێت دەلعازی دێڵە سەگەکە بکوژرێ، چونکە مایل بووە بۆ ئەنجامدانی ئەو گوناحە کەبیرەیەو هاوکاری شەیتانی کردییە. ئەوەی لەگەڵ سەگ جیماع بکات، بەو شێوەیە غوسڵی لێ دەردەچێت، بۆیە شوانەی قادر قاوەچی دەبێت دوو کەرپووچان[1] لەبن پێی خۆی دابنێ، ئاوی بە خۆیدا بکات هەتاوەکو هەردوو کەرپووچەکە دەتوێنەوە. ئەوکاتە شوانە غوسڵی لێ دەردەچێ و دوایە دەکرێ بیر لە سزاکەی بکەینەوە، لەوانەیە تاوەکو ڕەجمیش

---

١. کەرپووچ: خشتی سوور، خشتی لە قوڕی سوورکراوە لە کوورەیدا.

بڕوات! دوور نییە بگاتە سەنگەبەردیش لە شەللاق و مەللاقی ئەولاترە!

شوانە، ناخۆشترین وەختەکانی ژیانی خۆی بەڕێ دەکات بێ ئەوەی بزانێ گەردوون لەو چەرخو خولەیدا بەکوێیدا دەداو چ پەندێکی دیکەی بەسەر دێنێ! جار ناجار گوێی لە منداڵانی ئاواییە لەسەر دیواری حەساری دەڵێن: ماڵی شوانەی سەگێ!

ئەو ڕۆژەی، کە قەت لە یادەوەریی بەرنابێتەوەخوار، کاتێک لە دەلاقەیڕا چاوی لێبوو گوللەیەکی بەرازکوژی تاپڕییان بە کەلەکەی سەگەکەی وەناو کوفارەی خوێن فلوچقەی کردو سەگەکە دەمی بۆ برینەکەی خۆی بردو بۆنی بارووتەکەی کرد. چاوی بۆ شوانەی دەگێڕاو دووجار قووڕایەوەو گیانی سپارد. دەسەڵاتی نەبوو پارێزگاری لە سەیەکەی بکات، دەشترسا بە مەرەدی سەگەکەی ببەن.

دایکی شوانە کە بینی کوڕەکەی بۆ سەگەکەی بەکوڵ دەگری، زۆر دڵتەنگ بوو، زۆریش دەترسا لە دوای غوسڵ لێدەرکردنی، هەمان چارەنووسی سەگەکەی چاوەڕوانی شوانەی کوڕی بێت، دەترسا فەتوای مەلاکان سزایەکی کوێرانەی وای بەسەردا بدەن، کەس نەتوانێ ڕەتی بکاتەوە! سەری شوانەی بە سینگییەوە نابوو، هۆن هۆن فرمێسکی گەرمی بە سەر ڕوومەتیدا دەباراندن، گوتی: کوڕی خۆم ئەو ژنە، فاتە گەڕۆک، دەستت لە یەخەی ناکاتەوەو دەستبەردار نابێ هەتاوەکو بەفەیزێکت(١) نەگەیەنێ، ئاخر هەر ئەو سەر بەهەشە بابانکۆرەبوو مەلیعی قوڕبەسەری بێگوناحی بە دەستی ئەکرەمی کوڕی خۆی بەکوشتن دا، ئاخر کەس هەیە بە قسەی خەڵکی ئاوا دایکی خۆی بکوژێ؟!، هەتا ئەو ژنە لەو گوندەی بێت کەس لە زمانی سەلامەت دەرناچێت، بە قسەی

---

١. فەیز: فەتارەت، بەڵا و...

دایکی خۆت بکە هیچ لە ئەوشـــەو زووتر نییە هەر کە تاریک کەوتە گوندی، ســـەری خۆت هەڵگرەو بڕۆ، بڕۆ هەتا دەتوانی بڕۆ، بۆ شوێنێک بڕۆ نە عەتارو نە بەقاڵ و نە دێوەرەی ئەو گوندانەشـــی نەگاتێ، بۆ ئەوەی کەس نەتناسێتەوە، ئاخر کەس هەیە حەز بکات جگەرگۆشـــەکەی دەربەدەربێت، بەس چیبکەم؟ لە چارەنووست دەترسـێم هەرچەند جاری گوندی گوێم لێدەبێت دەڵێن شوانەی ســـەگگێ، خەریکە دەتوێمەوەو حەز دەکەم دەلعازی بمرم، بەڵام چی بکەم ڕوح لە جێیەکیەو هەرناقەنێ و بێتەدەرێ و ڕزگارم بێت!

شـــوانە، تازەلاوێکـــی زۆر بە کەڵک بوو بۆ خەڵکـــی ئاوایی، خەڵک وەک ئەستێرەیەک تەماشایان دەکرد، مەزەندەیان دەکرد لە دوارۆژدا ببێتە چرایەک گوندەکەیـــان ڕوونـــاک بکاتەوە. وەلـــێ مەخابـــن، وەک مانگی چـــواردە لە پەڵەهەورێکی ڕەشی چڵکنی بوختاندا ون بوو!

هەر لە دوای نوێژی شێوان، دروست لەوکاتەی هەموو خەڵکی ئاوایی خەریکی نانخواردن بوون، خۆی پێچایەوە، دایکی چەند نوردیە نانێکو دوو سەلکەپەنیری بۆ لە تێشتەبەرەکەی نا و شوانە بە جەمەدانیەکەی لە شانی خۆی ڕاست و چەپ گرێیدا. دێمکەئاوێکی بە گۆمکی گۆپاڵەکەیەوە لەسەر شانی خۆی دانا. دایکی تێر ماچی دەکاتو دەڵێ کوڕم ئەمن چەندەت لـێ ڕازیمە، خواش سەد هێندەت لـێ ڕازی بێت، یاخوا دایکت کوێر بێتو بە بێت نەژیم! چەند ئایەتەلکورسیەکی بە دوایدا دەخوێنێ. تارمایی شـــوانەی لـــە تاریکیدا ون بوو، تاریکایی قووتیدا. شـــوانە بە تەمەن ڕاستە منداڵە بەڵام بە شەو و نیوەشەوان ئەوەندەی دەشتودەرو شەوینو شیوەخوار دیوون، زۆر لە پێش تەمەنی خۆیەتی!

ئەو ونبوونە، چل و حەوت ساڵی ڕەبەقی خایاند. لە دوای دوو شەو و دوو ڕۆژ

ڕێ ڕۆیشتن، لە ڕۆژی سێیەمدا لەسەر کانیو ئاوێکی زوڵاڵ دانیشت و ئەو چەند ورتکە نانەی لە تێشـــتەبەرەو جەمەدانیەکەی پێی مـــاوە دەیخوا. زۆر بە داخ و کەسەرەوە لە بنی کانییەکە دەڕوانێ، ڕەنگە ژیان ئەو ساتە داخراوە بێت، کە نیگام خۆی لەنێو ئارامی و زوڵاڵی ئەو کانیاوە نقوم دەکات و وردوخاش دەبێت، ئازارێک لە ناخەوە ڕۆحی دەکرۆشت، چۆن کەوتە تەنیاییو بێکەسی و چۆن و کەی کۆتایی دێت؟ کەوتە بیرکردنەوە لە سەرنویشـــت و ئایندەی نادیـــاری خۆیو ئەو ڕووداوە دروستکراوانەی دەستی مرۆڤەکان، کە من بە هەناسەساردی لە پشت سەری خۆم جێمهێشـــتوونو بیرهاتنەوەیان دەمتەزێنن! لەو شوێنە چۆڵە، ئەوەی لە دەستی دەهات چەند نوێژو لە خوا پاڕانەوەو گریانو دادو فیغان بوو بۆ خۆی.

چیدی فرمێسکەکان لە بنی چاوەکانمدا ناشێرمەوە، هەنسکم لە گەروومدا ناخنکێنم، پێشیان بەردەدەم و ڕەهایان دەکەم.

لە دەســـتپێکی نوێژەکانی، دەکەوێتە بەر سەرنجو تەماشای چەند ڕێبوارێک کە ڕێگایان دێتەوە ســـەر ئەو کانیاوە، هەر دوور بـــە دوور دەبینن ئەو لاوە، نوێژ لەســـەر نوێژ دەکاتو بەکـــوڵ بۆ حاڵی خۆی دەگری، ڕێبـــوارەکان وا تێدەگەن ئەو عابیدە لە خەڵوەتگا هاتۆتە ســـەر ئەو کانییە بۆ نوێژ و خواپەرســـتی، لە بۆتەی خوداناســـیدا قاڵ بۆتەوە. بەئەسپایی لە پشـــتییەوە دادەنیشن، گوێ لەو گریان و هەنیسکە گەرمانە دەگرن، ســـوجدەکانی دەبێتە جێگای تێڕامانی هەمووان، کە ســـەری دەباتە سەر ســـوجدەی، گریانێک دەگریێ، دڵی وەک بەرد دەکات بە ئاو، ئەوەی گریانەکەی بە گوڕتر دەکردو بەناو پارزوونگی زەینیدا تێدەپەڕی و ویژدانی ئازار دەدا، ئای چ شەرمەزارێکیان زاڵمانە بە نێوچاوانی خێزانەکەیاندا هەڵواسی!

بە چاوی پڕ لە خوێنەوە ســـڵاوی نوێژەکەی دایەوە. ڕێبوارەکان پاڵەپەستۆی

یەکتر دەدەن، هەر بابایە هەوڵدەدات هەرچی زووە دەستی بە شێخیرابگات، یەک بە یەک دەست و پێی ماچ دەکەن و پێیدەڵێن ئەتۆ شێخی بەرماڵیی، ئەتۆ ڕەحمەتی ئیلاهی داباریویە سەر ئەو خاکەی! بۆ شوانەیەکی لانەوازو لاکەوتەو لێقەوماو، لەو سەرابی تەمەن بەباچوونە، ئەو هەڵسوکەوتە چاوەڕوان نەکراوە دەنگێکە وزەو وەرەی پێ دەبەخشێ. لێی دەپرسن: ئەی شێخی خەڵوەتکێش ناوت چییە؟

شوانە چەند ساڵە بە خێلی بە کوڕەشێخێکی هاوتەمەنی خۆی دەبات، کە بە پێچەوانەی ماندوویتیو شەونخوونی و ڕەتاندنی خۆی، ئەو کوڕەشێخە خاوێنو دەست و پێی سپی وەک شەعادەی، دەمێکە لە دڵی خۆیدا دەڵێ دەبێ کەی بێ منیش وەکو ئەو کوڕەشێخەی، کە ناوی شێخ سیراجەدینە، خەڵک خزمەتم بکات!

کاتێک دەبینێ بەتەمەنەکانیشیان کڕنۆشی بۆ دەبەنو دەستی ماچ دەکەنو خۆی بە قوربان دەکەن، هەست دەکات کتومت بۆتە ئەو شێخ سیراجەدینە هاوتەمەنەی خۆی کە ساڵانێکە بەخێلی پێوە دەبات. کاتێک دەبینێ بێ پلانو بێ هەوڵدان ئەو خەڵکەی دەوروبەری دەیانەوێ بیکەن بە شێخ سیراجەدین و ژیانێکی نوێ دەست پێدەکات. ئەو خەڵکە بە هەموو بوونیانەوە هەوڵی گۆڕینی ژیانی دەدەن. ئەویش خۆی ڕادەستی ئەو قەدەرە دەکات کە ئەو خەڵکەی دەوروبەری بۆی دەڕێسن.

لەو ڕۆژەوە، هەر بە ڕێککەوت لە شوانەی سەگگێوە بوو بە شێخ سیراجەدین! کاتێک خەڵکی ئاوایی دەبینن هەموو جلەکانی تیتۆڵ تیتۆڵ بوون، یەکێک دەنێرن بۆ شاری جلوبەرگی بۆ بکڕن. ئەو کەسە لەلای بەرگدروو دەڵێ هاتووم جلوبەرگم بۆ بدووری بۆ شێخ سیراجەدینمە. بەرگدوورەکەش کە ناوی شێخ

دەهێنێ، یەکسەر زەینی دەچێتە سەر ئەوەی سەڵتەو کەوای بۆ بدوورێ کە جلی شێخانەیە. کابرا مەبەستی لەناوهێنانی شێخ سیراجەدینی ئەوەیە کە بە خاتری جەدو ئابادی شێخی، بەرگدوورەکە پارەی کەمتری لێوەربگری. تاوەکو سەڵتەو کەوێ دەدروێ، دەچێت شاڵی سەوزو لەچکەی سپیو مێزەری لەنگەری و پێداویستییەکانی شێخایەتی بۆ دەکڕێ، بەجۆرێک دەیگۆڕن هەرچی ئاسەواری شوانەبوونە، پێوەی ناهێڵن. ئەویش خۆیان ڕادەست دەکاتو ڕێشمەی قەدەر شل دەکات، تازە ئەو بەشەی لەخۆی لەدەستدابوو، کابرایەکی کاسبی کڵاشخواری گوندەکەی خۆیان بێت!

خەڵک بەجۆرێک دەیگۆڕن، بۆ خۆیشی خۆی ناناسێتەوە! تۆ بڵێی ئێستا من کێ بمو ببم بە کێ؟! یان ئەو خەڵکە بەنیازن بمکەن بە کێ؟ هەرکات لە فکرانڕادەچێت سێ دیمەن زۆر ئازاری دەدەن، هەرگیز لە یادەوەری و لە زەینی نابنەوە لە ناخەوە ئاگر لە هەناوی بەردەدەن، یەکیان: دیمەنی تەقەکردن لە سەگەکەیو قروچکانەوەی و چاوگێڕانی بۆ دوا دیداری خاوەنەکەی کە شوانەیە. دووەم: دەنگی منداڵانی ئاوایی لەسەر دیواری دەیانگوت ماڵێ شوانە سەگگێی. سێیەم: بەخۆوە گووشینی دایکیو داباراندنی فرمێسکی گەرم بەسەر ڕوومەتی لەکاتی بەڕێکردنی و دواپین دیداریاندا.

گەیشتبووە ئەو باوەڕەی مرۆڤ بە خواستی خۆی نییە ببێت بە چی، ئەوە خەڵکانی دەوروبەرن بڕیار دەدەن بتکەن بە چی! زۆربەی شتەکان دەستکاری مرۆڤ خۆیەتیو ڕانەرو پاڵنەرەکەی هەر مرۆڤە، بۆیە بە گرنگی زانی بگەڕێتەوە ئەو شوێنەی کە خەڵکەکەی ئەویان دروست کردو وەکو قوتبێکو کەسایەتییەکی لە خۆیان گەورەتر لێی دەڕوانن. شێخ سیراجەدین کە زانی

هێشـــتا کەسانێک هەن لە گوندی، سەربردەی شـــوانەی سەگێیان لەبیرماوە و دەیناسنەوە، بڕیاریدا بڕوات و بۆ هەتاهەتایە نەگەڕێتەوە!



# ٥

حومێـرەی حاجی سـمایلی، لە پێش ماڵـی خۆیان خەریکی قەشاویشـی ئەسـپەکەی بوو. سمەی نادر ڕاوچی هەرچەندە شـارەزایی لە ئاژەڵداریدا نەبوو، چێرێکی ئاوسی بۆ ماسـت و دۆی لە عەزەی قەساب کڕیبوو. عەزە ئەو چێرەی بە شـەرتی جحێری پێ فرۆشـتبوو، کە گوایە مێنگینە و هەڕەتی تەمەنیەتی، پەتکێکـی لە ملی چێرەکەی خسـتووە و بـەرەو ماڵی خۆیان بـە دوای خۆیدا ڕایدەکێشـێ. لەسـەر ڕێگای خۆی چاوی بە حومێرەی حاجی سـمایلی و چەند کەسێکی دیکە کەوت.

سـمە، چونکە زۆر جار حومێرەی حاجی سـمایلی بینیبوو تەماشای ددانی وڵاخەبەرزەی دەکرد بۆئەوەی بزانێ ئەو وڵاخە پیرە یان جحێڵە، چونکە وڵاخە بەرزە بە ددانەکانی تەمەنی دیاریدەکرێ، وەک ئەوەی شیلەی[1] پێمابێ زۆر جحێڵە، یان بەرازەی دەرکردبێ هەڕەتییەتی و...

سـمە وای مەزەندە کردبوو چێریش بە ددانەکانی دەزانرێ تەمەنی چەندە،

---

١. شیلە: ددانی شیریی وڵاخی بەرزەی وەک ئەسپ و ئێستر. کە لە تەمەنی سێ مانگی (دوو ساڵ و نیو)یدا فڕێیان دەدا و لەوێوە ددانی بەرازەی دەردەکا. دیاریکردنی تەمەنی وڵاخەبەرزە بەو شیلە و بەرازەیە دەستنیشان دەکرێ.

بۆیە داوای لە حومێرەی کرد تەماشـــای ددانـــی چێرەکەی بۆ بکات، بۆ ئەوەی بزانـــێ تەمەنی چەندە. حومێرەش چاوێکی لـــە هاوڕێکانی داگرت بە ئاماژەی ئەوەی دەنگ نەکەن تاوەکو بەزمێک بە سمەی سازدەکەن. بۆیە هەرکە تەماشای ددانەکانـــی چێرەکەی کرد، فیتوویەکی درێژی لێداو گوتی: ئەو چێرە زۆر پیرە، وەرە تەماشـــای زاری بکە خۆ ددانی سەرەوەی هیچیان نەماون؟ ئەوە کێ قۆڵی بڕیوی؟! ســـمەش بە گورجی چووە پێشەوەو تەماشای ناو زاری چێرەکەی کرد، بە حەپەســـانەوە گوتی: خۆ ڕاســـتە یەک تاقە ددانی سەرەوەی نەماوە! بەدەم جنێوبارانکردنی عەزەی قەساب، ڕێشـــمەی چێرەکەی وەرسووڕاندەوە بۆ ماڵی عەزەی. بـــە بۆڵەبۆڵەوە دەیگوت: چما ئەمن هێنـــدە نەزانم عەزە ئەو کڵاوەم لەسەری بنێ!

بەرلەوەی ســـڵاوی لە عەزەی قەساب بکات، گوتی: هەی خوانەناسی قۆڵبڕ، لەگـــەڵ کەس نا لەگەڵ من؟ ئـــەو درۆیەت چۆن کـــرد؟ واتدەزانی ئەمن هێندە خراپ پێچراومەتەوە، ئەو پیرەچێرە بێ ددانەم بە مێنگوین پێ بفرۆشی؟ نابینی یەک ددانی سەرەوەی لە زاریدا نەماوە!

هەرچەندە عەزەی قەســـاب ســـوێندی خواردو گوتی: هیچ چێرێک ددانی ســـەرەوەی نییە و تەنیا ددانی خوارێی هەیە، بڕۆ تەماشـــای نێو زاری هەموو چێری ئاوایی بکە، ئەگەر یەک چێرت دیتەوە ددانی سەرەوەی هەبێ، پارەکەت دوو بەرابەر دەدەمەوە.

کاتێک سمە بەناو ئاوایی کەوت چێرێکی نەدیتەوە ددانی سەرەوەی هەبێ، ئەوکاتە لەوە تێگەیشت حومێرە هەر بۆ جەفەنگ و بەزم ئەو پەندەی پێداوە.

چەنـــد گەردەلوولێکی بچووک خۆیان لـــە دیواری کۆڵانەکانـــی ناو گوندی

دەسوون، لەدوای خۆیان لە قوژبنی دیوارەکان چەند پشیلۆکە[١] و قەلقەلاشک[٢] و سوورناتکێک[٣] جێدەهێڵن، ئەوەش نیشانەی هاتنی پایزە. پاشنیوەڕۆی ڕۆژێکی پایزەو ئاســمان ڕەنگی زیوینی پۆشیوە، ئاســمان وەکو ئۆقیانووسێکی مەند و بەرین، کۆتایی دیار نییە. کۆترەکان لەســەر جێ جۆخینــان ئەو دەنکە گەنمانە هەڵدەگرنەوە لە پاشماوەی کووزرو بنجۆخینەکان وەک خاپەڕۆک بەجێماون. هەر کە شــەڕەبەردەقانی منداڵانی ئاوایی دەستی پێکرد، شریقەی لچکە بەردەقانیو گڤەی بەردەکان کۆترەکانیان تەقاند بۆ پەڕپەڕۆچکەی ئاسمانێ و لە قەوامی بەردی بەردەقانییەکان دەرچوون. سەگەکان لە پەنای لەودە کایەکان لە ترسی بەردەفڕکێی منداڵان، ســەر دەرناهێنن. لە گوندی شەڕە بەردەقانییەکە سەگ ساحێبی خۆی ناناســێتەوە. شــەڕەبەردێکە تیری بەچەپەی تێ بڕ ناکات![٤] منداڵانی ئاوایی بووینــە دووبــەرەی دژ بە یــەک و، وەک میراتی بابیان بەش بکــەن! بە هۆی گڤەگڤی بەردان کەس ناتوانێ سەر وەدەرنێ. ئەو چەند ئەسپسوارەی پێش دەرگای ماڵی دەروێشۆکی، سەرنجی منداڵەکانی ڕاکێشا. منداڵان زانینی ئامانجی ئەو سوارانەیان لا گرنگتر بوو لە بەردەوامی شەڕەبەردەکە، بۆیە گوتیان کوڕینە ئێستا وا چاکە شەڕەکەی ڕاگرین، بچینە لای ماڵی دەروێشۆکی بزانین ئەو ئەسپسوارانە

---

١. پشیلۆکە: گوڵێکی سپییە کە وشک دەبێت وەک لۆکە سپی و سووک دەبێت. شکوور مستەفا لە وەرگێڕانی ڕۆمانی (کاریتە)دا (ئیزگیل)ی بۆ داناوە.

٢. قەلقەلاشک: قانگەلاشک، قەدی ڕووەکی وشک و نێوبۆش.

٣. سورناتک: پنچکەگیایەکی ڕەنگ سووری ژەنگاوییە، بۆ مەڕ زیانبەخشە، ئەگەر بیخوات دەموچاوی خورووی تێدەکەوی و بریندار دەبێ، دەڵێن سورناتک بردوویەتی.

٤. تیری بە چەپەی تێ بڕ ناکات: ئەوانەی کە چەپەن، تیر و پلاری دەستیان زۆر بەهێزە.

بۆچ شــتێکی هاتوونەتە گوندەکەمان؟ بەردەقانیەکانیان حەمایل کردو لە پشتی خۆیان بەســتا، ئەوەش نیشانەی شــەڕ ڕاگرتن بوو. چەند برینداریێکی سووکیان هەبوو لە هــەردوولا پەڕۆکیان لە برینەکانیان پێچــاو، هەیپێیان لێکرد بۆ پێش ماڵی دەروێشۆکی. هەموو منداڵی ئاوایی لە پێش ماڵی دەروێشۆکی کۆبوونەوە، دەمیان بە دەرکی کوندەی سەر کوندەلانی وەنا، دەتگوت تەریفە بووینە لە تینوان، یەک لــە دوای یەک دەرکی کوندەکەیان لە یەکتــری وەردەگرت. بۆ ئەوەی بڵاوە بە منداڵەکان بکەن هەریەکە چەند دەنکە شــەکرۆکەی ڕازیانەی گوومشــکیان دانــێ، بەڵام ئەوەی منداڵانو هەموو خەڵکی گوندی هەراســان کردبوو، هۆکاری هاتنی ئەو سوارانە بوو، زۆر بە تاسەوە بوون بۆ زانینی نیەتی هاتنیان، هەریەکەو بەجۆرێــک مەزەندەی دەکرد: ڕەنگــە خزمی دووریان بن یان شــوانەکەیان زەڕی کــردووە! باش بوو خەڵکی گوندی ڕزگاریان بوو لــەو دڵەراوکێیەو هەر زوو بۆیان ئاشکرا بوو ئەو سوارانە داخوازیکەری بەگمێ کچی دەروێشۆکینە.

بەگم، کچێکــی قەیرەی لەندەهۆری بــە قەلافەتی نەفرەجــا[١]، کتومت ڕۆســتەمی زاڵ، زۆر کەس دەیانگوت: بەگم بۆ پیاوێکی پاڵەوان دروستکراوە، بــەڵام لە کۆتایی دروســتکردنەکە لێیــان تێکچووەو بە هەڵــە کردوویانە بە ژن. چونکــە زۆربــەی تایبەتمەندیەکانی پیاوی هەڵگرتبوو، ســەرو کەللەی بەگمێ بەقەدەر ســەرو کەللەی دوو پیاوی ئاسایی دەبێ، چەند داوە مووێکی ڕەشــی ئەســتووری بەســەر چەناگەو لاجانگ و ســمێڵیەوەیە، برۆکانی وەک دەســکەکەوەری لێک بڵاو، دەســتی هیچ ئارایشــتگەرێکی وێ نەکەوتووە.

---

١. نەفرەجا: زەبەلاح، قەد و قیافەی زل و ناڕێک.

دەستو ناو لەپی لەگەڵ کارکردن هێندە گەورە بووینە هەرگیز بە دەستی خانمی ماڵ ناچێت، ناو لەپی دەستی وا خاراوە شمشێری میسری نایبڕێ. بەگم وەک ژنانی ئاسایی چاوان ڕەش ناکات بە کلی سوبحانیو بسکی لوول ناکات، هەردوو بسکی بە بناگوێدا لە پشتی سەری خۆی دەبەستا بۆ کارکردن تاوەکو بەرچاوی نەگرن، کەشکو داندۆکی دەستی بەگمێ، بە هۆی گەورەیی نێولەپی دەستی، لەنێو کەشکو داندۆکی هەموو ژنانی ئاوایی دیاربوو، داندۆکەکان بە قەدەر کفتەی برِێشی گەورەن، کاتێک بەگم دەستی دەدایە خاکەناسی، هەندی بلێی یەکو دوو قوڕی هەزار خشتی دەگرتەوە، دەستباری[١] جەواڵە گەنمی لەگەڵ پیاوان دەگرتو ڕەشکەکای باردەکرد. ئەو پشتیە قەسەڵەی بەگم لە پشتی خۆی هەڵدەدا بە چوار ژن هەڵنەدەگیرا. دوو کوندەی نێریانی ئاوێی لەسەریەک لە پشتێ دەکرد، هەتا سەر کوندەرانی داینەدەنان، بۆ سواقدانی سەری خانوو، لەودەی کا، قەت مارنجی بەکارنەدەهێنا، چونکە دەستی بە قەدەر مارنجێک قوڕی ڕادەداو لووسی دەکرد.

دەروێشۆک زۆر بەخێرهاتنی میوانەکانی کرد. یەک لە میوانەکان کە دیاربوو دەمڕاستو ڕیشسپیان بوو، گوتی: کاک دەروێش بە پیاومان زانیوی بۆیە هاتووینە سەر بەڕەکەت، مەبەست لە هاتنمان ئەوەیە داوات لێ دەکەین کوڕی حاجی خارندی بکەیتە کوڕو خزمەتکاری خۆت و بەگمی کچتی لێ

١. دەستبار: لەکاتی بارکردنی جەواڵەگەنم لە وڵاغ، دوو کەس دەستیان تێک دەگرن، وەک ئەوەی ئامێز لە جەواڵەکە بدەن، دەستەکانی دیکەشیان دەخەنە بن قوژبنی جەواڵەکە. کەسی سێیەمیش کە لە دواوە دەست بە جەواڵ یان بارەکەوە دەگرێ و ئاوای سەرپشتی باربەرەکەی دەکات، پێیدەگوترێ پشتبار.

مارە بکەی‌و قسـەمان نەشکێنی لەو مەجریسـەی. دەروێشۆک کەوتە سەر ئازایەتـی‌و پاڵەوانیەتی‌و ماڵداریکەری بەگمـێ کچی و گوتی: کچی من کچ نییە زەلامە زەلام، قەسـەم بە خوای ئیشی سێ کوڕانم بۆ دەکات! حاجی خارند گوتی: کاک دەروێش پێویسـت ناکات ئەتۆ باسـی بەگمێ بۆ من بکەی، لەو ڕۆژەی بە چاوی خۆم بینیم بەرامپیلی گرێدابوو، پێنج خشـتی لەسەر پشتی خۆی دانابوو، بە چاوی خۆم دیتم خشـتی لە سێ بەژنە زەلامی بۆ سەر سەری وەسـتای داوێتو هەڵدەدا ئاسمانێ، لەو ڕۆژەوە سـوێندم خوارد ئەگەر خوا بە قسمەت بکات دەبێ ئەو کچەی بکەمە بووکی خۆم، ئەوجا ئێمە کچمان نییە ژن بەژنەی بکەین، دەبێت بە ماڵی دنیایێ لەگەڵمان پێک بێی. دەروێشـۆک گوتی: یەک کوڕی گچکەم هەیە هێشـتا بە دەساڵی دیکەش هی ژنێ نییە، ئەمن شـیربابییم[1] وەرنەدەگرت، بەڵام ناچارم چونکە پاشـی دە دوازدە ساڵی دیکـە ناتوانم ژنی بۆ کوڕەکـەم بێنم هەر کچەکی بیخـوازم ماڵی دنیایێیان دەوێتو داوای شیربابییمان لـێ دەکەن. دەزانم ئەوەی پارەی شیربابیی وەربگرێ دوور نییە ناولەپی دەستی کون بێت! بەڵام ناچارم ئەمنیش ئەوە چەند ساڵە ئەو کچەی بەخێو دەکەم، ناکرێ هەر ئاوا بە سـووک‌و ئاسانی‌و بەلاش لە قەبەری کوڕی خەڵکی بکەم، هەر دەبمە سـۆدرەی خزمان! ئاخر هەتا گیسکەکی گەورە دەکەی هەردوو چاوت دێنەدەرێ، ئەوەندەی زەحمەتی پێوە بکێشی، ئەوجا بێنە بەرچاوی خۆت چۆن کچەکی گەورە دەکەی! دەروێشـۆک گوتی: حاجی خارند مامرەت لەوسەرەی خۆشە بۆ ئەوەی لە دوایێ گازاندەم لـێ نەکەی، قسەی خۆم

١. شیربابیی: شیربەها. هەقی شیر و بەخێوکردنی کچ تا گەورەکردن و بە مێرددانی لە ماڵی باوکی.

لەوسەرەی دەکەم، دەبێت لێم بەپەلە نەبی هەتا ئەو دوو هۆڵە مەڕەی بناغەمان دانایە تەواوی دەکەین، چونکە بەگمم لەدەست بیتەوە مەعتەل دەبم، سەری خانووان و لەودەی کای سواق بدەین بووکی خۆت بگۆزەوە، ئەمەش قوڕکاریمان تەواودەبێتو حەز دەکەن ڕۆژی دوایی هەڕوونە جلکان، هەرچەندە دەزانم بۆ ساڵی دادێ، کەسم بەدەستەوە نامێنی بۆ مەلۆ و گیشەو شەغرەو ڕەشکەکا کێشانەوەو دەستباری جەواڵە گەنمو قوڕکاری، بەڵام کچەو دەبێ بچێتە ڕێوجێگای خۆیو ماڵو مێردی خۆی، ئەولاد هەتا مردنێ لەگەڵ دایکو باوکی نامێنێ، کوڕ ژنێ دێنێو کچ مێردی دەکات، ئەوە سوننەتی ژیانە، ئێمەش هەر ئاوا لە دایکو باوکی خۆمان جیابووینەوە، یەک لە ڕیشسپیەکان گوتی: کەواتە با مامۆستا دەست بە مارە کردنێ بکات. مامۆستا گوتی: کەستان تەسبیحی نەگێڕیو هەمووتان دەستتان لەسەر ئەژنۆتان دانێن، نەوەک خوانەخواستە یەکێک زاوای ببەستێو بە زاوا نەبێ!

مەلا کە بینی هەندێکیان بێزاربوون لەو قسە چەندبارەیە، فاتیحایەکی هەدییە کردو هەموو پێکەوە بە زاوایان گوت هەستە کوڕە دەستی خەزورت و مامۆستاو ڕیشسپییەکانیش ماچ بکە. پارەی مەلایان دا بۆ کرێی ئەو چەند قسەی کردبووی. هەر کە گەڕانەوە، حاجی خارند چەند کاوڕە نێرێکی لە مەیدانێ کرد بۆ فرۆشتن تاوەکو زێڕو جلکی بووکێی پێ بکڕێ، پارەی خستە تەنکەی باخەڵیو لە چاوەڕوانی وەڵامی دەروێشۆکی بوو. دوای ئەوەی دەروێشۆک هەموو قوڕکاری و ئیشە سەختەکانی بە بەگمێ ئەنجام دا، وەڵامی دایە حاجی خارندی: با بێن بچنە جلکانو بووکی خۆیان لەدەست دەنێم. حاجی خارندو چەند ژنێکی ماڵی بووکێو حاجی ژن و بەگم، لەگەڵ

گەردی بەیانی هەیپێیان لێکرد بۆ سـەر جـادەی قیر، لەدوای کاتێکی کەم لە چاوەڕوانی، پەستی[١] عەزیز عەدلانی بەجیرەجیر بەدیارکەوت. حاجی خارند کەشیدەی لە سەری کردەوەو دوو سێ جاری کەشیدە ڕاوەشاند، بۆ ئەوەی دیقەتی شـۆفێرەکە بۆ لای خۆیان ڕابکێشـێ کە ئەوانیش سەرنشینن و دەچنە شاری. پەست ڕایگرتو سەرکەوتن، سەرنشـینەکان زۆریان حاجی خارندیان دەناسی. لەدوای بەخێرهێنان و هەواڵ پرسی‌و بارودۆخی ورساتی[٢] و کاوڕەنێر لە بازاڕی جووتی چەندی دەکا؟ پرسـیاریان لێکرد خێرە لەگەڵ ئـەو ژن و ژاڵەی دەچیە شاری؟ حاجی خارند گوتی: ئیشـی خێرمان بەدەستەوەیە، دەچینە جلکان بۆ بووکێ. هەموویان پێکەوە پیرۆزباییان لێکردو گوتیان ئینشائەڵڵا پێکەوە پیرو خەرۆ دەبن، بووکەکەت یەکەم منداڵی نۆبەرەی کوڕ دەبێت، بە حەول و قووەتی خودای دوازدە کوڕی کاکۆڵ سۆرت بۆ بێنی.

تازە دووکاندارەکانی ناو قەیسـەری، دوکانەکانیان دەکردەوەو بە مەسینەیەکەوە پێش دووکانەکانیان دەڕشـاندو وەستا لە شـاگردەکانیان ڕادەخوڕی، سەفارچی[٣] و خمچـی‌و ئاسـنگەرەکان ڕەژوویان دەگەشـاندەوەو دەلاڵـەکان پارچە بەڕەیەک، مافورێکی سـەرەنازیان بە شانیاندا دابوو، هاواریان دەکرد: ئەوەڵمەزاد دینارەک و دوو عانە! یەکی دی دەیگوت: دینارەک و سێ عانە. بەوجۆرە نرخەکەی هەڵدەکشا

١. پەست: ئۆتۆمبێلێکی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیست بوو، بۆدیەکەی لە دار دروست کرابوو، بۆ گواستنەوەی سەرنشین و پێداویستیی ڕۆژانەی خەڵک بەکاردەهات.

٢. ورسات: وڵسات، ماڵات و حەیوان.

٣. سەفارچی: مسگەر، مزگەر، ئەوانەی کە مەنجەڵ و شتی لەو جۆرە سپی دەکەنەوە.

تاوەکو دوایی لە کۆتایی هاواری دەکرد: کەس نەما، ئاخیرمەزاد، دەستی فرۆشیارو کڕیاریان لەناو دەستی یەکتر دەناو، شافلخێر، یانی خێری لێ ببینی!

حاجی خارند لە پێشەوە دەڕواو ئەوانی دیکە بەدوایەوە بەناو قەیسەرییان. بۆنو بەرامی بەهاراتو زنجەفیل و مێخەکو گوڵاو، مێشک و لووتی هەمووانی پڕ دەکرد. هەموویان لە تەماشای شار قوشقی دەبن. یەکەم شت کە بە نیازبوون بیکڕن جووتێ پێڵاوی بنعانەی[١] زەردی زرۆقی[٢] بوو بۆ بووکێ، بەڵام هەموو قەیسەریان لێکدا، پێڵاوفرۆش نەما سەری پێدا نەگرن، لەو شارەی هیچ پێڵاوێکی ژنانەیان دەست نەکەوت بەپێی بەگمێ بکات! تەنانەت پێڵاوی پیاوانیش بەپێی نەدەکرد، هەر هەمووی بچووک بوون بۆی! بەناچاری بڕیارياندا کڵاشی بۆ بنپەرگ[٣] بدەنو بۆی بچنن. ئاخر ئەو ڕۆژانەی ژنانی ئاوایی دەچوونە پەرۆشان و چیلکەو سەرگینو قەسەڵان، پێیان لەجێی پێی بەگمێ دادەنا، شوێن پێی ئەوها تەخت دەکرد وەک باگردێنی لێدرا بێت، قونجرکەو دڕکو چقڵی لێ پاک دەکردەوە.

لە دوای ئەوەی بڕیارياندا لەباتیی پێڵاوی قۆندەرەی بنعانەی زەردی زرۆقی، کڵاشی بۆ بچنن، ڕوویان کردە کۆڵانی زێڕنگران لە دوکانی زێڕنگرەکە هەرچەندی

---

١. پێڵاوی بنعانە: پێڵاوێکی پانی بەرزی ژنانە بوو، بنی پاشپانییەکەی بەقەدەر عانەیەک بوو، بۆ بووک دەکڕدرا.

٢. زەردی زرۆقی: ڕەنگ زەردێکی بریقەدار.

٣. بنپەرگ: کڵاش بنەکەی لە تایەی ئۆتۆمبیل دەبڕدراو بە موو بنپەرگ دەدرا، واتا ڕزێکیان دەژنی، چونکە موو بە تەڕبوون خراپ نابێت، بەو ڕیزچنینە دەگوترێ بنپەرگ.

بازنەکانیان تاقی کردەوە هیچ بازنەیەک بە قۆڵ و باسکی بەگمێی نەکرد! دەستی نەچووە نێو هیچ یەک لە بازنەکان، هەمووی بۆ بچووک بوون. هەر گوارەیەکی بە گوێیان دەگرت بچووک بوو، زێڕنگرە قۆشمە شارییەکە، کە زانی ئەو بازنەو گوارەو زێڕانــەی لای ئەویان بــە دڵ نییە یان بۆی نابێ، وەک گاڵتــە پێکردنێک گوتی: مەگەر دوو فانۆســـی بە قوڕپی بۆ بکەنە گــوارە! ئەو گاڵتەیە هەمووانی ئەبڵەق کرد. حاجی خارند خۆی لـــێ ڕاستو چەپ‌و سوورو شین کرد: هەی سەرسەری شەللاتی، پیاوی قەشمەریان بناســە! لێرە لە ترسی پۆلیس‌و حەپسخانەی ناوێرم هیچــت پێ بڵێم‌و هیچت لـــێ بکەم، بریا بــە بریاداران لــە ناوبەندانی زووری بای، ئەوجا دەتبینـــی خڕکەبەردی وەقەیی[1] و نیـــو وەقەییت کو وەکی تەرزەی لەســـەر تریقەی پشتێ هەر دەقۆزیەوە! زێڕنگرە قۆشمەکە گوتی: حاجی لە مێژە بـــە ڕەفتی کەفیل بەربووی؟ بە گاڵتە وای پێگــوت، حاجی گوتی: وەرن با بڕۆین هەتـــا زەرەکی پێ نەکردوومە! لە دوکانی زێڕینگری هاتنە دەرێ بە تووڕەیی و بێ ماڵئاوایی. حاجی خارند لەسەر دەرگای دوکانێ گوتی: بەشم لە هەر چوار مەزهەبی خوای براب‌ێ، ئەگەر زێڕم لە عەرزو عاســـمانان بەدەســـت نەکەوێ، زێڕی لەو بێ حورمەتەی ناکڕم‌و مامرەتی لەگەڵ سەرسەرییان درووست نییە!

یەک لە گیرفانبڕەکان، لە بازاڕی زێڕینگران کە چاوی بەو خەڵکە دێهاتییە کەوت، لە دڵی خۆی گوتی ئەو دەشـــتەکیانە[2] دڵساف‌و خۆشباوەڕن وا دیارە پـــارەی زۆریان پێیە بۆیە خەریکی زێڕ کڕینن، بەدوایان کەوت گوێی لـــێ بوو

١. وەقە: هۆقە کە بریتییە لە دوو کیلۆو نیو.

٢. دەشتەکی: گوندی، لادێی. لە ئاخاوتن و فەرهەنگی خەڵکی سنووری هەلێرێ، مەبەست لە دەشت، گوندە.

حاجیژن گوتی: خارند پار ئەگەر منداڵەکانمان سونەت کرد خۆ ئێستاش پارەی کیربڕینێکمان لەسەر مایە، ئینشائەڵڵا کابرای کیربڕ دەبینینەوە پارەکەی بدەینێو ئەو قەرزەمان لەسەر نەمێنێ. حاجی خارند گوتی: ئەرێ ناوی چی بوو، حاجیژن گوتی: لە بیرم نەماوە بەڵام ناوی، ناوی، ناوی، ئا ناوی بەشیری مزەمیدی کیربڕ بوو. هەر بە شیری مەڕی بە بیرم هاتەوە، بەڵام دڵنیام خەرکی هەولێرێ بوو. گیرفانبڕ، ئەو قسانەی هەموو گوێ لێ بوو، جانتایەکی کیربڕانی کڕی لەگەڵ سیدارەیەکی ڕەش لەلای کۆڵانی تەنەکەچییان، لێیان سووڕایەوە و هەر لە دوورڕا: ئای حاجی خارند ئەوە چی دەکەی لێرە؟ ئامێزی کردەوەو حاجی خارندی لە ئامێزێ کرد. حاجی خارندیش لە خوای دەوێ بۆ چاوساغەکی، گوتی: ناتناسمەوە! بەشیر مزەمیدی کیربڕم. ئەمن لە ئاسمانان ئەتۆم دەویست ئێستا لە عەرزیم بەدەست کەوتووی، ئەوە کووە ڕێت بە شاری کەوتییە؟ هەموویان ڕوخساریان گەشایەوە. چاوساغ و شارەزاو ناسیاوێکیان بۆ پەیدابوو! بەرلەوەی بگاتە لای حاجی خارندیو لە ئامێزی بکات، هەر یەکێکیان شتێکی دەگوت ئەوە ناونووسەکەی ئەوێ ساڵێ نییە؟ نا، نا، باشچاوەشەکەیە. یەکی دیکە دەیگوت ئەوە دێوەرە مەنسوور نییە؟

بەشیر مزەمیدی کیربڕ، بۆ ئەوەی هەموویان لەو دڵەڕاوکێیە ڕزگاربکات خۆی بە یەک بە یەکیان ناساند. حاجی خارند دووبارە دەستی لە ملی کرد گوتی: بەو حەجەی تەوافم کردییە، ئەوە حاجیژن دەزانێ ڕۆژی ئەورۆ باسی تۆمان کردییە. دەمگوت، دەبێ جارێکی دیکە بەشیرە فەندی ببینمەوەو ئەو قەرزەشم لەسەر نەمێنێ. لەگەڵ ئەو قسانە دەستی لە باخەڵی ناو جزدانی پارەی دەرهێنا پارەی یەک سوننەتی قەرزارییەکەی بداتێ، بەشیر کە زانی

جزدانــی پارەکــەی لــە کام لای باخەڵی داناوە، دڵنیابوو بە ئاســانی دەســتی پێڕادەگا، ســوێندی خوارد: حاجی بە ســوڵتان مزەفەر لێت وەرناگرم، باســی قەرزی ئەو کیربڕینە بکــەی برادەرایەتیمان نامێنێ! حاجی گوتی کاکە قەرز کۆن دەبێ بەڵام نافەوتێ! حاجی خارند گوتی: مادام پارەی قەرزەکەم لێوەرناگری نیــوەڕۆ لە لۆقنتەخانەیەکی باش دەبێ دەعوەتی من بی! بەشــیر گوتی دڵت ناشکێنم ئەوەیان ڕێی تێدەچێ، قەت ڕێم پێ نەدەدان بچنە لۆقنتەخانان، بەڵام چبکەم خێزانم چۆتەوە ماڵی بابــی. هەموویان بە یەکەوە بەرەو لۆقنتەخانەی بەڕێکەوتن، چێشــت و نانیان بــۆ هات، حاجی خارند برنجو شــلەی بۆ هات، حاجی پێی وابوو ئەگەر شــلەکەی نەخوا پارەی کەمتر لێوەردەگرن، بۆیە بانگی شــاگردەکەی کرد گوتی: ئەمن برینجەکەم بەسە، ئەو شلەیەم بۆ ناخورێ وەرە بیبەوە. شــاگردی لۆقنتە گوتی: لێیگەڕێ حاجی با لێرە لەســەر مێزەکە بێت دوایــی دەیبەمەوە. حاجی خارنــد پێداگیری کرد کە دەبێت شــلەکە بباتەوە، شــاگردەکە حاڵی دەبێت حاجی مەبەستیەتی پارەی شــلەکەی بۆ بگەڕێتەوە، پێیدەڵێ: مام حاجی شــلەکەی بخۆی یان نەیخــۆی پارەکەی دەبێ هەربدەی، برنجی بێ شــلە نافرۆشــین. حاجی کە وایزانی، هەرچەندە برنجەکەی بەنانەوە خواردبوو، گوتی: کەواتە دوو نانم بۆ بێنە! شــلەکەی ڕاکێشــا پێش خۆی دوو نانــی بەویش خواردو پــارووی کۆتایی بە بنی قاپەکەدا هێنــا. حاجی خارند پارەکەی دا بە خاوەن چێشــتخانەکە. لەدوای نانخــواردن حاجی خارند گوتی: بەشــیرەفەندی با بچینە مزگەوتی خانەقایێ نوێژەکانمان بکەین، هەر ئەوەمان بەکەڵک دێت، بۆ ڕۆژی مەبادایێ! بەشــیر گوتی: ئەمن خەریک بوو وا بڵێم. لە مزگەوتێ لەدوای نوێژکردن بەشــیر مزەمیدی کیربڕ بە فرسەتی زانی کەوتە

ڕێکخستنی پزووی شەرواری حاجی خارندیو بەرو پشتێنی و یەخەی کورتەکە مرادخانییەکەی و داخستنی قۆپچەکانی بەرگەردنیو گوتی: حاجی گەردنت هەڵکێشە با دووگمەکانت بۆ دابخەم، نامەوێ دۆستی گیانی بە گیانی خۆم بە شەپرێوی ببینم، دەی چەناگەت بڵند بکە، حاجی چەناگەی بەرزکردبووەوەو لووتی لە ئاسمانێ کردبوو، وەک بۆن بە ئاسمانێوە بکات! بەشیر مزەمیدی کیربڕ ئەوەی ویستی، کردی و بردی!

بە پەلە گوتی: ئای حاجی تازە بیرم کەوتەوە دەبێ بە پەلە بچم منداڵی ماڵێ متەسەرفی سوننەت بکەم، جەنابی متەسەرف چاوەڕوانم دەکات. دڵی نایە کوڕە تاقانەکەی بەمن نەبێت بەکەس سوننەت بکات. دەزانێ ئەمن دەستم سووکە ئەگەرنا حەزم دەکرد هەتا دەڕۆنەوە لە خزمەتتاندا بام و بەڕێم کردبانەوە بۆ گوندی. حاجی خارندو خێزانی زۆریان تکا لێ کرد گەردنیان ئازاد بکات! لەدوای ڕۆیشتنی، هەزارو یەک دوعای کەسک و سۆریان بۆ کرد. حاجی خارند دەیگوت: قورحان بە هەقت بە ساحێبت دەڵێی بارەکم لەسەر شانی لاکەوتووە، بەشیر مزەمیدی کیربڕ گەردنی ئازادکردم لە هەقی ئەو کیربڕینەی گۆڕین. حاجیژن دەیگوت: بە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، بە شێخ نورەدینی بریفکانی، ئەو پیاوە چاکە، ئەوجارە ڕێی بکەوێتە گوندی، دەبێت هەتا پێی هەڵدەگیرێ پەنیرو کەشک و دانۆکی بۆ دابنێم بۆ منداڵەکانی بباتەوە. ئای لەو پیاوە نوورانیو چاکەی! دەموچاو جەمالی پاکی، نووری لێ دەباری!

ئەوجارە لەناو قەیسەری ڕوویانکردە دوکانی کوتاڵفرۆش شەریفی عیسمەتێ بۆ جلکان، لەکاتی هەڵگرتنی کراسی گوڵباتمانو کەوێی ئاگرباران بۆ بووکێ، دیاربوو ماڵی زاوای دەیانویست ڕەزیلی بە کڕینی جلکان بکەن،

هەرچی لایەنگرانی ماڵی بووکێش بوون دەیانگوت: کراسی بە باخەڵ و دامێن، بۆ بەگمێ، نۆ گەز کوتاڵی دەوێ. حاجی خارند هەمیشـــە دەیگوت: دوو ســێ بەرامپیلی چاوپانی[1] قایم بۆ بووکێ هەڵگرن! چونکە حاجی خارند چاوی هەر لە ماڵداری و ئیشەکانی بەگمێ بوو، ئەو بەرامپیلانەی بۆ پاککردنەوەی هۆڵی مەڕو ماڵاتی و کاو ئالیکدانی مەڕو مانگاو وڵاخەبەرزەکان بوو.

جلوبەرگی بووکێیان لەلای شـــەریفی عیسمەتێ لەناو قەیسەری هەڵگرت و کوتاڵەکانیان لەســـەریەک کۆکردەوە. حاجی خارند هەر زوو بۆ ئەوەی نەبادا کوتاڵـــی زیاتر هەڵگرن، گوتی: مام شـــەریف بزانە پارەی ئـــەو جلکانە دەکاتە چەنـــد؟ دەزانم ئەتۆ گرانمان لەســـەر حیســـاب ناکەی، بۆیـــە مامرەتم لەگەڵ نەکردی! مام شەریف چۆرتی ژمێریاریەکەی دەستدایەو هەر سێ خڕۆکەی دەینا ئەولایەو یەک خڕۆکەی دەبردە لایەکی دیکە، گوتی: حاجی خارند قازانجەکی کەمم هاوێشتۆتەســـەر، هەموو پارەکە دەکاتە شـــازدە دینار و چار عانە، چار عانەکە بەقوربانی پێڵاوی تۆ! هەر شازدەکەت لێوەردەگرم! حاجی خارند دەستی بـــۆ باخەڵی برد جزدانەکەی دەربێنێو پارەی کوتاڵەکانی مام شـــەریفی بدات، بەڵام جزدان دەڵێ لە من مەگەڕێ! حاجی مشـــەوەش بوو، بەجۆرێک سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشـــا، هێندە بەپەلـــە گیرفانەکانی یەک بە یەک دەپشکنی، ڕانەدەوەستا هەتا گیرفانی کورتەکە مرادخانیەکەی دەگەڕێ، دەستی دەبرد بۆ گیرفانی شـــەرواری، خەریک بوو هەمـــوو گیرفانەکانی بدڕێنێ، بەڵام هەواڵێک لە جزدانی پارەکەی نەبوو! هەموو ســـەرنجو چاوەکان لەسەر دەست

---

١. بەرامپیلی چاوپان: ئەو بەرهەڵبێنە بوو لە جۆرە جاوێکی قایم کە پێیان دەگوت چاوپان، دروست دەکرا.

و گیرفانی حاجی خارندی، ئەبڵەق بووبوون، بەجۆرێک کەسیان چاویان لەسەر هەڵنەدەگرت، هەمووان پێکەوە دەیانپرسی: حاجی ئەوە چی بووە؟ حاجی بە تاسانو پچڕ پچڕ دەیگوت: جزدانی پارەکەم! جزدانی پارەکەم! گوتیان: جزدانی پارەکەت چی؟ بۆ پێمان ناڵێی؟ گوتی: بە خوای جزدانی پارەکەم نەماوە، خوا دەزانێ لە کوێ لێم کەوتووە! مام شەریف گوتی: کاکە ڕەنگە گیرفانبڕەکان پارەیان پێ شک دیوی و لێیان دزیوی، بزانە بۆ کوێ چووی؟ حاجیژن گوتی: کوڕە خۆ ئەگەر پارەی لۆقنتەکەت دا جزدانەکەت لەو باخەڵی لای چەپت داناو لەگەڵ بەشیر مزەمیدی کیربڕ چوون بۆ مزگەوتێ، ڕەنگە لەو بەینەی لێت دزرابێ! بە بیستنی ناوی بەشیر مزەمیدی کیربڕ، مام شەریف گوتی: ئەو بەشیر مزەمیدە کێیە ئەوها لێتان بووە بە دایکبرا؟ حاجی خارند گوتی: ئا ئا ڕاستە کە پارەی لۆقنتەکەم دا، قرتەی جزدانەکەم داخستو لە باخەڵم ناوە، لە مزگەوتێ بەشیر بەرو پشتێنی بۆ ڕێک خستم و پووزوی شەرواڕو یەخەی مرادخانی و کەشیدەی بۆ ڕێک خستم. ئەتو بڵێی ئەو، ئەو نمەک حەرامییەی لەگەڵ کردبم؟ مام شەریف گوتی: بەشیر مزەمیدی دایکبرات کاتێک بەرو پشتێن و یەخەی بۆ ڕێک خستووی، جزدانەکەی بردووە! حاجی خارند بە گومان کەوت، گوتی: بەشیری مزەمید هەر یەکسەر گوتی دەڕۆم دەچم کوڕە تاقانەکەی متەسەریفی سوننەت دەکەم. مام شەریف گوتی: کاکە حاجی ئەوە بزانە درۆی لەگەڵ کردووی چونکە متەسەریف تەنهایەو منداڵی نییە. هیچ کوڕی نییە، ئەتوو پێم بڵێ پارەی زۆری تێدایە جزدانەکەت؟ حاجی خارند گوتی: ئەرێ وەڵڵا. پارەی دە کاوڕەنێرو گۆلکەک و چار عەربەگەنمی تێدایە، توخوا پێم بڵێ متەسەریف وەجاغکوێرە؟ ئەگەر وایە ئەو درۆیەی بۆ لەگەڵ کردم؟ مام شەریف گوتی:

هەموو خەڵکی شـــاری دەزانن متەســەریف وەجاغکۆرە. مام شەریف گوتی: حاجی خارند ئەو بەشـــیر مزەمیدی پیاوەکی چۆن بـــوو؟ حاجی خارند گوتی: مام شـــەریف بڵێم یەکـــی چۆن بوو، کاکە خەرکی شـــاری زۆر پێک دەچن بەو دوولینگو قەرێتانەی ملیان هەمـــوو دەرییێی لە یەک دایک و بابی بووینە، ئەوەندەی دەزانم یەکی سوورەی ملئەســتوور، ملی دەتگوت قونکە هەوجارە، چاوسۆر، برژانگی سەت سوندو کەلامولڵات دەخوارد هێندە زەرد بوو دەتگوت: برژانگی ئەو گۆلکە زەردەی فرۆشـــتم ئاوا برژانگی زەردبوو. چاوی دەســـووڕاند دەتگوت گای خوودارییە[١]، هەر دەیمشـــاندو دەیخواردو دەیگوت: با بێ مام شەریف گوتی: حاجی بەشیر مزەمید چی لەبەربوو؟ حاجی گوتی: چاکەتەکی لەبەربـــوو دەتگوت چاکەتـــی مدیر ناحیەیە، قەرێتەکی ســـۆری لە ملی بوو دوولینگـــی لەپێ بوو، جانتایەکی کیربڕانی بەدەســـتەوەبوو، حاجی نەیدەزانی بڵێ سیدارە، گوتی کڵاوێکی قوزەچێرانی لەسەری بوو، هێندە ڕەش بوو دەتگوت قوزی چێرە بەکەڵێیە جوانەگا پێی هەڵمیستووە، پێڵاوی پەنجەرەی کون کونی لەپێدابوو، جانتایەکی کیربڕانی بەدەستەوە بوو، بەبنی چاوی لێم خێس دەبۆوەو لاو نیو تەماشای دەکردم. مام شەریف گوتی: لە دوای چووان مەچوو، پارەکەت دزراوەو ئەو بەشـــیر مزەمیدەیە لێی دزیوی، کوتاڵەکان هەڵگرەو ئەوەش پارەی هەقی ڕێیێ، ئەگەر هەتبوو بمدەوە، ئەگەرنا گەردنت ئازاد بێت، وەکی شـــیری دایکی خۆت لێت حەڵاڵ بێت! حاجی خارند گوتی: ماڵت ئاوا بێت مام شەریف، خۆ هێشـــتا زۆرمان ماوە بۆ بارگەی بووکێ بیکڕین، سەرەهیزارو هەوری ماوە،

١. گای خوودار: بەو گایە دەگوترێ کە هەر زیندەوەرێک لە مرۆڤ و ئاژەڵ ببینێ، مۆڕەی لێدەکات و دەیداتە بەر قۆچان.

کۆترۆکەو دووگمەو دۆڵابو بنکەوای بە سیمی چندراو، ئەوجا دەبی حەفتا کڵاوی بەسیمی دزەییانیو حەفتا جۆت گۆریەو حەفتا دەسترو حەفتا ئاوێنەی دووڕووی گیرفانیو حەفتا دۆخینو بێجگە لە کل و کلدانو کیسەخەنەو هوردەواری ژنان، خۆ لە دابونەریتی گوندی و کرمانجیەتی خۆمان دەرناچین، ئەوەی بچیتە دوای بووکێ دەبێ جووتە گۆرییەک، دەسترەک، دیارییەکی بدەینێ ئەگەر دۆخینێکیش بێت. چارەی من ئەوەیە بچمەوە گوندی، چوار عەربە گەنمی دیکە بفرۆشمە تەراحەکانو بەرانەکی چاکمان هەیە بیهێنمە مەیدانێ بیفرۆشم، پارەی جەنابتو ئەو شتانەی ماوە بیکڕم، کاکە ماڵ بە لاباران ناگاتە هەواران، دەبی خۆم بخورێنم! حاجی خارند و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هەڵتەک هەڵتەک گەڕانەوە بۆ گوندی، هەر زوو لە گوندی دەنگۆی ئەوەی بڵاوبویەوە کە پارەکی زۆریان لە حاجی خارندی دزیوە، هەر بابا بوو، دەیانگوت: خەڵکی شاری کلی لە چاوان دەدزن، ئەوجا پارەی کو نادزن؟ کە چووینە شاری گیرفانمان بدوورین. حاجی خارند هەر سەر لە ئێوارێ بە کوڕەکانو شوانەکەی گوت: بەرانی کەویسار[1] لە هەوێزێ[2] بگێڕنەوەو بە پەتکەکی قایم گرێ بەرانانی لێ بدەنو لەناو پەرژینی بیبەستنەوە بۆ ئەوەی سبەینێ لەگەڵ مێگەلی ڕای نەدەنە ئاقاری. سبەینێ بە پەستی عەزیز عەدلانی دەیبەمە مەیدانی شاری دەیفرۆشم، هەتا زەڕەکی دیکەی نەکردییە، خێرەکمان لەسەر بوو ئەوێ ڕۆژێ ئەو کوریژگەی نەکوشت، هەرچی بەرامبەری بێت قۆچی

---

۱. کەویسار: ئەو مەڕ یا ئەو بەرانەیە کە ڕەنگی دەمو چاوی شینە و خەت خەتی سپیی وردی پێداهاتووە.

۲. هەوێز: ئەو گۆڕاییەیە کە هاوینان مێگەلەمەڕی لێ ڕادەگیرێت و قشپلی لێدەکات.

لـــێ دەدات. ئەگەر لەبەر ئەو قۆچ تێهەڵدانـــەی نەبایە، بە دە بەرانی گوندیم نەدەگۆڕیەوە، وەچەی ئەو بەرانەی لەنێـــو هەمـوو بەرخو کاوڕی مێگەلەکانی تەواوی گوندی دیارە.

بەو ســـبەینەی ســاڵحانە هێشـــتا خێرو شـــەڕ بەش نەکراوە، کزەبایەکی فێنکی بای بســـکان، لفکەی کەشـــیدەی حاجی خارندی دەبـــزاوت، کوڕەکانی بەرانیان گەیاندە جـــادەی قیرێ، لەدوای جغارەخـــۆرەک چاوەڕوانی، گوێیان بە جادەی قیرپیەوەدەنـــا، بزانن ئۆتۆمبیل نزیک بۆتەوە! پاش کەمێک، پەســـتی عەزیز عەدلانـــی بەدیارکەوت، حاجی خارند کەشـــیدەی لەســـەری کردەوە و دووجاری ڕاوەشاند، پەســـت ڕایگرت، بەرانی کەویساریان لە خانەی پشتەوەی پەســـتی کە شـــوێنی گوێلکـو مەڕو ماڵاتی بوو، ســـوارکرد. خەلیفە ڕەحمان کەرحیز، لەلای بەرانەکەی لە پشـــتەوەی پەســـتی ســـوار ببـــوو، دیارە ڕۆژی پێشـــوو ئێوارەکەی هێندەی کۆڕی زکری دەروێشـــان گەرم کـــردووەو جەزم بووە، بەهۆی ماندوێتیو کفتی لەگەڵ هەژاندنی پەستی خەوی لێکەوتووەو جارجار ســـەروملی ڕانەگرتووەو خەوە کوتکەی بردۆتەوە، جارجار ســـەری بۆ پێشـــەوە تەکان داوە، تومەز بەرانی کەویســـار وای زانیوە شەڕە قۆچی لەگەڵ دەکا، بەران چەند هەنگاوێک دەکشـــێتەوە پاش و هەتا هێزی تێدایە بە قۆچی لە تەختی نێوچاوانی غەلیفە ڕەحمان کەرحیزی دەدا! بەرانەکەی بە شـــێوەیەکی گورجتر دەبەستەوە و بە شۆخی بە ڕەحمان کەرحیزی دەڵێن: ئەوە ئەتۆی قایمی، ئەگەر یەکـــی دیکە بوایە ملی لە نۆ جێیان دەشـــکاو دەبوو بە بـــڕووش، هەرچەندە دەمودەست ناوچەوانی ئەستوور بوو.

حاجی خارند لە مەیدانی حەیوانـــان بەرانی ڕادەگری، جامبازەکان، هەر بۆ

ئەوەی بەرانەکەی بشـکێنن و هەرزان لە دەسـتی دەربێنن، دەڵێن مام حاجی ئەو کاوڕەنێرەی بە چەندی دەفرۆشی؟ یەکی دی دەڵێ: ئەو شەکەی بە چەندی دەدەی؟ حاجـی خارند دەڵێ: ئەوڕۆ خەریک بوو زەلامەکی بکوژی ئەوە بەرانە بەران، لاکەون لە پێشی با یەکتان بەفەیز نەگەینێ!

بەرانی فرۆشـت و پارەی وەرگرت. پێش هەموو شـتێکی، چووە لای شەریفی عیسـمەتێ، پارەی کوتارو جلی بووکێی دایێو پێداویستییەکانی دیکەی بووک گواستنەوەی کڕیو گەڕایەوە گوندی. دەروێشۆکی باوکی بەگمێ، لە قەسەرکێشانەوە بۆ سـەر لەودە کایەکانو سـواقدانیان بوو، لە کاتێک مشیری ڕەفعەت ئاغای بە سـواری ئەسپی بەلایاندا تێپەڕدەبوو، بێ ئەوەی سڵاو یان ماندوونەبوونیان لـێ بـکات، گوتی: دەروێشـۆک ڕەفعەت ئاغای باوکم گوتی بێ سـێ و دوو بگەیە دیوەخانێ، ئەویش گوتی: بەسـەرچاو. هەر زوو گەیشـتەوە ماڵێو مەسـینەو دەستشـۆریان بۆ هێناو هەندێک سەرو سـەکوتی خۆی خاوێن کردەوەو بەپەلە، پشـتێنەکەی لە قەدی خۆی ئاڵاندو هەر لەبەرخۆیـەوە دەیگوت: یا ئەڵڵا خێر! دەبێ چ سـوخرەو بێگارو ڕەزیل کردنێکم پێ بکات. کاتێک گەیشـتە بەردەرگای دیوەخانێ، خزمەتکارو گۆردەکانی بەردەرگای، بە فیتی ڕەفعەت ئاغای، لەبەر ئەو خۆرەتاوەی لە چاوەڕوانیدا ڕایانگرت، هەر بۆئەوەی غرورو کەسـیەتی بشـکێنن! دوای ماوەیـەک لـە چاوەڕوانی تاقەتپڕووکێنی بێ هۆ، لە نـاکاو چایچییەکەی ئاغـای گوتی: وەرە ژوورێ ئاغا دەڵێ با بێت. لە دیوەخانێ وەژوورکەوت، سـڵاوی لـە ڕەفعەت ئاغای کرد، ئاغا مینگەیەکی لە بن لێوان لێوەهات، لـێ کەسـی لـێ حاڵی نەبـوو، جنێوی دا، یـان سـڵاوەکەی سـتاندەوە. دوو بالیفی پەری کەوێی لە پاڵپشـتی بوو، لەسـەر کەوڵەورچێکی خاراو، پیاڵەچایەکی لە پێش

بوو، دەمانچەیەکی چواردەخۆری بە قایش و قرۆشـــەوە ڕاســـتو چەپ لە خۆی بەستابوو، پازدە گەز پشتێنی مەخمەری گرانبای لە پشتێ بەستاوە، خەنجەرەکی ســـاڵح بەگی لەبەرڕاکردییە، دوو هەوری سۆری لە سەری نایە، مێزەری هێناوەتە سەر نێوچاوانی، ئەوەش نیشانەی تووڕەیی دەگەیاند، تەزبیحێکی دەنک درشتی بەدەستەوەبوو، ئەنیشـــکی لەســـەر ئەژنۆی دانابوو، هەرچەند جاری دوو دەنک تەســـبیحی بەردەدایە و ترقەی دەهات، وەک کوتکێکی لەســـەری دەروێشۆکی بـــداتو دڵی لەگـــەڵ دادەخورپاو ڕادەچەنـــی. ئاغا کۆخەیەکی دەســـتکردی لە زاری دەرپـــەڕی وەک گوللەی بە ســـینگی دەروێشـــۆکی وەبنێ، بـــە دەنگێکی گڕی گەورەپیاوانەی لەخۆڕازی، گوتی: دەروێشـــۆک! هێشـــتا ناوی دەروێشۆکی بـــە تەواوی لـــە زاری دەرنەپەڕیبـــوو، دەروێشـــۆک بە ڕێژنە بەڵێیـــەکو ئاغا فەرمایشـــتتە نۆکەری خۆت گوێی لێیەو لە خزمەتدام گەورەم، بەڵێ بەڵێ ئەمر دەکـــەی، ڕەفعەت ئاغا گوتی: ئەگەر ئێمەت بە گەورەی خۆتو خۆت بە نۆکەری من بزانبایە لە گوندی من، کیژت بەبێ پرســـی من و قسەی من بەمێرد نەدەداو شیربایی وەربگریو هیچ حیسابەکی بۆ ئاغاو دیوەخانەکەی نەکەی بۆ مەسرەفی قاوەو، ئەو دیوەخانە بەتڕان گەرم دەبێ؟! دەروێشـــۆک دەســـت لەسەر سینگ لە حزوری ئاغا خۆی چەماندۆتـــەوە ئەژنۆکانی دەلەرزین بەجۆرێک چیدی بەرگەی ڕاگرتنی کێشی ناکەن.

ڕەفعەت ئاغا گوتی: هەرچی لەو گوندەی دەقەومێ، هەر بێ حورمەتییەکی دەرهەق بەو دیوەخانەی دەکرێ، هەمووی لە بن ســـەری حاجی کۆمەنیســـتو کوڕەکانیەتی، نە مەلای ئاوەدانیو نە کوێخا و نە شێخی تەریقەتو نە دوعاگۆو نوشـــتەنووس، کەس لەو ماڵەی ڕازی نییە. هەر ئەوان باعیســـی ئەوەن کەوا

خەڵک تەریقەت وەرناگرن‌و تۆبە لە گوناهان ناکەن، گەورەو گچکایەتی نەماوە! وایان شوول لێهەڵکێشاوە حیساب بۆ کەس ناکەن، ئەوێ ڕۆژێ مشیر ئاغای کوڕم دەمانچەی لە کاکەڕەشی کوڕە گچکەی حاجی سمایلی هەڵکێشاوەو جنێوی پێ داوە، ئەویش بێ شەرمانە دەستی بۆ قرتەی دەمانچەی بردووەو دەستی لەبەرکردۆتەوە، ئەگەر ئەو سەگبابانە تەمێ نەکەم یان لە گوندیان دەرنەکەم، خەڵکیش چاو لەوان دەکەن و لێم هەڵدەگەڕێنەوە وەکی تۆ، ئەوە نییە ئەمن بەناو ئاغای گوندیمەو پرسم پێ ناکەی کیژت بەمێرددایە! دەروێشۆک گوتی: ئەستەغفیرەڵڵا ئاغا ئەتۆ هەر گەورەی، ئەمرت بە چییە هەتا جێبەجێی بکەم؟ ئاغا گوتی: بڕۆ دوو کیفکە دەمانچەی چواردەخۆر بەقایش‌و قرۆشەوە لە قایشی حەسیب قادری کەرکوکی[1] بکڕە، لەگەڵ دوو دەست کورتەک‌و شەرواری خەتداری فەتاح پاشایی[2]، هەر کە نەختو شیربایی بەگمێت وەرگرت بیانکڕەو بۆ دیوەخانێیان بێنە، دەروێشۆک گوتی: بەسەرچاو ئاغا هەر

---

١. حەسیب قادری کەرکووکی: وەستایەکی سەڕڕاجی کەرکووکی بوو، خەریتە و کیفە دەمانچەی، لە چەرم و قایشی قایم و گرانبەها دروست دەکرد.

٢. فەتاح پاشا: ١٨٦١ — ١٩٣٦، بنەچەی خێزانەکەیان بۆ گوندێکی نزیک شاری کەرکووک دەگەڕێتەوە، لە سوپای عوسمانیدا کاری کردووە و بەرەو پێش چووە تا پلەی فەرماندەی لیوا ڕۆیشتووە. بەڕێوەبەری (کارگەکانی چنین)ی سەربازی بووە لە بەغدا. لە ١٩٢١ بۆ ١٩٢٤ موتەسەڕیفی کەرکووک بووە. ساڵی ١٩٢٦ لەگەڵ کوڕەکەی (نووری) کارگەیەکی چنینی خوورییان لە گەڕەکی کازمییەی شاری بەغدا، دامەزراندووە. ئەو کوتاڵانەی کە بەرهەمیان هێناوە زۆر بەناوبانگ بووە و کێبڕکێی بەرهەمە بەریتانییەکانی کردووە. یەکێک لەو بەرهەمانە جۆرێک کوتاڵی پیاوانە بوو کە لەنێو کوردان بە فەتاح پاشایی ناسرابوو. ئەو کارگەیە تا کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستیش بەردەوام بووە.

نەختو شـــیربابییم وەرگرت دەیانکرم. ڕەفعەت ئاغا گوتی: گویّ بگرە! نامەوێ بەهیچ شێوەیەک هاتوچۆی ماڵێ حاجی سمایلو کوڕەکانی بکەن.

لـــەو ڕۆژەوەی بەگمیان مارەکردبـــوو، کچ و ژنانی گوندی بۆیان ببووە کێشـــە نەیاندەزانـــی کامە زاوایـــەو دەســـتگیرانی بەگمێیە، هەریەکـــەو زەلامێکی لە میوانـــەکان بە زاوا دانابوو، یەک دەیگوت: ئەمن لە دەلاقەی هۆڵی مەڕی چاوم لێبوو، پێـــم وایە یەکی قوڵەخـــڕەی کورتەک ڕەش ئەوە زاوا بـــوو. ئەوەی دیکە دەیگوت: نـــا، یەکی کزەی پووخەی ڕەقەڵە، کورتەکو شـــەروارەکەی هەر یەک لە ڕەنگێکی بوو، پشـــتێنەکی کەڕنەکی سپی لە پشـــتێ بوو، کیسە تووتنەکی پڕاوپڕ لە تووتنی لە پشـــتەوە لەبەر پشـــتێنێ بوو بەســـەر قوونیدا شۆڕ ببۆوە، ئـــەوە زاوابوو. لەو کاتەی بەگم هاتە ســـەر بیرێ، ئـــاوێ هەڵێنجێ، گوتیان ئەوا لە بەگمێ دەپرســـین کیهان زەلام دەســـتگیرانتە؟ لە بەگمێیان پرســـی، ئەویش گوتی: بەخوای نازانم کیهان دەســـتگیرانم بوو، ئەمن هەر خەسوو و خەزوورم لە جلکان ناسی، دەســـتگیرانی خۆم نەدیتییە، بەڵام بابم دەیگوت زەلامەکی باشەو ئەقرم گرتیتی، دەرێن کاســـبو نوێژکەریشـــە، خۆ دەرێن گندۆرە بە ڕەنگی نییە، یەک لە کچەکان گوتی: ئینشـــائەڵڵا ئەوەی کیسە تووتنەکەی بەسەر لا قوونی شۆڕکردبۆوە ئەو هەو نییە، بە خوای خوێنتاڵ و ڕەزاگران بوو، ئەگەر ئەو زاوا بوو، هەر ئەو گۆرانیەی بۆ بڵێ:

## گوێی کۆتکی سەپانان هێستر لەقەی لێدایە
## کەپووی هێلانەقوڵتە[1] تاڵەبنێشتی دەردایە!

١. هێلانەقوڵت: کۆجیلەی بنێشت کە بە قەدی دارەبەنێوە دروست دەکرێ.

## چاوی وەك قونەمریشکە جیقنەی زەردی دەردایە
## قونی قۆتەرەی ئاشی حەوت عەربەی زەرەر دایە!

ئەو رۆژە پێڕابواردن کەوتبووە سەر بەگمێ سەربەهەش، ئەویش تەبای کچ و ژنی ئاوایی زاوای نەدەناسیو نەیدەزانی کامە زاوا بووا!

دەروێشۆک جوابی بۆ ناردن گوتی: ئەمە حازرین، ئەگەر پێیان باشە ئەو پێنج شەمو جومعەی دەتوانن بووکێ خۆیان لەدەست دەنێم با بیگوێزنەوە. حاجی خارند بە سواری هێستریێ کوڕەکانو برازاکانی هەریەکەی بۆ گوندێکی دەوروبەری خۆیان ناردو، لەدو خەرکیان گێڕایەوە بۆ ڕۆژی بووک گواستنەوەی. ڕەشماڵێکی پێنج ستوونی هەڵدا، چەند دەستە قەمیشی ئاکرێیی، لە تووتن داگیرا بۆ میوانەکان. بووکیان گواستەوە، زاوا لە شوێنێکی بڵند شەکرۆکەو برێشکەو هەندێک فلس و عانەی بەسەر بووکێدا کردو قەمیشێکی لەسەری بووکێ دا بۆ ئەوەی سامی بەسەر سامی بکەویو لێی بترسێ و بە پیاوی بزانی. منداڵان لەبەرپێی بووکێ سواری سەری یەکتری دەبوون بۆ شەکرۆکەو فلس و عانە هەڵگرتنەوێ. بووکیان لەسەر دوو بالیفی گەورە دانا، هەرچی تەماشای بووکێی دەکرد بەو قەلافەتو سەرو کەللەوە دەیانگوت: حاجی خارند بووکی هێناوە یان ڕۆستەمی زاڵ! بەخوای ئەو زاوا ڕەقەڵەو ئەو ژنەیان نەگوتوە، قەت بەو زەلامە پووخەی ئەو بووکە هەڵگێڕو وەرگێر ناکرێ! بووک زاوای لە قیلمقاسێ[١] بکات هەتا ماڵی بابی داینانێ!

شەوێ، سەر لە ئێوارێ زاوایان لە پاڵ بووکێ کردو بە ژوورکەوت و سەلامی لە بووکێ کرد، لەلای دانیشت. بۆ ئەوەی پیاوەتی خۆی نیشان بدات و زاڵبوونی

---

١. قیلمقاس: قەلاندۆشک، هەڵگرتنی منداڵ لەسەر مل کە دوو لینگانی بەسەر سینگی کابرادا شۆڕدەکاتەوە.

بسەلمێنێ بە دەنگێکی گڕ گوتی: ئافرەت هەستە جامە ئاوەکم بۆ بێنە! بەگمیش یەک پێ بڵند بوو هەستایە سەر پێ لەگەڵ ڕۆیشتنی بۆ لای جەلعەئاوەکەی[1]، لەگـەڵ هـەر هەنگاوێکـی جامـە فافۆنەکەی سـەر جەلعەکـەی دەلەرزیو دەزرینگایـەوە. بەگم جامەکەی هێندە پڕ ئاو کردبوو لەسـەر لێواری دەڕژایەوە، دەتگوت قەرزی لەسـەرەو دەیداتەوە، زاواش بەفیزەوە دەسـتی دابووە بەرخۆی، ناو لەپی دەستی لەسـەر زەویەکە دانابوو. بەگمیش بۆ ئەوەی ئاوەکەی لەدەست نەڕژێ، زەینی هەر لەسـەر لێوی جامەکە بوو، بێ ئەوەی تەماشای بەرپێی خۆی بـکات لە زاوای نزیک بۆوە، بەرلەوەی جامە ئاوەکەی بداتە دەسـتی زاوای، پێی لە پشـتی دەستی زاوای ناو زاوا هاواری لێهەستاو دەستی لە باخەڵی خۆی گرت. تومەز ئەو پەنجە ڕەقو تەقانەی زاوای دوانیان شکابوون، وردی کردبوون! سەرەڕای ئەوەش جامە ئاوەکەی بەسەر زاوایدا ڕشت. بەگم چەند جارێک گوتی چاوم کوێر بێت بەسـەری بابم نەمدیبـوو! بەوەی باش بوو کۆتایی پایـزێ بوو، ئیش و کار نەمابوو، خەڵک بە شکانی قامکەکانی زاوای نەزانی.

حاجی خارند لەنێو خەڵکی گوندی، هەردەم شانازی بەوەوە دەکردو دەیگوت خزمینە ئەمن ژنم بۆ کوڕم نەهێنـاوە، بووکی من زەلامە زەلام! ئەگەر نەمرین هێندەمان نەماوە بۆ بەهارو هاوینێ، ئەوجا بە چاوی خۆتان دەست و خاکەناسی بەگمێی بووکم دەبینن، بەو کەشـیدەی لەسەرمەو بەو حەجەی تەوافم کردووە ئیشی سێ زەلامی بەوەج دەکات. ئاخر ئەوکاتەی کیژ بوو لە ماڵە بابان بە چاوی خۆم دیتم پێنج خشـتی لەسەر پشتێ بوو، وایدەزانی پووشکەیە! لەو کاتیەوە هیچ ڕوحم بۆی نەما، گوتم ئەگـەر نەمرمو بمێنم دەبێ ئەو پاڵەوانەی بکەمە

١. جەلعە: گڵێنەیە، چەند جۆرێکی هەیە: گەورەکە (جەڕە)یە، لەو بچووکتر (شەربە) یە و هەرە بچووکەکەی (جەلعە)یە کە هەموویان بۆ ئاوی خواردنەوە بەکاردێن.

بووکی خۆم، بۆ ئەوەی لەبەری بحەسێمەوە!

ئەگـــەر بزانم لە گوندی تێر ئیش نابی، لە دەو ڕووباری، لە تەنیشـــت ماڵی حەمەدەمینو حاجی سمایلی، پارچە شـــینایییەکی لە خیارو تەماتەو بامیەو باینجان بۆ دەکەم و پارچە زەوییەکی بۆ بەکرێ دەگرم سایلی خەرکی.

ئەو دەو ڕووبارە، ئەوبەر ئەوبەری هەردوولای، بەهاران و هاوینان دەکرێت بە شینایی تەماتەو خیارو شووتیو بامیەو باینجان و هەموو جۆرە بەرهەمێکی کشتوکاڵی، هەتتا پەمۆشی لێ بەرهەم دەهات.



# ٦

هەر بابا بوو مەکینەیەکی ئاوی لیستەر یان کرۆبی دامەزراندبوو، لەوکاتەی کاریان پــێ دەکرا دەنگیان تێکــەڵ بەیەکتری دەبوو. جۆوانــەکان[1] پێمەڕەیان لەسەرشــانییەو خەریکی ئاودانــن، هەر جغارەخــۆرەک دوای نوێــژی بەیانی بەهێمنی و بێ گرێوگۆڵ و ساتمە و هەنگامە وەک داوەموویەک لەنێو ماستی ڕابکێشی، تاریکی کلکی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا، سیوادی دابوو، سەگــو گورگ لێکدەکرایەوە، ئاســۆی ڕووناکی لەلای خۆرهەڵاتێ هەتــا وەکو کات تێپەڕدەبوو، دڕی بــە تاریکی دەدا، تیشــکی زێڕینی خۆر وەک کەلافەئاوریشــمێکی زەرد خــۆی لە گەردنی گردی قەڵغانی[2] وەرپێچــا، کزەبایەکی فێنک تێکەڵاو لەگەڵ بۆنی بڕکەتەماتــە و دەلوجەو گوڵەبامیەو ئەو دێراوە ڕەیحانەی ئەســمەری مام حەمەدەمینی لە بۆ زێنەتی کەیفێ دڵی خۆی چاندبووی، خانە هەســتیارەکانی بۆنکردنی مەســت دەکرد، قاژەی تیتراوســکەکان بێدەنگیی ئەو بەیانەیان وەک

---

١. جۆوان: ئاودێر، ئەو کەسەی کە شینایی ئاودەدات.

٢. گردی قەڵغانی: گردێکی پانە، کەوتۆتە بەرجادەی هەولێر – کەرکووک لە ڕاستی زورگەزراو.

سەمفۆنیایەکی خۆزای، بەگوێی زیندەوەرەکاندا دەچراواندو بێدەنگییان دەشکاند.
تارمایی ئەو پەنجا سندوقە دارەی ئێوارەی ڕۆژی پێشوو، حسێن بۆی لە پیکابە جەمسیەکەی دابەزاندبوونو لەسەریەک دانرابوون، هەموویان سندووقی دەبڵ بوون، بە نیازی ئەوەی ئەو ڕۆژە تەماتەو ئاروو بڕنو بچنن. سندوقەکان بەپڕی داگرن لە تەماتەو ئاروو، چەند گونیەی داخسۆریش پڕ بکەن لە دەلوجەو باینجانو بامییە. هەتا کات هەڵدەکشێ ڕوونتر دەبینرێن. مام حەمەدەمین بەر لە هەمووان داسووکەی دەستدایە شۆڕبۆوە بۆ دەو ڕووباری، یەک تێلەگە پونگەی دروێنەکردبوو، بۆ سەر سندوقی تەماتەو ئاروو و گونییەباینجانو دەلوجەو بامیەکان، بۆ ئەوەی تاوەکو دەگەیەندرێنە شاری هەولێرێ بۆ فرۆشتن، سیس نەبن. مام حەمەدەمین بانگی کردن: دەی کوڕم دەی کچم زووکەن هەستن لە خەوێ، بەرامبیلەکانتان لەپشتی گرێدەن، ماڵی حاجی سمایلیو عەزیز قەمبەری هەر تاریک بوو قریوەیان دەهاتو دەستیان بە ڕنینی کرد، دەی بە قوربانتان بم ئیش هەتا دەستی پێ نەکراوە شێرە، دەستت پێکرد دەلعازی دەبێتە ڕێوی! هەستانو دەستیان بە ڕنینێ کرد، بیست سندووقێکیان ڕنیبوو، بانگیان کردن بۆ نانی چێشتێ، چێشتەنگاوێکی درەنگە، بۆ نانی بەیانی ئاو و هەوا تەواو گەرم بووەو شینایی وردە وردە ئەو فێنکیەی بە درێژایی شەوێ هەڵیمژیبوو، لە دەستی دەداو گەڵاکانی ملیان لاردەکردەوەو سیس دەبوون. لە دوای خواردنی نانی چێشتێ، بەرەو نێو گۆلە گەرمەکانی تەماتەو ئارووەکان ڕۆیشتن، هەریەکەو داوەبەنێکیان لە تەختی نێوچاوانیان بەستاوە بۆ ئەوەی ئارەقە نەچێتەوە ناو چاویان، بەو داوە بەنەدا بچۆڕێتەوە کە لەدوای گرێدان بە لا تەنیشتی لاجانگیانەوە شۆڕبۆوە. هەتا ڕۆژ زیاتر بەرەو تاقی ئاسمانێ هەڵدەکشا سێبەر کورت دەبوونەوەو پێیان هەڵدەکێشاوە

بەرخۆیان، هەرچی زیندەوەرە هەر بابایە خۆی هەڵدەکوتی بۆ سێبەرێ.

ئەو کوڕو کچە جاحێڵەی شەوی پێشوو لە دژی دابونەریتی داخراوی خێڵەکیو ئەقڵیەتی توند و سندمکراوی ئاینی، دەستیان لەنێو دەستی یەکتری نابوو، بۆ خۆدەربازکردن لە دەست کەسوکاری کچەکە، ئەوشەوە بەنێو پەرێزو کوێرەڕێ و دڕکەزەردەو قەلۆغانو نووسەکەدا، بەتەمای شوێنێکی دوور و پەنایەکی ئەمین، ڕێیان دەکرد. دەبوو هەتا بەیانی تاو دەکەوێ، خۆیان بگەیەننە شوێنێکی پارێزراو، دەبوایە ئەو دێمکەئاوە بەشیان بکات.

چێشتەنگاوە، ئەوەندەی بەنێو قەلۆغان و دڕکە زەردانددا ڕابکەن، هەموو دەست و لاقو سپیلکی پێیان خوێنیان لێدەچۆڕێ. ماڵی بابی کچەی، بەیانی کاتێک دەبینن کچەکەیان لەنێو جێیدا نیە و بۆئەوەی فریویان بدا، دوو بالیفی لە شوێنی خۆی داناوە، ئیدی دەزانن کە ڕەدوو کەوتووە!

بەدرێژایی ئەوشەوە، بۆ ئەوەی گیانی خۆیان قوتاربکەن، هەر ڕێگایان بڕیوە. چاویان دابووە ئەو کەپرە لاچەپەی دوکەڵێکی شینی بە کزی لێهەڵدەستێ، نیشانەی ئەوەی بوو کە بن ئەو کەپرە ئاوەدانە و خەرکی لێیە. بەردەوام ئاوڕیان دەدایەوە بۆ ئەوەی دڵنیابن کەسیان بەدواوە نییە! ماندووبوونو ترس وێرانی کردبوون هەر هەنگاوێکو ساتمەیەک بەلادا دەکەون، هێز دەدەنە بەرخۆیان بۆ گەیشتنە کەپرەکە. مام حەمەدەمین دەیگوت دەی بە قوربانتان بم دەستوبرد بکەن بۆ بەیانی دەبێت دوو پیکەب شووتیان بڕنین، حەیفە ئەو هەموو شووتییە هەریەکی بەقەد بالیفێکیە، ئاوا بەبەرچاومانەوە خەساربێت و شەوان دەقەڵشن، ئەگەر یەکێک هەبێت بیانڕنێو ساغیان بکاتەوە، بەنیوەیش دەیدەمێ هەر بۆئەوەی بەبەرچاومەوە خەسار نەبن.

لەنێو کەردووە تەماتەکان، برکی[1] ئەوەندە گەرمو شێدارە، ئارەقەی ڕەشوشینیان دەرداوە، جلوبەرگیان شەلاڵی ئارەقەیە و پشتیان بۆتە مەدۆنە، وەک ماستو دۆت بە پشتیدا کردبن! مام حەمەدەمینو فەرهادی کوڕی، تەماتان دەڕنن، ئەسمەری کچیشی بە سەبەتە، هەر بەغار پاشۆلەتەماتەکانی بۆ لە سەبەتە دەکەنو ئەویش دەیکێشێتەوە بن کەپرێ، هەر کە دەگاتەوە لایان پاشۆلیان پڕپڕ لە تەماتەیە، ئەسمەر یەک چرکەش پشوو نادات، لەو گەرمایە بێدەنگە، بەس چیرەی سیسرکەو جیرجیرەکان دەبیسترێ. ڕاماڵ و وەڕینی شێرەبۆرەی[2]، سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا: کچ و کوڕێکی گەنج، کچەکە بوخچەیەکی بە کۆڵیدا داوە. لەگەڵ هەر هەنگاوێکی ئاورێکی بەرەو دوای خۆیان دەدەنەوەو سەرسمێک دەدەنو ساتمەیەک دەکەن بۆئەوەی بزانن کەسیان بەدواوە نییە! سەگەکەش هێرشیان بۆ دەبات، ئەوانیش دەگەنە ئەو باوەڕەی ئەو سەگە نایەڵی یەک شۆقاوی بچنە پێش، لە شوێنی خۆیان دادەنیشن، هەتا سەگەکە ڕشتی[3] زیاتر دەکات. فەرهاد، هەنگاوەکانی خێراترو سوکتر دەکرد. مام حەمەدەمین دەڵێ فەرهاد کوڕم غاردە ئەوانە میوانی کەپرەکەی ئێمەن، بگە شێرەبۆرەی نەوەک بیانگری و زامداریان بکات. فەرهاد هەر بەغارو لە بای غارێ لە سەگەکەیڕا خوڕیو دوو سێ جنێوی پێ دا، کەستەکێکی خۆشەویستی و خاوەنداری ڕائالاندە شێرەبۆرەی و بێدەنگی کردو ئەویش لە مەرامی فەرهادی حاڵی بوو کە ئەوانە میوانی بێ ئازارنو دەبێ

١. برک: شوێنی گەرم و شێدار کە هەناسەی مرۆڤ تەنگ و سوار دەکا.

٢. شێرەبۆرە: ناوی یەکێک لە سەگەکانیان بووە.

٣. ڕشت: ڕژد، مکوڕ، پێداگر.

ڕێگایان بدات. شـێرەبۆرە، بە نوسـکانەوە ملی ملکەچیو ڕەزامەندی لەسەر زەوی درێژکردو کلکی گوێڕایەڵی بۆ فەرهادی لەقاند. فەرهادیش پێی ئافەرینی بەسەری سـەگەکەیدا هێناو ملی خوراند، ماندوونەبوونی لە میوانەکان کردو فەرمووی لێکردن بۆ بن سێبەرێ بۆ ئەوەی بحەسێنەوە.

بەو تۆزو خۆڵەی سـەر بسکو پەرچەمی کچەکەو سەرکڵاو و جەمەدانی کوڕەکـەوە بوو و، بە پێڵاوی دڕاو و دامێنی جلە تیتۆڵ تیتۆڵ بووەکانیان، زانی لە ڕێیەکی دوورو بەرِپێ ناخۆشو لاڕێدا هاتوون، بە باوشکدانو جیقی چاویان، زانی کە بەدرێژی ئەو شەوە نەخەوتوون، بەدرێژایی شەوێ بە ڕێوە بوون.

لەژێر سێبەری کەپرەکە داینیشاندن و سەبەتە نانێکو شووتیەکی بۆ هێنان و گوتی ئێوە پشوو بدەن، ئەمن دەچمەوە سەرکارەکەم، هەروەختێکی ویستتان، ئەوە شووتی ژێر سێبەری بڕکە تەماتەکان ساردن، بۆ خۆتان لێیبکەنەوە.

فەرهاد، هـەر ئەوەندەی بـە باوکی گـوت: ئەوانە خەڵکـی لێقەوماو و هەڵاتـوون، لە ڕێگای دوورەوە هاتوون، چاویان پڕە لـە ترس، بەردەوام دیقەتیان لەسەر ئەو ڕێگایەیە کە لێیەوە هاتوون، وەک خەڵکیان بەدواوە بێت، دڵنیام بە درێژایی ئەو شەوە هەڵاتوون و ڕێگایان بڕیوە، پێ ناچێ خەڵکی ئەو گوندانەی دەوروبەری خۆمان بن، نەدیتیو نەناسی ڕوویان لێرە کردیە.

لە دوای ئەوەی مام حەمەدەمینو فەرهادو ئەسمەری کچی، دەستیان لە کار هەڵگرتو هاتنە لایان، کوڕەکە گوتی: ناوم مەمۆیە خەڵکی ناوچەیەکی دوورم. لەقسـەکانیڕا دەردەکەوت کە پیاوێکی لانـەوازو لاکەوتەیە، ترس و ئازارێکی گەورە ڕۆحـی دەکرۆژێت. مام حەمەدەمینی بە پیاوێکـی بە بەزەیی دەزانی، بۆیە ڕووی قسـەکانی لەوی بوو: ئەو کچەم هەڵگرتووەو برایەکانی زەلامی زۆر

بە وەجن، ڕۆژێکمان مابێت هەر دەمانکوژن. زۆر خراپ و دەسترەشــن، نایەڵن هەقیان لەلای هیچکەس بمێنێ.

لەو کاتەدا، ئەوان قســەی خۆیــان دەکرد، کچەکە بنیسکەســابوونێکی بەدەستەوەبوو، لەسەر جۆگای ئاوەکە دەموچاوی دەشووشت. تۆزو خۆڵی ڕێیەی لە ســەرو پرچی خۆی دەتەکاند، بســکەکانی لوول دەدا، هێشــتا تۆزو گەردی ئەو هەڵاتنەی لێی نیشــتبوو، لەخــۆی نەکردبوویەوە. دامێنــی جلەکانیان تیتــۆڵ تیتۆڵ بوون، پێڵاویان بــە پێیەوە نەماون و لە چەند شــوێنەوە دڕاون، قەیتانەکانیان هەر خوا دەزانێ لەکوێ بەجێماوە!

هانامان بــۆ ئێوە هێناوەو کەتینە ســەر بەختێ ئێــوە، وەک عارەبی بەر بەغداییێتان دەخیل بین، ئەگەر پەنامان نادەن و نامانپارێزن، بەدەســتی خۆتان بمانکوژن! ئەوە مەمۆ کوتی.

مــام حەمەدەمین جغارەکــی بەئاگر کردو دوو ســێ مــژی قوڵی دوکەڵ هەڵمژین. ســینگی وەک هەمبانە دەف، بە دوکەڵ فوودا. پاش هەست لەخۆ ڕاگرتنێــک، لە هەردوو کونەلووتی وەک لوولە ســۆپا دوکەڵ ســەری وەدەرنا، قســەکانی کە لە زاری دەهاتنــەدەر لە دوکەڵ وەرپێچرابــوون، گوتی: مەمۆ کــوڕی خۆم باش گوێ لە مامی خۆت ڕابگرە، ئەمــن هەر ئەو تاقە کوڕو ئەو تاقە کچــەم هەنە ئێوەش دەبنە کوڕ و کچی من، تاوەکونێ ئێوە بە ئێمە ڕازی بن، ئێرە ماڵە بابی خۆتانە، بەخۆ بە فەرهادی کوڕم ســەری خۆمانت لەســەر ســەری دادەنێین، هەتــا ئەمە لە ژیاندا مابین ڕێ نادەیــن ئێوە زەڕ و زیانتان پێ بگات، ئەسمەرییش خوشکی خۆتەو چۆن خزمەتی فەرهادی برای دەکات ناواش خزمەتی تۆ دەکات. ئەوجا هەســتایە سەرپێ، لەبن ئەستێرکی نوێنان

تفەنگەکـــی برنۆی درێژی ڕەقـــەم حەڤدەی دارشووشـــەی دەرهێنا، لەگەڵ دوو خەریتەی قایشـــی حەسیب قادری کەرکوکی و بیست و چوار پاکەت فیشەکی قۆرخانی[١] گوللەسۆری تێزخڕ[٢] لەپێش مەمۆی دانان: کوڕم مەمۆ هەتا لە ماڵـــی من بی، ئەو تفەنگە ئی تۆیەو خەمی فیشەکانیشـــت نەبێ، هەرکەس تفەنگێکی پێوەنـــای، ئەتۆ چوارانی پێوەبنێوە، پیـــاو دەبێ حەول بدات کاری نابەجێی لەدەســـت نەقەومێ، خۆ ئەگەر لەدەستیشـــی قەوما، دەبێ پیاوبێ‌و داکۆکی لەخۆی پـــێ بکرێ! وەرە... دەرەوە با پێت بڵێـــم ئەو کەپرانەی نزیکی ئێمەن کێن! مام حەمەدەمین دەیویست شارەزاییەکی لەسەر دەوروبەر و دەرو دراوسێکانی بداتێ: ئەو کەپرو شینایی دەســـتەچەپمان عەزیز قەمبەرییە، ئـــەوەی دەستەڕاســـتمان کوڕەکانی حاجی ســـمایلین، ئەوان ســـێ بران لەگەڵ باوکیان نێوانمان گەلەک خۆشەو پیاوی بەوەجن و زەلامی پشت پێ بەستانێن، کوڕە گچکەکەیان ناوی کاکەڕەشـــە، پیاوێکی زۆر ئـــازاو تفەنگچییە، کۆلارەی لە ئاســـمانێ بە یەک فیشـــەکی دێنێتە خوارێ! ئەوانیش تێدەگەیەنم ئەگەر کەســـی نەناس‌و گوماناوییان بینی خەبەرمان بدەنێ، هەزار سوێندیش بخۆی سوێندت لـــێ ناکەوی، ئەو سێ کوڕەی هەر دەڵێی بەس بۆ یارمەتی خەڵکی عاملانـــدوون! هەموو خەڵک خۆشـــیاندەوێن، تەنها ئاغـــاو دەرەبەگـــو زاڵم‌و گۆردەکانیان رقیان لـــێ دەبنەوەو لێشیان دەترسن! کاکەڕەشیان خەریکە بەرِی بـــرا گەورایەتی لەژێر پێی برایەکانی دەردێنێ‌و ئەوانیش زۆریان خۆشـــدەوێ و

---

١. فیشەکی قۆرخانی: جۆرە فیشەکێکی باش بووە و چرووکی کەم بووە.

٢. تێزخڕ: ئەوتۆزە باڕووت یان چەشنەی کە بە قونکی قەوانی فیشەکەکەوە خڕو زەقەو، بە پێکەوتنی دەرزیلەی تفەنگ دەتەقێ.

بۆتە جێی شانازی بنەماڵەکەیان، هەموو بڕیارە قورسەکان کاکەڕەش ڕەزامەندی لەسەر دەدا. ئەوانەی برادەرایەتی لەگەڵ دەکەن هەموو پیاوی دەستوەشێنن. بە چاوی خۆم پێوەم دیووە، بە ڕۆژێ گێرەی قونجرکانی لەسەر زگی بکەن، جوونی پێبدەنو گێچەڵی پێ بکەن، شەڕێ ناکا، بەڵام کە شەو داهات، هێندە نێمگیر[1] و دەستڕەشە، دەستی خۆی دەوەشێنێ، گەورەترین ئاغاو زاڵم شەوێ باشاری[2] ناکاو دەیانکات بە پۆڕی خوراو، پیاوەکی هەڵکەوتەو عاسێیە، هەر بەتەواوی ڕەنگی شەوێی گرتیە، ئێمە دوو بەشی لە خۆشی جیرانەتی ئەوان ئەو زەویەمان ئیجار کردووە.

ئەو ئێوارەیە، وەک زۆربەی ڕۆژەکانی دیکە، پیکەبە جەمسییەکەی حسێنی، لەلای گردی قەڵغانی بەدیارکەوت، هێندە خێرا لێی دەخوڕی گەواڵ گەواڵ تۆزی لەدوای خۆی جێ دەهێشت. ئەو کۆترە کیویلکەو سۆفەقیتە و بوغاز و تیترواسک و پۆپیتەسلێمانانەی قەراغ ڕێی، کە خەریکی هەڵگرتنەوەی ئەو دەنکە پاقلە گاگۆزو پاقلەخاتوونەو نانەشوانەو نیسکانە بوونو دەیانخوارد، بە بینینو نزیکبوونەوەی پیکابەکە، لە شەقەی باڵیان دەداو لە پشتەوەی پیکەبەکەی دەنیشتنەوە. هەردوو سەگەکانی ماڵی عەزیز قەمبەری، قەرە بە قەرەی پیکەبەکەی غاریان دەداو پێی دەحەپین، تاوەکو زمانیان بستێک لە زاریان دەردێناو هیلاک دەبوون، ئەوجا لە یەخەی پیکابەکە دەبوونەوە و دەگەڕانەوە جێی خۆیان. دیسان چەند سندوقێکی دەبڵی دارو چەند گونییەیەکی داخسۆری بۆ ماڵی مام حەمەدەمینی لە پێش کەپرەکەی دابەزاندو پسولەی فرۆشتنی بەرهەمی ڕۆژی پێشووی دایەدەست مام

١. نێمگیر: ڕقئەستوور و پێداگرو عاسێ.

٢. باشار: دەرەقەت، زەفەر، تاکردن، پێوێران.

حەمەدەمینی و پارەکەی بۆ ئەژمارکرد. مام حەمەدەمین گوتی: کاک حسێن دوو بەیانی لەگەڵ بارکردنێ، ئەمنیش دێم بۆ شاری بەجێم مەهێڵە، ئیشوکاری زۆر پێویستم هەیە لە شاری ئێوارەش لەگەڵت دێمەوە.

بەیانیەکی فێنک، کزەبایەکی شەماڵی بەحاڵ گوفکی بڕکەتەماتەو حەسیری هەلاشی لێوی کەپرەکەی دەبزاوت، تیتروا سکو چیکەنەکان[1] چراوەیان[2] دەهات، پیکەب کشایەوەو خۆی لەگەڵ سندوقە تەماتەو ئاروو و گونییە باینجانو دەلوجەو بامیەکان جووت کرد، هەتاوەکو ئەوان باریان کردن مام حەمەدەمین جلی ئیشێی داکەندو جلی نێو خەڵک و مەجلیسانی لەبەرکرد. ئەو بەنە زەرد و سوورانەی لە ئەسمەری کچی وەرگرت کە ڕۆژی پێشوو ڕایسپاردبوو ئەندازەی پێڵاوەکانی مەمۆی و ژنەکەی پێ بگرێ، ئەسمەر گوتی: بابە لێت نەگۆڕێن زەردەکە ئەندازەی پێی ژنەکەیە، بەنە سۆرەکەش ئی پێی مەمۆیە، ئەوجا لە یادت نەچێ دوو کیس خەنەو سابوونی دەست و چاوان و چەند زارجووە بنێشتێکی کوردیشمان لۆ بێنە. مام حەمەدەمین سواری پیکەبی بوو، هەولێر خۆت بگرەو هاتم. کاتێک گەیشتنە هەولێرێ بەپەلە خۆیان گەیاندە بازاڕی تەڕەباری[3] هەولێرێ، پیکابەکان بەڕیز وەستابوون دەرگای دواوەیان دەکردەوەو بەدوو زنجیری سەر بە قولاب قایم کرابوونو بەسترابوون. حەیدەرەکەچەڵ لەسەر دەرگای پیکەبەکەی وەستابوو، پیاوێکی بە قەڵافەتو سوورو سپی بوو چەفیەکی سپی لەسەری دەهاڵاند، هەرچەند جاری پونگەی سەری سندوقە تەماتەو ئاروو و

---

١. چیکەنە: جۆرێک باڵندەی هاوشیوەی تیتروسکە، بەردەوام دەچریکێنێ و چیکەیەتی.

٢. چراوە: دەنگی تیترواسک و چەند باڵندەیەکی دیکە.

٣. تەڕەبار: باری میوە و بەرهەمە ڕووەکییەکانی وەک تەماتە و بامیە و باینجان و...

گونییە داخسۆرەکانی لادەبرد، کە چاوی بە بەرهەمێکی جوان دەکەوت، ئۆخژنێکی لە دڵدا دەگەڕا. دەڵاڵ بوو، کەسایەتیەکی جوانی هەولێریێ بوو، تەماتەی عەزیز قەمبەری بەناوبانگ بوو، ئاارووی عابیدیش بەناوبانگ بوو و پێشبڕکێی لە هەموو بەرهەمی جووتیارەکانی دیکەی ناوچەکە بردبووەوە یەکانەبوو. بەو پێهەڵدانە پیشەییانەیەی حەیدەرەکەچەڵیش، هێندەی دیکە لەبەردڵی کڕیارەکان شیرینتر دەبوون. حەیدەرەکەچەڵ بەو قەڵافەتە بەرزەیەوە، وەک فەرماندەیەک لەسەر دەرگای پشتەوەی پیکەبەکە وەستاوەو مەزاد دەکات، دوکاندارە کڕیارەکان وەک تیپێک سەربازی بە دیسپلین لە خوارەوە وەستاون و تەماشای زارو گوفتاری فەرماندەن. ئەویش هەر زوو زوو ئەو جۆرکە پڕ لە درهەم و فلس و خوردەیە لەبەر قایشەکەی پشتی توند دەکات. حەیدەرەکەچەڵ تەماتەیەکی سەری سندوقی بەدەستی ڕاستەوەیەو لە هەوادا هەڵیدەداو دەیگرتەوە: قەمبەرییە، قەمبەرییە لە دنیادا وێنەی نییە. بەدەستی چەپیش دوو ئاروی بە کوڵووکەی بەدەستەوەیەو هاوار دەکات: خەیارەکە عابیدییە، هێند ناسکە ڕایوەشێنی لەنێو قەدێرا پەڕییە. ئەوەل مەزاد پێ بەپێ نرخ بەرز دەبێتەوەو دەبێتە مایەی دڵخۆشی جووتیارەکان. ڕۆژانە لەنێو جووتیارەکان وەکو نرخی بۆرسەی جیهانی باسیان دەکرد کە ئەوڕۆ تەماتە گەیشتە ئەوەندەو ئاروو گەیشتە ئەوەندەو، پیکەبی شووتی بەوەندەی فرۆشا. لەوکاتەی داواکاری زیاد دەبوو نرخ هەڵدەکشا، حەیدەرەکەچەڵ دڵی خۆش دەبوو، هەستی پێدەکرا شادیو کەیفی گۆتنێی هەڵدەستا، قۆریاتێک کۆکتێلی بە حەیران دەگوت، چریکەی بە ئاسانی دەگەیشتە بنقەڵات و دەوروبەری مزگەوتی دێرەبرووشەی. هەولێرییەکان ژیانێکی دوور لە بوغزو ڕق و کینەیان بەسەردەبرد، کە جێی دەمارگیری نەتەوەیی‌و ئاینی نەدەبووەوە. پێکەوەژیان چێژێکی تایبەتی

هەبوو، درۆ و غەشو ساختەکاریو دزیو بوغزاندنی نەتەوایەتی، دەگمەن بوو، تەنها چەوسانەوەی چینایەتی کۆمەڵگای داڕزاندبوو، ئەوەش زیاتر لە گوندەکان دەبیندرا، لە شارەکان کەمتربوو.

مام حەمەدەمین هەر زوو پارەو پسوولەی بەرهەمەکانی وەرگرتو بە حسێنی گوت: دەچمە قەیسەری هەندێک پێداویستی و شەکر و دەرمانچای دەکڕم، بەجێم مەهێڵە، حسێنیش گوتی: پیکەبەکە لەلای ئەو کەندە پیسەی تەنیشت بەنزینخانەی ڕادەگرم. مام حەمەدەمین هەیپێی لێکرد بۆ نێو قەیسەری، جارێ لەلای هێروە[1]، دوو جووت پێلاوی کڕی، یەکێکیان پێلاوی بنعانەی زەردی زرۆقی[2] بۆ ژنی مەمۆی، ئەوی دیکە پێڵاوی پیاوان بۆ مەمۆی. هەریەکە بە ئەندازەی ئەو بەنە زەردو سوورانەی لە ماڵێ هێنابوونی. لەنێو کوتاڵفرۆشانیش کراسی گوڵباتمانو کەوێی ئاگربارانو بنکەوێ یەخەچندراو و نەخێشندراو بە ئارموشو سیمی زەردو سپی، چارۆگ و بەرامپیل، هەر وەک جلکی بووکێ هەڵبگری، ئەوەیان بۆ ژنی مەمۆی. کورتەکو شەرواری فەتاح پاشای مرادخانیو پشتێنی کەرنەکی سپی بۆ مەمۆی. با بچم چایەکیش لە چایخانەی عەبۆی بخۆم، گەرووم هیشک بووە هەندەی مامرەتی لەگەڵ ئەو دوکاندارانە بکەم. لەسەر ڕێگای خۆی، لە کۆڵانی کورتاندووران، کورتانێکی باشی بۆ نێرەکەرە بۆزەکەی کڕی. هەرشتێک بۆ نێرەکەرە بۆزی بکڕم بەخەسار ناڕوا، ئاخر ئەو کەرە دەستو پێمانە بەخوای، وەکی دەڵێن «ئەوەی کەرەکی نەبی کەرەکی نایینی». دەبێت سەرکەللەو قەڕاسەکی نوێشی بۆ بکڕم. حەمباڵێکی کۆپان بەشانی بانگ

١. هێروە: دەستپێک، سەرەتا، بەرایی.

٢. زرۆقی: زەردی بریقەدار.

کردو کورتانی نێرەکەرە بۆزو ئەو شـــتانەی کڕیبووی، هەمووی بۆ خســـتنە سەر کۆپانەکەی پشتی. مام حەمەدەمین لە پێشەوە دەڕواو حەمبالەکەش بەدوایەوە. کیسەیەک شـــەکرۆکەی کیری قازیو گوومشـــکی کڕی بۆ منداڵانو گەیشتەوە لای پیکەبەکەی حســـێنی، و وردە وردە جووتیارەکان بۆ گەڕانەوە لەلای پیکەبەکە نامادەبوون. لە یەکتریان دەپرســـی ئەرێ کەبابت خوارد؟ چونکە لە گوندەکان باو بوو ئەو کەسەی دەچووە شاری دەبوایە کەبابی بخوا، ئەگەر کەبابی نەخواردبوایە دەیانگوت: کەواتە نەچوویە شاری!

ئێوارەیەکی درەنگەو ڕۆژ لە ســـەر زەردییە، هەر یەک دوو باڵی ڕۆژ ماوە، مام حەمەدەمین بە ســـواری پیکەبە جەمسیەکەی حسێنی گەیشتەوە کەپرو شـــینایی خۆیان. لەکاتـــی دابەزینی لە پیکەبەکە هەمـــوو خێزان، بە مەمۆ و ژنەکەشـــیەوە، بەرەو پیری چـــوون، بەر لە هەمـــوان منداڵەکانی فەرهادی گەیشـــتنێ، دەیانزانی بۆ هەموویان بەبێ جیاوازی شـــتێکی هێناوە، هەر زوو شـــەکرۆکەی کیری قازیو گوومشکی دا بە منداڵەکان، ئەو شتانەی کڕیبوونی هەموویان لە ناوەندی کەپرێ لەســـەر یەک دانان: ئەوە بۆ منداڵان، ئەو کیسە خەنانەو بنێشـــتی کوردی دابەشـــکەن بەســـەر ژنەکان، ئەوە پێڵاوی مەمۆ و خێزانی، ئەو کـــراس گوڵباتمانو کەوێی ئاگرباران و بنکەوێی نەخشـــێندراو، بـــۆ ژنی مەمۆی، کڵاو جەمەدانی بۆ مەمـــۆیو دەڵێ کوڕم مەمۆ کورتەکـو شەرواڕێکی فەتاح پاشام بۆ بە شـــێوەی مرادخانی بەڕادان داوی، هەرکە دروا بۆت دەنێرنەوە. دەمەوێ بتکەمە پیاوێکی قۆچاغ، ئەوجا ئەو پشتێنە کەڕنەکە سپیەی لەسەر ببەستە لەگەڵ دوو خەریتەی حەسیب قادری کەرکوکی و شای بە سەپانی خۆت مەزانە! دەمەوێ هیچ کوڕەئاغایەک، لەلایەنی جلوبەرگ و

تەداروکاتی چەکدارییەوە، باشارت نەکا.

ئـەو بەیانییە لە خەوێ هەسـتان، مام حەمەدەمین لەسـەر نانخواردنی بەیانی گوتی: کوڕینە ئەمشـەو زەلامـمان هاتبوونەسەر، شـێرەبۆرە دەوی لە کالان نەچوو، شـەوی ئەمشەو هەر ڕامالّی بۆ ئەو کەندەی پێش مالّێ دەبردوو دەحەپی، سەوەرێکی زۆر بوو فیشەکم لێخوڕیبووە بەرێ، لە پەنای ئاوبارەی[1] دانیشـتم بۆ ئەوەی ئەگەر بێن، تەقەیان لـێ بکەم. فەرهادی کوڕیو مەمۆ گوتیان بابە ئەدی بـۆ بانگی ئێمەت نەکرد؟ مام حەمەدەمین گوتی: ئەوەندە خەوتان خۆشـبوو دلّم نەهات بانگتان بکەم، وەرن با بڕۆین بزانین لەو کەندەی چییان لـێ بەجێماوە. کە چوون، شوێنی دوو کەسیان بەدی کرد چەند قونکە جگەرەیەکیان لـێ بەجێ هێشتبوو.

شـەوی دواتر، زەلامەکان دیسان هاتنەوە سەریان، بەلّام شێرەبۆرە ڕێگای پێ نەدان لە کەپـرێ نزیک ببنەوە، ناچاربوون هەندێـک تەقەیان بە کەپرێوە ناو ئەوانیش وەلّامیان دانەوە. دیاربوو برای ئەو ژنەی بوون، کە مەمۆ هەلّیگرتبوو. گوللەیەک سـەرچیغ بە ملی شێرەبۆرەی کەوتبوو، ئەو فیشەکە لەسەر ملیرا هەتـا لای کلکی داغی کردبوو. بۆ بەیانی چوونە شـوێنی زەلامەکان دیاربوو قەوانـی تفەنگی ئینگلیـزیو برنۆی لێبوو، بە دۆنی ئـاژەلّ و دەرمان مەلاریا سـەگەکەیان تیمارکرد. مام حەمەدەمین دەیگوت: پێم خۆشبوو ئەو گوللەیە بە من کەوتبایـە، بەلّام بە شـێرەبۆرەی نەکەوتبایە! داخەکـەم زمانی ناگاتە

---

١. ئاوبارە: تەبارەیەکی لە گلّ سازکراوە، بۆ گواستنەوەی ئاو بە مەبەستی ئاودێری، لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە یان لە تەپۆلّکەیەک بۆ تەپۆلّکەیەک کە نێوانیان نزم بێت.

برینەکـــەی، دەنا دەیلێســـتەوەو زوو چاکی دەکردەوە. ســـەگ هـــەر ئەوەندەی زەحمەتە هەتا دەمی دەگاتەوە برینی خۆی.

دوای چەند ڕۆژێک، قاسیدێک هاتە لای مام حەمەدەمینی: ئەمن لەلایەن براکانی ئەو ژنە هەڵگیراوەی مەمۆیەوە هاتووم پێت بڵێم ئەوان ئێســـتا ئەتۆو کوڕەکەت بە دوژمنی ڕاســـتەقینەی خۆیان دەزانن، چونکە بە هۆی پەنادانی ئێوەیە دەســـتیان ناگاتە مەمۆ و خوشـــکەکەیان و بیانکوژن، ئەگەر ئێوە نەبن هەویـــری مەمۆی ئەوەندە ئاوەی نابـــات، لە حەفتەی زیاتر نابا، چارەســـەریان دەکەین! مـــام حەمەدەمینیش گوتی: ئەو کوڕە پەنـــای بۆ من هێناوەو خۆی دەخیلـــی ماڵی من کردووە. هەتا لەلای ئێمە بـــن مەگەر ئەمن و کوڕەکەم لە پێش ئەواندا بکوژن، ئەگەرنا ڕێگا نادەم ئەو دوانە هیچیان بەسەربێت. هەموو کەس دەزانێ لە کوردەواریدا خۆهاویشـــتنە ماڵی هەرکەســـێک، حیسابێکی گـــەورەی هەیە، ئەگەر ئـــاوا نەبایە من حەز ناکەم مێشـــوولەیەکیش دوژمنم بێت، ئێمە پیاوی کاسبین، کوا پیاوی ئەو شەڕەتەقەو تفەنگ بە یەکتروەنانین، هەرشـــەوێک دەبێت بە تەقە، منداڵ زیڕەی دەکـــەن. ناچارم، کاتێک یەکێکی لێقەومـــاو ڕوو لە دەرگات دەکات، ناکرێ دەرگای بە ڕوویدا دابخەی، هەر لەنێو خەڵکی دەبیە ســـۆدرەی دنیایێو دەبیە بنێشتەخۆشـــکەی ســـەرزارو زمانان، دەڵێـــن میوانی لە ماڵـــی خۆی دەرکردیە، ئەگەرنا ئەمن لە ئێشـــی دڵی ئەو پیاوانە، کە کچیان هەڵدەگیرێ، دەگەم، دەزانم لەنێو خەرکی چۆن باس دەکرێن، ڕەنگە لە شـــەڕەمنداڵیش خەڵک بە چاویاندا بدەنەوەو پێیان بڵێن ئەگەر پیاون بڕۆن تۆڵەی خۆتان بکەنەوە، ئەوە چەند ســـاڵە خوشـــکتان دەتەقێننەوە! ئەدی هەر ئاوا نەبوو ئەوێ ساڵێ مارێ فرانەکەسی، لە دوای بیست و چوار ساڵان لە

شەڕەمنداڵی بە چاویاندا دانەوە، ئەوانیش چوون عەیشێیان کوشت! کوڕی بە ژن وماڵیشی هەبوو!

نۆ مانگیان بەو تەقوتۆقەی شەوان بەڕێ کرد، کوردگوتەنی: مام حەمەدەمین و فەرهادی کوڕی «نەکردیو نەخواردی لە سمێلان مەیی»، تا وای لێهاتبوو کار و کەسابەتیشیان دابوویە کزی، چونکە شەوان تێرخەو نەدەبوون. بەڵام مام حەمەدەمین دڵی هەر ڕوون بوو، بە ئومێدەوە دەیگوت: ڕۆژگار کۆن بێ، بە پشتیوانیە خوای، ئەو گرێکوێرەیەی دەکەینەوە و چاری دەکەین!



# ٧

ئەو شـــەوە لە ماڵی حەسەنەکووڕی کۆبوونەوە، هەر لە دوای نوێژی شێوان برادەران یەک یەکـو دوو دوو پەیدابوون. کۆتایی زستان و سەرەتای بەهارێیە، ســەرما کلکی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ و بەهار شوێنی پێ لەق دەکات. مام حەســەنەکووڕ گوتی: کوڕینـــە هەمووماں بە منداڵی لـــەو گوندەی پێکەوە گەورەبووین‌و تەمەنی منداڵی‌و هەرزەکاریمان بەیەکەوە بەسەربردووە، هەزار و یەک یادگاری خۆش‌و ناخۆشمان بەیەکەوە هەیە، با هەریەکەمان یادگاریەکی منداڵیی بگێڕێتەوە. یەک دەڵێ: لە بیرتە ساڵی کلۆ زۆرەکە لەکاتی نان و شێو خواردن، کلۆ خۆی دەخستە نێو قاپە ماستو شێوی پێشمان. ئەدی ئەو ڕۆژەی هاواریـــان کرد : بگەنێ ماینێ ماڵێ حاجی ســـمایلی خنکا، هەموو بەغاردان ڕۆیشتین، هەتا گەیشـــتینە ماینەکەی، کندرەکەی وا لە ملی ئالأبوو، فەراقی ڕەشی لێبڕابوو، کەلاکەکەمان ڕاکێشا کەندێ بۆ پێش سەگان.

تاو نا تاو مریەمێ ژنی حەســـەنەکووڕی ســـەری لە دەرگای دەبردە دەرێ‌و دەهاتەوە ژوورێ: ســـاماڵەکە وەک زیوی، ئاســـمان دەڵێی ڕێوی لێستیتیەوە، یەک تاقە پەڵەهەوری پێوەنییە، ڕۆژی کۆڕێیە. بە خوای ئەگەر عومر باقی بێ

سبەینێ دەچمە کۆڕێ. بوخچەی ڕادەخستو جام و لیفکەو شانەو گڵەسەر[١] و سابوون و بەردەزبرەی پاککردنەوەی پاشپانیی ژنانی لەنێو بوخچەکەیدادەناو گرێیدەدا و لەبەرخۆیەوە دەیگوتەوە: بەخوای سبەینێ دەچمە کۆڕێ بۆ دەراوی ژنان، ئاوێ گەرم دەکەین لەگەڵ ژنان، بەڕاستی سبەینێ ڕۆژی کۆڕێیە. کەزیو پرچی کردبۆوە، لەچکەکەی لەنێوچاوانی بەستابوو، سینگ و مەمکی نیوەڕووتی بەرەڵای دنیایێ کردبوو، دەتگوت ئارەزووەکانی بەرچاوی تاریک کردووە، سینگو مەمکی لەو گۆڕەی دەڵێی ژنە حۆرییە، هەر حسابێ بۆ پیاوەکان ناکات. مریەم ئەو قسەیەی چەندجار دووبارە دەکردەوە دەیگوت: هەرێم بە ژنی گوندی دایە سبەینێ لە دەراوی ژنان کۆڕەکی دامەزرێنین ئەوسەری دیار نەبێ! هەتا هەموو ئاوێ ڕوونمان لێدێ خۆ دەشۆین. حەسەنەکووڕیش لە مەرامی مریەمێ حاڵی بوو، گوتی: مریەم مریەم، گوێ بدێ! بەس سەبرم لێبگرە ئەو میوانانە بڕۆن، ئەگەر پیاوبمو دایکیان نەگابم، سبەینێ دەتنێرمە کۆڕێ، چۆن دێڵم بە وشکی کۆڕێ بکەی!

بوو بە پێکەنین، گوتیان وەڵڵا براژنە مریەم دەیەوێ بەدەرکردن دەرمان بکات، ئەوە ئێمەینەو چاومان قایمە ناڕۆین، دەنا عالەم ئاشکرا پێمان دەڵێ بۆمان چۆڵ بکەن، لەگەڵ حەسەنی کارمان هەیە! ڕاستی دەکرد، ئەستێرە زەقەزەق دەبریسکانەوەو دەیانجریواند. هەر بابا بوو بە قسەی ناوەخندار دەیگوت: بەخوای ئەمنیش ژنەکەم دەنێرمە کۆڕێ، براژنە مریەم بەجێی مەهێڵە سبەینێ!

---

١. گڵەسەر: گڵێکی سوورە، ژن لە ئاودا دەیانخوساندەوە و دەیانکرد بە قوڕ، لە جیاتیی شامپۆ سەریان پێدەشووت بۆ ئەوەی نەرم بێت. گڵەسەرفرۆش، بە پشتی گوێدرێژ گونداو گوند دەگەڕاو دەیفرۆش.

بەیانـــی ڕۆژویان گەرم بووە، هەموو ماڵەکان نانی چێشـــتیان خواردووە، ژنانی ئاوایی هەریەکە تێلەگەی لە پشـــتی خۆی هەڵداوە، بوخچەی پێداویستییەکانی خۆشۆردنو تەشتو مەنجەڵو جامیان دەستداونێ، یەکیان دەپرسی: کچێ مریەم ســـەرت لە قوڕێ نێن، خۆ ئەوڕۆ چوارشەم نییە کۆری بکەین، ئەجندە دەستمان لێبوەشـــێنن! مریەم دەڵێ: ڕاوەستە، لەســـەر دیواریڕا لە مەلاژنێ خێزانی مەلا ســـاڵحی دەپرســـم، ئەو لەبەر نوێژی خوتبەی دەزانێ، ئا ئـــەوە مەلاژن لۆ خۆی هاتەدەرێ، ئەرێ مەلاژن پرسیارەک، ئەوڕۆ چ ڕۆژە؟ مەلاژن: دووشەممەیە. ژنان ڕۆیشـــتن بەرەو دەراوی ژنان، لە دەم ڕووباری نزیک بوونەوە لە شوێنی کۆری ژنان، چەند ســـاڵە ئێرە دەراوی ژنانە، جێی کۆری ژنانی ئاواییـــە، بەڵام ئەو پیاوانە چی دەکەن لێرەو خەریکی چین؟ خۆ ئەوە پیاوەکانی ڕەفعەت ئاغان، ئەوەتا مشـــیری کوڕیشی لەوێیە.

گەیشـــتنە ســـەر ڕووباری، چ ببینن! هەموو کوچاگر[1] و پەرۆشـــە[2] و ســـەرگینو چیلکە بۆ ئاوگەرم کردن لەوێ داندرابوو، هیچی نەماوەو هەمووی فڕێدراوەو بە ڕووباریدا دراوەو ئاو بردوویەتی. مشـــیر ئاغا بە ژنەکان دەڵێ ئێرە چیتر دەراوی ژنان و جێگای کۆری ژنـــان نییە، بۆتە باخی ئاغای، هەموویمان کردووە بە نەمامی بەری، بڕۆن شـــوێنێکی دیکـــە بدۆزنەوە بیکەن بە جێگای کۆرکردن. مریەم: ئەیەڕۆ خۆ دایکو داپیرمان لێرە سەری خۆیان شۆردووە. ژنان دەگەڕێنەوەو چییان دیوە بۆ پیاوەکانیان دەگێڕنەوە، بە کۆڵێک گلەیی و گازاندە،

---

١. کوچاگر: کوچکی ئاگر، سێکوچکەی ئاگر، ئەو سێ بەردە بوو کە لە دەوری ئاگردان مەنجەڵ و کتریی لەسەر دادەنرا بۆ چاو چێشت و...

٢. پەرۆشە: پوشو. بن و کۆلکەی گیایەکە، کە وشک بوو بۆ سووتان بەکاردێت.

ئەیەڕۆ ئەو ئاغایەی ئێمە چەند زاڵمو چاوبرسییە، یاخوا لەبەر دەلینگم مرێ، جێگای لـێ بڕاوە، چاوی بە هیچ تێر نابێ، پاریش جێ جۆخینانی کێڵاو کردییە قەرسیل، چاوی مەگەر بە خۆڵی نێو قەبری دەنا بە هیچ پڕنابێتەوە!

ئەو ڕۆژو شەوە باس هەر ئەو باسەبوو لە گوندی. یەک بە یەکی ڕادەگەیاند، ئاغا چی لە دەراوی ژنـــان کردییەو چۆن هەمووی کردووە بە تەمامی بەری، لە مورکی خەرکیەوە کردوویە بە مورکی خۆی.

دوای نوێژی شێوان، تاقمێک لە پیاوەکانی گوندی، لە ماڵی حاجی سمایلی خڕ بوونەوە، ئەوەی ئامادەنەبوو تەنها پیاوەکانی ئاغای و چەند گۆردەیەک بوون. هەموویان لەسەر ئەوە تەبا بوون کە حەول بدەن ئاغا ئەو شوێنەی داگیرنەکات. بۆ ئەو کارەش، هەریەکەو تەگبیرێکی دەکرد، هەبوو خۆی سوورو شین دەکردو لەگەڵ قســـان کەفی لە زاری دەردەپەڕی هێندە بـــە تووڕەیی دەیگوت: ئەگەر خوێنم بڕژێ ناهێڵم ئەو ئیشـــە ســـەربگری، ئاخر ژنەکانمان لە کوێ ســـەریان بشـــۆن و کۆری بکەن؟ ئاخیرەی، گەیشتنە ئەو بڕیارەی لەدوای مامۆستا مەلا ساڵحی بنێرنو وەک نوێنەری خۆیان ڕەوانەی لای ئاغای بکەن، پێیڕابگەیەنێ کرمانجەکان ئەو داگیرکردنەیان زۆر پێ ناخۆشەو گوناهت دەگات ئەو شوێنەیان لـێ داگیربکەی. مامۆستا مەلا ساڵح پێیەوە دیاربوو کەوتۆتە ژێر ناڕەزایەتیی مەلاژنـــێو، مەلاژن لە دژی ئەو داگیرکردنە مـــەلای باش تیژ کردبوو، چونکە یەکەم قســـەی ئەوەبوو گوتی: لەعنەتی خوای لەو کەســـەی زوڵم لە خەڵک دەکات! هەندێک ئایەتو حەدیســـی ئاگرینی خوێندەوەو خەڵکەکەی هاندا بە هیچ شێوەیەک ئەو زوڵمەی قەبوڵ نەکەن، گوتی: پێغەمبەر دەفەرمێ ئەوەی زوڵم قەبوڵ بکات لە ئۆمەتێ من نییەو ڕۆژی مەحشەرێ لەسەر پردی سیراتێ

شەفاعەتی بۆ ناکەم. بە کۆی دەنگ بڕیاریان دا بەنوێنەرایەتی خەڵکی ئاوایی مامۆستا مەلا ساڵح بچێتە لای ڕەفعەت ئاغای، پێی بڵێ دەراوی ژنان چەند پشتە لە زەمانی باب و باپیران هەر جێی کۆری ژنان بووەو پێشینیان بە زانا بوون ئەو شوێنەیان هەڵبژاردووە چونکە بەرەو ڕۆژەو بای ناگرێتەوە و خوای داناوە بۆ کۆڕی ژنان.

مەلا بەرەو دیوەخانی ڕەفعەت ئاغای کەوتەڕێ، ئەوشەوە خەڵکی ئاوایی تا درەنگانی شەوێ، لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی مەلاو دوا بڕیاری ڕەفعەت ئاغایدا مانەوە، بەڵام مەلا نەگەڕایەوە، دیاربوو مەجلیسی ئاغاو دیوەخانی لێ خۆش هاتبوو، هەر نەگەڕایەوە. بۆ بەیانی خەڵکەکە چوونە لای مامۆستای مەلاش چەند ئایەتو حەدیسی هێورکەرەوەی دەرخوارددانو گوتی: فیتنە لە کوشتن توندترە، سەبرگرتن کلیلی ڕەحمەتێیە. دیاربوو ئاغا سمێڵی مەلای چەور کردبوو، ئەو پفدانەی مەلاژنێش فش ببۆوە. حاجی سمایل بە ژوورکەوت، دیاربوو تازە لە ئالیکدانی وڵاخەکان سەوەی کای دانابوو، هێشتا مووی سینگی پڕ لە زلەکا بوو، چاوەڕێی نۆبەی قسانی کرد، تەنها کاکەڕەشی حاجی سمایلی بێ ئەوەی وەکو ئەوانی دیکە ببڕێو بکوژێو هەڕەشەو گەفوگوڕ بکات، لە داخان هەر سمێڵی خۆی دەکرۆشتو ئاوری تۆڵەی لە هەناویدا نێڵەی دەدا، گوتی: ئەوەی نەتوانێ داکۆکی لە دەراوی ژنانو جێگای کوڵکردنیان بکات، هەقە ژنەکەی لەگەڵی نەخەوێ بە خوای، مخابن زۆر زەلام مارەیی ژنێی لێ نایە هێندە دەست و پێ سپیە، دەسەڵاتی مریشکە کورکەکی نییە، کەسێک نەتوانێ پارێزگاری لە سەرشۆرکی ژنەکەی بکات، بۆ پێی بگوترێ پیاو! حەسەنەکووڕ هەستایە سەرپێ، ئەوەندە بە توندیو تووڕەیی هەستایەوە

سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، دوو هەنگاوی بەرەو دەرگای حوجرەی مامۆستا مەلا ساڵحی نا، بەجۆرێک دەستی بۆ بەرپشتێنی برد وەک خەنجەر یان دەمانچەی هەڵکێشـی، کیسـەتووتنە بۆندارەکەی لە بەرپشتی دەرێناو دەستی لە دەرگا بردە دەرێ و دوو سێ جاری کیسەتووتنەکە داتەکاند بۆ ئەوەی تۆزی توتنەکەی لـێ بتەکێ، هێندە بە توندی کیسەکەی دادەتەکانت وەک سـەری ڕەفعەت ئاغای ڕابوەشێنێ! ئەوانەی لای دەرگای کە تۆزی تووتنەکەی چوبووە نێو لووتیان، چەند جارێک پژمین. پەڕەسیگارێکی لە دەفتەرە بافرەکە کـردەوەو زمانی بە لێواری داهێناو تۆزێکی لە لێـواری کردەوە، پڕ لە تووتنی کردو زمانی پێدا هێنا، وەک مانگا گۆلکی خۆی بلێسـێتەوە، دەمێک بوو لە دارجغارەکەی دەگەڕا بەرپشـتێنو باخـەڵ و گیرفانەکانی هەموو گەڕا، دوایی بیـری کەوتەوە لەنێـو کیسـەتووتنەکەی دانابوو، جغارەکەی لـە دارجغارەی چەقانـدو چەرخی لێدا، کیسـەتووتنەکەی بۆ ئەو کەسـەی لە تەنیشـتی دانیشـتبوو، ڕاداشـتو فەرمووی لێکرد جغارێکی تێبکات. بەو شـێوەیە ، کیسەتووتنی حەسەنەکووڕی هەتا لە مەجریسێ سوڕایەوە، هەموان پێکەوە جغارەیان بە ئاگر کرد . هەزار سۆندت خواردبا سۆندت لـێ نەدەکەوت دەتگوت ڕێوی قانگ دەدەن، سەنەگەیان لەسەر جغارەی هەڵنەدەگرت، تووتنەکە تووتنی بۆنداری هەرتەلێیە، کەس هەیە کیسەی ئاوای بکەوێتە بەردەستیو یەکێکی نەپێچێتەوە! لە حوجرەی مامۆستای، چاوچاوی نابینی، فانۆسی قەد دیوارەکە وەک ترووسـکایی ئەستێرەیەکی کز، لەنێو تەمومژ بەحاڵ دیاربوو، لەوکاتەی هەموویان هەستیان لە چێژو بۆنی جغارەکان ڕاگرتبوو، حاجی سمایل ئەو دەمەی بە فرسەت زانی، کەلێنە ئەگەر دوو قسەی بەریکەوێ، مژێکی لە جغارەکەیدا

و قســەو دوکەڵی جغارەکە بە تێکئاڵاوی لە زاری دەهاتەدەر: خزمینە «قســە چارە دووی بەکارە»، زۆر گوتن قورعان خۆشە، با چیدی زۆران بۆ کەمان نەڵێین، ئەگەر هەمووومان قسەو بەڵێنمان یەک بێتو پەیمان نەشکێنین، نەک ئاغا بابی ئاغاو هەموو پۆلیســی سوارەشمان بێتەســەر دەرەقەتمان نایەن، ئەگەر چەند کەســێکیش چەورەیی بکاتو بە دزی خۆی باوێتەوە دیوەخانی ڕەفعەت ئاغای، ئەوا ڕیسەکەمان لێ دەبێتەوە خوری.

ڕۆژ بــە ڕۆژ بارودۆخەکــە ئاســایی دەبوویەوە، ئەو هەمــوو گەف و گوڕە بوونە بڵقی ســەرئاو، ئەوەی لە هەمووان زیاتر خۆی دەخواردەوەو دەرینەدەبڕی، کاکەڕەشی حاجی سمایلی بوو.





سالا وەرسووراوەتەوە، پایزێکی درەنگەو لە زستان نزیک بووینەتەوە. خەڵکی ئاوایی وەک کوورەی هەنگ هەر بابایە سەرقاڵی کێشانەوەی پێداویستیەکانی زستانن‌و لە چاڵ و عەمبارو کادێن‌و سەرگیندان[1] دایاندەکەن، بەرهەمە لەخۆ زیادەکان دەفرۆشن، ئێستا کاتی دانەوەی قەرزی خواو خەڵکە. دەچنە شارەکان جلوبەرگ بۆ ئەندامانی خێزانەکانیان دەکڕن. هاوینی ڕابردوو، حاجی سـمایل کارەمووی[2] لە دۆن و بەزو مووی کارە ساوا دروستکردبوو، لە کونی سێلۆکەی جەنجەڕو کلچووکی[3] تۆپەی باڵتەکانی[4] جەنجەڕی هەڵدەسوی بۆ ئەوەی

---

١. سەرگین: ڕیخی مانگا و گامێش کاتێک وشک دەبێتەوە، لە هەولێر پێیدەگوترێ سەرگین و، لە پشدەر و موکریان پێیدەگوترێ تەپاڵە، لە سنووری سلێمانی پێدەگوترێ شیاکە، لە دوو گوندی سێگرتکان و ئۆمەرگومبەت لە سنووری کۆیە پێیدەگوترێ لاس. سەرگیندان: شوێنی ئەنبارکردنی سەرگین (تەپاڵە).

٢. کارەموو: گریسی دەستکردی خۆماڵی. مووی کاریلە بە مقەست لێدەکرایەوە، بەز و دونگی ئاژەڵیان دەتواندەوە و لەگەڵ مووەکەتێکەڵاویان دەکرد و وەک گریس بۆ چەورکردنی جەنجەڕ و بەکرەی بیری ئاو بەکاردەهات.

٣. کلچووک: کلکی تۆپەی باڵتەی جەنجەڕ کە دەچووە نێو سێلۆکەی.

٤. باڵتە: ئەو دەمە تەورانەن کە بە ڕۆڵەی جەنجەڕەوە بەستراون، بۆ وردکردنی

چەور بێت و بە ئاسانی بسووڕێ. جەنجەڕو هێسترەکانی بە نەوەکانی سپارد تاوەکو لەماڵەوە دەستی بشواتەوە و بگەڕێتەوە لایان. دروست لەو کاتەدا، یەک لە نەوەکانی حاجی سمایلی کەوتبووە ژێر جەنجەڕی جووتە هێستری. باڵتەکان هەموو ئازای بەدەنیان ئەنجنیبوو هەر بەدەم غاردانو گەرماوگەرم حاجی سمایل مەولودی پێغەمبەری بۆ لەخۆ گرت: مەولودێکم لەسەر بێت ئەو منداڵە نەمرێتو ئیفلیج نەبێت! لە هەموو ئازای بەدەنی خوێن فیچقەی دەکرد، لە باوەشی حاجی سمایلی وەک تۆپەڵە خوێنێکی مەییو دەبینرا، کەواو سەڵتەکەی بە تەڕدەستی هەڵکردووەو شاقەلی کەواکەی لە بەرپشتێنی ڕاکردۆتەوە، کلکەئەنگوچکی کراسەکەی لە قۆڵ و باسکی لەژێر کەواکەیەوە پیچاوەو لەکاتی هەنگاونان دەرپێیە شەعادەکەی دەبینرێ، ئەنگوچکو دەرپێی شەعادەی سپی لە خوێنێدا سوور سوور هەڵکێشراوە، بەجۆرێک نازاندرێ ڕەنگیان بەر لە هەڵگرتنی منداڵەکە سپی بوون.

لە لای حەکیم، بە دەرمانی گیایی‌و خۆماڵی، بە سێ مانگ منداڵەکە چاک بوویەوە. حاجی سمایل خۆی بە قەرزاری خوا دەزانی، ئێستا کاتی وەفاداربوون بە بەڵێن و خاوەنداریکردنە لە خوێندنەوەی ئەو مەولودەی قەولی دابوو، ئەو بەڵێن و سۆزەی حاجی سمایل لەگەڵ خوای خۆی بەستوویەتی، ئاخر ناکرێ، پەیمان ئەگەر بە زمانیش دەرینەبڕی هەر لە دووڕ دڵی خۆت لەسەرت دەبێتە ماڵ! دوور نییە ئەگەر بەڵێنەکەت پشتگوێ بخەی خوا غەزەب لە ماڵ و منداڵت بگرێ، یان دەردێک بە مەڕو ماڵاتت وەربێ‌و قڕانی تێبکەوێ، یان ئاگر لە دەغڵودانت بەربێ‌و ...

---

قرشەی گەنم و جۆ، لە کاتی گێرەدا.

هەموو پێداویستییەکانی مەولود ئامادەکرا، چەند ئاژەڵێک بۆ سەربڕین لە پێش دەرگای حەساریٚ بۆ ئەوەی میوانەکان هەموو ماک[١] و گۆمیلکە مەیوەکانی خوێنەکە ببینن و بزانن چەند سەر ئاژەڵ سەربڕاوە، دوو کاوڕی ئایەغ[٢] و بەرانە گێژەکەو ئەو کوورەی چاوێکی کوێر بووبوو بە پلاری شوانی، هەرچوار سەر ئاژەڵەکانیان سەربڕی. کابان، لچکە کەوایان لە گیرفان ناوە، کوچاگر ڕیزکران ژنی کابانو چەلەنگ، کەوگیرو کەوچکە گەورەکانیان بەو قۆڵ و مەچەکە سپیانە هەڵدەسووڕاندو چەند دەنکە پلاوساوەریان لەسەر زمانیان تام خویٚ دەکرد.

خەڵکێکی زۆر بانگهێشت کراوە، حاجیژن لەسەر کابانەکان دەسووڕیٚو خۆیان دەستەودامێن و بە قوربان دەکات: بەڵاگێڕتان بم با چێشتەکە زۆر بیٚو کەم نەبیٚ، حاجی سمایل کەمەی نازانی، هەر دەڵیٚ فلانکەسیش لە بیر نەکەن بانگهێشتی بکەن. حاجیژن لە خەیاڵی ئەوەی چێشت خەسار نەکریٚ و کەم نەیەنیٚو، حاجی سمایل لە فکرو داڵغەی ئەوەی دەبێت میوانەکان چۆن باسی مەولوودەکەی بکەنو هەتا چەند لە چێشتەکەی ڕازی بن. کاکەڕەشیش بۆ یەک چرکە ئەو زوڵمەی لە یاد ناچێت بەهاری ڕابردوو ڕەفعەت ئاغا بەرامبەر خەڵکی ئاوایی، بەداگیرکردنی دەراوی ژنانو فرێدانی کوچاگری جێی ئاو گەرمکردنی کۆری ژنان، کردبووی. هەموو دەمیٚ، لەکاتی جووتکردنو بەری دروێنە و شەنەباو کاکێشانیش لەبەرخۆیەوە وەک ورێنەی بکات، دەیڵێتەوە:

---

١. ماک: پەڵە، وەک پەڵە خوێن، شوێنەوار.

٢. ئایەغ: یاغ، کاوڕی لەڕو لاواز و بێکەڵک. بە کینایە بۆ شتی دیکەی بێکەڵک بەکاردیٚ.

«ئاخر بەنگۆ دەڵێم چۆن بەخۆم بڵێم پیاو، ئەگەر نەتوانم غیرەتی ئەوەم نەبێ جێی دەراوی ژنان لە ڕەفعەت ئاغای بستێنمەوە، ئەوجا ئەو ژنە کو بە من ڕازی دەبێ؟ ئاخر ئەمن بەنگۆ دەڵێم ئەو پیاوەی نەتوانێ پارێزگاری لە شوێنی سەر شووشتنی ژنەکەی خۆی بکات چۆن مارەیی ژنێی لێدێ! بۆ ئەنگۆ پێتان وایە هەرچی دوو داوە مووی بە سمێڵی وەبێ بە پیاو حیسابە، کوڕە ئاخر ئەگەر بە مووی بایە دەبوایە بزن براگەورەبی. نازانم ئەو خەڵکە بۆ وا زوو هەموو شتێکی بیردەچێتەوە، یادەوەرییان هەر دەڵێی یادەوەریی مێشیە!»

کاکەڕەش، دەمێک بوو شەوان لەژێر جاجمە دوو لایەکەی جینگڵی دەدا لەتاو ئەو زوڵمەی خەوی لێ دەهەڕکا[1] و تەزووی تۆڵەی بە هەموو لەشیدا دەگەڕاو پشتی پێیەکانی لە یەکتری گیردەکردو ددانەکانی بە چیرەوە دەبرد، ڕقێکی ئەستوور و بێئامان ڕۆحی هەلا هەلا دەکرد.

ئەوشۆ فرسەتە، تاریکەشەوێکی قەترانییە، قەڵای مێردانە. ئاخر شەو سامو هەیبەتی خۆی هەیە!

هەر لە ئێوارێوە، دوو باری ڕۆژ مابوو[2] زۆر بە بێتاقەتی لە ئاوابوونی خۆری دەڕوانی، هێندە لە ئاوابوونی خۆر بەپەلەیە، ئەگەر بۆی بکرابایە تاوێرێکی زەبەلاحی بە خۆرەکەیەوە هەڵدەواسی، بۆ ئەوەی لە کلکەی قەرەچوغی نقومی نێو تاریکیی بکات و وڵات لە تاریکی وەرپێچرێ. ئەو چرکەهەورەی وەک تارای بێوەژنان بە ڕەنگێکی سوورباو خۆی بەسەر چیای قەرەچووغی هەڵکێشاوە، لە ناکاو لە بەینی ئەو پەڵە هەورەو چیای قەرەچوغی، خۆر وەک مەلەوانو

١. خەوی لێ دەهەڕکا (خەو لێهەڕکان): خەو لێزڕان، خەو لێتێکچوون.

٢. دوو باری ڕۆژ مابوو: دوو باڵی ڕۆژ مابوو، نزیک خۆرئاوابوون.

دەریاوانێکی کارامە خۆی فجوق کردو شــۆڕبۆوە. پەڵەهەورەکە، لە داخی خۆ ونکردنی خۆر، ڕەش هەڵگەڕاو هەتا دەهــات دنیا زیاتر و زیاتر لە تاریکاییدا لوول دەبوو. کاکەڕەش پیاوێکی تێگەیشتوو و ئاقرمەندە، وەلــێ، هەموو هیوای بە تاریکایی شەوە، بە تاسووقەوە لە تاریکایی شەوی دەڕوانی بۆئەوەی کارەکانی تێدا ئەنجام بدا. هەمیشــە وایدەزانی تەنیایــەو کەوتۆتە نێو بیرێکی قووڵ و دەبێ تەنها پشت بەخۆی ببەستێ، بە تین و تاقەتی خۆی، خۆی دەربازبکات و بە تەمای ئەوەی نەبێ کەسێک دەربازی بکات!

ســـڵاوی میوانەکان، لە نێو نغرۆبوونی بیرو غایلەکانی ڕایچڵەکاند، سڵاوی وەرگرتنەوە. چەند مافوورێکی سەرەنازو چەند لبادێکی لاکێشی درێژی نەخش قەزمەنووشــتی ناوڕەنگ ڕاخــراوە. هەتاوەکو میوانەکان زیاتــر دەبن، گوڵی مافوورو قەزمەنووشــتی لبادەکان زیاتر دادەپۆشــن. مامۆستا مەلا ساڵح لە ســەرەوەی مەجریســێ بەرماڵەنوێژێکی بۆ ڕاخراوە. کاکەڕەش زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنــی ئەو میوانانەی دەکرد کە لەگەڵ گورگی گۆشــتی دەخۆنو لەگەڵ شوانی شینێ دەکەن! یان وەک دەڵێن لە ناڵیش دەدەن و لە بزماریش! بەتایبەتی ئەوانەی چووبوونەوە دیوەخانی ئاغای و چەورەییان کردبوو، خۆش خۆشــە چای لــە پێش دادەنان بە وریایی و بە گەرمی بەخێرهاتنی دەکردنو هۆشــی بۆ لای خۆی ڕادەکێشان، مەبەستی تایبەتی هەبوو لەو گرنگی پێدانە، بۆ ئەوەی بوو، بەیانــی هەرکارێک لە دژی ئاغای کرا، ئەوانە بڵێن کاکەڕەش، هەر لە هەوەڵی هەتــا کۆتایی لە مەولوودەکەی بووەو چای بۆ هێناوین، شــایەدیی بۆ بدەن کە ئەوە کاری وی نییە.

هەرچەندە بە بینینی ئەو جۆرە کەســانە قەڵس بوو، بەڵام ئەو کاری پێیان

بوو، بۆیــە خزمەتی دەکردنو دەیدواندن. مــام حەمەدەمینو فەرهادی کوڕی گەیشـــتن، بەدڵ بەخێرهاتنی کــردنو گوتی: مام حەمەدەمیــن بۆچی خاو و خێزانت نەهێناوە، خۆ ئێوە بێگانە نین لە ماڵی ئێمە. مام حەمەدەمین گوتی: لەبەر مەمۆی، بۆ خۆت دەزانی مەمۆ پیاوێکی دوژمندارە و بۆ ئەو قەرەبارغی و جێیانە نابێ کە هەموو نەوعە خەرکەکی دێتێ.

میوانەکان نانیان خوارد، مەلا سالْح گوتی: خزمینە دەست بە خوێندنەوەی مەولوودەکە بکەم باشــە، هەر هەند بۆ ماڵنووستنان لێی دەبمەوەو خاتیمەی پێ دێنم، ئەو مەنجەڵە شــەکراوەی بێننە پێش. گوتیان فەرموو مامۆســتا! بالیفێکی گەورەیان لە پێش مامۆســتای دانـــا، کۆنە کتێبێکی پەڕ زەردی بەر دوکەڵی چەند ساڵەی نێو دەلاقەو بنمیچانی لەسەر دانا. بە ناوی مەولودنامەی پێغەمبەر جۆرکێک شــەکرۆکەی بە داملیان[1] لە پێش مامۆســتای دانا بۆ ئەوەی مەولوودی بەسەردا بخوێنێو ببێتە متفەڕک، ئەوانەی نەخۆشییان لە ماڵێ هەبوو، چەند دەنکێک لەو بەداملیەیان دەدانێ بۆ ئەوەی شفای بۆ بێت، چونکە مەولوودی بەســـەردا قلْپکراوە، لەگەڵ غرمەو نرکەی یەکەم سەڵەوات لەوکاتەی هەمووان ســـەرنجیان لەسەر ئەو قسانەبوو، کە لە زاری مامۆستای هەڵدەوەرین، کاکەڕەش فرســـەتی هێنا، باوەڕیشـــی بەس بـــە هیدۆی برادەری هەبوو: هیدۆ ئەمن دەڕۆم ئیشێکی زەروورم هەیە هەر کەسێک لەمنی پرسی لە کوێم؟ پێی بڵێ ماینەکە بەرەڵڵابـــووە، ورتکەنانو خوێی لەنێو لەگەنێکدا برد ماینەکەی بگرێتەوە. هیدۆش بە هەڵە لەو کارە گرنگەی کاکەڕەشـــی حاڵی

---

١. شەکرۆکەی بەداملی: نوقڵێکی خڕی سپی بوو، نێوەکەی دنکە بادامی تێدابوو.

بوو، وایزانی دەچێتە ژوانی کچان، هەندێکی پێ ڕابوارد گوتی بەشـەرتێک کە هاتییەوە هەرچیت کردبوو بۆم لە نووکەوە بگێڕیەوە! چونکە بەپەلە بوو گوتی: باشـە، هەمووت بۆ دەگێڕمەوە. ئەو تەورداسـەی چەند ڕۆژبوو بە هەسـانی دەیسوو، مووی دەکرد، چەند جار بە باسکو بەلەکی خۆی دادەهێنا گارەی مووی دەهـات و دایدەڕنی، ئامادەیە، لەژێر کورتانی هێسـترەکەی شـاردۆتەوە، هەر بەپەلە تەورداسی دەسـتدایە بەرەو دەراوی ژنان کەوتەڕێ، هەر دەڵێی دەفڕێ! هێـز و ڕقی تۆڵە باڵی پێ گرتووە. هێندەی حەز لە بێدەنگیو تاریکیی شـەوە دەڵێی بە تاریکەشەوێ لەدایک بووە، !

گوێی لە قیرەی بۆقەکانی دەو ڕووبارییە، ئەوە نیشـانەی ئەوەیە گەیشتووەتە شـوێنی خۆی. ئێرە دەراوی ژنانە، دەراوی داگیرکراو، جێی کۆر و حەسـاری ژنانی گوندی. دایکی، چەندینجار لێرە سەری شووشتووەو جلەکانی بۆ لە ئاوێ وەرداوەو پـاک کردۆتەوە، بە چاوی خۆی شـەرەئاوی کچ و ژنانی ئاوایی لێـرە دیووە. ئێرە دەراوەکەیە، نەمامەکانی ئاغای، وەک سەربازی بە دیسپلین لە بەردەمی فەرماندە وەک بت بێ جووڵە ڕاوەسـتاون. کات لە بەرژەوەندیدا نییە دەبێ دەستبەکاربێت. لەگەڵ نەمامەکان دەدوێ: ڕقم لە ئێوە نییە، وەلـێ ئێوە لەسـەر دڵی ئێمەو لە سـەر سینگ و مەمکی ژنەکانمان چەقاون، دروسـت لەسەر دڵمان، وەک ملی خۆم ببڕمەوە، ددان ئەگەر ئازارت بدات ناچاری دەبێ دەریێنی!

بە تەورداسەکەی دەستی شێتانە کەوتە وێزەی نەمامەکان، هەرجارەی دوو ڕێزی لەسـەر زەوی تەخت دەکرد، لەگەڵ وەشـاندنی هەر تەورداسێک، وەک بەندی دڵی ئاغای ببڕێ! هێندەی نەبرد نەمامی بەپێوە نەهێشـتو هەمووی تەخـت کرد. بەپەلە گەڕایەوە. تەورداسـەکەی، لەو سـەوزاییەی دارەکان کە

پێوەی نووسابوو، شووشـــتەوە. وەک خەنجەر لە خوێنی کەسێک، بشواتەوەو ئاسەواری کوشتنێکی لـێ پاک بکاتەوە!

ئەوشـــەوە، بەڵێنـــی بەخۆیدا چیدی بە دیار شـــکۆی شـــکاوی جووتیارە هەژارەکانەوە دەستەوەســـتان دانەنیشێ. فرســـەت لە شەوە ئەنگوستەچاوەکان قەرز دەکات ئەســـتۆی کەچیان ڕاست بکاتەوە! ئیدی ناکرێ ئاوا بێدەنگ بین، ڕەفعـــەت هەرچی بیەوێ بە کەیفی خۆی بیـــکات: یەکەمجار جێ جۆخینانی داگیرکرد، شوێنی ئەو دۆمە وەســـتاکارانەبوو دەهاتنە گوندی، ئەوجارە دەراوی ژنان، لە دوای ئەوەش نازانم! پێڵاوەکانی لە نێو قشـــپل و سەرگیندانی شاردەوە، ئاخـــر هیچ پێڵاوێک لەبەرچـــاوی عەلی عەبدوڵڵای شـــوونهەڵگر ون نابێت! نەخشی بنی پێڵاوەکانی تۆماردەکرد. بە شێوەیەک، تەنانەت جۆری پێڵاوەکەو ژمارەکـــەی، وەک مۆری موختاری لەســـەر زەوی لە دوای بەجـــێ دەما، بۆیە پێڵاوەکانی شـــاردەوە. لەبەرخۆیەوە دەیگوت: تەنها بە گرتنم نەدەن بەسە، کە شـــەو داهات وا دەزانم هەموویان دۆخینیان لە تەنیشـــتییە[1]! بە دەنگێکی بـــەرز گوتی: هیدۆ ماینەکەم گرتەوە! بەڵام هیدۆ، بە ماینی دووپێ حاڵی بوو، گوتی دەستخۆش.

لەوکاتەی گەڕایەوە نێو مەولود خوێندنەوەکەی، مامۆســـتا مەلا ســـاڵح تازە بە تازە گەیشـــتبووە ئەو لاپەڕەی کە دەڵێ: «غولامێـــک هەبوو هەموو ڕۆژێک ئەسپەکەی تاودەدا، ئەســـپەکەی سەرکێش بوو بۆی نەگەڕایەوە ڕووی کردە پێشماڵی سوڵتانی. لەوکاتەی، کوڕی ســـوڵتانی لە بەردەرگای یاری دەکرد، ئەسپەکە

---

١. دەربڕین و دەرلینگی ژنان دێخونیان لەلای تەنیشتە. لێرەدا ئیدیۆمەکە ئاماژەیە بە کەمزانینی دوژمن یان کەسی بەرانبەر و تەشبهکردنیان بە ژن.

چەپۆکی لەسەری منداڵەکەداو سەروملو سینەی تێکشکاند، حەیاتی لەبەربڕی. لەلایەن پاسەوانەکانی سوڵتانی ئەو غولامە قۆڵبەست کرا بردیانە لای سوڵتانی، سوڵتان بەسەریدا نەڕاند: دەبێ تۆ لەسەرت بدرێ و ملت بپەڕێنن! غولامەکە لە دڵی خۆیدا بەڵێنی دا ئەگەر نەجاتی ببێت لەو بەلایەی، لەسەری نەزر بێت بخوێنێتەوە مەولودی سەیدوالبەشەر، خشتێک لە دیواری دەرپەڕی بەسەر دڵی سوڵتانی کەوت جێبەجێ حەیاتی لەبەر بڕی!» غرمەو هاڕەی سەڵاواتان گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد. کاکەڕەش دەنگی لە هەمووان بەرزتر کردبوو، مەلا کەلێنێکی بۆ پشوودان کردەوە، کاکەڕەش شەکراوی بەسەر ئامادەبوواندا گێڕا، هەبوو نەیدەخواردەوە شووشەیەکی بچووکی لە گیرفانی دەردێناو شەکراوەکەی بۆ ماڵێ دەبردەوە بە تایبەتی ئەوانەی نەخۆشیان هەبوو، لە جامێکی گەورەی پڕ لە ئاوی دەکردو هەموو خێزانەکەی دەیانخواردەوە، دەرخواردی گۆلکە نەخۆشیشیان دەدا! هیدۆ کە بینی کاکەڕەش گەڕاوەتەوە، خۆی لێ نزیک کردەوە: وەرە بزانم چەند ماچت کرد؟ ئەوچی دەگوت؟ ئەتۆ چیت پێ گوت؟ چیت بە دیاری بۆ بردبوو؟ ئەو چی دا بە تۆ؟ کاکەڕەش گوتی: هیدۆ ئەتو دایم فکرت لەسەر کچانە با سبەی ڕۆژویان گەرم بن، خەڵک بچنە دەراوی ژنان، ئەوکات دەزانی لە چ ژوانێکی بووم! هیدۆ تێگەیشت کارێکی مەردانەی لە بەرانبەر داگیرکاری ئاغای ئەنجامداوە، گوتی: ئەگەر وابێت ئەوشەو ئەتۆ لە ئاغایەتیت تێپەڕکردووە. لێرە بەدوا بە (پاشای شەو) بانگت دەکەم!

ئەو بەداملیو شەکراوەی بەردەمی مامۆستا کە لە ئێوارێوە ئەو هەموو مەولودو سەڵاواتەی بەسەردا قلپ کراوەتەوە، هەر لە زیادی مامۆستا دوو سێ ئایەتلکورسیشی بەسەردا شۆڕکردەوەو چەند فووێکی بەسەردا پرژاند، سوندی

خوارد: بەو قورعانەی لەسەر ڕانم داناوە، هەرکەسێک لەو بەداملیو شەکراوەی بخواتەوە، مەگەر دەردی ئەجەلیی بێت، دەنا جێبەجێ چاک دەبێتەوەو دەلعازی بەسەر پێ دەکەوێتەوە، بەو ئایەتەلکورسیانە و فووکردنەی، هەرچی جندۆکەو لەمەچێتر[1] و شەیتان هەیە لێی دەپرینگێنەوەو هەڵدێن، هەر سەڵەواتێک لە دیداری موحەممەدەلمستەفای هەزارو یەک گوناهت لەسەر ڕەش دەکاتەوە، هەر قومێک لەو شەکراوەی، هەفتا هەزار نەخۆشی دەپەڕێنێ، نە شەیتانو نە جندۆکەو لەمەچێتر، زەفەرت پێ نابەنو لە خشتەت نابەن، دەست بۆ خۆڵی بەری دەبێتە زێڕ، بەرەکەت دەڕژێتە نێو ڕزق و ماڵ و منداڵت!

بەیانی، هەر زوو حاجیژنی خێزانی حاجی سمایلی، لە بووکەکانی کردە دەنگ: گەسکەکی لەو نێو ماڵ و حەوشەو حەسارەی بدەن، ڕاگەڕاوە لەگەڵ قونکە جغارەی، دەڵێی هەوێزە! چما شەوێ ڕابردوو ئەو هەموو جغارەیان کێشاوە! دەی ئەتۆ مافورە سەرەنازو ڕایەخە لبادەکان لوولدەو دایانوەشێنە! گۆتیە نەوەکانی: لەگەڵ گوڕێ، ئەو هیربارو قاپ و قاچاغانە بە ساحێب بکەنەوەو بزانن هی کێن بۆیان ببەنەوەو پێیان بڵێن ماڵتان ئاوەدان بێت، خوا لە جیرانەتیتان کەم نەکاتو لەگەر دەستی خۆش هەندێک بەداملی و شەکراویان لۆ بەرن.

سفتاحی ئەو سبەینەیە، دوو خەبەر بوون: یەکیان زۆر خۆشە، وەک لەسبێحی نەرجیل، جووتیارەکانی ئاوایی یەک لە یەکی وەردەگرێو ئەو دەست ئەو دەستی پێدەکەن، ئەوی دیکەیان ناخۆشە.

---

١. لەمەچێتر: لە ئێمە چاتر، لە ئێمە باشتر و گەورەتر. مەبەست لە بونەوەری دەرەوەی ژیانی مرۆڤە، کە خەڵکی ئەو ڕۆژگارە، نەیانزانیووە چ ناوێیان لێبنێن و پێیانگوتون لەمەچێتر و، لە خۆیان بە زاناتر و چێتر زانیوون.

یەک بە کەسێکی دیکە دەڵێ تەماشای بەردەرکی قەمتەرەو قۆنگرەو قەراتو دیوەخانی ماڵی ئاغای بکە، هەر فڕکان فڕکانەو خۆ بە یەکتریدا دەدەن، خزمەتکار مشەوەشن، نۆبەتدار هەر بابایە خەریتەی تفەنگی نیوە لە ژوورێو نیوەی لە دەرێ، ئاوەزێنە و قایشی سەرملی دادێخی. وسووی سەرکار، بۆرەی خارخاری لەسەر بیستو چوار بزماری[1] لە تەویلەی ڕاکێشا دەرێ، ئەها ئەسپەکەی زینو لغاو کرد. ڕەفعەت ئاغا پێی لە ڕکێفێ نا کەوتە سەرخانەی زینی، شەشاگری[2] لەبەر پشتێنی ناو قەرەبینای[3] بە قەرپووزی زینی وەکردییەو تفەنگچییەکان بەدوای کەوتن. دیارە بە قسەی خەڵکی باوەڕ ناکات باخەکەی هەڵبڕاوە، بەخۆی دەچێتە تەماشای. خزمەتکارو دەستوپێوەندو کۆیلەو گۆردەو چەلاوخۆری لەدوا دەڕۆن بە پیادە، وەک تاژیو توولان بباتە ڕاوێ. خزمەتکار هەر چواردەوریان گرتییە. سوێندی بە وەجاغی ڕەشاد ئاغای باپیرە گەورەی خوارد: بە گۆڕی ڕەشاد ئاغای گەورە، هەرکەسێک ئەو ئەتکەی بە من کردبێت، لە ژنان کەمتر بم ئەگەر کیرمیزیان[4] لێ نەبڕم!

حەسەنەکووڕ هاتە نێو قسان: خزمینە ئەدی بۆ دەڵێن پیاو نەماون! پیاو لەوەی ڕەشیدتر جورئەتی ئەوە بکەی باخی ڕەفعەت ئاغای هەڵبڕی، ئای بەخۆ

---

١. لەسەر بیست و چوار بزماری: ئەسپێک کە هەرچوار ناڵەکەی بە بیست و چوار بزمار، هەر ناڵە و شەش بزمار، داکوتراوە.

٢. شەشاگر: شەشئاگر، شەشئاورە، جۆرێک دەمانچە بووە کە شەش فیشەکی خواردووە.

٣. قەرەبینا: جۆرێک دەمانچە بووە کە لوولەکەی نەختێک درێژ بووە.

٤. کیرمیز: ئەوەی کە بە کیر میز دەکات، نێرەوەز.

و بە ماڵ و منداڵەوە بە قوربانی دەستەکانی بم، ئای لە بابی منت کەوی کوڕی شـەویّ![١] لەبەر ئەو بابەی مرم ئەو بەرخبەرانەی لـێ بووە، سەری هەموو کرمانجی ئەو گوندانەی بەرزکردەوە، ئەوجا با ئاغا پیاوبێو بیکاتەوە باخ! دەبێ نـەو پیاوە مەردە کێ بێت؟! کوڕە بابم ئەگـەر فیل هەبی کەرگەدەنیش هەیە! بەخوای ڕاسـتە ئەگەر دەڵێن مست لە درێشەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر ساڵی پار نەمانهێشتبا جێ جۆخینان بکاتە قەرسیل، ئێستا دەراوی ژنانی نەدەکردە باخ، دەبا کرمانجیش زەلامەکی بەوەجی شەوانیان لـێ هەڵبکەوی خۆ دنیا خرا نابی!

ئاغا کە چاوی بە باخەکەی کەوت نەمامەکان لارو پار بوون، لە بری شکانی هەر نەمامێک شکانی کەرامەتو غرووری ئاغایانەی خۆی دەبینی، نێوچاوانی دوو ئەنگوستی لـێ ماوەتەوە، دەڵێی شـەیتان بەنێوچاوانیدا هەڵمیستووە! خوێـن لە چاوەکانی دەباری، وەکو گای خـوودارى، هەرچی بۆی ڕاگری دەیداتە بەرقۆچان. ڕەفعەت، پیاوی بەڕێکرد بۆ شاری خەبەری بداتە پۆلیسی و پەڕاوی لێکۆڵینەوە بکاتەوەو چەند جووتیارێکی ناوچەکە، لەوانەی لە گوێ و حەمدی ئاغایدا نینو ئاغا بە سەرکێشو پیاوی خراپیان دەزانی، بەگرت بدا، لە سەرووی هەموویانەوە کاکـەڕەش. ئەوەبـوو دوو ڕۆژ دوای مەولوودەکە پۆلیس هاتنە گوندی و ڕاپێچی زیندانیان کرد.



---

١. لە بابی منت کەوی: دەرد و بەڵات لە بابی من بکەوی.

# ٩

هەواڵی دووەم کە هەموو خەڵک پێی تەزی، شەو تەواوێک ڕاکشابوو، مام حەمەدەمیــن لەگەڵ فەرهادی کوڕی لە مەولوودەکەی ماڵی حاجی ســمایلی گەڕانــەوە، بۆ ئەوەی کەســیان بە ئــاگا نەهێنن، زوو خۆیــان خزاندە نێو جێو بالینگانی خۆیان، خێزان هەموو لە شیرینخەوێدا بوون.

خێزانــی مــام حەمەدەمین هێشــتا لەنێــو جێگایە. ئای ئەوشــەو ئەو هەمــوو خەونە پچڕ پچڕە چی بوو، خوایە بەخێری بگێڕی، قەتم حەمەدەمین ئــاوا نەبینیــوە لەو خەونــەی وەک ورچێکی برینــدار جینگڵــی دەدا، بەرە ئەســتورکەکی[١] تەندورێم خێربێت خودا بەخێــری بگێڕێت! وەک هەموو بەیانییەک لە خەوێ هەســتا، کتری ڕەشی وەســەر ئاگردانی نا: هەتا تێرخەو نەبن بانگی کەسیان ناکەم، با بە کەیفی خۆیان لە خەوێ هەستن.

چێشتەنگاوە، خۆر بە تاقی ئاســمانێوە، هەردووک لەپی دەستی داونەتە بەرچەناگەی، لە ڕووخانی پەناگەیــەک خێس بۆتەوە، داڵدەدراو و پەنابەرێک چۆن نانی دەخواو ناندێنێ دەدرێ! چۆن هەردوو مەمکی دایکی خۆی دەبڕێتەوەو

١. بەرە ئەستوورکەکی تەندووریێ: ئەو چەند کولێرانەی کە بە یەک کەڕەت بەتەندورەوە دەدرێن.

نمەکحەرامی دەکات!

خۆر سەنەگەی ســەرنجەکانی لەسەر ماڵی مام حەمەدەمینی هەڵناگرێ. لەو بەیانیەی، خەرمانی وەفا گڕی تێبەردرا، دابونەریتە پیرۆزەکان ئەتک کران، هەواو هەوەس و ئارەزووی ناکەسبەچەیەک کەرامەتی مرۆڤە ڕاستەقینەکانی قــرچو بڕ کرد، کانیــی پاکیو بەرائەتــی گڵاو کرد. بانگی ئەســمەرێ کچی دەکات: ئەیەڕۆ ئەو سەربەهەشــە دەڵێی مردووە، هەســتی لێنایە! دەســتی بــۆ درێژ کــرد، ڕایدەژەنێ: ئەســمەر! ئەســمەر کچم هەســتە! ڕۆژ لە تاقی ئاســمانێیە، چام وە ســەرناوە! نەخێر، ڕۆحی تێدا نیە! چمکی لێفە ئەتڵەسە ســوورەکەی هەڵدایەوە، چی بینی؟ دوو بالیفی گەورە لەســەر جێی ئەسمەرێ جێماوە، دایک حەپەســاو لاڵ بوو، یەکســەر زانی کار لــە کارێ ترازاوە. ئەوە کاری لە مێژینەی بــە دوکەوتووەکانە بۆ فریودانی ماڵەباوانیان. غاردە بۆ جێ خەوتنی مەمۆ و ژنەکەی، بۆ ئەوەی ســۆراغی ئەسمەرێ لەوان بکات. جێ و بالینگان خاڵــی! تفەنگی برنۆ بە دیواری هەڵپەســێردراوە، دوو خەریتەی پڕ فیشــەک، لە بن بالیفێ جێ ماوە، ئەوکاتــە زانی کەر لە کوێ کەوتیەو کوندە لــە کوێ دڕاوە! بەبێدەنگی لەخۆی دەداو شــینێکی بێدەنــگ دەگێڕێ: بە چ زمانێکــی ئەو خەبەرە ئابڕووبەرەیەی بە حەمەدەمیــنو فەرهادی کوڕم بڵێم؟ لــە دوای چەندجار کەوتنو هەســتانەوەو ڕوو داڕنین، بەجۆرێک گرمۆڵە بووە، کراسەکەی بۆ گەورەیەو دامێنی لەدوای دەخشێ، کووڕ کووڕ بۆتەوە، دامێنی کراسەکەی لە قاچو قولی دەهاڵێو ساتمە دەکاو ڕووەو ڕوو بەردەبێتەوەو بەپەلە هەڵدەســتێتەوە، بەجۆرێک کراســەکەی دەکەوێتەوە بن پێی وەک گلۆرە موو خلۆردەبێتەوە، ئەیەڕۆ ئەو حەیاو نامووســەی چەند ســاڵە خڕمان کردەوە، ئەو

کچەتیوە سەر بەهەشە هەمووی دۆڕاند. ئاخر، پێش هەموو کەس دایک تاوانبار دەکرێ بەوەی کە چۆن ئاگات لە هەڵسوکەوتی کچەکەی خۆت نەبووە، دوو سێ کۆرەمستی زڕدایکانەی لە سینگو بەرۆکی خۆی دا، ڕمبەی دەهات. نازانم چۆن دەستی نەچووە ناو سینەی، ئەو سینگکوتانە بۆ ئەوەیە بە جارەکی جەرگو هەناوی خۆی بەدەستی خۆی خەرا بکات، ئای ئەو شیرەی مەمکمت لێ حەرام بێ وەکی گۆشتی سەی، چۆن دڵت هاتو ویژدانت قەبوڵی کرد سەری باب و برات شۆڕ بکەی؟! لەگەڵ چریکەو قیژەی پەردەی بێدەنگیی ئەو سبەینەیەی دادڕی. ئەو قسەیەی قەت بیری لێ نەکردۆتەوە بیستی: حەمەدەمین! حەمەدەمین! هەستە کەلاکمان داوە! کیژت بە دوکەوتیەو مەمۆ و ژنەکەشی ڕایانکردیە. مام حەمەدەمین لەناو جێگا هەڵناستێ، بە ئومێدی ئەوەی خەون بێت، زۆری حەز دەکرد کوژرانی فەرهادی کوڕە تاقانەکەی ببیستێ بەڵام ئەو هەواڵە کەرامەتشکێنە نا، نەخێر کار لەکار ترازا ئەو ئومێدی خەونە هەڵپرووکا دووجارو سێ جار ئەو قیژەو هاوارە لەناو جێگای دەرپەڕاند، بەپێ خواسی و سەرکۆتی غارە بۆ جێگای نووستنی مەمۆی، ئەوەی نەدەبوو بیبینێ بینی؟ جێگای خەوتن خاڵی تفەنگو خەریتە جێ ماوە، خەنجەرت لێ دابایە دڵۆپە خوێنێکی لێ نەدەهات! بەچکەگورگم بەخێوکرد، باپیرانمان دەیانگوت ناکەسان مەکەن بە کەس کوڕاوان مەکەن بە باخ! ئای لەو کارە ئابڕووبەرە، ئای چ هەرەسێکی ویژدانی و داشۆرانی ئاکارو غیرەتی کوردانەیە! ئاخر خۆم لەسەر تۆ کردە دوژمندار، نامەردی و نمەکحەرامی وا، لێرە قەت ڕووی نەداوە، گەردوون بە دژی خواستەکانی من سووڕاو هەڵیتەکاندم، ناشزانم بە کوێمدا دەداو چ پەندێکم بەسەردێنێ! بەڵام هەرچی بەسەرم بێت لەو ڕیسواییە بە

نازارتر نابێت! ئای نامەرد، ئەدی نەتگوت ئەســمەر خوشکمە! بەشم لە هەر چوار مەزەبی خوای براببێت بە کوژرانی کوڕە تاقانەکەم فەرهاد دێمەبەرێ، بەڵام بەو کڵاوخواربوونەو شان داچۆڕانەی نایەمەبەرێ. بارتەقای خواردنەوەی ژەهری هەلاهل بە ئازارە. گاشــە بەردی گەورە گەورەم هاتوونەتە سەر ڕێ نەدیتە لێیان هەڵەنگوتوم و سەرانگرێ بووم، کەوتوومەتە کەندو زەندۆڵ و ئاودڕان، بەهێزتر لە جاران خۆم تەکاندووەو هەستاومەتەوە، بەڵام قەت بە شێوەی ئەو خەرەندەی، هەپروون بــە هەپروونی نەکردووم! داخی دڵم داخێکــی زۆر گەورەتری هاتۆتە ســەر، داخ وەکو کێــو! ئاخر ئەگەر کلۆڵیو بەدبەختی مــن نەبێ کێ گورگی نــاوای لە کۆزی بەرخی خۆی دەکات! دەک ڕووت ڕەش بێت، خۆ ئەمن حەقی بابو فەرزەندیم بەسەرتەوە هەبوو، ئەی ئەسمەرت وەک خوشک قەبوڵ نەکرد!

فەرهاد حەپەســاوە، لێــوی خۆی دەکــرۆژێو ســمێڵی داو داو دەردێنێ. ناســۆرێکم لەدڵدایە ژانی داوەتە ئێســکانم، هەموو وجــودی داگرتووم هیچ لوقمانێــک چارم ناکات، مەگەر لوولەی ئەو دەمانچــەی! ئەو مووە لە پیاوان نەهاتبێ ئەگەر نەتکەمە دەرسێک نەوە بۆ نەوەی بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی کەسی دی زاتــی ئەو جۆرە نمەکحەرامیو ناپاکییەی نەکات. کوڕم فەرهاد گوێ بدێ، لە گەرمەی هەندێک پێشهاتدا ئەقڵ حوکم ناکا، دڵ پاڵت پێوەدەنێ ئیشی بێ جێ بکەین، پیاو ناشــبێ پووشــکەی لە عەرزی وەربداتو داڵغان لێبدا، ئەو ئابڕووچونە بە دۆشــدامان ناشۆردرێتەوە، هیممەتی پیاوانەی دەوێ: «بڕووشی مێردان بە نۆر دەکورێ[١]».

---

١. بڕووشی مێردان بە نۆر دەکورێ: بڕوێشی پیاوان بە نۆرە دەکولێت. کینایەیە بە ئارامگرتنی پیاوی ئازاو تۆڵەستێن.

لەو کارەساتەیدا، هەتا کەمتر قسە بکەین‌و هەڕەشە بکەین، بە قازانجی ئابڕوومانە. هەراسانم و بیربڵاوم، بەو کۆڵە قورسەیەوە، بەس مەگەر موجازانی دەستی سپی موسای لەو گێژی ئابڕووچونە دەرمبێنێ، لەبەرئەوەی نا کچی منی هەڵگرتووە! لەبەرئەوەی داب و ئاکاری بابو باپیرانی وە بنپێی ناوە. شەرتبێ نەیەڵم ئەوەی بۆ مەیسەر بێت، دەبێ خەڵکی دیکەشی پێوە تەمبێکەم!، ئاخر چیم بۆ نەکردی مەمۆ!؟

بەڵێن بێت لەگەڵ ژنی خۆمان نەخەوین‌و ڕوو لەو ماڵەی خۆمان نەکەینەوە، تاوەکو ئەو پەڵەیەی لەنێوچاوانمان نەشۆینەوەو خەڵک و خزمان لە خۆمان ڕازی نەکەین! دەی زووبن، فینگەفینگی ناوێ، خێراکەن نوێن‌و پێخەوی دوو کرێکارمان بۆ دانێن، کتری چای‌و هیربارو تاخمەتراش‌و بڕێک جلوبەرگی زیادیمان بۆ بپێچنەوە، هەتاوەکو خەڵکمان بەسەردا وەرنەبوون، بەرگەی تەماشاکردنی کەس ناگرم!

دوو دەمانچە چواردەخۆرەکەی لەنێو بوخچەی جلان شاردەوە: یەکەم شت با بچینە هەولێرێ، وردە وردە کنەی لێدەکەین‌و شوێن پێیان هەڵدەگرین، ببنە تەیریش دەیانهێنینەوە خوارێ.

مام حەمەدەمین جەمەدانیەکەی دەمامک دا، فەرهاد پرسی: بابە ئەوە بۆچی جەمەدانیت دەمامک داوە؟ کوڕم ئەدی ئەوەی خەمێکی هەبێت یان مردووی لێ مردبێت یان دووچاری ئابڕووچوونێکی وەک ئەوەی ئێمە بووبێت، تیلاکی خوار ناکا؟ جەمەدانی ناهێنێتە سەر نێوچاوانی؟ ڕۆڵە نازانی لۆمەی عەبدان لە عەزابی قەبری گرانترە.

بە گوێرەی ئەوەی تفەنگەکەی نەبردووە، چۆتە شاران. زۆرجار وڕێنەی

موسڵی دەکرد. ئەرێ بابە موسڵ لە کوێی (کەرەکی یاسین ئاغا)یە؟ لە زێیی دەپەڕییەوە؟ کوڕم لە گۆگجەلیش تێپەڕ دەبی ئەوجا دەگەیە موسڵێ. بابە خۆ عارەبی نازانین چۆن قسان لەگەڵ خەڵکی موسڵێ بکەین؟ کوڕم خەڵکی موسڵێ لە سێ بەشان دوو بەشی کوردن، زیاتریش، بە بادینی قسان دەکەن، بێجگە لە ئەرمەنییان.

دوای دوو ڕۆژ مانەوە لە هەولێرێ هەر زوو هەواڵی ئەوەیان پێ گەیی ڕایانکردووە بۆ موسڵێ. مەمۆیان لە زیارەتی نەبی یونس دیووە دوو ژنی لەگەڵ بووە، یەکیان ئەو ژنەیە کە لە گوندەکەی خۆیان هەڵیگرتبوو، ژنەکەی دیکە ئەسمەری مام حەمەدەمینیە. بەو خەبەرەی، فەرهاد ددانی بەچیرەوە دەبردو لێوی خۆی دەکرۆشت، لە دڵی خۆی دەیگوت: خۆزگە لەوێ دەبووم ئەوجا دەتانبینی چۆن دەیاندەمە بەر گوللانو هەرسێکیان پەلاواژ دەکەمەوەو ڕوحیان لەسەر خوای دەکەمەوە، زۆرم مەراقە بەرەوڕوو بەرلەوەی وەبەر دەمانچانی بدەم بە مەمۆی بڵێم بۆ ئەو ناپاکییەت لەگەڵ کردین؟ ئەو کولک و کوانە بەژانەم لەسەر دڵی خۆم لادەبرد، ئەوجا خەڵک لە مەجریسان چۆن باسی ئازایەتیمان دەکەنو دێینەوە ڕیزی پیاوان!

لە دوای دوو ڕۆژ مانەوە لە موسڵ لە ئوتێلی بابلتۆپ، ژوورێک لە گەڕەکێکی هەژارنشین بەکرێ دەگرن کە گوایە کرێکارن بۆ کاسبی هاتوونەتە موسڵێ. هەفتەی چوار ڕۆژ کاری کرێکاری دەکەنو سێ ڕۆژەکەی باقی، هەریەکەیان لە گەڕەکێکی، کووچە بە کووچە بە سۆراغی مەمۆیدا دەگەڕێن. لە سێ مانگ نزیک بۆتەوە، ڕۆژی هەینییە، دەڵاڵخانەی موسڵێ زۆر جەنجاڵ و تێک قژقژانێکە باب کوڕی خۆی لێ ون دەکات، ئەو بازاڕە سەری هارو ماری تێدایە، دەڵاڵەکان

هەریەکەو شتێکی هەراج دەکەن، غەوغایەکە سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە. یەک هەتا دەنگی تێدایە هاوار دەکات: ئەوەڵ مەزاد! دوو دەستە جلی عارەبی بە چەفیەو عەگالەوە دەکڕن بۆ ئەوەی کەس نەیانناسێتەوە، دوو چاویلکەی ڕەش، ئاخر بنیادەم بە گلێنەی چاوی دەناسرێتەوە. سێ مانگی ڕەبەقە دوور لە ماڵ و منداڵ و قەومو قیلە، یەک لەو سێ ڕۆژانەی بۆ شوێنپێ هەڵگرتنو سۆراغی مەمۆی هەریەکەیان بە کۆڵانی گەڕەکێکدا دەگەڕێن، فەرهاد جلوبەرگی عارەبی لەبەرەو عەینەکێکی رەشی لە چاوییە، دایکی خۆیشی نایناسێتەوە. لە بابلتۆپ لەناو ئاپۆرای خەڵکو جەنجاڵی کڕیارو فرۆشیارەکان ئەو دیمەنەی دەیان شەو لە زەینی خۆی دایڕشتبوو، وەک نەشتەر لە گلێنەو ئاوێنەی هەردووک چاوەکانی چەقی، ئا هەوە خۆیەتی نە خەونەو نە چاوم ڕەشکەو پێشکەی دەکات، با بزانم چی دەکاتو بۆ کوێ دەچێت؟ فەرهاد خۆی لە پەنای پیکەبە پیازێکی دەگرێ، مەمۆ لە هەڵبژاردنی یەک بە یەکی تەماتەکان سەرنجی چڕکردۆتەوە، فەرهادیش لە دەستنیشانکردنی ئەو شوێنەی جەستەی مەمۆی، بۆ ئەوەی یەدەگە دەمانچە چواردەخۆرەکەی لێ خاڵی بکاتەوە، کە سەر دڵیەتیو کەللەی سەریەتی، دەبێ زۆر بە وریایی شوێنپێی هەڵگرم، بە هیچ شێوەیەک نابێت وا بکەم بمبینێ و ڕیسەکەم لێ ببێتەوە خوری! ئای نمەکحەرام! ئای حەرامزادە؟ چۆن غیرەت و ویژدانت قەبووڵی کرد ئەو کانییەی ئاوت لێ خواردەوە بەردی تێ باوێی؟! ئاخر چەندان شەو شەڕە تفەنگم لەسەر کردی، دوژمنم بۆ خۆم دروستکرد، چۆن دڵت هات ئێمە سەرشۆڕی نێو خەڵکی بکەی؟ دەبێ باجی ئەو ناپاکیەت بدەیتەوە!

مەمۆ بە کیسەیەک تەماتەوە بەرەو مەنزڵ گەڕایەوە. جار نا جارێک گورگەئاوڕێکی دەداتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ کەسی بەدواوەیە یان نا، فەرهادیش

لـــە جلوبەرگی وەلەکەعارەبێک[1] بەدوایەوە، دوورو نزیک نایەوێ ونی بکاتو ناشیەوێ هێندەی لـــێ نزیک بێتەوە گومانی چاودێریکردنی بکەوێتە سەر، ئا نەوەتا مادام ســواری پەیتوونی ئەسپانی[2] ناو شاری نەبوو واتە شوکور ماڵی نزیکە. لە سەری هەموو کۆڵانێک ئاوڕ بە دوای خۆیدا دەداتەوە، بەڵام هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە ئەو وەلەکەعارەبە کێیە بە دوایەوەیە.

چەنــد کۆڵانێکی تەنگی تێپەڕکرد فەرهادیشـــی بەدواوەیە، لەو دەرگا دوو دەرییـــە دارە کۆنە تێپەڕ بوو، چەند هەنگاوێک لە ماڵی خۆی ڕەتبوو، لە ناکاو گەڕایەوە بەرەو دەرگا دارینەکەو بەپەلە خۆی بە ژوورێدا کردو دەرگای داخست، بەرلەوەی ســەرنجی بکەوێتە سەر فەرهادی، فەرهادیش بە هەمان شێوەی ئەو بە گورجی خۆی بەو دووکانە بچووکەی گەڕەکەکەدا کرد، خاوەنەکەی پیرەژنێکی کوێر بوو، ســڵاوی لە پیرەژنەکە کرد، پیرەژنەکە بە کوردی بادینی بەخێرهاتنی کرد. ئاخر لە ســێ بەشان دوو بەشی خەڵکی موسڵێ کوردی زێباریو هەرکیو ســوورچیو گۆرانو شــکاک و نێروەییو بەرۆژکیو ڕێکانیو چەند هۆزێکی دیکەی کوردن. پیرەژنەکە لە فەرهادی پرسی ئەو کوردییە چۆن فێربووی؟ گوتی: گامێشمان هەیە لە هەولێرێن. بایی دوو عانەی ڕەحەتە لوقم لـێ کڕی، لەگەڵ پێدانی پارەی لوقمەکان پرسی: ئەرێ خانووی کرێی لەو کۆڵانەی دەستناکەوێو پێت شک نایە ژوورێک هەبێت بۆ کرێ؟ هەر ئەوەندەی لـــێ حاڵی بوو گوتی: لەبەر خەڵکی گوندان خانووی کرێ دەســت ناکــەوێ. فەرهاد گوتی: ئێمەش

---

١. وەلەکەعارەب: عەرەب وشەی (ولک — وەلەک) واتا کوڕە! زۆر بەکاردەهێنێ. لێرەدا واتای کوڕەعارەب.

٢. پەیتوونی ئەسپ: گالیسکە، عەرەبانە، کە بە دوو ئەسپ ڕادەکێشرێ.

بۆ کرێــکاری هاتووین، گامێشــمان نەماوە هەمووی مرداربوونــەوە. پیرەژنە یەکچاوەکــە گوتی: ئەوەتا ئەو ماڵــەی بەرامبەرمان پیاوێکە دوو ژنی جوان و جحێڵی هەیە، ئەو خانووەی کە زۆر بچووکیشە بە دوازدە درهەم گرتییە، نازانم ئەو کرێیــە زۆرەی بە چی دەدات! بە خۆی ڕۆژێ هەتا ئێــوارێ بەدوای ژناندا دەســووڕێتەوە، ئەو دوو ژنە جوانەش دەنێرێتە ماڵــی دەوڵەمەندو پیاوەکانی حکومەت و ماڵە ئەفسەرە باڵاکانی سوپای، خزمەتکاری بەو دوو ژنەی دەکات، پیاوێکی گەلەک کرێتە، ســووکە، خودێ هەقێ وی کوشتنە! ئەو ژنانە وەک خۆی سووک دەکات.

فەرهاد، وەک چۆلەکە پاســاری خەریکە باڵدەگرێ بە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا پێچ دەکاتەوە بەرەو ماڵ. ئەوەی چەند مانگێکە بەدوایدا وێڵەو نێو ماڵ و منداڵی خۆی بۆ حەرام کردووە. لە کۆتایی، بەدەستی کەوت، بەدەستی پڕ دەگەڕێتەوە لای مام حەمەدەمینی بابی.

ئێوارەیەکی درەنگەو خۆر، هەر دوو باڵی ماوە ئاوابێ، دوایین تیشکی دیداری تەنها لە قەدی باڵەخانە بەرزەکانی شار گیرکردووە، بەڵام کات لەسەر هیچکەس ڕاناوەســتێ، ســێبەرەکان درێژو درێژتر دەبنەوە، خۆر دوانیگای نارنجی لێکنا، فەرهاد گەیشتەوە ماڵ، وەلــێ باوکی هێشتا نەگەڕاوەتەوە. لەسەر گازەرەی پشتێ درێژبوو، چاوی بڕیوەتە کاریتەی بنمیچی ژوورەکە، لە بیری ئەوەدا بەیانی چۆن یەدەگە دەمانچەکەی خاڵی دەکاتەوە، چــۆن دەبێتە یەکەم هەواڵی گوندەکانی دەشــتی دزەییایەتی. دەنگی دەرگا، زنجیرەی خەیاڵ و پێشبینییەکانی پچڕاند، فەرهاد یەکپێ لەبەر باوکی هەلستاو ماندوو نەبوونی لێکرد، باوکی گوتی: زۆر ماندووم، بەو درەنگە لە پێش مزگەوتی بابلتۆپ یەکێک لە پێشــمەوە دەڕواو

منیش بەدوایەوە، هەزار ســوێندو کەلامولَلات خواردبایە مەمۆیە، سوێندت لێنەدەکەوت، دوو ســەدە هێســتر بە توندی پێم هەلَێنا بۆ ئەوەی دەموچاوی ببینم، گەیشــتمە قەرەبەقەرەی، تیلەی چاوێکی دامــێ، حەیفێ ئەو نەبوو. ئەوەی گوتو ڕاکشا: ئای ماندووم! فەرهاد گوتی: بابە مەمۆم دیتەوە! هەر بە بیســتنی ئەو دوو قسەیە وەک پالَەوان قیتبۆوە، دەرفەتی هیچ قسەی دیکەی بۆ فەرهادی نەهێشــتەوە. گوتی چ، چ، چ، چ ئەوە چی دەلَێی؟ بەڕاستتە ئەی مالَەکەی لە کوێیە؟ ئەو دێلَەقەحپانەی لەگەلَن؟ چی لەبەربوو؟ یەک ڕێژنە پرسیاری کرد بێ ئەوەی لەسەر وەلامەکانی بوەستێت.

بەلَێ مالَەکەیشــم دیتەوەو هەردوو ژنەکانیشی لەگەلَن، نازانم کاری چیان پێ دەکات، دوکاندارەکەی بەرامبەریان لە باســکردنی مەمۆی هەر دەڕشایەوە! ئۆف ئۆف بەڕاستی خەبەرێکی خۆشت بۆ هێناومەوە، لەدوای ئەو سێ مانگە دووری لە مالَ و مندالَ، لە کۆتاییدا بینیمانەوە، هەتاوەکو لەو شــوێنەی باری نەکردووە دەستی خۆمانی لــێ بوەشــێنین، دلَنیای ئەتۆی نەدیو نەیناسی؟ نەخێــر هیچ گومانێکی لــێ نەکردم. نابێت ئیشــی بــە قووندڕایی بکەین، سبەینێ دەبێ کارەکی وا بکەین دەستەکی ئاوایان لــێ بوەشێنین، ببینە جێی ڕەزایەتی خزمو کەسوکارو خەلَکی گوندی، باب بۆ نەوەی بگێڕێتەوە، ئای چەندم زگ هەلَگوشــی ئەو سێ مانگەی، ئەو کەلوپەلانە کۆکەینەوە، کرێی خانوەکە بدەین، ئیشــمان بەس بە جلوبەرگە عارەبیەکانو دەمانچەکانمانەو هیچی دی. فەرهاد گوتی: بابە دەبێت بەری ئێوارێ کارەکەمان ئەنجام بدەین، دلَنیابین کە هەرسێکیان لە مالَەوەبن، نابێت لەسەر هیچیان باز بدەین.

ئەوشەوە خەو نەچووە چاویان، بیریان هەر لەوە دەکردەوە کوشتنی سێ کەس

ئاسان نییە، ئەگەر بەسەرکەوتوویی ئەنجامیاندا هەواڵەکە لەناو خەڵک و گوندەکەی خۆیانو دەوروبەریان چۆن بڵاودەبێتەوەو خەڵک چۆن باسیان دەکەنو دەستخۆشییان لێدەکەن لە زەتو خۆشی باسکردنی خەڵک هەموو لایەنەکانی دیکەی مرۆڤایەتییان لەبەرچاوان ڕەش کردبوون. لە هەریەکێکیان ڕادەمای، لەوی دیکە زیاتر خوێن بەری چاوی گرتبوو، خوێن و تووڕەیی‌و ڕق، سیمای لێڵ کردبوون، نەریتی ژەنگگرتووی کۆمەڵگا وەک خۆرە بەربووە گیانیان، هەموو حەژمەتو حەسرەتیان ئەوەبوو بچنەوە ڕێزی پیاوان، شەپۆلەکانی ئەو پاشخانە کۆمەڵایەتییە داتەپیووە، هەستاوەتە سەر پاشووان، هەرچی بێتە سەر ڕێگای و ڕێگربێت، لوولی دەدات. بە ڕۆژکردنی ئەوشەوە ئاسان نەبوو، هەریەکەیان ڕەنگە ئەتۆ بڵێ سەد جار، ئەمن دەڵێم هەزارجار، هەرسێکیان کوشتبن‌و زندوویان کردبنەوەو دیسان کوشتوویاننەوە، هێشتا فتراقیان دانەکەوتییەو گڕی تۆڵەیان دانامرکێتەوە. ئازارێک لە ناخەوە ڕۆحی دەکرۆشتن: چۆن دەبێت لاکەوتەو لانەوازێک بگریە خۆت، باڵی بەزەیی‌و ڕەحمەتی بەسەردا بکێشی، لە پاداشتی ئەو هەموو زەحمەتەش، خەنجەری ژەهراویت لەپشتڕا لێبدات، ئاخر ئەنگۆ لۆ خوای بڵێن ئەو کەسە لە کوشتن زیاتر دەبێ مستەهەقی چی بێت؟

درێژترین شەوی ژیانمانەو هەرچەندی جینگڵ دەدەین ئەمشەوە تەواونابێ‌و کازیوەی بەیانی نادات، کوڕم فەرهاد هەستە چایەکەی بەسەرنێ، ئەمنیش هەتا ئەو نانەواخانەی سەری کۆلانی دەچم، بەڵکو تەندووریان گەرم کردبێت بۆ ئەوەی چەند نانێکی گەرم بێنم.

ئای خوایە گیان شەومان گەلەک بە حاڵێکی خراپ بەڕێکرد، ئەوجارە نۆرەی ئەو ڕۆژە درێژەیە، ئاخۆ کەی دەبێتە ئێوارە؟! بەرلەوەی بەرگی غەزەب

لەبەربکەیــن وا چاکە پێخــەفــو کەلوپەلەکان بپێچینەوە و لە حەســارێیان دابنێین، پارەی کرێی خانووەکە بۆ ئەو پیرەپیاوە شەبەکە ببەین‌و پێی بڵێین بۆ بەیانی خانووەکەت چۆڵە.

ئێوارەیەو هیچ کارێکی نیوەچڵمان لەدوای خۆمان جێ نەهێشــتووە. ئێســتاکە چوست و ئامادەین بۆ کرینەوەی کەرامەتمان بەهەر نرخێک بێت.

دوو عارەبــی کوردی زمانی عەینەک لەچاوی بەســام، ئەســپی نامووس هەڵیگرتوون، تەقڵەکوت بەرەو کەتنێک خەنجەری رووت بەدەســتەوە. ئێستا واچاکــە لێرە چاودێــری ماڵەکەیان بکەیــن، لــە دوای چاوەڕوانییەکی کەم و کورتخایــەن، تارمایی کەســێک دیارە هەر دوور بــە دوور فەرهاد گوتی: ئەوە مەمۆیە، خۆیەتی، بــەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە. ئەوان مەزەندەیان کردییە هەر دوا بەدوای مەمۆی هەنگاوەکانیان نزیک لە هەنگاوەکانی بێت، مەودای نێوانیان زۆر کــەم بکەنەوە، لەگەڵ چونەژوورەوەی مەمــۆی دەرفەتی پێ نادەن دەرگا لە دوای خۆی دابخات، هێشتا ئەو ئاسنەی بۆ دەرگەکوتان بە دەرگاکە هەڵواسراوە وەک جۆلانــە دێتو دەچــێ و دەلەرێتەوە، جیــڕەی ڕێــزەی دەرگا دوودەرییە دارینەکە لە جیڕەجیڕ نەکەوتووە خۆیان بە ژوورێدا دەکەن خاوەنماڵ تاســانێک تاسان زمانیان لاڵ بوو.

لە ناخی کــوڕ و بابدا بورکانی تووڕەیی‌و رق دەتەقتــەوە. ڕۆژی بەرێ کارەکە دابەش کراوە، مام حەمەدەمین دەبێتە بکوژی مەمۆی، فەرهادیش ئەســمەرێ خوشــکی‌و ژنە گەورەکەی مەمــۆی دەکوژێ. بە بینینــی دوو عارەبی دەمانچە بەدەســت بە باشی هەردووکیان ناسیەوە، زانییان کار لەکار ترازاوە، بکوژ خوێنیان لــە چــاو زاوە. هەریەکەیان نێولەپی دەســتو پەنجەکانیان کردۆتە ســەنگەرو

چەپــەر بۆ پارێــزگاری لە خۆیان، لەگــەڵ داگرتنی پەلاپیتکــەو قرمژنی یەکەم فیشەک هەرچی کۆترو کوکوختی ســەرتەلی دارتێلی کارەبا هەیە، لە نەفرینی ئەو ڕۆژگارە، لە شــەققەی باڵیانــداو فڕین بۆ پەرپەرۆچکەی ئاســمانێ! گوللە دەمانچە وەک برێشــکە دەتەقێتەوە، لەو حەســارە گچکۆکــەدا دەنگی گوللەو بۆنی باڕووتو زرینگەی قەوانــەکانو لرخەلرخی مەمۆ و چریکە خنکێندراو و قەتیسماوی گەرووی ئەسمەرێ و کوفارەی خوێنی سینگو مەمک و چاوەکانی، نزای پەشــیمانیو داوای لێبوردنیان حینجە دەکردەوە، ژنــە گەورەکەی مەمۆی جینگڵ دەداو لە خوێنــی خۆیدا دەگەوزی، پەنجەو لەپی بە خوێنی بۆ مەمۆی ڕاداشت بە مانای ئەوەی هۆکاری ئەو کۆتاییە مەمۆیەو بەس. ئەو حەسارە بۆتە مەیدانی جەنگێکی بێئامان و کوژەر، بۆنســاردی مــردن کتومت بۆنی خوێنی مەیوی ســەربڕخانەکانە. هەتاوەکو پێش ئەوەی بمرن، باری قورســی سووکایەتی شانی داچۆڕاندبوونو ویژدانی جەزرەبە دەدان، چ بە سادەیی مردن، هەر بەڕاستی یەکجاری مردن، مەرگی ئەوان هێندە سووکو هێندە هەرزان بوو!

لە دوای خاڵیکردنی یەدەگــی دەمانچەکانیان یەدەگە بەتاڵ و خاڵیەکانیان لە دەمانچەکان دەرهێناو یەدەگی پڕ فیشــەکیان خستە سەر دەمانچەکان. ئەو ئێوارەیە، زەردەپەڕێکی غەمگین و ئاسمانێکی خوێناوی بوو!

بەشێنەیی دەرگا دوودەریە دارینە بچووکەکە دەکەنەوە. جگە لە شوێنپێی هاتــن و چونی عیزرائیل هیچــی دیکە بەدی ناکرێ. لە دیــوی دەرەوە چەند هاوسێیەک سەریان لە دەرگای حەسارێ وەدەرناوەو سەرەتاتکێ لەگەڵ بکوژەکان دەکەن، جەستەیان لە دیوی ژوورەوەیەو سەروملیان لە دەرگا بردۆتە دەرێ، ژنەکان خۆیان بە پشتی پیاوەکانەوە چەسپاندووە، وەک قەڵغانی گوللە نەبڕیان لەپێش

خۆیان ڕاگرتبێ!

پیرێژنە دووکاندارە یەکچاوەکە، لای چاوە ساغەکەی داوەتە ئەو دوو بکوژە: ئەرێ وەڵڵا ئەوەیان کوڕەکەی دوێنێیە ئەوەی ڕەحەتە لوقمی لێ کڕیم!

خۆر لە ئاوابوونە، لە حەسارێکی بچووکدا لرخەلرخی نیوەمردوو، پەلەفرکێو چاو لە مۆلەق، بۆنی خوێنو بارووت، تەنکەدوکەڵێکی شـین لەو حەسـارەی داوێسـتاوە. دوو بکوژی عەرەبپۆشـی کوردی زمان، بە گورگەلۆقە لە کۆڵانێ سووڕانەوەو لەبەرچاو بوونە تارمایی، چەند پێچی کۆڵانەکان هەڵدەوێژنن زیاتر لە چاوان ون دەبن، نە کەسـێکیان بەدواوەیە نە کـەس گومانیان لێدەکات. لە چوارڕای شەقامی گشتی، تازە بە تازە پۆلیس وا خەریکە کۆدەبنەوە، باشچاوەش توورتـوورەی بەدەمیەوەیە خەریکە گوپـی دەدڕێ هێندەی فووی پێدا بکات، پێی لە ئەرزی دەکوتێ و سەنەگە لەسـەر فوودانی توورتوورەکەی هەڵناگرێ، ئاماژەیە بۆ کۆکردنەوەی هەرچی پۆلیسی گوێبیستی توورتوورەیە، ڕووخساری سوورو شـین بووە. مام حەمەدەمین دەپرسی ئەوە چییە؟ چی قەوماوە؟ ئەوە لێـرە چـی ڕوودەدات؟ یەکێک وەڵامـی دایەوە لەو کوچانـەی لای مزگەوتێ دەڵێن پێنج کەس کوژراون. ئەی قاتیل نەگیراوە؟ قاتیل سـێنە ئێستا پۆلیس دەیانگرنو قۆڵبەستیان دەکەن، ڕەنگە هەرسێکیان لە دار بدەن.

گەیشـتنەوە لای پێخەف و کەلوپەلـە پێچراوەکانیـان، بەرگی غەزەبیان لەبەرخـۆ داڕنی و بەرگی کرێکارییان لەبەرکرد، دەی ڕۆڵە فەرهاد هەتا زووە بڕۆ ترومبێلەکی بگرە بە هەرچەندێـک بێت بمانگەیەنێتەوە هەولێرێ. جێبێکی لەندرۆڤەری درێژی بەکرێ گرت، لە بەردەرگا جێب وەستاو باب و کوڕ بە خێرایی کەلوپەلەکانیـان بارکرد، لە موسـڵێ بە تەواوی دەرنەچووبـوون خۆر ئاوابوو.

هێشــتا نەگەیونەتە گۆگجەلی، نە شۆفێرو نە سەرنشــین، هیچیان ئەلفازیان ناگــەڕێ. شــۆفێرەکە دەیەوێت ئــەو بێدەنگییە بشــکێنی: دەڵێی خەڵکی موسڵێ نینە؟ نەخێر خەڵکی هەولێرین، لە هەولێریش خەڵکی گوندەکانین. دیارە بۆ کرێکاری هاتوونەتە موســڵێ؟ بەڵێ بۆ کرێکاری لێرە بووین، ئێســتا لە لای خۆشــمان کارو کاســبی پەیدابووە بۆیە دەگەڕێینەوە. موسڵ خۆشترە یــان گوندەکەی خۆتان؟ مام حەمەدەمین وەڵامی دایــەوە: گوندەکەی خۆمان لە هەموو دنیای خۆشــترە، نەبوونی هەموو کارێک بە پیاوی دەکات. توخوا! ئەگەر نانی ڕەق بخۆن لە گوندەکەی خۆتان بەڵام ڕوو لە شاران مەکەن!

زۆر بە ئەزیەت لە زمانی شۆفێرەکە حاڵی دەبوون، هەرچەندە زۆر بەوریاییەوە گوێیان لە قســەکانی دەگرت، بەجۆرێک تێکەڵو پێکەڵ بوو دەتگوت شــیوی دەروێشــانە! وشەکان پێکهاتبوون لە ســێ زمان و پێنج زاراوە بگرە زیاتریش. هەرچــی زمانزانی دنیایە بــۆی لێک هاوێر نەدەکرا، هەرگیــز بە زمانەکەیەوە دیارنەبوو سەر بە چ پێکهاتەیەکی نەتەوەییە لەو عێراقە. ئەوەندەی لــێ حاڵی بوون گوتی: بیکەنــە خاتری نەبی یونس پێغەمبــەری، گوندی خۆتان بەجێ مەهێڵن، بۆ ئەوەی وەک ئێمەتان بەســەر نەیەتو شوناسی خۆتان ون بکەن! ئەوەتا ئەمن و تو، هاوزمان و هاوخوێنین، لە یەکتری حاڵی نابین!

مام حەمەدەمین لێی پرســی بۆ ئەتۆش کوردی؟ بەڵێ منیش کوردبووم، ئێزیدی شنگالــێ بووم، ئێستا ئەسڵ و فەسڵ و نەتەوەو ئاینی خۆم ونکردووە، باوکم هەر ئەوەندەی خۆشبوو هەتا لە شنگالــێ هەرقەنا. تاوەکو ئێستا خۆمان نەگرتتەوە. هەرچەندە لە حاڵی حازر وەکو ئێوە موسڵمانم، بەڵام بەزۆر ناچاریان کردین دینەکەمان بگۆڕین. بابم تاوەکو مردیش، ئاخی بۆ شنگال و ئێزدیاتی و

چوارشەممە سوور هەڵدەکێشا.

باسـی ئەوەی بۆ دەگێڕانــەوە کە چۆن لە شنگالــێ هەڵقەندراون و کوردە موسـڵمانە هاوزمانەکانیان، چۆن ڕەفتاریان لەگــەڵ کردوون! دیاربوو کە زانیی مـام حەمەدەمین و فەرهاد، تامەزرۆی بیسـتنی هۆکارەکانی لەدەسـتدانی شوناسی نەتەوەیی و ئاینیی ئەون، کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی باوکی:

بابـم دەیگوت، ئێمە بە کشـتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریـک بووین، بەڵام لە دهـۆک و هەولێر، حاسـڵاتەکانی وەکو گەنم و جۆ و تەماتــە و خیارو گندۆرەو ئەوانەیان لە ئێمە نەدەکڕی، بە بیانووی ئەوە کە گوایە ئێزدی پیســن و شەرع ڕێ نادا بەرهەمەکانیان لێبکڕین! ناچاردەبووین موسڵمانێک بەکرێ بگرین بۆ ئەوەی بەرهەمەکانمان بە ناوی خۆی بۆ بفرۆشـێ. ئەگەر کەسـمان دەسـتنەکەوتبایە، بەناچـاری بەرووبوومەکانمــان دەهێنایــەوە ناوچەکــەی خۆمــان، یــان ئەوەتا هەرزانفرۆشـمان دەکرد، یان دەمانــدا بە ئاژەڵەکانمان. ئــاژەڵ و پەلەوەر و هەتتا هێلکەشیان لـێ نەدەکڕین، وەک ئەوەی هێلکەکان بۆ خۆمان کردبمانن! باشترین هەنگوینمان کە حەوت دەردی دەپەڕاند، ماسـت و شیرو پەنیری ئێمەی ئێزدی هاوزمانی خۆیان نەدەکڕی، لە عارەبەکانیان دەکڕی، گۆیا ئەوان لە ئێزدیان خاوێنترن و بـرای دینین! بابم دەیگێڕاوە، ئێمە حەفتا فەرمانمان بەسـەردا هاتووە. کە دوو جار هەر بەدەستی برا کوردەکانی خۆمان بووە. کەچی ئەگەر کوردێکی موسڵمان میوانمان بوایە، وەک ڕێزلێگرتنێک، چەقۆمان دەدایە دەستی بۆ ئەوەی بۆ خۆی مریشـکەکە بە دەستووری ئیسـلامەتی خۆیان سـەرببڕێت. بابم بەسەرهاتی سەیری دەگێڕایەوە گوایە کەڵەبابی کوردێکی ئێزدی، بەسەر مریشکی کوردێکی موسڵماندا فسیوە، کوردە موسـڵمانەکە بە تفەنگ کەڵەشێرەکەو مریشکەکەی

کوشـــتووە، گوتوویەتی ناجایزە کەڵەبابی ئێزیدی بەسەر مریشکی موسڵمانانـدا بفســێ! چونکە هێلکەو جوچکەی حەرامیان لـــێ بەپاش دەکەوێ! ئینجا بابم لەژێر ئەو ســـووکایەتی پێکردنە، لە شنگالـــێ کۆچی کردووە بۆ موسڵێ. وەک دەبینی، خۆمانو نەتەوەو دینەکەشـــمان لە دەستدا، ئەوە خاکیش هەر لێگەڕێ! بابم زۆر لەمێژە وەکو ئێوە هاتۆتە شـــاری موسڵێ بۆ کرێکاری، لەدوای ماوەیەک دایکمو ئێمەشـــی هێناوە. هەر خانووەکی بەکرێ دەگـــرت، هەر ئەوەندەی خۆش بوو هەتاوەکو خاوەن خانوو و هاوسێکانمان دەیانزانی ئێمە ئێزیدین، لە خانووەکە دەریاندەکردیـــن. یان بابم دەچـــووە کرێکاری، کاتی نوێژی نیـــوەڕۆ کە دەیانبینی نوێژێ ناکات، دەیانزانی ئێزیدیە، لەســـەر کارەکـــە دەریاندەکرد، زۆرجار پارەی ئەو دانە ڕۆژە کرێکاریەشـــیان نەدەدایێ. لەترســـی مردن لە برســـان، بابم دینەکەی گۆڕیو بووە موســـوڵمان، لەو دواییانەشـــدا کەوتینە بەردڕندانەترین شـــێوازی تەنگ پێهەڵچنین بۆ ئەوەی خۆمان بە عەرەب بنووســـین. ئێســـتا ئێمە قەوم و دین و خاکمان لەدەســـتداوە، ئەوەتا زمانەکەشم هەلا بە هەلا بووە، تێکەڵەیەکە لە هەموو زمانەکانی شـــاری موســـڵێ، لە کوردی، عەرەبی، تورکمانی، سریانی و... لە هەموو شـــانازی و داب و دەســـتووری باب و کالان ڕووت بومەوە! یەک تاقە منداڵم نازانی دوندی چلمێرا، لالش، شنگال، (زۆر تەمەرپاشا[١])و گۆڕیان

١. زۆر تەمەرپاشا: تەمەرپاشا، بە زۆر تەمەرپاشا ناسرابوو، پاشایەکی مەزن بووە، لە وێرانشەهرەوە تا ئامەد و سنووری موسڵ و باکووری حەڵەب دەسەڵاتدار بووە. سی و شەش هۆزی کورد لە ژێر فەرمانیدا بوون. لە دژی داگیرکاریی تورک و عەرەب جەنگاوە. کچەکەی ناوی (عەدول) بووەو ماشوقەی (دەروێشی عەڤدی) بووە، هیچ ئێزدییەک نییە نەیناسێ و چیرۆکی ئەوینداریی عەدول و دەروێشی عەڤدی نەزانێ.

کەوتۆتـــە کوێی ئەو دنیایە. منداڵەکانم نازانن (دەروێشـــێ عەڤدی)و (عەدول) و (زۆر تەمەرپاشـــا) کێنەو ئێمە نـــەوەی ئەوانین‌و ئەوان ئـــەژدادو ڕەچەڵەکی ئێمەن، کە غەیرە ئێزیدیش شانازییان پێوەدەکەن! قەت لە بیرم ناچێ کە لە خانوو دەریاندەکردین دەیانگوت: ئەو خانووە هەمووی بۆن ساردبووە چونکە غەیرە دینی لەناودا بووە، دەبێ بسمیلی بکەین و جوان بیشۆین!

ئەوجا، بۆ ئەوەی وەک ئێمەتان بەسەر نەیە، گوندو واری خۆتان جێ مەهێڵن، کورد گوتەنی بەرد لە جێگای خۆی بەسەنگە! بابم هەموو جارێ دەیگوت: بە بیرم دێ ئەو شـــاری موسڵە لە سێ بەشان دوو بەشـــی کورد بوو، هەموو نەتەوەکانی دیکە لە ســـێ بەشان بە شـــێکیان پێکدەهێنا، وا خەریکە کورد لە موسڵ دەبینە غـــەوارە! هەتا مردیش دەیگوت: قەت گەردنی خـــۆم ئازاد ناکەم کە یەک لەوانە بوومـــە هـــۆکاری ئەو گۆڕینەم. بریا لە شنگالـــێ لە برســـان ڕەق بوویام، ڕووم لە موسڵێ نەکردبایە!

تاوەکو شـــوفێرەکە لەو ســـەربورد و قســـەو باســـانە بوویەوە، گەیشـــتنە باڕووتخانەی ڕەشـــکین[1]، گڵۆپی هەولێرێ بەدیارکەوتن. فەرهاد پرسی: بابە یەکەمجار بچینە کوێ؟ کوڕم چۆن نازانی یەکەمجار دەبێ بچینە ماڵی کاکم! ناخر جگـــە لەوەی کاکمە، گەورەی تایەفـــەو بنەماڵەکەمانەو کوێخایە. بەدەم کەلوپەل دابەزاندن، بە شـــۆفێرەکە دەڵێن ئەوشەو لەلای ئێمە ڕۆژ بکەوە، بەو ترومبێلە یەک لایتە ناگەیەوە موســـڵێ، شـــۆفێرەکە گوتی: هەتا دەگەمەوە موســـڵ تووشی چوار ترومبێلان نابم، جادە چۆڵەو منداڵەکانم نازانن لە کوێم!

---

١. باڕووتخانەی ڕەشکین: ڕەشکین گوندێکی نزیک شاری هەولێرە لەسەر ڕێگای موسڵ. بەدرێژایی ڕژێمەکانی عێراق عەمباری باڕووت و چەک و تەقەمەنی سەربازیی لێبووە.

شـــۆفێر کرێی خۆی وەرگرتو ڕۆیشت. کاتێک کوڕو باب وەک دوو جەنگاوەری براوەی شـــەڕ بە ژوورکەوتن، کوێخا لەسەر کەوڵەمامزێکی خاراو دانیشتووەو دوو سەرینی لەپاڵ پشـــتێنە، هێندە گەورەن شەڕەتفەنگی لەپاڵ بکە، هەر لە دووررا گوتی: جارێ پێم بڵێن شێرن یان ڕێوی؟ بە جووت گوتیان: شێرین!

کوێخا، لەبەر کەم کەس هەڵدەســتێ، نەخاسمە لە بەر برا گچکەو برازای، بەڵام ئەوجارە لە خۆشـــی هەواڵەکە، یەکپێ بڵندبـــوو، هەردووکیانی ماچ کردو خۆش خۆش دەیگوت: ئەە لەبەر گونتان مرم! ســـەری هەمووانتان بەرزکردەوە! دەک بەقوربانی دەســـتتان بـــم، ئەوجا چیدیکـــە خۆم نابوێرم لـــە چوونە ناو مەجریسان، کۆفیم قیت دەکەمەوەو تیلاکم دەینمە تی سەرم. زەلامەکی وەکی ئێوەم هەبێت کەس ناتوانێ هەقم بخوات و ســـووکایەتیم پێ بکات، ئەوجا لێرە بەدواوە هەســـتی خۆتان ڕاگرن بزانن خەڵک چۆن بە شان و باڵماندا هەڵدەدەنو چۆن باسمان دەکەن، قسەی نێو خەڵکی بۆ من زۆرە!

بە گەیشـــتنەوەی مام حەمەدەمینو فەرهادی، هەر دەلعازی، کوێخا کوڕی نارد بچێـــت ژن و منداڵەکانیماڵی مام حەمەدەمینی بێنێ بێ ئەوەی ئەوان ئاگادارین. کوێخا دەیویســـت بەرلەوەی ســـبەینێ ڕادەستی پۆلیس بکرێن یان خۆیان ڕادەست بکەن، ژن و منداڵەکانیان ببینن، چونکە ئەوە سێ مانگی ڕەبەقە نەیاندیـــون. دیدەنی ئەو ژن و منداڵە چەند دیدەنیەکی ســـەختە بە تایبەتی دایکی ئەســـمەرێ، ئازارێکی چەنـــد گرانە! لەگەڵ بکـــوژی کچە تاقانەکەت ڕووبـــەڕوو بێت، ئەوانیش کوڕ و هاوســـەری خۆت بـــن، وەک کۆلکەدارێکی بێگیان بەرامبەریان دانیشـــت، دار قەرەشـــت، بەرد قەرەشت، ئەرقومێ ناکاو ئەلفـــازی لەگەڵیان ناگەڕێ و مانی لە قســـان گرتووەو چاو لە مۆلەق. ئەو ژانە

ناخهەژێن و سوتێنەرە لە هەناوی پەنداوی دابۆوە، لە ئانو ساتی خۆیدا بوو لە چاوە کەنەفتە تەڕەکانی بتەقێتەوە! چ فریادێکی بێدەنگە، قریشـــکەی دەگاتە سەر کۆسپەی دەرگای بارەگای یەزدان! لە نیگای دایک و باوکدا تەنها بە زمانی جەستەو کرو بێدەنگ سکاڵای ناخیان بۆ یەکتری هەڵدەڕشتو تێک ڕامابوون.

مام حەمەدەمین بە پاڕانەوە و داوای لێبوردن بە چاوان هاوسەری دەدواند: ئاســـان نییە کچە تاقانەکەی خۆت بە دەستی خۆت بکوژیو خەڵتانی خوێنی بکەی، بەڵام ئافرەت نەمدەزانی چۆن وەڵامی خەرکی بدەمەوە، ئاخر لێرە دەبێت لۆ خەرکی بژی!

لەو کاتەدا، کوێخا وەک بڵێی لەو قســـانەی ژن و مێرد، کە بە زمانی جەستە دەیکەن، وشە بە وشـــە حاڵی بووبێت، ئاخر ئەو لە لێکدانەوەی تایبەتی خۆیەوە دەدویێ کە لە پاشـــخانی ئەقڵیەتی دۆگمای خێڵەکییەوە سەرچاوەی گرتووە. هاتە نێو قســـان: لێرە بەدواوە گوێ بگرن خەڵک چۆن بە چاکەو پیاوەتیو ئازایەتیماندا هەڵدەڵێن و لە مەجریسان خەڵک چۆن باسمان دەکەن! ژنی تاین لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیـــرا لە حەژمەتی ئەو ئـــازارەی لە ناخەوە ڕۆحی دەکرۆشـــت: ڕووی بابی خەڵکی ڕەش بێت کاتێک لە تاو قرچەقرچی سووتان و بۆنکرووزی جەرگم، ئارامم نەبێت! خەڵکی چ گوێێک دەخۆن با بیخۆن، نابێتە دەرمانی برینی جەرگم!

مام حەمەدەمین گوتـــی: ژنی چاکبە، کاکم لێرە دانیشـــتییە هێور بەوە. نەبیســـتراوە نەدیتراوە ئەتـــۆ لە حزووری کاکم دەنگـــت بەرزکردبێتەوە. ددانی لەســـەر جەرگی خۆی داگرتو هاوارەکەی خواردەوە. بۆ دایکێک لە حەژمەت و حەســـرەتی مەرگی جگەرگۆشەکەی کە گۆڕێکیشـــی نییە سەردانی بکات، مەگەر بـــە دزیو دوور لە چاوی پیاوەکان، لە بوخچـــە بەجێماوەکەیدا بۆن بە

جلوبەرگ و خەناوکە قەنەفرەکەیەوە بکات!

کوێخا گوتی: لێیگەڕێ حەمەدەمین، ژن ئەو فینگەفینگەی هەر دەکەن، بـۆ خۆی چاک دەبێو لەگەڵ بارودۆخەکـەی ڕادێ، هەر کچی وی نەکوژرایە، هــەر ئەوەندەی ئەمن لە بیرم بێ ئەوە چەند کەس کچی بکوژرێ، ئێمەش لەو خەڵکەی زیاتر نینە.

بەیانییــە و نم نـم بارانێکی وردو نەرم دەبــاری. کوێخا لە پێشــەوە دەڕواو حەمەدەمینو فەرهادیش بە دوایەوە بەرەو قشــرەی ســوارەی[1] بۆ ئەوەی خۆیان ڕادەستی پۆلیسی بکەن. مۆڵەتیان وەرگرت لە ژووری مەئموور مەرکەز سڵاویان کرد. هــەر ئەوەندەیان خۆش بوو تاوەکو بە مەئمـــوور مەرکەزیان ڕاگەیاند ئێمە قاتیلین، سێ کەسمان کوشتووە، لێنەگەڕا ڕوونی بکەنەوەو بە وردی لە مەسەلەکە حاڵی بێت، سیدارەکەی لەسەری ســووڕاند و توندی کرد، وەک خۆی بۆ ئەگەری نەخوازراو ئامادە بکات دەرپەڕییە دەرێ، لە ژوورەکە تووڕتووڕەی بەزاری خۆیەوە ناو پێی لە عەرزی دەکوتا، ســەنەگەی لەسەر تووڕتووڕەی هەڵنەدەگرت، کەلێنی نەدایــەو بێ ناوبڕ فووی تێدەکرد، کەلای ناو تووڕتووڕەکە خەریک بوو لە حەیفان دەرپــەڕی، هەندی بڵێی یەک و دوو، هەرچی پۆلیس هەیە لەو قشــرە ســوارەی وەسەرخۆی گێڕا، لەبەر شڵپەشــڵپی پێ لە عەرزی کوتانو چرکەچرکی تفەنگـو زرەزرەی ئاوەزێنان، سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسییەوە!

مەئمور مەرکەز هێندەی فشار بۆ تووڕتووڕەکەی و گوپی خۆی هێنا، خەریک بوو دەموچاوی شــینو مۆر هەڵگەڕێ! ئەو فووەی لەو تووڕتووڕەی کرد، بایەکەی

---

١. قشرەی سوارەی: قشلە یان سەرای پۆلیسی سوارە.

ئاشێکی وەکو ئاشی بای سەر قەرەچووغی[1] پێ دەگەڕا، زۆری نەمابوو، خۆی فتق و قۆڕ بکات، فرکان فرکانێکە ناپرژێنە سەر هەڵگرتنەوەی سیدارەکانیان. مەئمور مەرکەز دەستی بۆ لای قاتیلەکان ڕاداشت و گوتی: بیانگرن ئەوانە قاتیلن. سێ قەتلیان کردییە. بە کوێخاوە هەرسێکیان کەلەپچەو زنجیر کردن دەمانچەکانیان لە بەرپشتی دەرهێنان لوولەیان بۆن دەکردن، بۆ ئەوەی بزانن بۆنی باڕووتی لێدێ یان نا. هەرچەندی کوێخا هاواری کرد: ئەمن هەروا لەگەڵیان هاتوومو قاتیل ئەمن نیم، ئەو براو برازایەم قاتیلن، بەڵێ، سودی نەبوو، چونکە مەئموور مەرکەز بە هۆی ئەوەی ماوەیەکی کەم بووە گوازرابۆوە بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو حەپسخانەیە، بۆیە ئەو قورەکێخوایەی[2] نەدەناسی، تفەنگیان لەسەر سینگی دانا. لە هەرچوار دەوریان لوولە تفەنگیان لەسەر دانابوون، وەک ئەوە وابوو تازە دەستبەجێ گەیشتبنە شوینی کوشتنەکان و هێشتا بۆنی باڕووت نەڕەویبێتەوە. لووە گۆشتەکانی پشتی ملی مەئموور مەرکەزی وەک کۆپەرانی کەوتبوونە سەر یەخەی جلە سەربازییەکەی. دوو سێ قامچییان لە کوێخای دا، قامچی لێی دەسووڕایەوە. کوا؟ جەنازەکانتان بۆ نەهێناوە؟ ئەگەر نەشتانهێناوە لە کوێن؟

تاوەکو حاڵییان کردن ئەو کوشتنە دوێنێ بووەو لە شاری موسڵێ ڕوویداوەو ئێمە بەپێی خۆمان هاتووین خۆمان تەسلیم کردووەو دەمانچەکان ئەوەتا لەلاتانەو هیچی شاردراوە نییە بۆ گوتن. مەئموور مەرکەز خۆی لێ سوورو شین کردنو بەتوورەیی گوتی: بۆ پێتان وایە هێندە بە ئاسانی قەتل ئەنجام

---

١. ئاشی بای سەر قەرەچووغی: شوێنەواری ئاشێکی کۆنە لەسەر لوتکەی چیای قەرەچووغی، کە بە بای گەڕاوە (ئیشی کردووە)

٢. قورەکێخوا: قورەکوێخا، قوڵەکوێخا، کینایەیە بە کوێخای بچووک و کەمدەسەڵات.

بدەن و ئاوا وەک بەرزەکی بانان بۆی دەربچن‌و لە دەستی پۆلیس ڕابکەن؟ چما پێتان وایە پۆلیس نوســـتووەو شـــار بێ حاکمە، بە کەیفی خۆتان قەتل بکەن‌و دەستگیر نەکرێن؟ نازانن حکومەت بە عارەبانەی کەروێشکی دەگری! لە ناکاو پۆلیسێک سەرنجی کەوتەسەر پانتۆری مەئمورمەرکەزی و لەگەڵی دەسووڕا، چەند جاری سڵاوی سەربازی بۆ دەکردو پێی لە ئەرزێ دەداو دەیگوت: قوربان پانتۆرەکـــەت! تومـــەز هیچ پانتۆرەک بـــۆ قونو قالچـــەی مەئمورمەرکەزی نەدەبوو، ناچاربوو تیرێژێکی سێگۆشـــەی لەناو پستێری پانتۆرەکەی دەبردەوە. ئەو ڕۆژە هێنـــدەی خۆ تەنگاو کردبوو لەکاتی فوودانـــی توورتوورەکەی و لاق بەرزکردنەوەو لە عەرزی کوتان پینەی پانتۆرەکەی هەڵوەشابووەوە، دەرپێ قوتە سپیە شعادەکەی دیاربوو، مەئمورمەرکەز بەتووڕەیی لە پۆلیسەکەی ڕاخوری‌و پێیگوت: ئەوە چیەو چیتە بەدوای مندا دەســـوڕێی؟ چت لە ناو پانتۆری من دیتیەتەوە؟ ئەوجا پۆلیسەکە حاڵی کرد.

دروســـت لەوکاتەی بە کەلەپچەو زنجیرەکانی پێیانەوە لە گۆشەی حەساری حەپسخانەی ڕاگیراون، پۆلیسەکان ئامادەباش بە چەکەوە بە دیاریانەوە وەستاون، چونکە کاتی چوونە ئاودەســـتی زیندانییەکان بوو، چاوەڕوان بوون دۆسیەکەیان ئامادەبکرێ‌و کاری چوونەسەرئاوی بەندیەکان تەواو بێت ئەوجا بیانکەنە ژورێ. دەبوایـــە هەر بەندیەک کاری چونەســـەراوی زوو تەواوبکات، چونکە لەکاتی میزکردن چرکەیان بۆ دەگرتنەوە. زۆرجار کەســـێ بەدواکەوتوو قامچیکوتیش دەکراو، شـــەق لە دەرگادانی پۆلیســـەکان، پاشـــەرۆ و ئیشـــی ســـەراویان بە بەندییـــەکان نیوەچڵ دەکرد، چۆرەمیزەکانیان پێ دەبڕین. ئەو ســـەراوکردنەیان وەک جێبەجێکردنی فەرمان دەبینی نەک پێویستی. بە تەنیشت ئەو میلەو

شیشە ژەنگاویانەی حەپسخانەی پیاوانەوە جێگای بەندکراوە ژنەکان بوو، چەند ژنێک لەو شوێنە بەندکرابوون. یەک لەو ژنانە، ژنێکی شێتی ناسراو بوو، کەم کەس هەبوو نەیناسێ، جلوبەرگی تەنکو گەنجانەی لەبەردەکرد، لەچکەکەی ئەوەندە بەتوندی لەژێر چەناگەو قورگی بە گرێکوێرە شەتەک دابوو، دەموچاوی وەک تەماتەی، سوور هەڵگەڕابوو، بەهۆی ئەو گرێکوێرە توندەی لەچکەکەی، دەمووچاوی وەک ئاوسان دەهاتە بەرچاو، چاوەکانی زەق زەق خەریکی دەرپەڕین بوون. بەر لە دەستگیرکردنی، شەوان لەســەر شۆستەی بەردەرکی دووکانەکان کارتۆنی ڕادەخستو لێی دەخەوت. بە تاوانی ئەوە گیرابوو حەسحەسێکی[1]، کە پاراســتنی ئەو ســنوورەی ژنە شــتێتەکەی لێدەخەوت، لە ئەســتۆ بووە، لەوکاتەی شەو ڕادەشــکێو مانگ خۆی لە پەنا دەدا، حەسحەسەکە هەوەسی جووتبوونی دەوروژێ، بە نیازی ئەوەی شــتێکی دەســتبکەوێ هەر لە بەردی نەرمتر بێت بیداتە بەرێ و کلوکۆی دابمرکێنێتەوە، لەناکاو، کوتکو سنگی[2]، چاوی لە ژنێکی نووستوو دەچەقێ، خۆی لــێ نزیک دەکاتەوە، دەبینی ئەو ژنە شێتە لەسەر شۆستەی بەردەرکی دوکانێک خەوتووە، پووزی هەڵکراوەو بەلەکی وەک تووری ســپی هەتا ئەژنۆی بەدەرەوەیە، کراســی هەڵماڵدراو ناوپستێری دەرپێی، ســەرنجی کاکی پۆلیس ڕادەکێشنو دەیوروژێنن، هەستو هەوەسی، بەرچاوی تەڵخ دەکــەن. تفەنگەکەی بە دەڕابی دوکانەکەی هەڵدەپەســێری و دەکەوێتە شــێلانی بەلەکو ڕانی ژنەی، هــەوەس بەجۆرێک باڵی پێ دەگرێ، لە گەڵو ســمتی ژنەی زیاتر چاوی هیچ شــتێکی دی نابینێ، ســواری سەری

١. حەسحەس: بە ئاخاوتنی کۆن پۆلیس، پۆلیسی شەوانە (حرس لیلی).

٢. کوتکو سنگی: کینایەیە بە زۆر لێک نزیکی، لێک نزیک هێندەی کوتک و سنگ.

ئارەزووەکانی خۆی دەبێت، ژنەش بە خەبەردێت دەبینی پۆلیسێک دەیشێلێ، خۆشــی لەو شــێلانەی دێت، دەڵێ یارەبی خوا خێرت بنووسێ کاکی پۆلیس! ئەویش وردە وردە هەڵدەکشێ تاوەکو دەرپێکەی دادەکەنێ لەوکاتەدا ژنە پشتی دەخەوێنێتــە ئەرزیو لینگانی بــڵاودەکات، پێی بە تفەنگــی کاکی پۆلیس دەکەوێ، تفەنگی ئینگلیزی یازدەخۆر لەسەرڕا بەردەبێتەوە، بەو شەوە بێدەنگە، شــرینگەی لە چەمەنتۆی بەردوکانەکەوە دێنێ، حەسحەسێکی هاوپیشەی، گوێی لەو شــرینگەیە دەبێت، دەزانی ئەوە دەنگی بەربوونەوەی تفەنگە، هەر زوو ڕوو دەکاتە شــوێنی دەنگەکە، نەبادا کەسێک حەسحەسە هاوپیشەکەی بەردابێتەوەو تفەنگەکەی بۆ خۆی ببات و، بۆ ئەوەی ئەو پیاوخراپەی لە زەینی خۆی دایڕشــتووە، ئەویش نەکاتە ئامانج، زۆر بە ئەســپاییو هەستیاریی ڕێ دەکات، کاتێک لە ســووچی دوکانان دەســووڕێتەوە، دەبینێ هاوپیشــەکەی، ژنێکی دایتەبەرێ لاقی پێ کردۆتە چەتاڵ. ئەسپی هەوەس بەجۆرێک باڵی پێ گرتووەو نغرۆی ناو چێژو چرکەســاتەکانی هەرەخۆشی خۆی بووە، بێئاگا لەوەی حەسحەسێکی هاوپیشــەی بەدیاریەوەیە، دەمێکە چاودێری دەکات، کاتێک دەزانــی کار لە کار ترازاوەو پاڵتۆی دەوڵەتی بۆ ئەو گانە ڕاخســتووەو شــکۆی حکومەتی شــکاندووە. هەستی بەرپرســیاریەتیو دڵنیاکردنی هاوڵاتیان کە گوایە حکومەت نەخەوتووە، دەســت دەکات بە تووڕتووڕەڵێدان بەجۆرێک لە بن قەڵاتێ و مزگەوتی دێرەبڕوشەی[1] گوێیان لــێ دەبێت. بەرلەوەی پۆلیسی

١. مزگەوتی دێرەبڕوشەی: مزگەوتێکی بچووکە لە نزیک جادەی باتە لە شاری هەولێر، کەوتۆتە سەر ئەو کۆڵانەی بۆ گەڕەکی عارەبان دەچێت. ئەو مزگەوتە بەناوی گوندی دێرەبرووشەیەوە کراوە.

گانکــەر پانتۆڕو قایش و قــرۆشو خەریتەی تفەنگی ببەســتێتەوەو پاڵتۆیە سەوزە ســەربازیەکەی لەژێر ژنە شــێتەکە دەربێنێ و لەبەری بکات، پۆلیسە حەسحەســەکانی بەسەر وەردەبنو هەردووکیان قۆڵبەست دەکەن. ژنە شێتەکە دەڵێ: خۆ ئەمن کەسم نەگایە! ئەمن لۆ دەگرن؟ کاکی پۆلیس گانکەرە کەچی ئەمن دەگرن! باشچاوەشــی ئێشــکگر ئاگاداردەکەنەوەو بڕیــاری ڕاگرتنیان بۆ دەردەچێ، دەیانبەن بۆ حەپسخانە. کاکی پۆلیس دەبێتە زەخیرەی پێ ڕابواردنی بەندییــەکان، هەر بەخۆیــان تاوانەکەی بۆ ڕاڤە دەکەن و ماددەکانی بۆ شــی دەکەنەوە. لە ناو فەزای بێسەروبەری زینداندا هەرکەسەو بە ئارەزووی خۆی لە جیاتی دادوەر ســزای بۆ دیاری دەکەن و پێشبینی بۆ دەکەن، لە ڕووی بەخیلی پێبردن کە ئەوان لە حەپسخانە بێبەشــن لە چێژی جووتبوون، هێندەی دیکە باری کەتنەکەیو ســزاکەی بۆ قورس دەکەن! گەیلان قامە، هاتە نێو قســان: ئەتۆ بە ســێ برگە سزا دەدرێی، دوور نییە بگاتە لەسێدارەدانیش! ئەوجا گوێم بۆ ڕاگرە، لەبەر ئەو تاوانانە، حوکمت هەتا بڵێی قورسە:

یەکەم، ئەو تاوانە بە جلوبەرگی سەربازی ئەنجام دراوە.

دووەم، کەتنەکە لە کاتی ئەرکدا کراوە.

ســێیەم، پاڵتۆی دەوڵەتت لەژێر ئەو ژنە ڕاخســتووەو شەڕەفی حکومەتت شکاندووە!

چوارەم، بەگوێرەی یاساو ڕێنمایەکانی ئیسلام، دەستدرێژیکردنە سەرشێتێک سزای دوو بەرابەرە.

لەو ڕۆژەوەی گیراون، هەرچەند جارێک ئەو پۆلیســە وەک هەر بەندییەکی دیکە دەچێت بۆ میزکردنو ســەرئاو، ڕێگای چوونەسەرئاو بە بەردەمی بەشی

ژناندا تێدەپەڕێ، ئەو ژنە شـێتە دەزانێ چ کاتێک پیـاوە بەندییەکان دێن بۆ سـەرئاو، لەوکاتەدا بە هەردووک دەستی میلەو شیشـی قەفەزە ئاسنینەکە دەگـرێ، نیوەی دەموچـاو و چەناگە و لووتـی لە کەلێنی شیشـەکان دەباتە دەرێ. هەرکـە چـاوی بە پۆلیسـەکە دەکەوێت، هەتا دەنگـی تێدایە دەڵێ: هـا ها ها ئۆی، بەخـوای کاکی پۆلیس گانی کرد! تاوەکو پۆلیسـەکە خۆی بە ژووری حەپسـخانەکەدا دەکاتەوە، ئەو ڕسـتەیە دووبارە دەکاتەوە. بەندییەکان خەنـی دەبن بە پێکەنین، وەک ئەوەی ئەوکاتـە تەرخان کرابێت بۆ میزکردنو پێکەنین! پۆلیسەکانیش خۆیان پێ کۆنترۆڵ ناکرێ کە پێنەکەنن چجای ئەوەی لە بەندییەکانی قەدەغـە بکەن. جارجار بە تێکەڵەیەک لـە بەندییەکانیان ڕادەخوری کە پڕبوو لە پێکەنین، وەلـێ بێ سوود بوو، چونکە تێخوڕینەکەیان بۆ گۆ نەدەکرا لەبەر پێکەنین. ئەو ژنە شێتە دەیبینی هەموویان بە قسەکانی پێدەکەنن، کەلێنی نەدەدایە قسـەکانی، هەتاوەکو پۆلیس و بەندیەکان زیاتر پێدەکەنین، ئەو ژنە لەبارەی گانی ئەوشـەوە زیاتر قسەی هەڵلەق مەڵلەقی بۆ دەکردن. هەرچەندی ژنە هاوبەندییەکانی کراسـیان لە پشـتەوەڕا ڕادەکێشا بۆ ئەوەی لە شیشـەکان دووری بخەنەوە، بەڵام وا بە هەردوو دەسـتی شیشەکانی گرتبوو، پێشی لە عەرزی بڕابوایە بەری نەدەدا، پێیاندەگوت کچێ بەسە سەرت لە قوڕێ نێن حەیای هەموومانت برد سـەر بەهەش! ئاخر ئەوەیە: «نەشێتی بگێ نە شێت بتگێ».

لە دوای لێکۆڵینەوەو وتە وەرگرتن، گەیشـتنە ئەوەی کە کوێخا، بەشدارو ئاگاداری ئەو سـێ کوشـتنە نەبووە، بۆیە ئازادیان کرد. مـام حەمەدەمینو فەرهـادی کـوڕی لە گۆشـەی حەسـاری حەپسـخانەی لە بەینـی ژووری

مەئموورمەرکەزو چێشتخانەی حەپسخانە لەسەر ئەو دوو پێخەوە لوولدراوەی کوێخا لەگـەڵ خۆی بۆی هێنابوون، لـە چاوەڕوانی ئـەوەی مەئموورمەرکەز پەڕاوی لێکۆڵینەوەو دەستبەسـەرییان تەواوبکات، بەندییەکان نابینن، بەڵام گوێیان لەو پێکەنین‌و قاقایەی بەندییەکانە کە بە کۆمەڵ دەنگیان دێ.

بـاب و کوڕ لـە یەکتری دەپرسـن: بۆ بەندکـراوی واش هەیـە لەناخەوە پێبکەنێـت؟! ئەتۆ بڵێی ئێـرە بەندیخانە بێت! لـە دوای ڕیزکردن‌و ژماردنی بەندییـەکان، دڵنیا بوون کـە ژمارەیان تەواوەو هەموویـان لەو هۆڵەن کە لای پێشەوەی وەک قەفەزی ئاسنین بە میلەو شیش گیراوە، دایانکردنەوە ژووری.

دوو پۆلیس بە فەرمانی مەئموورمەرکەز، پیلی مام حەمەدەمین‌و فەرهادیان گرتن‌و پۆلیسێک پێخەوەکانی بۆ هەڵگرتن بەرەو دەرگای بەندیخانە هەنگاویان نا. دەکەونە بەردیدی بەندییەکان، لە ژوورەوەڕا کە چاویان بە کەلەپچەو زنجیری پێیان دەکەوێت، زانییان تاوانەکەیان قورسە. خۆیان ئامادەکرد بۆ لێپرسین‌و وتە وەرگرتن لێیان‌و پرسـیارباران کردنیان وەک هەر بەندییەکی نوێ. دیاریکردنی بڕگەو جۆری تاوان و سزاکانیان، ئاخۆ هەتا چەند ساڵ دەڕوا، ئەوە ئیشی ڕۆژانەی بەندییەکان بوو، هێندەی ئاوقاتێک شارەزاییان پەیداکردبوو، لە سزای کەتنەکان. هەندێکیان خۆیان ئامادەکردبوو بۆ پێ ڕابواردن‌و کاتبەسـەربردن، هەندێک بۆ دزی لێکـردن و هەندێک بۆ یارمەتی و دڵدانەوەو... پۆلیسـەکان، کەلەپچەو زنجیرەکانیـان لێکردنەوەو بـە پێخەوەکانیانەوە پارەسـووی[1] ژوورێیان دان و دەرگایان لەسەر داخسـتن. بۆ ئەوان، ئەو مەخلوقەی خوا زۆر سەرسوڕهێنەر

---

١. پارەسوو: پاڵەستۆ، پاڵنان.

بوو، واقیان وڕمابوو لە هەرچوار دەوری خۆیان دەڕوانی، هەبوو سەری بە گیزان تراشـــابوو، هەبوو ســـەری کەپووی کوترابوو، هەبوو قۆڵا و باسکی دووپشکـو خەنجەرو مارو دڵی بـــە تیر ئەنگاوتەو ئاخو ئۆف و چەند پیتی ئینگلیزی بە کوتین هەڵکەندرابوو. هەبوو لەبەری چاوی ڕا هەتا ســـەر ڕوومەتی بە چەقۆ هەرتلیشـــابوو، جێی هەموو تەقەڵەکان دیاربوو. لەگـــەڵ هاواری بەندییەکان قوشقی بوون، پشتیان بە یەکەوە نابوو، وەک خۆ ئامادەکردنێک بۆ بەرپەرچی هەر پەلامارێـــک، یەک دەیگوت: وەرە با بزانم لەســـەر چـــی گیراوی، یەک دەیگوت: لە شـــوێنی خۆتان بوەستن هەتاوەکو مەراقیبی بەندیخانە دێت ئەو بڕیار دەدات لەکوێ شوێنتان بۆ دیاری دەکات. ئەوانیش پێخەفەکانیان هەروا بە بن هەنگڵیەوەیـــەو هێدمەگرتی بووینە، لە هەرچوار دەوری خۆیان دەڕوانن لە دڵی خۆیان دەیانگوت: قەیناکا بەندمان دەکەن بەڵام بۆ؟ ئێمەیان هێناوەتە نێو ئەو خەڵکە هەرچیو پەرچیو شەللاتیو چەقۆکێشانە!

کاکەڕەش، لە بنەبانی بەندیخانەی، لە بارێ ســـەرێ، چاوی پێیان کەوت، ئای خوایە خۆ ئەوە مام حەمەدەمینو فەرهادی کوڕیەتی! دەبێ لەسەر چی گیرابن! هەنـــگاوی هەڵێنا بەرەو ڕوویان بانگی کرد: مام حەمەدەمین، مام حەمەدەمین! فەرهاد گوتی: بابە ئەوە کاکەڕەشـــی حاجی سمایلیە بانگمان دەکات، دەڵێ وەرنە ئێرە. کاکەڕەش ئامێزی بۆ گرتنەوەو بەخێرهاتنی لێکردن، دەنگێک، وزەو ورەی پێ بەخشـــین. مام حەمەدەمین وەک گوڵێکی تینوو ئاوی لە بن بکەی، گەشایەوە، بە بینینی کاکەڕەشی شاگەشکەبوو دەم نا دەم دەیگوت: مادام کاکەڕەشی حاجی سمایلی لێرەیە وا دەزانم بەردراوم و ئازادکراوم.

پێخەفەکانیان لە تەنیشـــت جێگای کاکەڕەشی ڕاخســـت، دیاربوو کاکەڕەش

لەنێـــو بەندیخانەکە، قســـەی بە هەنـــد وەردەگیرا، بە هۆکاری ئـــەوەی چاودێری بەندیخانـــە عـەبدۆ بوو، باوکی، پوورزای حاجی ســـمایلی باوکی کاکەڕەشـــی بوو. بـــۆ خۆی هەمەکارەو بکوژو ببڕ بوو، بۆ کاکەڕەشـــی زۆر باش بوو، هەمیشـــە بە پوورزا بانگی دەکرد، بەو هۆیەوە شـــەللاتیو شەقاوەکان لێی دەپرینگانەوەو زاتی نەوەیان نەدەکـــرد خۆ لە قەرەی بدەن، ئاخر ئەو بەندییەی عەبدۆ ڕێزی بگرتبوایە بەختی هەبوو، دەبوو بە ماســـی بێ کێرد لە بەندیخانە. ئەو پوورزایەتییە، خێری بۆ دابۆوە. هەر بەندییەک عەبدۆ ڕقی لـــێ دابگرتبوایە، دەکەوتە بەرپەلاماری دەستە شەقاوەکانیو دارکارییان دەکرد، خاوەو بەرتیلی لە بەندییە پارەدارە دەستو پێ سپی و بێدەســـەڵاتەکانیش وەردەگرت. کاکەڕەش، کاتێک پەنیرو داندۆکی بۆ دەهات، بەشی عەبدۆی دەدا. دیاربوو بە سرتە بە بناگوێی کاکەڕەشی دەچرپاند: پوورزا ئەو کوڕو بابە پارەی چاکیان پێوەیە، بەڵام دەســـتی تۆم شکاوە، دیارە برادەری تـــۆن هیچم پێ ناگوترێ! مام حەمەدەمین خـــۆش خۆش دەیگوت: چاک نەبوو نەتـــۆ لێرەبووی کاکـــەڕەش! ئەگەر تۆ لێـــرە نەبای دەبووینە قەشـــمەرجاری ئەو هەرچیو پەرچیو شەللاتیو شـــەقاوانە، بە خوای بابم ئێمە پیاوی شەڕەبۆکسی نینە، هەوکە شەڕە خڕکە بەرد بوایە لە ئاقاری خۆمان، سەرسەرێ من، حەز دەکەن با هـــەر هەموویان بکەونـــە بەرامبەرم، بەڵام بە خوای ئەمـــن لەو دامربۆکسو مۆکســـەی نازانم! ئەوجا دەڵێن هەندێکیان وەکی بەرانی کەللەی داوێن، بووینە بەرانە کەویســـارەکەی حاجی خارندی لای خۆمان، بەخوای هەقە ئەو شەللاتیو چەقۆکێشـــانە جوودا بکەنەوە. مـــام حەمەدەمین درێژەی بە پرســـیارەکانی دا: کاکەڕەش ئەمـــن بەخۆم دەزانم بۆ لێرەم، بەڵام نازانم چـــی ئەتۆی هێناوەتە ئێرەو لەســـەرچی گیراویو لە کەنگێوە لێرەی؟ کاکەڕەش خـــۆی خۆش کردبوو وەڵامی

بداتــەوە، لە ناکاو عەبدۆی مراقیــب توورتوورەی لێداو هــاواری کرد: خواردنی ئێوارەتــان وەربگرن، ئەوەی دوابکەوێ خواردنــی پێ نادرێ، کاکەڕەش گوتی: مام حەمەدەمین با بڕۆم خواردنی هەرسـێکمان بێنم، هەسـتابووە سەرپێ و گوتی: ئەمشــەو لە دوای نانخواردن گیرانی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە، لەســەری هەتا بنی، وردو درشــتت لە پێــش دادەنێم. فەرهاد لــە دیوارەکانــی بەندیخانەی دەڕوانی بەو کۆلکەخوێندەوارییەی هەیەتی نووســراوەکانی بە حینجە دەخوێندەوە. ئەو دیوارانــە وەک دێوجامەی نەخێشــندراوی، ڕاوەکەوێ دەهاتــە بەرچاو، لەولاوە وێنەی شــیرو خەنجــەرو دەمانچەو تفەنگـو تاژیو کەروێشــکـو دڵی بە تیران ئەنگاوتــەو چاوی پڕ کل و بــرۆی کەوانو موژگانی ڕەشو پەرچەمی شــانەکراو مێژووی دەســتگیرکردن و ئازادکردن، ژمارەی ساڵانی سزای زیندانی، چەند کورتە هەڵبەستێکی ســەقەتو پەقەت و بازووی بەهێزی کرێکارو... بە سەرسامیەوە لــە دیوارو شیشــی میلەی قەفــەزی بەندیخانەکەی دەڕووانــیو ورد دەبووەوە. چاوی کەوتەســەر ئەو ســێ پەنجەرە بچووکەی بەقــەدەر دوو بەژنە زەلام بڵندە، بۆ تەماشــاکردنی لای نەخۆشــخانەی سیلداران و ســینەمای دەبوایە پشتی بۆ یەکتری دابنێینەوە، ئەوجا بەحاڵ چەناگەیان دەگەیشــتە لای ژێری پەنجەرەکە، لە کەلێنی کەتیبە ژەنگاویەکە دەیانڕوانییە دیــوی ئەودیوی بەندیخانەکە، میلەو شیشــی قەفەزی بەندیخانە ئەوەندەی دەستی بەندییەکانی دەگاتێ چەور چەورە باقیمانــدەی ژەنگی هەڵێناوە. تاوەکو بنمیچی هۆڵەکە لەوێش جاڵجاڵۆکە تەونی تۆڕی بەندکراوەکان دەچنێ، هەرشتێک چاوی بکەوێتە سەری لێی ورد دەبێتەوە. لەجێ و بالینگانی بەندییەکانڕا تا دەگاتە ئەو قوفڵە گەورەیەی دەرگا ئاســنەکەی پێ قوفڵدراوە. ســەرنجی کەوتە سەر وێنەی ئەو بەندییەی زنجیر لە ملو دەست

و پێیەوە شـــەتەک دراوە. نووســـینەکان ئامـــاژەی ئەوەبوون ئـــەو بەندیخانەیە لەپێش ئەوان چەندەها کەسی دیکەی بەڕێ کردووە، واتا ئەوان نە یەکەم کەسن‌و نە دواکەســیش دەبن کە دەبنە میوانی بەزۆری ئێرە. دیارە حەپســـخانەش وەکو کاروانســـەرایە. کاکـــەڕەش خواردنی هەرســێکیانی هێنا، ســـمایل کە زەلامی لەدەست زەڕ بووبوو، خواردنەکەی خۆی هێنا لای ئەوان بۆ ئەوەی پێکەوە بیخۆن، چونکـــە بەجۆرێک مەتوو و هۆگری کاکەڕەشـــی بووبوو، لێـــی جیانەدەبووەوە، لە ئاوی مەند دەچوو، بە ئاشـــکرا هەستی پێ دەکرا ئەو بەندیخانەیە کرابوو بە دوو بەش، ئەوانەی تۆمەتەکانیان بەلای سیاســـەت‌و کێشـــەو ململانێی چینایەتی‌و نەتەوەیـــی‌و کۆمەڵایەتییەکانـــی وەک کوشـــتن‌و تۆڵەکردنـــەوە کەوتبوونە لای سەرەوە، لە بنەبانی هۆڵەکە جێگایان گرتبوو. ئەوانەی لەسەر چەقۆکێشی‌و دزی‌و کارە دزێوەکانـــی نێو کۆمەڵگا گیرابوون، کەوتبوونـــە لای دەرگا، چونکە هەر زوو زوو دەگیران‌و ئازاد دەکرانەوە. لە دوای نانخواردن، ســـێ قۆغە چایان وەرگرت‌و بە دەم چاخواردنەوە دەستیان بە قسان کردەوە، کاکەڕەش ڕووی لە مام حەمەدەمینی کـــرد: بە مامی خۆم بڵێم، ئەمـــن بۆ گیرام و لە کەیەوە گیـــراوم و قەرارە کەینێ بەربم؟ بەر لە ســـێ مانگـو چەند ڕۆژێک شـــەوی مەولوودەکەی ماڵی ئێمەت لـــە بیرە کە ئەتـــۆش بانگ کرابووی؟ بەڵـــێ بەڵـــێ دەی دەی دەی چاکم لە بیرە، شـــایەد بەو شـــایەدیەی ئەتۆو هیدۆ شـــەکراوتان دەگێڕا، یەک بە یەک چەند جار بەخێرهاتنـــی میوانەکانتان دەکرد، مەلا ســـاڵح مەولوودەکەی دەخوێندەوە. بە مامی خۆم بڵێم دروســـت ئەو شـــەوەی مەولوودەکـــە، نەمامەکانی ڕەفعەت ئاغای لە دەراوی ژنـــان هەڵبڕدراوەو قەت تاقە نەمامێکـــی بەپێوە نەماوە. مام حەمەدەمین هەموو ئەندامەکانی جەستەی بووە بە گوێ، بەجۆرێک چێژی ئەو

هەواڵە ئۆخژنی خستۆتە دڵی، لەگەڵ هەروشـــەیەک زیاتر لە کاکەڕەشی نزیک دەبێتەوە، خزاوەتە سەر جێگای کاکەڕەشی، خەریکە بچێتە نێو زاریو پاشماوەی قســـەکان بە دەستی خۆی دەربێنێ! دەی دەی! توخوا زوو تەواوی بکە درم تەقی. بۆ بەیانییەکەی ئەو هەواڵە، ڕەفعەت ئاغای شێتو هارکرد، لەگەڵ شکاندنی هەر نەمامێک، شـــکانی کەرامەتو هەیبەتی خـــۆی دەبینی، بە ئابڕووچوونی خۆی دادەنا. لە مەخفەری پۆلیســـی ناحیەی، شکایەتی لە من کردبوو، دیاربوو دەمی مەئموورمەرکەز جەعفەریشـــی چەورکردبوو، بۆیە بەوردی لە دوای سەرەداوێک دەگـــەڕا منی پێ تاوانبار بکات. ســـەرەڕای ئەو هەموو گەواهیـــدەرە قورعانیان خوارد کە من ئەو شـــەوە لە مەولوودەکە خزمەتم کـــردووەو هەندێک لە میوانە دوورەکان ئەو شـــەوە هەر لە ماڵی ئێمە مانەوە، بەس مەئموورمەرکەز جەعفەر، وایدەزانـــی گوێـــزی بۆ دەژمێرن، بەرتیـــل وا بەرچاوی تاریک کردبوو! ئەوە ســـێ مانگی ڕەبەقە ئەمن لێرە گیراوم، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکم لەســـەربێت. بابەو برایەکانم، مەئموور نەمایە کاوڕێکی بۆ نەبەنو سمێڵی چەور نەکەن، تازە بە تازە بە ئومێدم ڕۆژی شـــەممەی بەرم بدەن. بەڵام، ئەوەی باشە، لێرە ئەو سێ مانگەی بەردەوام خوێندوومە لەلای ئەو ئەفەندییەی ســـەری بۆ ســـەرەوە داهێناوە، ناوی جەمال هەولێرییە. بە بیســـتنی هەواڵی ئەوەی کە گوایا کاکەڕەش بەیانی ڕۆژی شـــەممەی بەردەبێت، مام حەمەدەمین ئەبڵەق بوو، ڕەنگێکی هێناو ڕەنگێکی برد، لەگژ فکرانڕا چوو، بەجۆرێک ئەو ڕێژنە پرسیارەی بەتاو دەیباراندە سەر زەینی کاکەڕەشی و پرســـیارکوتی کردبوو، ڕایگرت، لە خەمی بە تەنها مانەوەیان دۆش دامابوو، تەنانەت چاوەکانیشـــی داخســـت، تارمایی ئەو خەوەی کەوتبووە سەر پێڵـــووی چاوەکانی، ڕەوییەوە، بێدەنگ، نغرۆی نێو ڕۆحـــی خۆی بووبوو. لە ناکاو

ســەری هەڵبڕی، ئەوەی لە دڵیدا پەنگی دەخوارد، هێنایە ســەر زمان: بەخوای ئەتۆ بڕۆی ئەو هەرچیو پەرچیو شــەقاوانە هــەر بەزیندوویی کەوڵمان دەکەن، چاوە چــاوی ئەوەیتیان ئەتۆ بڕۆی بەربنە گیانمان! هەوکــە ئەتۆ پێم ناڵێی ئەو هەموو خەڵکە لەسەر چی گیراون؟ هەرجارەی ئاماژەی بۆ یەکێک دەکرد، پێم بڵێ ئەوەی ســەری بە گیزانی تاشیوە دەموچاوی کەلوکرۆم بووە، قەتماغەو ئاسەواری برینی پێوە دیارەو دەهێرژێ[1] دەڵێی شــێرەبۆرەی خۆمانەو بە دە ســەیان لە نێو قوڕاوێ شێلاویانە، ناوی چییەو لەســەر چی گیراوە؟ ئەوە ناوی گەیلان قامەیە، لە بەندیخانەش کەوچکــی بە دیواری تیژکردووەو کردوویــە بە چەقۆ ئەوەندەی لــە بەندیخانەیە نیو هێندە لــە دەرەوە نیە، بۆتە پارچەیەک لە جەســتەی ئەو بەندیخانەیــە. هەرجارێک بەری دەدەن پێخەفەکەی ناباتەوەو ئامانەتی یەکێکی دەداتو پێی دەڵێ زۆرم پێ ناچێ دەمگرنو دەمهێننەوە ئێرە! هەموو خزمەکانی لێــی بێزاربوونە کەســیان نییە، دووجار یان زیاتریش دەســتەبەری بۆ نەکاتو نەبووبێتە کەفیلی، بۆیە ئێســتا پۆلیســیش داوای هیچی لــێ ناکەن، چونکە کەسێک شک نابات ببێتە کەفیلی.

ئەو چوار ئەفەندییەی ســەریان بەیەکەوە ناوە لەسەرخۆ قسان دەکەن، ئەوانە شــیوعین بە تۆمەتی ئــەوە گیراون خەڵکیان هانداوە ســوخرەو بێگاری بۆ ئاغاو دەرەبەگەکان نەکەن و لە دژی ئیستیعمار تێبکۆشن، داوای ئازادی و سەربەخۆیی و کــوڕە چوزانم هەرچی بۆ ئێمە باشــە، دەکەن، هەرچی کەســێک بیەوێ فێری خوێنــدەواری بێت ئەوان ئامادەن دەرســی پێ بڵێن، ئەمن بەو ســێ مانگەی تا

---

١. دەهێرژێ (هێرژان): هەناوەکوتێ و زۆر هیلاکبوون.

ئەندازەیەک فێری خوێندنەوەو نووســین بووم. ئەو کاک ســمایلەش زەلامی لە دەســت زەڕ بووە، بەس ئۆباڵ بە ملم پیاوەکی برنجییە! ئەو کوڕە گەنجەی نوستوە، ئەکرەمە، بە هۆی قســەو قسەلۆکی خەڵکی گوندی دایکی خۆی کوشتووە گوایە پەیوەندی لەگــەڵ پیاوێکی گوندی خۆیان هەبووە. ئەدی ئەو ســۆرە مللەوەزە[١] موو زەردە چاو سۆرە، دەڵێی گای خودارییە غەزریوە، لەگەڵ کەس ئەرقومێ ناکاو ئەلفازی ناگەڕێ دەڵێی میزی گیرایە. ئەوە ئیبۆیە خەڵکی سەر تۆقەرەی قەڵاتێیە لــە ژنەکەی تــوڕە بووە هەرچی فەخفوریو شووشــەواتی ماڵــی هەیە هەمووی شــکاندووە، قەت تاقە پیاڵەو پەرداخێکی بە ســاغی نەهێشــتۆتەوە، ژنەکەشی پوختە شــکایەتی لێکردووەو بە گرتنی دایە. ئەو پیاوە تەبەش پانەی جەمەدانی هێناوەتە تی سەری، ئەها لەگەڵ کوڕو برازاکانی دانیشتووە، ئەوە خەڵکی بەرڕێیە، لەگەڵ خزمەتکارو نۆبەتداری ئاغای بەشەڕ هاتینە لەسەر شەڕەسەی، لەو بەینەی شــەقرچی ئاغای کوژراوە، بە تی خاکەناسی لە تەوقی سەریان داوەو سەری شەق بووەو مردووە، تۆمەتەکەیان کوشــتنی بە ئەنقەســتە، هێشتا محاکەمە نەکراوە ڕەنگە حوکمەکەی قورس بێت. ئەو پیاوەی دەوریان لێداوەو بە قسەکانی پێدەکەنن، ناوی مام شەخســەیە خەڵکی قەڵادزەیە، لەســەر ئەوە گیراوە تەســکەرەی خۆی داوەتە خزمێکی کوێســتانێ[٢]، ئەویش بەتەســکەرەکەوە گیراوە. لەدواییدا مام

---

١. مللەوەز: ملئەستوور و ناقۆڵا.

٢. کوێستانێ: مەبەست لە خۆرهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ئێرانێ)یە. لە لۆغەی کۆندا ئەو بەشەی کوردستان کە دواتر بەر وڵاتی عێراقێ کەوت، دەگوترا گەرمێن و ئەو بەشەش کە بەر وڵاتی ئێرانی کەوت دەگوترا کوێستان و، ئێستاش شوێنەواری ئەو لۆغەتە هەر ماوە و جارجارە بەکاردەهێنرێ.

شەخسەشیان گرتوە. ئەو دوو کەسەی لەپێش مام شەخسەی دانیشتوون، هەر لە خوتو خۆڕایی گیراون، دوازدە شـــاهیدیان هەیە کە بێتاوانن کەچی دەیانەوێ گووی وشکیان بەقونێوە بنووسێنن! ئەوانەی بەبێ تاوان لێرە پەستراون کەم نین!

مام حەمەدەمین مەبەســـتی ئەوەبوو کاکەڕەش لە ناساندنی کەسایەتیو جـــۆری تۆمەتەکانیان و ناوی بەندییەکان، زانیاری وردی بۆ بخاتە ڕوو، دەیزانی ناچارە ناوی ئەندامەکانی ئەو خێزانە تازەیەی خۆی بزانێ. پرسی: ئەو چاومۆنە کڵاوسپییەی دەنکە تەزبیحی بەردەداتەوەو لە بن لێوان پستەپستێک دەکا بێ ئەوەی کەس لێی حاڵی بێت، کێیە؟ ئەهاگوێی قوڵاغ کردییەو هەستی لە قسەی ئەو ســـێ ئەفەندییەی ڕاگرتییە، بزانی چی دەڵێن! پێم وابێ تەریک کەتییەو کەس حەز لە چارەی ناکا، نەک هەر ئێوە، هەتتا شـــەقاوەو چەقووکێشەکانیش بەچاوێکی پڕ لە ڕقەوە تەماشای دەکەن دەڵێی پیسکەی دوور ئاواییە! کاکەڕەش گوتی: ئەوە (ئایدن جاسووس)ی دەرێنێ، گوایا بە تۆمەتی سیخوڕی بۆ تورکیا دەستگیرکراوە، وەک باس دەکەن ئەو جاسووسیە، لە باب و باپیریەوە بە میرات لـــۆی بەجێماوە. باپیری لە شـــاری کەرکوکێ، زەمانی عوســـمانییەکان وەک دەستکێشو چاوساغ کەوتۆتە پێش سەربازو جەندرمەی تورک، بۆ هەڵکوتانە ســـەر گەڕەکی جوولەکە کوردەکان، تاوەکو بیانگرن بۆ ســـەفەربەلکو ڕاپێچی ســـەربازیی زۆرەملێـــی جەنگیان بکەن، یان چەند جارێک پـــارەی بەدەل بدەن. یەک لەو مەلایانە بووە کە لە بری ئەو جاسوســـی و چاوساغییە بۆ تورکەکان، خەڵاتی لیرەی زێڕ، لە جۆری لیرەی ڕەشادی، وەرگرتووە!

ئایدن جاســـووس، لە خوێنو پشـــتی ئەو کەســـەیە لە پەستیو بەدخویی یەک مـــووی لە باوکی هەڵنەبـــواردووە، میقرۆبی ئەو کارە پیســـەی، خوێنی

ئالوودە کردووە، ئێستاش جاسووسی بۆ حکومەت دەکات، بۆیە کەس لێی نزیک نابێتەوە. هەتتا هەتیوبازەکانیش بێزی لێدەکەنەوەو بەهاوشانی خۆیانی نازانن، پێیان شەرمە لەگەڵی بدوێن، گومان دەکرێ هەر حکومەت بە ئەنقەست هێنابی بۆ ئەو بەندیخانەیە بۆ ئەوەی جاسووسییان بۆ بکات، بە تایبەتی لەسەر بەندییە سیاسییەکان، ئەوەتا بەردەوام بەدوای ئەو چوار مامۆستایەوەیە کە زیندانی سیاسین. مام حەمەدەمین گوتی: ڕەحمەت لە باپیرانمان گوتوویانە: «تۆرکە لە جێی بە میز دەبێ، کوڕ لە بابیرا حیز دەبێ!». لەو کاتەدا عەبدۆی مراقیبی بەندیخانە توورتوورەی لێدا: کاتی خەوتنە! ئیدی هەرکەسەو خزایە سەر جێگاو بالینگانی خۆی. کاکەڕەش گوتی: مام حەمەدەمین، بەیانی ئەگەر عومر باقی بێت و بە زیندووییماینەوە، سەرجەلەو ڕەچەڵەک و ماجەرای هەموو بەندییەکانت پێدەڵێم. فەرهاد لەسەر گازی پشتێ ڕاکشاوە، چاو بە مۆلەق لە گۆشەی بنمیچی هۆڵەکەی دەڕوانی، سەرنجی کەوتە سەر ئەو جاڵجاڵۆکەیەی کە پێی وابوو تەونی ئایندەی ئەوانی دەچنی. ڕووناکی هۆڵی نووستنی بەندییەکان کوژایەوە، لێ مام حەمەدەمین کۆڵی نەدەدا لە تەنیشتی کاکەڕەشی ڕاکشابوو، دەیویست تا خەویان لێدەکەوێ، کەڵک لەو چەند خولەکەش وەربگرێ: بەڕاست کاکەڕەش ئەورۆ گوێم لێبوو گەیلان قامە بەو گەنجەی لای دەرگای دەگوت ڕۆڵە تۆ یاغنیشی دوو چەقۆ تەرحت دەدەمێ! دوو چەقۆ تەرح یانی چی؟ کاکەڕەش گوتی: دوو چەقۆ تەرحت دەدەمێ یانی ڕادەوەستم بە هەموو کەیفی خۆت دوو چەقۆم لێبدە، ئەوکاتە من دەست بە شەڕێ دەکەم! مام حەمەدەمین گوتی: حای، وەڵڵاهی دوو چەقۆی بە هەموو کەیفی خۆمی لێبدەم، دەبی تەرسی بە گۆڕێ وەربکەم و فەڕاقی ڕەشی لێببڕم!

کاکــەڕەش تاوەکو ئازادکرا، هەوڵی دەدا ناوی زیندانییەکانو کەســایەتیو جۆری تۆمەتەکانیان بۆ مام حەمەدەمینی ڕوون بکاتەوە.



# ١٠

ڕۆســـتەم، بەرلەوەی باری دەروونـــی تێک بچێت، دەســـتی خەڵکی دەگرتو زۆرجار پارەشـــی بە قەرز دەدانێ. لە هەندێک شـــوێن هەر بە ڕۆستەمی بازرگان ناویان دەهێنا. لەدوای ئەوەش کە باری دەروونی تێک چوو، خەڵک ئامادە نەبوون بە ڕۆستەمەشێت ناوی بێنن، وەکو جاران بانگیان دەکرد کاک ڕۆستەم. بەڵام هەر پاشناو و ناتۆرەیەک لە زاری ڕەفعەت ئاغای دەهاتەدەر، زۆربەی خەڵک لاسایيان دەکـــردەوە. ئاغا، گەورەیی خۆی لە بچووککردنەوەی بەرامبەرەکەیدا دەبینی، بۆیە پاشناوی شێت، ژنانی، کەرحیز، قاوەچی، گەڕۆک، چینکۆ، سەرئاسن، کوندەمیزو چەندیـــن ناتۆرەی دیکە کە لایـــەق بە مرۆڤەکان نەبوو، هەمـــووی لە داهێنانی ڕەفعەت ئاغای بوون، بۆ ئەوەی خۆیان لە کرمانجەکان بە ماقووڵتر نیشـــان بدەن، یەکیش لەوانەی ئاغا ناتۆرەی بۆ دروست کردبوو، ساڵە بوو.

ســـاڵە، زۆرخێـــزان بوو، ژنەکەی نەســـاغ بوو، بـــە هەموو کارەکانـــی ماڵەوە ڕانەدەگەیشـــت، بۆیە ساڵە جاروبار دوور لە چاوی خەڵکی ئاوایی، یارمەتی دەدا. ڕۆژێک، یەک لە پیاوەکانی ڕەفعەت ئاغای، ســـاڵەی بینیبوو لەسەر سینییەک پرپۆرەی بۆ جووجکان کردبوو، ئەویش وردو باریک بۆ ئاغای گێڕابووەوە، ڕەفعەت ئاغاش لەدوای ساڵەی ناردبوو پێیگوتبوو شەرم ناکەی ئیشی ژنان دەکەی؟ ئەتۆ

چ جۆرە پیاوێکی؟ لێرە بەدواوە بانگت دەکەم سالە پڕپۆرە!

ڕۆستەمەشـێت، هەر کە بیسـتی کاکەڕەشی حاجی سـمایلی هاتۆتەوە ئاوایـیو لە بەندیخانە ئازاد کراوە، هەیپیێی لێکرد بە هەرەداوان بە کۆلانەکانی گوندیدا خۆی تێکەلاوی ئاپۆرای خەلکی کرد، کە ژنو منداڵو تەواوی خەلکی ئاوایـی بێجگە لە ئاغاکانو گـۆردەو خزمەتکارەکان، بە بیسـتنی هاتنەوەی کاکەڕەشی حاجی سـمایلی، خۆشـحاڵ بوون، منداڵان پێیان سەیر بوو بچنە دیدەنی کەسـێک لە حەپسـخانە ئازادکراوە، بۆ ئەوەی بزانن حەپسـخانە چ گۆڕانکاریو ئاسەوارێک لەسەر ڕوخساری مرۆڤ جێ دەهێڵێ.

ڕۆسـتەم، چاوی بە هەرکەسێک دەکەوت، ژن بایە یان پیاو، منداڵ بایە یان پیر، دەیگوت: چەندم بە کاکەڕەشـی حاجی سـمایلی گوت: پیاوی چاک بە مەچووە شاری، بە قسەی نەکردم! دە بیخۆ دەی! ئاوا لە شاری حەپست دەکەن، ئـەو خەڵکە هێندە بێ ئەقڵن وا دەزانن ئەمن بۆ خۆمە نەسـیحەتیان دەکەم مەچوونە شاری، وا دەزانن لە شاری هەنگوینیان بۆ ڕۆکراوە، شەویلاکم شل بوو هەرچەندی بڵێم کاکە مەچوونە شـاری، بابم مەچوونە شـاری، ئاخر لە گوندی تەشتی زێڕت لەسەر سەری بێت کەس دەستی بۆ نابات!

ڕۆستەمەشـێت، هەرکەسێکی دەیبینی، بەڵێنی لـێ وەردەگرت کە ناچێتە شاریو گوندەکەی بەجێ ناهێڵێ. لەگەڵ وەرگرتنی هەر بەڵێنێک لە هەرکەسێک، گەز گەز باڵای دەکردو ئاسوودەیی دەڕژایە دڵیەوە.

بەرلەوەی ئامێز لە کاکەڕەشـی بدات و بەخێرهاتنەوەی بکات، هەر لەسەر کۆسـپەی دەرگایڕا گوتی: بە قسـەت نەکردم کاکەڕەش چووی بۆ شاری، بۆیە حەپسیان کردی! کاکەڕەش گوتی: ڕۆسـتەم ئەتۆ ڕاست دەکەی، هەرکەسێک

گوندو مـــەزراو ئاقاری خۆی بەجێ بهێڵێ، کەســـایەتیو هاووڵاتیبوونی خۆی لاســـەنگ دەکات، بەڵێنـــت پێدەدەم ئیدی ناچمە شـــاری، ئەوجا خۆ ئەمن بە خۆشـــی خۆم نەچووم بۆ شـــاری، پۆلیس ئەمنیان گرتو بەبێ خواســـتی خۆم بردمیانە شـــاری و حەپســـیان کردم. لەدوای یەکتر لـــە ئامێزگرتن، کاکەڕەش ڕۆستەمەشێتی لە تەنیشتی خۆی داناو گرنگییەکی تایبەتی پێ دا، پەنجەکانی خســـتبووە نێو پەنجەی ڕۆستەمەشێتی، پەنجەیان تێکهەڵکێشابوو، دەستی ڕۆستەمەشـــێتی لەســـەر ڕانی خۆی بەخۆیـــەوەی نوســـاندبوو، ئەویش هەر لەســـەر یاســـینی گۆلکێ[1] بوو: وەرە پیاوبە بەڵێنم پێبدە بڵێ شەرت بێ لە شـــەرتی پیاوان جارێکی دیکە ناچمەوە شـــاری! کاکەڕەشیش خەریک بوو بە سوێندانەوە ڕەشبێتەوە هێندەی سوێندی کەسکو سوّری بۆ ڕۆستەمی خوارد، کە ئەوجارەیان ڕوو لە شـــاری ناکاتەوە. هەرکاتێـــک یەکێک بەڵێنی تۆکمەی بە ڕۆســـتەمی دەدا کە ناچێتە شاری، ئاســـوودەیی بە هەموو گیان و بوونیدا گوزەری دەکرد، هەستی بە سەرکەوتنێکی یەکجار گەورە دەکرد. باڵاو قەڵافەتی کاکەڕەشی حاجی سمایلی و ڕۆستەمەشێتی، وەکو یەکتری بوون، جلوبەرگیان بۆ یەکتری دەبوو. کاکەڕەش بانگی برازاکەی خۆی کرد: ئەو کورتەکو شەروارە

---

١. یاسینی گۆلکێ: ئیدیۆمێکە لەوەوە هاتووە کابرایەک گۆلکێکی هەبووە، زۆری خۆشویستووە، گۆلکەکە نەخۆشکەوتووە، کابرا داوای لە مەلای گوندی کردووە بێت یاسینی لەسەر بخوێنێ، مەلاش دەڵێ: یاسین لەسەر ئاژەڵ ناخوێندرێ. دوای ئەوەی گۆلکەکە دەمرێ، خاوەنەکەی، لە هەموو کۆڕ و بۆنەیەکدا، هەرباسێک کرابایەوە، دەیگوت: مامۆستا ئەگەر یاسینت لەسەر گوێلکەکەم خوێندبا، نەدەمرد، مەلاش دەیگوت: دیسان هاتینەوە سەر یاسینی گۆلکی!

ڕەشــە مراد خانیەکەم بۆ بێنــە، لەنێو باولە ســوورەکەی خەلانەیە[1]، دەیدەم بە ڕۆســتەمی. کاتێک کورتەکـو شەرواره ڕەشــەکەیان بۆ هێنا، لەبەردەمی ڕۆســتەمی داناو گوتی: ئەوەش بۆ تۆ ڕۆســتەم گیان! ڕۆستەمیش بەرلەوەی لەبەری بکات، داوای دەرزی و داوی کرد، دەرزی و داویان بۆ هێنا، بەڵام دەزووی ڕەشــیان نەبوو، دەزووی ســپییان بۆ هێنابوو، ڕۆستەمەشێت کەوتە دوورینو تەقەڵدانی گیرفانەکانی کورتەکـو شــەروارەکەی. ئــەو گیرفانانەی دابووە بەر تەقەڵی شــاشو واشو گیرفانــی هەموو بــە دەرزیو داو دووری. قەت جلی لەبــەر نەدەکرد تاوەکو هەموو گیرفانەکانــی نەدووریبان. کاکەڕەش گوتی: دە هەڵســە هەڕوو لەبەریان بکە با بزانم لێت جوانە! ڕۆستەمەشێت لە بەرامبەر هــەر داوایەک کە لێت بکردبایە مەرجی خۆی هەبوو، مەرجەکەیشــی چەند ســوێندێک بوو کە ئەتۆ ناچیە شاری! بۆیە بە کاکەڕەشی گوت: لەبەری ناکەم تاوەکو سوێندم بۆ نەخۆی کە ناچیە شاری! وەک ئەوەی لەوەپێش بەشێلکە[2] ســوێندی بۆ نەخواردبێــت! ناچار بوو ســوێندی خوارد کە ناچێتە شــاری و گوندەکەیان جێ ناهێڵێ، ئەوکات ڕۆستەمەشــێت گوتی: ئێستا دڵم داکەوت، ئەوا لەبەری دەکەمو بە قســەت دەکەم. چوو، کورتەکـو شەروارەکەی پۆشیو هاتەوە مەجریسێ. هەموویان گوتیان ڕۆستەم زۆرت لــێ جوانە، پۆتی هەموو ئاغای دزەییانت شکاند، هێندە قۆزی! کاکەڕەش گوتی: خزمینە ڕۆستەم ڕاست دەکات ئەو بۆ ئێمەیەتی کە دەڵێ مەچنە شــاری، دەبێ هەموومان بە قسەی بکەین، زەوی و گونــدو مەزرای خۆمان جێ نەهێڵینو نەچینە شــاری، ئێمە

---

١. خەلانە: بن هەرزاڵ.

٢. شێلکە: ڕیز، سەلیە.

خاوەنی زەوی نیـــن، زەوی خاوەنی ئێمەیە، بۆیە دەبێت وەکو دایک تەماشـــای بکەیـــن، قەت نابێت لێـــی جیاببینەوە. لە گونـــدی، ئاریکاریی یەکتری هەیە، خۆشەویستی هەیە، دەســـتپاکی هەیە، سڵاو لە یەکترکردن هەیە، هەموومان خزمو کەسوکاری یەکترینو دڵمان بۆ یەکتری دەسووتێ.

ڕۆســـتەم، بەرلەوەی شـــێت بێتو بـــاری دەروونی تێک بچێـــت، خاوەنی کەســـایەتییەکی بەهێزبوو، پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشـــانەی تێکســـمڕاوی توندوتـــۆڵ و زرنگ بـــوو، ڕومەتی خڕوپڕو کوڵکن، مووی ســـینگی هەتا بەر چەناگـــەی بەگەردنیـــدا هەڵزنابوو، لـــە کەلێنی قۆپچەی کراســـەکەی، مووە ڕەشـــەکانی سینگی ســـەریان وەدەرنابوو، مووی قۆڵ و باســـکی بە گروازە بوو. هەر بەڕاســـتی باوکی زانیبووی ناوی لێبنێ ڕۆســـتەم، چونکە بەزیادەوە لێی دەوەشایەوەو ناوەکەی خەسار نەکردبوو، بە هەموو باراندا ڕۆستەمایەتیی تێدا ڕەنگی دابۆوە، دەتگوت خودا هەر بۆ ئەوەی دروســـت کردووە یارمەتی خەڵکی بداتو خۆشی بوێن.

ڕۆستەم بەر لە چوار ساڵ، کە ئەوکات حاڵی لـێ نەگۆڕابوو، حاڵ و گوزەرانی لە زۆر کەســـی گوندی باشـــتربوو، زەکاتی دەدایە هەژارەکان. بەهۆی کاسبیو کڕینو فرۆشتنەوە سەرقاڵ بوو، خێزانەکەی بریتی بوو لە خۆیو ژنیو دایکی و خوشکی و دوو منداڵی سەرکەو بنکە. بازرگانی کڕینو فرۆشتنی لە مابەینی کوردســـتانو بەغـــدادا دەکرد، گوێزو قەزوانو ســـماق و پێســـتەو خوریی لە هەولێرێڕا باردەکرد بۆ بەغدا، لەوێ ســـاغی دەکردنەوەو دەگەڕایەوە کوردستان. ئەوانـــەی ئـــەو کاڵایانەیان بەرهەم دەهێنا، ڕۆســـتەمیان بە چاکی دەناســـی و متمانەیان پێـــی هەبوو، بۆیە بەرهەمەکانیان ڕادەســـتی ڕۆســـتەمی دەکرد،

بێئەوەی پارەی پێشــوەختەی لێوەربگرن، تەنها لەسەر نرخەکەی پێکدەهاتن‌و بەرهەمەکانی دەبرد بۆ بەغدا دەیفرۆشت‌و پارەکەی بۆ فرۆشیارەکان دەهێنایەوە. خۆ ئەگەر پارەکەش جاری وا هەبوو دوادەکەوت، خەڵکەکە هێندەیان متمانە بە ڕۆستەمی هەبوو هەر باسیان لێوەنەدەکرد، تا هەمووی ساغ دەکردەوە. ڕۆستەم، ژیانی لەسەر قازانجی ئەو بەرهەمانەبوو کە دەیبردنە بەغدایە.

ڕۆســـتەمی بازرگان، ئەوە دوایین کەرەتی بوو بچێتــە بەغداو، ئیدی لەوە بــەدوا قەت بەغدای نەدیتـــەوە. ڕۆژێکی گەرمی کۆتایی بەهــارێ بوو، تازە، دەســـتە دەســـتە جەوبرەکانی هەرەوەز لە بڕینەوەی خوری مەڕەکان بووبوونەوە، هەر مەڕدارەو خوریەکانی لەســـەریەک هەڵچنیوە، ئامادەیە بۆ هێنانە دیاری کڕیارەکان. ڕۆستەم هاتە تەماشــای خوریەکان‌و دوو سێ خوری هەریەکەو لە ڕیزێــک دەرهێناو کردنییەوە، بۆ ئەوەی بزانـــێ گنجی[١] و بەرمیزەی[٢] زۆری لەگەڵ لوولدراوە یان خورییەکان خاوێنن! لە دوای مامرەتکردن‌و کێشمەکێشێکی زۆر لەگەڵ مەڕدارەکان پێکهات لەســـەر نرخی جووتی خوری، چونکە دەبوایە بەجووت خورییەکان بکڕێ‌و بەقەپان‌و کێشان لە بەغدا بیفرۆشێ، بۆیە ڕۆستەم دەبوایە بزانێ جووتی خوریەکان چەندەو، وەزنیان، بە چەند خوریان هۆقەیەکەو، باتمانی خوری چەند کیلۆ دەردەچێت! ئەو ڕۆژە ڕۆســـتەم دوو لۆری پڕاوپڕی لە شیلفی شیشکوتی خوری بارکردو، بەغدا خۆت بگرەو هاتم!

---

١. گنجی: ئەو تیسکە خورییەی خوار دونگی مەڕ، کە پاشەڕۆی پێدا دەڕژێ، بە خورییەکەوە ڕەق دەبێتەوە. لە هێندێک شوێنی کوردستان (قلقلە)یشی پێدەگوترێ.

٢. بەرمیزە: ئەو خوریەی کە میزی زۆر پێدا دەڕژێ، زەرد هەڵدەگەڕێ لە میزدا دەسووتێ.

لۆریە خوریەک بۆ کارگەی ڕستنو چنین، لۆرییەکەی دیکەش بۆ کارگەی
،تۆی فەتاح پاشا). هەردووک شوێنەکە تا ڕادەیەک لە دەرەوەی شارن، ترافیکی
ۆمبێلەکان نابنە ڕێگر لە پێش لۆرییەکان، بە بەراورد لەگەڵ ناوجەرگەی بازاڕی
ریجەو شوێنە جەنجاڵەکان، بۆیە هەر بە ئاسانی گەیشتنە شوێنی مەبەست.
کەمجار، لە دەرگای کارگەی ڕستنو چنین، یەکەم باری قەپان کردو کرێکارەکان
بیان کردو پارەکەی وەرگرت. پاشـــان بارەکەی کارگەی (پەتۆی فەتاح پاشا)شی
ی کردو پارەی ئەویشـــی وەرگرت، کرێی لۆریەکانی دایە شـــۆفێرەکان، چونکە
ۆفێرەکان بەپەلە بوون بڕۆن بۆ گەراجی باربەری لە شـــەقامی شێخ عومەر بۆ
ەی بە خاڵی نەگەڕێنەوە، بەڵکو باریان بدەنێ بۆ کوردســـتان بە موسڵیشەوە.
لە بەغداوە بۆ کوردســـتان یەکجار زۆربوو چونکە پایتەختی عێراقەو هەموو
ارەکان پێداویســـتیەکانیان لە بەغداوە دەکڕیو لەوێ دابین دەکرا. ڕۆســـتەم
ئاوایی لە شـــۆفێرەکان کردو بەرەو نێو بازاڕی بەغدایە، کەوتەڕێ. بەتایبەتی
قامی جمهوریو شەقامی ڕەشـــید، کە مەڵبەندی کۆبوونەوەی کوردەکان بوو،
کەی لە باخەڵی توند قایم کردبوو هەموو هەستو زەینی لەلای پارەکەی بوو، لە
ی گیرفانبڕەکانو دزە شارەزاکانی بەغدایە، جێی پێ جێ نەبوو، ترسو نیگەرانی
دیاربوو. ناهەقی نەبوو، هەرکەسێک بیویستبا بچێتە بەغدا، بەر لە هەرشت
ندەگوت ئاگات لە جزدانو پارەکـــەت بێت، گیرفانبڕ لێت نەدزن! کەس نەبوو
چیرۆکی گیرفانبڕینو دزی شـــاری بەغدای نەبیستبێت! زۆر کەس بە هۆی
ۆلێدان لە گیرفانی و، بەهۆی دەســـت داگرتنی دزەکان و هەستیاریی شوێن و
دزیەکە، زیاد لە پێویســـت چەقۆیان داگرتووە، کابرا بریندارکراوە، ئی واش
وە هەر لەجێێ خۆی گیانی لەدەســـتداوە! ڕۆســـتەم، بەدەم ڕێگاوە نێوە نێوە

گورگەئاورێکی لە دوای خۆی دەدایەوە، بۆ ئەوەی دڵنیابێت کەسی بەدواوە نییە! هۆکاری مانەوەی ڕۆستەم لە بەغدایە، ئەوەبوو کە جاری پێشوو سەد پێستەی دابوو بە حاجی سەلبوخ، پارەکەی وەرنەگرتبوو، دەبوایە ئەو کەرەتەی وەریبگرێ. لەکاتی ڕێ ڕۆیشتنی نێو بازاڕی بەغدایێ، هەرکەسێک لێی نزیک دەبۆوە بە گوومانەوە لێی دەڕوانی و دووری لێدەکرد. خەریک بوو لە خۆی بمیزێ، نەیدەوێرا بچێتە مزگەوتێک بۆ میزکردن، وایدەزانی ئەوانەی دێنە مزگەوتێ، هەموویان بەدوای وی کەوتوون پارەکەی لێ بدزن. پێی وابوو ئاودەستەکانی مزگەوتێ بۆ قیرەبڕکردنی، شوێنێکی چۆڵە. کاتێک لە شەقامی جمهوری دەیویست بچێت بۆ شەقامی ڕەشید، دیقەتی کەوتەسەر شوێنێکی لاچەپ لە بەینی دوو تەلاری بەرز، بینی هەر بابایە ڕووی لە دیواری تەلارەکانەو بەپێوە بە دیوارەکان هەڵدەمیزی. ڕۆستەمیش، خۆی بە گۆڕەپانی میزکردنێدا دەکات. دیوارەکان، بە ئەندازەی مەترێک بڵندی، شوێنەواری پەلامیزەی ڕێبوارانی پێوە دیارەو لە خوارێ گۆمیلکەمیزەکان پەنداوی داوەتەوە، هاڵاوی بۆنمیزەکە خنکێنەرو ناتەندروستن، سینگ دەئاوسێنێو چاو دەبرژێنێتەوە.

ڕۆستەم گوتی، وامدەزانی هەر لە مابەینی گوندەکانو دەوری ئاشەکانی لای خۆمان کەرمیز هەیە! وەلێ دیارە لە شاری بەغدایێش کەرمیز هەیە! لەکاتی پەڕینەوەی لە شەقامە جەنجاڵ و دوو سێ ڕیز لە ئۆتۆمبێلەکان، ئەوەندەی دوکەڵی ئاگجۆزی ئۆتۆمبێلەکان هەڵمژییە کۆخەی دەهاتێ. ڕۆستەم یەکەمجاری نەبوو بچێتە بەغداو موسڵێ، بەس هیچجارێک ئاوا بە تەنها نەبووەو قەتیش ئەو پارە زۆرەی پێ نەبووە، بۆیە بە جارەکێ زەندەقی لە دزەکانی بەغدایێ چووبوو، وەک لە غەیبەوە پێیان گوتبێ ئەو کەرەتە

تووشی کارەســاتێک دەبێت! بۆیە هەمیشە چاشمیش و لە ئامادەباشیدا بوو، لە ســێبەری خۆی دەڕەوییەوە، بەجۆرێک خــۆی تەڵقین کردبوو وەک بەردەوام تارمایی دزێکی بــەدواوە بێت، زۆرجــار لە بەردەمی دوکانێک دەســتبەجێ دەوەستاو لە ڕێبوارانی دوای خۆی دەڕوانی، هەتاوەکو هەموویان بە بەردەمیدا تێپەڕدەبوون ئەوسا دەستی بە ڕۆیشتن دەکردەوە. ڕۆستەم بە هۆی ئەو گومانی دزییە لە هەرکەســێک لە دەوروبەری و قوشقیبوونی، سەرنجی چەند دزێکی بــۆ لای خۆی ڕاکێشــا. دزەکان دڵنیابوون کە ئەو پیاوە، پارە، زێڕ یان شــتێکی گرانبایی پێیە، بۆیە، شــوێنی دەکەون. دزەکان هەمــوو جۆرەکانی گیرفانبڕی و دزیــی لەســەر تاقی دەکەنەوە، بە هیچ شــێوەیەک زەفەری پــێ نابەن. لە نــاکاو چەند دزێکی دیکەش دەکەونە شــوێنیو چاودێریکردنی. زۆربەی دزو گیرفانبڕەکانی بەغدا یەکتری دەناســن، بۆیە لە دزەکانی بەرایێ دەپرسن ئایا لە مێژە بەدوایەوەن؟ دڵنیان پارەو شــتی گرانبەهای پێیە؟ دزەکانی بەرایێ دەڵێن زۆر وریایــەو هەرچەنــدی دەکەین هیچ ڕێی ناچنێ. دزە تــازەکان، بە دزەکانی بەرایێ دەڵێن: هەر لە گۆترە بە ئێمەی بفرۆشنەوە، ئێمە چارەی دەکەین! دزەکانی بەرایێ، دەزانن کیســەی پڕە، بۆیە دەســتبەرداری نابنو دەڵێن ئێمە لە پێش نیوەڕۆوە بەدوایەوەین، نایفرۆشینەوە، بەڵام دەتوانین ببین بە شەریک و برابەش و، پێکەوە بە هەرجۆرێک بێت ڕووتی دەکەینەوە، هەرچیمان دەســتکەوت لە نێوان خۆمان وەک برا دووبەشی دەکەین. بەوجۆرە، دەست دەخەنە نێو دەستی یەکتریو شافلخێر لە یەکتری دەکەن.

ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارێ بەدوای ڕۆستەمەوە بوون، بە هیچ شێوەیەک زەفەری پێ نابەن. ڕۆستەم زۆر خۆی لە شوێنی جەنجاڵی وەک بازاڕی شۆریجە نادات،

ناچێتە ئەو شوێنانەی دزیو گیرفانبڕیی تێدا ئاسانترە، تا دەگاتە شوێنی ئاسایی. ڕۆستەم، هەرکەسێک لێی نزیک دەبێتەوە دەیخاتە بەر لێزمەی گومان. دوو دەستە لە دزە گیرفانبڕە هەرە شارەزاو بە ئەزموونەکانی شاری بەغدای، لەو دزانەی کە کلی لە چاوان دەدزن، بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە! دوو لە دزەکان بەوبەری شەقامەکە بەپەلە پێش ڕۆستەمی دەکەونەوە وەک ئەو پیلانەی دایانڕشتووە، بە تیژی تێدەپەڕن، بەرلەوەی ڕۆستەم بگاتە لایان، بەیەکتری هەڵدەپژێنو دەیکەنە شەڕێکی شانۆگەری، بە ئومێدی ئەوەی ڕۆستەم بچێتە نێوانیان و نێوبژیيان بکات و لە کاتی نێوبژی زەفەری پێ ببەن، لەوکاتەی لە بەینی هەردووکیانە پارەکەی لێ بدزن. بەڵام ڕۆستەم بەلایاندا تیژ تێدەپەڕێ و گرنگییان پێ نادات و بەرەو ئەوسەری شەقامی ڕەشید لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبێت. کارێکی ئەوتۆی لە بازاڕی بەغدا نەماوە، پارەی سەد پێستەکەشی وەرگرتووەو سەردانی دوکاندارە کڕیارەکانی ئەو بەرهەمانەی کوردستانی کردووەو لیستی داواکاری هەنگوینو ڕۆنەکەرەو خوریو تەواوی داواکارییەکانی لێ وەرگرتوونو دیاری بۆ ژن دوو منداڵە ساواکەی کڕیوە. کاتی ئەوە هاتووە لە هۆتێلێک جێگای مانەوەی شەوی بگرێ.

تویژاڵێک دوکەڵ ئاسمانی بەغدای داپۆشیوە، دواتیشکی خۆر لەبەر زگی ئەو تویژاڵە دوکەڵانەی کارگەکانی لای خۆرئاوای بەغدا دەدات، زەردەپەڕ ئاسمانی ئەو ئێوارەیەی شاری بەغدای خوێناوی کردووە، پرچی نارنجی خۆر، وەک لیزگەی مرواریو کەلافە ئاوریشمێکی زەرد خۆی لە گەردنی بەرزی باڵەخانەکانی شاری بەغدا هاڵاندووە. ڕۆستەم لەو دەرگایەی (هوتێل ...) بە پلیکانەکانی دالانەکەدا سەردەکەوێ، لەدوای چەند پێچدانەوەیەک خۆی لە

پرسـگەی هۆتێلەکە لە بەردەمی بەڕێوەبەری هۆتێلەکە دیتەوەو سـڵاوێکی لێکـردو ئەویش فەرمووی لێکرد. ڕۆسـتەم پرسـیاری جێـگای لێکرد: ئایا جێگاتان مـاوە؟ بەڕێوەبەرەکە پێیگوت: بەڵێ بچۆ ژووری پێنج چوار تەختی نوسـتنی لێیە کام تەختت بەدڵیە لەسەری ڕاکشێو سێ تەختەکەی دیکە بۆ ئەو میوانانەی لەدوای تۆوە دێن. ڕۆستەم ڕوو دەکاتە بەڕێوەبەرەکەو پێی دەڵێ ئەمن لەگەڵ هیچکەس لە ژورێک ناخەوم چجای لەگەڵ سێ کەس، ئەمن هەر چـوار تەختەکە کرێ دەکەم و پارەکەی چەنـدە هەمووی دەدەم. لەدوای ئەوەی تەسکەرەی لـێ وەردەگرێو ناوی دەنووسێو پارەکەی لـێ وەردەگرێ، کلیلی ژمارە پێنجی پێ دەدات کە لە پارچەدارێکی سەری کلیلەکە نوسراوە ژمارە پێنج. بەو شێوەیە ڕۆسـتەم ژوورێکی چوار تەختی بە تەنها بۆ خۆی دەگرێ. کە دەچێتە ژوورەوە سەیرێکی پەنجەرەو دەرگاو دارودیواری ژوورەکە دەکات بۆ دڵنیابوون لە قایمی شـوێنەکە چونکە هەموو خەیاڵ و هەستی لەلای پارەکەی باخەڵیەتی، بە هیـوای ئەوەی بەزووتریـن کات بگەڕێتەوە گوندیو هەقو حیسـابی ئەو خەڵکە بدات کە بەرهەمەکانی لـێ وەرگرتوون.

کاتێک دزەکان بەوە دەزانن، قەرەمی دەسـت و پێیان دەشـکێ، کە هەموو ئومێدیان بەو شـەوەیە پارەکەی لـێ بدزن. لـە چایخانەی ژێـر هۆتێلەکە کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی نەخشـەیەکی نوێ دابڕێژن بۆ بڕینی گیرفانی ڕۆستەمی. هەریەکەو ڕاو پێشـنیاری خۆی دەخاتەڕوو بـۆ ئەنجامدانی گوناهێک کە لە کۆتایی سەرنویشتی خێزانێکی نغرۆکرد! دزێک دەڵێ ئەو پیاوە بە ئەندازەیەک قوشقی و زیتە، دزیکردن لێی ئاستەمە، مەگەر کڵاوی سەخرەجندمان لەسەری بێتو نەمانبینێ ئەوجا بتوانین دزی لـێ بکەین! ئەو نەخشە کێشانە، قەدەری

نادیاری ژیانی ئایندەی ڕۆســـتەمیان دەڕست! پیلان و پێشنیاری هەریەک لە دزەکان بۆ ئەوەیە بزانن چۆن چۆنی زەفەر بە ڕۆســـتەمی بەرن. وەک ڕەوەگورگ لەو نێوە ملۆمۆ دەکەن، وەک ئەو کەمتیارانەی چاودێری نێچیرێک بکەن!

دزەکان وەک پیشەی نامەردانەیان، هەمیشە داشکاندنیان هەیە لە ئەخلاق! شەو ڕاشـــکاوە، زۆربەی خەڵک نوقمی خەوە، وەک ئەو نەخشەی دایانڕشتووە لەدوای ئەوەی دڵنیابوون ئەو هۆتێلە شـــوێنی بۆ مانەوەی میوانی تازە نەماوە، بە دارەمەیتێکەوە کە مردوویەکی تێدا ڕاکشـــاوە، بەدەم گریان و لشمەلشمەوە لە هۆتێلەکە وە ژوور دەکەون‌و دارەمەیتەکە لە پرســـگە دادەنێن. هەندێکیان ســـەریان شـــۆڕکردۆتەوە ســـەر ســـنگی مردووەکەو نێوچاوانیان لە بەتانیەکە دەسوون‌و دەگرین، بەدەم بابەڕۆوە خۆیان وەک کوڕی مردووەکە دەناسێنن‌و هەم بۆ ئەوەی کەس دەموچاویان نەبینێ کە ببێتە هۆی ناسینەوەیان و هەم خۆیان وانیشان بدەن ئەو دارەمەیتە جەنازەی باوکیانی تێدایەو زۆری بۆ بە پەرۆشن. لە پرســـگە پێیان دەڵێن هیچ شوێنێکی چۆڵمان نەماوە بۆ مانەوەی ئێوە، لەپێش ئێـــوەش چەند میوانی دیکەمان بۆ هات بەڵام شـــوێنێک بۆ مانەوەیان نەبوو، ڕۆیشـــتن بۆ ئەوەی لە شـــوێنێکی دیکە جێگا پەیدا بکـــەن، ئێوەش بچن بۆ هۆتێلێکی دیکـــە. خاوەنی مردووەکە پێداگیری دەکەن بـــۆ مانەوەو دەیکەنە دادو فیغان، دەڵێن ئەوە تەرمی بابمانەو ئێمە خەڵکی دیوانییەین، بەوشـــەوە بە مەیتێکەوە بۆ کوێ بڕۆین! مەگەر کافرستانییە بەغدا؟! بە هەرشێوەیەک بێت دەبـــێ جێگامان بۆ بکەنەوە. لەوکاتەدا زۆربـــەی میوانەکانی هۆتێلەکە بەئاگادێن‌و دەچنە پرسگەکە بۆ ئەوەی بزانن چ خەبەرە ئەو گریان‌و هەنگامەیە؟ ڕۆستەمیش تەبای ئەو خەڵکە دەچێتە پرسگە، بەڕێوەبەری ئێشکگری پرسگە،

کاتێک چاوی بە ڕۆستەمی دەکەوێت، دەڵێت: تەنیا ئەو برادەرە ژوورێکی چوار تەختی گرتووەو کرێی خۆی داوە، ئەگەر ئەو لە پیاوەتی خۆی جێگاتان بکاتەوە، ئەوانیش ئەو پێشنیارەی کە نەخشەیان بۆ کێشاوە لە زاری بەرپرسی پرسگەکە دەبیستن، دەکەونە سەردەستو پێی ڕۆستەمی و پێی دەڵێن بیکە ڕاهی خوای، ئەو چەند کاتژمێرەی ماوە بۆ بەری بەیانی، جێگامان بکەوە! لەوکاتەی بەرپرسی نووسینگەکە دەڵێ: ئەو برایە کوردە، کورد بە بەزەیی‌و مێرخاس و بەخشندەن! ئیدی بە هەر هەموویان، کورد وەک ئەشرەفی مەخلوقات نیشان دەدەن، کورد بە شەرەفن، کورد بە ویژدانن و... ڕۆستەمیش غروری کوردانەی سواری سەری دەبێـــت: بە هەرنرخێک بێـــت نابێ ئەو متمانەیە لەدەســـت بدەم! بە متمانە بەخۆبوونێکەوە پێیان دەڵێ: ئەو دارەبازەیە هەڵگرن، وەرنە دوام بۆ ژووری پێنج! ئەوانیش هێندەی شـــانی ڕۆســـتەمی ماچ دەکەن وەک قوتبی ڕەببانی ئاوڕی بەزەیی لــێ دابنەوە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕشتی بکەن لەسەر بەڵێنەکەی.

دارەمەیتەکە دەبەنە ژوری پێنج‌و لەلای ڕۆســـتەمی دایدەنێن، ڕۆستەم بەو عارەبییە چەپرەکەی فێری بووبوو، کەوتـــە دڵدانەوەیان پێیان دەڵێ هەمووما‌ن مردنێـــک قەرزدارین‌و هەر دەمرین، ئەوەی نامرێ بەس خودایە، هەریەکەمان بەجۆرێک و لە شـــوێنێک دەمرین، دایک‌و باوک بۆ کەس تا ســـەر نامێنن، ڕۆژێک بەجێمان دێڵن و ئێمەش ڕۆژێـــک منداڵەکانمان جێدێڵین، مردووش بە گریان‌و داد‌و فیغان زندوو نابێتەوە! ئەوانیش دەکەونە ســـەر مەدح و سەنای کوردان، چەند بەخشندەو میهرەبانن، وەکو نموونەی ڕۆستەمی. یەک لە دوای یەکتـــری ژوورەکەی جێ دەهێڵـــن، لە کۆتایی یەکیان لەســـەر دارەمەیتەکەی ماوەتەوە بە تەنها، ئەویش داوا لە ڕۆســـتەمی دەکات ئاگاداری تەرمی باوکی

بێت، تاوەکو لە ئاودەست و سەرئاو دەگەڕێتەوە، یان برایەکانی دێنەوە. بەو شێوەیە ڕۆستەم بە تەنها لەلای دارەمەیتەکە دەمێنێتەوە، دەرگاش داخراوە، ڕۆستەم بە تەنها لەلای مردوویەک زۆر هەراسانی دەکات لە ناکاو مردووەکە بە ماسکێکی دەستکردی زۆر ترسناک لەنێو دارەمەیتەکە قیت دەبێتەوە، ڕۆستەم بە بینینی ئەو دیمەنە ترسناکە هیچی لەدەست نایە، جگە لە چەند بیسمیللایەکی پچڕپچڕ! مردووەکە زەلامێکی بەقەڵافەتی نەفرەجای ترسناک، بە ئاسنێکەوە هەڵدەکوتێتە سەر ڕۆستەمی. لە کۆمەڵگای ئێمەدا جەنازەی مردوو زۆر بەسام و ترسناکە، چجای بە بەرچاوتەوە زیندووبێتەوەو لە دارەمەیتەکە بێتە دەرێ. ڕۆستەم، بەو دیمەنە لە هۆش خۆی دەچێ. مردووەکە، زۆر بێ بەزەییانە وەک ئاژەڵێکی دڕندەی کێوی بە قەستی کوشتن، ئاسنێک لە سەری ڕۆستەمی دەداو کوفارەی خوێن فلوچقەی دەکات، لەوکاتەدا پارەکە لە باخەڵی دەردەهێنێتو لە کارەکەی دەبێتەوەو تاقە یەک دینار لە گیرفانەکانی ناهێڵێتەوە. کە جێیدەهێڵێت، وا دەزانێت ڕۆستەم مردووە، دەستێک بەسەرو گوێلاکی خۆی دادەهێنێو سیمای خۆی ئاسایی دەکاتەوە، بە هێمنی لە ژوورەکەوە دەچێتە دەرێ و دەرگای ژووری پێنج دادەخاو دارەمەیتێک و ڕۆستەمی لە خوێن شەلاڵ، بەجێ دەهێڵێ، بە پلیکانی دالانی هوتێلەکەدا دەچێتە خوارێ. پاشدزەکان، لە خوارێ و لە چاوەڕوانی پارەکە، وەکو گورگی برسی زمانیان لە لالێویان دەدەن، چونکە دڵنیان ئەو پیلانە سەردەگرێ، لەبەرئەوەی بۆ یەکەمجارە ئەو شێوازە لە دزی، تاقیدەکەنەوە!

چۆنیەتی زانینی وردەکاری و دانپێدانانی ئەو دزیە، کە داشکانێکی زۆری ئەخلاقیی تێدایە، لە دوای چەند دزیو گیرفانبڕی و کەتنی دیکە. ڕۆژێک

دوو لە دزەکان دەستگیر دەکرێن، کە کارەکتەری هەمان گیرفانبڕینی ڕۆستەمی بووینەو ددانـــی پێدا دەنێن. ئەوجارەیان بە تاوانـــی گیرفانبڕینی حاجییەک، کە خاڵی ئەفســـەری پۆلیسی نەهێشـــتنی تاوان بوو لە شاری بەغدا، لە دوای لێکۆڵینەوە ددانیـــان نا بە چەند تاوانو دزی کە لـــەوە پێش کردوویانە، یەک لەو تاوانانەش دزیکردن لە ڕۆســـتەمی، شـــێوازی ئەوجۆرە لە دزی، بووە جێی ســـەرنجی تەواوی ئەفسەرو پۆلیســـەکان. دزیکردن بە مردوو شێوازێکی نوێ بوو، نەبیســـتراو و نەدیترابوو، لە ئەنجامی لێکۆڵینـــەوە بۆیان دەرکەوت ئەو کەســـەی لەنێو دارەمەیتەکە خۆی کردبوو بە مردوو، گەورەگیرفانبڕی شـــاری بەغدا و چەقۆکێشـــی ناسراو، کەریم عرێبی بوو، ئیشوکاری دەرگەوانی خانمە لەشفرۆشـــەکانی بەغدا بوو، پارەی کرێی لەشفرۆشەکانی وەردەگرت. درەنگانی شـــەویش زۆرجار لە بەردەرگای یانەو بارەکان خاوەی لەو پیاوە سەرخۆشـــانە، کە مرۆڤی دەستوپێ سپی و بێوەی بوون، منداڵێکیش دەیتوانی ڕووتیانکاتەوەو، چەقۆیەکیان پێ نییە بۆ خۆپاراستن، وەردەگرت.

بـــۆ بەیانی، پاککەرەوەی هۆتێلەکە گوێی لە ناڵـــەو لرخەی میوانی ژووری پێنج دەبێت، بەڕێوەبەری پرســـگەی هۆتێلەکە ئاگاداردەکاتەوە، یەکسەر دەچن بۆ ژوورەکە، کاتێک دەرگای ژووری پێنج دەکەنەوە دەبینن دارەمەیتێکی بەتاڵو میوانێکی شـــەلاڵی خوێن، لەنێو پێخەفە خوێناوییەکانیدا بەحاڵ هەناســـە دەدات! پۆلیس ئاگاداردەکەنەوە و بەپەلە بەرەو نەخۆشخانە دەیڕفێنن. لەکاتی هێنانەخوارەوەی ڕۆســـتەم کە لەنێو بەتانیەکەیە، ســـەرنجی پیاوێکی کوردی خەڵکی کەرکوک بۆ لای خۆی ڕادەکێشـــێ و هاوار دەکات: بوەستن، من خۆم لەگەڵی دەبم، ئای ئەوە خۆ کاک ڕۆستەمە دەمێکە دەیناسم، خەڵکی گوندەکانی

هەولێـــرە. خاوەنداری لێدەکاتـو کاتێک لە نەخۆشـــخانەش دەردەچێ، چونکە باری دەروونی تەواو تێک چووەو شێواوە، یاوەری دەکات تاوەکو دەیگەیەنێتەوە گوندەکەی خۆیان. لەو ڕۆژەوە باری دەروونی ڕۆســـتەم شـێوا و، لە ڕۆســـتەمی بازرگان بوو بە ڕۆستەمە شـێت! هەرچەندی خزم و کەسوکارو خەڵکی ئاوایی لێی دەپرسن ڕۆســـتەم بۆچی وات بەســـەرهاتووە؟ کێ وای لێکردی؟ لە کوێ ئەو بەڵایەیان بەســـەرهێناوی؟ هەر ئەوەندە لە ڕۆســـتەمی دەبیستن: مەچن بۆ شـــاری! بەدرێژایی ئەو چەنـــدە ڕۆژە، ئەوەی لە ڕۆستەمەشـێتی دەبینن و دەبیستن، تەنها دەستی لە سەر گیرفانەکانی خۆی توند دەکات، وەک بیانەوێ شـــتێکی لە گیرفانی دەربێننو ڕێگایان پێ نەدات و دەڵێ: لە شاری مردووش دزیت لێدەکات! لە وەڵامدا دەڵێت بۆ خواتان پێ دەڵێم مەچنە شاری و گوندی بەجێمەهێڵن. دەستم دامێنتان شـــار بۆ ئێمە نابێت، کاکە هەر چ ئیشێکتان هەبـــوو من بۆتانی دەکـــەم، بەس بەڵێنم پێبدەن مەچنە شـــاری، لە شـــاری، مردووش دزیتان لێدەکەن!

هەرکەسێک بیگوتایە ناچمە شـــاری، هەڵدەستا ئەولا ئەولای ماچ دەکرد: نەتۆ کوڕی بابی خۆتی و بە قوربانت بم، نەکەی بچییە شاری!

ئەوانەی خوریو هەر بەرهەمێکی دیکەیان بە قەرز دابوو بە ڕۆســـتەمی، یەک یـــەک دەهاتنەلایو دڵنەواییان دەکردو دوعـای چاکبوونەوەیان بۆ دەکرد. هەر هەمووشـــیان گەردنیان ئازاد کرد لەو پارەیەی لەســـەری بوو، بگرە پەنیرو ماستو کەشـــکـو زۆر پێداویســـتی ڕۆژانەی منداڵەکانیان بۆ دابین دەکرد.

خەڵکی گوندی ساڵانە شـــکارتەیەک[1] گەنمیان بۆ دەچاندو بۆشیان دروێنە دەکردو هەرچییێکیان بۆ ماڵ و منداڵی خۆیان دەکرد ئەوەشیان بۆ ڕۆستەمەشێتی دەکرد. لـــە ڕووی جەســـتەییو توانای کارکـــردن، هەر ڕۆســـتەمەکەی جاران بوو، تەنها باری دەروونی شـــێوابوو، دەنا زەلامێکی بـــەوەجو بەهەرەکەت بوو، ئەگەر بیانویســـتایە کرێکاریی پێ بکەن، هەرچەندی پێشنیاری پارەی زۆریان بۆ بکردایە، تەقەی لەســـەریەوە نەدەهات و کارەکـــەی نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بتگوتایە ئەو کارەم بۆ نەکرێ دەچمە شاری و گوندی جێ دەهێڵم، دەستی دەکردە ملی خاوەنـــکارو دوو ماچی لێدەکردو دەیگوت: بەڵێنم پێبدە ناچیە شـــاری، برای خۆت هەموو کارەکەت بۆ دەکات. بەو شـــێوەیە پارەی ڕۆژانەکەیان دەدایە دەســـتی ژنەکەی و ئیدارەی گوزەرانی خۆیان پێدەکرد. ڕێگای خستنەسەرکاری ڕۆستەمیان دۆزیبووەوە. هەر کورتەکـو شەرواڕو دەستەجلێکی نوێی بۆ دەکرا یان پێیان دەبەخشی، قۆڵی تێهەڵنەدەکێشا هەتاوەکو هەموو گیرفانەکانی زۆر بـــە مەحکەمی نەدووریباو تەقەڵرێژ نەکردبـــان، جلەکانی لەبەرنەدەکرد، بۆی گرنگ نەبوو داوە دەزووەکە هەر ڕەنگێک بوایە، تەنها قایم بوایە بەس بوو!

زۆرجـــار ژنە کامڵەکانی ئاوایی، ســـاوار، برویـــش، گەنمەکوتاو، داندۆک، نیســـکـو نۆک، لەنێو جەواڵاندا بۆیان بڵند نەدەکـــرا بیگوێزنەوە، بە بەرگوێی ڕۆســـتەمیان هەڵدێنا، وەک بڵێی بووکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێبێت: خۆ دنیا بەزەیی تێدا نەماوە، ئەیەڕۆ بابانت شێوێ! جیران ناچتە یاریی جیرانی

١. شکارتە: پارچە موڵکێکە کە جوتیارێک بە دانەوێڵە و ڕەنجی خۆی، بۆ کەسێکی هەژار و نەداری وەک شوان، ڕێنجبەر، ماڵە هەتیو و... دادەچێنێ بەرهەم دێنێ. هەندێکجاریش خەڵکی ئاواییەک بۆ مەلای گوند ئەوە دەکەن.

خۆی! ئەو گوندە کەڵکی ژیانی تێدا نەماوە، باربکەین بۆ شـاری لە هەمووی باشترە! هەرکە ڕۆستەمەشێت ئەوەی دەبیست، بەپەلەو بە هەشتاوی دەیگوت: کـوا چ کارێکتان هەیە با بۆتانی بکـەم، هیچم ناوێ تەنهـا بەڵێنم پێ بدەن مەچوونە شـاری! هەموو جەواڵو خرارو تێرو پرێسـکەکانی بۆ دەگواستنەوە، لە بەرامبەری ئەوەی نەچن بۆ شاری و گوندی چۆڵ نەکەن! بەڵام سەرەژنە کابان چاکەکانی ئاوایی، بەشـی پێداویستی ماڵی رۆسـتەمیان بە زیادەوە دادەناو بۆیـان ڕەوانەی ماڵێ دەکرد . ژیانی ڕۆستەمەشـێتو ماڵ و منداڵی لەسـەر شـانی خەڵکی بەخشـندەی ئاوایی بوو، لەلای خەڵکی ئاوایی قابیلی قبووڵ نەبوو شتێک لە ماڵی خۆیاندا هەبێتو لە ماڵی ڕۆستەمەشێتیدا نەبێ! بگرە زۆرشـت لە ماڵی ڕۆسـتەمی زیاتر بوو تا دەگاتە ماڵەکانی ئاوایی. تەنانەت کچە گەورەکەشـی کە تەمەنی تازە ببووە حەوت سـاڵ، ئەو خاڵە لاوازەی بابی دیتبۆوە، داوای هەرشـتێکی کردباو ئەو بۆی دابین نەکردبا، دەیگوت: ئەگەر بۆم پەیدانەکەی، لە گوندی دەڕۆم دەچمە شاری! ڕۆستەمەشێت بە بیستنی ئەو قسەیە قەڵەمی دەستوپێی دەشکاو لە ئامێزی دەکردو سەد جاری خۆ بەقوربان دەکرد : بەس مەچۆ بۆ شـاری، هەرچی ئەتۆ داوای بکەی ئەگەر لەسەر پشتی شێران، لەسەر باڵی هەوران بێت، بۆت دێنم!

لەنێو سـەد گوندی ناوچەکە، هەرکارێک هەرڕووداوێک هەرقسەیەک لە دژی بەرژەوەندی ئاغاو شـێخو دەسەڵاتداری زاڵم ئەنجام بدرایە، یەکسەر و بێ سـێو دوو وەک تاوانێک دەدرایە پاڵ حاجی سمایل و کوڕەکانی، لەنێویشیاندا کاکەڕەش! تەنانەت لەو چەند ڕۆژەی ڕابردوو، لەسەر قەبرستانی، لەکاتی ناشتنی تەرمی منداڵێکی ئاوایی، ڕۆستەمەشێت کە هیچ تەکلیفێکی شەرعی لەسەر

نییە، پشتی کردبووە شـــوورەی قەبری ئاغاکانو ڕووی لە قەبرستانەکە کردبوو، هـــەردوو باڵی لێک بڵاوکردبوو، وەک بیەوێ مـــردووەکان لێک جیابکاتەوە، بە دەنگێکـــی بەرز گوتبووی: بۆ خاتری ڕۆحیانەتی پێغەمبەری و ماڵ و منداڵی پێغەمبـــەری و ئەولیاو ئەنبیاو جەمیعی موســـوڵمانان، بە تایبەتی مردووی ئەو قەبرســـتانەی بێجگە لە ئاغاکان، هەدیەتەن ئەلفاتیحا! خەڵکەکە زۆریان لە شـــەرمی خاوەن مردووەکە، نەبادا دڵی شـــتێک بکا بە پێکەنینیان، لفکەی هەوری و جەمەدانییەکانیان لە زاری خۆیان هاوێشتبوو بۆ ئەوەی پێکەنینەکە داپۆشـــن. ئەو قسەیەی ڕۆستەمەشـێتی گەیشـــتبووەوە ئاغاکان، ئەوانیش گوتبوویان ئەوە مامۆستای هەبووە، مەبەستیان کاکەڕەش بوو، ئەگەرنا شێتێک چۆن لە فاتیحاش ئێمە هاوێر دەکات! دەیانگوت: ئەگەر هێستر لووشکەی لە ئاغایەکی بدات، دەستی کاکەڕەشی تێدایە!

لەدوای ئازادکردنی لە بەندیخانە، ســـەرماو ســـۆڵە بەتـــەواوی داهاتبوو، لـــەدوای ســـێ مانگی ڕەبەق، ئاغاکان هێشـــتا کـــۆری دریان بەوەنـــدە گرتنە دانەمرکابووەوە، ئازادکردنی ئەوانی نیگەران کردبوو. شـــەو و ڕۆژ ئاغاو شـــێخ و دوعاگۆو قوڵەکوێخای ناوچەکە بە پشـــتیوانی دەســـەڵات، لەوەی دەخەفتان چۆن کاکەڕەشـــی لەنێو ببەن و ئەو کۆسپەیە لەسەر ڕێی خۆیان تەخت بکەن، بـــۆ ئەوەی بە شـــکاندنی ئەو، چاوی هەموو ئەو جووتیارە هەژارانە بشـــکێنن کـــە ڕۆحیەتی بەگژداچوونـــەوە لە دەماریانـــدا هەیە. ڕۆژانە هـــەزارو یەک تەگبیرو پیلانیان تاووتوێ دەکردو دادەڕشـــت، دەســـەڵاتی زاڵم و کۆنەپەرستی میریـــش، لـــە بەرژەوەندیی ئاغاکاندا بوو. چەوســـانەوەی چینایەتی، پشـــتی

جووتیارە هەژارەکانی لە سـوخرەو بێگار وەکو پشـتی باربەر جدەو[١] کردبوو، فریادڕەسێک نەبوو، دەستیان بگرێ و لەو زەمهەریرە دەریانبێنێ! ئاغاکان پێیان وایە خاوەنی ماهیەتێکی ماقوولترین و ئەفسـانەیی و ئەزەلین، بۆیە چێژیان لە ئازاردان و برسـیکردنی جوتیارە هەژارەکان دەبینی. بێئاگا لەوەی مرۆڤەکان کاتێک هەست بە جۆرێک لە یەکسانی و تێربوونی زگی خۆیانو منداڵەکانیان دەکەن، هیچکات بیرو خەیاڵیان بـۆ لای تفەنگـو دژبەری بەرامبەرەکەیان کە چەوسێنەرەکەیە، ناکەنەوەو پەنا نابەنە بەر یاخیبوون.

شەوانی زسـتان دانیشـتوانی گوندەکانی ئەو مەڵبەندە بە یاریی جۆراوجۆر بەسەر دەبەن، یەک لەو یاریانە کەرەمستانێیـە[٢]، هەندێکجار لەسەر قەلیش دەیکەن. ئەو شـەوەی کە بڕیاربوو لەو گوندەی ئەوبەری ڕووباری، کەرەمسـتانێ بکرێ، کاکەڕەش و هیدۆش بانگهێشـت کرابوون، لەدوای نانی شێوان ئامادەبن. ئاخر هەردووکیان یاریزانی باش بوون. کاکەڕەش لەدوای ئازادکردنی لە بەندیخانە، یەکەمجار بوو بە شـەو لە ماڵێ بچێتە دەرێ. ئەو ڕێ ڕۆیشـتنە لە لای کەس نهێنی نەبوو، بە ئاغاکانیشـەوە، هەمـوو خەڵک دەیزانی ئەمشـەو یاری لەو گوندەی ئەوبەری ڕووباری ئەنجام دەدرێ. کاکەڕەشـیش یـەک لە یاریزانەکانەو بەدڵنیاییەوە ئامادە دەبێتو دەچێت. مشـیرئاغاو باوکی، ئەو شەوڕۆیشـتنەی کاکەڕەشـیان بە هەل زانی بۆ ئەوەی زەفەری پێ بەرن و بیکوژن، دەیانەویست لە ڕەشەشـەوی ژیانی ئەو مەڵبەندەدا چرایەک بخنکێنن، چونکە لە قەڵەمڕەوی

---

١. جدەو: بڵندابیەکە لە بەینی مل و پشتی باربەر، بەهۆی بار و کورتانەوە دەئەنگوا و چڵکی دەکرد.

٢. کەرەمستانێ: کەڵەمستانێ، گلاوێن، گۆرەوێن، جۆرابێن.

ئەواندا چرا و ڕووناکی قەدەغەیە! دەیانویســـت خۆیان لەو هەڕەشــەیەی لەسەر بەرژەوەندییەکانیان دروســت بووە، دەرباز بکەن. لەوکاتـــەی ڕەفعەت ئاغا دڵنیا دەبێت کاکەڕەش دەچێتە یارییەکە، بە مشـــیرئاغای کوڕی دەڵێ: بچۆ وەلی قادر ژنانیم بۆ بانگ بکە! قادر ژنانی ئەو ناوەی لە ئاغاکانەوە بە باڵای بڕابوو، مام قادر ژنانی هەڵسوکەوتی مێیانەبوو، خزمەتکاری ئاغایەو کاری نێو ژنانو بە تایبەتی ئاغاژنی پێسپێردراوە، بەهۆی کارەکەیەوە، ئاغاکان ناتۆرەی ژنانیان پێ هەڵواسیوە. وەلی قادر ژنانی هەتا دەست هەڵێنی کەڵەگەت، جێگای متمانەی ڕەفعەت ئاغای بوو، ئەوە یەکەم کاری نەبوو پێی سپێردرا بێت، چەند جارێکی دیکەش ناردرابوو بۆ گوندەکانی دەوروبەر بۆ بڕینی کلکی کەری ناحەزەکانیان و تەقەکردن لە ماڵی خەڵــک و دیواربڕینو زۆر کەلێنی دیکە. ئاغا پێـــی وابوو بۆ ئەو کارە، وەلی لە هەموو تفەنگدارەکانی دیکەی باشـــترە، بۆیە ئەو ئەرکە قورسەی پێ دەسپێرێ. وەلی لە بەردەمی ئاغای خۆی ئامادە دەبێتو دەست لەسەر سینگ دەڵێ فەرموو ئاغـــا ئەمر بکەو بەندە جێبەجێی بکات! ڕەفعەت ئاغا دەڵێ: وەلی! هێشـــتا بە تەواوی وەلیەکەی لە زاری هەڵنەوەریوە، وەلی چوارجار دەڵێ: بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ! گوێبگرە، ئەرکی ئەوجارەت دەزانم قورسە، وەلـــێ ئەمن بە خۆم دەزانم کێ پیاوی ئەرکی قورسەو لە هەموو تفەنگدارەکانم عاسێترە، پیاو ئەو پیاوەیە بچێتە هـــەوێو بێتەوە[1]! پاداشـــتی ئەوجارەت بەدڵی خۆتە، بۆیـــان باس کردووم دڵت بە کچی ئەو پیاوەوەیە کە تازە لە دوای حەمەشـــوانی بۆتە شـــوانی ئێمە، سەیە! هەرکـــە کارەکەت ئەنجامدا بەیانییەکەی لێتی مـــارە دەکەم! وەلی، ئاوی لە دڵی

١. پیاو ئەو پیاوەیە بچێتە هەوێ و بێتەوە: کەسێک بچێ لە شوێنی مەبەست دەستی خۆی بوەشێنێ و بە سەلامەتی و سەرکەوتوویی بگەڕێتەوە.

دێت: ئەوجا حەزدەکەی بلّێ بابت بکوژە، جا بزانە چۆن سەگتۆپی دەکەم! ڕەفعەت ئاغا دەڵێ: ئەوشەو کاکەڕەشی حاجی سمایلی دەچێتە گوندی ئەوبەری ڕووباری بــۆ کەرەمســـتانێ، بەرلەوەی بگاتە ئەوێو دەســـتەگوڵی لێبـــدات، ئەتۆ لە دەو ڕووباری بۆی دانیشـــەو دەستەگوڵی خۆتی لێبدەو بیکوژەو ئاغای خۆت ئاسوودە بکە! وەلی قادر ژنانی دەڵێ: ئاغا وابزانە سبەینێ لە قەبرستانییە، ئەگەر حەوت ڕوحی هەبێت هەر حەوتی لێدەستێنم، ئەتۆ ناتەوێ فەراقی ڕەشی لێببڕم؟ ئاغا دەڵێ: دەی برۆ بتبینم، زەلامی لە تۆ بەوەجتر لەو گوندەی شـــک نابەم بۆ ئەو کارە قورســـەی، دەزانم هەر ئەتو ئەو کارەت لەدەســـت دێ! وەلی، پاشەوپاش و دەست لەســـەر سینگ دەکشێتەوە. لەســـەر عەتەبەی دەرگای دیوەخانێ ئاودیوی دەرێ دەبێ، مشیرئاغا دەڵێ: ڕاوەستە ئەو خەریتە فیشەکەی من بەرە، هیچی چروک ناکات، هەمووی فیشـــەکی ئاگرداری قۆرخانی گوللە سۆرە، حەیفە ئەو سەگبابە بە فیشـــەکی خراپ بکوژرێ، ئەو فیشـــەکانەم بەس بۆ کوشتنی کاکەڕەشییە! وەلی قادر ژنانی هەرچەندی بیردەکاتەوە، ئەو پێچەی دەو ڕووباری لە خوار دەراوی ژنان، لەنێو کۆزە قامیشەکە لە هەموو شوێنێک بە لەبارتر دەزانێ کە ڕێبوارەکان ناچارن بێنەوە بەرلوولەی تفەنگێ، هێندە نزیکە ڕەنگە بارووت بچێتە نێو برینی بە ئامانجگیراو. ئەو پێچە لەو کەندەی، هەر دەڵێی بۆ ئەو کارەی ڕاخراوە!

کاکەڕەش و هیدۆ بەرلەوەی بکەونەڕێ، ڕەختو فشەکدانیان توند لە قەدی خۆیان بەســـتو تفەنگیان لەنێو گۆلمێیە، شەوێکی تاریک و ئەنگوستەچاوە، هەور زگی لە عەرزی ناوە، نەرم نەرم دەپروشێنێ، بێدەنگیو تاریکی باڵی بەسەر دێ و ڕووباری کێشـــاوە، ئەوەی دەبیســـترێ تەنها قیـــڕەی بۆقەکانە. کاکەڕەش هەمیشە خۆی دەخستە شـــوێنی دوژمن، بیری لەوە دەکردەوە لە مابەینی ئەو

دوو گونــدە، ئەگەر بتەوێ بۆ یەکێک لە کەمیندا بیو بتەوێت بیکوژی، لەکام شوێن سەرکەوتن بەدەست دەهێنی! کاکەڕەش دەیویست ڕای هیدۆی وەربگری: ئەگەر ئەتۆ بتەوێت لەو ڕێیەی ئێستا ئێمەی پێدا دەڕۆین، کەمین بۆ یەکێک دابنێیەوە کامە شــوێن بەباش دەزانی بۆ ئەوکارەی؟ هەم بۆ خۆحەشاردان هەم بۆ دەستوەشــاندن؟ لەکوێ پیادەڕۆ بە ئاسانی دەکەوێتە بەر قەمچی تفەنگی نەیارەکانی؟ هەر خۆت بخە شــوێنی دوژمن، پێت وایە کێندەر زۆر باشــە بۆ کەمین؟ هیدۆ گوتی: لای کۆزە قامیشــەکەی خــوار دەراوی ژنان، ئەها لەوێ ڕێگاکــە پێچ دەکاتەوە، پیادەرۆ دەچێتەوە بەرلوولــەی تفەنگێ. هیدۆ ئەوەندە شــارەزاو لێزان بوو دەبوایە قسەکانی بە هەند وەربگیرێ، ئاخر گورگی باراندیدە بوو، ئەندازیاری ئەو کارانەبوو. کاکەڕەش گوتی: ئەمنیش هەمان بۆچونی تۆم هەیە، کەواتە ئێمە بەرلەوەی بگەینە لای دەراوی ژنانو کۆزە قامیشــەڵانەکە، نابێ بە ڕێگاکــەدا بڕۆین، زۆر بە گومانم ئەوشــەو پیاوەکانی رەفعەت ئاغای بۆمان دانیشتبن، چونکە دەزانن دەچینە ئەوبەری ڕووباری.

لە نزیک دەراوی ژنان، هیدۆ دەچێتەوە پشــتی قەمیشەڵانەکە و کاکەڕەش لە تەنیشــتی لای ڕاســت، بۆ ئەوەی بەرلەوەی بپرژێنە ســەر تەقەلێکردنیان، ئەوان غافڵگیریان بکەن، گرنگ نییــە کەمینەکە یەک کەس بێت یان دوان. بەجۆرێک دەڕۆن وەک پێ لەســەر هێلکە دانێن. بە ئەسپایی و بە وریاییەکی تەواو دەســت لەســەر پەلاپیتکەی تفەنگ، هەنگاو دەنێن، بێئەوەی کەسیان بینیبێ بەهەستیاری هەنگاوەکانیان هەڵدێنن، بۆ خۆشیان گوێیان لە خشپەی پێی خۆیان نیە، لە قامیشــەڵانەکە نزیک بونەتەوە بــێ ئەوەی بزانن یەکێک خۆی بۆ مەڵاس داون، تەنها لە زەینی خۆیان ئەوەیان داڕشتووەو خۆیان تەڵقین

داوە کە بەیەقینی بۆیان دانیشـــتوون. لەو شوێنەی وەلی مەزەندەی نەکردووە، بەجـــووت بە دەنگێکی گڕی ناخهەژێن تێیرادەخوڕن: هەســـتە زەلام کوژرای؟ خۆت بناســـێنەو وەرە پێش، لەنێو قەمیشـــان وەرە دەرێ هەتا ئاگرمان نەداوە! یەکســـەر وەلی لەنێو قامیشان دێتەدەرێ، تفەنگ بەدەستەوەو زمانی تەتڵەی دەکاتو قســـەکان نیوەچـــڵ و پچڕپچڕ دەردەبڕێ. هەر ئەوەنـــدە دەزانێ هیدۆ وەک باز بەسەرسەری نێچیرەوە بنیشێ، لوولەی تفەنگی لەسەر پشتی سەری دادەنێ: ســـەگباب ئەو تفەنگەی فڕێدە ســـەر زەوی، ئەگەرنـــا کوژرای! وەلی، تفەنگە بڕنۆ ڕەقەم حەڤدە شێرو قورشیدداڕەکە لەسەر عەرزی دادەنێ. ئەوجارە دەڵێ ئەو ڕەختو فیشـــەکدانە لە پشتت بکەوەو لەســـەر تفەنگەکەی دانێ. چەند هەنگاوێک لە تفەنگەکەی دووری خستەوە، هیدۆ خەریتە فیشەکەکە لە پشتی خۆی دەبەستێو باقەنەزمەی تفەنگەکەی دەردێنێو لەبەرپشتی خۆی ڕادەکات. چەند لوولە تفەنگێکی لە خالیکەو قەبرغەی دەکوتێ، بە کاکەڕەشی دەڵێ با بیکـــوژم، خۆ ئەو هاتووە ئێمە بکوژێ! ئاخر ســـەگباب چ خوێنێکت لە زگـــی ئێمەدا هەیە؟ کاکـــەڕەش گوتی: ئەگەر مـــووی پیاوانی لێهاتبێ و بەڕاســـتی مانای تفەنگهەڵگرتنێ بزانێ، ئەوەی ئێســـتا بۆ هەر تفەنگدارێک کە چەک بکرێ، ئەوە کوشـــتنی ڕاســـتەقینەیە. وەلی زۆریـــان لێدەپاڕێتەوە نەیکوژن. کاکەڕەش دەڵێ: خۆ ئێســـتا بتکوژین لە ترێ ســـەی دەچیو دەبیە ترێ بنگۆمێ، هەر کەس ناشـــزانێ کێ ئەتۆی کوشتوە، ئاخر هەی ژنترپباب[1] هەتاکەی لەگەڵ بابە گەوادەکـــەت نۆکەرایەتی بۆ ئاغاکان دەکەن؟ لاگری زاڵم

---

١. ژنترپباب: جنێوێکی کۆنی بازاڕی و میللییە، تەنها بە پیاوان دەگوترێ، لە پیشەدا هیچ مانایەکی نییە.

دەبن لە دژی مەزڵوم؟ خۆ ئاغا حیسابی سەگێکتان بۆ ناکات هەی گۆردە! وەلی هەزار سوێندو کەلامولّلا دەخوات دەڵێ بۆ کوشتنی ئێوە دانەنیشتوم لامداوە بۆ ئەوەی دەست بە ئاو بگەیەنم. هیدۆ دەچێتە شوێنی دانیشتنەکەی وەلی قادر ژنانیو چەرخەکەی بە ئاگر دەکاو شوێنەکەی ڕووناک دەکاتەوە. لە چەند قونکە جغارەیەک زیاتر هیچی لێ نییە کە لەکاتی چاوەڕوانی ئەواندا کێشاونی. هیدۆ دەڵێ هەوکە ئەگەر هەر بایی خواردنی خۆت ڕیتبای، دەمگوت ڕاست دەکەی! کاکەڕەش دەڵێ: وەلی ملت بشکێنە تفەنگەکەت هەڵگرە هەتاوەکو هیدۆ نەیتۆپاندووی، بڕۆ چیت دیوە وردو درشت هەمووی بێزیاد و کەم بۆ مشیرو ڕەفعەت ئاغای بگێڕەوە، بەڵکە بۆیان ببێتە دەرسێک و دەستبەرداری پیلانگێڕی بن!

بەیانی، کاتێک تاریکی کلکی بەدوای خۆیدا ڕاکێشاو ڕاخوشی و دەستی لە یەخەی گوندی کردەوە، کەرەبابەکان دەمێک بوو لە بانگی بەیانی ببوونەوە، گمەی کۆترە نێرەکان و سەرنەوی کردنی کۆترە مێیەکان بە مانای ڕازیبوون، وای لە کێشکە پاسارییەکان دەکرد لە کونی بن سواندەی خانوەکان بێنە دەرێ، سفتاحی ئەو بەیانیەیان چەند پێدافسینێکی کێشکەنێرەکان بوو. ئەو کێشکەپاسارییانەی هێلانەیان لە بن سواندەی ناندێنەکان نزیک تەندوورەکان بوو، ڕەنگی ڕیشۆڵەیان گرتبوو، زۆر بەڕوونی کێشکەی ناندێنان لە کێشکەی شوێنەکانی دیکە جیادەکرایەوە. تازە لە هەندێک ماڵ دوکەڵی ئاگرکردنەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێ. ڕەفعەت ئاغا جیا لە ڕۆژەکانی دیکە، وەک پیشەی ئاغایانەی خۆیان، ئەو بەیانییە چێشتەخەوی نەکرد، چونکە چاوەڕوانی ئەوەبوو ئەو بەیانییە ئاوایی و، بە تایبەتی ماڵی حاجی سمایلی و

کوڕەکانی، ئاسایی نەبێ! ئاخر ئەوان وایان دابووە بەرداسێ، ئەو بەیانییە لەگەڵ کازیوەیدا، ئاوایی بخرۆشێو خەڵکەکەی لە دەنگی شینو شەپۆرو قوڕپێوانی ماڵی حاجی سمایلی خەبەریان بێتەوە! وەلێ هەرچەندی سەرەتاتکێ دەکات، دنیا کشـــومات و خەڵکی ئاوایی بە کرو بێدەنگی لەبەر ســۆپاو قون ئاوردانی ماڵەکانیان، خەریکـــی نانخواردنی بەیانین، زۆر ئاســایی وەک هەر ڕۆژێکی دیکە گاڕانی گونـــدی لەپێش دەرکی مزگەوتێ کۆبۆتـــەوەو ئامادەیە بۆ ڕادان بـــەرەو ئاقاری. لە هەمـــوو ماڵەکان دوکەڵی لوولەســۆپاو دەلاقـــەی ناندێنو کڵاوڕۆژنەکانو دوکەڵکێشەکان وەک ستوونی بەرگری لە بەربوونەوەی ئاسمان، خۆی نمایش دەکات.

دیمەنـــی ئاوایـــی، بەپێچەوانەی مەزەندەی ڕەفعەت ئاغای، خۆی نیشـــان دەدات. لەوکاتەی مشـــیرئاغاو باوکی بە چاوی خۆیان حومێرەی کوڕی حاجی ســـمایلیان بینی جلی لە تاژییەکان کردەوەو وشـــتەی لێکردن. تاژی چوارپەل بەخەنەو مل بەقەرێتەو گوێ بەڕیشـــۆرە لەســـەر گوفـــەک و جێ جۆخینان ڕاوێچکەی دەکەنو ڕاوەدووی یەکتری دەنێن. ئەوانەش هەمووی نیشـــانەن بۆ دڵنیاییبوون کە شەوی ڕابردوو هیچ شتێک ڕووی نەداوە جێگای سەرنج بێتو چاوەڕوانی ئەوان پڕ بکاتەوە! وردە وردە تارمایی نیگەرانییەکانی ئاغای، تابلۆی خەیاڵپڵاوی تەڵخ دەکەن، شکســـتی ئەو پیلانە هێنـــدەی دیکە ئاغاکان هارو شێت دەکات! لەو بێدەنگییە وەڕزەدا، بابو کوڕ دەقرقرێن[1] و هیچ شوێنێک بەخۆیان ناگرن. یەکیان دەڵێ ڕەنگە کاکەڕەش ئەوشـــەو نەچووبێتە گوندەکەی

---

١. دەقرقرێن: ناجێگیری دەروونی و ڕاڕایی لەسەر ڕاستی و دروستی کارێک هەواڵێک.

ئەوبەری ڕووباری! یەکیان دەڵێ ناکرێ تاوەکو ئێســـتا بەو هەواڵی کوشتنەیان نەزانیبێ! لە هەمووی بە ئازارتر بۆ مشـــیرئاغاو ڕەفعەت ئاغا ئەوەبوو کاتێک هیدۆ باقەنەزمەی تفەنگەکەی بە مـنداڵێکدا بۆ وەلی قادر ژنانی ناردەوە! بەڵام هیدۆ کە لەبەر ڕووناکی لە خەریتەو فیشەکدانەکەی نۆڕی ، یەکسەر ناسیەوە: ئەوە خەریتەی مشـــیرئاغایە، کـــە لەلایەن ئاغایەکی دەڤـــەری کەرکوکێرا بە دیاری بـــۆی هاتبوو. ئاخر، ئاغا و دەوڵەمەنـــەکان نەبێ، کەم کەس خەریتەی قایشی حەســـیب قادری کەرکوکی وەدەســـت دەکەوت! هەرچەندی کاکەڕەش گوتی: هیدۆ دەبوایە فیشەکدانەکەشی بۆ بنێریەوە، هیدۆ گوتی: ئەتۆ نازانی ئەو فیشـــەکدانە هی کێیە! بۆ لە خۆتەوە پیاوەتیو چاکەم پێ دەفرۆشـــیەوە؟ کاکـــەڕەش گوتی: نەوەڵڵا نازانم ئی کێیە؟ مەگـــەر ئی وەلی قادر ژنانی خۆی نییە! هیدۆ گوتی: ئەوە خەریتەو فیشـــەکدانی مشیرئاغای ڕەفعەت ئاغایە، بۆ ئەوەی بەو فیشەکە باشانە بمانکوژن! بەڵام ئەمن بەجۆرێکی دیکە هەموو ڕۆژێک چەندجار دەیانکوژم، ئەویش بە بینینی ئەو خەریتەو فیشـــەکدانە لە پشتی من گەز گەز گۆشتی بەردەدەنو دەتوێنەوە! بەناچاری لە بەرامـبەر ئێمە دەبێت چاویان شـــۆڕبکەن، ئەوانە زۆر مەغـــرورن، دەبێ هەرکارێک بکەین بۆ چاوشـــکاندنیان، ئەگەرنا دەمانخۆن و، بە خواردنیشـــمان دڵیان ئاو ناخواتەوە، ئێسکیشمان دەهاڕن!

ڕەفعـــەت ئاغا کێچ کەوتۆتە کەوڵی، لەوســـەری دیوەخانێ بۆ ئەوســـەری دیوەخانـــێ، بزانێ چەند شـــاقاوە! بەجۆرێک پێی بەرز دەکاتـــەوەو لە عەرزی دەکوتێ وەک پاسەوانی پاشایەتی بێتو لە مەیدانی مەشقکردندابێ، دەستی ڕاســـتی کردۆتە کۆڵەمستو بە هەموو هێزی خۆی لەنێو دەستی چەپی خۆی

دەکوتێو شەقەی لێدێنێ: ئاخخخخخ ئاخخخخخ! ئەو سەگبابە کەڕەکرمانجە کەڵاشخوارەمان لــێ بۆتە پشــیلەی حەوتڕوح، بۆمان ناکوژرێو ناکوژرێ! لە ناکاو، وەک گای خووداری مێشــوولە لە بناگوێی گیزەگیز بکەن، دەفیشقێنێو دەردەپەڕی، تەزبیحە دەنک گەورەکەی هێندە بەپەلە لە دەسکی خەنجەرەکەی دەکاتەوە، دووپشــکەی زیوی لە دەسکی خەنجەرەکەی دەکەوێتە خوارێ. ئای! ســەری خۆم بۆ کــوێ هەڵگرم؟ خەفەت دەمداتە دەســت خەفەتێکی دیکە! شکست بە شکستێکی دیکەم دەسپێرێ! بەجۆرێک ئەو تەسبیحە لە دەستی بە زاڵە هاتبوو، بەرقەوە دوو دەنک دوو دەنک ئاوای دەکردنو ترقەیان دەگەیشتە دەرێــی دیوەخانێ. ئەوجار تەســبیحەکەی گرمۆڵە دەکردو ڕایدەگوشــی و لە لەپی ڕاســتی دەئاخنی: وەرە مشــیر بڕۆ پیاوێک بەدوای ئەو وەلییە ناوەلییە ســەگبابەدا بنێرە، با لە زاری خۆیەوە بیبیســتم بزانم ئەوشــەو چی کردووە لە کــوێ قونی داوە؟! ئەمن وام دانابوو لەگەر گەردی بەیانی لەپێش ماڵی حاجی ســمایلی گەرمەشینو قورپێوان بایە! زۆرجار شــەقاوەکانی لەگەڵ نەغەمەی قســەو تووڕەبوونەکانی هەڵکشانو داکشانیان پێوەدیاربوو. لەناکاو بەرەو پاش دەســووڕایەوە ڕووی وەردەگێڕا. زۆرجار شەقاوەکانی بۆ بنەبانی دیوەخانێ تەواو نەدەکــرد بە نیوەچڵی لەپڕ لــە نیوەی دیوەخانێ پێی لە عــەرزی دەداو گورج دەســووڕایەوە، وەک سەربازی مەشــق لە گۆڕەپانی ڕاهێنان وەڕا دووڕ بکات! کەفی لەلالێوی وشــک ببووەوە، دوو سێ ڕیشــووی هەورییە ڕەشبەڵەکەکەی چووبۆوە زاری، تەنانەت مشــیرئاغای کوڕیشــی زاتی ئــەوەی نەبوو بڵێ بابە ئەو ڕیشووە شــەدانە لە زارت دەربێنە. بەو ســەرمایەی، تفت هەڵباوێشتایە لە ئاســمانێ دەمەیی، ئارەقەی ڕەش و شــینی بەخۆی کردبــوو، نێوە نێوە بە

لفکەی هەوریەکـەی ئارەقەی نێوچاوانو لا ملی خۆی دەسـتڕی وەک لەبەر بـەری دروێنەی بێت! لەنـاکاو ئەو پیاوەی لەدوای وەلی قـادر ژنانیان ناردبوو هاتەوەو وەلیشی بەدواوەیە، لـێ وەلی ئەو پیاوەی دوێنێ نییە، تێکشکاو لاقی تێکدەهـاڵان. لە دیوەخانێ وەژوورکەوتن. ئاغا لێی پرسـی: بۆ هیچ خەبەرت نەبوو؟ وەلی قادر ژنانی سەیرێکی ئەو پیاوەی کرد کە بەدوایدا ناردرابوو، ئاغا بەو نیگایە تێگەیشت شـتێک لە گۆڕێدایەو ناکرێ لە خۆیو ڕەفعەت ئاغاو مشیرئاغای زیاتر، کەس بیزانێ، نەڕاندی: ئێرە چۆڵ کەن، بە تەنهامان بێڵنەوە! لەوکاتەی تەنها سێ بە سێ مابوونەوە، وەلی بە شەرمەزاری و چەند تەکانێک، قسـەو منجەمنجەکانی بۆ لە گەرووی نەدەهاتنەدەر، وەک زەروو بە قوڕگـو مەڵاشوویەوە نووسـابوون! بە دەربڕینی چەند وشەی سـەروگوێ شکاو، ئاغا حاڵی بوو کە شەوێ لەناو قامیشەڵانەکە لە کەمینداببووە بۆ ئەوەی کاکەڕەشی حاجی سـمایلی بکوژێ. لەگەڵ تەکانی هەرقسەیەک، خیزی لە زاری وشک دەبـوو، لە جیاتی خیـزی قوتدان بۆ ئەوەی قوڕگـی تەڕبکاتەوە، هەوای قوت دەدا، ئەوەش هێندەی دیکە گەرووی وشـک دەکرد: کاتێک بە خۆم زانی هیدۆ تفەنگی لەسەر سەری دانام، کاکەڕەشیش لێم سووراببۆوە، ئاخر ئەوان بەو ڕێیەدا نەهاتن، دابوویانەوە بەربەیاری، چەکەکەیان لێسـتاندم، ئێستا خەریتەکەیان نەداومەتەوە، تفەنگەکەیان هەر شـەوێ دامەوە، بـەڵام باقەنەزمەیان لەگەڵ خۆیان برد، ئێستا بە منداڵێک بۆیان ناردمەوە!

ڕەفعەت ئاغا سمێڵی خۆی دەکرۆشت، قسە نەبوو مووێکی سمێڵی لەگەڵ دەرنەهێنێ! لـە ناکاو لێی چووە پێش وەک گوێی لە قسـەکان نەبووبێت یان بەهەڵـە حاڵی بووبێـت: چ چ چ چ؟ وەڵڵا بابە باش! ئەمـن بۆ ڕدێنێم ناردی

کەچی سمێڵیشت لەسەر دانا! دەبوایە بزانم کوڕی قادر ژنانی و زەلام کوشتن نابی! دەڵێن کفر کاریتەی لێ هەڵناکەوی. بە تەڵاقم دەبێت ئەو پاشناوەی قادری بابت لۆ تۆش دابنێیم لێرە بەدواوە، هەرچی نەڵێ وەلی ژنانی، قاوەی لەو دیوەخانەی ناخواتەوە! ڕەفعەت ئاغا ڕاست دەڵێ، هەموو ناو و ناتۆرەکان ئەوان بۆ خەڵکیان دادەنا. هەر بەپەلە پاکەتی جگەرەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، هێندە بەخێراییو بەڕقەوە لە پەنجەی دەستی چەپی خۆی دەکوتا، چەند جگەرەیەک بەیەکەوە بەربوونەوە. وەلی، جگەرەکانی بۆ ئاغای هەڵگرتنەوە، ئاغا جگەرەیەکی بە لێویەوە ناو ئەوانی دیکەی لەنێو دەستی ورد کردو هەمووی بە دەموچاوی وەلی قادر ژنانیدا دا: لەبەرچاوم ونبە سەگباب هەتا نەمکوشتووی! ئەویش دەست لەسەر سینگ پاشەوپاش لە عەتەبەی دەرگای دیوەخانێ وەدەرکەوت. ئاغا چەرخی دەرهێنا جگەرەکەی دابگیرسێنێ، لە مشەوەشیان ئاگری بە لای فلتەرەکەیەوە نا، ئەو هەلەهەلو پەلەپەلە هێندەی دیکە تەوژمی تووڕەبوونەکەی بە گوڕتر دەکرد، بە جۆرێک، پیشی دەخواردەوە دەتگوت جارێکی دیکە هەناسەی نایەتەوەبەر، خەریک دەبوو بخنکێ. وەکو ئاگری خەڵووزی، پریشکی داوێشتە دەوروبەری. سوێندی دەخوارد ئەوەیان بەسەرەوە ناچێ: ئای وەلی! بە گۆڵم گوێ بڕی، کەچی بە دێڵ دەرچوو!

هەرچەند مژی لە جگەرەکەی دەدا، وای هەڵدەمیسیە نێو سییەکانی، تاوەکو ماوەیەک هیچ خەبەر لە دوکەڵی نێو زاری نەبوو! لە ناکاو بەری دوکەڵی پەنگخواردووی نێو سییەکانی بەردەداو لە هەردوو کونەلووتی وەک لوولە سۆپا دەهاتە دەرێ. بەرهەمی ئەو تووڕەبوونەی و داهێنانی هزری لەو ڕۆژەدا، تەنیا ئەو پاشناوەی ژنانی بوو بۆ وەلی، ئەویشی وەکو قادری بابی، بۆ هەتاهەتایە ریسواکردو

مرۆڤێکی تێکشــکاو و بێئیرادەو خۆ بە کەمزانی لە ناخیدا موتربەکرد. ئەوەی زەینی بەجێ نەدەهێشــت، ئەو پاشــناوەبوو چونکە چــاک دەیزانی لێی دەبێتە تەوقو قیرِی کەوێی ســپی لێی نابێتەوە، هەتاهەتایــە وەکو بابی پێوەی دەناڵێ! بیری لەوە دەکردەوە بۆ دەبێ قەدەری خۆیو بابی ئاوا بێت! لەبەرخۆیەوە ئەو پەندە کوردییەی دەگوتەوە: «زاڵم بوو بە پرد پێیدا مەپەڕەوە!».

ڕەفعەت ئاغا دەیگوت: ئەوانە تەنها بۆ من کێشــە نین، بەڵکو بۆ هەموو ئاغەواتی ناوچەکە کێشــەن، لەنێوبردنیان هەر لەسەر شانی من نییە، دەبێت هەموو ئاغاکان بە هەرنرخێک بێت. لەبەرخۆیەوە ورێنەی دەکردو شــەوانیش خەوی لــێ هەرِکابوو. شــەونەبوو لە خەیاڵی خۆیدا بیرۆکــەی چەند جۆری لەنێوبردن دانەرِێژێو هەڵینەوەشــێنێتەوە. ئــەو کارە بۆی ببووە کارێکی هەرە لە پێشــینەو پەنای دەبردە بەر هەرچی پیاوکوژو ئەو پیاوانەی زەلامی شەوێو دەســتوەکەری بوون. هیچ لــە ئاغاکانی ناوچەکە نەمابوو ئەو باســەی لەگەڵ نەکاتەوە، ئەوانیش باگۆیــان[1] دەدایەوەو ئامادەیی خۆیــان دەردەبرِی، تاوای لێهات، ئەحمەدئاغــا، کە یەکێک لە گەورەی ئاغاواتــی ناوچەکەبوو، ئاغای چوار گوندان بوو، هەرگوندەو برایەک یان برازایەکی خۆی لەســەر دانابوو، زۆر بە دەسەڵات بوو، ئەو رۆژەی شاییو دەهۆڵ و زوورنا بوو خەڵکی حەوت گوندان بانــگ کرابوون، هەر نیشــانێکیان دادەنایەوە، ئەحمەدئاغا یەکەو فیشــەک دەیشــکاند، تــا وای لێهات ئەوەندەی لە دەســت و تفەنگی خــۆی ڕادەبینی کچــی یەک لە جووتیارە کرمانجەکان گۆزەیەکی لەســەر شــانی بوو، لەکاتی

١. باگۆ: بەشداری و پشتڕاستکردنەوەو ڕەوایەتیدان بە قسەی کەسێک بۆئەوەی مکورتری بکات لەسەر بیروڕاکانی.

گەڕانەوەی لەسەر بیریێ بۆ ماڵەوە، ئەحمەدئاغا بە ئامادەبووانی گوت تەماشا بکەن بزانن ئەو گۆزەئاوەی سەرشـــانی ئەو کچەی چۆن دەشکێنمو ئاوەکەی بە ســەر سنگـو مەمکیدا دەڕێژم! تفەنگی لەســـەر دەستی دانا، سێرەی لێگرت و نیوپێـــی هێنایێ[1]، تەققە لە تفەنگێ هات و گۆزەی سەرشـــانی کچەکەی شکاو ئاوەکەی بەسەردا ڕژا.

ئەحمەدئاغـــا، هەڵکەوتەیەکی نێو ئاغای دزەییان بـــوو، بۆیە ئەویش بە نۆبەی خۆی بەڵێنی پشـــتیوانیو هاوکاریکردنی ڕەفعـــەت ئاغای دا. زۆرجار لێیـــان دەگێڕایـــەوە بـــەر مەجریس گوتویەتـــی: هەرچی کاکەڕەشـــی حاجی ســـمایلی و هیدۆی بکوژی تفەنگێکـو دەمانچەیەکی چواردەخۆری بۆ دەکڕم و پێشکەشـــی دەکەم. هەتا دەهات ئەو نرخی کوشتنە بەرزتر دەبۆوە، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ خەڵکانێک ئامادەی خۆتاقیکردنەوە بوون! پیلانی وایان دادەڕشـــت کە دەستەجەمعی ئەو کارەی بکەن!



١. نیوپێی هێنایێ: تفەنگ و دەمانچە، کاتێک پەلاپیتکەی لەسەر دادەگری، دوو بەشە، بەشی یەکەم پێیدەگوترێ نیوپێ کە هێشتا نەتتەقاندووە، کە دەستت تەواو داگرت و تەقی، ئەوە پێی تەواوە.

# ١١

هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بەســەر چەککردنی وەلی قادر ژنانیدا تێپەڕیوە، وەلــێ، ئاغاکان وەکو مار لە کلکی خۆیان خۆش نابن! کێچیان کەوتۆتە کەوڵی، بەتایبەتی مشــیرئاغاو بابی. هەرچەند جاری ئەو خەریتە فیشــەکەی خۆی لە پشــتی هیدۆی دەبینی، خەریکە خوێنی بمەیێو گۆشــتی بەردەدا، خۆی دەخواتەوەو لە ناخەوە وێران دەبێ. ئەو قایشــخەریتە، دەســتکردی حەسیب قــادری کەرکوکە، بــە هۆی جۆریو گرانــی نرخەکەی، هەمــوو کەس توانای کڕینی نییە، هەرکەسێک لە هیدۆی دەپرسی ئەو خەریتەیەی حەسیب قادری کەرکوکێت لە کوێ کڕیوە، دەیگوت: ئەوە بە دیاری بۆیان ناردووم! ئەو قسەیەی هیدۆی، وەک گوللەیان پێوە بنێ، ئازاریان دەداتو دڵیان دەسمێ!

زستانێکی زۆر ساردو سەقەمە، شەوان خوسی دەکاتو گۆماوەکان شەختە بەستوویەتی. بەیانان لەگەڵ ئەنگوتنی ســروە، خەڵکی ئاوایی بە ژنو پیاوەوە لە جــێو بالینگانی گەرم دێنەدەرێو مشــووری کاری خۆیــان دەخۆن. کاری هەریەکەیــان دیارە، کێشکەپاســاریو ریشــۆڵەکان لــە چاوەڕوانیی جووڵەی ژنەکاندان، ئاخۆ کام ژن یەکەم پاشــۆڵی پاشماوەی خواردنو ئالیکی ئاژەڵەکان لە ســەر گوفەکی ڕۆدەکات، بە ئومێدی ئەوەی چەنــد دەنکە دانەوێڵەیەکیان

دەست بکەوێت. ئەو بەیانییە سادە، پاشماوەی کاوکۆتەکە هێشتا هەڵمی لێهەڵدەستێ، کێشکەپاسارىو ڕیشۆڵەکان گەواڵەی دەکەنو دەلعازی بەسەریدا دەبارنە خوارێ. منداڵانی ئاوایی هەر بابایە دەست لە نێو پستێرو نێوگەڵی یەکتری دەخشێنن، بۆئەوەی بزانن کامەیان ئەوشەوە میزی لە بنەخۆی کردییە، بۆئەوەی بیکەنە زەخیرەی پێڕابواردنی ئەوڕۆژەیانو پێی بڵێن کوندەمیز، کوندەمیز! لەسەر شەختە خۆیان دەخلیسکێنن، ئەوانەی میزیان بە خۆیاندا کردووە بە ئەنقەست خۆیان بەردەدەنەوە بۆئەوەی بڵێن لە کاتی کەوتنە خوارەوە شەروارەکانیان تەڕبووە. منداڵی وا هەیە هەر لە جێگای نوستنەکەی کە دەزانێ میزی بەخۆداکردووە، بەو سبەینێیە داوای ئاوێ دەکات، بۆئەوەی بەسەر خۆیدا بڕژێنێو وا نیشان بدات بە ئاوێ تەڕبووە نەک میزی بەخۆیدا کردووە. ژنو پیاو، گەورەو بچووک هەرکەسەو کاری خۆی دیارەو کەس ناچێتە سەرکاری ئەویدی، ئەو تابلۆ ڕەنگاڵەیىو ئاوێزەیەی ئەو بەیانییەی گوندنشینان، ڕەنگەکانی هەموو دنیا بەشی ناکات! منداڵانی ئاوایی، لاسایی سەگەکانیان دەکەنەوە، کاتێک دەبینن، سەگەکان دەحەپن، بە ئەستوورایی دەمیان هەڵمیان لێدێتە دەرێ. منداڵان مەبەستیان لەو لاساییکردنەوەیەی سەگەکان ئەوەیە پێشبڕکێ بکەن، بۆئەوەی نیشانی بدەن هەڵمی دەمی کامەیان ئەستوورترو زیاتر لە هەوادا بڕدەکات!

پیرەژنەکان، لەگەنێک دانەوێڵەیان بەدەستەوەیەو دەرگای کولانەی مریشکەکان دەکەنەوە، هێشتا بە تەواوی دەرگا نەکراوەتەوە دوو دوو و سێ سێ خۆیان بە دەرگایدا دەدەن، پیرەژنی بە ئەزموونو میهرەبان، دوو سێ مستەگەنم بە بەر مریشکەکان وەردەکات، تێکقژقژانێکە نەبێتەوە! هەریەکەو لە هەڵپەی

ئەوەیدایە چەند دەنکەگەنمێک لەوی دیکە زیاتر هەڵبگرێتەوە.

خەڵکی گوندی، وەک کوورەی هەنگ و شـــارەمێروولە، هەرکەسەو بە کاری ڕۆژانەی خۆیانەوە سەرقاڵن، ســـەرەژنەکان بەرانپیلیان ڕاستو چەپ حەمایل کـــردووەو چوونەتە بەر مانگادۆشـــین، بە جۆرێکی ســـەرنجراکێش گۆرانی بۆ مانگاکان دەڵێـــنو دەیانلاوێننەوە، خوا هەڵناگـــرێ مانگاکانیش خۆ نابزێون، بەڵکو، بە نیشـــانەی ڕازیبوونو پێخۆشـــبوونی ئاوازەکـــە، ئاوڕێک لە کابانی میهرەبـــان دەدەنەوە. زرەی پوولەکەی ســـەر کەرکیتی تەونـــی مافوورو بڕینی گورینگیو کوتانەوەی ڕایەڵەکان، ئەوەمان پێدەڵێ لەو ماڵە تەونکەر مافووری لە دارە. چەندە شـــیرینە! کچی چەلەنگ، وەکی لەسەر دارەبازی تەونی کلیلی کەمبەران دادێخی! ئاخر کچەکە تەونکەرەو ئەوەش ئیمیتیازە!

دوو کەس، جوانەئەسپێکی ســـاوایان هێناوە بە بەنێک هەردوو ڕەفیسکی پاشوویان بەســـتاوە، چاوەڕوانن ڕۆژویان گەرمدابێتو شەختەو بەند بیکاتەوە، لەنێو وەردو قوڕەشـــێلی بیدەنە بەر حەیزەرانو قامچییان، بۆ ئەوەی ڕەوهان[١] دەربچێـــتو بە هۆی بەنەکانی ڕەفیســـکی ناتوانێ شـــەقاوی درێژ باوێ، دەبێ بـــەوردی هەنگاوان باوێ. لە دەو ڕووباریڕا تەمێکی ســـپی بە ئاســـپایی بەرەو گوندی ڕادەخشی، هەموو دیمەنەکانی ئەو بەیانییەو ئەو تابلۆ پەرجووئاسایەی گوندنشـــینانی لەخۆیدا نقـــوم کرد، خۆی لە گردۆلکەکان وەرپێچاو، شـــانی لە کۆڵانەکانی ئاوایی دەســـوو، باڵی بەســـەر گوندیدا کێشـــا، وەک پەشتەماری سپیی خوداوەند، تەمێک وەک لۆکەی پەڕەکراو.

---

١. ڕەوهان: یەرغە، یەغرە، جۆرێک ڕەوت و ڕۆیینی وڵاخە لە بەینی غار و ڕۆیشتنی ئاساییدایە.

عوسمانەڕەش، شەرتی شـــوانی پاری هەڵاتو شوانێکی تازە وەک ڕێنجبەر لە لای دامەزراوە، عوســـمانەڕەش لەنێـــو ئاژەڵدارانی ناوچەکـــە، بانۆکەکی[١] بەناوبانگ بوو. ئـــەو بەیانییە، بزنێکی کارمردووی لەســـەر کارێکی دایکمردوو دەباناندەوە[٢]، هەنگاو هەنگاو بۆ شـــوانە تازەکەی شـــی دەکردەوەو بە کردەییش لەبەرچاوی بزنەکەی دەباناندەوە، بۆئەوەی شوانەکەی لە ئایندەدا ببێتە بانۆکەکی شارەزا. بزنە کارمردووەکەی هێنا، چاوی بەستەوە، پەنجەی لەنێو ئەندامی زاوزێی بزنەکە نا، واتە زێی زڕەنگوســـت دا[٣]، بە جۆرێک ئەنگوســـتی لە زێی بزنەکە وەردەدا، هەست بە ئازار بکات. لەو کاتەدا بزنەکەی دەسووڕاند بۆ ئەوەی گێژ بێت، هەندێک خوێواوکی خەستی بە پشتی کارە داکمردووەکەیدا کرد، لەگەڵ گێژبوونو ئازاری زێی بزنەکە، چاویان کردەوەو کارەکەیان هاوێشـــتە بەری، ئەویش دەستی بە لســـتنەوەی پشتی کارەکە کرد، وەک کاری خۆی بلێسێتەوە. کارەکەش دەستی بە مژینی گوانی بزنەکە کرد، بەو شێوەیە، بزنەکەی لە سەر کارەکە باناندەوە.

عوسمانەڕەش بە شوانەکەی گوت: ئەگەر پێستی کارە مردووەکەی بزنەکە مابا، حەوجەی خوێ پێداکردن نەدەبووین، پێســـتەکەمان بەسەردا دێناو بۆنی پێوەدەکرد. ئەو کردەیەی عوســـمانەڕەش بۆ ئەوەبوو بزنەکە لە بێ کاری، شیری

---

١. بانۆک: ئەو کەسەی مەڕ یان بزنی بێچوومردوو لەسەر کار و بەرخی داکمردوو دەبانێتەوە. (وەبەردەنێتەوە)

٢. دەباناندەوە (باناندن): کرداری وەبەرنانەوەی بێچووی بزن و مەڕ.

٣. زڕەنگوست: کاتێک بانۆک، بۆ وەبەرنانەوەی کار و بەرخی داکمردوو، پەنجەگەورەی دەستی دەخاتە نێو ماڵ (زێ، ئەندامی زاوزێ)ی مەڕ یان بزنەکە، بای دەدا و ئەزیەتی دەدا، بۆئەوەی وابزانێ کە تازە زاوە.

وشک نەکاتو کارەکەش لە بێ دایکی نەمرێ.

ڕۆستەمەشێتیش، وەک هەرکەسێکی دیکە کەوتبووە ژێر کاریگەریی نەریتە باوەکان، دوو کچی هەبوو، بەڵام حەزی دەکرد کوڕێکیشیان ببێ، حەزو ئارەزووەکەی هاتەدیو کوڕێکیان بوو، کوڕێک هاتە ئەو دنیا پڕ لە کێشمەکێشو غەدرو نادادییە، ژنی ئاوایی بۆ سەردانو یارمەتیدانی ژنی ڕۆستەمی، ڕێچکەیان بەست. تەڕەحەلواو چێشتو شیرو زۆر پێداویستیی ژنی زێستانیان بۆ برد. مەلۆتکەکەیان کردە قۆنداغەو لە سەر بێژینگیان درێژکردو قورئانێکیان لە پشتی سەری دانا، لە ترسی ئەوەی نەبادا شەوە بیبات! حەوت شەوی تەواو خەڵکی ئاوایی لەترسی شەوە، لە شەوارەی ئەو منداڵەی دانیشتن، ڕۆستەمەشێت دڵی زۆر خۆشە بەوەی لە دوای دوو کچان خودا ئاوڕی لێداوەتەوەو کوڕێکی پێ بەخشیوە، خەڵکی ئاوایی دەڵێن: ڕۆستەم کوڕەکەت گەورەبێت حەز دەکەی ببێتە چیو چ کارێکی پێ دەکەی؟ ڕۆستەمەشێت دەڵێ: ئەگەر گەورەبوو و خودا بێمزەڕەتی کرد، قەت ناهێڵم بچێتە شارو، گوندی خۆی بەجێبێڵێ، پێی دەڵێم کوڕم دەستم دامێنت نەکەی بچییە شاری، چونکە لە شاری، مردووش دزیت لێدەکەن، شار پڕاوپڕە لە دز، لە گوندی خۆمان ببە شوان، گاوان، کاکە لەو گوندەی خۆمان تەشتی زێڕ لەسەر سەرت دابنێ کەس دەستی بۆ نابات، لە گوندی کەس قوومەدۆیەک، مراکەماستەکی بەبێ یەکدی ناخۆن، ئەوە نییە ئەمن نە مەڕم هەیە، نە بزنو مانگا، کەچی بن سەوەشیری پڕە لە ماستو دۆ! بە خودای لە شاری کۆرەبی لۆ قوومەدۆیەکی کەس ناتداتێو کەس ڕەحمی بە کەسدا نایێ!

لە دوای تەواوبوونی شەوارەی کوڕی ڕۆستەمەشێتی، سەری نییەتی

ڕەمەزانییـــە، خەڵکی گونـــدی دەهۆڵی دەدەنـــە ڕۆســـتەمیو دەڵێن: ئەگەر پارشـــێوان دەهۆڵی بەئاگاهێنانەوەی پارشـــێوان بۆ گوندی نەکوتی، هەموومان باردەکەینو ماڵمان دەبەینە شاری! ڕۆستەمەشـێت هەر زوو دەهۆڵەکەو دوو دارحەیزەرانەکەیان لێوەردەگرێ: هەر سی شەوی ڕەمەزانێ دەهۆڵتان بۆ لێدەدەم، بەس قەولم پێبدەن مەچن بۆ شـــاری! خەڵکی گوندی قەولی پێ دەدەنو دەڵێن ڕۆژی عارفەش بە زیادەوە هەقی خۆتت دەدەینێ!

ڕەفعـــەت ئاغا بەو مانگـــی ڕەمەزانی پیـــرۆزەش، لە پیلانگێـــڕی ناکەوێو هەدا نـــادات! لەو گوندەی بۆتە میرغەزەب، دوو ڕێگـــەی لە بەردەمی کرمانجە هەژارەکاندا هێشـــتۆتەوە: یان ڕازیبوون بە نۆکەرایەتی، یان کوشتنو لەنێوچوون! هەرچەندە ســـوخرەو ســـەرانەش کەم تا کورتێک بۆ ئاغای هەر دەکەن، بەڵام دڵی بەوەندە ئاو ناخواتەوە، بە جۆرێک لەلا ماڵی حاجی ســـمایلو کوڕەکانی هاوێشتۆتە ملان، کەس ناتوانێ ســـاردی بکاتەوەو دەســـتبەرداری پیلانەکانی بێت، بە چەند ئاغایـــەک کۆمەکی ڕەفعـــەت ئاغای دەکەن، چەنـــد تفەنگچییەکی بۆ دەنێرن، ئەویش کاوڕێکی قەڵەوی بۆ سەربڕینو نانێکی چەوری دانێ بە ئومێدی ئەوەی لە بری ئەو دەم چەورکردنەی، ئەوشـــەو کەتنێکیـــان پێ بکات، باب بۆ نەوەکانی بگێڕێتەوەو بۆ خۆیشی ئۆخژنێک لە دڵی بگەڕێ.

لە شـــەوێکی نمنمەی باراناویدا، ئەوشـــەوەی ئاســـمان تیکی دا، ئەوشەو توخمی گوناهێک تروکا، لە حەژمەتان ئەستێرە خۆیان شاردەوە!

تاریکەشـــەوێکی ئەنگوســـتەچاوە، یەکـــەم شـــەوی مانگـــی ڕەمەزانییە، ڕۆستەمەشێت بە نیازە بە دەهۆڵەکەی خەڵکی ئاوایی بۆ پارشێوێ بە ئاگابێنێتەوەو لە خەویان هەڵبســـتێنێت، تازە لە سەر دەهۆڵکوتانی پارشـــێوان دامەزراوە، بە

ئومێدی ئەوەی ڕۆژی عارفەی، مووچەو بەراتی دەهۆڵکوتانەکەی وەربگرێت.

یەک لە تفەنگچییەکان، بە ڕەفعەت ئاغای گوت: سەگەکانی ماڵی حاجی سمایلی سواری لە سەر زینی دەهێننە خوارێ، باوەڕ ناکەم کەلێنمان بدەنێو لێبگەڕێن بگەینە شوێنی دامەزرانو تەقەکردن، بە تایبەتی ئەو سەگە هەوشارەی حومێرەی، کە بە کەرێکو کورتەکو شەروارێکی مرادخانی فەتاح پاشاو ساقۆیەکی ڕووسی ئاودامەن، لە دۆمانی کڕیوە. ئەو سەگە، هێندە دڕو نەقۆڵایە، بە ڕۆژ زنجیر کراوەو بەستراوەتەوە، تەنها شەوان کاتی ماڵنووستنان بەری دەدەن، یەک سەگیش باشاری ناکات، قانڕی زەلامی چەکدارە، وا پەروەردەکراوە چەنگەبازی زەلامی چەکدار دەبێت، هەتا وەکو تفەنگەکەی فڕێنەدات لە یەخەی نابێتەوە، چەکی بە چەند کەسان فڕێداوە! ڕەفعەت ئاغا دەڵێ: خەمی سەگەکانتان نەبێت، تەگبیرم بۆ سەگەکانیش کردووە، یەک لە پیاوەکانی بانگ دەکاتو پێیدەڵێ لە کاتی ماڵنووستنان بچۆ، دێڵەسەگێکی بە بام لە کادێنێ بەستاوەتەوە، مێغزنجیرەکەی هەڵکێشەو بیبە بەردەرگای ماڵی حاجی سمایلی، تاوەکو سەگەکانیان بۆنی ئەو دێڵەبەبایەی دەکەنو بە دوای دەکەون، لەو کەندەی بەرئاوایی دێڵەکە ببەستەوە، ئەو سەگانەی ماڵی حاجی سمایلی هەتاوەکو بەیانی بە دیارییەوە دەبنو سواری دەبنو پێوەی دەبن و نۆرەی لێدەکەن!

ڕەفعەت ئاغا، شوێنی هەریەک لە تفەنگچییەکان دیاری دەکات، پیلانێکی ئەوتۆی داناوە، دڵنیایە ئەوشەو ئەنجام بەدەست دەخات: دوو کەس لە پەنای دیواری چاڵەگەنمەکە دانیشن، وەختێک تەقە دەست پێدەکات، حومێرە دەیەوێت بسوورێتەوەو بە هانای ماڵی بابییەوە بێت، دێتەوە بەرلوولەی تفەنگی ئێوەو بیکوژن! شوێنی هەموو تفەنگچییەکان دیاری دەکاتو یەکەم دەستدرێژ لە

دەرگای ماڵەکانیان بکەن، بۆ ئەوەی بە کوژرانو بریندار بوونی ژنو منداڵەکانیان، سەریان لـێ بشێویو نەترەی بەربدەنو قەڵەمیان بشکێ!

شـــەوێکی کشـــومات، نمنم بـــاران دەبـــاری، تەنانەت گوێـــت لە حەپەی سـەگێکیش نییە، دەڵێی ئەو گونـدە زیڕۆحی تێدا نەماوە! شـریقەی یەکەم دەستدرێژ بێدەنگی گوندی قەڵاشـت. گوللە، وەکو ڕێژنەی باران دەباری، ڕووی لوولەی تفەنگەکانیان لە دەرگای ژوورەکانە، وەلـــێ حاجی سمایلو کوڕەکانی، ڕۆژگار فێـری کردوون، لە میوانداریش قەت لــە بەرامبەری دەرگاو دەلاقەکان نانوون! هەمیشـه شـوێنی خەوتنیان نابـێ گوللە بیگرێتـەوە. وەک پۆلە ژەنگەسـووره، فیشـەکی ئاوردار بەنێو ماڵەکان وەرکرا! حاجیژن وەک ئەرکی خـۆی، بە بووکەکانی گـوت ئەو لانکو ئەو منداڵانە بێننە ئەو گۆشـەی کە گوللە نایگرێتەوە، لە بەرامبەری دەرگا نەبن بۆئەوەی سەلامەت بن!

لەو شـەوەدا تەنیا دەنگی چەک دەبیسـترێ. دەنگی چەک، واتا دەنگی دارمانو مەرگ، دەنگی لێسـەندنەوەی ژیان لە مرۆڤەکان، دەنگی ڕقو کینە، دەنگـی هەترەشـچوونی ژنو منداڵـی ئاوایی، دەنگی مـردن، دەنگی لرفەی کوفارەی خوێنی بەرائەتو گۆشـاوگۆش سـەربڕینی ژیـان! کوڕەکانی حاجی سـمایلی لە تەقەکردنو خۆپارێزیو دوژمن فریـودان زۆر کارامەو مەعلانن، حومێرە لەسـەر دیواری خانوەکەی خۆیـڕا تەقە دەکات، بـەڵام هەرجارەو لە شوێنێک تەقە دەکات، بۆئەوەی سەر لە دوژمن بشێوێنێو نەزانن چەند کەس لـەو خانووەدا شـەڕدەکەن. تفەنگچییەکانی ڕەفعەت ئاغا، بـە تایبەتی ئەو دووەی پەنای دیواری چاڵەگەنمەکەی، ئەو سـووچە دیوارەیان بە گوللە دابێژاوە کـە بە نیاز بوون حومێـرە لەوێوە بە هاواری ماڵی باوکـیو برایەکانیەوە بێت.

حوسێن بە زانایانەوە شەڕدەکاتو دەستی بە فیشەکەوەیە، بۆئەوەی بەشیان بکاتو لێیان نەبڕێ، شریقەی تفەنگان ئاسمانی کەڕ دەکرد. شەڕەگوللەی شەوێ لەگەڵ شەڕی ڕۆژێ جیاوازە. کاکەڕەش تەماشای براچەی[1] لوولەی تفەنگەکانیان دەکات، لە کوێ بڵێسەی ئاگری تفەنگەکان دیاردەکەون، بە زانابوون ئەو شوێنە دەکاتە ئامانج، ئەگەر نەشیپێکێ بە دڵنیاییەوە لەو شوێنە هەڵیدەقەنێو ناچاری دەکات هەڵبێ. لە گەرمەی دەستڕێژی گوللەو قرمەژنی تفەنگان یەک لە منداڵەکانی ماڵی حاجی سمایلی، لەنێو لانکێ زیرەیەکی پێوەنووساوە بە هیچ شێوەیەک دایکی پێی کرو ژێر ناکرێتەوە. لەو گۆشەیەی کە هەموویان لێی کۆبوونەتەوە، هەرژنێک لە بووکەکانی حاجی خۆی بەسەر منداڵەکانیدا هێناوە، وەکو بارەکەو لە بن باڵی خۆی دەیانپارێزێ، حاجیژن بە خۆی سەرپەرشتیی بووکەکانو نەوەکانی دەکاتو ئاویان بۆ دێنێو دەڵێ هەریەکەو قومێکیان بدەنێ با نەترسێن. تەنها ئەو منداڵەی نێولانکێ ژێر نابێتەوە! حاجیژن دەڵێ کچم لە لانکێ دەریبێنە، با تەماشای بکەین، ئەو زیرەزیرە بێ هۆکار نییە، ئەویش دەسترازەی لانکێ شل دەکاتەوەو سەر زگی لەسەر منداڵەکەی لادەبات، دەستو نێو لەپی تەڕدەبێت! کاتێک پلیتی فانۆسەکە بڵند دەکەن، بۆئەوەی ڕووناکایی زیاتر بداتە دەوروبەر، دەبینێت دەستی هەموو خوێنە، دەیەوێت بزریکێنێو هاواربکات، بەڵام حاجیژن هاوارەکەی پێ قوت دەداتەوەو ناهێڵێ بزریکێنێ، بۆئەوەی نەبادا پیاوەکان بزانن منداڵێکیان گوللەی پێکەوتووەو برینداریان هەیەو دەستیان لە شەڕ شل

---

١. براچە: ئەو تیشکەی کە بە شەو لە لوولەی تۆپ و تفەنگ دەردەچێ.

بێت و کاریگەریی خراپی لەسەر ورەو خۆڕاگرییان دروست بکات! حاجیژن، هەر بەپەلەو بەکرو بێدەنگی، برینی منداڵەکە دەپێچێتەوەو بەو کەرەستە سەرەتاییەی لەبەردەستیدا هەیە، تیماری دەکات. دیارە ئەو منداڵە لەگەڵ یەکەم دەستڕێژ پێکراوەو چەند گوللەیەکیش بە کەوارەی لانکێ کەوتووە. حاجیژن بە بووکەکانو نەوەکانی دەڵێت بە هیچ شێوەیەک نابێت پیاوەکان ئاگادار بکەنەوە کە منداڵێکیان بریندارە، تاوەکو شەڕ تەواو دەبێت، ئەو کات بە خۆم دەزانم چۆنیان پێ دەڵێم، ئێستا نابێت بیزانن، نەبادا دەستیان شل بێتو ورەیان دابەزێ. لەوکاتەی ئەوان سەرقاڵی شەڕەتفەنگی خۆیانن، جار نا جار حاجیژن لە دەلاقەیڕا هاواردەکات: بە قوربانتان بم کوڕە چەلەنگەکانم، لێیان وەرنەدەست، دەستهەرینانەکی مەردانە بکەن، شیری مەمکی من لە خۆتان حەلاڵ بکەن! ئەو نەعرەتەو هاوارەی حاجیژنێ، ورەی دوژمنەکانی داتەپاندو ورەی کوڕەکانی دەبردە کەشکەلانی فەلەک! لە گەرمەی تەقەکردن، حومێرە حەیرانێکی سەرچیایی تێهەرکرد! هەورەکان زگیان بە عەرزییەوە ناوەو لە هەموو گەواڵەکان خوێنو پریشکە ئاورینگ دەبارێ، بلاچەی ئاگری لوولەی تفەنگەکان، قرموهۆڕی گوللان، گوێی ئاسمانی کەڕکردووە، گوڕڕەی قەوانەکان هەواڵی مەرگیان بە گوێی خەڵکی ئاواییدا دەدا. ئەوەی جێی سەرسووڕمانی حاجی سمایلو کوڕەکانیەتی، نەحەپینی سەگەکانیانە! ئەوە دەبێت چ تەلیسمێک بێت؟! سەگی ئێمە شەوان ناهێڵن تەیر تخونی ئەو نێوەی بکەوێت، کەچی ئەوشەو بۆ تاقە یەکجاریش گوێمان لە حەپەی سەگەکان نەبوو! بە دڵنیاییەوە نهێنییەک لە پشت بێدەنگکردنی سەگەکانمانەوە هەیە، مەگەر دەرمانیان دابنێ! حاجی سمایل شاقەلی کەوایەکەی لەبەرپشتێنی

ڕاکردۆتەوە، تاپڕێکی بەدەستەوەیەو بەسەر هەموو کوڕەکانیدا دەگەڕێو بەسەریان دەکاتەوە، بۆئەوەی لە ساغیو سەلامەتییان دڵنیابێتەوە، دەیویست بە هەرنرخێک بێت بسووڕێتەوە لای خانووی حومێرەی کوڕی کە لەپشت خانووی خۆیانەوە بوو، بەڵام گوللەیەک کەشیدەی پشتی لە دوو سێ قەفەوە بڕیو گوللەیەکیش سەرشانی هەڵدڕی. حاجی سمایل نایەوێ ژنو منداڵ بەو برینداریيەی بزانن، بەپەلە دەگەڕێتەوە لای حوسێنی کوڕەگەورەی، برینەکەی سەرشانی بۆ توند شەتەک دەدا، بە زۆری ناچاری دەکات لە خانووی کادێنەکە دابنیشێ، وەلێ حاجی سمایل ئەوەندە بە کولافەیە بۆ کوڕەکانی، لە بەرامبەردا برینەکەی خۆی بە هەند وەرناگرێ، حوسێن پێی گوت: بابە گیان ئەتۆ دەبوایە لە لای ژنو منداڵەکان مابایتەوە، نەک بەسەر ئێمەدا بگەڕێیو ئێمە بەسەربکەیەوە، ئەوەتا دانەنیشتی لە شوێنێک کە گوللە نەیگرێتەوە، تا خۆت بە فەیز گەیاندو بریندار بووی، چاکە برینەکەت سووکە! حاجی سمایل بۆئەوەی دڵنیای بکات کە خەمی ژنو منداڵەکانی نەبێتو جێگایان پارێزراوە، گوتی: دایکت لەلایانەو سەرپەرشتییان دەکات، لەو گۆشەیەی لای کەندووی ئاردو گەنمەکە خۆیان پەناداوە، ئەو شوێنە گوللە نایگرێتەوە، ئێوە شەڕی خۆتان بکەن لە خەمی ئەواندا مەبن، بە دڵنیاییەوە پارێزراو دەبن.

حاجی سمایل دەیویست لە یەک کاتدا دروست ببێتە سێ قەڵغان، سێ زرێ، سێ گوللەبەندو، ئەو گوللانە بگێڕێتەوە کە بە ئاڕاستەی سینگی حوسێن و حومێرە و کاکەڕەشی کوڕی دەهاوێژرێن. ژیانی خۆی نیو هێندەی ژیانی کوڕەکانی لا گرنگ نەبوو، زۆر جار دەیگوت: مریشک بە مریشکایەتی خۆی شەڕی هەموو گیانلەبەرێک دەکات کە بیەوێ زیانو ئازار بە جووجکەکانی بگەیەنێ! سەیرم بەو

باوکانە دێت لە بەرامبەر پاراستنی جگەرگۆشەکانیان خۆیان بەرپرسیار نابینن!

دەستەیەک لە مرۆڤکوژی دڵڕەق، گوندیان نغرۆکرد لە نەفرەتی. ئەوشەوە، ژنو منداڵی ئەو گوندە لەگەڵ شریقەی تفەنگان خەریکە زیرە دەکەن! لە هەموو کۆڵانەکان بۆنی بارووت داوێستاوە. ژن و دایکی ڕۆستەمەشێتی، زاریان وشک و هەناسەیان سوار بووە، هەڵدەلەرزنو لەبەرخۆیانەوە بە دوودڵییەوە دەڵێن: کوێربم بۆ ماڵی حاجی سمایلو کوڕەکانی! بە خوای کەسیان لێ دەرناچێ، هەموویان کوشتنو تەواویان کردن، هەقی پیاوچاکیی خۆیان دەدەن. ڕۆستەم بە بیستنی ئەو ڕیزە قسەیەی کە گوتیان ماڵی حاجی سمایلی تەواو کەسیان بە ساغی نامێنێو هەر هەموویان کوشتن، کێچی کەوتە کەوڵیو هەر خەریکی کۆکردنەوەی خۆی بوو، وەک بیەوێ بەپەلە بەکارێک ڕابگات، عەلەتریکە سێ پاترییەکەی لەنێو لەپی دەستییەو وەک ئێستا نا ئێستا بیەوێ دەرگا بکاتەوەو لەو دڵەڕاوکێیە خۆی ڕەها بکاتو بچێتە نێو ئەو گوللەبارانە کە وەک برێشکە گوللە دەتەقنەوە! لەوشەوەدا لە نمەی بارانو بۆنی بارووتو مەرگو خوێن زیاتر هیچ شتێک سەردەست نییە. بەهۆی تەڕیی عەرزوبانی خانووەکان، هەر تەقەیەک لە دوای خۆی هاشەو دەنگدانەوەیەکی ترسناک جێدێڵێو دەنگ دەداتەوە. تەنها گۆردەو خزمەتکارەکانی ئاغای لێدەرچێت، ئەگەرنا تەواوی کرمانجەکان هەرکەسەو لە ماڵی خۆی خێری لە خۆی گرتووەو لە خەمی ماڵی حاجی سمایلییە. هەندێکیان لە خەمان وشک بوونەتەوە، مەزەندە دەکەن بەیانی کەسیان بە زیندوویی نەبیننەوەو تاقیان لێ دەرناچێ!

لەو گەرمەی شەڕو گوللەبارانە، ڕۆستەمەشێت عەلەتریکە سێ پاترییەکەی دەستدایەو بەپەلە بۆ لای دەرگاکە ڕۆیشت، ساتمەی لە دەهۆڵەکە کرد کە

داینابوو بۆئەوەی پارشـێوێ بە کۆڵانەکانی گوندیـدا بگەڕێو بە دەهۆڵکوتان خەڵکی ئاوایی بە ئاگا بێنێتەوە. لەو کاتەدا دەنگی دەهۆڵەکە سەرنجی دایکی ڕۆستەمو ژنەکەی بۆ لای ڕۆستەمی ڕاکێشا، بە جووت گوتیان: ڕۆستەم ئەوە بەتەمای چی؟ گوتی: دەچم بزانم کاکەڕەش کوژراوە یان ماوە! دایکیو ژنە زەیستانییەکەی خۆیان بە ڕۆستەمیدا شـۆڕکردەوە، زۆریان گوت بیکە خاتری ئەو مەلۆتکەیەی مەچۆ دەرێ! بەڵام کوا باشـاری ڕۆسـتەمی دەکەنو بە ژنان بەرزەفت دەکرێ! خۆی ڕاپسکاندو یەکتاو تەقرەکوت بۆ ماڵی حاجی سمایلی. تفەنگچییەکانـی ئاغای، نێوە نێوە تەقەیان ڕادەگـرت، بۆئەوەی یەکێک بێتە دەرێو تەقەی لێبکەن. ڕۆستەمەشـێت، لەو کاتەی لـەو دوو تفەنگچییەی پەنـای دیواری چاڵەگەنمەکە نزیک دەبێتەوە، دڵنیا دەبن ئەوە کاکەڕەشـە، بە جووت بە قەسـتی کوشـتن تەقەی لێدەکەنو دڵنیا دەبن کاکەڕەشیان کوشت، عەلەمدارو سیمبولی شانازیی گوندێکیان خلتانی خوێن کرد.

تفەنگچییەکانـی پەنـای دیواری چاڵـە گەنمەکە، ئەوەنـدە دڵنیا دەبن کە کاکەڕەشی حاجی سـمایلیان کوشتووە، بۆیە وەک نیشانەی سەرکەوتنو پێکانی ئامانج، گوللەیەکی ئاگردار بەرەو ئاسـمانێ، بە مانای پاشەکشـێ بۆ دیوەخانی ڕەفعەت ئاغای، دەتەقێنـن. تەقە، کپ دەبێتو تفەنگچییەکان دەکشـێنەوە. لەوشـەوە ئەنگوسـتەچاوەدا، لە هەناوی تاریکیدا ئەسـتێرەیەکیان بەردایەوە، ڕۆستەمەشێت چەند جارێک دەکەوێو هەڵدەستێتەوە، برینەکەی گەرماو گەرمە کوفارەو چۆڕانەوەی خوێنەکەی، بە سەر عەرزە تەڕەکەدا تنۆک تنۆک لەگەڵ دڵۆپە بارانەکان تێکەڵ دەبن. لەو شوێنەی دەپێکرێ، تا دەگاتە بەردەرکی حەساری ماڵی حاجی سـمایلی، لەسەر عەرزە تەڕەکە تەنها چۆڕاوگەی خوێنو شوێن پێی دیارە،

لەگەڵ چۆڕاوگەی گوێســـوانەکانی ئاوایی تێکەڵاو بووە، هێزو وزەی هەنگاوەکانی قامەتی گوندێک، هەر هەتا ئێرە بڕدەکات. بەنێو گۆمیلکە باراناوەکەی بەردەرگای حەساری ماڵی حاجی ســـمایلیدا دەکەوێتو گۆمیلکەباراناوەکە بە خوێنی خۆی سوور سوور دەکات، وەک ئەوەی ئەوشەوە هەورەکان خوێنیان باراندبێت!

لە بن دەرگای حەساری دیارە عەلەتریکەکەی هێشتا دایسیو نەکوژاوەتەوە. کاکەڕەش لاتەریک خۆی دەگەیەنێتە لای دەرگای حەســـاریو کەلێنی دەرگاکە بە ئەســـپایی دەکاتـــەوە، تفەنگ لەنێو لەپی دەســـتیو لە ئامادەباشـــیدایە، تارمایی بریندارێک بەدی دەکات کە سەری کەوتۆتە لای سیوسیوەی دەرگاکەو عەلەتریکێکی سێ پاتری لەو نێوە کەوتووە، تیشکی ڕووناکییەکەی سەرچیغ بە ســـەر زەویدا خۆی ڕاکێشـــاوە. کاکەڕەش دەرگای دەکاتەوە، عەلەتریکەکەی هەڵدەگرێتەوەو لەنێو قوورو بەربارانەکەدا ڕووناکی دەڕژێنێتە ســـەر قامەتی بریندارەکـــە، ئەوەی هەرگیز نەدەبوو بیبینێو قەتی مەزەندە نەدەکرد، بە چاوی خۆی بینیی. لەو چرکەســـاتەدا لە ناوەوە هەستی بە شـــکانو وردوخاشبوونی خۆی دەکرد. لەنێو ئەو قوڕە دانیشـــت، سەری ڕۆستەمی خستبووە سەر ڕانیو خۆی بەســـەردا داهێنابۆوە، سینگی کردبووە چەتر بۆ ئەوەی لە پڕووشکە باران بیپارێـــزێ. کێ بەرگەو جورئەتـــی هێنکەهێنکی دواهەناســـەکانی بەرائەت دەگـــرێ؟ نمنم باران دەبـــارێ، وەک بیەوێ ئەو غەدرە بشـــواتەوەو کۆڵانەکانی گوند بسمیل بکات، بانگیدەکات: ڕۆستەم! ڕۆستەم! ئەمنم، کاکەڕەشی حاجی سمایلی! ڕۆستەم چاوی هەڵدێنێ، ئومێدێک بە کاکەڕەش دەبەخشێتو داوای عەلەتریکەکەی دەکات. کاکەڕەش عەلەتریکەکەی بە هەڵکراوی لە دەســـتی دەنێ. ڕۆســـتەم بۆ دڵنیایی، شەوقی عەلەتریکەکەی لە دم و چاوی کاکەڕەش

گیردەکاتو سەیری نێو چاوی دەکات، بۆئەوەی دڵنیابێت کە کاکەڕەشە! ئەویش، بە ئومێدی ئـــەوەی لە کانی چاوەکانی هەلێکی دیکــە بۆ ژیان هەڵبهێنجێ، چاوی بڕیوەتە نێو چاوی ڕۆستەم.

ئێســـتا کاتی پارشێوە، دەهۆڵەکەی ڕۆستەمەشـــێتیو دوو دارحەیزەرانەکەی دەهۆڵکوتان، بێنازو بێخاوەن لەو گۆڕەی کەتوون، کەسێ نییە خەڵکی ئاوایی پێ خەبەردار بکاتەوەو بۆ نانی پارشێو بە ئاگایان بێنێت. بەڵام کوانێ خەڵکی ئاوایی لە دەنگی قرمەژنی گوللەو ستەمی زۆرداران ئەوشەو چاویان چۆتە خەوێ؟!

لـــەو کاتەی کوفـــارەی خوێن لرفەیەتـــی، کاکەڕەش نازانـــێ کام برینی بۆ هەڵبەســـتێ! بە جۆرێک دابێژراوە کـــەس دوژمنی بابەکوشـــتەی خۆی ئاوا دانابێژێ! چ زوڵمێکە، پیاوەتیی گوندێک بێ تاوان دەکوژرێ! کەس کوشـــتنی ناگرێتە خـــۆی. خەڵکی ئاوایی گوێیـــان لێدەبێت کاکەڕەش هـــاواری براکانی دەکاتو دەڵێ فریاکەون، ڕۆستەم لێرە بە برینداری کەوتووە!

دایکـو ژنی زەیستانو خوشکی ڕۆستەمەشێتی، بە قریشکەو خۆڕنینەوەو پرچ دەرهێنان هەر بە غار بەنێو ئەو قوڕو لیتەیەدا، لە دوای چەندجار کەوتنو هەســـتانەوە، دەگەنە سەر ڕۆستەمی: ڕۆستەم! ڕۆستەم! وەلـــێ ڕۆستەم کاری کراوە، لە خوێنی خۆیدا پەلەفڕکێیەتی! لەو کاتەی هاوسەرەکەی، مەلۆتکەکەی لە ئامێزی داوێ، تەنیا ئەوەندەی لێدەبیســـتن کە سێ جار لەسەریەک دەڵێ: توخوا مەچوونە شـــاریو گوندی جێمەهێڵن! دەستێکی عەلەتریکەکەیەتیو وەک ئامانەتێک لەســـەر مەلۆتکەکەی نێو باوەشـــی دادەنێ بۆئەوەی وەک میراتێـــک بۆ کوڕە نۆ ڕۆژییەکەی جێی بهێڵـــێو دەورویەری خۆیو خەڵکانی دیکەی پێ ڕووناک بکاتەوەو، دەستەکەی دیکەی چەنگێک لە قوڕی گوندەکەی

گیر دەکات، گۆڵمی پڕ لە قوڕی دەگوشێت، بە جۆرێک لە کەلێنی قامکەکانی قـــوڕ فلوچقـــەی دەکات، وەک ئەوەی بـــە بەهاترینو پیرۆزتریـــن گەوهەری لەنێو دەســـتیدا پاراســـتبێت! لەو کاتەدا چاوێکی پڕ لە حەسرەتی هەڵهێنا: توخوا مەچوونە شـــاریو گوندی خۆمان چۆڵ مەکـــەن! چاوی بڕییە نێو چاوی کاکەڕەشـــی: توخوا کاکەڕەش!... بەڵام پێی تەواو نەکراو سەری کەوت، وەک بیەوێ منداڵەکانی ئامانەتی کاکەڕەشـــی بکات! ئەو ڕیزە وشەیەی دەیویست دەریانببڕێت، تەنها توخوا کاکەڕەشەکەی لە زار هاتەدەرێ، باقیمەندەی وشەکان هێندێکـــی لە زاریدا قەتیس مانو هەندێکـــی دیکەیان لە گەروویدا خنکان، بەمەزەنـــدە پێیان وابوو دەڵـــێ: توخوا کاکەڕەش ئاگاداری مـــاڵو منداڵەکانم بەو چاوت لێیان بێت! ڕۆستەمەشـــێت گیانی ســـپاردو بوو بـــە پەیکەرێکی ساردوسڕ، وەکو کۆترێکی سپی لە شەقەی باڵیداو بۆ بەربەرۆچکەی ئاسمانێ هەڵشـــکاو بۆ هەتا هەتایە لە بەرچاوان ون بوو. دایکی، خۆی بەســـەرداهێناو ژنی زەیستانیش بە مەلۆتکەی قۆنداغەکراوەوە دادو فیغانی بە تەنهامانەوەی بە ســـێ منداڵی ســـەرکەوینکەوە، بەردی دەتواندەوە! نازانم چۆن نەفرەتی ئەو شەوگارە پڕ لە غەدرەو تووکـو نزای دایکی ڕەشپۆشو مەلۆتکەو ژنی زەیستان، تەختی زاڵمان نغرۆ ناکات!

تفەنگچییەکانی ڕەفعەت ئاغای، بەپەلە مزگێنیی کوشـــتنی کاکەڕەشیان گەیاندە ئاغاکەیـــان، دڵنیایان کردەوە کە بە چەند گوللەیـــەک ئەنگاوتویانەو گوێیان لە شـــڵپەی کەوتنی بۆ نێو گۆمیلکـــە باراناوەکە بووە، بە گوێی خۆیان ناڵەی پێش سەرەمەرگیان بیستووە!

ئەوشـــەوە لە دوای پارشـــێوێ، ڕەفعەت ئاغا لە خۆشـــیی ئەو سەرکەوتنە

نەنووســـتەوەو گوێـــی بۆ گریـــانو دادو فیغانو غەڵبەغەڵبـــی کرمانجەکانی ئاوایی، لە بەردەرگای ماڵی حاجی ســـمایلی، شل کردبوو. ئەوەش زیاتر دڵنیای دەکـــردەوە کـــە پیلانەکەی ئامانجی خـــۆی پێکاوە، جغارەیەکی کەیفخۆشـــی داگیرســـاند، وەک براوەکانی ســـەرمێزی قومارخانەکان. لەنێو دیوەخانێ وەک فەرماندەیەکی براوەی مەیدانی جەنگ دەستی چەپی لەسەر دەسکی دەمانچە چواردەخۆرەکەی قەدیەتی، وەک تۆڵەی حەوت پشتی خۆی پێ کردبێتەوە!

لەگەڵ ئەنگوتنی سپێدە، تاریکی کلکی بە دوای خۆیدا ڕاکێشاو ڕووناکی شـــوێنی گرتەوە. دیمەنی ڕوو ڕنینەوەو پرچ دەرهێنانی ژنان لە بەردەرگای ماڵی حاجی ســـمایلی، بەڕوونی دەبینێ، ئەوەش، دڵنیایـــی زیاتری بە ڕەفعەت ئاغا دەبەخشـــی. لەناکاو هەواڵی کوژرانی ڕۆستەمەشـــێتی بڵاوبۆوە. لە قولایی و پانتایـــی دەروونو ویژدانی خەڵکی ئاوایی زریکـــەی دەنگێکی خەمەنگێز لە گوێیاندا دەزرینگێتەوەو زایەڵەی دێت. ئاخر تواناى ناشتنی قامەتو شوناسی گوندێک هێندە ئاسان نییە! شینگێڕان بۆ لە دەستدانی ڕۆستەمەشێتی هەروا سانا نییە، بەڵکو گەلێک گرانە!

گۆردەکان، بەپەلە ئەو هەواڵەیـــان گەیاندە ڕەفعەت ئاغا کە ئەوەی کوژراوە کاکـــەڕەش نییە، بەڵکو ڕۆستەمەشـــێتە! ئەویش دەڵـــێ: فلقیرو جەهەندەم، کرمانج هەر کرمانجە! بە تەوســـەوە دەڵێ: ڕەنگە بەو نیوەشەوەی لە گەرمەی ئەو گوللەبارانە ویستبێتی بە هانای کاکەڕەشییەوە چووبێ!

ژنانـــی ئاوایی بـــۆ شـــیوەنی ڕۆســـتەمی، کـــەزی و پرچیـــان کردۆتەوە، هەریەکەو تەشـــتێک قوڕی لەســـەر ســـەری ڕۆکردییە. گوند نغرۆی خەمو لە دەستدانی ڕۆســـتەمیە. ئاخر خەڵکی گوندی هەرگیز بە چاوی کەم تەماشای

ڕۆستەمەشێتیان نەدەکرد، ئەو پاشناوەی هەر لە ئاغاکانەوە بەسەردا بڕابوو، بەڵام کاریگەریی لەسەر کەسایەتیو خۆشەویستیی نەکردبوو، بەڵکو شیرینتری کردبوو، کە پێیاندەگوت ڕۆستەمەشێت، وەک مرۆڤێکی بڵندڕەگەزو پاکیان لەدەستدابێت! ئا لەو ڕۆژەدا بۆ خەڵکی ئاوایی دەرکەوت کە خۆشەویستی نیشانی دەدا پیاوی مەزن و بە شانوشەوکەت، کێیە!

بە پیرۆزکردنی گوندو خاکدۆستی، یەکێک لە خەسڵەتە جوانەکانی ڕۆستەمەشێتی بوو، کە لە کەم کەسدا هەبوو، ئاوا گرنگی خاکو گوند بزانێت. هەمیشە نەفرەتی لەو کەسانە دەکرد دەبنە کۆیلەیەکی سەرکزی بەردەرکی زاڵمان، ئەوانەشی خۆشدەویست کە دانانەوێنو بار ناگۆڕنو نەوینیان پێ کەسەری شانە. هەر ئەوەش هۆکار بوو بۆ برادەرایەتیو خۆشویستنی کاکەڕەشی. لەو شەوەوە، ئەو گۆمیلکەئاوەی بوو بە گۆمی خوێن، ئیدی کەس ناڵێ گۆمیلکەی بەردەرکی حەساری ماڵی حاجی سمایلی، ناوەکەی گۆڕا بۆ ڕۆستەم کوژرای! کاکەڕەش، وەک پیشەی هەمیشەیی و خەسڵەتی خۆی، بەهەڵەشەیی بڕیار ناداتو گەفوگوڕی بێ کردار ناکات، بۆیە بە دیار تەرمی ڕۆستەمەشێتیو بە دڵێکی پڕ لە حەسرەتو هاوارێکی تاساوەوە، کووڕ بۆتەوەو ڕقی تۆڵەسێنی لە ناخیدا قوڵپ دەدا!

هەواڵی کوژرانی ڕۆستەمەشێتی نەک هەر خەڵکی گوندەکەی خۆی، بەڵکو تەواوی گوندەکانی ناوچەکەی تاساند. ئاخر ڕۆستەم جێگای لە دڵی هەمووان‌دا کردبۆوەو خۆشیاندەویست، وەک هێمای گوند چاویان لێدەکرد. لە ڕووی کەسایەتیو خۆشەویستییەوە هەمان ڕۆستەم بازرگانی جاران بوو، بگرە بەو پاشناوە شێتەی خۆشەویستتریش بووبوو!

ئەوڕۆ لە گۆڕستانی گوندی، عەلەمداری گوندپەروەرێک دەنێژرێ. هێشتا بۆنی بـــاڕووت کونەلووتی خەڵکی بەرنـــەداوە، هەرمنداڵێکی ئاوایی دەبینی، جۆرکـــە قەوانێکی بەدەســـتەوەیە، خۆڵی خەمێکی یەکجـــار قوڵو ئازارێکی یەکجار بە ســـوێ لە ڕووخساری کرمانجەکانی گوندی نیشتووە، بە جۆرێک، لە هەرکەسێک دەڕوانی خۆی بە خاوەنی پرسەکەی دەزانی!

لە دوای پرســـەو میوانداری خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر، شەوێ لە ماڵی ڕۆســـتەمی کۆبوونەوە، مەلای گوندی هەڵیدایە قســـانو لـــە دوای دڵدانەوەی هاوســـەرو داکی ڕۆستەمی، گوتی: خزمینە، ئەو مەلۆتکەیە ناکرێ ئاوا بێناو بمێنێتەوە، لە دوای ئەو پیـــاوەی، ئەرکی ئێمەیە ناوێکی لێبنێین! هەموویان کـــۆک بوون ناوێکـــی وای لێبنێین، لەگەڵ ڕووداوەکە بگونجێو گوزارشـــت لە بێباوک مانەوەی منداڵەکە بکات، بۆیە ناویان نا مەغدوور، بە واتای ئەوەی بە دەستی غەددارێک غەدری لێکراوەو بۆتە پاشباب.



# ١٢

کات لەسەر هیچکەس ناوەستێ، لە دوای مردنی هەرکەس، شەو و ڕۆژو مانگو ساڵو وەرز، بێ پسانەوە دێنو پەکی خۆیان لە سەر هیچکەسێک ناخەن! بەهارە، سەرماوسۆڵە بارگەی خۆی پێچاوەتەوە، دەشتودەر بەرگی مەخمەرێکی سەوزی پۆشیوە، پەڕەسێلکەکان دەندووکیان پڕ لە قوڕەشین دەکەنو دەیبەن لە بەرمیچی خانووەکان دەیکەنە هێلانەی نوێ، گوڵەباخەکان ئەو نێوەیان پڕکردووە لە بۆنی خۆش، بۆنی هاتنی بەهار. هەرنمەبارانێکی بەهاری دەبارێو پاشان خۆشی دەکات. کۆلکەزێڕینە وەک پەڕی تاوس ئاسمان دەخەملێنێ، گوڵەحاجیلەو کوریکە زەردە ملیان داوەتەوەیەکو بە شنەی شەمالێکی هەستبزوێن وەک شایی ڕەشبەڵەکیان گرتبێت، رادەهەژێن، وەک کابانی گەورەماڵان خۆیان ڕادەژێنن، هەموویان کەشیدەی زەردیان بەستووە، ڕێک هاوشێوەی حاجییەکانی ماڵی خودا! کوورەهەنگەکان شەڵخەی نوێ دەردەکەنو هەندێکیان ماڵیان لە یەکتر جیادەکەنەوە. بەیانییان ئاونگی سەر پەڕەی گوڵان وەک کریستاڵو یاقووتو مرواری دەدرەوشێنەوەو بریسکەی لە ئەستێران دەبڕن! شوانەکان دەنگیان لە تێری مەڕەکانیانەوە دێت، شمشاڵەکانیان ئاوازی تێربوونی مەڕەکانیان دەژەنن، شەکەنێرەکان پێشبڕکێو نمایشی

شــەڕەقۆچانێ دەکەن، کاریلەکان هەڵدەستنە سەرپشتی یەکتر، گمەو بوغەی کۆترە مەســتەکان سەدای عیشقێکی شێتانەیان بە گوێی دەورووبەردا دەدا. لە لای ئێمەی گوندی، بەهار، کردنەوەو خســتنە سەرپشتی دەرگای خۆشنوودیو فەرەحناییە. بەهار بەزینی لەشکری سەرمایە لە بەرامبەر تیشکی خۆر.

بەهارە، چەنــد ڕۆژێکی کەمی ماوە بۆ دروێنەی جــۆ، کاتی باراش بڕانێیە. خدەی پلکــە هەمینەی، بە خۆی و بــە داکی لە ماڵێکدا دەژیــن، ئاردییان لە کەندوویدا نەمابوو، گەنمی باراشیشــیان تەواو بووبوو. خدە ڕۆشتە ماڵی حاجی ســمایلی بۆ ئــەوەی هەندێک دانەوێڵە پەیدابکات و لە ئاشــی بیکات بە ئارد. لەوکاتە حاجی ســمایل لچی ماینەکەی لەواشــە[١] دەکــرد، خەریکی بڕینی کەســمەی ماینەکەیان بوو. خدە سڵاوی کرد. حاجی سمایل بە ڕوویەکی گەش و ڕاوێژێکی باوکانە گوتی: یاخوا بەخێربێی سەرچاوی مامی خۆت، کوڕە خدە ئەوە بۆ دیارنی؟ ماوەیەکی زۆرە ناتبینم! ئەوە کەینێ مام و برازایەتی ئاوا دەبێت؟!

لەدوای ئەوەی یارمەتی حاجی سمایلی دا لە بڕینی کەسمەی[٢] ماینەکەی، ڕووی کردە حاجی ســمایلی: نــە ئاردمان لە کەندووی ماوەو نە باراشــیش لە جەواڵان، تەگبیرم چییە؟ حاجی ســمایل گوتی: هەی لە مامت نەکەوی هەر زۆر ئاســانە، ئەو پارچە جۆیەی لای قەلاوەمان[٣] زەرد بووە، بەتایبەتی ســەر

١. لەواشە: ئامڕازێکی دارینە، بۆ گوشینی لیچی وڵاخ لە کاتی کەسمەکردن و ناڵکردندا بەکاردێ.

٢. کەسمە: کرۆژەیەکە لە ئێسک نەرمترە، لەسەرەوەی کونەلووتی کەر و وڵاخەبەرزە دێ، تا نەبردرێ، وڵاخەکە ئالیک ناخوات.

٣. قەلاوە: ڕیزەگردۆڵکەیەکی چەقەن و کرێنە، دامێنەکەی زەویی کشتوکاڵییە،

بڵندایی و چەقێنەکان، لەگەڵ کاکەڕەشـــی کوڕم دوو داسان بەرن هەتا دەتوانن جۆی بدروون. دوو کوتکی ســـاوەرکوتانەوەش لەگـــەڵ خۆتان بەرن، هەر لەوێ، بایـــی بەرکوتێکی باش جۆی لەگەڵ خۆتان بێننەوە، لە ئاشـــی لێیبکەو ئاردی خۆت بێنەوە!

یەک لـــە برادەرە هەرە نزیک و جێمتمانەکانی کاکەڕەشـــی، خـــدە بوو. خدە، تاقانەی دایکـــی بوو، بابی، هەر زوو کۆچی دوایی کردبـــوو، بۆیە بە خدەی پلکە هەمینـــەی بانگیان دەکرد، تاوەکو لەگـــەڵ خدرەکانی دیکەی گوندی لێیان تێکەڵ نەبێت. لە ڕووی ژیانو گوزەرانییەوە دەســـتکورتو نەدار بوو، ئەوەی خوا دابوویە عەبدی خۆی، نەیبـــوو، لە دارەتی دنیایێ ئەوەی هەیبـــوو و نەیبوو دەمانچەکی ئوسرەی بێ کوتـو، رانکوچۆغەیەکـو کڵاشێکی بنپەڕۆ بوو. هەرکاتێک قایشو قرۆشـــی دەمانچەی ڕاســـتو چەپ لە خۆی دەبەســـت، ئەوەی خدەی نەناسیبا دەیگوت: ئـــەو زەلامە قۆچاغە دەبێ چەند جووت هێســـتری لە ئاقاری بگەڕێو چەند عەربە گەنمی تۆکردبێتو چەند شـــوانکارەو نیوەکاری لەسەر مەڕوماڵاتی بێت، خاوەنی چەند ڕێنجبەرو سەپانان بێت!

خدە گەنجێکی خڕکەڵەی وەک تەشـــی بادراو[1] بوو، چاو زیتو وشـــیارو بەدەســـتوبرد، هەرچەندە بێکـــەس و تاقەزەلام بوو، بەڵام ڕەشـــیدو بەوەج بوو. هەموو جارێک کاکەڕەش دەیگوت: خدە، جێگای چاوی تێدا هەیە[2]، ئەگەر

کەوتۆتە بەرجادەی هەولێر — کەرکووک.

١. تەشی بادراو: خولانەوەو هەڵسووڕانی تەشی بە گورجی لە کاتی ڕستندا. بە کینایە بۆ کەسی گورجوگۆڵ و هەڵسووڕاو بەکاردێ.

٢. جێگای چاوی تێدا هەیە: بە کەسێک دەگوترێ کە جێی ئومێد بێ و چاوەڕوانیی

چاک پەروەردە بکرێو لە خەڵکی خراپ و کاری نابەجێ دووربخرێتەوە، دەکرێ ئیشــی سەختی پێبســپێریو لێیشــی دڵنیابیت ئەنجامی دەدا، چونکە زۆر ئازایەو گوللەی لە تەختی نێوچاوانی بدەی ناگەڕێتە دواوە، خۆزگە ئەو هەموو ئازایەتییەی لەو کارانە بــە ختوخۆڕایی بە با نەدەدا، دەبوو کارەکانی قازانجی خەڵکی هەژارو کرمانجانی تێدابوایە!

خدە، ئەگەر نانی شەوێشی نەبایە، خەمی نەبوو، هەمیشە دەم بە پێکەنینو شــادو پڕ وزەو بــە جووڵە بوو، تەنها ئەوەی لە لای گرنگ بــوو و بایەخی پێدەدا، ڕانکو چۆغەو پشــتێنی سپی کەڕنەکو کڵاشی بنپەڕۆو کیفکە دەمانچەکەی بوو. ئەگەر ئەوانەی جوان بوونایە، شای بە سەپانی خۆی نەدەگرت! تازە ڕادیۆیەکی ڕەشــی کڕیبوو، تەنها بۆ گۆرانییەکانی حەســەن زیرەکو برایانی زێڕێو کاوێس ئاغــاو تایەر تۆفیق، لەگەڵیان جەزم دەبوو، پێــی وابوو گۆرانییەکان هەمووی بە خاتری ئەو گوتراونو مەبەســتیان خدەیەو هەر بە خۆی پاڵەوانی نێو داســتانی گۆرانییەکانــە. تا ئەو ســاڵانەی دواییــش، کەس لە گونــدی نەیدەزانی خدەی پلکە هەمینەی خزمی هەیە، بۆیە خدە هەمیشــە هەســتی بە بێکەسی خۆی دەکرد، چونکە تاقە زەلام کەوتبوو و هەمیشــە بە دوای دۆزینەوەی خزمەکانیدا دەگەڕا، لە ئەنجامی ئەو گەڕانــەدا ماڵەمامێکی زۆر دەوڵەمەندو مەڕدارێکی سەروەتمەندی خۆی لە گوندێکی ئەودیوی زووری، دۆزییەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو بە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەیبوو، هەمیشە کە دەیگوت ماڵی مامم، سەد مامی لە دەمی بەردەبۆوەو شانازی پێوە دەکردن.

---

شتی باشی لێبکرێ.

ماڵی مامی، بە پێچەوانەی هەستەکانی خدەی ڕەفتاریان دەکرد، تەنها ئەو کاتانــە بە خزمایەتی پلە دووی خدەی قایل بوون، کە لەگەڵ یەکێک بە دەمەقاڵە دەهاتن‌و لەســەر پەرێزو شەڕەسەگ‌و شەڕەمنداڵ‌و کێشــە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی گوندنشینان شەڕیان دەبوو، لەو کاتانەدا بە دوای خدەیاندا دەناردو خۆیان پێ هەڵدەدایەوە، بەڵام کە کێشەکەیان تەواودەبوو، لە شێنەیی هیچ حیسابیان بۆ خدەی نەدەکرد، چونکە دەســتکورت بوو و، بە هۆی هەژارییەکەیەوە بە هاوشانی خۆیانیان نەدەزانی‌و پێیان شەرم بوو بە ڕووتەڵەیەکی ئاوا بڵێن ئەوە خزممانە!

بــە هۆی گــەڕان‌و چاوکرانــەوەی خدەی پلکــە هەمینــەی، خەڵک زانی ماڵەمامێکی لەو گوندانەی ئەودیوی زووری هەیە. بەڵام هەتاوەکو خدە لێیان نزیکتــر دەبۆوە، ئەوان بــە پێچەوانەوە، بە هۆی دەوڵەمەندییــان‌و خاوەنداری جووتەهێســترو بارگینــی عارەبانەو کشــتوکاڵێکی زۆرو گەورەترین مەڕداری ناوچەکە بــوون، دوورییان لە خدەی پلکە هەمینەی دەکــرد، خۆیان لە بوون‌و خزمایەتیی نادیدە دەکرد. لە جیاتی ســەربێرێک، ســێ ســەربێریان هەبوو. کاتێک مێگەلەمەڕەکەیان ڕووەو گوندی بۆ ســەر کۆڵو بیرێ بە نیازی ئاودان ســەر دەکرد، نێرەکەری دۆڵابی دەوەســتاو دەرەقەتی هەڵهێنجانی ئەو هەموو دەولکە ئاوەی نەدەهات! بەرایی مەڕی، نێرییەکانی پێش مێگەلی دەگەیشتنە ســەر کۆڵو بیری، مەڕە کەترەکان[1] هێشــتا هەر لە ئاقاری بوون‌و سەروبنی مێگەلەکــەی دیار نەبوو. بە جۆرێک، ئەگەر لە دوایێ بای، گوێت لە زەنگوڵی ملــی نێریەکانی بەرایی مەڕی نەدەبوو، بەو پێچ‌و بزنەرێگایانەی گەوەی گردی

---

١. مەڕی کەترە: ئەو مەڕە نەخۆشەی کە لەدوای مێگەلان بەجێ دەمێنێ و لەگەڵ مەڕەکانی دیکە ڕێ دەرنابا.

لە قەدی دەســووڕایەوە، دەتگوت مارەزیوە هــەزار پێیەکانە لە گەردنی گردی دەسووڕێتەوەو تێی ئاڵاوە. بەو نێرینەی بەهاریێ مەڕ دوو بێرییە[١]، بێرییەکان بە ســەتڵو مەنجەڵی زنجیردار بۆ لای سەربێرەکان دێن، سێ بەردی سەربێریێ دانراونو شــەش بێری ئامادەن بۆ دۆشــین، یەک لەوانە حەفسەتی ئامۆزای خدەی پلکە هەمینەیە، وەک بەرخە کۆرپەی دوای مێگەلان، خۆی دەلەنگێنیێ! حەفســەت، لە بەرایــێ بێریــان دەڕواو وەکی مەڕی بە دامێــنو بەرۆک[٢] خۆی ڕادەنــێو دەلەنگێنێ! دەڵێی قورینگی لە پێــش ڕەوێیەو گەردنی خۆی هەڵدەکێشێ، سەری پەنجەی دەستو پێی، لە خەنەی ناوە، سەر پشتی بە گازو گورینگانی لە کەمەری بەستاوە، لەچکەو ڕەفتەی سەری وەکو تیلاک بەلاری لەسەری بەستاوەو جۆتە بسکی، سەد سووندێ دەخۆی کەلاَفەئاوریشمی چینە لە بناگوێیرا بردۆتەوە پشتی سەریو بەستاویە، گەندەمووی لاجانگی بە کزەی بای شەماڵی دەبزوون، خەناوکەی مۆریو مەرجانو قەنەفری شۆڕکردۆتەوە مابەینی زەدمەمکان، بۆئەوەی تۆزیان لــێ نەنیشێ! لەگەڵ ڕەفتو ڕۆیینی لە مجێزی، گــوارەی پێنجگۆی دێنەوە بۆ لای چەرخــەی ڕوومەتی گورگوری. بەرلەوەی لە تەنیشــت بەردی ســەربێریێ دامەزرێ، قۆڵو زەندی بە بازنــی بە ئەنگوچکی کراسەکەی شــەتەک بدات، گەندەمووی قۆڵو مەچەکی نیشانیان دەدا وەک پاوانێکی دەستنەخوردە، دەستی هەرچی ڕوحلەبەرە پێی نەگەیشتووە، هەرچی

---

١. مەڕ دوو بێرییە: واتا مەڕ ڕۆژێ دوو جار بێردەکرێ و دەدۆشرێ.

٢. مەڕی بە دامێن و بەرۆک: مەڕ کاتێک خورییەکەی بەتەنیشتەکانیەوە شۆڕدەبێتەوە سەر زەوی و دیمەنێکی جوانی پێدەبەخشێ. بە کینایەش بۆ ژنی شۆخو شەنگ (شۆڕەژن) بەکاردێ.

دەرمانی عەتارانە نەیبینیوە، دەنکە قەنەفرێکی لە کونی سمینی کەپووی لە جێی خەزێمی ئاخنیوە، بۆئەوەی سـمینەکەی کـوێر نەبێتەوە. دوو چاوی کاڵ، خەڵک دەیانگوت: چاوی حەفسـەتێ سبەینان شینەو دوای نیوەڕۆیان بە لای سەوزیدا دەڕۆنی، دوو ئەبرۆی ئەستووری پڕ، وەک پاوانی سەر ڕەوەزە عاسێکان دەوی هیچ مقەسو کشتەکی ئاریشـگەرێکی نەگەیشتۆتێ، برۆکانی تێکەڵ بە یەکتر بووینەوە. حەفسـەت، زۆری پێ خۆشبوو کاتێک ژنە بە تەمەنەکان دەیانگوت: ئەوەی برۆی تێکەڵ بە یەکتری بووبێتو پەیوەسـت بێت، نیشانەی ئەوەیەی دەبێتە دەسـتگیرانی ئامۆزای خۆی، شەوقی چاوەکانی، شەڕی لەگەڵ ئەستێران دەکرد، چەرخەی ڕوومەتی، شۆقی لە مانگێ بڕیبوو، دەمی قوتی لە یاقووتو مرواری لە ناو کراوە!

خدە، هەمیشە لەسەر بەردەبێرێ دادەنیشتو سەری مەڕەکانی لە بن باڵی خۆی دەنا تاوەکو بێرییەکان دەیاندۆشین. حەفسەت هەمووجارێ دەچووەی لای ئەو سەربێرەی خدەی ئامۆزای لەسەری دانیشتووە. دیارە هەردووکیان ژیانیان بێ ئەو چرکەسـاتە داخراوەیە کە نیگایان لە چاوەکانی یەکتریدا وردوخاش دەکەن! بۆ خدەی ئەوەندە بەس بوو کاتێک حەفسەت لە دۆشینی مەڕێک تەواودەبوو بە پێکەنینەوە دەیگوت: بەرەکەت[1]! ئەو بەرەکەتەی کە لە زاری حەفسەتێ بەردەبۆوە، خەرمانێک بەرەکەتی دەڕژاندە سـەر هەستو ئارەزووەکانی خدەی، بەشـی یەک هەفتەی خدەی دەکرد بۆئـەوەی دڵی پێی خۆش بکات. بە زەقی هەسـت پێ دەکرا جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانو پلەبەندیی مرۆڤەکان ناتوانن

---

١. بەرەکەت: واتا بەرەکەتی تێکەوێ. لە هەمان کاتدا ئاماژە بووە بەوەی کە بڵێ مەڕەکەی بەڕەڵابکە با بڕوات.

عەشق سندم بکەن. هیچ میرغەزەبێک عیشـقی پێ ڕاناگیرێ، عیشق هیچ تخوبێک ناناسێو تیری عیشق هەموو قەلغانو بەربەستێک دەسمێ!

خـدەی پلکە هەمینـەی هەرکات لە گونـدی ون دەبـوو، دەبوایە لە لای ماڵی مامـی بیدۆزییەوە، لـە زووری ئاودیو دەبوو، هەتـا وەکو ماڵی مامی گیرنەدەبوو، بە هەفتەو مانگ لەوێ دەمایەوە، وەک ڕێنجبەرێک ئیشـوکاری بۆ دەکردن، بەڵام بێبەرامبەرو دەستموسـتی. هەموو مەبەستیشـی ئەوەبوو، لـە پێناوی توندوتۆڵکردنـەوەی ئەو خزمایەتییەی، قوربانـی بە خۆی بدات. بۆئەوەی بە خەڵکی بڵێ منیش بێکەس نیمو لە کەلێنی دیواری دەرنەپەڕیومو کەنگرەبێکەسـە[١] نیم، بەڵکو وەک هەرکەسێکی دیکە مامو ئامۆزام هەن! دەیویست بیانکات بە گەورەی خۆیو لە ژێر فەرمانیاندا بێت. هێندەی لەسەر زاری خۆشـبوو کـە بە زمانێکی شـیرینو پڕ لە شـانازی پێکردنەوە کاتێک دەیگـوت: دەچم بۆ ماڵی مامم! لـێ، ماڵی مامی بە هـۆی دەوڵەمەندیو لەخۆباییبوونیان، هیچ بەهاو ڕێزێکیان بۆ ئەو هەسـتو هەوڵەی خدەی نەبوو، هەسـتت دەکرد ئەو خزمایەتییە، تاک لایەنەیەو، لە لایەکی دیکەش زۆر بە ڕوونی هەست بە عاشقبوونی خدەو حەفسەتێ دەکرا، چونکە بەرلەوەی عاشق بێت، دارلاستیکی بە کێشکەپاساریو کۆترەکانەوە دەناو پشیلەو سەی بەرەڵڵای دەکوشـتو چاوی کەرەکانی کوێر دەکرد، دەمانچەی بە تەیرو ئاژەڵەکانەوە دەنا! عیشق ئەو کوڕەی بە جۆرێک گۆڕی، تەنانەت پێی لە مێرووولەیەکیش نەدەنا، بە منداڵانیشی دەگوت: توخوا مەیانکوژن، ڕەنگە نێرەو مێیە بن، یان عاشقەو

---

١. کەنگرەبێکەسە: کنگر، هەمیشە بە تاقەوە شین دەبێ. بە کینایە بۆ کەسێک کە کەسوکاری نەبێ، بەکاردێ.

ماشقە بن! عیشق خدەی کردبووە کەسایەتییەکی مرۆڤدۆستو ژینگەدۆست، بە پێچەوانەی پێش عاشقبوونی!

پلکەهەمینە، زۆرجار بەرەئەستوورکێکی ئاردەساواری لە خۆی دەگرت، کە بیکاتە خێر بۆئەوەی خودا دڵی خدەی نەرم بکاتو سەرێک لە پیرەدایکە بێچارەو تەنیایەکەی بداتەوە! هەمیشە پەرێشانو چاو لەڕێی کورە تاقانەکەی بوو، پیرەژنێکی زۆر کوڵەوارو سادە بوو. خدە کە ڕۆیشتبوو عەلەتریکەکەی بە هەڵکراوی جێمابوو، پلکە هەمینە نەیزانیبوو بیکوژێنێتەوە، هەرچەندی بە شێوەی فانۆس کوژاندنەوە فووی لێکردبوو، نەکواژبۆوە، ئەویش عەلەتریکەکەی لە ناو کەندووی گەنمی نابوو، بە ئومێدی ئەوەی بکوژێتەوە! جار جار ژنانی ئاوایی دەچوونە لای بۆئەوەی هەست بەو تەنهاییە بێزارکەرە نەکاتو هەندێک دڵنەوایی بدەنەوە. ڕادیۆکەی خدەیان هەڵدەکرد، بۆئەوەی گوێبیستی گۆرانییەک بن، هەرکاتێک کاوێس ئاغا لاوکی گەنج خەلیلو حەفسەتێ دەست پێدەکات، پلکەهەمینە گورج ڕادیۆکە دەکوژێنێتەوە، ژنەکان دەڵێن پلکەهەمینە ئەو ڕادوێیەی بۆ دەکوژێنیەوەو ناهێلی گوێی لێبگرین؟ پلکەهەمینە لە سادەیی خۆی دەیگوت: بە خوای دڵم نایە، خدرۆکەی کوڕم لێرە نییە، زۆریشی حەز لە لاوکی گەنج خەلیلی کاوێس ئاغایە، بۆیە دەیکوژێنمەوەو ناهێڵم بیلێ هەتاوەکو خدرۆکەی کوڕم دێتەوە! بە کوترەکوتر لەسەر تاقیچکەی قەد دیوارەکەی دادەنا بە ئومێدی ئەوەی هەرکاتێک خدەی کوڕی هاتەوە لە سەر هەمان لاوکی کاوێس ئاغای بێتو گوێی بداتێ.

خدەی پلکەهەمینەی، بە جۆرێک عاشقی حەفسەتی ئامۆزای بووبوو و هەوڵی دەدا ڕۆژ تا ئێوارێ لێی دیار بێتو لە بەرچاوانی ون نەبێت. سەبارەت

بە چاوی حەفســەتێ، زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵی لە لای ماڵی مامی بەسەردەبرد. لەوەتای عاشــق بووە، دەڵێی گڕی تەنــدوورە، لە دووررا هاڵاو و تینی دێ! هیچ لوقمانێک چاری ناکات. ئەو عیشــقەی لــێ بۆتە دەردو کوانی سەر دڵی لە قوڵایی ڕوحیدا جێی خۆشــکردووە. ئەو ناســۆرەی لە دڵیدایــە، ژانی داوەتە ئێســقانی‌و هەموو بوونی داگرتووە. خدە، بارتەقای یەک دنیای پێخۆشــە کام کار ئاستەم‌و سەختە، ماڵی مامی بەوی بسپێرن!

ڕۆژێک، مامی ئەسپێکی سەرکێشی تۆرو سەرشێتی لە تەویلەی دەرهێنا، ئەسپ چ ئەسپ، چاوی سوور بووەو هەر لە هەوران ڕادەمێنێ! دەستی بۆ دەبەی چەنگ دەداتە ئاسمانێ! هەستاوەتە ســەر پاشووان، وەک بەنیازبێت لە سەر پشــتی هەوران تەڕادی بکات! کەس زاتی ئەوەی ناکات خۆی لە قەرەی بدات. ئەســپیان زین‌و لغاوکرد: کێ دەوێرێ‌و لە خۆی ڕادەبینێ ســواری بێت‌و غاری پێ بدات و چەند تەڕادێکی پێ بکات؟ خدەش مجێزی لەو سەرکێشــیانەیە، بە تایبەتی لەبەرچاوی حەفســەتێ! هەرچەندی حەفســەت بــە چاو و برۆیان پێیدەڵێ: نەکەی ئەو سەرکێشییە ترسناکە بکەی! وەلــێ ئەو، بڕیارو بەڵێنی داوەو پاشــگەز نابێتەوە. هەموو کەس دەیانزانی ئەو ئەســپە، سواری قەبووڵ نــاکات، چاوەڕوان بوون بزانن خدەی چۆن بە فەیز دەگەیەنێ‌و دەیفەوتێنێ! خدە لەوانە نییە قســەو بەڵێنی خۆی بخواتەوەو پاشــگەزبێتەوە، چونکە هەر لە منداڵییەوە فێری سوارچاکی ببوو. دەکەوێتە سەرخانەی زینی‌و پێی لە ڕکێبی داوێ. ئەســپ هەڵدەستێتە سەر پاشووان‌و دەیەوێ چەنگەبازی هەوران بێت. خدە توند خۆی بە قەربووزی زینی وەناوەو حەفسەت خێری مەنجەڵەماستێکی لەخۆ گرتییە خدە سەلامەت بێت‌و لە حەسارێرا ئاوێنەی بۆ ڕادەگری‌و شەوقی

لە خدەی دەگرێ، بۆئەوەی هێزو توانای پێ ببەخشێو بەسەلامەتی بگەڕێتەوەو لە ئەسپەکەی دابەزێ. بەڵام خدە وا حاڵی دەبێت ئەو ئاوێنەڕاگرتنە بۆ ئەوەی دەستخۆشی لێبکاتو داوای بەردەوامی لێدەکات. ئەسپ هەڵیدەگرێ بۆ تخوبی ئاقاری گوندەکانی دیکە، هەرچی دەکات، ئەسپی تایین ناتوانێ خدەی لەسەر پشتی خۆی بەربداتەوە. ئەسپ لە ئارەقەی ڕەشو شین دەبێت، گلۆز گلۆز کەفی لە گونانی بەردەبنەوە، ناچاردەبێت گوێی شۆڕدەکات کە تاکو ئێستا کەس نەیتوانیوە ئاوا ڕامی بکات. خدە زۆری حەز دەکرد هەرکارێک ئاستەمەو بە کەس ناکرێ، مامی بەویی بسپێرێ، ئەگەر بە نرخی ژیانیشی بێت، بۆئەوەی ڕاستینەی دڵسۆزیی خۆی بۆ مامی بەیان بکات. ئەوڕۆژە لە گوندی، باس هەر باسی سوارچاکیی خدەی پلکەهەمینەی بوو، ئەوەش حەفسەتی دڵخۆش دەکرد. ئەوشەوە، بە قسەی شوانەکان، گورگ گیسکێکی خواردبوو. خدەش سێ شەوان بە دەمانچەوە بۆی دانیشت، کەوڵەمەڕێکی بەسەرخۆیدا کێشابوو. شەوی سێیەم ئاواتەکەی هاتەدی، گورگەبۆری کوشت، هەرچەند لەبەرخۆیەوە دەیگوت: نەدەبوایە بیکوژم، ڕەنگە مێیەی هەبێتو عاشق بێت، بەڵام دەستی مامم شکاوە. چونکە ئەو گورگکوشتنەی خدەی لە گوندی دەنگی دایەوە، کە خدە گورگی لە یەخەی خەڵکی گوندی کردۆتەوە. خەڵکی گوندی دەستخۆشییان لە خدەی دەکرد، لێ دەستخۆشیی حەفسەتێ جیاوازو تایبەت بوو، کاتێک بەو گفتە شیرینەی دەیگوت: دەستت خۆش بێ ئامۆزا گیان! ئەو گورگە بە خەڵکی سێ گوندان نەکوژرا، دواجار ئامۆزاکەم کوشتی. خدە خەریکە بەو دەستخۆشییەی حەفسەتێ باڵ دەگرێ! ئەو گورگکوشتنو ئەسپسوارییە، خدەی کردە پاڵەوانی نێو قسەوباسی ژنانی سەراوو دەراوان. حەفسەت داوای لە

خدەی کرد ددانەکانی گورگی بۆ بێنێتەوە لە زێڕیان دەگرێ، دەڵێن بۆ زۆرشـــت باشەو تالعو یەغبارت پێ هەڵدەستێ!

ئی وا هەبوو لاشەی گورگەکەشـــی نەبینیبوو دەیگوت: گوللەی لە بەینی هەردوو برۆی داوەو دەلعازی فەراقی ڕەشـــی لێبڕیوە. نیشانشـــکێنێکە دەرزی هەڵدەگـــرێ! گەنجەکانی گوندی هاتنـــە لای خـــدەی پلکەهەمینەی: توخوا لەگەڵمان وەرە جگی گورگەکەی دەردێنین، دەڵێن جگەگورگ بە هەرگەنجێکی بێـــت، هیچ کچێک داخوازییەکـــەی ڕەت ناکاتەوەو تالـــعو یەغباری زۆرباش دەبێت! کاری جگەگورگی لە قوزەکەمەتیاری کەمتر نییەو بگرە باشتریشە!

ئەو ناســـینو دەرکەوتنەی خدەی، ماڵی مامی نیگەران کردووە، هەرچەند دەکـــەن نازانن بـــە چ بیانوویێـــک لە یەخـــەی خۆیانی بکەنـــەوە. ڕۆژانەش ڕاســـپاردەی پلکەهەمینەی بۆ خدەی دێت کە داوای لێدەکات سەرێکی داکی خۆی بداتەوە. دیارە ماڵی مامیشی ئەو گرنگی پێدانەی حەفسەتێ بۆ خدەی، گومانی لا دروست کردوونو زۆری تووڕەکردوون، چونکە خدەی بە هاوشانی خۆیان نازانن، لە لای خەڵکی ئاواییی وا نیشـــان دەدەن کە بە نانو زگی ئیشوکاریان بۆ دەکات. وایان ناساندووە کە گوایە خێریان پێکردووەو هێشتوویانە لە لای ئەوان بگیرسێتەوە! مامی کەوتە ئامۆژگاریکردنی و داوای لێکرد بچێتەوە گوندەکەی خۆیان سەرێکی داکی بداتەوە کە لە پیرییان کەنەفت بووەو چاوی لە ڕێیەتیو کەس سەراسووی ناکاتو خەریکە لە تەنهایی خۆیدا دەمرێ. ئامۆژگارییەک، هەزارو یەک دەرکردنی دێنا!

پێیگوت: ئێستا ئیشوکارمان کەم بووە، پێویستمان بە یارمەتیی تۆ نییە، هەرچی زووە دەبێت بچییەوە سەرێکی ئەو پیرەدایکەت بدەیتەوە، کە خەریکە

لەدووریت سوێی دەبێتەوە!

پلکەهەمینە لە ژوورێکی ڕەقو ڕووت، بە تاقی تەنها لەگەڵ پشیلەیەکو سندووقێکی بۆراقی دەرگا هەڵقەندراو و فانۆسێکی کۆنی تیشک کزی قەد دیوارو دوودەست نوێنی شڕو حەسیرێکو شەربەیەکی ئاوخواردنەوەو چەند هەمبانەیەکی نیوەبەتاڵی ساوارو برویشو گەنمەکوتاو و دوو کەندووی قوڕی نیوە گەنمو مەسینەیەکی مس، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ! لەوەی زیاتر عەشتەبایان لەماڵێدا نییەو مشک کلکی لێ بە ئارد نابێت! هەر غەوارەیەکی ڕووی لە گوندی دەکات، پلکەهەمینە دەچێتە کنیو دەستەودامێنی دەبێتو پرسیاری خدەی کوڕی لێدەکاتو بەسەرسووڕمانەوە دەڵێ: عەجایب ئەتو کو خدەی کوڕم ناناسی؟ دەزانی خدە چەند چەلەنگو قۆچاغە! کەس هەیە خدرۆکەی کوڕی من نەناسی! هەتا شۆڕدەبییەوە نێو عارەبان، برادەرو ناسیاری هەیە! وەک نانو پیوازیان لەگەڵ خدەی خواردبێت! قیسی ئەو عەرەبانەی خورماو دۆشاویشیان دێنا، لەوانیشی دەپرسی، بەقاڵو دێوەرەو وردەواڵە فرۆشەکانی ڕادەسپارد بە خدەی بڵێن بێتەوە سەرێکی داکی خۆی بداتەوە! کەسێک نەبوو کۆڵێک سەلامو ڕاسپاردەی بۆ خدەی کوڕی لە کۆڵی بارنەکات. داواشی لێدەکردن خدەی قایل بکەن بێتەوەو سەرێکی لێبداتەوەو زۆری غەریبی دەکات! لە دوای ئەو ڕاسپاردانە، مەسینەمسەکەی دەست دەدایەو بەردەرگای ئاوپرژێن دەکرد، بە کوترەکوترە گسکی دەداو دەیگوت: خدرۆکە نەبادا تۆزی لێبنیشێ! بەخوای خەونم پێوە دیوە، ئەورۆ دێتەوە، دەک چاوی داکت کوێرەبی لوت، لار بم ڕۆرە، داخۆ چەند ڕۆژە هێلکەورونەکی نەخواردیە! دەلاقەی پڕ لە هێلکەی دوو زەردێنە کردووەو بۆ خدەی هەڵگرتوون!

زۆرجار خەڵکی ئاوایی ئەســتوورکە ئاردەساوار، یان ناوسێریو ناسکەنانیان بــۆ دێنا، دڵی نەدەهات بیانخوات، بۆ خدەی هەڵدەگرت، دەیگوت: خدەی کوڕم دێتەوەو برســیەتی، با ئەو بیانخوات، ئەمن گۆشتی پێدەگرم. هەرمنداڵێکی ئاوایی گوتبای خەونم دیوە خدەی کوڕت دێتەوە، هێلکەیەکی لەدەســتی دەنا: برۆ لە ڕۆنی بکە!

نێرینــەی بەهارێیــە، گەنم خشــتگور[1] بووەو لەو شــوێنانەی چەقێنە خەریکە جۆ پێڕادەگاو بەرەکی تێکەوتووە، لــێ، لە نەوراییەکان هێشــتا هەر شــینو فەریکە، ئەو دەشــتە نەرمانو پانوبەرینە، لــە ئامادەکاریی ئەوەدایە میوانداریی ڕەوەی قەتێیان بکات. لەو شــوێنانەی هەردوو بەری ڕێگا کراوە بە گەنم، گەنم هەتا پشــتێنی زەلامی بڵند بووە، لەگەڵ کزەی بای شەماڵی، وەک شانە بە برژانگی گوڵە گەنمەکاندا بێنی! مرۆڤ کاتێک ڕێ دەکات، وەک بەنێو کۆڵانی تەنگەبەردا ڕێ بکات، دەغڵودان ئەوەندە غوردە، لە ترســی زیندەوەری زیانبەخــش، پیاو غیرەت ناکات لە ڕێگا لابــداتو بەنێو گەنمی بکەوێت. لە شوێنە نەوییەکان هەوای ئەوەندە شێدارەو برکی کردووە، بینینو هەناسەی مرۆڤی تەنگ دەکاتو هەســت بە قورسایی دەکات. سەرباری ئەوەی باری عیشقێکی ڕاستەقینەو پاکی لە کۆڵ ناوە، لێمشتی داخو کەسەری دابڕان، دەوری تەنیوەو هێندەی دیکەی هەناســەو بینی تەنگ کردووە، هەرچەنــد دەکا لاقی لە دوو نایەو بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشــێ، هەرچەند دەکات ڕێی داناگرێ، هەر ســێ هەنگاو ئاوڕێــک بۆ دواوە دەداتەوەو سەرســمێک دەداو ڕەتێک دەبا! هەموو

---

١. خشتگور: خشتگوڵ، بەو پەڵەگەنمە دەگوترێ کە گوڵەکانی بە یەک ئاست بەرزبوونەتەوە وخشت و ڕێکن.

ئـــازای بەدەنی گـــەرم داهاتووەو تایەکی گەرم دایگرتووە. وەک لە ســەر رووان رایبکێشـــن، لە هەر هەنگاوێک وا دەزانێ پێی لەسەر جەرگی خۆی دادەنێت! تاوەکو بەسەر زووری کەوت، لەبەر زۆر ئاوڕدانەوەو رێ لەبەرنەچوون، قیڕ سپی بوو! لە سەر زووری دانیشت، لە مەفتەنی ماڵی بابی نازدارحەیرانێی دەڕوانی: ئەی خوایە ئـــەو کچەتیوە ئەو مەملەکەتەی چەند جوانو دڵنشـــین کردووە! چاو لە تەماشـــای تێرنابێت! بەمەزەندەی خۆی دەیگوت: حەفسەت ئێستا لە بێرێتییە، داخۆ دەبێ کام لە شـــوانەکان سەربێریان بۆ گرتبێ؟ دەبێ دڵی چەند بەخەم بێت لە حەژمەتی ئەو لێکدابڕانەی؟! بەوێ فەسڵی دەرەبوارێ، خدە لە هەموو شتە جوانەکانی کە چاوی دەچووەسەر، شێوەی حەفسەتێی تێرا دەدیت، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: دەک ماڵت بەقـــوڕێ بگیرێ مامە! یاخوا ڕەوەگورگ بەنێو مێگەلەمەڕەکەت بکەوێ! گوێبارێ[1] لـێ دەرنەچێ! وەکی بەو بەهارەی هەڵتفراندمو لە حەفســـەتێت دابڕیم! ئەتۆ بڵێی مامیشم دڵی هەبێت؟! ئەتۆ بڵێی ڕۆژێک لە ڕۆژان عاشـــق بووبێت؟! ئەتۆ بڵێی وەک من لەســـەر ســـەد پۆلـــوان هەڵکزابێتو بۆنچەقەوێری، خەڵکی هێڕو کاس کردبێت؟! ئەتۆ بڵێی بۆنی برژانو گڕی سووتانی بۆ کەشکەڵانی فەلەکـو حەوت تەبەقەی ئاسمانێ هەڵچووبێت! سکاڵای بردبێتە عەرشی عەزیم؟ قەت باوەڕ ناکەم! قەت!

جغارەخۆرەک دەبـــوو پلکەهەمینە چووبـــووە ژووری، ئاخر لەگەر گەردی بەیانی، دەســـتی دەدایە بەرچاوی، ئەوەندەی چاوی هەتەردەکات لە دووڕیانێو

---

١. گوێبارێ: مەڕ گوێی درێژ و شۆڕە و دەباڕێنێ، ئەوە بۆتە کینایە بۆ تاقەمەڕێک. وەک تووکیش بەکاردێ: گوێ بارت لە دەرکێ نەمێنێ! واتا زیندەوەرت لە ماڵێدا نەمێنێ و هەژار و کەساس ببی!

بنـــاری زووری دەڕوانیو دەیگـــوت: دڵم خەبـــەری داوە زۆر لەگینە خدرۆکەی کەســـی داکی خۆی ئەمڕۆ بێتـــەوە! دەرگا تەنەکەکەی، لە ترســـی ئەو کەمە قەرەخەرمانەی لەســـەر ســـەکۆی هەڵخســـتبوو، بە بەنێک گرێ دا. لە ناکاو هەنگامەو غەڵبەغەڵبی منداڵان وەک هەموو ڕۆژەکانی دیکە لە دەرگایاندا. پلکەهەمینە بەقایان پێ نـــاکاتو دەرگایان لێناکاتەوە. منداڵەکان دەرگایان لە ڕێســـمە بردو بە ژوورکەوتن: پلکەهەمینە! پلکەهەمینە! کەس لەسەر کەس ڕانەدەوەســـتا قســـەکەی بکات، هەر هەموو پێکەوە گوتیـــان مزگێنی خدەی کـــوڕت هاتەوە! ئەوەیش چەند جـــاری دیکە ئاوا فێڵیـــان لێدەکردو هێلکەیان لێوەردەگرتو لە خدەش هیچ خەبەر نەبوو، ئەویش بە دەستی منداڵانەوە جاڕس بووبوو. پلکەهەمینە چاوێکی بە دەوری خۆیدا گێڕا، بۆئەوەی شتێکی دەست بکەوێو ڕایئاڵێنێتە منداڵان، تەنها گەراکوتکی[1] جلشۆردنی دەست کەوتو ڕایئاڵانـــدە منداڵەکان: بڕۆن لـــە دەوی بابتان بڕیم، بە خوای قەشـــمەریم پێ دەکەن! ئەیەڕۆ خۆ منداڵی ئەو زەمانەی بۆ هێندە ســـوورتکن[2]! بچنە سەر تەوســـکەی باوەڕتان پێ ناکەم! پێرێ قەیاســـەکم خەرمانلۆغەی قەرەخەرمانی دانێ، خدەش هەر نەهاتەوەو هیچ سەرو سۆراغی نەبوو، درۆتان لەگەڵ کردم بە قوربانی تەپڵی سەرم بن! لە ناکاو خدە بە ژوورکەوت. پلکەهەمینە لە مابەینی شکو یەقین هێدمەگرتی بوو: ئای کوڕەجوانەکەم، ئەوە ئەتوی؟ دەڵێی خدری زیندەی ئەوە لە کوێ پەیدابووی؟ دەزانم برسیتە داکت کۆرە بی، کوریژگەیان لە

---

١. گەراکوتک: دارێکی ٤٠ سم درێژ و ٢٠ سم پانە، دەسکدارە، بۆ شۆرین و کوتانی جلوبەرگ لە دەم ڕووباران، بەکارهاتووە.

٢. سوورتک: چەقاوەسوو، چەقەچناوە، بێ چاوو ڕوو، بێشەرم، زمانهەراش، زماندرێژ.

برســا هیشک کردۆتەوە، بە دەستی خۆم نەبێت بە دەستی هیچ کەسێ خدرۆکە تێر ناخوات! دوو هێلکەی دوو زەردێنەی لە بن خەلانەی دەرهێناو بۆی لە ڕوونی کردو دوو کولێرەی تەندووریشـــی لە پێش دانا. هەمینە دەستی بە ڕووخسارو لاجانگی خدەی دادەهێنا، بۆئەوەی دڵنیا بێتەوە کە بەڕاستی خدەی کوڕیەتیو هیچ کەمایەتییەکـــی نەهێناوەو لە قایدەی خۆی ماوەتـــەوە! خدە گوتی: زۆر ماندووم ڕادەکشـــێم، با گورگەخەوێکی بکەمو کەمێک ببۆرژێم. پلکەهەمینە گوتی: ڕۆڵە ســـەر بە کۆشـــی دایکی خۆت بکە، ناجوڵێم هەتا تێرخەو دەبی. خدە، بالیفێکی دەرهێناو خستییە بن سەری. دایکی بە دیارییەوە دانیشتبوو، مێشەکانی لـــێ پاس دەکرد، چاوی لەســـەر هەڵنەدەگرت: ئۆخەی ئەوجارەش کوڕە تاقانەکەم دیتەوە، ئەوجا مردن هەقەو ناهەق نییە! ســـبەینێ تەندووری ســـوور بکەمەوە، چونکە بەرە ئەستوورکەکم خێر لە خۆم گرتییە بۆئەوەی خدە بێتەوە، ئێســـتاش هاتۆتەوەو لە ســـەرم نەزربووە خێرەکەی بکەم. مریشـــکە جنجڕەکەشی بۆ سەردەبڕمو بە ساواری قەرەخەرمانی بۆی لێدەنێم.

پلکەهەمینە حەزی دەکرد ببێتە باوەشێنەیەکو باوەشێنی خدەی بکات، بۆئەوەی گەرمای نەبێت، ببێتە پەردە کوللەیەکی تەنک خۆی بە ســـەر خدەیدا بکێشێ، تاوەکو پێشکەو مێش هەراسانی نەکەنو بە ئارامی بخەوێ!

خدە هەرچەندی هەوڵی دەدا، دڵی لە گوندیو ماڵی خۆیان دانەدەوەرایەوە، هەر بە کەلەش لێرەبوو، دڵی لەودیوی زووری لـێ بەجێمابوو! ئێواران لەگەڵ جاحێڵانی گوندی دادەنیشـــتن، دەیگوت برادەرینە لۆمەی من مەکـــەن، لە کۆلکەزێڕینەو گرشەی ئەســـتێرانو خوناوی ســـەر پەڕەی گوڵەباغو نمەی باراندا بەس حەفسەتێ دەبینم! باوەڕم پێ بکەن ئەوانە هەموویان بەشێک لە جوانی حەفسەتێیان دزیوە!

شــەوان، کاتێک لەسەربانی لە جێگەکەی لە سەرپشــت ڕادەکشا، چاوی دەبڕیە مانگـو ئەســتێران، دڵی بەوەی خۆشبوو دەیگوت: ئێستا ئەو مانگـو ئەســتێرانە لە حەفســەتێ دیارنو وەک من چاویان لێدەکات. ئای شــەمارم چەند پێخۆشــە، بۆنی پەرچەمو سینگـو بەرۆکی حەفسەتێم بۆ دێنێو بەسەر گوندیدا براوی دەکاتەوە، دەڵێی حەفســەت ڕای ســپاردووە خۆی لە ڕووخسارو تەوێڵم بسوێ!

وەکو ســۆفیو دەروێشــی گەرمەتەریقەت جەزم دەبوو لە نێو تارمایی بەژنو باڵای حەفســەتێدا ون دەبــوو. بەردەوام لێو بەبارو ڕەنگــزەرد بوو، هەموو خەڵکی ئاوایی ئەو گۆڕانکارییەیان لە دەم و چاوو هەڵسوکەوتی خدەی پلکەهەمینەی بەدی کردبوو. هەمیشــە گۆشــەگیرو حەزی بە تەنیایی بوو، دروست بە پێچەوانەی بەر لە عاشــقبوونی. ئەوەی دڵخۆشو مەستی دەکرد، لاوکی گەنج خەلیلو حەفسەتی کاوێس ئاغای بــوو. پلکەهەمینە تەواو نیگەرانە، کاتێک کــوڕە تاقانەکەی ئاوا دەبینــی لەبەرخۆیەوە دەیگــوت: ڕەببی دایکت کوێر بێت ڕۆڵــە! ئەو کوڕێژگەیە دەڵێی دوعاو جادووی ڕەشی لێکراوە، نازانم نە لە هەناوی خۆیدا نەخۆشە، نە خەمی دنیایێ ئاوا خواردنو خەوی لــێ حەرام کردییە، دایم دەبنێسێو دۆش دادەمێنێ! بارتەقای خەڵکی ئەو گوندەی خەمێ دەخوات.

ســەر لە ئێواران، خەڵکی گوندی هەر بابایەو لەســەر ســەکۆ و سەربانان جێگایان ڕادەخست، بۆئەوەی تاوەکو کاتی نووستن فێنک دابێ، خدە ڕادیۆکەی هەڵدەکردو گوێی لە حەســەن زیرەکـو برایانی زێــزێو کاوێس ئاغای دەگرت. لاوکــی گەنج خەلیلی، خدەی مەندەهۆش دەکرد، خۆی وا تەڵقین دابوو کاوێس ئاغا ئەو لاوکەی بە خاتری عیشــقی خدەو حەفسەتێ گوتووە. خدە لە خەیاڵی

خۆیدا دەبوو بە گەنج خەلیل. هەرکە کاوێس دەیگوت:

**دەلێ لێ وەرە لێلێ**
**وەرە لێ لێ... وەرە لێ لێ**
**وەرە لێ لێ... وەرە لێ لێ... وەرە لێ لی... وەرە لێ لێ... نەماێ...**
**ئەزێ (قارش میش) ناکەم،**
**کورِ مامێ خۆ ل خەوەکە شیرن ڕاکەم،**
**ئەزێ ڕاکەم، چەکمەکا عاموودی دپییاکەم،**
**شەرواڵەکی شفتەلی دلنگاکام،**
**عەبایەکی تەنتەنی دەملاکەم، خەنجەرەکی سالح بەگی دبەر ڕاکەم،**
**ئەزی گەنج خەلیلی ئاغا کورِەمامێ خۆ**
**بەمە جۆت بازاری مەیدانی شامێ ڕاگرم**
**ڕۆژەکا بێت (ئۆغلەری) عوسمانیا بی وی چ ڕۆژی دل ناکەم...**
**کورِ مامێ خۆ ل چ دەوارا سوارکەم**
**ئەزی بینم خۆ بکەمە ماینەکە سەگلاوی،**
**بینم خۆ دبن گەنج خەلیل، کورِمامی خۆکەم،**
**سەری چ بابۆ براو دەرو جیرانی گوندی خۆ،**

ئەزی بینم ب خولامی سەری کوڕ مامی خۆ کەم...
نەمایێ... نەمایێ...
دپاشی گەنج خەلیل کوڕمامی خۆ نەمینم ل دنیایێ...
دەلێ لێ... وەرە لێ لێ...
ئەزی ڕابم، کالە زینەکی بۆ کوڕەمامێ خۆ دروست بکەم
سەرزینەکی بۆ کوڕمامێ خۆ دروست بکەم
کالی وی زینی چێ بکەم ژ مەرجانێ،
ئەرکیا بۆ بینم ل شارێ ئەرزینجانێ، قایشا ل هەمەدانێ،
ڕمەکا رووتی گورگانی چێ بکەم ل داری حەیزەرانێ،
سەرزینەکی دروست بکەم ل تووکی پەڕی نەعامێ،
ئەزی گیفاکانو لیفەکانی لی بدەم
شبەتی کولیکا چاردەی نیسانێ
گەنج خەلیل کوڕەمامێ خۆ
دلۆ نەمایێ ببەمە بازارا مەیدانی شامێ،
بەلا چ خەمی کوڕمامێ من زۆرو گەلەکن
دا خەمی پێ برەوینی دەم و دەمە پێبکا تەقلەو زێدەباری جلیتانێ،
نەمایێ... نەمایێ... چ نەمایێ چ وەرە لێ لێ
حەفسەت دبێژی یا ڕەبی خودێ دلی منی گەلەکی وانە،
گەنج خەلیل کوڕمامێ من لە ولاتی غەریبیانو غوربەتێ
گەلەك نەخۆشە وەزێ ڕابم نوینا ڕایەخم کەت کەتی ناز

**بالیفا بدەمە پالە،**

**ئەزێ ڕابم کەمەرا ل پشتێ خۆ بشکینم بکەمە هوردە بزمارە،**

**بسکێ خۆ ببڕم بکەمە سەرڕێشمە،**

**کەزییان بکەمە تۆقو هەوسارە،**

**گەنج خەلیل بینم سوارکەم ل کەوێتەکی تاڵە**

**بەبێ چ ولاتی شامێ ل ناو عوسمانیا دابێتە خارێ**

**دا کەس لۆمەی کوڕمامێ من نەکەن،**

**بەلی نەبێژن سوارەکی کوردە چەندی بێ کارو بارە!**

خــدە بە جۆرێک ڕۆدەچووە ناخی لاوکەکە، هــەر کتومت لەگەڵ ئەوی بێ، هەریدەکێشا دەمانچەی، یەک یەدەگ فیشەکی دەتەقاند. ئاخر بۆ فیشەک لە خەمدا نەبوو، کاکەڕەش زوو زوو فیشەکی بۆ دابین دەکرد.

خدە، بەرلەوەی بچێتە لای ماڵی مامیو عاشــقی حەفسەتێ بێت، یەک لە هاوتا مەڕدارەکانی مامی بە ناوی حاجی مووســا، کــە خاوەنی مەڕو ماڵاتێکی یەکجار زۆر بــوو، دوو ژنی هەبــوو، ژنەکانی چووبوونە تەمەنــەوە، لە ژێرباری قورســی مەڕداریو ماڵداری و مەڕدۆشــینو مەشــکەهەژاندنو ئیشوکارەکانی گوندنشینی، چەتروم[1] و کووڕ بووبوونەوە، زۆرجار برادەرەکانی پێیان دەگوت: بۆ ژنێکی جحێــڵ ناهێنی ئەو ژنانەت تواناو هێزیان لەبەر براوە. بە ڕای هەموویان حەفســەت بۆ مەڕدارێکی وەکو تۆ زۆر باشــەو بنێرە داخوازی. حەفســەت لەو

١. چەترووم: پەککەوتن و هیلاک بوون لەبن ئیشی سەخت و گراندا.

ژنانەیە کابانێتی گەورەمالانی پــێ دەکرێ. ئەویش زۆری پێخۆش بوو، ناردبوویە داواکاریو خوازبێنـــی حەفســـەتێ. مالی بابی حەفســـەتێ بـــەو داوایە قایل نەبووبوونو ڕەتیان کردبۆوە، چونکە ئەو پیاوە زۆر لە بابی حەفسەتێش گەورەتربوو، ســێ بە قەد تەمەنی حەفسەتێ هەبوو، دوو ژنیشـــی هەبوو، حەفسەت دەبووە ژنی ســێیەم. لە دوای ســالێک، کاتێک خدە چووە لای مالی مامیو عەشــقی حەفسەتێ بوو، مالی بابی حەفســـەتێ هەستیان کردبوو خدەو حەفسەت دلیان بە یەکترییەوەیە، بەهۆی هەلســوکەوتی حەفســـەتو خدەی نیگەران بوون. لە دوای گەڕانەوەی خدەی بۆ لای دایکی، حەفســـەت زۆر خەمناکو وەڕس بووبوو، ڕەنگزەردو لێو بەبار، هەمیشـــە تۆزی لەسەر ڕووخسارو بسکی کەوتبوو، بسکو شابسکو هوردە پەرچەمی ئالۆزو ڕەفتو ڕۆیینی، مجێزی جارانی نەمابوو. بابی حەفسەتێ، خدەی برازای لە ڕووی دەولەمەندیو پلەی کۆمەلایەتی بە هاوشانی خۆیان نەدەزانی، بۆیە بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبوون، حەفسەتێ بدەنە خدەی، ئەسلەن هەر بیریشـــیان لـــێ نەدەکردەوە، چونکە بە لای ئەوانەوە ڕێی تێناچێ خـــدەی پلکەهەمینەی بکەن بە زاوای خۆیان. باوکی دەلێ: ئەگەر ئەو کچەی بە خاوەن نەکەینو نەیبەســـتینەوە، مەبەستی بە شوودان بوو، دەترسم لەگەل خدەی سووکایەتییەکمان بێننەســـەریو دووچاری ئابڕووچوونێکمان بکەن، ئەو حەیاو نامووسەی چەند ســـالە کۆمان کردۆتەوە بە جارەکێ بیتەکێننو بمانکەنە پەندو بنێشتەخۆشـــکەی ســـەرزارو زمانی خەلکی. بۆئەوەی خدەی کوڕی پیرەژنێو لە برسانمردی دەســـتی لە بن سەری دانێ، ئەگەر کلکی حوشـــترێ بگاتە عەرزی، حەفســـەتی نادەمێو دەبێ وا ســـوڕگومی بکەم هەمینەی دایکی هەتا دەمری بلووریو بلێ کوڕەکی لەو حارەو لەو ڕەنگەم هەبوو، داخی گرانم بزربوو!

لە دوای ئەوەی سـالێک بەسـەر داواکاریو خوازبێنی حەفسەتێ تێپەڕیوە، ئەوجـارە بە خۆیان وەڵامی بۆ کابرای مەڕداری دووژنە، حاجی مووسـای دەنێرن: بێتە پێش، بە ماڵی دنیایێ حەفسـەتی دەدەینێ. کابرای دوو ژن، زۆر خۆشحاڵ دەبێـت کە بێریـوانو کابانەکی وەکی حەفسـەتێ بەرهەمی مـەڕو ماڵاتی بۆ بەخودان دەکات! تەداروکاتی خۆی ئامادە دەکاتو ڕۆژی مارەبڕین دیاری دەکەن. کاتێک حەفسـەت بەو سەینو بەینو مامرەتە لەسەر خۆی دەزانێ، هەموو شت براوەتـەوە، درەنگ کەوتووەو کـەس بە گوێی هەڵنەهێناوەو پێیـان نەگوتووە بە نیازین بتدەینــە ئەو پیاوەی کە لە بابت گەورەتـرەو دوو ژنی هەیە، تۆش دەبیت بە سێیەم ژنی! لە کاتێک ئەو خدەی ئامۆزای خۆشدەویو هاوتەمەنی خۆیەتی، بەڵێنــی بە خدەی داوە یان بۆ ئـەوی یان دەبێتە هی گڵــی. حەیرانی ئازایەتیو چاپووکیو خۆنەویستی خدەی بووە. حەفسەت، نیگەرانییەکی زۆر دایپۆشیوە، بەردەوام تی چاوی لەسـەر ئەو ڕێگایەیە لە زووری شـۆڕدەبێتەوە، بەڵکو خدەی ئامۆزای پێیدا بێت. ئەو ڕۆژە، دێوەرە مەسوور کە دێوەرەیەکی فەلەیە، ئەسپێکی ڕەشـی زنجی بارکردووە، تەنها سەرو بەشێک لە ملی دیارە، باقیماندەی ئەسپەکە بە ڕسـتە مووروو و زەنگیانەو مەرجانو خەناوکەو لیزکەی نقێمو ئەنگوسـتیلەو ڕسـتەبازنەو لەچکەو هەوریو خڕخاڵو پوولەکەو دەرزیو پرپرەو لاسەرەو عەترو بۆو کیسـەخەنە داپۆشراوە، وەلحاسڵ، سـەری هارومارى پێیە، ئەوەی بیرت بۆی ناچێ لە لای دێوەرە مەسـووری هەیە. هەموو گوندەکانـی ئەمدیو و ئەودیوی زووری دەکـرد، بگرە دوورتریش دەڕۆیشـت، هەرکە دەگەیشـتە هەر گوندێکی، دەلعازی هەرچی ژنو کچی ئاواییە دەوریان دەداو شـتیان لـێ مامرەت دەکردو لێیان دەکڕی. ئەویش هەموو شـتێکی وەک، کەشکو داندۆکو پەنیرو ساوەرو

بڕۆێـــشو هێلکە، لە بری ئەو وردەواڵانەی هەڵیاندەگرت، وەردەگرت. حەفســـەت، بە فرســـەتی زانی وەکو قاســـیدو ڕاســـپێردراوی بە متمانە، دێوەرە مەسووری بۆ لای خدەی ئامۆزای بینێرێ. حەفســـەت چاوەڕوانی کرد، تاوەکو ژنو کچی گوندی هەموویان لە دێوەرە مەســـووری کشانەوە، حەفسەت بە دێوەرە مەسووری گوت: ئەوە سەری چەند شەو و چەند ڕۆژانە هەرچەندی دەکەم «قاسیدەکی بە بەقاو بە متمانەم بەدەست ناکەوێ بینێرمە لای کوڕەتیم حەیرانێ، ڕاستی دڵی خۆی لەبۆ ببێژم!». ڕاســـپاردەم هەیە دەزانم ئەتۆ فەڵەی، دەڵێن فەڵە درۆیان ناکەن، لەگەڵ ئەو قسانە پاشۆڵەکی کەشـــکو داندۆکو چەند سەرکەپەنیرێکی دایێو گوتی ئەگـــەر بەوەش تەواو نەبی، دەتدەمێ ئەنگوســـتیلەی لە پەنجانم، لەبۆم بڕۆ لای خدەی پلکەهەمینەی پێی بڵێ بە کوڕەتیم حەیرانێ، ئەگەر لەسەر قەولو قەرارێ جارانە بێتەوە سەری مەیدانێ، دەرمبێنێ بە زەبری خەنجەری دەبانێ، یان دەستانم لێهەڵگرێ لەبـــۆ پیرەکورتانێ! وەکی بەرخەکۆرپەی دوایێ مێگەلان، لەبۆ خۆییم ببا لە جیاتی تارانێ! دێوەرە مەســـوور چاک لە مەبەستی حەفسەتێ حاڵی بوو، حەفسەت دەستڕەی لەمەرِ خدەشـــی دایێو گوتی: ئەو دەستڕەی ببینێ، بەقات پێ دەکات. دەســـتڕی لە باخەڵی ناو، ئەسپی ڕەشـــی زنجی دایە بەر قامچیانو گوند بە گوند، لـــێ لە گونـــدەکان دوا دەکەوت، بە بۆنـــەی مامرەتی کڕیارەکان، دێوەرە مەسوور گوند بە گوند بەدەم فرۆشـــتنی وردەواڵەکانی گەیشتە گوندێکی نزیک ماڵی خـــدەی، دوو ڕۆژی پێ چووبوو، بەو بەیانییە زووە هێشـــتا خەڵکی نانی قاوەڵتی سبەینێیان نەخواردبوو، پلکەهەمینە لە سەر تەندوورێ خەریکی پێوەدانی ئەســـتوورک بوو، خۆی بە حەســـاری ماڵی خدەیدا کرد، هەر ئەوەندەی گوت کە لە گوندی ماڵی حەفسەتی هاتووە، خدە هەموو ئەندامەکانی جەستەی

بوون بە گوێ، هەر زوو ئەسـپەکەی لێوەرگرتو بەسـتییەوەو دەیویست هەرچی لەو ماڵەی هەیانە لە پێش ئەسـپەکەی ڕۆ بکات، چونکە لە گوندی ماڵی بابی حەفسەتێرا هاتبوو، ئاخۆ ئەو وردەواڵەی سەر پشتی ئەسپەکە چەند جار دەستو پەنجەی حەفسەتێی تێگەڕابێ! دێوەرە مەسوور لەو کاتەی پلکەهەمینە لە سەر تەندووریٚ بوو بە هەلی زانی: ئەتـۆ خدەی پلکەهەمینەی؟ خدەش ڕێژنەیەک بەلێی لە زاری هەلوەری. دێوەرە گوتی: حەفسـەت خان ئامۆزای تۆیە؟ دیسـان بەلێ بە دوای یەکتردا ڕیچکەیان بەسـت. دێوەرەمەسـوور دەسـتی لە باخەلی ڕاکردو دەستڕەکەی حەفسەتێی دەرهێناو دایەدەستی خدەی، خدەش خەریک بوو باڵ بگرێ! لەگەڵ هەرقسەیەک لێی دەچووە پێشێو دیقەتی نێو زاری دەدا، چاوی لە چاوەکانی بڕیبوون، گوتی: حەفسەت خان سڵاوی لێدەکردی، دەیگوت:

**جوابەکم لۆ بدەنە کوڕەتیم حەیرانێ**
**هەرچەندی دەنگێ خۆم دەردینم دەنگم نایگاتێ**
**دەنگم نووسایە، لەبەر غەمی ئەوی دنیایێو لەبەر گریانێ**
**بە تەمانە بمدەنە پیرەگەمبۆرێ بنکورتانێ**
**یان ئەوەتە دەستانم لێهەڵگری،**
**یان دەرمبێنی بە زەبری خەنجەرێ لەوێ گۆڕەوێرانێ**

خـدە نەیدەزانی، نە گوێ لـەو ئازارنامەیە بگرێ، نە دەسـتڕەکەی بۆن بکاو فرمێسـکەکانی پێ بسـڕێ! هەرکە گوێی لەو ڕاسـپاردە گورچکبڕە بوو، دنیای ڕوونی لەبەرچاوان ڕەش بوو. کە بۆنی دەسـتڕەکەی لەمـەڕ خۆی دەکرد، هەر بە جارەکێ مەندەهۆش دەبوو، ئاخر لەو کاتەوەی دەسـتڕەکەی دابووە حەفسـەتێ،

هەمیشە لە مابەینی زەردەمەکانی دەشاردەوە. پلکەهەمینە، لەسەر تەندووری خۆی لە ئاردی نێوکەوڵی[١] داتەکاند کە ئەستوورکی پێ پان دەکردەوە، سەبەتە ئەستوورکی لە پێش دێوەرەمەسوورو خدەی کوڕی داناو نانی بەیانیان خوارد.

دێوەرەمەسوور، دەمێک بوو سەرەتاتکێی ژنو کچی ئاوایی، ئەوانەی کڕیاربوون، بەدی کردبوو، بۆیە هەستاو ماڵئاوایی کرد، خدەش هەر بەدوای ویدا خۆی کۆکردەوە، بە جۆرێک، پشتێنی کەڕنەکی سپی لە خۆی دەهاڵاند وەک فرفرۆکی دەسوورا. دایکی لەو پەلەپەلو خۆ ئامادەکردنەی خدەی کوڕی، واقی وڕمابوو، نەیدەزانی دێوەرەمەسوور چ هەواڵێکی بەپەلەی بۆ هێناوە ئاوا لە چواردەوری خۆی دەسووڕێ. قایشو قرۆشی دەمانچەی لە خۆی بەستو یەدەگەکانی پڕ لە فیشەک کردنەوە، پلکەهەمینە بە دیارییەوە هێدمەگرتی بوو، وەک کۆلکەدار وەستاوە: ڕۆڵە ئەوە چ هاوارێکت بۆ هاتووەو چی ڕوویداوە، ئاوا ئۆقرەت لێبڕاوە؟ لۆ بە داکی خۆت ناڵێی؟ ئەوە خەریکە دڵم شەق دەبات، بۆ کوێ خۆ ئامادە دەکەیو بۆ کوێ ئۆغر دەکەی؟ ئەمن چیدی بەرگەی دووریت ناگرم!

خدەش ڕاستو ڕەوان گوتی: دایە حەفسەتێ ئامۆزام دێوەرەمەسووری ڕاسپاردووە هەرچی زووە بیگەمێ، ئەگەرنا دەیدەنە پیرەگەمبۆرەکی، لە بابی خۆی گەورەترە! دایکی گوتی: ڕۆڵە لە عاسمانان بانگ دەکەنو دەڵێن: ئاوکووفی هەر تەیرەی لەگەڵ ڕەوی خۆی دەفڕێ، ئەوانە دەوڵەمەندن، پیرپیان[٢] بە هەژاری وەکو ئێمەدا نایەتەوە، پاروەی لە زاری خۆمان گەورەترمان بۆ قووت نادرێ، پێی دەخنکێین!

---

١. نێوکەوڵ: ئەو برە ئاردە کە کابانی نانکەر لە کاتی نانکردندا دەیخاتە نێو کەوڵی نان و لەگەڵ پانکردنەوەی هەر ئەنگوتکێکدا تۆزێکی لێ پێدادەکات.

٢. پیرپ: گرنگی نەدان بە یەکێک خۆ بەهاوشان نەزانینی.

خــدەش ئاگری لە جــەرگ‌و هەنــاوان بەربووبوو، بەدەم پێــڵاو لەپێکردن گوتی: دایە خواحافیز، دەچم بۆ ماڵی مامم ئیشــەکی بەپەلەو گرنگم هاتۆتە پێشــێ‌و نابێت خۆم دوابخەم. دایکی هەر ئەوەندەی پێڕاگەیشــت لە پشــترا تەماشای بکات، هەر زوو وەک تارماییەک لەبەرچاوی ون بوو. پلکەهەمینە، وەکــو بەردێکی بێگیان دەســتی لە ئەژنۆی وەرێنا، وەک لــە بن دارەکی بێت تاقە پەلکەکی پێــوە نەمابێ، لەبەرخۆیەوە دەیگــوت: دەک مارت بە قوڕێ بگیرێ‌و خانەی بابت خەرابی دێوەرەمەســوور، نازانم ئەو پیرە فەلەیە چ هاوارو چ خەبەرێکی بەو ســبەینەی ســاڵحانە بۆ خدرۆکەی کوڕم هێنا، ئاخر نە خێر بەشکرایەو نە شەڕ، بەو سبەینەیە کوڕێژگەت بۆ کوێ هەڵفڕاند؟ خوا دەزانی جارەکی دیکە دەیبینمەوە یان نا، خەونم پێوەدیوە: بە سێ گورگان پڕیان دەدایێ، هەرچەندی دەکرد باشاری نەدەکردن، یاڕەبی خوا چەپارەت بدات کوڕم!

خدەی پلکەهەمینــەی، بە دوای قەدەری نادیاری خــۆی کەوتبوو، بێئاگا لەوەی بکوژانی خۆشەویســتی، لە هەرســەراو و دەراوێکی، لەسەر کۆسپەی هەردەرگایەکی، شمشێری ڕووت بەدەستەوە بۆ ئەوەی عیشق سەر ببڕن.

بە جۆرێــک لە گونــدی دەرچــوو، وەک باڵــی پێوەنووســابێ، لە چەند هەناسەیەکدا هەر تارماییشی دیار نەما. بە ئاستەم پێی بە عەرزێ دەکەوت، وەک دەنکە تەزرەی هەڵدەقۆزییەوە. وەک گەردەلوول لەگەڵ خۆی لوولی بدات، پێــی لە عەرزی بڕاوە، هەورازو نشــێوی بۆ نییەو هەر ڕێــگا قووت دەدا. لە نەدیوان بەغارو بــە گورگەلۆقە، تەنها چرپەو تۆزێکی کەم لە بنی پێڵاوەکانی جێدەمێنێ، چاوی بڕیوەتە ئاســۆگەی زووری، دەیەوێ هەرچی زووە وەکو هەڵۆ لەسەری بنیشێتەوە. لەگەڵ هەر هەنگاوێکیدا، لە زەین‌و خەیاڵیدا ئەو پیرەپیاوە

گەمبۆرەی قەولە حەفسەتی بدەنێ، دەکوژێو زیندووی دەکاتەوە! وەکی گورگی نێو مێگەلان، بەردەبێتە گیانی ئەوانەی ئازار بە حەفسەتێ دەگەیەنن! وەک ڕەشەبایەکی هاروهاج، هەرچی بێتەپێشی لرفی دەکات. لە سەر ترۆپکی زووری، ئەو دەشتە پانوبەرینەی ماڵەبابی نازدارحەیرانێی لێ بە دیارکەوت، دەستی لە بناگوێی ناو حەیرانێکی سەرچیایی بەسەر دەشتی قەراجیدا شۆڕکردەوە:

**ئەنگۆ زەینێ خۆتان بدەنێ**
**دەشتی کاولەقەراجی لە من کاکی بە کاکی،**
**ئەمن جوابان دەنێرم سەلام لۆ داکی،**
**شەرت بێ دەست لە بەژنێ باریكو دوو چاوێ بەرەك هەڵناگرم،**
**هەتاوەکینێ کۆمەرەکی برادەران سەرم نەدوورن لە جانگی[١]،**
**شۆڕم نەکەنەوە ناو گۆڕو خاکی!**

هەر بە بازدان خۆی لە زووری شۆڕکردەوە پێدەشتی، وەک قەدەر بیرفێنێ!

گوندی ماڵی مامی، وەک تارمایی سەرابێکی یەکجار دوور دیارەو هێشتا ڕێگایەکی دوورو درێژی ماوە بگاتە بە شوێنی خۆی، وەلێ، خۆشەویستیو حەسرەتی بۆ دیداری حەفسەتێ، باڵی پێگرتووە، هەنگاوەکانی بە جۆرێک ئەو دەرودەشتە قووت دەدەنو لە دوای خۆیەوە جێیاندەهێڵێ، وەک چۆن ماسی ئاو دەبڕێ، ئاوا ڕێگا دەبڕێ. لە ئاقاری تخوبی دوو گوندان، مێگەلەمەڕی ماڵی

١. جانگ: پارچەیەکە بۆ کفن بەکاردێت.

مامـــی لە دوورڕا بینی، وەک گەردەنبەند لە ملی گردی ئاڵاوە، نە سـەری دیارەو نە بنی! بۆئەوەی کاتی گرانبەهای لە کیس نەچێ، خۆی لە شـوانەکان نەدیوکردو وای نەکرد بیبینن، لە حەفسەتێ بەدەر نایەوێ کات بە هیچکەسێک ببەخشێت.

ئێوارەیەکی درەنگ گەیشـتە ماڵی مامی، هەر لە سـەر کۆڵو بیر چاوی بە حەفســەتێ کەوت، لەچکەی لە نێو چاوانی بەستاوە، وەک ژانەسەری گرتبێت، تۆزو غوباری خەمێکی گران ڕووخساری تەڵخ کردووە. حەفسەتە مەشرەفخۆشو دەم بەپێکەنینەکــەی جاران نەبوو، کاتێک قاقاو حریتەی مێیانەی، ئارەزووەکانی خدەی دەورووژاند، هەروەک گوڵێکی ژاکاوی دەســت ڕەشــەبا، شــەمزاوە. چەند ڕۆژێکە ئاوی بە دەموچاوی نەکەوتووە، دەڵێی خۆڵو دۆی بەســەردا کراوە، ڕەنگی پەڕیوە، نائومێدی ڕەنگ و ڕووی ســواق داوە، بە قەدەر کونی دەرزی ڕووناکیی لە دڵیدا نەمــاوە، لێو بەبارو تازییە بارییەکەی، چیرۆکــی زوڵمێکی زۆر گەورەی لە ناخیدا حەشــارداوە. ئەو حەفســەتەی هەرجار کە پێدەکەنی ڕوومەتی قووڵ دەبــوو، دەتگوت قۆڵتــی ماچانە! کە لێــوی وەکو خونچە دەپشــکوت، دوڕوو مرورای وەک پۆلە ئەســتێرە لەنێو زاری دەبریســکانەوە! ئێســتا لێوی لەسەر یەک ناترازێنو بــزەی نایەتێو پێکەنینی بیرچۆتەوە! لــەو کاتەی چاوی کەوتە سەر خدەی، فرمێسکەکانی پێش قسەکانی کەوتن، کۆڵەگری لە هەوکی وای کرد بەحــاڵ نووزەیەکی لێوە بێت، وەک لە بنی ســیاچاڵێکدا بدوێ! بەزۆر لەخۆکردن توانی بڵێ: خدە ماندوو نەبیو بەخێربێی بۆ نێو ئاوری! خدە، بەحاڵ گوێی لێبوو. حەفسەت، ئەوەندە ئومێدبڕاو بووبوو، بۆیە توانای قسەکردنیشی نەمابوو!

چوونــە ژووری ماڵەوە. حەفســەت، بێئــەوەی لێی بپرســێ دەیزانی نانی نەخواردووە، سەبەتەی نانو پەنیرو ماستی لەپێش دانا. لــێ، خدە کوا نانی لە

قورگی ئاوا دەبێ؟! خدە، بە زمانی جەستە دەیویست حەفسەتێ دڵنیابکات تاوەکو ئەو لە ژیاندا بێت، ناهێڵێ ئەو زوڵمە سەر بگرێت. حەفسەت دەڵێ:

**ئامۆزا! کافری هەر حەوت دینان بە حاڵی من نەبێ!**
**ئەتو نازانی ئاگرەکەم بەربوویتە دەروونو دەروونخانێ**
**نە دەکوژێتەوە بە شەوبایێ شەوێ، نە بە تنۆکە تنۆکەیێ بارانێ**

ئـای دەبێت لـەو مەملەکەتە بـە قوڕێ گیـراوەی ئێمە، ژن بـۆ هێندە بەدبەختو چارەڕەش بێت! دەسەلاتی ئەوەشی نەبێت بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆیشـی بداتو خەڵکی دیکە بڕیاری بۆ بدەن! ئامۆزا، ئەمن لەسـەر قەولو قەراری خۆمم، یـان ئی تۆمە یان ئی گڵیم. خدە، نغـرۆی نێو بیرکردنەوەکانی بووەو قسـەکانی حەفسـەتێ دێنێ و دەبا. ئەوانەو زۆر ڕازی دیکەی لە چاوی حەفسـەتێ خوێنـدەوە: «دەردێ مـن نە لـە قەوامی حەکیمانـە، نە کاری نووشتەنووسانە، دەردی دەست لێکبەردانێ دەردەکی گەلەک گرانە!»

خدە، لە گێـژاوی بیرکردنەوە بۆ ڕێگاچارەیـەک دەخوولایەوە. بەڵێنەکانی عیشقێکی یەکجار پاکژی حینجە دەکردەوە. لەو کاتەدا ماڵی مامی، حەفسەت نەبێ، ئەوانی دیکە هەموویان بە بینینی خدەی چاویان چۆتە پشتی سەریان، وەک دوژمنی بابەکوشـتەی خۆیان ببینن، هەر بەسەری زمانیو بە لمووزی، ماندوونەبوونێکـی جنێوئامێزیان لێکردو لە بنـەوە لێوی لێدەکرۆژن! خدەش بێئـاگا لەوەی ڕۆژگار قـەدەری نادیاری دەچنێ، نازانێ لەوشـەوەدا پیلانێکی کوشـندە بۆ لەنێوبردنی لە ئارادایە! زۆرانبازیی عیشـقو ڕق دەستی پێکرد. تەوژمـی ئەقڵییەتی خێڵەکیو کۆمەڵگای پاشـڤەڕۆ ئۆقـرەی لەبەربڕیونو

بەرەو تاوانێک گوڕیان دەدات. ئا لەو شـــەوەدا، سەربڕەکانی ئەشق و جوامێری، ســـواری پشتی دێوی تاوان بوون، خەنجەری ڕووت بەدەستەوە بۆ لەتلەتکردنی جەســـتەی ژیانو عیشـــقو جوانی. بەڵێ، لەو شـــەوە خەمگینەدا خدەیان لە نەخشەی خۆشەویستی سڕیەوە، سوڕگومیان کردو لاشەکەشیان شوێن بزرکرد!

لـــەو ڕۆژەوەی بڕیاریاندا حەفســـەتی پێشکەشـــی بە حاجی موســـای بکەن، حەفســـەت، گێژاوی خەمو خەیاڵەکانی، دەیهێنێ و دەیبا. لـــە (گۆدە)ی بترازێ، کەســـێکی دیکە شـــک نابات ڕازو نیازی دڵی خۆی لە لا بـــاس بکاتو تۆزێک ســـوکنایی بە دڵیدا بێت. لـــە گۆدەی بەدەر کەس نییـــە خەمەکانی لەگەڵ بەش بکاتو ببێتە هاودەمو ڕازپۆشـــی. ئاخر گۆدە، هەر بەقەدەر لەپەدەستێک دەبوو. ئەو ڕۆژەی دایکی هێســـتر جووتەی لێداو کەس بە زیندوویی نەگەیشتە سەریو گوێیان لە یەک قووڕانەوەی نەبوو. کە داکی تۆپی، حەفسەت بەدەستی خۆی بزنی بۆ دەدۆشیو تێچینەی شیری بۆ دەکرد. بە دەستی خۆی گەورەی کردو عاملاندی. بۆیە هەمیشە وەکو دایک لە حەفســـەتێی دەڕوانیو شەو و ڕۆژ بە دوایەوە بوو. لەو کاتانەی حەفسەت دەچووە ژوورێ، گۆدە لەبەردەرگا وەردەکەوت تاوەکو دەهاتەوە دەرێ! حەفســـەت هەر بەخۆیشـــی ناوی نابوو گۆدە. گۆدە، بـــە جۆرێک هۆگری حەفسەتێ بووبوو، تەنها کاتی خەوتن لێی دادەبڕا، ئەوەش لەبەر قسەوقسەڵۆکی خەڵکی: گۆدە گڵاوەو شـــەرع نەفرەتی نەهیی کردووەو ناکرێ لەگەڵ مرۆڤەکان بژی و بنوێ یان بەوشێوەیە هاودەمیی لەگەڵ سەگێک بکەی. بەڵام حەفسەت، گۆدەی هێندە خۆشدەویســـت گوێی بە قسەی خەڵکی نەدەداو نەیدەتوانی دەستبەرداری بێـــت، هەموو رازی دڵی خۆی بۆ گۆدەی باس دەکـــرد، چونکە گۆدە تاکە بوونەوەر بـــوو، گوێی بۆ شـــل دەکردو تێیدەگەیشـــت. گۆدە، بەو خۆشەویســـتییەی خدەو

حەفسـەتێی دەزانی، ئەو چەند ڕۆژە، وەکی حەفسـەتێ دڵبەخەمو دۆش دادەما. گۆدەو حەفسەت، هەر بەڕاستی گیانێک بوون لە دوو جەستەدا!

گۆدە، چەند ڕۆژێکە یاری بە کلکی خۆی ناکات، کلکەسووتەی بۆ حەفسەتێ ناکات و کلکەئەنگوچکی کراسەکەی بە گاڵتە ڕاناکێشێ و، لەگەڵ منداڵانیش وەک ڕۆژان یاری ناکات! لە ناخیدا هەسـت بـە خەمێکی قوڵ دەکرێ، چاوی بەزەیی لەسـەر ڕووخساری حەفسەتێ ناگواسـتەوە. خەڵکی ئاوایی، بۆ یەک چرکەش حەفسـەتیان نەبینیوە گۆدەی بەدواوە نەبێت، بۆیە بەردەوام بەیەکەوە ناویان دەهێنان: حەفسـەتو گۆدە، حەفسـەتو سەگەکەشـی لەوێ بوون...
گۆدە، تازە سنووی هاتبۆوە[1]، لەگەڵ میزکردنێ لاقێکی هەڵدێناو بڵندی دەکرد بەسـەر پنچکە حوشـترالووکیو خرنووکدا دەمیزت. گـۆدە بە هاتنی خدەی، وەک فریادڕەسێکی حەفسـەتێ خۆشحاڵ بوو. ئەویش وەک ئەوان چاوەڕوانی ڕووداوێکی ناخۆشی دەکرد!

ئەوشەو گۆدە، وەک بۆنی خوێنێکی بەناهەقڕژاوی کردبێت، لمووزی بەرەو ئاسـمانێ بەرزکردۆتەوەو دەلوورێنێ، دەیەوێ سـکاڵای غەدرێک بەرزکاتەوە! ئـەو دادو فیغانەی گۆدەی، دڵی وەک بەردی دەکرد بە ئاو! لوورەو هەناسـەی گۆدەی وەک سـتوونێکی ئاگر بەرەو ئاسـمان هەڵدەکشا، پەڕوباڵی هەورەکانی دەسـووتاند، ئاسمانی بە فریشتەکانەوە دەخسـتەگریان! حەسرەت و سووتانی ناخی دەگەیشـتە عەرشـی عەزیم و بۆنکرووزی دێتـەوە بەرلووتی خاوەنماڵ

١. سنووی هاتبۆوە: سنوهاتنەوە. توتکە سەگی نێر تا گچکەیە، لە هەڵمیزتندا قاچی بڵند ناکا، کە باڵق بوو لە کاتی هەڵمیزتن بەسەر دار و دەوەن و پنچک و... لاقی بەرز دەکاتەوە، نیشانەی ئەوەیە سنووی هاتۆتەوە.

و، بۆئــەوەی لە بنخــاک کردنی قامەتــی بەخوێن ســوورکراوی میهرەبانیو خۆشەویستی، بەئاگا بێتو بێدەنگ نەبێ!

ئەوەی بینرا تەنها حەفســەت قایشو قرۆشو دەمانچەکەی خدەی بە دەست برایەکەیەوە بینی، کە دەیویســت بیشــارێتەوە. برایەکەی حەفسەتێ، کە زانی حەفسەت دەمانچەکەی خدەی بینی، بە ئاماژەی سەربڕین پەنجەی بە ملی خۆیدا هێنا: خخخخخ! واتە دەنگ بکەی ســەرت دەبڕم! لە تەویلەی، تاکەپێڵاوێکی پڕ خوێنی خدەی لــێ بەجێمابوو، هەر زوو ئەویشیان شاردەوە. حەفسەت لە نێوانی بەڵێنی عیشقێکی پاکژو بەجێگەیاندنو دەستگرتن بە نەریتە باوەکان تاسابوو و، لەتاو ژانی دەروونی پڕ لە حەســرەتو کوڵــی، گەوزی دەدا. بە بینینی دەمانچەو پێــڵاوە پڕخوێنەکەی خدەی، یەقینی پەیداکرد، کە ئەوشــەوە خدەیان ســوڕگوم کردووەو لە ژیاندا نەماوە! حەفســەت کاتێک بێئومێد بوو لە بە زیندوومانەوەی خدەی، کەوتــە جێبەجێکردنی بەڵێنو پەیمانەکەی کە بە خدەی دابوو: «ئەگەر بژیم هی تۆمو ئەگەر مردم هی گــۆڕم!». لەبەرخۆیەوە بە گۆدەی دەگوت: بەڵێن بێ خۆم ڕادەست نەکەم! بە دڵێکی باوەڕ بەخۆ، شانی لە شانی مەرگدا. بە گۆدەی دەگوت: ئاخر هەتا کەنگێ فرمێســکەکانم لە قوڵایی چاوەکانمدا قەتیس بکەم؟ هەنسکەکانم لە گەروومدا بخنکێنمو فریادەکانم قووت بدەم؟!

ئەو زیندانە ســووتێنەرە ســتەمگەرە، بەرەو هەقیقــەت بەجێدێڵم، بەرەو ئامێزی خدەی خۆم هەڵدەفڕم. حەفسەت دەیگوت: هەرگیز من لە خۆم نابوورم! چەند ســاتێکە لە دوای خدەی هەناسەی دەدەم! هەناسە حەرامەکانم ڕادەگرم، ئیدی بەســە ئەو هەناســانە حەرامن حــەرام لەدوای خدەی، کــە من بوومە ســـەبەبکاری گەڕانەوەی بۆ بەرکێردی غەدرو مردن. ئەمــن بۆ ئەوەی نابم لە

دوای خدەی تاقەڕۆژێکیش بژیم! حەفســەت بە گۆدەی گــوت: لێم ببووره بە تەنهات دەهێلمەوە، توخوا لە بیرم بکەو بۆ خۆت بژی! ژیان زۆر خۆشـــە، بۆیە ئەمن دەمەوێ لە پێناویدا بمرم!

ســەری بەســەر بیرەکەدا گرت، بۆئەوەی گوێی لــە ناڵەیەکی خدەی بێت، یان، لــە بنی ئەو بیرە قوڵەی بەحاڵ ئاوەکەی بنــی هێندەی ئاوێنەیەک دیارە، سۆراغێکی دەست بکەوێ، لــێ، سۆراغێک لە خدەی نییە، کە لەنێو ئاوی ئەو بیرەدا خنکابێ، بەڵکو خدە، لە زەلکاوی نەریتە بۆگەنەکانی کۆمەڵگادا خنکا!

حەفســەت، دەمێکە هــاوارەکان لــە هەناویدا دەخنکێن، ئــازاری بەجێ نەگەیاندنی بەڵێنێک، ویژدانی دەکرۆشــت! بڕیارە قورسەکەی دا: سەرەوخوار دەفڕم، نەبادا خدە لەوێ بێتو پێم بەر ســەری بکەوێ! فڕینێکی سەراوســەر، قیژەیەکی (خدە!)ی درێژ درێژ بە قــەدەر قووڵایی بیرەکە دەنگێکی وا دەنگی دایــەوە، پایەکانی تــەلاری ویژدانی مرۆڤایەتی وەلەرزەخســت! چریکەیەک، کتومــت چریکە درێژەکــەی خەجێ، کە لە چیای ســیپانێ خۆی فڕێداو فڕی خۆی بەو قیســپە تیژەی سیامەندی سمیبوو، داکرد. قیژەیەکی درێژ بە قەدەر درێژایی زوڵمەکە درێژ! لە ئاوی بنی بیرەکە چەند بڵقێکی سەرئاوکەوتوو، چەند جووڵەیەکی بازنەیی، ئیدی بۆ هەتایە لەناو خۆیدا نقومی کرد.

دەنگی قریشکەی (خدە!)یەکی، هێندەی قریشکەی خەجێ بۆ سیامەندی درێژ، لە قووڵایی بیرەکە دەنگ دەداتەوە. لەگەڵ چریکەو فریادی حەفســەتێ، ئاسمان تیک دەبا، قەرەچووغ گرمەیەکی ترسناکی لێوەدێ، چەند گابەردێک لە هەردوو دیوی قەرەچووغی، ئاگریان لــێ بەرزدەبێتەوەو بەرەو بناری چیای، خلۆر دەبنەوە. لە دواییدا خەڵک زانی قەرەچووغ، لە زەبری ئەو زوڵمەی لە عیشــق

درا، ئێخەی دادڕیـــوەو قۆپچەکانی بەرەو بناری خلۆربوونەوە، تا وەکو ئەوڕۆش ئەو قۆپچە بەردانە لە بناری هەردوو دیوی، بە چاو دەبیندرێن!

ئەوەی ئاگاداری ئەو فڕینە بوو، تەنها گۆدە بوو کە سەری بە بیرەکەدا گرت، دیتی حەفسەت کاتێک دەفڕی، چۆن هەوای نێو بیرەکە بسکو پەرچەمی شانە دەکرد. گۆدە لە چەند چنجڕۆکێک لە کەروکەی بیرەکەو چەند نووسکانەوەیەک، هیچی لە دەست نەهات. زۆر چەنگەبازی بەکرەی بیرەکەی بوو، لـــێ، سوودێکی نەبوو، بە ناچاری لەسەر لێواری بیرەکە وەرکەوتو دۆشدامابوو. لە دوای ئەوەی چەندجار بۆ ماڵێ غـــاری دا و دەقووڕایەوە، کەس بە دەنگییـــەوە نەهات. کاتێک زانییان حەفســـەت دیارنەماوە، هەریەکەو لەوی دیکەی دەپرسی: حەفسەتت نەبینیوە؟ چونکە ئـــەوڕۆژە هەموویان لێی بەچـــاو بوون، داخوا لە دوای ســـوڕگومکردنی خدەی، چ ڕەددێکی دەبێت! هەموو تەویلەو هۆڵە مەڕەکان گەڕان، بەڵام هەواڵێک لە حەفسەتێ نییە! کاتێک لە دۆزینەوەی بێئومێد بوون، دەیانویست دوو کێلان بە بەردێکی بپەڕێننو بڵێن خدە حەفســـەتی هەڵگرتووە! وەلـــێ، گۆدە دەرفەتی ئەو تۆمەتـــە ناڕەوایەی پێنەدان: هێندەی بچێتە ماڵێو بقووڕێتەوەو بێتەوە لای بیرەکەی، ســـەرنجی هەموو خەڵکی بۆ لای بیرەکە ڕاکێشا. کە چوونە لای بیرەکە، گۆدە چەناگەو لمووزی لەسەر پشتەدەســـتی خۆی درێژکردبوو دەگریا، هۆن هۆن فرمێســـکی دادەباراندن، ئەو نانـــەی منداڵ بۆیان هێنابوو، پەلکەنانێکی لـــێ نەخواردبوو. گۆدە مانی گرتبوو کـــە دەم لە زەوادی نەدا. بە ئاماژە بە هەموانی دەگوت: حەفســـەت لـــەو بیرەیدایە! خەڵکی ئاوایی قولابـــی چوارنووکی دەولک دەرهێنانیان هێناو شـــۆڕیانکردەوە نێو بیرێ، دوو جاریان باداو هەڵیانکێشایەوە. هەر یەکەمجار، لەچکی حەفســـەتێ بە قولابەکەوە بوو، دڵنیابوون حەفسەت لە

نێو ئەو بیرەیە. پیاوێک بە گوریســـەوە شـــۆڕبۆوە بیرێ، گوریسەکەی لە تەرمی حەفسەتێ گرێداو هەڵیانکێشاو هێنایانە دەرێ. لاشەیەکی بێگیان! براگەورەکەی حەفســـەتی، لەسەر دەستی خۆی دانا بۆئەوەی بیباتەوە ماڵێ. چاوەکانی زەقەزەق لەو خەڵکەی دەڕوانی، گۆدە بۆنی پێوەدەکرد، هەردوو بســـکو هەرچوار کەزییە ئەستوورەکانی ئاویان لێدەچۆڕایەوە.

لە دوای شۆردنو کفنکردنی، تەرمەکەیان بەرەو گۆڕستانی گوندی بەڕێکرد. گۆدە هەنگاو بە هەنگاو بە دوای تەرمی حەفســـەتێوە دەڕۆیشـــت، تاوەکو ئەو کاتەی ناشـــتیان، خەڵکی گۆڕستانیان جێهێشـــتو بەرەو ماڵەکانیان گەڕانەوە، تەنها گۆدە ئامادە نەبوو گۆڕی حەفسەتێ جێبهێڵێ! مندالآنی ئاوایی نانیان بۆ دەبردە گۆڕستان، گۆدە یەک پەلکە زەوادی لەو نانەی نەدەخوارد، سەری لەسەر خۆڵەکەی سەر سینگی حەفسەتێ دانابوو، هۆن هۆن فرمێسکی دەباراندە سەر گۆڕی حەفسەتێ. لە دوای حەوت شەو و حەوت ڕۆژان، گۆدە بزربوو، ئێستاشی لەگەڵدابێ بزربوونێک بزر بوو، کەس نازانی لە مەملەکەتی ڕەجمو کوشـــتن، سەری خۆی بۆ کوێ هەڵگرتو بۆ هەتا هەتایە خۆی ونکرد!

هەواڵی خۆ خنکاندنی حەفسەتێو سورگومکردنی خدەی، زار بە زارو گوند بە گوند ڕۆیشت. وەک خەجێو سیامەندی باسیان دەکرد!

حەفســـەت گۆڕێکی هەبوو، کچانی گوندی ڕۆژانی هەینیو چوارشەممان دەچوونەسەری، لـێ، خدە بە جۆرێک گومکرا، هیچ سەرەداوێکو هەواڵێک لە تەرمەکەی دەست نەکەوت! کاکەڕەشو چەند برادەرێکی خدەی، هیچ شوێنێک نەما بەدوای تەرمی خدەیدا نەگەڕێـــن، کەونەبیر نەما نەگەڕێنو کەندڕ نەما سەری بەســـەردا نەگرن، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، کەسێک ئێسکو پرووسکی

خدەی نەدیتەوە، گومان دەکرا هەر لە تەویلەی وڵاخان، گۆڕیان بۆ هەڵکەندبێتو شـــاردبێتیانەوە. ئەوەی بۆ خەڵکی گوندی جێما، تەنها یادگارییەکانیو هاوارو ئاخو نزوولـــەی پلکەهەمینەی دایکی بوو، ڕۆژانـــە گوێچکەی گوندێکی بە ســـەرەدوولکەو لاواندنەوە کەڕکردبوو، بانگی خدەی دەکرد، کەس زاتی نەدەکرد، بـــە لای ماڵی پلکەهەمینەیدا ڕەت ببێو بەکـــوڵ لەگەڵیدا نەگری! نە ئاگر لە ســـووتانی جەرگی تێردەبوو، نە ژیانیش دەســـتی لە بەرۆکی دەکردەوە! هەتا لە نووزە کەوت، هەر گریاو هەر گریا!



# ١٣

بە لەدەستدانی ڕۆستەمو خدەی، کاکەڕەش دارێکی لە ڕوحی درا. دایم و دەرهەم دەیگوت: خدە جێی چاوی تێدابوو، هەمیشە یاخی بوو یاخی! ئەو ساڵە کاکەڕەش، چەند کەسێکی ئازای لە کوڕە کرمانجەکان کە لە قسەیدا بوون، لە خۆی کۆکردبووەوە، بە گیانی بەرەنگاری پەروەردەی دەکردن، بۆئەوەی لە دژی چەوسانەوەو سووکایەتی بە مرۆڤەکان خۆیان بەرپرسیار ببینن و بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی بزانن داکۆکی لە کرمانجە مافخوراوەکان بکەن، لە هەرکوێیەک بن، هیچ گوندێک لەگەڵ گوندێکی دیکە جیاوازیی نییە. چۆن ئاغاکان هەموویان لەسەر یەکتری بە جوابن، کرمانجەکانیش دەبێ ئاوابن. دەبێ هەموومان شارەزایی لە شەوڕوییو هەڵمەتی شەوانە پەیدابکەین. جارجارەش هەندێک کاری بچووکی پێدەسپاردن، بۆئەوەی بۆ کاری گەورە ڕایانبێنێ. کاکەڕەش دەیزانی کێ بۆ کارە قورسو شوێنە عاسێکان دەبێت، زۆر سەرسام بوو بە دەستوەکەریو دەستگەرمیی هیدۆی. لەگەڵ هیدۆی دەیانزانی هەندێک تۆڵەکردنەوەو تەمبێکردن دەبێت لە زستاندا بکرێ، چونکە خەڵک لە ژوورێن، هەندێکیش دەبێت لە هاویندا بکرێ، چونکە کەسی بە ئامانجگیراو لە دەرێ دەخەوێ! هەروەها زۆر بە وردیو لێزانانە شوێنو کاتی بۆ دیاری

دەکردن. ئاغاکان، زۆرجار بە ڕۆژی ڕووناکو بە بەرچاوی خەڵکەوە بە ئاشکراو بە پاڵپشتیی پیاوەکانی حکومەت، تاوانو زوڵمیان لە کرمانجەکان دەکرد. کاکەڕەش دەیگوت: ئەگەر ڕۆژی ڕووناک هەیە، بۆئەوەی ئاغا زوڵممان لێبکات، شەوی ئەنگوستەچاویش هەیە بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆمانی تێدابکەینەوە. هەمیشە دەیگوت: هەموو ئاغایەک هەر زاڵم نییە، کوڕەئاغای خوێندەوارو قەڵەم بەدەستی وا هەیە، لە سەنگەری هەژاراندایەو دژی چەوسانەوەیەو جیاوازیی مرۆڤەکان ڕەت دەکاتەوە، کرمانجەکانی ژێر قەڵەمڕەوی باوکی هاندەدا سوخرەو بێگاری بۆ نەکەن، باوکیشی مرۆڤێکە وەک ئەوان. بۆیە دەبێ ئەوانەیان لێ جیابکەینەوەو دەستیان لێ بپارێزین. کاکەڕەش، دەیزانی بە کوێوە بدات ئێشی زۆرە، دەیگوت: دەبێت بە جۆرێک غافڵگیریان بکەین، چاویان پێ بشکێو زاتی ئەوە نەکەن پڕ بدەنە کرمانجەکان. دەبێت لەو کارە نابەجێو نیوەچڵانە خۆ بپارێزین کە لەجیاتی تەمبێکردن، دوژمن دڕتر دەکات! ئێمە دەبێ لە سەرە گەورەکانەوە دەست پێبکەین، بۆئەوەی چاوی ئەوانی دیکەی پێ بشکێنین! کەس خەمی چەکو فیشەکی نەبێت، چەک بۆ ئەوەیە چەکی پێ پەیدا بکەین! هەمیشەش دەیگوت: دەبێ دەست لە کوشتن بپارێزین، مەگەر زۆر ناچارمان بکەن، چونکە کوشتن، برین قووڵتر و ڕق ئەستوورتر دەکات! ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین نینۆکیان بکەین!

کاکەڕەش هەواڵی ئەوەی پێ گەیشتبوو کوڕەگەورەکەی ئەحمەدئاغای، لەو ئاقارەی بە دەراسەی خەریکی دروێنەیە. ئەو ئەحمەدئاغایەی، ئاغای چوار گوندان بوو، براگەورەی ئاغەواتی ناوچەکە بوو. ئەو ئەحمەدئاغایەی پایزی ڕابردوو عەرزی لە کرمانجە هەژارەکان داگیرکردبوو، لە بری ئەوە،

هەندێــک عــەرزی نەزۆکی لە بناری زووری دابوونــێ، ئەو زەویانەی بەردەڵانو بێ پیتو بەرەکەت بوونو هیچیان نەدەهێنا. ئێستا کاتی دروێنەیەو دەڕاسەی ئەحمەدئاغای، تەبــارەی داوەتە پێش خۆی. ئەحمەدئاغــا، یەکەم کەس بوو دەڕاسەی هێنابوە ناوچەکەو کەس هێشتا شتی وای نەدیبوو، دروێنەیان هەربە داسێ دەکرد. دەڕاســەی ئاغای، تەبارەی نە بەکرێ نە بەپیاوەتی بۆ هیچکەس نەدەدورییــەوە! هەر ئەوەش بــوو وای کرد کــوڕی ئەحمەدئاغای، وەک فیزو پۆزلێدان بەدیار گەنم و دەڕاســەیەوە خێوەت هەڵبدا، دەنا خزمەتکار و نۆکەر کارەکانیان ڕایی دەکرد.

کاکــەڕەش بانگی هیدۆی کرد: هیدۆ هەر ئێســتا جلکی کۆنی شــەپڕێو لەبەربکەو برۆ ئاقاری گوندی ئەحمەدئاغای، بزانە دەڕاسەی لە کوێ دەگەڕێو کێ سەرپەرشتیی دەکاتو کێش لەوێیە؟ سۆسەیەکی ورد بکەو هەواڵەکەمان بە خێرایی بۆ بێنەوە.

هێشــتا قســەکەی تەواونەکردبوو، هیــدۆ جەمەدانیو کورتەکــی فڕێداو دەمانچــەی لە قەدی کردەوە، خۆی کردە ڕێنجبەرێکی نابووت! ، بارگینێک لەوێ بەسترابۆوە، پەتکی لە سینگی کردەوە و هەر بەڕووتی خۆی هەڵدایە سەرپشتێ، ڕۆیشت و ڕانەوەســتا تاوەکو گەیشتە نێو پەرێزی گەنمی ئەحمەدئاغای، دەڕاسە دەگــەڕێو تەبــارەی داوەتە پێش خۆی، تۆز دەچێتە ئاســمانێ، لــە دوای خۆی پەرێزێــک وەک قژی چاک کراو جێدەهێڵێ، هەر بــەری تەبارەیەو لرفی دەکات! هیدۆ دیقەتی کەوتە ســەر خێوەتێک، جڵەوی ئەســپی ســووراندو چاویدایە، بینی پیاوێکی ســوورەو کەڵەگەتی چاوشینو دەستوپێ سپی، جووتە سمێڵێکی ســووری قوڕمیشــکراو، جەمەدانی لەبن هەنگڵی گرتووەو کڵاوێکی بەسیمی

زەردی دزەییانەی لەسەرپێیەو لەسەر کورسییەک دانیشتووە، دەستی داوەتە بەرچاوی‌و لەسەر سەدەی دەڕاسەی دەڕوانێ، جارجار دووربینی بە چاویدا دەلەقێنێ، کووپەئاوێکی سەهۆڵاوی لەلایە، جامێکی فافۆنی لەسەر دانراوە، کۆتکەماستاوێکی کوڵکنی بە ماستی مەڕی و کلۆ سەهۆڵێکی تێدایە. هیدۆ سڵاوی لێکرد، لێ چونکە هیدۆ ئەوەندە نابووت‌و پەڕپووت هاتە بەرچاوی، هەر وەڵامی سەڵاوەکەیشی نەدایەوە. هیدۆ لە تینووان زاری وشک بووبوو، دەستی بۆ جامە فافۆنەکەی سەر دەرخۆنەی کووپەئاوەکە درێژکرد، ئاغا تێیراخوڕی: هێی هێی هێی! ئەو ئاوە بۆ کرمانجان نییە، لەو دێمکەیەی لە دەرێ هەڵواسراوە، بخۆوە، دەڵێی خنکاوی لە تینووان!

هیدۆ ئاوەکەی بە سەر دەوییەوە کرد، لە تینووان نیوەی بە سینگی خۆیدا ڕشت. هەناسەیەکی قوڵی لەگەڵ ئاوەکەدا هەڵکێشا. کوڕی ئەحمەدئاغا گوتی: ئەوە لە چی دەگەڕێی لەو نێوەی؟ هیدۆ گوتی: گەورەم گایەکی ڕەشی کۆرەم لێ ون بووە، نەتبینیوە؟ گوتی» گای ئاوا نەهاتۆتە ئێرەو بڕۆ لە بەرچاوم ونبەو لای بای بەردە، بۆن ئارەقەی سەی تۆپیوت لێدێ! سەگباب وادەزانێ ئەمن گاوانی بابیمە، پرسیاری گای لە من دەکات!

هیدۆ بەپەلە گەڕایەوەو لە خۆشییان هەر سمێڵەخدکەی دەهاتێ. لە ئەسپەکەی دابەزی‌و بەستییەوەو چووە لای کاکەڕەشی: مزگێنی! بەشەرەفم یەک تفەنگی برنۆی ڕەقەم حەڤدە، تیژایی گوللەی ناخوا، کوڕە هەر بای پێ نەکەوتییە، دوو خەریتەی پڕ فیشەک، دەمانچەیەکی چواردەخۆری لاکەلی قوونک سۆر بە پێنج یەدەگەوە، هەمووی قایش‌و قرۆشی حەسیب قادری کەرکوکی، کوڕە دووربین دووربین! ئای چەکی ئاغایان چەند جوانن! وەڵڵا

هەریەکــەی ئەولادەکی دەهێنا! ئــەو تفەنگە، باوەڕناکــەم گوللەی لە لوولەی هاتبێتە دەرێ، دارشووشە چ دارشووشە، هەر ڕدێنی لەبەر قۆنداغەی بتراشە!

کاکەڕەش گوتی: ئەوشەو بە خزمەتی دەگەین.

دنیا هێندە گەرمە، ئەو ئاقارە وەک تراویلکە هەڵدەچێو مێروولەی دەکات، هەر دەڵێی ســەرگوڕی ئاگرییــەو هەڵدەچێت. جەنگــەی دروێنەی گەنمییە، دەنگی جیرجیرەو زیکزیکەی، پەیامی گەرمایەکی بێئامان بە گوێی مرۆڤەکاندا دەدەن. قەتــێ هێلانەیان لە بن قەســەڵی گەنمی خۆش دەکەن، ســۆفەقیتەو بوغازو پۆپیتەســلێمانەو تیترواســک لە قەراغ ڕێــگا دەندووکیان کردۆتەوەو بەپەلە هەناسە دەدەن، خۆیان لە بن پنچکە حوشترالووکو خرنووکان دەخزێنن، بۆئەوەی لە تیشکی گەرمی خۆر خۆیان بپارێزن، لە دوای دروێنە هێلانەکانیان بــە ئەزیەت پێدەزاننەوە، چونکە نیشــانەکانیان هەموو لــێ تێکچووە. ئەو تەبارەگەنمەی هاتۆتە پشــتێنی پیاوی، گەنمی ئەحمەدئاغایە، هێندە غوردە دەڵێی بۆ هەتیوان داچاندراوەو ڕسکاوە. دوو پیکەب دەرەقەتی گەنم کێشانەوە نایەن، قۆمەتە قەسەڵەکان وەکو گردی بچووک بچووک بەجێماون!

کاکــەڕەش، هەمیشــە ئــەوڕۆژەی دەهاتــەوە بەرچاوی کــە عەرزەکانیان لــە کرمانجــەکان داگیرکردو چەنــد عەرزێکــی نەزۆکیان لەجیاتــی دانێ. سکاڵای ژنی ڕۆستەمەشــێتی ڕەحمەتی لە گوێیدا دەزرینگێتەوە، قسەکانی ئەحمەدئاغایشی لە زەینی خۆی لێکدەدایەوە: ئەمن دەڕاسەو تراکتۆرم کڕییە، ئاخر خۆ جووتەهێسترو جووتەکەر نییە لە عەرزی سەرسەدەکورت بسووڕێتەوە، دەبێت عەرزەکانی من هەموو بەســەر یەکەوە بن، هەتــا چاو هەتەر دەکات، سەرســەدەیان دووربێ. دادو فیغانی ئەو خەڵکە، تۆسقاڵێک لە بەردی ویژانی

ئەحمەدئاغای نەڕووشـــاند! ئەوجا ئەحمەدئاغا، ئاغای چوار گوندانەو ئاغای ئاغایانەو کەس دەوێرێ قســـە لە قسەی بکات؟! ژنی ڕۆستەمی ڕەحمەتی بە ســـێ منداڵی هەتیو و بێ باب، ئەوەندە فرمێسکی بۆ عەرزەکەی خۆی ڕشت، بەردی دەتاواندەوە، وەلـــێ، کێ دیویەتی دڵی بەردینی زاڵم بە ئاوی چاوان نەرم بێت؟! دەبێت وەکو بەردی ســـەر ڕێگا لەسەر ڕێی خەڵکی هەژاریان لابدەین، کاکەڕەش ئاوای گوت.

لـــەو دەمییەوە لەگـــەڵ هیدۆو ســـەلیمی بڕیاریاندا ناهێڵـــن ئەو گەنمانە ئاوا بەئاســـانی بدوورنـــەوەو قووتی بدەن! هیدۆ دەیگـــوت: کاکەڕەش لە بیرتە خێزانی ڕۆستەمە شێتی ئەگەر دەگریاو دەیگوت: ئەو تۆزە عەرزەمان هەبوو، خەڵک بە خێرا خۆیان بۆیان دادەچاندین‌و بۆشـــیان دەدوورینەوە، بۆئەوەی ئەو ســـێ منداڵە بێ بابەی پێ بەخێوبکەم‌و لە برســـان نەمرین، ئێستا دەستم لە قونکی جەواڵی هاتەدەرێ، هیچم بەدەستەوە نەما، ئاخر ئەحمەدئاغا چاوت بە خۆڵی قەبری نەبێت تێرنابێ، تەماع لە ئێمەی خاوەن سێ هەتیویش دەکەی؟! وەبیرهێنانەوەی ئەو قسانە، کاکەڕەشی وردوخاش دەکرد، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: شەرت بێ دەبێ هەقی ئەو بێوەژن‌و هەتیوانەت لێبکەمەوە، قابیلە تاریکەشەو بڕابن؟ ئەگەر پیاو هەبێت تاریکەشەو زۆرن! لەناکاو، لە خەیاڵەکانی ڕاچەنی: ئەرێ هیدۆ بەڕاســـت ئەوشەو تاریکەشەوە یان مانگەشەوە؟ هیدۆ گوتی سەر لە ئێوارێ مانگەشـــەوە، هەر بایی ئەوەی مانگەشەوە هەتاوەکو ئێمە دەگەینە لای خێوەتەکەی ئاغای، دوایی مانگ خۆی لە پەنا دەداو دەبێتە تاریکەشـــەو، ئەوجا خۆ ئێمە ناچین دامەی لەگەڵ بکەین، ئیشی یەک سەعاتییە!

کاکەڕەش‌و هیدۆو سەلیم، بۆ شەودەرچوونێک خۆیان ئامادەکرد، کە نزیکەی

شـــەش مانگ زیاترە خۆی بۆ دوا دەخەن، بۆ ئەو کاتەی ئێستا ئەنجامی بدەن. ناوی نهێنییان بۆ هەرسێکیان دانا. بۆ خۆپارێزی لە ناسینەوە، کەس بۆی نییە بە ناوی ڕاستی خۆی، بانگی ئەوی دی بکا. ئەرکی هەریەکێکیان دیاری کراوە، تەنها ســـەلیم بۆی هەیە قســـە بکات، چونکە گوندەکەی ســـەلیم دوورترەو بە ئاسانی نایناسن. ئەوڕۆژە، نابێت هەرسێکیان پێکەوە ببینرێن، نەبادا گومانیان بچێتە سەر!

ڕووناکی بە ئارامی ڕاخوشیو تاریکایی شوێنی گرتەوە، گوند لە تاریکایی لوول بوو. لە دوای ئەوەی خەڵکی گوندی کرخەو بوون، هەرسێکیان بەئەسپایی یـــەک لە دوای یەک لە گوندی وەدەرکەوتن، کەســـیان ورتـــە ناکات، بەلاڕێدا دەڕۆن. مانگەشـــەوە، مەزەندەی ئەوەیان کردووە تا دەگەنە شـــوێنی مەبەست، مانگ خۆی لە پەنا بداتو ئاوابێ، تاریکی بڕژێتە نێو تەبارەی گەنمو پەرێزەکان، بۆئەوەی ئەو کاتە، کوڕەگەورەکەی ئەحمەدئاغای خەوتبێتو لە شیرنخەودا بێ، بارتەقای ئەوەش لە گوندی دوورکەتوونەتەوە کە بتوانن قسان بکەن، کاکەڕەش گوتی: هیدۆ بە ڕۆژ کاتێک بۆ سۆسەکردن چوویە خێوەتەکەی، گوتت گایەکمان ون بـــووە، ئـــەدی ئەگەر بەو شـــەوەی نەخەوتبوو و بە ئاگابـــوو؟ ناڵێی بۆچی هاتـــووم؟ هیدۆ گوتی: دەڵێم هاتوومە، ئەگـــەر گەنمەکانی خۆتان دووریەوە، پەڵەگەنمێکم هەیـــە بۆم بدوورنەوە! ئاخر هیدۆ کوڕی ئەو گۆنگەڵانەیەو قەت بۆ قسەی دەستو ڕستو و وەڵامی بەجێ، دانامێنێ! یەک لە دوای یەک ڕێ دەکەنو تفەنگیان لە گۆلمێیە، لە خەیاڵی خۆیان وای دەبینن ئەو جووتیارانەی زەوییەکانیان داگیرکراوە، هەموویان چاویان لە دەستو تفەنگی ئەوانە! دایانەوە دەو ڕووباری. بۆقەکان هێندە بەڕقەوە لەنێو زەلو حەســـیرو قامیشـــەڵانی دەو

ڕووباری دەیانقیژاند، پەردەی گوێی شـــەویان دەدڕی! بەهۆی چڕی نووسەنەکـو دڕکەزەردەو جەگەنەوە، وەک دیوارێکی کەلێنبڕ[1] ملی ناوەتە یەک، دەنگی قرپەی شکانی قەلۆغانەکان بۆ چەند چرکەیەک بۆقەکانی بێدەنگ کرد . هیدۆ گوتـــی: ڕێ دەرناکەین، وا چاکە لـــە دووری دەو ڕووباری بڕۆین، لاقو لەتەرمان هەموو دڕکـــەزەردە خواردی! کەمێک لە دەو ڕووبـــاری دوورکەوتنەوە بۆ بەری لای زووری. لـــە دەراوی ژنان، چەند بەردەبازێکی لێیە، بەســـەر بەردەبازەکاندا بازیانـــداو لە ڕووبـــاری پەڕینەوە. کزەبایەکی فێنک لەســـەر ئـــاوی ڕووباریڕا هەڵیکرد، بەنێو کەلێنی قامیشەڵانەکاندا خۆی لە بناگوێو ڕوومەتو لاملی بەئارەقەیان، دەســـوی، تەوێڵیان دەلێســـێتەوە. ئەو ئارەقەیە باخەڵو پشـــتو بەرپشـــتێی تەڕکردوون بە بای شەماڵی فێنک بوونەوە. جارجار تیترواسکێک، سۆفەقیتەیەک، بوغازێک، لە ترسی ئەوەی پێیان لێبنێن، چەند باڵێک دەفڕیو خۆی بە عەرزیدا دەداتەوە. ئەو فڕەیە، پیاو ڕادەچەڵەکێنێ. ســـەرەوەی دەراوی ژنان واقەواقی چەقەڵو تورگ ئەو نێوەی پڕکردووە، هەریەکەیان بانگی ئەویدی دەکات، وەک ئەوەی یەکتریان گوم کردبێت. هەرسێکیان بەدوای یەکتردا ڕێیان دەکرد. قالۆرە گوڵەبەڕۆژەو قەلۆغانو شـــەکرۆکەو کەریەشەکان بەجێدەهێڵن. لە ناکاو کاکەڕەش میلی تفەنگی ڕاکێشـــا، بـــە دەنگێکی گڕی وا گوتی: کێی زەلام بجوولێی کوژراوی، هیدۆو سەلیم لوولەی تفەنگەکانیان بەرەو ئەو شوێنە ڕاداشـــت کە کاکەڕەش کردبوویە ئامانج. بەڵام هیچ هەســـتو خوســـتو وەڵام نەبوو، ئامانجەکە ڕەق ڕاوەســـتاوە، تەنها بە تەوژمی ئەو نەرمەبایەی دەهات،

---

١. کەلێنبڕ: زۆر چڕ و بێ کەلێن، کە ڕۆیشتن پێیدا ئەستەم بێت.

لفکەی جەمەدانیەکەی دەجوولا. کاکەڕەش و هیدۆ دەست لە سەر پەلاپیتکەی تفەنگ، بەرەو ڕووی ڕۆیشتن، گەیشتنە لای، توومەز داهۆڵی بێستانێ بوو لە شێوەی مرۆڤ دروستکرابوو، کۆنەجەمەدانییەکیشیان لەسەری نابوو. هیدۆ هەر لەوێ لە پێکەنینان کەوتبووە سەرپشتێ، دەستی بە زگییەوە گرتبوو هێندەی بە کاکەڕەشی پێبکەنێ و دەیگوت: ئەگەر مزت بەسەردا بتوێننەوە ئەو داهۆڵە دەردەچێ، هێندەی لێ ترساوی، چاک بوو تەقەت لێنەکرد، دەنا ڕیسەکەمان لێدەبۆوە خوری!

لە شوێنی مەبەست نزیک بوونەتەوە، لە پەنای قۆمەتە قەسەڵێک دانیشتن بۆئەوەی مانگ لە ئاسووگەی ئاوابێ، کاکەڕەش گوتی: کوڕینە دەبێت هەوڵبدەین بەرلەوەی بکەوینە بەر عەلەتریکی دەڕاسەو پیکابەکان، بگەینە لای خێوەتەکەو کارەکەمان ئەنجام بدەین، سەرسەدەی سوورانەوەی دەڕاسەکە گەلێک دوورە، بە دڵنیایی ئیشەکەمان بەر لە سوورانەوەی دەڕاسەکە تەواودەکەین. بۆئەوەی نەناسرێنەوە جەمەدانییەکانیان دەمامک داوە، تەنها چاویان دیارە، کەس نایانناسێتەوە. مانگ خۆی لە پەناداو بەرەو ئاوابوون ڕاخوشی و وڵاتی بە تاریکی سپارد. بڕیاریاندا ئەگەر دەست نەکاتەوەو مەترسییان لەسەر دروست نەکات نەیکوژن بەڵام بەقوربانی مردنێی بکەن! کاتێک دەڕاسە سووڕایەوەو پشتی کەوتە ئەوان، بەوپەڕی بێدەنگی و هەستیاری هەنگاو داوێن، بە ئەسپایی و بە کووڕەکوور وەک بچنە پارێزی مامزان! ئەو کاکەڕەشەی بە هەموو تەمەنی بەو قەڵافەتو هەیبەتەوە خۆی لەبەر قرمژنو گیزەی گوللان نەچەماندۆتەوە، ئێستا خەریکە وەک پڵینگ بە چوار چەنگۆڵە بەرەو خێوەتەکە دەڕوات، لە خێوەتەکە وەژوورکەوتن کوڕە گەورەی

ئەحمەدئاغای لەسەر تەختێک خەوتووە، ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نییە. نەوەک مێشوولە پێوەی بدەن و پێستە ناسکەکەی ئازار بدەن، پەردەکوللەیەکی تەنکیان بۆ هەڵداوە! سەلیم بە لوولەی تفەنگەکەی پەردەکوللەکەی لەسەر هەڵدایەوە. لەو ساتە هەستیارەدا دەستی بە لوولەی تفەنگەکەی سەلیمی کەوت، هەر بەجارەکی زێڕکی[1] ڕژاو زەندەقی چوو! ئەو بە منداڵیش، هیچ منداڵێک زاتی ئەوەی نەکردووە بەو جۆرە لێی نزیک بێتەوە، یان شەقێکی لێبدات، کەچی ئێستا بە لوولەی تفەنگ خەبەری دەکەنەوەو بە ئاگای دێنن! ئەو لوولە تفەنگانەی هیدۆ لە قەبرغەو خالیگەی دەکوتا، لەسەر تەختەکەی بەربۆوە. نە تفەنگی لە بن کەلەکەی ماوەو نە دەمانچەکەی لە بن بالیفی ماوە، هەر زوو هیدۆ ئەوانەی هەموو لە خۆی بەستاو دووربینەکەی لە ملی کرد. هەر لوولەتفەنگێکی هیدۆ لە خالیگەو بنهەنگڵی دەکوتا، کووڕی دەکردەوە! کووپەئاوەکەی بەسەردا ڕژاند. ئاغا پێی وابوو دنیا ئاوەژوو بۆتەوە، لە خەویش بیری لێنەکردۆتەوە، سەلیم پێیگوت: دەزانی ئەو لوولە تفەنگانەت بۆ بە قەبرغەی دەکەوی؟ گوتی: بەس مەمکوژن، چی دەڵێن وا دەکەم! سەلیم گوتی: ئەگەر ئەوەی پێتی دەڵێین، بابت موو بە موو جێبەجێی نەکات، دەتکوژین! دەتوانین دەڕاسەو گەنمەکەش ئاگر تێبەربدەین، بۆیە ناتکوژین بۆئەوەی پەیامەکەمان بگەیەنیتە باوکە زاڵمەکەت، ئەو زەوییانە بدەنەوە خاوەنەکانیان، سوخرەو بێگارو چەوسانەوە کۆتایی پێ بێنن! هەر دەیگوت: ئێوە ئەمن بە کێ تێدەگەن؟! باوەڕی نەدەکرد کوڕی گەورەی ئەحمەدئاغای بکەوێتە بەر

---

١. زێڕک: زراو، زەندەق، ئەترەش، هەترەش.

قۆنداغەتفەنگی کرمانجان! سەلیم، وەک ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو، چونکە ئەو لە گوندێکی دوورترڕا هاتبوو، ئەو دەبوایە قسەبکات، بۆئەوەی کاکەڕەشو هیدۆ نەناسرێنەوە، گوتی: چاکت دەناسین، کوڕی گەورەی ئەحمەدئاغای، ئەو ئەحمەدئاغایەی بە عـــەرزی چوار گوندان چاوی تێرنابێتو تەماعی پڕنابێت، عەرزی جووتیارە هەژارەکانیش دەداتە بن لیچ، ئەو زەوییە بە پیتو بەرەکەتانە بۆ خاوەنەکانیان بگێڕنەوەو بەشەگەنمی خۆیان بدەنێ. ئەگەر بابت ئەو داوایانە جێبەجێ نەکات، دڵنیابە جاری دووەم دەتانکوژین! بەحاڵ نووزەی دەهات. هیدۆ هەموو ئازای بەدەنی شـــکاندبوو، هەر دەیگوت: بەڵێ، بەس مەمکوژن، چی دەڵێن وا دەکەم! هیدۆ بە جۆرێک لێی دەدا، جارێکی دیکە نانی کەرت نەکات، کۆری ســـەردەرێو بندەرێیان پێ دەرکرد! ئەو زاڵمەی لەسەر ئاوخواردنەوەیەک ســـووکایەتی بە هیدۆی کرد، ئێستا لەبەردەســـتی هیدۆی بۆتە پۆڕی خوراو! ســـوێندو تەڵاقیان پێخوارد کە ئەو زەوییانە بـــۆ خانەوەکانیان بگێڕنەوەو چی دیکە زوڵم لە کرمانجەکان نەکەنو لە گەنمی ئەوســـاڵ بەشی باراشو بنەتۆیان بدەنەوە! وەک نیوەمردوو بەجێیانهێشتو تفەنگو دەمانچەو دووربینیان بردو ڕۆیشتن، لەنێو خوێنو قوڕاوی ئاوی کووپەکە جێیانهێشت.

ئەوشـــەوە، چوونەوە ماڵی حاجی سمایلی لەســـەر کەپرو شینایی. شەوی هێنـــدە نەماوە، لـــە بانگـــی بەیانی نزیـــک بوونەتەوە. تفەنـــگو دەمانچەو دووربینەکەیان لە دەرێ لە بن قەســـەڵو کای شاردەوە. وەک سێ پڵینگی دوای ڕاو لەدوای ئەوەی داو و دەلینگی شـــەروارەکانیان لە نووســـەکەو دڕک پاک کردەوە، لێی خەوتن.

بەیانی کاتێک ئەو هەواڵە گەیشـــتە ئەحمەدئاغای، باوەڕی نەدەکرد کەس

هەبێــت بوێریی ئــەوەی تێدابێت ملی خــۆی لە خەنجــەری ئەحمەدئاغای بســووی! وەک هەور دەیگرماند. هەرکە چاوی بە کوڕەکەی کەوتو هەمووی بۆ گێڕایەوەو بەو سەروگوێلاک شــکاوییە کوڕەگەورەی خۆی بینی، پریشکی ئاگری لێدەبۆوە!

لەســەرئەوەی ئەحمەدئاغا شونهەڵگرو باشــچاوشو پۆلیسی بۆ شوێنپێ هەڵگرتنی ئەو ســێ کەســە هێنابــوو، لەگەڵ کوڕەکەی لێیان بوو بە کێشــە هەرچی کوڕەکەی بوو دەیگوت: پێویســت ناکات بە دوایــان بکەون، چونکە ســوێندیان خواردووە، ئەگــەر داخوازییەکانیــان بەجێ نەگەیەنیــن ئەوجارە دەمکوژن. هەر بەحاڵ نووزەی لێوە دەهات، هەموو گیانی شکاوەو خوێنی پێوە ڕەق بۆتــەوە. ئەحمەدئاغا لە کوڕەکەی تووڕەبوو: ئەتۆ حەرامزادەی، لە من بە پاشــنەکەوتووی، خوا دەزانێو دایکت دەزانێ لە توخمی کێ بە پاشکەوتووی، دەنا چۆن بەو هەموو قەڵافەتەوە تفەنگت لەبن کەلەکەی دەردێننو دەمانچەت لە بن بالیفی دەردێننو نەتوانی دەســت بکەیتــەوە! خۆ لەوان ئاو ناڕواو لە تۆ خوێن! هێندە ترسنۆک بی نەوێری بە گرتنیشیان بدەی!

شــوێنهەڵگر، لەگەڵ گــەردی بەیانی لە خێوەتێڕا شــوێن پێــی هەڵگرتن. باشــچاوەشو پۆلیس بــە دوایەوەن، هەر لەنێــو پەرێزێ گوتــی: یەکیان وەزنی قوورسەو کڵاشــێکی بن ئیســفەنجی نەخش وردی لە پێیە، لە دووەکەی دیکە زیاتر قەسەڵەکەی پانکردۆتەوە. دوانەکەی دیکە، کڵاشی بن پەڕگدراویان لە پێیە، ژێرەکەی تایەی ئۆتۆمبیلیەو شوێن پێیان قەسەڵەکەی باش پان نەکردۆتەوە.

شوێنەکەی لە پەرێزێ دەرکرد، لە دەو رووباری شوێنەکەی هەڵگێڕاوە، ڕێک چاویان دابووە ماڵی حاجی ســمایلی بابی کاکەڕەشــی. یەک لە کرمانجە بە

ئەزمووننو دنیادیدەکان کە پیاوێکی قســەزانو دۆستی ماڵی حاجی سمایلیش بــوو، چووە بن هەنگڵی شــوێنهەڵگرەکەو جغارەکی دایێو گوتی: دانیشــە با جغارەکانمان بکێشین، بەچرپەوە پێیگوت: ئەوە ئەتۆ بە تەمای چی؟! دەزانی ئەو شــوێنەی بۆ ماڵی حاجی سمایلی بەری، کاکەڕەش قەت لێت خۆش نابێو ئەو تۆڵەیەت لێدەکاتەوە! بۆچی لە ختوخۆڕایی خۆت دەکەی بە دوژمندارو بە دەســتی خۆت لەسەر ئاغای زاڵم دوژمن بۆ خۆت دادەتاشی؟ ئەوجا کەسیش نا کاکەڕەش! بۆ خۆت باش دەزانی بەس تاریکەشــەوێکی پێویســتە بۆئەوەی پەشیمانت بکاتەوە لەو کارەی دەرهەقی وی دەیکەی!

شوێنهەڵگر کاتێک ئەوەی بیست، شوێنپێیەکانی بۆ لای رووبارێو شوێنی بەردەلانی وا هەڵەتەکرد کە شوێنهەڵگرتنی تێدا ئەستەمەو، لە یەخەی ماڵی حاجی ســمایلی کردەوەو گوتی: ئەو پیاوانە زۆر شــارەزای شوێنهەڵگرتنن، بۆ شــوێنەونکێ چوونەتە نێو رووباری. لەو شــوێنانەی تەنکاوە شوێنپێیان هەر نەبێ بەردێکی جوولاندووە، بەڵام ئەو شوێنانەی قوولن، شوێنی لــێ هەڵناگیری، بۆیە لێــرە زیاتر ناتوانم شــوێنەکە بۆ هیچ لایەک دەربکــەم! ئەحمەدئاغا، هەرچەندی گەفوگوڕی لێکرد بێ ســوود بوو: ئاغا بشمکوژی لە خۆڕا ناتوانم شوێنەکە دەربکەم!

بەو شــێوەیە، ئاشکرا نەبوو کە ئەو ســێ پیاوە کێن ئەو کارەیان بەرامبەر بە کوڕی گەورەی بە دەسەڵاتترین ئاغاواتی ناوچەکە کردووە.

کاکەڕەش دەیزانی ژنو هەرسێ منداڵەکەی ڕۆستەمی ڕەحمەتی، گوزەرانیان زۆر خەراپو ناگزوورن، پێویستییان بە یارمەتی هەیەو ئەوەش ئەرکی ئەوانە چاوەدێرییان بکەن، بۆیە، قســەی لەگەڵ سەلیمو هیدۆی کردبوو، کە دەمانچە

چواردەخۆرەکەی کوڕی ئەحمەدئاغای، لەنێو عارەبان بفرۆشـــن‌و پارەکەی بدەنە ژنەکەی ڕۆســـتەمی. کاکەڕەش ئەو کارەی زۆر بـــە نهێنی ئەنجامدا. لە دوای وەرگرتنـــی پـــارەی دەمانچەکە، لەگـــەڵ داکی چوو بۆ ماڵی ڕۆستەمەشـــێتی ڕەحمەتی، بۆ پاراستنی نهێنییەکە بە ژنەکەی گوت: براژن، کاتی خۆی ڕۆستەم بەرلەوەی لە بەغدایە ئەو بەڵا و ئەوحاڵەی بەســـەربێت، دەمانچەیەکی لەلای من دانابـــوو، بەڵام کە وەزعـــی تێکچوو، نەمویســـت دەمانچەکەی بدەمەوە دەســـتی خۆی، نەبـــادا کارێکی خراپی لە دەســـت بقەومێ، هەتـــا ئەوڕۆژانە پاراستبووم، ئێستاش دەزانم ئێوە زۆر پێویستتان بە پارەیە، بۆیە بەئەمانەتەوە فرۆشـــتوومەو ئەوەش پارەکەیەتی. پارەکەی لەپێش ژنەکەی ڕۆســـتەمی دانا. ژنی تایین بەو هەموو پارەیە هەر شاگەشـــکە بوو! لەو ڕۆژە سەختو تەنگانەو نەبوونییە. هەرچەندە باوەڕی بەو قســـەیە نەبوو، کە کاکەڕەش کردی، وەلـــێ زۆری لـــێ نەکۆڵییـــەوەو تێگەیشـــت کاکەڕەش ئـــاوای پێخۆشـــەو دەیزانی نهێنییەکی دەشـــارێتەوە، گوتی: خوا لە برایەتی‌و سەرڕاســـتی‌و دەستپاکیت کەم نەکا، ئەتۆ مامێکی دڵســـۆزی بۆ منداڵەکانم‌و برایەکی شیرپاکی بۆ من، بە خوای برام لەوەتـــای ئەحمەدئاغا زەوییەکەی داگیرکردووین، بە کولەمەرگی دەژین! کاکەڕەش گوتی: بەڕاســـت، باش بوو بیرم هاتەوە، ئەوســـاڵ دەبێ کچە گەورەکـــەت بنێریە بەرخوێندنێ. ئەویش گوتی: چۆن بینێرم؟ ئەوە نییە ئاغاو مەلاو شێخ محەمەد هەموو جارێ لە نوێژی هەینی دەڵێن مەکتەب عیلمی شـــەیتانییەو منداڵەکانتان مەنێرن نەخاســـمە کچیش! بە خوای دەمکەن بە ســـۆدرەی دنیایێ هێندەی خوتبەم لەسەر بخوێننەوە، بەڵام ئەگەر لە گوندیشم دەربکەن قسەت ناشـــکێنم، چونکە دڵنیام ئەتۆ قازانجی خۆم‌و منداڵەکانمت

دەوێ، هەر سبەینێ جۆرکەی پەڕۆی بە قوڕپی بۆ دەدوورمو قەڵەمو دەفتەری بۆ دەکڕمو دەستی دەگرم دەچم لە مەکتەبێ ناونووسی دەکەم. کاکەڕەش گوتی: براژن ئەمن سێ مانگان لە حەپسخانەی خوێندم، خوا خێری ئەو دوو سێ ئەفەندییەی بنووسێ، ڕۆژێ تا ئێوارێ بە نۆرە دەرسیان پێ دەگوتم، دەمگوت بریا سێ مانگی دیکەش لە بەندیخانەی بام بۆئەوەی بە چاکی فێری خوێندنو نووسین ببوومایە.

هەواڵی ئەو تەمبێکردنو چەککردنەی کوڕەگەورەی ئەحمەدئاغای خاوەنی چوار گوندان، وەک بۆمبێک لە ناوچەکە تەقییەوە، بە جۆرێک، وەک ئاگرو پووشی بەرڕەشەبای، هەموو گوندو مزگەوتو سەراو و دەراوێکی تەنیەوە. ئەو دارکاریو تەمبێکردنو چەککردنە، چاوشکانو دۆشدامانی ئاغاو دەربەگەکانی لێکەوتەوە، تینو گوڕێک بوو بۆ کرمانجەکان، پێیانەوە دیاربوو، گوڕاحیان[1] خۆشترە کە هەست دەکەن پشتیوانیان بۆ پەیدابوو، بۆئەوەی کەسی دیکە زاتی ئەوە نەکات زوڵمیان لێ بکات.

هەواڵەکە، هەرچەندە ڕووداوێکی کەم نەبوو، بەڵام هێندە ئەو زار ئەو زاری کردبوو، بە جۆرێکیش ترشو خوێ دەکرا و لە قەبارەی خۆی گەورەتر دەکرا، خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆی، نەیدەناسییەوە! هەبوو دەیگوت ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە، ئێستاش لەنێو قامیشەڵانو حەسیرو زەلی دەو ڕووباری خۆیان شاردۆتەوە، بۆئەوەی شەوان لە ئاغایان بەخۆ بکەون، سوێندیان خواردووە هەرشەوەی ئاغایەکی تەمبێ بکەن!

---

١. گوڕاح: دڵخۆشی، کەیف.

کەســـی وا هەبوو خۆی وا نیشـــان دەدا ئەو بووە دەستکێشیو چاوساغی بۆ کردوونو، بۆ ئەنجامدانی ئەو تەمێکـــردنو چەککردنەی، یارمەتیی داون. دەتوانێ زۆر کاری دیکەشـــیان پێ بکات، باوەڕپێکراوی ئەشـــقیاکانەو ڕۆژانە پەیوەندیی پێوەدەکەن!

ئەوەی بەرامبـــەر ئەو ڕووداو و هەواڵە بێدەنـــگو گوێگر بوو، کاکەڕەشو ســـەلیمو هیدۆ بوون. ڕۆژانە خەریکی کەســـابەتی خۆیان بوون، گرنگییان بەو هەواڵە نەدەدا. ئەو خزمانەی کاکەڕەشـــی کە لە حەپسخانە کاتی سێ مانگ گرتنەکە ســـەردانیان کردبوو، ئامۆژگارییەکانی ئەوکاتیـــان بیرچووبۆوە کە بە کاکەڕەشـــیان دەگوت: دەستبەرداری دژایەتیی چەوســـانەوەو سوخرەو بێگاری ئاغایـــەکان بێت. پێیان دەگوت: ئەتۆ زیاد لـــە ئۆمەتی محەمەدی بۆ خۆت کردۆتە قووچەک بۆئەوەی بەردت باوێنێ؟ بۆ ســـایلی ئەو خەڵکەی دەست بە کڵاوی خۆتەوە ناگری با نەیبا! ئاخر ئەو کارەی ئەتو دەیکەی بە تەنها لە ســـەر شـــانی تۆ نەبڕاوەتەوە! پێمان ناڵێی ئەتۆ بەتەنـــێ چت پێدەکرێ؟ لۆ بە ئاقڵی وەکی ئەو خەڵکەی لەسەر کوتکو سنگی خۆت دانانیشیو داناسەکنی!

لـــە دوای هەواڵـــی ئـــەو تەمبێکـــردنو چەککردنە، هەر ئـــەو خزمانەی کاکەڕەشـــی چوونەتە لایو دەڵێن: مست لە درێشەی دەگەڕێتەوە، ئەگەر فیل هەیە کەرکەدەنیش هەیە! بەجۆرێک گەرم داهاتوون، هەر دەکوژنو نایشارنەوەو دەڵێن: ئەدی بابم ئاغاکانیش با بزانن دارکاریکردن چەند ناخۆشـــە! با جارێک بەردیان بکەوێتە بـــن ددانی! هەر ئەو زاڵمانە بوون ڕۆســـتەمی ڕەحمەتییان کوشـــتو منداڵەکانیان هەتیو کرد. وا دەزانن خەڵک هەتا سەر هەر بێدەنگ دەبێو ئاوایان بۆ دەچێتە سەر، نازانن هەموو شتێک لە باریکی دەپسێ، تەنها

زوڵم لە ئەستووری دەپسێ! ئەوەی بەخۆی بڵێ پیاو ئەو زوڵمەی قەبووڵ ناکات! ئــەو خزمانەیان بە جۆرێک جەزم بووبوونو گەرم داهاتبوون، بە کەس ســاکین و سارد نەدەبوونەوە! هەر ئەوانەی لە پێشــدا سەرزەنشتی کاکەڕەشیان دەکرد، ئێستا دەڵێن: ئێمە نابێت دەســت بە خۆماندا شۆڕبکەینەوەو ئاوی دانوان بە خۆماندا بکەین[1]، چونکە، ئێمە هەتاوەکو بێدەنگ بین ئەوان زیاتر ســواری پشــتمان دەبن! لەو کاتەیدا هیدۆ پەیدابوو کە گوێی لەو قسانەی خزمەکانی کاکەڕەشــی بوو، ڕووی تێکردن: بە گوێرەی ئەو قسانەتان سوێندم پێ دەخورێ ئەنگۆ دەســتتان لەو تەمبێکــردنو چەککردنەیدا هەیــە! ئەوانیش لە بنەوە ســمێرەخرتەیان دەهاتێو ڕەتیان نەدەکردەوە کە بێئاگانو دەستیان تێیدا نەبووە! هیدۆ بەگاڵتەوە تۆمەتی ئەو دەستوەشاندنەی بە ملی ئەوان دادەهێنا!



١. ئاوی دانوان بەخۆماندا بکەین: ڕادەستبوون، بێئومێدبوون لە شتێک یان لە کارێک.

# ١٤

بـــەو چرقەی گەرمایێ، ئەو دەشـــتە پـــانو بەرینەی دزەییاتـــی، هەتا چاو هەتەردەکا ڕەملان دەکاتو وەک تینی سەر تەندوورێکی داکەوتوو هەڵدەچێ، ســـەرابی دەشتێکی کاکی بە کاکی، نە سەری دیارەو نەبن، دووریو مەودای بە کەس مەزەندە ناکرێ! ســـەگەکان خۆیان لە ژێر چکەچکی ئاوی ژێر کوندەڵانی خزاندووە، لەســـەر عەرزە تەڕەکە خۆیـــان لێک بڵاوکردۆتەوە، بە شـــێوەیەک وەرکەوتوون هەوڵی ئەوە دەدەن زۆرترین بەشی جەستەیان بکەوێتە سەر قوڕی بن کوندەڵانێ، زمانیان بستێک دەرەهێناوەو هێندە بەپەلەپەلو بە شێلکە هەناسە دەدەن، کەس ناتوانێ هەناسەدانیان بژمێرێ، وەک لەوە بترسێن هەوا دواپشووی بێتو بە قەدەر بای نێو فوودانەیەک هەوای لەلا نەمابێ، بۆیە خۆش خۆش لە عەمباری ســـییەکانیان هەناسە پاشەکەوت دەکەنو تێی دەپەستێون. کێشکە پاســـارییەکان بە ئامانو زەمان لای کوندەڵانێ بەرنادەن، کەڕەسیسەیان کردییە، خۆیان بەو لکە قەســـەڵانەی ژێر کوندەکان هەڵواســـیوە، ئەو لکە قەسەڵانەی تک تاک ئاویان لــێ دەتکێتەوە، دەندووکیان لە یەک ترازاندووەو دڵۆپەئاوەکان دەخۆنەوە، هەرکـــە دڵۆپەئاوێکیان خواردەوە، دڵۆپێکـــی دیکە ئامادە دەبێت، تاقە یەک تنۆکی وەپاش نادەن بتکێتە ســـەر زەویو لێوی وشکی تەڕبکاتەوە.

ڕێنجبەر کورتانیان لە هێسترەکان کردۆتەوە، لەسەر خۆڵەپۆتی گوفەکێ خۆیان دەگەوزێنـــن، هەرجارەی بە لاتەنیشـــتێکدا خۆیان وەردەگێـــڕنو تەکان دەدەنە خۆیان. ئەو پەلکەشـــووتییەی شـــەوی ڕابردوو کە هێشـــتا لچی مانگاکانی بەسەردا ڕانەگەییوە حەپەلووشی بکەن، ژەنگەسوورەیان تێئاڵاوەو کەس ناتوانێ لێیان نزیک بێتەوە. جاغێکی جاوی پڕ لە دۆ، بە سێپێکی مەشکەهەژاندنێوە هەڵواسراوە، بۆئەوەی زەرداوەکەی بپاڵێویو باقیماندەی بکەن بە کەشک.

سۆفی عوسمان پیاوێکی کەڵەگەتی ڕەقەڵانەی مسریگۆشتە[1]، ڕدێنێکی تەوشـــولەیی[2] بە چەناگەیەوەیە. بە گوێیان گرانە، بۆیە لە قسەکردن دەنگی بەرز دەکاتەوەو لەگەڵ دەربڕینی هەرڕســـتەیەک دەڵێ: تێگەیشتی؟ سمێڵی هەڵپاچیوەو ســـیماو ئاسەواری سمێڵی پێوە نەهێشتووە. دوو چاوی ڕەشی لێڵ لە بنەبانی قەپێلکی چاوی، دەڵێی دەنکەترێیە ژەنگەسوورە خواردوویەتی. لە قسەکردن ددانەکانی بە چیرەوە دەبات، وەک بەردی نێو نیسکێنەی کەوتبێتە بەرددانی. لە قسەکردن سەری هەڵدەتەکێنێو ڕیشە تەوشوولەییەکەی لەسەر وشـــەکان دادەنێو حینجەیان دەکاتەوە. لە گوندیو لەنێو خزمان بەوە ناســـراوە ڕقـــی لە ددانی خۆیەتی کـــە نانی پێ دەخوات. پارە، هـــەر هێندەی زەحمەتە هەتاوەکو ئاودیوی ژووری گیرفانی ســـۆفی عوســـمانی دەبـــێ، ئیدی بۆ هەتا هەتایە چاوی بە ڕووناکایی ناکەوێتەوە! ئەو ڕۆژەی ددانی بە ژان کەوت چوو بۆ شاری، لە دوای ئەوەی ئەو مەنجەڵەماستانەی لەگەڵ خۆی بردبوونی، هەمووی

---

١. مسریگۆشت: داڵەگۆشت، ڕەقەڵە و لەڕو لاواز.

٢. ڕدێنی تەوشولەیی: ڕیشی کۆرپەنەکراو، ڕیشێک کە دەستی پێدا نەهێنرابێ و کۆتاییەکەی وەک دەمە تەبشوو باریک بۆتەوە.

فرۆشـــت، چوو بۆ لای ئامۆزاکەی کە ماڵی لە شاری بوو، کرێکاری گەچکاری بوو، ئەو ڕۆژە لە نزیک ماڵی خۆیان خانووی بۆ مامۆستایەک سپیکاری دەکرد. سۆفی عوسمان چووە لای و لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەوەی ڕێنوێنی و چاوساغی بۆ بکات بۆ لای دکتۆری ددان. دکتۆر لەو کاتەی کە دەیویست ددانی بۆ بکێشێ پرسی: بەنجت بۆ بەکاربهێنم؟ سۆفی عوسمان لە ترسی ئەوەی نەبادا بە هۆی بەنجەکەوە پـــارەی زیاتری لێوەربگرێ، بە دکتۆری گوت: نامەوێ دکتۆر، تەنها بە کەربەتێنەکەی[١] بۆم بکێشـــە. دیارە ئازاری ددانەکانی لەلا باشتر بوو لە ئازاردانی گیرفانی!

دکتۆر ددانەکانی کە دوو دانە بوون، بۆی کێشا. چوونە مزگەوتێ پشوویێکی باشـــیاندا. ئامۆزاکەی سۆفی عوســـمانی گوتی: با بچینە لۆقتنەخانەی نانی نیوەڕۆی بخۆین. سۆفی عوســـمان وای مەزەندە کردبوو، چونکە دەوڵەمەندەو لە ئامۆزاکەشی گەورەترەو ئامۆزاکەی ئیشوکاری تایبەتی خۆی کە کرێکارییە، بە خاتری ئەوەی لەگەڵ ســـۆفی عوســـمانی ئامۆزای بچێتە لای دکتۆری ددان دەســـتی لە کار هەڵگرتووەو لە شاری خانوویشی بەکرێیە، سۆفی عوسمانیش خاوەنی سێسەد ســـەر مەڕو جووتەهێسترو شەش کوڕی ئیشکەرو سێ کچی مارداریکەرە، بەو هەموو پێوەرو لێکدانەوەیە بێ، دەبێ سۆفی عوسمان پارەی لۆقنتەو نانخواردن بدات، بۆیە بە ئامۆزاکەی گوت: ئەتۆ بڕۆ نانی بخۆ ئەمن بە هۆی ئەوەی ددانم کێشاوە ناتوانم نانی بخۆم، دەچمەوە مزگەوتێ نوێژان دەکەم، بۆ قیامەتێ هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە! ئامۆزاکەی، نان و کەبابێکی باشـــی

---

١. کەربەتێن: گازی ددان هەڵکێشان.

خواردو مشنێکیشــی بەســەرداکرد. کاتێک گەڕایەوە لای سۆفی عوسمانی، دیتی لەبەر ســێبەری مزگەوتێ پشــتی بە دیواریدا داوەو سەموونێکی ڕەقی داوەتە بەرقەمپــاران وەک ئەوەی حەوت ڕۆژ بێت زەوادی نەچووبێتە هەناوی! شووشە ساردییەکی کۆلای لە دەست، جارجار کە سەموونی لە قورگی دەمێنێ قومێکی بەســەردادەکات، ئامۆزاکەی پێیگوت: ئەتۆ بۆ لەگەڵ من نەهاتی بــۆ لۆقنتەخانەی؟ خۆ خواردنی گەرمو نەرمیان هەیە، ئێســتا دەڵێی گورگت کوشتییە ئەو ســەموونە ڕەقەی دەخۆی! ئامۆزاکەی چاک لێی حاڵی بووبوو بــۆ لەگەڵی نەچوو بۆ لۆقنتەخانەی، گوتی: ســۆفی عوســمان ئەو خواردنە باشــەت لە کیسی خۆتدا خۆ ئەمن نەمدەهێشــت ئەتۆ پارەی نانەکەی بدەی، ئەمن بە نیازبووم دەعوەتت بکەمو پارەکە بدەم. ســۆفی عوســمان لە کاتێک ئــەو دەعوەتەی لە کیس چووبوو، دەیویســت بۆ جاری ئاییندە کاتێک تێری پڕ لە مەنجەڵەماســتی هێنا بۆ شاری بۆ فرۆشــتن، ئەو کاتی ئەو دەعوەتەی بە ئامۆزا کرێکارەکەی بکاتو ئەو قەرزە بەســەر بگرێتەوەو لە کیســی نەچێت، بۆیە گوتی: وەڵڵا باشــە نەمزانی پێت خۆشــە دەعوەتم بکــەی، ئەگەرنا دڵم نەدەشکاندی، خۆ نەچووە بچێ، ئەوجارە هاتمە شاری هەتاوەکو لای تۆ گیرنابم، ئەوکاتی چ لۆقنتەکت پێ باش بوو دەچین بۆ ئەوێ، ئاخر بەلاش نەیانگوتووە: «قــەرز کۆن دەبێ بەڵام نافەوتێ!» با ئــەو دەعوەتە قەرز بێت لە لات! ددانی بەچیرەوە دەبردو چەناگەو ڕیشە تەوشولەییەکەی هەڵدەتەکاندو بەرزدەکردەوە، دەمارەکانی ملی ڕەپ ڕاوەســتابوون، دەیویســت ئەوەندە قسەی ئامۆزاکەی، بکات بە ماڵ لەســەری، بەجۆرێک نەتوانێ لێی پاشگەزببێتەوە. هەموویان دەیانناســی چیرەی چەند درێژە لــە بەرامبەر وەرگرتنــەوەی قەرزەکانی خۆی.

ئامۆزاکەی گوتی: کێشە نییە، هەرکات هاتیە شاریو برسی بووی، ئەمن نانت بـۆ دەکڕمو تێرت دەکەم، قیروسـیا خۆ ئەمن هەر دەوڵەمەنـد نابم، کەواتە با ئەتـۆ فەقیر نەبی. لە کۆتایی ئامۆزاکەی گوتی: بەڕاسـت، ئەگەر هاتی دوو مەنجەڵەماستی سەر بەسەرتویومان[1] بۆ بێنە پارەکەت دەدەمێ.

بابەشـێخیش برادەری سـۆفی عوسـمانیە، چۆتە تەمەنـەوەو دوو ژنی هەیە. بەردەوام، ئەگەر کەسـێک بە گرانەتا دەکەوێت، بۆ بانگڕاهێشتن دەچنە لایماڵی ئەوان بـۆ ئەوەی بزانن ماخۆی چارچاو چ دەرمـان دەدا! تەنها ناوی بابەشـێخە، ئەگەرنا شـێخ نییە. بۆ ڕێزگرتن لە شێخی گەورە، بە ناوی شێخی گەورە کراوە، پێشـناوی بابیان پێ هەڵواسیوە. پیاوێکی پانە خرچەرەی پانوپۆڕو شەپڕێو، کورتەکەکی ڕەشی مرادخانی بە قۆپچەی لەبەردایە، گیرفانەکانی نیو ڕبە جۆی دەگرن، هێندە گەورەن! سـەعاتێکی زریزەداری، بە قۆپچەی گیرفانی هەڵواسیوەو سـەعاتەکەی لەسەر بەرکی ناوە. دەرپێیەکی شەعادەی سپی لە بەردایە، هەموو دەمێکی دۆخینی شۆڕ بۆتەوە. چونکە بە هۆی چوونەتەمەنەوە میزی ڕاناگرێو دەمارەکانی شـل بوون، بەردەوام پاشمیزی دێتەوە، دۆخینەکەی ناخاتەوە نێو دەرپێیە شـەعادە سـپییەکەی، بۆئەوەی کاتێک تکەمیزەکانی سەریان کرد، دەستەوڕسـت قورفانگەی دۆخینەکەی ڕاکێشێو وەک تفەنگی لەسەرپێ، نیوپێی بێنێتێ، بۆئەوەی تکەمیزەکان دەرپێیە شەعادە سپییەکەی زەرد نەکەن. لەسـەر کورتەکە مرادخانییەکەی، چەند گەز پشـتێنی بەستاوە، شاقەلی کورتەکی بەسەر دەرپێیەکەی شۆڕکردۆتەوە، سەری کیسەتووتنەکەی

١. بە سەرتو: بە سەرتوێ. ماستی بەسەرتوێ، توێژاڵی سەرەوەی مەنجەڵەماست.

لەبەرپشتێنی ناوە، پڕپڕە لە تووتنو بەسەر لاسمتی شۆڕبۆتەوە. دارجغارەیەکی دوبستی لەبەرپشتێنی ناوە. ڕاستی هەردوو کونەلووتی سمێڵە سپیەکەی زەرد زەرد کردووە. بابەشـێخ، دە ساڵ لە سۆفی عوسمانی بە تەمەنترە، کاتێک قسە دەکات وەک ئـەوە وایـە چەنگەبەردێکی لەنێو زاری بێت، قسـەکانی لەگەڵ خڕەخڕو شەقەشـەقی نێو زاری تێکەڵاودەبێت، بە ئاسـتەم لێی حاڵی دەبی! وەک لەجیاتی قسـەکردن بـەردان بکرۆژێ! نێو زاری، لە بازاڕی ئاسـنگەران دەچێت، بەهۆی چەکوچکاری کەس گوێی لە کەس نییە!

سـۆفی عوسمان لە ماڵێ داوای جەوی لە ژنەکەی کرد: ئافرەت ئەو جەوەم بـۆ بێنە با ئەو کاوڕەی ببڕمەوە، بەهۆی ئەوەی نەبڕاوەتەوە، زیاد ناکاتو قەڵەو نابێ، ئەو خورییەی لێبکەمەوە بەڵکو زیاد دەکات! ژنەکە لەو کاتەدا دەستی لەنێو تەشتی هەویریدا بوو، گوتی: سۆفی بەخوای دەستم بە هەویرە، دەبینی چ تەشتەهەویرێکم لەبەردەستدایە، لەو دەمو دەستەی نازانم جەوەکە لە کوێیە، هەرکات تەواو بووم بۆت دەبینمەوە، هەموو ڕۆژێ ئەمن دەبێت یەک گیشـە نانی بۆ ئەو خەڵکەی بکەم، بەرگە ناگرێ، زۆرخێزانین! سـۆفی عوسـمان بە بۆڵەبـۆڵ و بە مینگەمینـگو جنێودانەوە بەرەو مزگەوتـێ بەرێ کەوت. لە بەینی بابەشێخو مەلا شێخ محەمەدی مەلای ئاوەدانی، دەستنوێژ دەشوات، لە جیاتی بیسـمیللاو ئەو دوعایانـەی لە کاتی دەسـتنوێژ دەبێ بگوترێن، ڕیزەجنێوێک بـۆ ئەنداماني خێزانەکەی دەنێرێ، لەنێویشـیاندا بۆ ژنەکەی. هەسـتو زەینی بابەشێخو مەلا شـێخ محەمەدی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، لێی دەپرسـن: سۆفی ئەو بۆڵەبۆڵەت لەگەڵ کێیەو ئەو جنێوانە بۆ کێ دەنێری؟ چ قەوماوە؟ سۆفی عوسمان گوتی: داوای جەوم لە ژنەکەم کرد بۆئەوەی کاوڕێک

ببڕمەوە کە تا ئێستا نەبڕاوەتەوە، بە هۆی خورییەکەی زیاد ناکاو قەڵەو نابێ، ژنەکەم دەڵێ: ئێستا دەستم لەنێو هەویرەو لەو دەمو دەستەی نازانم جەوەکە لەکوێیە. بابەشێخ وەک هەمیشە لە خوای دەوێ سەر بکاتە سەر سۆفی عوسمانی، بۆیە بە هەلی دەزانێ: ئاخر پیاو بە ژنێکی هەمیشە هەر بێژن حیسابە! شەرع بەخۆڕایی چوار ژنی دانەناوە بۆ یەک پیاوی! بەڵام ئەتۆ ناوێری وەکو من دوو ژنان بێنی، دەنا کچت جاحێڵەو دەتوانی بۆ خۆت بە ژنی بدەی، ئەگەر غیرەتو پیاوەتیت هەبێتو بوێری! بەخوای دەنا ئەمن دوو ژنم هەیە، کەیفم لێیەو مرخم لێ خۆش کردییە ژنێکی دیکەش بێنمو بیانکەم بە سێ، کچیشم عازەبەو هی ماڵو مێردانەو تۆغیانێتی، ئەگەر دەوێری وەرە با ژن بە ژنی بە کچەکانمان بکەین، کچی تۆش هەڕەتی مێردییەتی، ئەتۆ کچی خۆت لە من مارەبکە، ئەمنیش کچی خۆم لە تۆ مارەدەکەم. ئێستا برای یەکترین لەنێو گوندی ئەو کاتی دەبینە خەزووری یەکتریش! سۆفی عوسمان هێشتا گڕی تووڕەبوونەکەی دانەمرکابۆوە، لەسەر ئەوەی جەویان بۆ نەدیوەتەوە، بەڕقەوە گوتی: وەی هەزار جاری، با کچەکانمان بدەین بە یەکتری! مەلا شێخ محەمەد دەڵێ: ئەو کارەتان هەتا بڵێی موسڵمانانەیە، ئێوە ئەهلی مزگەوتین، هەر ئەوە لە ئێوە چاوەڕوان دەکرێت، خۆ نەبووینە کوڕەکانی حاجی سمایلیو هەندێک لەو مولحیدو مونافیقانەی برادەرییان دەکەن کە ژنان فێری تەوقەکردن دەکەنو دەڵێن: یەک پیاو و یەک ژنیان گوتووە، غافڵو گومڕا لەوەی کە شەرعی ئیسلام چوار ژنی بۆ پیاوێک حەڵاڵ کردووە، گەر وایە هەردوولاتان ڕازین کچەکانتان بدەن بە یەکتریو پێشکەشی یەکتری بکەن، دەی کەواتە مبارەکە با بچینە ژووری مزگەوتێ، ئیشی خێرێ هەتا زووتر بکرێ پاداشتی دواڕۆژی

زیاترە، با هەردوو کچەکانتان لـــێ مارەبکەم! ئەوانیش دەڵێن زۆر باشـــە. هەر لە مزگەوتێ، دوو شـــاهید ئامادە دەبن، مەلا شێخ محەمەد کچەکانیان لـــێ مارەدەکات. ســـۆفی عوســـمان لە دوای نوێژێ دەگەڕێتەوە ماڵێ بە کچەکەی دەڵـــێ: چایەکی بەڕەنگم بۆ بێنە، ئەتۆشـــم بە مێرد دا، ئێســـتا ئەتۆ حەڵاڵی بابەشـــێخی، ئەویش کچی خۆی لە مـــن مارەکرد. لەو ماڵەی، نە ژنو نە کوڕو نە کچ هیچکەس نەیتوانی فزەی بکات، تەنانەت ڕووشـــی گرژ بکات، چونکە دەیانزانی تووڕەیی ســـۆفی عوســـمانی بابی ئەوەی دەکات بەنێویان بکەوێتو هەموویان کەلوکرۆم بکات!

ئەوشـــەوە، وەک زوڵم لێکراوێکی بێدەسەڵات، لە پەنای دایکی بە گریانو نزگرەوە ڕۆژی کردەوە. بەیانی لەسەر بەرماڵی نوێژکردنێ تووکو نزای دڵی خۆی دەکرد. ســـۆفی عوســـمان بینی کچەکەی لەســـەر بەرماڵی نوێژەو هەردووک دەستی بۆ ئاســـمانێ بەرز کردۆتەوە بۆئەوەی ئاســـمان بێتە فریای، بابەشێخو بابی بمرنو ئەو کارە ســـەرنەگرێ، بەڵام سۆفی عوسمان بەهەڵە حاڵی بوو، وای دەزانی کچەکەی شـــوکرانەبژێری ئەو شـــووکردنە دەکات، بۆیە چەناگەو ڕیشە تەوشوولەییەکەی بەرزکردەوەو ددانی بەچیرەوەبرد: ئافەریم کچی خۆم ئافەریم!

بەپەلە، هەر بابایەو چوونەوە ســـەر کاری ڕۆژانەی خۆیان. کاتێک هەواڵیان هێنا بۆ سۆفی عوسمانیو پێیان ڕاگەیاند ئەوشەو کاوڕێکتان لە کەندێ بەرئاوایی گورگ خواردوویەتیو پاشـــماوەی کەلاکی لەوێ کەوتووە، ســـۆفی عوســـمان بـــە هەرەداوان هەیپێی لێکـــرد، وەک هەواڵی مردنی بابیـــان پێ ڕاگەیاندبێو بیەوێ بەســـەری ڕابگات، چووە ســـەر لێواری کەندێو لە کەلاکەکەی ڕووانی، دڵنیابوو کاوڕەکەی خۆیەتی، گەڕایەوە بۆ ماڵێ، هەرچەندی بیری دەکردەوە چۆن

یەکێــک لە ئەندامانی خێزانەکەی تاوانبار بکاتو بە هۆکاری لە دەســتدانی ئــەو کاوڕەی لە قەڵەم بدات! بیری کردەوە ئەگەر ڕۆژی پێشــوو ژنەکەی جەوی بــۆ بێنابوایەو کاوڕەکەی ببڕیبوایەوە، خورییەکەی قازانج دەکرد، قیروســیا لە کاوڕەکەی! ڕیزەجنێویێکـو چەند گۆپاڵ داکوتانەک، بە ژنەکەی گوت: بە ملی شکاوت! ئەگەر دوێنێ جەوت بۆ بێنابوومایە ئێستا خوریەکەمان بۆ دەمایەوە! حەجمینی لــێ هەڵگیرابوو، هەر دەرێو ژووریی دەکرد، ژانی شەڕێک ئۆقرەی لێهەڵگرتبوو، لەناکاو چاوی کەوتە ســەر ڕســتەی جلکان کە جلی شــۆراوی لەســەر هەڵخرابوو، بەحاڵ دەلینگە دەرپێیەکی ژنانی بینی کە بای شــەماڵی کراسەکەی پێی داپۆشــرابوو بەحاڵ هەڵدابۆوە. سۆفی عوسمان ئەو دیمەنەی دەلینگە دەرپێیەکەی کرد بە هەنجەتو بیانوو: قەحپایەتیتانو بێناموسیتان گەیشتە ئەو ڕادەیەی، دەرپێی ژنان لەسەر ڕستەی دانەپۆشن لەبەرچاوی پیاوان، وەڵڵا بابم پیاو نەماون بەلاش نییە گوتوویانە: «پیاو بێکەس بێت هەژار دەبێ، ژن بێکەس بێت هار دەبێت!». هەموان هەناسەیان لە خۆیان بڕیوە بۆ ئەوەی تۆزێــک ئەهوەن بێتەوەو خوێن بەری چاوی بەر بدات. بەڵام بێ فایدەیە دەم لە دەمێ گەرمترو تووڕەتر دەبێت. لە ناکاو زرووکەو زیرەی ژنێک، لە گوێی خەڵکی ئاوایی دەنگی دایەوە. گریانێــک، چنجرۆکی لە ویژدانیان گرت، چریکەیەک، هەموو ســەگەکانی ئاوایی لەژێر کوندەڵانەکان دەرپەڕاندو کردیانە ســەوەڕ و چەقەلوولانــێ، زرووکەیەک لە هیچ دەنگێکی دیکە ناچێت، تەنها لە دەنگی نێو ئاگر و سووتان! بەجۆرێک، خەڵکی ئاوایی لە ماڵەکانیان دەرپەڕین. کەسی وا هەبوو بە کڵاوی خۆی ڕانەگەیشت، ئەوەی لەسەر جۆخینان بوو شەنەکانیان چەقانــدو بە غار بەرەو دەنگەکە ڕایاندەکرد، ئاپۆرای خەڵکی ئاوایی گەیشــتە

بەردەرگای ماڵی ســۆفی عوسمانی، کاتێک بەرایی ئەو هەنگامەیە گەیشتنە بەردەرگای حەساریێ، سێ ســێو چوار چوار خۆیان بە دەرگا تەنەکەکەدا دەداو نیگایان دەکەوتە سەر ژنەکەی سۆفی کە بەحاڵ نووزەی دەهاتو لە هۆش خۆی دەچوو و خوێنی لاملو پشتەســەری وای نیشــان دەدا سەریان بڕیبێ! سۆفی عوســمان، وەک جەنگاوەرێکی براوەی مەیدانی شەڕ، وەکو لە غەزای سەری گاورانی بڕیبێو بە دەستییەوە بێت، جووتەکەزیی ئەستووری ژنەکەی هێندەی نێو لەپەدەستێک چەرمی پشتی سەری لەگەڵ هەڵقەندبوو و بەدەستیەوە بوو. توومەز لەو بۆڵەبۆڵە، سۆفی عوسمان فشــاری چۆتە سەرێو نێوە نێوە نوێی کردۆتەوە، بە هۆی ئەوەی گوێشی گران بوون، پاڕانەوەی ژنەکەیشی هەمووی بە جنێو بۆ ئەژمار کردبوو، خێرا خێرا پێیگوتووە: هەی قەحپە! ئەوە لە بەردەمم قیت دەبیەوە؟ جنێوم پێ دەدەی؟ وا دەزانی چاوم نابینێ دەمت دەجووڵا!، وات لێهات لەبەردەمی زەلامان قیت ببیەوە؟ تاوای لێهات لە پشتڕا هەردوو کەزی دەگرێو پێی لەســەر ســەری دادەنێو بە هەموو هێزو توانــای، کەزییەکانی ڕادەکێشــێو چەرمو گۆشتی پشتی سەری لەگەڵ هەڵقەندبوو. لەبەرچاوی ئەو خەڵکە، وەک بێ ڕێزییەک کەزیو چەرمەکەی فڕێدایە بەردەمی سەگەکان!

ئەو ڕەفتارە دڕندانەیە، هەموو خەڵکی ئاوایی تەزاند، بە ترس و تۆقینێکی گەورەوە لەو تاوانەی ســۆفی عوسمانیان دەڕوانی و ئەو ترسە لە ڕووخسارياندا بەجوانی دەخوێندرایەوە. کاکەڕەشــیش هاوشێوەی ئەو خەڵکە بۆ ماڵی سۆفی عوســمان غاریداو لــە دەرگای حەســارێ وەژوورکەوت، نیــگای چاوەکانی لە دیمەنی لەهۆشچوونی ژنەکەو ڕاوەستانی سۆفی عوسمانی، ئەبڵەق بوو. لەو دەمودەســتەدا، لە سمێڵ کرۆشــتن زیاتر هیچی لە دەست نەدەهات. تابلۆی

ئەو کەتنـــەو کچ گۆڕینەوەی لەگەڵ بابەشـــێخی، بوونە غەمـــی ئاوەڵدووانە، باش دەیزانی ئەو کەتنانە لەژێر هەژموونی فەتوا ســـەقەتەکانی مەلا شـــێخ محەمەدییەوە ســـەرچاوە دەگرن. ســـەرەڕای ئەوەی هەموو ڕۆژانی هەینی لە گوتاری خۆیدا وەکو گـــەوارەی بەهاری دەبوایە ڕێژنـــە ڕەجمێکی ماڵی حاجی سمایلیو هاوبیرەکانیان بگرێتەوە. ئاخر ڕۆژانی پێنجشەمووان، ئاغا بۆی دیاری دەکرد لە هەینیـــی ئایندە، چ جۆرە گوتارێک بداتو چۆن هێرش بکاتە ســـەر نەیارەکانی ئاغا. هەموو وتارەکانی ئەو کلێشـــەیەی تێدابوو: کوڕەکانی حاجی ســـمایلو هاوبیرەکانیان مولحیدو مونافیقن، خوێنی مولحید حەڵاڵە، ئەوانە مارەیی ژنیان لێنایە، ژنەکانیان بۆ خۆیان چۆنە بۆ خەڵکیش ئاوایە! ئەوانە باسی یەکســـانی لە بەینی ژنو پیاو دەکەن، لە کاتێکدا ژن ناقیسولئەقڵە، بەڵگەش ئەوەیـــە خودا بەلاش نییە چوار ژنی بۆ پیاوێک حەڵاڵ کردووە! ئەوانە ژنان فێرە ســـوخەتەکی گەلەک خەراپ دەکەن، کوڕە لەگەڵ پیاوان فێرە تەوقەیان دەکەن تەوقە! لەگەڵ قســـەکانی مەلایدا، نوێژخوێنەکان تەماشـــای حاجی سمایلیان دەکرد بۆ ئەوەی بزانن لە ڕاســـت ئەو هەموو هێرشانەدا، چ ڕەدێکی دەبێت! تا وای لێهات بەناچاری مزگەوتی واز لێهێناو لە ماڵێ نوێژەکانی دەکرد.

کاکەڕەش ئاگاداری وردو درشـــتی ئەو قسانەی مەلا شێخ محەمەدی بوو، ناچارکرا سنوورێکی بۆ دابنێو ســـووکەتەمبێیەکی بکات! بە هیدۆی گوت: سۆسەیەکی جێی خەوتنی مەلا شێخ محەمەدی بکات، لە کوێ دەنوێو کەی دەنـــوێ؟ هیدۆ لە دوای دوو ڕۆژ هاتە لای کاکەڕەشـــی: بە تەنیا لە بن دیواری خانووی لە حەســـارێ دەنوێ، بۆئەوەی بەیانیـــان زوو خۆر لێی نەدات، دەرپێو کراسێکی خامی سپی لەبەردەکات. کاکەڕەش گوتی: ئەمشەو دەچینە سەری،

هەرچەندە مانگەشــەوە، ئەگەر تەمبێی نەکەین، خەڵکمان لــێ هاندەداتو خوێنمان حەڵاڵ دەکات. تاوانی بەدبەختیی ئەو دوو کچەش هەر لە ئەســتۆی ئەستووری ئەودایە!

لە دوای نیوەشەو، کاکەڕەشو هیدۆ لێی بە سەربانی کەوتن، لەسەر لێواری بانیرا بینییان لەسەر گازەرەی پشــتی ڕاکشاوە، دەستو لاقی ئاوا لەباریەکتری بردووە وەک بیەوێ کەســی دیکە لەو حەســارە گەورەیەی جێگای نووســتنی نەبێتەوە. ئێســتا هەموو ئاوایــی خەوتوون، بۆ پارێزگاری خۆیــان تەنها دوو دەمانچەیان پێیە، دوو خشتی بەسەر یەکەوەیان لە ستارەی خانووەکە هەڵقەند. کاکــەڕەش بە هەموو هێزی خۆی ئەو دوو خشــتەی لەســەرڕا لەنێو زگی دا! دروست لەسەر نێوکی. قەرەوێڵەیەکیش لەسەربانی بوو بە هەردووکیان بە دوو دەستە، کاکەڕەشو هیدۆ قەرەوێڵەکەشیان لەسەرڕا بەسەردا بەردایەوەو هەڵاتن بــۆ دەرەوەی گونــدی، نەبادا لە کاتــی ڕاکردن خەڵکی گونــدی بیبیانبینن، کە دەچنەوە ماڵێ. لەگەڵ گرمەی خشتەکانو شەقەشەقی قەرەوێڵەو هاواری مەلا شــێخ محەمەدو چراوەو قیژەی مەلاژنێ، هەنــدی بڵێی یەکو دوو، دەلعازی هەموو خەڵکی گوندیان بەسەردا قژقژا. مەلاژن بەر لە هەرکەس چووە سەری، کە بینی دەرپێی سپیو دۆشــەکی لۆکەکەی لەگەڵ پیسایی و خوێن تێکەڵاو بــووە. هەوڵیدا هەر زوو ئەو دیمەنە لە خەڵکی بشــارێتەوە، خەفتیانی ئەوەی کــرد جلەکانی بگۆڕێ. ئەو حەســارەی پڕ لە بۆنی پیســایی کردبوو و کافر لە دامێنی نەدەژیا. مەلاژن نەیتوانی ئەو خۆپیســکردنە دیزە بەدەرخۆنە بکات. ئەو هەواڵە، کرمانجەکان یەک بۆ یەکیان دەگێڕایەوەو ترشو خوێشیان دەکرد. لەنــاکاو ئاپۆرای ئەو خەڵکە وەک مێگەلەمەڕ بــێو گورگی بەنێو کەوتبێو

برەوێتەوە، ڕەفعەت ئاغا دڕی پێدان، لەگەڵ پیاوەکانی هاتنە سەر مەلا شێخ محەمەدی. کە بەو شێوەیە چاوی پێکەوت، شکانی شکۆی ئاغایانەی خۆی بینی، چۆن دەبێت کەسانێک هەبن زاتی ئەوە بکەن لە ژێر قەڵەمڕەوی ئاغایدا ئەو کەتنو سووکایەتییە بە دەستەڕاستی ئاغای بکەن!!

مشیرو ڕەفعەت ئاغا باش دەیانزانی ئاوا بڕوا نۆبەی تەمبێکردنی ئەوانیش دێتو ڕەنگە، بە حوکمی کوشتنی ڕۆستەمەشێتیو بریندارکردنی حاجی سمایلو منداڵێکی نێو لانکێ، باجی ئەوان قورستریش بکات، بۆیە هەموو هەوڵی خۆی خستبووەگەڕ، ئاگربڕێک لە دەوروبەری خۆی بکات بە پەرژین، ئەگەر هەر نەبێت ئەوانەی نووکی ڕمەکەن، بە گرتنیان بدات، بۆئەوەی حوکمی زیندانیکردنی چەندساڵێکیان بە قەبرغەیدا بدات. بە گرتنی چەند ئاوقاتێکو گەواهیدەرێکی بە ناهەق، بتوانن ئەو تۆمەتەیان بەسەردا ساغ بکەنەوە، کورد گوتەنی «پێش تایێ بەری بەخۆدا بدەن!»و بە بەردێکی دوو کێلان بشکێنن. ڕەفعەت ئاغا نەڕاندیو سوێندی خوارد بە وجاغی ڕەشادئاغای گەورە، نابێ ئەوەیان بەسەرەوە بچێت، ئەو کارە کەسنەکردییە قەبیعاتە، بە دوو سەران لەگەڵ مەلا شێخ محەمەدی کرایە: یەکەمیان ئەو مەلایەو وارسی ڕەسولوڵڵایە، دووەمیان شێخەو ئەولادی پێغەمبەرییە!

مەلا شێخ محەمەدیان شۆڕکردەوەو لەگەڵ ئاوپێداکردنێ، کەمێک هاتەوەهۆش خۆی، لێیان پرسی ئەوە چیت بەسەرهاتووەو کێ وای بەسەرهێناوی؟ بە ناڵەو نووزەوە گوتی: هەر ئەوەندەم ئاگا لێبوو بە هۆی بوومەلەرزەوە دیواری خانووەکەمان ڕووخا، چیدیکەم ئاگا لێ نییە!

ئەوشەوە لە مەلابانگدانی بەیانی نزیک بۆتەوە، بە دیار مەلا شێخ

محەمەدییەوە دانیشـــتوون، حەمە عەلی بەیتاریان هێنا، بەر لە هەرشت بە تەنتریۆی برینەکانی برژاندەوەو پاکی کردنەوە، چاوی ڕاستەی هێندە ئەستوورو شـــینو مۆر هەڵگەڕابوو، وێدەچـــوو قەرەوێڵەکەی، لەو کاتەی بە ســـەریاندا بەرداوەتەوە، وێ کەوتبێت، بەجۆرێـــک، کونی چاوی دیار نییە! بۆئەوەی بزانن چاوی کوێربووە یان ساغە، لەبەر ژانی باسکەشکاوەکەی ئارامی نییە، چونکە لەو کاتەی دوو خشـــتەکەیان بەســـەردا بەرداوەتەوە، دەســـتی ڕاستی لەسەر نێوکی بووە، بۆیە باسکی گردەبڕ شکابوو. حەمەعەلی بەیتار سێ هیلکەی لە پارچەخامێک هەڵسوویی‌و لە باسکەشکاوەکەی مەلای وەرپێچاو چەند تلیشە تەختەیەکی لەســـەر خامەکە بە بەنێکی قایم لـــێ شەتەکداو گرێچنی کرد. باسکەشکاوەکەی بۆ گرتەوەو قۆڵی شێخیان بە ملییەوە هەڵواسی!

تیشـــکی خۆر، وەک گەردنبەندی زێڕ خۆی لە ملەملی زووری ئاڵاند، هەر بابایە لە ماڵی خۆی بە هەرەداوانو هەشتاوی هەیپێی لێدەکات بۆ ماڵی مەلا شێخ محەمەدی، پیاوی وا هەبوو نیوەی پشتێندەکەی بە ڕێگاوە دەبەستو لە قەدی خۆی دەئاڵاند. هەبوو پێڵاوەکانی هەر بە ســـۆلانی، بەسەرپێوەکردبوو لە نیوەی ڕێ پاشـــپانی هەڵدەکێشـــا، هەبوو هەرتاکەی ئی کەسێکی بوو. هەبوو کڵاوی بەلاری لەســـەری بوو، کاتی نەبوو قیتـــی بکاتەوە، بۆیە هەر بە ڕێگاوە جەمەدانییەکەی لەسەری خۆی دەپێچا. هەبوو لە پەلەپەلیان قۆپچەی کراسی لاترقەوچانە داخســـتبوو، یان لچکە کورتەکـو شـــاقەلی کراسی بە دەرەوە بوو نەپەرژابووە سەر ئەوەی بیخاتە شەرواری. ژن هەبوو منداڵێکی بە سینگییەوە نووســـاندبوو، مەمکی لە زاری نابوو، منداڵێکی فەراقەشـــی بە دەستەوەبوو بە دوای خۆیدا پەلکێشـــی دەکرد، بۆی گرنگ نەبـــوو منداڵەکەی چاوی خێل

دەبێ یان نا، ئەوەی پێی گرنگ بوو زوو بگاتە ماڵێ مەلای! ژن هەبوو هێندە بەپڕتاوی پێچی کۆڵانەکانی گوندی دەبڕی، دامێنی کراسەکەی لە لاقو لەتەری دەئاڵاو سەرسمی دەداو سەرانگرێ دەبوو، لەپاوڕوو دەکەوتە سەر خۆڵو زبڵی بەرپێیانی، لە دوای ئەوەی چەند هەنگاوێکی بێ خواستی خۆیو بەدەر لە بەرزەفتکردنی خۆیو سەراوسەر دەڕۆیی، ئەوجا دەکەوت، بێ ئەوەی خۆی بتەکێنێ هەڵدەستایەوەو لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبوو. ژنی وا هەبوو هەتا دەنگی تێدابوو بانگی کچە عازەبەکەی دەکرد: ئەو منداڵانە لە خەوێ هەستێنەو بە دوامدا وەرن بۆ ماڵی مەلا شێخ محەمەدی، بابیشت حەوت زەمانە لەوێیە! ژن هەبوو نەدەپەرژییە سەر ئەوەی منداڵەکەی لە لانکێ دەربێنێ، ڕای دەکرد. خەڵکی ئاوایی، لەبەر ئەوەیان نییە کە پەرۆشی مەلایان بێ، یان پێیان ناخۆش بێ وا بەپەلە ڕادەکەنو بۆ ئەوێ دەچن، بەڵکو دەیانەوێ بزانن چۆنیان لێیداوەو چی بەسەرهاتووەو شکو گومانی لە کێیە!

هەڵلایەکە لەنێو گوندی، سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە! هەموو خەڵکی گوندی خۆی دەکوتێ زووتر بگاتە ئەوێ، هەتاوەکو قیسی سەگەکانیشیان قەرە بە قەرەی خاوەنەکانیان ڕادەکەن! ئەو بەیانییە زووە، هەموو ڕێگاکان دەچوونەوە قەمتەرەی حەساری ماڵی شێخ محەمەدی. لەنێو حەسارێ، ئاپۆرای خەڵکی گوندی جمەی دێ! ئەو دیمەنەی مەلا شێخ محەمەدی کە لاچاوی شینو مۆر بووەو وەک فوودانەی ئاوساوەو کونی چاوی دیارنییەو قۆڵی بە ملییەوە هەڵواسراوە، هەریەکە سەرنجی خۆی هەیەو ڕای خۆی بەرامبەر بەو ڕووداوە دەردەبڕێ. هەرچی دێتە حەسارێ، لەو پارچە خشتو قەرەوێڵەیە دەڕوانێ کە بە سەریاندا بەرداوەتەوە: مەلایەکەت دەستیان داوەتەبەرێ دەنا هەرکەسێکی

دیکە بایە فەراقی ڕەشی لێدەبڕاو جارێکی دیکە نانی کەرت نەدەکرد!

هەبـــوو دەیگوت ئەوە دەبێ چ کافرێک بن دەســـتیان چووبێتە پیاوی خوای؟ کرمانجی وا هەبوو دەیگوت: پیاوی خوای چی! ئەوە پیاوی ڕەفعەت ئاغایە، نەک پیاوی خوای، هەرچی خوا پێی خۆشە نایلێ، پیاوی خوای نابێ لەگەڵ زاڵمی بێ، دەبێ لەگەڵ فەقیری بێت.

لە نـــاکاو کۆخەیەکی دەســـتکردی ئاگادارکەرەوە، کە ئاشـــنابوو بە گوێی هەموویان، وەکو مقەس قسەکانیان پێ بڕین. بینینی ڕەفعەت ئاغاو پیاوەکانی بـــوو کە چاوی هەموانی بۆ لای خۆی ڕاکێشـــا، قەرەباڵغیەکەی دوولەت کرد، دڕیانداو ڕێیان چۆڵ کرد.

ڕەفعـــەت ئاغا فەرمانی پێدان: هەرچی زووە ئـــەو نێوەی چۆڵکەن، لەگەڵ مەلا شـــێخ محەمەدی قســـەی بەینی خۆمان هەیە! لە سەرینگانی شێخی دانیشـــت: گومانت لە کێیە ئەو کارەی بەرامبەرت کردبێت؟ شێخ محەمەد گوتی: کەسم نەبینیوەو نازانم بڵێم کێ بووە. ڕەفعەت ئاغا گوتی: ئەمن دەزانم، لە کوڕەکانی حاجی ســـمایلی و لە نێویشـــیان کاکەڕەش، دەرنەچووە، لەوانەیە هیدۆش یارمەتیی دابێت، پێویستە بەگرتنیان بدەین، تاوەکو کەتنی دیکەیان نەکردووەو خەڵکی دیکەش چاویان لێنەکـــردوون، وەڵڵا وەبیللا وەتیللا! نابێت ئەوەیان بەســـەرەوە بچێو بێ ســـزا تێپەڕێ! وەڵڵا بابە باش! هـــەر ئەوەمابوو پڕبدەنە شێخو مشایەخانیش! ئەو قسانەی زۆر بە تووڕەیی دەکرد. مەلا گوتی: ئاغا خۆ ئەمن شـــاهیدم نییە کە ئەوانە بوون! ئاغا قسەکەی پێ بڕی: خەمی شاهیدت نەبێ، ئەوە بۆ من بەجێ بێلە، ئەمن شاهید پەیدادەکەم. هەرئەوەندە لە ســـەر تۆیە لە لای پۆلیس داوایان لەسەر تۆمار بکەیو بڵێی داوام لەسەر

ئەوانەیەو ناوەکانیان بە پۆلیس بلێن. پۆلیس لە خوایان دەوێت. ئەوجا پۆلیس‌و باشچاوەش لە قسەی من دەرناچن!

ترومبێلێکیان هێنا، مەلا شـێخ محەمەدیان بـۆ ناحیەو بنکەی پۆلیس سـوارکردو کەوتنەڕێ. لە پۆلیسی کەتنەکان داوای یاساییان لە سەر کوڕەکانی حاجی سـمایل‌و هیدۆی تۆمارکرد و گوتیان: ئەو کەتنە، لە کاکەڕەش‌و هیدۆی دەرنەچووە، وەکی قۆدی جغارەو چەرخی وان، شەو و ڕۆژ بەیەکەوەن!



# ١٥

پێشـــنیوەڕۆیەکی گەرمـــە، خەڵکی گونـــدی هەریەکـــەو خەریکی کاری خۆیەتـــی. جۆخینـــەکان، وەک گردۆڵکان قووت بوونەتـــەوە، هەیە جەنجەڕی لەســـەر دەگەڕێو خەریکی قرشەشکێنییە، هەیە وردەکوتی دەکاتو، هەیشە شـــەنەبای دەکاو ڕەوســـەی ســـۆرکردییە. جۆخینەکان هەموو بەجیان، گەنمی ڕەشـــگور، قەندەهاری، حومێرە، یەخـــەدادڕا، گـــورڕووت. پنچکەخڕنووکـــو حوشترالووکەکانی نزیک جۆخینان، هێندەیان وردەکاو بەربا لێنیشتووە، بەحاڵ ســـەری گوفکیان بەدەرەوەیەو دیارە. کوڕەکانی حاجی ســـمایلی، هەرســـێکیان خۆشخۆش بە شەنەدارەکان شـــەنەبای دەکەن، نایانەوێ ئەو کزەبایەی شەماڵی بەفیرۆ بڕوا. ڕەوسەیان سوور کردییەو تارمەی کایان هەڵداوەتەوە.

لەناکاو، نیگایان کەوتەســـەر شەوقی شووشەی ترومبێلێک. لە دووڕیانی گوندی نزیک بۆوە، مســـەللەحەیەکی شورتەی بوو، گەواڵ گەواڵ تۆز لە دوایدا لوولـــی دەخوارد، ســـەرنجی هەموو خەڵکی گوندی بـــۆ لای خۆی کێش کرد. یەکســـەر چوونە بەردەرگای ماڵی حاجی ســـمایلی. پۆلیسەکان خۆیان فڕێداو پیادەبوون، دەســـتیان لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگە ئینگلیزیو کەنەدییەکانیان بوو، ئامادەباشـــی هەر ئەگەرێک بوون. ئاخر سکالاکە وا کرابوو: ماڵی حاجی

ســـمایلی تفەنگیان هەیەو سەروکاریشـــیان لەگەڵ حیزبی نەیاردا هەیە، بۆیە فەرمانی پشکنینیشیان پێبوو.

منداڵەکان بە هێنکەبڕاوی گوتیان ئەو ماڵەی ئێوە پڕبووە لە معاونو پۆلیس، بانگتان دەکەن. ئەوانیش شـــەنەدارەکانیان لە ڕەوســـەی گەنمـــی چەقاندو کڵاوە لبادەکانی سەپانییان بەســـەرداداو هەریەکەیان بە دەم ڕێوە، خەریکی تەکاندنی تۆزو کای ســـەرو پۆتەڵاکـو قۆڵو باســـکی مواویو ســـینگیان بوون، پشـــتی کورتەکەکانیان لە ئارەقەیدا سپی بووە. حاجی سمایلیش گێرەو جەنجەڕی بەرداو بەرەو ماڵ بۆوە. هەرچی ژنو منداڵو گەورەو بچووکی ئەو گوندەیە، لەسەر دیوارو بەردەرگاو سەربانو لاکۆڵانان تەماشای ماڵی حاجی سمایلی دەکەن. پڕپڕ بووە لە معاونو پۆلیس، بەجۆرێک چاشـــمیش بوونە، وەک ئێستا نا ئێستا ببێتە تەقە! خەڵکی وا هەبوو هەزار ســـوێندی دەخوارد: هەر ئێســـتا نا ئێستا گوللەبارانیان دەکەن، هەرکەسەو لەخۆڕا حوکمی بۆ دەبڕینەوە!

کاکـــەڕەش لە بەرایـــی هەموانڕا دەڕواو بە بیری هاتەوە لەنێو ســـندووقە دارەکـــەی دەمانچە چواردەخۆرەکەیو تاپڕێکـو چەند نووســـراوێکی قەدەغەو وێنەیەکی مارکـــسو ئەنگڵسو لینینی تێدایە، بۆیە بـــە براکانی گوت: ئەو شـــتانە ئی منو ئێوە بڵێن ئێمە ئاگادار نین، ئاخر ئەو نووسراوانە بە جۆرێک قەدەغـــەن، پەر لە پەڕی قاچاخترو ڕســـتە لە ڕســـتەی ئاگرینتر، هەر ئەوەندە کاغەزە بەســـە بۆ ئەوەی، ئەگەر لە سێدارەشـــیان نەدەن، هەموو تەمەنیان لە حەپسخانەی بیانڕزێنن. بۆیە کاکەڕەش گوتی: ئەمن دەڵێم هی منو برایەکانم ئاگادار نین، بۆئـــەوەی تەنها یەکێکمان لە ســـەری بگیرێینو حوکم بدرێین. هەریەک لە برایەکانی دەیانگوت: ئەمن دەڵێم ئی منە، بەڵام قسەی کاربڕ لای

کاکەڕەشی بوو. بەرپرسی پۆلیسەکان معاون فازڵ، عەرەبێکی خەڵکی بەسرایێ بوو، هەرکە گەیشتنەوە ماڵێ، بەخێرهاتنی معاونو پۆلیسەکانیان کرد. معاون فازڵ یەک بە یەک نـــاوی داواکراوانی خوێنـــدەوە، هەریەکە بە نۆبەی خۆی، گوتیـــان بەڵێ! ئەوەی دیارنەبوو هیدۆ بوو کە ناوی لە کاغەزەکە وەک داواکراو هەبوو، بە معاونیان گوت: هیدۆ ماڵی جوودایە، لەگەڵ ئێمە نییەو ماڵی لە لای مزگەوتێیە. کاکەڕەش لە خوای دەویست هەرچی زووە کەلەپچەیان لە دەستی بکەنو بیانبەن، تەنها دەرکی ســـندووقەکە هەڵنەدەنـــەوە، چونکە پەیوەندیی بـــە مانو نەمانیانەوە هەیە! لەناکاو ڕســـتەیەک گوێی هەمووانی زرنگاندەوە، ئەوەی نەیاندەویست گوێبیستی بن، گوێیان لێبوو: دەبێ ماڵەکەتان بپشکنین! ئەوەی گوتو معاون پۆلیسەکانی دەنگ دا: دەی هەرچی زووە هەموو ماڵەکە بپشکنن، نامەوێ هیچ شـــوێنێک فەرامۆش بکەن! پۆلیسەکان، هەر بابا بوو پێیان لە عەزری دەکوتا: بەڵێ گەورەم!

ســـندووقێکی دار، ســـەرنجی معاون فازڵـــی بۆ لای خۆی ڕاکێشـــاو چاوی لەســـەر نەگواســـتەوە، بەرەو ســـندووقەکە ڕۆیشـــت. هەرهەنگاوێکی، بۆ سەر هەســـتی کاکەڕەش بە جۆرێک قورس بوو، وەک قورسایی دنیای کەوتبێتەسەر! لەگەڵ درێژکردنی دەســـتی بۆ دەرگای ســـندووقەکە، وەک دەست بۆ ڕیشەی دڵی کاکەڕەشـــی ڕابکێشـــێ! دڵی زۆر بەپەلە لێی دەدا، هەر ئەوەندەبوو لە ســـینەی نەیەتەدەرێ! دیاریکردنی مانەوەو نەمانەوەی لە ژیانو دیاریکردنی چارەنووســـی، ئەو چەند چرکەساتەیە! معاون فازڵ سەری سندووقەکەی هەڵدایەوە، وەک لەسەر باڵەخانەیەک بەربێتەوە، ئەوەی هەرگیز پێشبینیی نەکردبوو لە ماڵەجووتیارێکی کوردی ئەو دەشـــتە پانوبەرینەی هەولێرێ بیبینێ، بینـــی! بەدەر لە دەمانچەو

تاپڕەکە، کاغەزە قەدەغەو ئەو سێ وێنەیە بوو کە خودی مەعاون لە بەسراوە بۆ هەولێر لەسەری دوورخرابۆوە! دیاربوو لەگەڵ خانەوادەی حاجی سمایلی هەڵگری هەمان هزرو بۆچوونی سیاسی بووە، هەر بەپەلە سەری سندووقەکەی داخستەوە بێئەوەی دەستکاری یەک لەو شتانەی نێو سندووقەکە بکات، لەسەر سندووقەکە دانیشت. معاون فازڵ پیاوێکی تەمەن بیستو حەوت ساڵ بوو، قەدو باڵابەرز سمێڵی بادراوی کەوتبووە سەر، ڕوومەتە ئەسمەرە بەسراوییەکانی، تی چاوێکی دڵنیاییو سۆزی هاوبیرانەی دایە کاکەڕەشی، دارەکەی دەستی لە لمووزی پۆستاڵەکەی دەداو بەسەر پۆلیسەکاندا نەڕاندیو فەرمانی پێکردن: هەموو شوێنێک بگەڕێن! دەستی بۆ لای کەندووی ئاردیو هەمبانەی بڕوێشو ساوارو گەنمەکووتاو و قیسی ئەو مەشکەخاراوەی ڕاداشت کە بە جەفتو گروان خارابوو، بە بەرمیچی ژوورەکەدا هەڵواسرابوو. حاجیژن جامێکی ماستاوی مەڕی بۆ هێنان، معاون فازڵ ئەوەندە بەڕێزەوە ماستاوەکەی لێوەرگرتو چاوی تێبڕیبوو، کتومت وەک ئەوەی لە حزووری دایکی خۆی وەستابێت، لە تابلۆی پەیکەری دایکی دەڕوانی. بە هەموو بوونییەوە دەیویست ئەو سۆزو هاوبیرییەی خۆی لە تێڕاخوڕینی پۆلیسەکان ون بکاتو بشارێتەوە، لە دوای خواردنەوەی ماستاوەکە، جامەکەی کە پڕبوو لە ڕێزو حورمەتی کوڕو دایکانە، بە ڕێز و میهرەبانییەوە دایەوەدەست حاجیژنێ. جورئەتی بەرگەگرتنی دەستە لەرزۆکەکانی حاجیژنی نەدەگرت، کە چاوەڕوانی ئایندەی کوڕەکانی، وەلەرزەی خستبوون. ئاخر دەستی دایکی دەهاتەوە بەرچاوی کە هەواڵی دوورخرانەوەی، لە پۆلیسی بەسرا بۆ پۆلیسی هەولێری، پێگەیشت.

بۆ ئەوەی هاوسۆزی خۆی بشارێتەوە، خۆی لە پۆلیسەکان تووڕەکرد: دووبارە ئەو

ماڵە بپشکننەوە! نیگایەک، زۆر شتی شاراوەی لەخۆگرتبوو، دەیگوت: نیگەران مەبن، زمانم شتێک دەڵێ‌و دڵم شتێکی دیکە، هەتا لە توانامدا بێت دەتانپارێزم. معاون فازڵ لە پۆلیســەکانی ڕاخوڕی: هەرسێکیان قۆڵبەستو کەلەپچە بکەن! بە نەغمەیەکی هەڕەشەئامێزیشەوە فەرمانی پێکردن: خێرا بیانبەن لە قەفەزی ســەیارەکەیان پەســتن! بۆ خۆیشــی لە دوای هەموویان کاتێک دڵنیابوو هیچ پۆلیســێک لە ژووری نەماوە، لەسەر سندووقەکە هەستایە سەرپێ‌و چووە دەرێ، بەرەو ماڵی هیدۆی ، بۆ دەســتگیر کردنی، وەڕێکەوت. هەر لە ڕێگا ئەویشــیان گرتو قۆڵبەســتیان کرد. ژنو منداڵی گوندی هەموویان هەترەشیان لە پۆلیسو معاونو کەلەبچەو قۆڵبەستو زنجیر چووبوو، ئاخر ئەوانە سامێکی تایبەتییان هەبوو، پۆلیسەکان لەبەرچاوی خەڵک ئاوا خۆیان هاوێشتە نێو ترۆمبێلی، وەک ئەوەی بە خەڵکی بڵێن: هیچکەس لە دەستی حکومەت دەربازی نابێت!

لە بستووی دووریانێ ئاوابوونو لەبەرچاوان ون بوون، ئەوەی لە دوای خۆیان جێهێشــت، گەواڵەی لوولخواردووی تۆزێکی خەستی خۆڵەپۆتی ڕێگاکە بوو. گەواڵەتۆزەکان ئامێزیان لێکدەداو بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان.

لە دوای دڵنیابوونی حاجی سمایلی کە پۆلیس لە گوندی نەمانو ڕۆیشتن، چووە زگ سندووقەکەی‌و پێی شک دەهات سندووقەکە تاپڕو دەمانچەی چواردەخۆرو چەنــد پەڕە کاغەزێکــی قاچاغو مەمنوعی تێدابێت، ســەری ســندووقەکەی هەڵدایەوە، هەموو شــتەکان وەک خۆی بوونو دەستکاری نەکرابوون، وێنەی سێ پیاوە ڕیشــدارەکە لە لای ســەرەوە بوو. حاجی ســمایل وێنەکەی بەدەستەوەبوو، بە حاجیژنێی دەگوت: بەو مەککەیــەی توافم کردییە، ئەو معاونە عارەبە وەک کوڕەکانی من موریدی تەریقەتی ئەو سێ سۆفییە ڕیشدارەن، بۆیە هەرکە چاوی

بەو وێنانە کەوت وەک نەیەوێ بە دەستی بێ دەستنوێژ دەستیان لێبدات، گورج لە جێی خۆی دانایەوە، وەڵڵاهی وەبیللاهی وەتیللاهی ئەمن ئەگەر هیچ لە دنیایێ بزانــم ئەو معاونە لەگەڵ منداڵەکانی ئێمە یــەک مەرامی هەیە، ئای کوو بووە فریشــتەی نەجات بۆ ئێمە! ئەگەر معاون لەسەر ســندووقەکە دانەنیشتبوایە، ئــەو دەمانچە و تاپڕیان دەدۆزییەوەو ئەوکات ســەرت دەچووە قوڕێو هەشــت بەســەری دەبوو، کوڕەکانت نەدەبینییەوە. حاجیژن گوتی: ســەدەقەم لەسەرخۆم نەزر کردییە خوابیانپارێزێ، دوو بەرەئەســتوورکی تەندورێم خێر لە خۆم گرتییەو فرووجە جنجرەکەش دەدەم بە منداڵەکانی ڕۆســتەمی ڕەحمەتی، بەس کوڕەکانم پارێزراوبن! حاجی ســمایل گوتی: تەنها کوڕەکانی خۆت؟ ئەدی هیدۆ؟ حاجیژن گوتی: ئەیەڕۆ! بــە خوای هیدۆش لەگەڵ کاکەڕەشــی جیاوازیی نییە، بە خوای هێندم خۆشدەوێ، دەڵێی بەخۆم شیرم داوەتێ!

کاکەڕەش هەســتی بــە وزەیەکی زۆر دەکــرد، تەواوی گیــانو بوونی جۆشو باوەڕبەخۆبوونێکــی وای تێگەڕابوو، وەک گڕکانێک لــە هەناویدا دەتەقییەوە. دڵخۆش بوو لە پەنای ئەو دڵخۆشییە ئومێدێکی زۆر بە ڕووخسارییەوە دیاربوو. یەکەم وەک ڕزگاربوونێکی بەرپەتی سێدارە. دووەم: بۆی دەرکەوت هاوبیرەکانی، لەوانــەی لەگــەڵ ئەودا یــەک مەرامیان هەیە، لــە ڕیــزی هێزەئەمنییەکانو نەتەوەکانی دیکەش هەن! ئەوەش تینو گوڕێکی دیکەی پێ دەبەخشــی. ئاخر ناهەقی نەبوو، چونکە معاون فازڵ ئاوی حەیاتی ڕژاندبووە ژێر نەمامی ئومێدی!

لە ئەنجامی حەولو تەقەللای بێوچانی ڕەفعەت ئاغای، بۆ ڕۆژی وتەوەرگرتن لــە پێش پۆلیسو لێکۆڵــەری دادگایی، دوو گەواهیدەری ئامــادە کردبوو، بۆ ئەوەی بەناحەق لە دژی کاکەڕەشو هیدۆی، گەواهی بدەن.

گەواهیـــدەرەکان یەکیـــان نـــاوی زرار هەمبانـــە بوو، لە ناوچەکـــە بە درۆ
ـاخدارەکانی بەناوبانگ بوو. هەر بەو هۆیەوە پێیان دەگوت هەمبانەی درۆیان!
ـرار هەمبانە، کوڕێکی ناوی ســـەربازی هاتبوو، دەبوایە بچێتە سەربازی، زۆر
ـــار لەبەر ڕەفعەت ئاغـــای دەپاڕایەوە چونکە ئەو لە دامـــودزەگای دەوڵەتی
ەســـتی دەڕۆیشـــتو قســـەی بە هەند وەردەگیرا، بەڵکو کارێکـــی بۆ بکات
وڕەکـــەی بۆ بکات بە (موعین) بۆ ئەوەی نەچێتە ســـەربازی، لە بەرامبەردا
امادەیە ڕەفعەت ئاغا هەرچی کارێکی سەختە پێی بسپێرێ، بۆی بکات.

دووەم شـــاهید قەهار بوو، کە خزمی ماڵی حاجی سمایلی بوو. قەهار، بە
ەســـتی خۆی زەلامەکی ئازابوو، لـــێ، ئەو ئازایەتییەی خســـتبووە خزمەتی
غـــاکانو، لە دژی ماڵی حاجی ســـمایلو کرمانجەکان، پشـــتگیریی لە زاڵم
ـکرد. قەهار، تەنها کێشـــەی بەخیلی هەبـــوو، ئیرەیی ڕوحی ئالوودە کردبوو،
ـتێک لە خەڵکی دەبیســـت: کوڕەکانی حاجی ســـمایلی پیاوی ئازانو لەسەر
ـمانجان دێنەوە دەنگـو سەریان بۆ زوڵم شۆڕناکەن، هاوکاریو زیارەی خەڵکی
ماو دەکەنو ماڵێکی ناندەرن، ئەوانە هەمووی وەک ئاگر قەهاری دەتواندەوەو
ناخەوە خۆی دەخواردەوە!

لە گەورە باســـکردنی ئەواندا گچکەیی خـــۆی دەبینی، بۆیە هەوڵی نەدەدا
ـک ئـــەوان گـــەورەو کەڵەگەت بێت، بەڵکـــو هەوڵی دەدا ئـــەوان ببڕێتەوەو
ـک خـــۆی بچووکیـــان بکاتـــەوە. ئەو ئیرەییـــەی بە جۆرێک بـــوو، خەڵکی
چەکە شـــارەزای قەهاری بووبوون، هەر بە ئەنقەســـتو بـــۆ ئازاردانی دڵی،
ـەوتنە پێداهەڵدانو باســـی مەردایەتی کوڕەکانی حاجی سمایلی. زۆرجار
ـەو پێداهەڵدانە زیادەڕۆییشـــیان دەکرد. ئەو قســـانە وەک خەنجەری دەبان

دەچەقینە سەر دڵی قەهاری بەدبەخت. ئاغاکانیش بۆ هەرکارێک بیانویستبا، بەکاریان دەهێنا. قەهار لەو تەقەلێکردنەی ئەوشـــەوەی ڕۆستەمەشێتی تێدا کوژراو حاجی ســـمایلو منداڵێکی ســـەرلانکێ بریندار بوون، بەشـــدار بوو. بـــە ئەقڵی خۆی وای دانابـــوو ئەگەر خزمەکانی خۆی بشـــکێنو لە بەرامبەر ئاغاکان بە چۆکدابێن، ئەو گەورەیی و پێداهەڵدانەی ماڵی حاجی ســـمایلی بە میرات بۆ وی دەمێنێتەوەو لە گۆڕەپانەکە دەبێتە میرکوڕ! بەخیلی، وا دەروونی داگرتبوو، لە هیچ کارێکی نـــاڕەواو ڕەفتارێکی پیس نەدەپرینگایەوە. ئاغاکان کاری وا خراپیان پێ دەســـپارد لەگەڵ ئازایەتیی ویـــدا نەدەهاتەوە. دیواربڕیان دابووە دەســـتی بۆئەوەی دیواری تەویلەی ولاخان ببڕێتو وەک ئەتککردنێک کلکی کەرو مانگای خەڵکیان پێ ببڕێت، یان هیزە ڕۆنی خەڵکییان پێ دەدزی. کاکـــەڕەش زۆرجاران دەیگوت: مخابن! قەهار ئـــەو هەموو ئازایەتییەی خۆی خستۆتە خزمەتی زاڵمانو دژایەتی کرمانجان!

ڕەفعـــەت ئاغا، بەڵێنی بـــە هەردووکیان دابـــوو، ئەگەر ئەو شـــاهیدییە بـــە کەیفی من بدەن، ئـــەوا کوڕی زرار هەمبانەی دەکـــەم بە موعینو ناهێڵم ســـەربازی بکات. زەویی کاولانیش کە باشـــترین پارچەزەوییە، لە ماڵی حاجی سمایلی دەستێنمەوەو دەیدەم بە قەهاری.

حاجی ســـمایل، جگە لە چەنـــد نەوەیەکی منداڵو چەنـــد ژنێک بەولاوە کەسی دیکەی بەدەستەوە نەمابوو، کەسیشی شک نەدەبرد بۆئەوەی ئیشوکاری جۆخینداریو خەلەو خەرمانی بۆ بکات، ناچارە تاکو کوڕەکانی لە حەپسخانەی بەردەبن، بە خۆیو بە حاجیژنێ قۆڵی لـــێ هەڵماڵنو ئیشوکارەکان ڕاپەڕێنن، چونکە لە دوای گرتنی کوڕەکانیان ئیشـــوکارێکی زۆریان بەسەردا کەوتۆتەوە.

ڕاستە هەندێک لە خزمو کرمانجەکان جارجارە یارمەتییەکیان دەدەن، وەلێ، ئەوانیش کاری خۆیانیان هەیەو دەبێ پێی ڕابگەنو کورد گوتەنی: «ماڵ بە لاباران، ناگاتە هەواران!». زۆر کەسیش هەیە حەزدەکات یارمەتییان بدات، بەڵام لە ترسی ڕەفعەتی ناوێرێ تخونیان بکەوێو، دوورییان لێدەکات.

ئەورۆژەی هەرسێ کوڕەکەیان قۆڵبەست کردنو بردیانن، حاجی سمایلو حاجیژن، بۆ ئەوەی ئاگایان لە ڕەوسەو جۆخینەکان و ئامێرەکانیان بێت، بەیەکەوە بۆ ئاودەنگیی یەکتری لەسەر جۆخینان جێ نووستنیان خۆشکرد. هەموو ئێواران شەقرچی ئاغای بە سواری ئەسپێکی قورەنژدی[1] بۆرەی خارخاری، دەهاتو لە ئەسپەکەی دادەبەزیو ڕەوسەی گەنمەکەی شەقر دەکرد بۆئەوەی نەبادا خاوەنەکەی بەرلەوەی بەشی ئاغای لێبدات، چەند ڕبەگەنمێک بەدزی بۆ ماڵی خۆی بەرێتەوە. ئەو بەیانییە، کزەبایەکی شەماڵی هەڵیکردبوو، حاجی سمایل جگەرەیەکی قامیشی بەدەستەوەبوو، سەرنجێکی وردو پڕ لە شکۆو لە هەمان کاتیشدا تەژی لە خەمو ناسۆر، سەرەواندبووە هەرسێ کڵاوە سەپانییەکەی کوڕەکانی، کە بە بای شەماڵی دەجوولانەوە. ئاخر چۆن ڕۆژی گرتنەکە شەنەکانیان لە ڕەوسەی چەقاندبوو و کڵاوەکانیان بەسەردا ڕۆکردبوو، وەک خۆی کەس دەستی لێنەدابوو!

حاجی، چێژێکی تایبەتی لە تەماشاکردنیان وەردەگرت. حاجی، ڕووی کردبووە لای بای شەماڵیو بایەکەش نەرم نەرم لا ملو بن چەناگەی دەسوویو فێنکی دەکردەوە. چاوی لە ڕێگای شەقرچییە، بێتو تەماشای

---

١. قورەنژدی: قوڵەنژدی. ئەسپی خڕکەڵەکەی توندوتۆڵ و کلک کورت.

ڕەوســـەکەی بکاتو لە دوای دڵنیابوون لەوەی کە دەستکاری نەکراوە، فەرمانی دەستبەکاربوونی پێ بدات. ئەوڕۆژە دەبوایە لەگەڵ حاجیژنێ کوزرو بنجۆخینی لە گەنمی جیا بکەنەوە. شـــەقرچی ئاغای، بە ســـواری ئەسپەبۆرەی خارخاری بۆ ســـەردانی جۆخینەکانی دیکەی خەڵکی ئاوایی، یەک ڕکێب هەڵیکوتایە سەر جۆخینی ماڵی حاجی سمایلی، وەک ئەوەی ئاغا دنەی شەقرچی دابێتو بیانەوێ گۆبەندێکی بۆ سازبکەنو تۆمەتێکی بەسەردا ساغ بکەنەوە. بینی لە گۆشەیەکی ڕەوسەکە تۆزێک تێکەڵ بووەو شەقرەکە گەچراوەو تێکچووە. ئیدی کردییە ڕۆژی حەشـــرێو هەرچی جنێوی ناشیرینو نەشـــیاوە بە ئەستوورایی زاری دەهاتنەدەرێو جنێو بە جنێوی ڕانەدەگەیشـــت! حاجی ســـمایل گوتی: بـــەو مەککەیەی توافم کردییە، شـــەوی ئەوشـــەو لەدیـــاری خەوتووین، بەو بەیانییە لە نوێژێدا بووم تاژییەکان بەســـەریاندا غـــارداو ڕاوەدووی یەکترییان دەنا، ئەو گۆشـــەیەیان گەچراندو تێکەڵکرد، ئەوجـــا خۆ کوڕەکان لێرە نین، کێم هەیـــە گەنمی بۆ من بەرێتەوە ماڵێ، ئەگەر باوەڕیش ناکەی وەرە ماڵێ هەموو بگەڕێو بپشکنە، ئەگەر پێنج ڕبە گەنممان لە ماڵی بوو، ئەمن بە جەزای خۆم قایلم! هەرچەندی حاجی سمایل زۆری گوت، شەقرچی کەمی گوێ لێگرت! بە دەم ســـووڕاندنەوەی جڵەوی ئەســـپەکەی گوتی: دەبێ ئاغا لە تەویلەی وڵاخان سەراوبن هەڵتواسێو دوکەڵی کای جۆت لە بن لووتی بکاتەوەو قانگت بدات، عەربەگەنمێکیش جەزات بکات!

جغارەخۆرەکـــی پێ نەچوو، مشـــیری ڕەفعـــەت ئاغاو شـــەقرچیو چەند خزمەتکارێک بە سواری ئەسپان داباریەنە سەر جۆخینان، وەک بۆ مەیدانداری خۆیان پڕ چەکو تفاق کردبێت! بەو ســـبەینێیە، کە هێشـــتا خێرو شەڕ بەش

نەکرایە، کتومت ســیکەوگورگەیی[١] هەڵیانکوتایە ســەر حاجی ســمایلی. بە فرســەتیان زانی، لەو کاتەی کوڕەکانی حاجی ســمایلی گیراونو کەس نییە بەرپەرچیان بداتەوە، هەرچی جنێوی ناشیرینە بە حاجی سمایلیو حاجیژنیان دا، بەوەش ڕانەوەستانو دڵیان ئاوی نەخواردەوە، بە حەیزەرانو قامچیان وەرگەڕانە لێدانیان، دروســت لەو کاتەی ئەو کچە هەشــت ســاڵانەیەی نــەوەی حاجی ســمایلی، ئاوی خواردنەوەی بۆ باپیرو نەنکی هێنابــوو، کەوتە بەرچەپۆکــو گێژەنی سواران، وەک زەڕنەقووتەیەک لەبەر چنگی داڵەکەرخۆرەی بپلیقێتەوە، وابوو. گوڵاڵە، ئەو کچە تەمەن هەشــت ساڵانەیەی نەوەی حاجی سمایلی، لە دوێنێ ئێوارێوە دایکی هەرێــی پێ دابوو، کە تازە درەنگەو بەیانی ڕێگای پێ دەدات، هەرکە لە خەوێ هەســتا گۆزە بچکۆلانەکەی بە پڕئاوی بۆ بابەحاجیو دایەحاجــی بەرێتە ســەر جۆخینان. گوڵاڵە، هەر لە ئێوارێــڕا گۆزەکەی پڕئاو کردبوو و لەسەر ســەکۆی نێو حەساریێ لە سەرینگانی خۆی دانابوو، بۆئەوەی تا بەیانی ســاردبێت. ئەو شەوە لە خۆشی ئەوەی بەیانی ڕۆژ بووەوە گۆزەئاوەکە بۆ باپیرو داپیری دەبات، خەوی لــێ هەڕکابوو. دایکی لەگەڵی خەریک بوو بە چیرۆکی (خوشکی حەوت برایان، بزنۆکەو مەڕۆکە، ئەحمەدو محەمەد، ڕێوی فێڵباز) بینوێنێ.

---

١. سیکەو گورگە: بەشێک بوون لەو هیندیانەی لەگەڵ سوپای ئینگلیز هاتبوونە عێراق و کوردستان. هێزێکی ناڕێکخراو بوون، لە چوارچێوەی لەشکری ئینگلیزدا کاریان دەکرد. پابەندی پرەنسیپە سەربازیەکان نەبوون، کاری دوور لە عورف و دابو نەریتی کوردەوارییان ئەنجام دەداو زیانی زۆریان بە کورد گەیاندبوو، بۆیە لەنێو کوردەواریدا بە خراپکار ناویان ڕۆیشتبوو.

گوڵاڵە، ئەوشـــەوە چەندان خەونـــی ڕەنگاڵەیی بینیبـــوو، بەئومێدی ئەوەی سبەینێ لەگەڵ تاوهەڵاتێ بگاتە سەر جۆخینان، کاتێک گۆزەکەی قلْپ دەکاتەوە نێو جامەفافۆنەکەو دەیداتە دەســـتی بابەحاجـــیو ئەویش ئاوەکە دەخواتەوەو چ تامێکی لێهەڵدەگرێ: ئای ئاوی دەســـتی ئەو کچەی بۆ هێندە خۆشـــە! لە ئاوی دەستی هیچکەســـێک ناچێ! ئەمن بە ئاوی دەســـتی گوڵاڵەی نەبێ، تینوێتیم ناشکێ! ئافەرینێکی وەردەگرێو بابەحاجی بە گۆزەکەیەوە تا ئاستی سەری خۆی بەرزی دەکاتەوە: ئای ئەوەندە گـــەورە بی! ئای ئەگەر ئەو کچە نەبێت لە تینووان دەخنکێیـــن، کەس قومەئاوێکـــمان ناداتێ! بە خەیاڵی ئەو قســـانەی لە زەینی خۆی دایڕشـــتوون، ئۆخژنێک لە هەناوی دەگەڕێ، هەســـت بە گرنگیی هەبوونی خـــۆی دەکات. دووبارە بە قلْپکردنەوەی گۆزەکـــە، جامەفافۆنەکە پڕئاو دەکاتەوەو ئەوجارەیان بـــۆ دایەحاجی. ئەویش لە دوای خواردنـــەوەی: عەمرت درێژ بێتو ڕووت سپی بێتو مرازت حاسڵ بێتو ئاقیبەتت خێر بێت، کچە کەزی زەردەکەم! لە دەوری سەری خۆتو بابت بگەڕێم، بەلاگێڕو بە قوربانتان بم!

لەدوای وەرگرتنی ئەو هەموو ئافەرینە، دایەحاجی جامەکەی بۆ پڕدەکات لە گەنم: بچۆ لەلای مام خۆشناوی بە ترێی ڕەشمیری بیگۆڕەوەو بەشی ئەوانی دیکەش بدە!

هەرکە گەیشتە ســـەر جۆخینان، بەپێچەوانەی ئەو هەموو خەونو خەیاڵە ئاوریشـــمییەی شـــەوی ڕابردوو لە زەینی خۆیدا چنیبـــووی، بەرلەوەی ئاویان لـــە گۆزە بچکۆلانەکەی بۆ لـــە جامەکەی بکات، کەوتە بەرچەپۆکی ئەســـپە مەغروورەکانـــی مشـــیرئاغاو پیاوەکانی، گۆزەکەی لەدەســـت پـــەڕی، لەگەڵ شکانی گۆزەکەی، فنجانی دڵەبچکۆلەکەی شکا، لەگەڵ ڕژانی ئاوەکە، هەموو

خەونە ڕەنگاوڕەنگەکانـــی ڕژان. بە بینینی دیمەنی خولانەوەی جامەفافۆنەکە لەبەرســـمی ئەسپەکان، ســـەری گێژی خوارد، لەگەڵ ســـووڕانی ئەسپەکان بە چواردەوریاندا، گوڵاڵە وەک هەترەشـــچووییێک چاو لە مۆلەقەو حەپەساو، لە ترســـی ئەوەی، هاکا کەوتە ژێر چوارناڵەی ئەســـپەکان. بە چـــواردەوری خۆیدا دەخولێتەوە، وەک ئەوەی ڕەوەگورگێک گەمارۆیان دابێت، هێدمەگرتی بووە!

بۆئەوەی لە دواوە زەفەری پێ نەبەن، لە هەوڵی ئەوەدایە پشتیان تێ نەکات. جارجـــار قامچییەکی پێ دەکەوت، لەو کاتەدا زریکەو فوغانی، لەگەڵ فرمەو حیلەی ئەسپەکانو شریقەی قامچییەکانیان بەرەو ئاسمان بەرزدەبێتەوە، وەک جانەوەرێکی تۆقێنەر و ترســـناک تەماشای دەکردن. لە کۆتاییی بە دیار پارچە تاســـولقە شـــکاوەکانی گۆزەکەیەوە هەڵتووتاوەو بە خەمو نیگەرانییەوە لێیان دەڕوانیو بە تاســـەوە سەیری دەستگرو قوڵپەکانی دەکرد، بە حەپەساوییەوە لە جامەقۆپاکەوەی دەڕوانی کە هێشتا دەخولایەوە، دڵی شکاو و ئومێدی قوپاوی خۆی تێدا دەبینی! پرچی ئاڵۆزکاو و شـــانەنەکراو و دووچاوی قاوەیی ڕەشباوی تەژی لە ڕۆندک، دەنکە فرمێســـکە کریســـتاڵییەکانی ســـەر ڕوومەتی وەکو ئاونگی ســـەر پەڕەی گوڵەباغ. ڕێچکەی فرمێســـکەکانی، وەک دوو جۆگەلەی جۆماڵکراو، چڵکـو تۆزی ســـەر ڕوومـەتی هەتاوگازی تاوەکو چەناگەی سپیو پاک کردبۆوە، ڕەنگی ڕاســـتەقینەی ڕوومەتی گەیاندبووە ســـەر ساغایی! ئەو دیمەنە پڕ ئازارە، دڵی وەک بەردی دەکرد بە ئاو!

هەڵســـوکەوتی مشـــیرئاغاو پیاوەکانی دەرهەق بە ماڵی حاجی سمایلی، بەوە نەدەچوو هاوســـێو هاوگوندیو هاوزمانی یەکتری بن، ئەوەندەی هەســـت دەکرا لەشـــکری مەغۆل بەسەر شـــاری بەغدایدا دابێتو شەلم کوێرم ناپارێزم

کەوتبێتە وێزەیان. کەشـــیدەی حاجی سمایلی بە خوێنەوە لەو گۆڕەی کەوتووە، سەری لە سێ جێگاوە شـــکاوە، خوێن بە ڕیشی سپیدا دەتکێتەوە. حاجیژنیان بـــە کەزی بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشـــا، هیچ مرۆڤێکی خـــاوەن ویژدان توانای لاواندنەوەی ئەو ســـپێدە خەمناکەی نەبوو! حاجی ســـمایل دەیگوت: ئێمە چ حەرامێکمان خواردووە؟ پێمان ناوەتـــە چ ڕۆژگارێکی ناماقووڵەوە؟ هەوای چ خاکێکـــمان هەڵمژیوە خاکی بابـو باپیرانمان نەبێـــت؟ هەر لەوڕۆژەوە کە خوا دونیای ڕۆناوە، ئەو ســـەرزەمینە کوێیە وا ئێمە نابێ پێی لەســـەر دابنێین؟! خودایە توانام پێ ببەخشە ئازاری ئەو غەدرەش تێپەڕێنم!

حاجیژن، بەدەم تەکاندنی لچکە ســـپیەکەیو بەستانی بەسەرییەوە، دەنکە فرمێســـکەکانی لە حاجی دەشـــاردەوە. بەڕوونی پێیەوە دیاربوو هیوای زۆر لە چاوانی پەڵەی دابوو، شـــانازی بەوەوە دەکرد ئەو کەســـانەی تەختی زاڵمانیان وەلـــەرزە هێناوە، لە هەنـــاوی ویەوە وەپاش کەوتوونو شـــیری مەمکی ئەویان خواردووە. لە بەرخوا دەپاڕایەوە بۆ خۆی چی بەســـەردێ چ قەیدی نییە، بەس کوڕەکانی پارێزراوبنو لەو غەدرەی خەلاس بن، وەلـــێ نزاکانی، بەرلەوەی بگەنە جێی خۆیان، دەکوژانەوە!

حاجی ســـمایل، دەیڕوانییە شـــەنە چەقێندراوەکانی حوســـێنو حومێرە و کاکەڕەشی کوڕی، چۆن ڕۆژی گرتنەکە چەقاندبوویان کەس دەستکاری نەکردوون، کڵاوە سەپانییەکانیان بە بای شـــەماڵی دەخولێنەوە. حاجی بە جۆرێک تێیان ڕامابوو، وەک ئەوەی تەماشـــای کوڕەکانی بکات! هەرچەند لە حاجی سمایلت دەڕوانی، لەســـەر ڕوومەتو تەوێڵو قەڵشـــەکانی لەپی دەستی، ئایەتەکانی حەڵاڵخۆریو زەحمەتکێشـــیت دەخوێندەوە. زەمەن ئاســـەواری چەوسانەوەی

لەســـەر ڕووی جێهێشـــتبوو. ئاغا هەموو گورگەکانی خـــۆی تێبەردابوو، بەو بەیانییە تووڕەیی پەنگخواردووی خۆیان بەسەر پیرەپیاو و پیرەژنو منداڵێکدا قلْپ کردەوە.

حاجی سمایلو حاجیژن، لەنێو لرفەی شەپۆلەکانی زوڵمدا دەیانڕوانییە برینی گەرمو بەندکردنی جگەرگۆشـــەکانیان. ئاه و نزوولەی هەردووکیان چاوی کەنەفتی پڕ لە ئەســـرینیان مۆلەق مۆلەق بڕیبووە ئاسمانێ، دەستی قەڵشیو و لەرزۆکیان لەبەرخوای خۆیـــان پانکردبۆوەو دەپاڕانەوە کەوا هەقیان بـــۆ بکاتەوەو ئەو زوڵمو زۆرەیان لەسەر لابدات. بەو حاڵەشەوە حاجی بە حاجیژنی دەگوت: هەرچۆنێک بێ، نابێ کوڕەکان بەو لێدانەمان بزانن، چ لە حەپسخانە چ دوای بەربوونیشیان، نەبادا لە ڕقی تۆڵەســـەندنەوەیدا کارێکی خراپیان لە دەســـت بقەومێ، دوایی نەتوانین وەک خـــۆی لێبکەینەوە. هەرچەند دەزانم، دەموچاومـــان هەموو پێکەنین بێ، خەمی ئەو ســـبەینێیەو ئەو سووکایەتی پێکردنەمان بشارنەوە، بەڵام هەوڵ دەدەم ئەو زوڵمو سووکایەتییە لە کوڕەکانم بشارمەوە! ئاخر حاجی سمایل، دەمێک بوو لە ئازارو میحنەتدا بە پشت کەوتبوو، قۆناغێکی یەکجار دژواری بڕیبوو!

ڕۆژی دوایی، هێشتا سیوادی نەداوە، ئەو سەبەتەیەک سەپکی ئەستوور ئەســـتووری بەســـەر ســـەگەکاندا دابەش کـــرد. دوای دۆشـــینی مانگاکانو لاواندنەوەیـــان، هەریەکەو ئەنگوتکەهەویرێکـــی دایە گۆلکەکان. لەگەنێکی پڕ لـــە گەنمی بەدەســـتەوەیە، وەک تۆدەر لـــە ناوەندی حەســـارێ گەنمی بە بەرمریشـــەکەکان وەرکرد، لە تەماشـــاکردنی مریشـــکەکان کاتی دانخواردن چێژێکی تایبەتی هەبوو، هێشـــتا لەگەنە گەنمەکەی دەستی خاڵی نەکردبوو لەپڕ کچۆڵەکەی ڕۆستەمەشـــێتی ڕەحمەتی، بە هەشـــتاویو هەناســـەبڕکێ

خۆی بــە دەرگا تەنەکەکەدا دا، وەک یەکێکی بــە دواوە بێت بیەوێ بیگرێو ئازاری بدات. هێنکەبڕاو بووبوو، لە هەروشــەیەک یــەک دوو پیتی لەگەڵ هەناسەی قووت دەدایەوە قوڕگیو بۆی گۆ نەدەکرا. قسە نیوەخنکێندراوەکانی بۆ کۆنەدەکرانەوە، لەگەڵ هەر هەناسە هەڵکێشانێک دایەحاجییەکی دەگوت. دوای چەندجــار دووبارەکردنــەوەی، بە هەزار ناری عەلــی گوتی: دایە حاجی مزگێنی! داکم ئەوشــەو خەونی بینوە کوڕەکانت لە حەپسخانەی ئازادکرابوون، کاکەڕەش لەپێشەوەی هەموویان دەڕۆیشت، داکم دەڵێ خەونی من یەکاویەکەو دێتەجــێ! حاجیژن، حەزنێکو شــانازییەک لــە گیانیدا گــەڕا، یەکەم وەک ئومێدێک بەڵکو ئەو خەونە بەڕاست بگەڕێو کوڕەکانی ئازادبکرێن، دووەمیان شــوکرانەبژێر بوو کە کوڕەکانی جێی بایەخی خەڵکی هەژارنو خەونی خێریان پێوە دەبیننو خۆشەویســتی خەڵکی ئاواییو فەرامۆشــیان ناکەن. حاجیژن گوتی: خەونی خێرێ بێو بەخێرگەڕابێو یوســفی مســرێ سەددەقی لێدابێ. لەگەڵ ئەو قســانە، لەگەنەگەنمەکەی لەسەر جەواڵە نەخشێندراوەکە دانا، بە هەردوو دەستی ســەری کچۆڵەکەی خستە نێو لەپی هەردوو دەستیو هەردوو لاڕوومەتی دایە بەرماچانو ئومێدی ڕووسپیایەتی لە خوای گەورە بۆ خواست. دەســتە چکۆلەکانی گــرتو بە دوای خۆیــدا بۆ لای کولانەی مریشــکەکان ڕایکێشــا، چەند هێلکەیەکی بۆ دەرهێنا: دامێنی کراسەکەت وەک پاشۆڵی پەرانپیلی بگرە! هێلکەکانی بۆ کردە نێو کۆشییەوە. گوتی: بچۆ لەگەڵ داکتو منداڵەکانــی دیکە ئەو هێلکانە لە ڕۆنی بکــەنو بیخۆن. هەر دوو هەنگاوی مابوو لە دەرگای حەســارێ وەدەربکەوێ، حاجیژن بانگی کرد: دادەی ڕاوەســتە کچە جوانەکەم کولێرەی گەرمیش بەرە لەگەڵ خۆت! بە بووکەکانیشــی گوت:

نانو پێخۆری بۆ مامتان حاجی سمایل، بخەنە تێشتەبەرەکە، بۆی بەرمە سەر جۆخینان، شــەوی ئەوشــەو وڕێنەی کردووەو ناڵاندوویەتی بە هۆی ئازاردانی دوێنێی مشیرئاغاو پیاوەکانی، هێشتا سیوادی روون نەکردبۆوە کە جێمهێشت، دڵــم نەهات بانگی بکەم، گوتم بــا بخەوێ. ئاخر بە ناشــکوری نالێم ئەمنو حاجی ســمایل لەو تەمەنەی ئی ئەو تەقرو شەقرو ئیشە قورسانە نین ئەگەر ناچــاری نەبێت، بەڵام چبکەین ئەوە بەخــتو نێوچەوانی ئێمەیە، هەتا تین و تاقەتمان دەبەردابێ، دەبێ کاربکەینو ڕاکەڕاک بکەین، هەر پێشــڕاناگەین، هەتاوەکو ئەو ژیانە لە دار نەکەینەوە ناحەســێینەوە، وای ژیانێکی پڕ لە ژانو کولەمەرگیمان بەڕێکردو لە پشت سەری خۆمان بەجێهێشت!

گوڵاڵە، هەموو دەم بەدوای داپیرەیەوە بوو، لــێ بەهۆی ئەو کارەســاتەی ڕۆژی ڕابــردوو، کە بۆ منداڵێکی ئاوا یەکجــار تۆقێنەر بوو، نایەوێ جارێکی دیکە بچێتەوە سەر جۆخینان. لە زەینی خۆیدا وای دانابوو هەرساتێک ڕەنگە مشــیرئاغاو پیاوەکانی هەڵبکوتنە ســەر جۆخینان! ئــەوەی دوێنێ دەرهەق بابەحاجی کردیان دووبارە بیکەنەوە. بۆیە گوتی دایەحاجی ئەمن نایەم بۆ سەر جۆخینان، نەبادا دیسان لێمبدەنو سەرم بشکێننەوە. دایەحاجیش لەژێر دارتووە بەتەمەنەکەی حەســارێ، بە گوریســێک جۆلانەیەکی بۆ داخست، هەرکە بۆ پێشەوە پاڵیان پێوەدەنا وەک لە هەوادا بفڕێ دەمی دەکردەوە. تەوژمی بایەکە، پرچە ئاڵۆزەکانی بۆ دواوە شــانەدەکردو چێژی لەو بایە فێنکە دەبینی کە خۆی لە بناگوێو لاملی هەڵدەسووی.

لەو کاتەی حاجی ژن ئەســتوورکو پێخۆری بۆ حاجی ســمایلی بردە ســەر جۆخینان نانی چێشــتانێ بخوات، گوێیان لە دەنگــی بانگەوازێک بوو، بۆئەوەی

بزانن بانگەوازەکە بۆچییەو لێی تێبگەن، حاجی ژن گێشکەو سەرەندەکەی ڕاگرت: ڕەحمەت لەوەی بێت، لە بابی بێت، ئەوەی مەنجەڵو تەشــتو ســینیو هێرباری مســی هەیەو دەیەوێت سپی بکاتەوە، ســەفارچی هاتۆتە گوندی، بارو بنەیان لە سێبەری دیواری مزگەوتێ خستووە، دەزگای ســپیکردنەوەی دامەزراندووە، هەتا زووە هێربارەکانتــان بێنــن بۆتان ســپی بکەینەوە! خەڵکی ئاوایــی، هەریەکەی بە مەنجەڵی زنجیردارو تەشــتو قاپلەمەو ســینیو لەگەنو پاشــۆڵێک قاپ‌و کەوچکــەوە، وەخۆ کەوتن. ئەو بەیانییە، ڕێی هەمــوو کۆڵانەکان دەچوونەوە لای مزگەوتێ. ســەفارچییەکان، هەمبانەی کوورەدەفو دوو ســنگی ئەستووریان لە دیــواری مزگەوتێ داکوتا بۆئەوەی لە کاتی ســپیکردنەوەی هێربارەکان دەســتی پێوەبگرن. باوشــێک قەســەڵیان لەبەرپێیــان دانا هێربارەکانی لەســەر دابنێن. سەروەستا، هەمبانەدەفی ڕووەو چاڵی خەڵووزەکە دەف دەدا، بۆئەوەی هێربارەکانی لەســەر گەرم بکات. ئەو هێربارانەی قۆپاون، وەستا لەسەر سندانەکەی بەردەمی دایاندەنێو بــە ڕیتم چەکوچکوتی دەکردو ئەو شــوێنانەی خواربوون ڕاســتیان دەکاتەوەو لێوە قۆپاوەکانیان وەک خۆی مشتوماڵ دەکاتەوە، هەر بە گەرمی نۆشاترو قــەراو دەرمانی تێدەکردن، پەڕۆکێکی لەنێــو وەردەدان. ئەو مەنجەڵە زنجیردارو تەشــتو ســینیو لەگەنی گەورە، لەوانەی جێی هەردوو پێی شــاگردەکانی تێدا دەبێتەوە، هەردوو پێیان دەخســتنە نێوی‌و دەستیان بە سنگەکانەوە دەگرتو پێیان لەنێو هێربارەکان بادەداو دەسووڕاند، بە جۆرێک قوونیان با دەداو گۆرانییان لەگەڵدا دەگوت، وەک سەماکەری سەر شانۆ سووڕیان دەدا! خەڵکی ئاوایی هەریەکەو بە دیار نۆرەی خۆیەوە دانیشتووەو هێربارەکانی لە پێش خۆی داناوە. خەڵکی وا هەیە هێرباری مسیشی نییە، وەلــێ هەر بەخۆشیی گۆرانیو ســووڕدانەکە، لەوێیەو

لەلای سەفارچییەکان ماوەتەوە.

هیربارەکان، وەکو چووڕەی شیری، سپی کراونەتەوەو بریقەیان دێ، هەر دەڵێی تازە کرِدراونو نوێن، خاوەنەکانیان نایاننناسنەوە!

حاجیژنیش، تەبای خەڵکی ئاوایی هیربارەکانی ماڵی خۆیانی هەموو بردو سپیی کردنەوە، بە ئومێدی ئەوەی کاتێک کوڕەکانی ئازادکران بۆ میوانداریکردن بەکاریان بێنێت، ڕۆژی دەژماردن: چاوی داکتان کوێربێ، ڕەببی لاڵ بم ڕۆڵە! ئەوە بیستو دەیە، گیراون! ئاخر ئەو ڕۆژەی کاکەڕەشو هیدۆو حوسێنو حومێرەیان قۆڵبەست کردو بەرەو حەپسخانەی شاریان رفاندن، پاش نیوەڕۆیەکی گەرمابوو لەسەر جۆخینو لەنێو قرشەو جەنجەڕو شەنەبای، هەر بە جلی ئیشێوە ڕایانپێچان. ئەوەندەی باش بوو معاون فازڵ بە ڕواڵەتو لەبەرچاوی پۆلیسەکان زۆر توندوتیژ بوو، نمایشی معاونێکی بێبەزەیی دەکرد، بەڵام قسەو کرداری بەتەواوی لە یەکتری جیاواز بوون، هەوڵی دەدا، چۆن بەندەکانی یاسای سزادراوان نایانگرێتەوەو لەبەرژەوەندیی ئەواندایە، ئاوای دەنووسی. هێشتا هەر لە حەساری حەپسخانەی بوون، فەرهادو مام حەمەدەمین لە کەلێنی میلەی قەفەزی زیندانەکە چاویان پێکەوتن، ئای کورە خۆ ئەوە کوڕەکانی حاجی سمایلو هیدۆیە گیراون! ئەی خوایە دەبێ ئەو جارە چ بوختانێکیان بۆ کردبن! چەند گوناحن! بە ئاغایانو بەو حکومەتە زاڵمەی نایەڵن ئەو ماڵە کاسبکارە ڕۆژێک بە ئاسوودەیی دابنیشنو خەریکی مەڕداریو جووتیاری خۆیان بن! ئەوە مام حەمەدەمین ئاوای دەگوت. یەکسەر بەرەو لای میلەی ئاسنی قەفەسەکەی زیندان بە پیریانەوە چوونو پێشوازییان کردن، مام حەمەدەمین لە سەرێک بە بینینیان گەشایەوەو خۆشحاڵ بوو، لە سەرەکەی

دیکە پەرۆش بوو کە گیراونو دەستبەسەرن.

بێ ئەوەی بیر لە قسەکەی بکاتەوە بە دەنگێکی بەرز چەند جار لەسەریەک دەیگوت: یاخوا بەخێر بێن، بەڕاستی پێم خۆش بوو هاتوون، کاکەڕەش ئێرەت چۆڵ کردبــوو! کاکەڕەش گوتی: مــام حەمەدەمین پێویســتی بە دوعای تۆ ناکات، دڵنیابە زوو زوو دەمانگرنو دەمانهێننەوە ئێرە، لێرە بەدواوە وەکو گەیلان قامەی، پێخەفو کەلوپەلی حەپســخانەی نابەینەوە، چونکە هەتاوەکو ئاغا قســەیان لەلای ئەو حکومەتەی ڕەواجی هەبــێو وەربگیرێ، ئێمەمانان دەبێ لە کونجی بەندیخانە ژیان بەســەربەرین! لە دوای ئەو قســانە، بۆ دڵخۆشیی مام حەمەدەمین، کاکــەڕەش گوتی: دەمزانی بیری هیدۆو کاکمو وانت کردیە، بۆیە ئەوانیشم لەگەڵ خۆم هێناوە بۆئەوەی بیانبینی! لەنێو هۆڵەکە چاوی گێڕا بۆئــەوەی بزانێ لە زیندانییەکان کێ ماوەو کێ ئازادکراوە، چاوی بە هەمووواندا گێڕا، چاوی کەوتە ســەر مامۆستا جەمالو دوو ئەفەندییەکەی لەگەڵی بوون: ئای ئەوە مامۆستا جەمالو هاوڕێکانی هەر لێرەن! کەوابێ لە سبەینێوە لەلای مامۆســتا جەمالی دەســت بە خوێندنەکەم دەکەمەوە. بەخوای ئەو بایە لەو کونەیەوە بێتو ئاوا بڕوا، ئاغاو حکومەت هەر لەو حەپســخانەیەی خوێندنم پێ تەواودەکەنو وردە وردە دەبینە پارچەیەک لەو زیندانەی!

هۆڵەکە هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە، هەر وەک ڕۆژانی بەرێ ماوەتەوە. ئەوەی گــۆڕاوە چەنــد دەموچاوێکی نوێو زیادبوونی نووســینو تابلۆی ســەر دیوارەکانیەتی. دیارە وەک خانەخوێیەکی خانەدان مێوانێکی زۆری بەرێکردووەو پێشوازیی لە میوانی تازەش کردووە.

معاون فــازڵ، کە وەرگری یەکەم وتەی تۆمەتبارکــراوەکانو داواکارەکە بوو،

دۆسـیـیەکەی وەک خۆی لە ڕووی یاسـاییەوە نووسـییەوەو لـە بەرژەوەندیی تۆمەتبارکراوەکاندا بوو. لە ڕووی یاسـاییەوە یەکەم وتە زۆر گرنگە. مەلا شێخ محەمەد لە وتەی یەکەم نەیگوتبوو شاهیدم هەیە، ئەوە ڕەفعەت ئاغا بوو دوو شاهیدی بە ناهەقی بۆ قیت کردبوونەوە.

گیـراوەکان بە ناچاری ئانیشـکیان دایـەوەو کەلەکەیان لە حەپسـخانەی گیرکرد. یەک لە گیراوەکان ناوی عوسـمان بوو، بە عوسـە بانگیان دەکرد، لە دوای دەستگیرکردنو چیرۆکی گرتنەکەی، زیندانییەکانی هاوڕێی پاشناوێکی دیکەیان بۆ زیاد کردبوو، کە پەیوەندیی بە دۆسـییەو تۆمەتەکەیەوە هەبوو: عوسە لێدە برنجە!

عوسـە پیاوێکـی داڵەی ڕەقەڵـەی کەڵەگەتی مسریگۆشـت بـوو، وەکو کوورەچییەکانـی هەولێـرێ جەمەدانییەکی بـێ کڵاوی وەک قووچەکی قووت لەسەری دەپێچا. عوسـە ماڵی لە یەکێک لە گەڕەکەکانی هەولێرێ بوو، ڕۆژانە بژێوی ژیانی خۆیو ماڵو منداڵی لەسـەر ئەو چەرخە بوو کە بە شانی، کۆڵان بە کۆڵانی شـاری پێ لێکدەدا. نانی ڕۆژانەی پەیوەندیـی بەو هندرەوە بوو کە ئاخۆ چەندی بادەدا! هەتا دەنگی تێدابوو بانگی دەکرد: چەقۆی تیژدەکەمەوە، مقەسی تیژدەکەمەوە، سـیکاردی تیژدەکەمەوە! عوسـە ژێی دەنگی نێرانەو بۆ خانمان سەرنجڕاکێش بوو! کەم ژن هەبوو گوێی لە دەنگی عوسەی بێتو نەیەتە دەرگای حەساریو سەیری خاوەنی ئەو دەنگەی نەکات، بزانێ چ جۆرە پیاوێکە!

هیدۆ کە زانی عوسـە لێدە برنجە لەسـەر چی گیراوەو لـە بنەڕەتدا چی کردووە، خۆی لـێ نزیک کردەوەو بە نیازی ئەوەی بە گوێگرتن لەو گێڕانەوانەی عوسـەی، قەرەبووی کاتە لە کیسـچووەکانی بکاتەوە. لە نیشاندانی تابلۆکە

چێژێکی تایبەتی دەبینیو لێی تێرنەدەبوو، وەک پیشــەی ڕۆژانەی، دیســان عوســەی لە زیندانییەکانی دیکە دادەبڕیو تیی دەکردەوە بۆ ئەوەی دووبارە لە نووکەوە چیرۆکی ڕۆژی گرتنەکەی پێ بگێڕێتــەوە، چونکە بە خەیاڵ دەکەوتە نێو فەزایەکی جیاواز لە دنیای حەپســخانە. هیدۆ گوتی: دەی کاکە عوســە توخوا بۆم بگێڕەوە لەبەرچی گیراوی؟ چیت کردبوو؟ چۆن دەستگیریان کردی؟ وەک ئەوەی پێشــتر هیچ پێی نەگێڕابێتەوەو هەموویشــی لەبەر نەکردبێت! عوسە گوتی: کاکە هیدۆ بە گۆڕێ دایکم کووت لۆ دەگێڕمەوە ئەوهایە، ئەمن ئەوە چەند ساڵە لەو شارەی چەرخی چەقۆو مقەس تیژکردنەوەی بە شانم کۆڵان بە کۆڵان دەگێڕم، هێندەم چەرخ بە شــانییەوە بووە ئەو چەند ساڵەی، ئێستاش شەوان لە کاتی خەوتن وا دەزانم چەرخەکەم بە شانییەوەیە!

عوسە جارجار چاوی لەسەریەک دادەنان و هەستۆکەکی ڕادەگرت، بۆئەوەی هەرچــی جارەکانی ڕابردوو لە یادی نەبووە، ئــەو جارە بێتەوە یادیو بۆ هیدۆی، کە زۆر تامەزرۆی بیستنی بوو، بگێڕێتەوە: بە کاکی خۆم بڵێم، لە بەدبەختیو چارەڕەشــی خۆم ئەوڕۆژەی پێی گیرام، بەناخێری گیان بە ملی شــکاوم چوومە گەڕەکێکی دەوڵەمەندنشین، هیدۆ وەک تەهووووەوی بۆ حەیرانبێژ لێبداتەوە، نێوە نێــوە دەیگوت: ئێی دەی دەی! توخوا هەموویــم بۆ بگێڕەوە هیچ وەپاش مەدە! عوســەش کە دەیبینی هیدۆ هەموو لەشی بۆتە گوێ، بەوردی هەنگاو هەنگاو لە باســەکە دەچووە پێــشو ڕایەڵەکەی هەڵدەوێژنــی: بە کاکی خۆم بڵێم، ئەوڕۆژە هێندەی نەمابوو بۆ نیوەڕۆ، بە هۆی گەرماوە قیری شــەقامەکان نەرم بووبوون، لەو ســەری کۆڵانێ بۆ ئەوســەری کۆڵانێ لــە منو چەرخەکەم زیاتــر زیرۆح بــەدەرەوە نەبوو، ناچار بووم بۆ خۆپاراســتن لە تیشــکی خۆرو

گەرمای، وەکی عـــەرزم کردی کۆڵانیش چۆڵ بوو، بـــە پێچەوانەی ئەو گەڕەکە هەژارنشینانەی ڕۆژانە بۆی دەچووم کە ژن سۆندەی ئاویان بەدەستەوەیەو بە دەم قســـەکردنەوە لەگەڵ یەکتری، پێش دەرگای دەشۆن. هەتا دەنگم تێدابوو هاوارم دەکـــرد: ڕەحمەتی خواتان لێبێت چەقۆ تیژدەکەینـــەوە، مقەس تیژدەکەینەوە، ســـیکاردتیژ دەکەینەوە! لادەرگایەک بەئەســـپایی کرایەوە، ژنێکی باڵابەرزی ئەلمۆدەی چاوشین دەتگوت لە ئینسان نەبووەو ماینی بەحرییە! تیشکی خۆر چەرخەی ڕوومەتی نەئەنگاوتبوو، گرشەی ســـەری کوڵمانی گرشەی مانگیان تاڵان کردبوو. هەڵســـوکەوتو ورووژاندنی مێینانەی، غارەتی دینی ســـۆفی و دەروێشـــانی دەکرد. تۆبەکارێکم دەویســـت بیبینێتو تۆبەی نەشـــکێنێ زۆر بەئارامـــیو بەنەرمی دەرگای کردە چراخان!: کاکە ماندوو نەبی! چاویشـــی بە کۆڵانێـــدا دەگێڕا بۆ ئەوەی دڵنیابێتەوە هاوســـێکانی کەســـیان لە دەرێ نین، دڵنیابوو بۆیە گوتی: کاکە مقەس تیژدەکەیەوە؟ ئەمنیش گوتم: بەڵێ! پێیەوە دیاربوو نەیدەویست هیچی دیکە هاوار بکەم بۆ ئەوەی خەڵکی کۆڵانێ بەئاگا نەیەنـــم، نەبادا بێنەدەرێ و بەرنامەکەی لـــێ هەڵبوەشـــێ: کاکە وەرە ژوورێ لەبەرســـێبەرێ کارەکەت بکە! لەگەڵ یەکەم هەنگاوم بۆ حەســـارێ، هەســـتم دەکرد ئەو ژنە ڕووخســـاری خوێنی تێدەزاو دەگەشایەوە، دەرگاکەی داخستەوە، وەک پێم بڵێ تازە لە دەستم دەرناچی، گفتولفتی هێندە شیرینو خۆشئاواز بوو میسکو زەبادی دادەبێژت! قسەکانی ســـەرتاپایان لە گەوهەر بوون، خەفەتی دنیایان دەنیشت. لە سێبەری شەنگەبییەکەی حەسارێ، چەرخەکەی پێدانام: وەرە ژوورێ پشـــوویەکی بدە! هەرچی گوتم ئەو نەیبیست: خانم نایەمە ژوورێ، ئاوەدان بێت، ئەمن لە سێبەری ئەو شەنگەبییەی کارەکەی خۆم ئەنجام دەدەم!

بـــێ فایدە بوو، بردمییە ژووریو لەســـەر قەنەفانی دانـــام. یەکەمجارم بوو لە شوێنی ئاوا نەرم دابنیشمو ئەســـڵەن هەر قەنەفە ببینم! دیمەنی ئەو هەموو گڵۆپو ســـورەییا ڕەنگاوڕەنگانە شـــۆکیان کردبووم. بەڵام ئەو ژنە ڕەونەقێکی سەرســـوورهێنەری خستبووەسەر پرشـــنگی چراخانی ژوورەکە، بە جۆرێک لە چواردەوری خۆمم دەڕوانیو مەندەهۆش بووم لەوەی، چما خەڵکێک هەیە لەو شارەی ئێمەدا ئاوا پاشـــایانە بژی! لەوکاتەی ژنەکەی منو هەزاران ژنی دیکە، مردن هێندەی هێلکە لە منداڵەکانیان کەرتو دابەش بکەن! ئێستا دەزانم ئەو ژنانەی ئێمە بۆ پێکەنینیان بیرچۆتەوە!

هەر بە زەردەخەنەوە بەخێرهاتنی کردمو لێوی لەسەر یەکتری ترازاندو هاتە گوفتار، چ بازاڕی دووڕو یاقووتو مرواری نیشـــاندا! جامەبەفراوێکی بۆ هێنام لە شەرمان نەمدەزانی چۆنی دەست بۆ بەرمو چۆنی لێوەربگرم! هێدۆ بەجۆرێک ڕۆچووبووە نێـــو چیرۆکەکە، هەر بەخەیاڵ جامەئاوەکەی لە جیاتی عوســـەی هەڵقوڕاندو خیزی نێو زاری خۆی قووت دەدایەوە، هەروەک ئەوەی بۆ خۆی لە جیاتی عوسەی لەوێ بووبێت!

عوســـە گوتی: ژنەکە لێی پرسیم ناوت چییە؟ گوتم: خانم ناوم عوسمانە، بـــێ ئەدەبـــی نەبێ لە ڕووی تۆ پێم دەڵێن عوســـە، ژنەکە گوتـــی منیش ناوم پەســـیرەیە، هەرکە گوتی پەسیرە، زارم پڕ لە ئاو بوو، گوتم: ئەی ئەوە سەردارت یان کەسێکت لەگەڵ لەماڵەوە نییە؟ بۆچی لەو ماڵەو لەو خانووە گەورەیەی بە تەنهای؟ هەر ئەوەندەم گوت: ژنەکە برینی کولایەوەو دەربوو: منداڵمان نابێت هەر خۆشم پێم خۆش نییە منداڵم لەو سەگبابەی مێردم پەیدابێت! مێردەکەم بازرگانێکی زەنگینی ئەو شارەیە، بەهۆی دەوڵەمەندیو بەزەبری ماڵی دنیاییو

زێڕو پارەی زۆر، ئەمنی خواستو لە دەوڵەمەندییەکەی زیاتر ماڵی بابم چاویان هیچی دیکەی نەبینی، پوختە ئەمنیان لـــێ مارەکردو لەوڕۆژەوە بەدبەختیو چارەڕەشی من دەســـتی پێکرد! ئەو هاوینەی دەکاتە پێنج ساڵ ئەمن ژنی ئەو پیـــاوەم، لە مانگێ دە ڕۆژان لە ماڵێ نییـــە، لەگەڵ بازرگانییەکەیدا، خەریکی کەیفـو سەفای خۆشیەتی. جاران لە مەلهاکانی بەغدایێ بەسەری دەبرد، بەڵام ئێســـتا پیری بە بەغدا نایەتەوەو دەچێتە لوبنانو میســـرێ. بریا بە بریاداران مێردەکم هەبوایە وەکو تۆ ڕۆژ تا ئێوارێ کۆپانی حەمبالانی بە پشـــتێوە بایەو خەریکی حەمباڵی بایە، بەس شەوان هاتبایەتەوە کاولەکەی خۆی! ئەمن چی لەو بەهەشـــتەی بکەم کە هاودەمێکی بۆ من تێدا نەبێت؟! ئەمن لەگەڵ ئەو پیاوەی بێمرادو بەدبەختو چارەڕەش بووم!

قســـەکانی ئەوەندە پڕ بوون لە ئـــاوازی مێیینانە، نەبـــاتو ئاوی حەیاتی دەرژاندە نێو دڵم، نەمدەزانی نە بۆ دەستکورتیو هەژاری خۆم خەم بخۆم، نە بۆ تەنهاییو بێمێردیی پەسیرەی! هەرجارەی جۆرەخواردنێکی بۆ دێنامو هەرچەند جاری دەچـــووە ژووری خۆی کە دەهاتەوە، پارچەیەک لە جلەکانی دادەکەند، تا وای لێهات یەک ژێرکراسی تەنکی لەبەرخۆیدا هێشتەوە، بەجۆرێک زاتی ئەوەم نەدەکرد ڕوویەڕوو تەماشـــای بکەم، تەنها لەو کاتانە نەبێت کە پشتی دەکەوتە لای منو بەئەنقەســـت خۆی دادەهێنایەوە، ئەمنیش لە سمتو ڕانیم دەڕوانی. کاتێـــک خۆی قیت دەکردەوە بە تەکانێک ســـەری بەرزدەکـــردەوەو پرچی خۆی هەڵدەدایـــەوە، مردووی لە قەبری دەردێناو زیندووی دەکردەوە! جار لە جار زیاتر لە نزیکمەوە دادەنیشـــت، هەرچەندی خۆم خڕەکردەوە ئەو دەیگوت: شەرمێ مەکە بەخۆم پێم خۆشە لە نزیکت دانیشم! چاوەکانی، وەک چاوی هەڵۆیەکی

برسی دەرژاندە نێو مووەکانی سینگم، بە جۆرێک هەناسەی هەڵدەکێشا، دەمگوت: ئێستا دێتە نێو باخەڵم، وەک پێم بڵێ دە تۆش وەک من سینگت ئاواڵە بکە! ستیانەکەشی فڕێدابوو، بەحاڵ گۆی مەمکی کەوتبووە ژێر لێوی بنکراسە تەنکەکەی، پشتەملی هەتاوەکو قۆرنجی ڕووت بوو، پرچی تازە شانەکراوی داوداو وەک کەلافە ئاوریشمی خاس بەسەرشانی ڕووتیدا پەرێشان کردبوو، گرمتەی پیلی لە بەینی قژی، وەک پەنیری کوێستانان، هەڵتۆقیبوون، هەرکە دادەهاتەوە لەشکری قژی هرووژمیان دەکردو بەلایەکی ملیدا دەکەوتن، گەندەمووی پشتەملی وەک فریزی کۆرپە بەدیاردەکەوتن، زوو زوو دەیگوت: گەرمایە بۆ ئەو جلانەت داناکەنی؟ تا وای لێهات بەدەستی خۆی هەموو جلەکانی لەبەرداکەندم، خۆمم وەک باڵندەیەکی بێدەسەڵات لەبەرچنگی هەڵۆیدا دەبینی، گوتی: گەرماتەو هەست دەکەم شەرمێ دەکەی، ئێرە ماڵی خۆتە، بە هیچ شێوەیەک نابێت شەرمێ بکەی، چۆنت پێخۆشە وا بکە، لێرە ئازادی! گوتم: خانم تەواو، حەسامەوە دەبێت بڕۆم بە دوای کاری خۆمەوە، ئەوەی ڕۆژێ پەیدای نەکەم شەوێ نیمە بیخۆم. پەسیرە گوتی: ڕۆژێ چەندی پەیدادەکەی، ئەمن دوو هێندەو زیاتریشت دەدەمێ، بە شەرتێک تا ئێوارێ لە لام بیو دڵم نەشکێنی! منیش تەنهاو قسەکانی تۆم پێخۆشە، خێرت دەگات لێرە بی! وەک ئەو منداڵەی ڕقی لە خۆشووشتنێە، بۆ حەمامێ پەلکێشی کردم: دەبێت خۆت بشۆی گەرمایە، ئەها مووی سینگت پڕە لە خۆڵو تۆز! لەگەڵ ئەو قسەیە دەستی بەنێو مووەکانی سینگمدا گێڕا، وەک بە دوای شتێکیدا بگەڕێ! بەزۆری لە حەمامێی پەستامو گوتی: ئەوە تاخمەتراشو لیفکەو پەشتەمار، هەرچیت ویست بانگم بکە شەرمی ناوێ! هەرچەندی

لێم دەڕوانی ئاونگی لــەزەتو ئارەزووی لێدەتکا، ئەســپی هەوەس بەجۆرێک هەڵیگرتبــوو، بۆ دامرکاندنەوەی ئاگری دەروونی ئامادەی هەموو قوربانییەک بوو. لەو کاتە هەســتیارە، هیدۆ لێی چووەپێش، خەریک بوو بچێتە نێو زاری عوسەی، هەمیشە دەیگوت: ئێی! ئێی! ئەی دوایی؟

کاکــەڕەش لە لای مامۆســتا جەمــاڵو برادەرەکانی کە دوو مامۆســتای قوتابخانە بوون، دەفتەرو کتێبــی دەرهێنابوو لەپێش خۆی دانابوو بۆ ئەوەی دەرسەکەی بخوێنێ بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد: هیدۆ هیدۆ کاتی خوێندنە نایەی بخوێنی؟ هیدۆش وەک داوەری تۆپی پێ، بێئەوەی هیچ بڵێ و ســەیری لای کاکەڕەشــی بکات، دەستی بەرزکردەوە، واتا بێدەنگبە! چونکە چاو و گوێو هەستی وشە بە وشــە لەگەڵ گێڕانەوەی عوســەی ئاوێتە بووبوون. مامۆستا جەمال بە کاکەڕەشــی گوت: ئەوە عوســە باســی چی بۆ هیدۆی دەکاتو چ بابەتێکــی وا گرنگە خوێندنەکەی بۆ بچوێنــێ؟ یان ئەتو بڵێی تەگبیری چی بکەنو چ داڕێژن؟ کاکەڕەش گوتی: لەگەڵ عوســە لێدە برنجە، ڕەنگە پیلانی ڕووخاندنی حکومەتەکەی نووری سەعیدی دابڕێژن، بۆیە نایانەوێ سیلسیلەی ئەفکاریان بپچڕێ!

عوســە بەردەوام بوو: نێوە نێوە پەســیرە دەیگوت هیچــت ناوێ؟ ئەمنیش دەمگوت نەخێر! خۆم پشیلەشــۆرکردو هاتمەدەرێ، پەســیرە جلێکی نووستنی مێردەکەی لەســەر دەســتی بۆ ڕاگرتم، بەزۆری پێی لەبەرکــردم، ئەمنیش وەک منداڵ جلی بابی پۆشیبێ وابووم! هەر ئەو کاتی زانیم بە گوێرەی جلەکان، مێردی پەسیرەی چ نەفرەجایێکە! دیاربوو پەسیرەش پرچی ئاوی لــێ دەتکایەوەو خۆی شووشــتبوو. لە لایەک نیگەران بووم نەبادا بەڵایەکم بەســەربێتو لە لایەکی

دیکەشەوە دەمویست دڵنیایی لە پەسیرەی وەربگرم کە کەس نایەتەوە ئەو ماڵەی، گوتم: پەسیرەخان ئەی ئەگەر یەکێک هات بۆ ماڵی ئێوە، ناڵێ ئەو زرتەزەلامە چییە لێرە، ئاوا بە پانایی و بە درێژی ماڵێ دێتو دەچێت؟! پەسیرە دڵنیایی دامێ کە کەس نایەت، چونکە کەس سەراسووی ناکاتو مێردەکەیشی لە لوبنانە. ئارەزووە هاروهاجەکانی پەسیرەی، وەک شەپۆلی زێی بەهارێ هەستاوەتە سەر پاشووان، هەموو مەترسییەکان لرف و لوول دەدات! سات لە دوای سات هەوەسی زیاتر هەڵپە دەکات. پەسیرە ژێرکراسێکی تەنکتری لەوەی جاری پێشوو لەبەرکردبوو، هەر ڕووت ڕووت بوو، هەموو ئازای بەدەنی تێڕا دیاربوو. جارجار دەستی بە بەرزگی خۆیدا دەهێناو دەیگوت: سفتو سۆم لە هەناواندایەو زگم دێشی، پێموایە نێوکم کەوتییە، ئەرێ کاک عوسمان ئەتۆ پیاوێکی گەڕیدەی چۆن دەبێ لە نێوکان نەزانی؟! ئەمنیش درۆم پێ ناکرێ گوتم: نێوکی پیاوانم هێناوەتەوە، بەڵام تا ئێستا دەستکاریی نێوکی ژنانم نەکردووە. پەسیرە پێکەنی: خۆ هێنانەوەی نێوکی ژنان لە ئی پیاوان ئاسانترو خۆشتریشە، بەدەم ئەو قسە ورووژێنەرانەوە، دەستی گرتمو بەرەو ژووری نووستنی پەلکێش کردم نێوکی بهێنمەوە! لەسەر تەختی نووستنەکە لەسەر گازەرای پشتێ خۆی درێژکرد، وەک خەرمانەی دەوری مانگ دەدرەوشایەوە! ژێرکراسەکەی هەتاوەکو گەردنی هەڵماڵی، دەستم بە نێوکیدا دەهێنا، دەترسام ئەو دەستە زبرو قەڵیشاوییانە پێستی نەرمو لووسی بڕووشێنن! هەستم دەکرد تەزووی چێژێکی گەرمی بە لەشدا دێت، بە جۆرێک حەجمینی لێ هەڵگیرابوو، خەریک بوو لە ژێر دەستم بتوێتەوەو ببێت بە ئاو! کە موچڕکی خۆشیی بە لەشیدا دەهات، وەک کاریلە دەیمرقاندو گینگڵی دەدا، دەستی لەسەر دەستم دادەناو هەرجارەی دەستی بۆ لای خوارترو بەرەو مووی

مردار[١] دەخزاندم: ئێرەم بشێلە بە قوربانی ئەو دەستانەت بم! تا وای لێهات قسەی دەبزرکاندو هیچ وشەیەکی بە تەواوی بۆ گۆ نەدەکرا، لە چەند پیتێکی وەک ....، ... ئەگەر دەستم لەسەر زاری دانەنابوایە هەموو خەڵکی کۆڵانێی بەسەر دەگێڕام! بە جۆرێک زاری بە گۆمی لەزەتەوە نابوو کەوتبووە دنیای خۆیو ئەودیوی زەمەنەوە! هەستم دەکرد گلێنەی هەردووک چاوەکانی وەرگەڕابوونو لە قووڵایی دەریای چێژێکی قووڵدا مەلەیان دەکردو باکیان بە خنکان نەبوو!

لە دوای ئەوەی نانێکی پاشایانەمان خوارد، ئەمن جلەکانی خۆمم لەبەرکرد، هەرچەندی پەسیرە هەوڵیدا جلەکانی خۆم لەبەرنەکەم، بەڵام ئەمن وەک خودا لە دڵی نابم پەسیرە تا بەڵایەکم بەسەر نەهێنێ دەستبەردارم نابێتو دەستم لە یەخەی ناکاتەوە، چونکە بەو ئاگرەی تێیبەربببوو، ئامادەی هەموو قوربانیدانێک بوو! ئەمن لەدوای نێوکهێنانەوەکە زیاتر دەترسامو یەقینم دبوو تووشی کارەساتێک دەبم! ئەو هەستەشم بەهەڵە دەرنەچوو، بەردەوام چاوم لەسەر دەرگای حەسارێ بوو. لە ناکاو دەرگای حەسارێ کرایەوە، دەستێکم بە ڕستە کلیلێکەوە بینی بە سیمایەکی ئەبڵەقو نیگایێکی حەپەساوەوە لە دەروازەی حەسارێم دەڕوانی، هەر بەجارەکی لاڵ بوومو قەڵەمی دەستو پێم شکا! هەر ئەوەندە پێڕاگەیشتم هەندێک وشەی نیوەناچڵم لە زاری بەربوونەوە، بە ئاماژە دەستم بۆ لای دەرگا ڕاداشت، پەسیرە حاڵی بوو، زانی مێردەکەیەتی لە گەشتی لوبنان گەڕاوەتەوە، لەناکاو پیاوێک بە جانتایێکی گەورەوە هاتە حەسارێ، چ پیاوێک، ناوەڵا تۆ بڵێ چ نەفرەجایەک! باش بوو جانتاکەی داناو

---

١. مووی مردار: تووکەبەر، مووی بەری مرۆڤ

بانگی کرد: پەسیرە! کچێ پەسیرە وەرە ئەو جانتاو کەلوپەلانەم لەگەڵ بێنە ژوورێ. لەگەڵ ئەو بانگکردنەی پەسیرەی، خۆیشی بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەی گەڕایەوە، بۆ ئەوەی باقیمەندەی ئەو کەلوپەلانەی دیکە کە هێنابوونی، بهێنێتە خوارێ. ئەمن هەر بە ئەندازەی ئەو کراسو بێجامەیەی پەسیرە بە زۆری پێی پۆشیبووم، زانیم ئەوە مێردەکەیەتی. سەری سفر تاشیبوو، کراسێکی نیوقۆڵی لەبەربوو، ئەگەر بکۆخیبا ڕەنگە هەموو قۆپچەکانی هەڵوەریبان! پانتۆڕێکی کابۆی شینی پۆشیبوو، بە ترسێکی زۆرەوە گوتم: چیم لێدەکەی؟ پەسیرە گوتی: ترسی ناوێ بچۆ سەربانی! بە پێچەوانەی من، هیچ پەشۆکاوییێکم بە ڕووخسارییەوە نەبینی. ئای ژن، چەند لە پیاوان ئازاترن! مێردە دێوئاساکەی دووەم جانتاشی هێنا حەساریێو گەڕایەوە دەرێ. بە فرسەتم زانی، بەرلەوەی بگەڕێتەوە تیزماڵێکم دایێ بۆ سەربانی قەفەزی لیسی کۆتران. لەوێ لە لای کۆترەکان وەک هەتیوی بابمردوو، تۆقیو و لە ترسان هەڵتووتام. لە دەلاقەی ستارەی خانووەکەوە تەماشای مێردی بەسیرەم دەکرد، کتومت وەک دێوێکی زلو زەبەلاحم دەهاتە بەرچاو، زەلامێکی چوارشانەی قەبە، گۆشتی پشتەملی وەک کۆپەران کەوتبووە سەر یەخەی کراسەکەی، پێم وابوو وەکو گای خووداری بەدوای پەڕۆکێکی سووردا دەگەڕێ بیداتە بەرقۆچان. لەو کاتەدا دڵنیابووم لە جیاتی گەڕان بە دوای چەقۆی کولو مقەسی نەبڕ بۆئەوەی تیژیان بکەمەوە، ملی خۆم خستۆتە بەرچەقۆیەکی زۆر تیژترو بەپێی خۆم بە دوای مەرگی خۆمدا وێڵ بووم، ڕوح لە جێیەکی قایمەو نایەتەدەر! بەلام لەنێو حەوت کولەکاندابێت، ئەو دێوە لێمی دەستێنێت! ناخۆشترین ساتەکانی تەمەنی خۆمم ژیان دەکرد. ئەو کارە ئابڕوویەرەی من ئەنجامم دابوو، هیچ پاساوێک

هەڵناگـــرێ، خۆ ئەگەر ئـــەو دێوەش نەمکـــوژێ، هەر بـــە زیندوویی چاوان، لەحەیفانو لەشەرمان دەمرم، چۆن چاوم لەبەر کەسوکارو ناسیاوەکانم هەڵبێنم؟ بەخۆم دەمزانی توخمی چ گوناهێکم ترووکاندووەو چ شەرمەزارییێکم بە یەخەی خێزانو بنەماڵەکەمەوە هەڵواسیوە!

ئەوەی نەدەبوو بیبیســـتم، گوێم لێبوو هاواری کرد: کچێ پەســـیرە گەنمی کۆتـــرەکان لەکوێیـــە؟ دەچم بۆ ســـەربانی دانیان دەدەمێو ئاوی ســـاردیان بۆ تێدەکەمەوە. ئای کە گوتی دەچمە سەربانی، لەحەژمەتان نازانم چۆن نەمردم! وەک منداڵێـــک پیســـایی لەبنەخـــۆی کردبێت بـــە مۆنی لـــەلای کۆترەکان دواچرکەســـاتەکانی ژیانی خۆمم دەژمارد! گوێم لێبوو پەســـیرە دەیگوت: بێ خەمبە، وێڕای نەخۆشـــییەکەم بەو بەیانـــی زووە دانو ئاوم بۆ کۆترەکان داناوە، دەستت بشۆ وەرە نانەکەت بخۆ، دوایی بچۆ لای کۆترەکان، دیارە ئەتۆ کۆترەکانت لە من خۆشـــتر دەوێو پێت گرنگترن! ئەو قســـانە لـــە پێداگری مێردەکەی بۆ چوونەســـەربان کەم نەکردەوە: نانی ناخۆم هەتاوەکو کۆترەکان نەبینم، لە لوبنان خەونم پێوەدیوون، لەو خەوە کۆترەکانیان لـێ دزیبووم.

ئەمنیش چاوەڕوانی چارەنووســـی خۆمم دەکرد، لـــە بەرامبەر هەرترپەیەکی پێی کە لەسەر پلیکانەکانی دادەنا دڵی منیش دواترپەکانی خێراتر دەبوو، تاوەکو دەنگی ترپەکان نزیکتر دەبوونەوە، دڵم خەریک بوو لە سینەم دەربێ، هەر لەگەڵ یەکەم هەنگاوی بۆ ســـەربانەکە، نیگای چاوەکانی لە سەروسەکوتی من چەقی، یەکســـەر هاواری کرد: نەمگوت! ئەدی نەمگـــوت! خەونی من یەکاو یەکە. لە لوبنان خەونم دیبوو کۆترەکانیان لـــێ دزیبووم! ئەوە چیدەکەی لێرە هەی کۆتردز! بۆ پێت وایە ئەمن هێندە دەبەنگم نەزانم تۆ بۆ کۆتردزین لێرە خۆت مەڵاس داوە!

ئەوەی بیەوێ دزی لەمن بکات، هێشتا لە دایکی خۆی نەبووە!

ئای چەند بەو تۆمەتە شـــوکرو خۆشـــحاڵ بـــووم، وەک خەڵاتـــی کردبم، هەرچەندە بـــە منداڵییش دزیم نەکردووە، بەڵام بۆ من داشـــکانێکی زۆر بوو لـــە تۆمەتە ئابڕووبەرەکەی خۆم! دزی بۆ مـــن بوو بە تۆمەتێک ورەو وزەی پێ بەخشـــیم. ئەو تۆمەتی دزییە، وەک مەدالیایەکی شـــەرەف بوو بە یەخەیدا هەڵواسیم، چونکە دڵنیابووم لەسەر کۆتردزین کەس کەسی نەکوشتووە، بەڵام لەســـەر ئەو کارەی من ئەنجامم دابوو چەندین بنەماڵە یەکتریان بڕاندۆتەوە! لێم نزیک بووەوە، هەردوو دەســـتی کردنە کۆرەمســـت، ماســـولکەکانی قۆڵو بازووی وەکو هەویری هەڵاتە هەڵمســـابوونو پـــف درابوون، خەریک بوو قۆڵی کراســـە نیوقۆڵەکەی هەڵبزڕێ، دەمزانی دەستکردنەوە لەگەڵ ئەو دێوە، شەڕی خۆتڕێنە! بۆیە دەستم بە خۆمدا شـــۆڕکردنەوەو کەوتمە پاڕانەوەو گوتم توخوا ئازارم مەدە ڕاســـتت پێ دەڵێم. لـــەو کاتەی توند پشـــتەملی گرتبووم، وەک بارەکەوی گرتبێت، ڕووی ســـووڕاندمەوە لای خۆی، تفێک دەموچاوی سواقدام: دەک داوەشـــێی بەخۆشـــت دەڵێی پیاو! تەماشـــا دەڵێی پەیکەری ئێسقانی! ئێستا بە بۆکســـێک فەراقی ڕەشت لێببڕم؟ ڕۆحت لەســـەر خوای بکەمەوە! هەندێک جنێوی بۆکسوەشـــێنو چەقۆکێشـــانەیدا، وەکو: دەموچاوت بکەمە گڵۆپ، ددانـــت بکەمە خوردەو بیدەمـــەوە دەســـتت، وات لێبکەم بە گووی بڵێـــی حەلوایە! هەندێک جنێو هەر بە حەیاتم گوێم لێنەبووبوون، یەکەمجارم بوو بیانبیســـتم! ناچاربووم لەبەری پاڕامـــەوە: مەمکوژە خاوەن ماڵو منداڵمو منداڵەکانم وردن، ڕاســـتت بۆ دەگێڕمەوە. توومەز پەسیرە ئاگای لەو مرخێش مرخێشـــەی بەینی منو مێردەکەیەتیو بە فرسەتی زانیوە جلەکانی بگۆڕێو

نمایشی ژنێکی نەخۆش بکات!

پشـــتی ملی ڕاگوشـــیم: ڕاســـتم بۆ نەگێڕیەوە چی وای کرد ئـــەو کۆترانە بدزی، لێرە دەتکـــوژم! گوتم: ڕۆژانە چەرخی چەقۆ و مقـــەس تیژکردنەوەم بە شـــانێوەیە، کۆڵان کۆڵان دەگەڕێم، چاوم بەو کۆترە دەندووک کورتو پێ بەپەڕو تەقڵەبازانەی ئێوە کەوت لەســـەر دیواری ســـتارەی دەیانگماند، ئەمنیش لە دەرگای زۆرم بانگ کرد: مالێ! مالێ! کەســـی لێنەبوو، بۆیە شـــەیتان هاتە بن کلێشـــەمو ئەو کەتنەی پێکردم، توخوا ئەمن کردم ئەتۆ نەیکەی! بە دەســـتی ڕاستی پیلی چەپی گرتمو بۆ خوارێی ڕاپێچام، دوو دوو و سێ سێ پلیکانەکانی پێ دەبڕیم، دەترسام سەرەنگرێ بمو ملم بشکێ، بەجۆرێک دەیڕفاندم خۆم وەک ئەو کارمامزەی دەهاتە بەرچاو کە پڵینگ دەیڕفێنێ. لە نێوەڕاســـتی حەسارێ هەردووکمان ڕوومان لە دەرگای حەســـائ بوو، لەناکاو خولێکی پێ لێدام وەک فرفرۆک ســـووڕاندمی، ڕووم کەوتەوە بەرامبەری خۆی، دەیویست لەبەرچاوی ژنەکەی ئازایەتی خۆی نمایش بکات. دوو سێ جنێوی بازاڕیی پێدام، لەوکاتەی ڕووم کەوتبووەوە بەرامبەری دەرگای مالێ، پەســـیرە هاتە دەرێ، بەڵام نەک ئەو پەسیرەیەی نیو کاتژمێر بەر لەئێستا، کراسێکی ڕەشی بەسەرخۆیدا هێنابوو، لەچکێکی ڕەشی بەتوندی لە نێوچاوانی بەســـتابوو، هەنگاوەکانی بە دارەدارە هەڵدێنان، وەک تازە نەشـــتەرگەریی بۆ کرابێت، بەلادا دەهات، بەحاڵ پێڵووی چاوەکانی هەڵدێنا، نەغمەی قســـەکانی بەجۆرێک بوو، نەتوانێ ڕســـتەیەک تەواوبکات، لە توانای کەسدا نەبوو، پاکیزەیی فریشتەئاسای بخاتە بەر گومان، خۆی وەک ڕاهیبێکی تەرکەدنیا نیشـــان دەدا! بەحەپەساوی و سەرسامییەکەوە لـــە بنی پێیم هەتاوەکو تەوقی ســـەرم لێـــی هەڵدەڕوانیم، لە دەورم ســـووڕا بە

چاوی مانگاکرین لێم خێس دەبـــووەوە: ئەیەڕۆ توخوا ئەتۆش بە خۆت دەڵێی پیاو! کابرا ئەتۆ شـــەرمێ ناکەی بەو ســـەرو فەساڵەتەوە کۆتری ماڵان دەدزی؟ هەی داوەشـــێی‌و دارزێیت! وەک ژنەکەی نیو ســـەعات پێش ئێستا نەبێت! دیاربوو لەگەڵ ئەو قسانەی پەسیرەی، هێندەی دیکە لەگەڵم توندوتیژتر دەبوو، هەر وەک منداڵێکی بەدەســـتەوە بێت، هێنـــدەی نەمابوو پیلم لە قولقولەیرا دەربێنێ! بۆ لای دەرکی حەســـارێ ڕەتاندمی، بەئەنقەست بە دەرگای دادام‌و بە دەنگێکی بەرز گوتی: هەی ســـەگبابی کۆتردز! چاکە ژنەکەم بەو نەخۆشـــیی خۆیەوە نەیبینیوی ئەگەرنا زەندەقی دەچوو، دەڵێی پەیکەری ئێسقانی! ئێستا تەسلیمی پۆلیســـت دەکەم بۆ ئەوەی بۆ حەوت پشتت تەمبێت بکەن، تاوەکو جارێکی دیکە زاتی ئەوە نەکەی بچییە سەربانی ماڵان‌و دزی بکەی!

لەدوامانەوە شـــریقەیەک هات، ئاوڕی دایەوە: پەسیرە ئەوە چییە فرێتدا؟ گوتی: چەرخی ئەو دزەیە! چەند هەنگاوێکـــی گێڕامەوە دوواوەو چەرخەکەی پێ لە ملی کردم. دیاربوو دەیویست زۆرترین خەڵکی کۆڵانێ خۆیان بمانبینن. پێدەچوو چێژێکی زۆر لەو بەزمـــەی وەربگرێت کە بە منی دەکردو خەڵکیش ببینن چ قارەمانێکە! ڕووی لە خەڵکەکە کرد: تەماشـــایکەن، کاکی دزە کۆفی چەند قیتە! لەگەڵ ئەو قســـەیەی، جەمەدانییەکەی لەسەری کردمەوەو وەک گۆلکـــی پەت کردبێت لە ملی گرێدام‌و هەتاوەکـــو بنکەی پۆلیس ڕاینەگرتم. دۆســـییەیەکی گەورەو گرانی بۆ کردمەوە، ناویان لێنا دۆســـییەی کۆتردزەکە. ئەمن بەو تۆمەتە ڕازی بووم، دانم نا بەوەی، بەڵێ کۆتردزم!

هیدۆ بەجۆرێک نوقمی گێڕانەوەکـــە ببوو نەیدەزانی لە کوێیەو زەمانی چ پاشایەکییە!

عوســـە، بە هەناســـەیەکی ســـاردەوە گوتی: ئەوەی ئازارم دەدا، ئەو کۆترە بەستەزمانانەن، بێئەوەی داواکراو بن یان داواکەر، هەموو دانیشتنێکی دادگا لەسەر دۆسییەکەی من لە قەفەسێک بە دەست پۆلیسێکەوە، لە ژووری دادوەر ئامـــادە دەکرێن، تاکو دادگاییەکە تەواودەبێت، ئەو کۆترانە بە هەر چواردەوری خۆیانـــدا دەڕوانن، لەو دادوەرو ئاوقاتو پۆلیـــسو تۆمەتبارانەی نێو هۆڵەکە دەڕوانـــن، بێئەوەی گوناهێکیان کردبێت. پێموابوو کـــە لە یەکتریان دەڕوانیو دەندووکیان دەبردە بناگوێی یەکتـــری، دەیانگوت: «ئەوەیە نەکردیو نەخوردی لە سمێڵان مەیی!»

چەرخی چەقۆو مقەس تیژکردنەوەکەش هەموو جارێ لەسەر مێزی بەردەمی دادوەر لە دادگا ئامادە دەکرانو لەسەری نووسراوە ئامرازی فریودانی هاوولاتیان بۆ دزیکردن. ئاوقاتەکان دەڵێن باری تاوانەکەت قورستر دەکات کە ئامێری کاسبیت بۆ چاوبەستەکێی خەڵک بەکارهێناوە. عوســـە گوتی: ئەوە چەندجارە دادگا ئەو دۆســـییەیەی منی پێ یەکلایی ناکرێتەوەو چارەنووســـی خـــۆم نازانم. بەرلەوەی پەســـیرە ئەو کەتنەم پێ بکات، ناوم عوســـمان بوو و بە عوسە بانگیان دەکردم، لە دوای ئەو گوناهە کەبیرمە، لە حەپســـخانە هـــاورێ زیندانییەکانم پێم دەڵێن عوسە لێدە برنجە! خەبەرم هەیە لە دەرەوەی حەپسخانە لەنێو خەڵکو خزمەکانم ئەوانەی زانیویانە لەســـەر کۆتردزین گیراوم ناوم بۆتە عوسە کۆتردز، هەتا دەمرم نازانـــم چ پەندێکی دیکەم بەســـەردێو ڕۆژگار لەو چەرخو خولـــەی بە کوێمدا دەداتو خەڵک دەمکەن بە چیو چ ناوێکی دیکەم لێدەنێن!

هیدۆ دەیگوت: کاکەڕەش لـــێ نەگەڕا بە چاکی گوێ بدەمە قســـەکانت، دەبێت ســـبەینێ لە نووکـــەوە بەوردی بـــۆم بگێڕیەوە. دەیوســـت گێڕانەوەی

سبەینێشی لەسەر بکات بە مال! لەناکاو توورەیی عەبدۆی مراقیب هەموو بەندییەکانی بەئاگاهێنا: زووبن نانخواردنە! بەدەم نانخواردنەوە هیدۆ گوتی: کاکەڕەش ئەمن لە بەندیخانەی ئازادبکرێم، مالم دێنمە شاری، یان چەرخی چەقۆو مقەس تیژکردنەوە دەکڕمو کۆلان بە کۆلان دەگەڕێم، یان دەبم بە تەنەکەچیو وەستای پرێمزو سۆبەو فانۆس چاککردنەوە. کاکەڕەش دەیزانی هیدۆ کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو چیرۆکەی عوسە لێدە برنجەوە: بۆ شێتە پێتوایە لە «هەموو هەوران هەر بارانە!»، ئەو بەرنامەیەی لە مێشکت دەرکە، ئەمنو تۆ زۆر کاری گرنگمان وەکو ئەرکێک لەسەرشانە، دەبێ بەیەکەوە تەواویان بکەین، ئەمنو تۆ بەلێنو پەیمانی برایانە لە بەینماندا هەیە، ناکرێ خاوەنی بەلێنی خۆمان نەبین، خەلکی هەژار چاوەڕوانییان لە ئێمە هەیە!

هەرچەند جاری دەیانبردن بۆ داداگاییکردن، بە کەلەپچەو زنجیر لە یەکتریان دەبەستن، خەلکی شاری ئەوانەی لە سەر ڕێگای دادگا بوون، لە هەردوو بەری شەقامەکە تێیان ڕادەمانو هەریەکەو بە کەیفی خۆی تۆمەتێکی پێ هەلدەواسین. لە دوای چەندجار دادگاییکردن، شەشەم دانیشتنی دادگا، کاکەڕەشو هیدۆو حوسێنو حومێرە هیچیان لەسەر ساغ نەبۆوەو شاهیدەکانی مەلا شێخ محەمەدی کە ڕەفعەت ئاغا بە کرێی گرتبوون، وتەکانیان یەکتری نەدەگرتەوەو دژ بەیەکیی زۆر تێدابوو، هێزی باوەڕپێکردنی لەلایەن دادگا زۆر لاواز بوو، یان هەر نەبوو، بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا، شاهیدەکان پالنەرێکیان لەپشتەوەیە، دەنا دوورو نزیک ئاگایان لە ڕووداوی ئەوشەوە نییەو شاهیدیەکەیان بە ناهەقەو بەهۆی نەبوونی بەلگەی کاربڕ، دادوەر هەرچواری ئازاد کردن.

ئاغاکان ئەو هەموو زولمو زۆرییەیان بە ڕۆژی ڕووناکو بە بەرچاوی

خەڵــکو حکومەتەوە بە ئاشــکرا ئەنجــام دەدا، کرمانجەکانی هاوشــێوەی ڕۆستەمەشــێتیان دەکوشــتو خەڵکیان، وەک حاجی ســمایلو منداڵەکەی نێو لانکێ، برینــدار دەکرد، کەچی تاقە یەک ڕۆژ نەدەگیران، کرمانجەکانیش داوایان تۆمار نەدەکرد، چونکە دادگایان بە دادگای ئاغایەکان دەزانی، لەبەرئەوە نەبوو کە ڕقیان لە یاســاو دادگا بێت، دەیانزانی تەرازووی دادگا لاســەنگە، لە بنچینەشــدا هەروابوو. بەپێچەوانەوە ئاغاکان، دادگایان بە بەشێک لە خۆیان دەزانیو لە دامەزراندنی دادوەرەکاندا ڕۆڵیان هەبوو، بۆیە بۆ هەموو ڕووداوێک پەنایان بۆ دەبردو بۆ ســەرکوتکردنی کرمانجەکان، بە تایبەتی ئەوانەی لە دژی چەوسانەوە یاخی دەبوون، بەکاریان دەهێنا.

تاوەکو جۆخینیش لە گۆڕێ هەڵگیرا، حاجی سمایلو حاجیژن کارەساتی ئەو بەیانییەی گۆرینی سەرجۆخینانیان لە کوڕەکانو لە هیدۆی شاردبۆوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا پەرچەکردارێکی توند نیشــان بدەنو خۆیان پێ بەرزەفت نەکرێ. هیدۆ، لە ڕێگای خزمەکانی خۆی، بەر لە هەموویان بەو لێدانو سووکایەتییەی زانیبوو، کە لەلایەن مشــیرئاغاو پیاوەکانی، بە هەنجەتی شەقرشــکاندن، بە حاجیو حاجیژن کرابوو، بۆیە، هەمیشە بۆ ڕۆژی خۆی لێوی لێدەکرۆشتن!



# ١٦

جۆخین لە گۆڕێ نەمان و تارمەکایەکان لە لەودان کران، شـــەرتی شـــوانان نوێکرایەوە، دواین بارەگەنمو ڕەشکەکا کێشرانەوەو داکران، قوڕە گیراوەکان شەوی بوونەوە بە هەرەوەز هەرجارەی ســـەری خانوو و هۆڵەمەڕو لەودەی کاو ســـەری چاڵی گەنمی ماڵێک ســـواق دەدرایەوە. هەر بابایە لە ژنو پیاو وەک مێرووله تفاقو پێداویستییەکانی زستانیان دادەکەنو تاقەت دەکەن، مەشکەو دۆدانو کوندە هەڵگیرانەوەو بە بنمیچی ژوورەکانەوە هەڵواســـران، جەنجەڕو شـــەنەو داسو قەیناغو قەرانگـو شـــەغرە هەڵگیرانەوە، گاســـنو هەوجاڕو نیرو بنملو بارێنەو هەموو ئامێرەکانی جووتکردن هێندرانەوە بەردەســـتانو ئامادەکران بۆ ئەوەی لە دوای یەکەم بارانو نەرمبوونەوەی زەوی، دەست بە شۆبڕین بکەنەوەو تۆدەر گەنمو جۆیان تۆداوە، وەردەکان کێڵدراون، واتە تۆکراونو چاوەڕوانی بارانی پەڵەن، ئاخوڕ نۆژەن کراونەتەوەو کیژی مارەکـــراو گوازراونەتەوە، جوجکە قازو جوجکە قەلی بە نیوەیی، دابەشـــکراون، شانە هەنگوین بڕاونەتەوە، چیغ لوول درانو گوریســـەکان هەڵوێزندران، ئەوانەی جلیان دڕابوو پۆشتەکرانەوە، کەندوو لێوڕێژی ئارد کرانەوە، داندۆکـو ساوەرو برۆێشو پیرخەنیو گەنمەکوتاو لەنێو هەمبانـــان ئاخێندران، هیزە، پـــڕ ڕۆنی زەنگ کران، خەتی دامەو نۆڕســـکانێ

نوێکرانــەوە، کاوڕەنێر پشــتیان ڕەنگ کرا، ڕســتی تاژی هێــنراوە مەیدانێ، ئەندامانی خێزان پۆشــتە کرانەوە، گوێسوانەو سوولاوکە ئاوەڕۆی بانەکان نۆژەن کرانــەوە، جغزی گۆڕی قاشــوانێ خەتدرانەوە، دەلاقە باکێشــەکانی هاوینە بە قوڕێ گیرانەوە، ژنەکان توورەگەی کتێبەکانی منداڵانیان تەقەڵدایەوە.

ڕەفعــەت ئاغا هاتــە دیوەخانێ، بــە بینینی ئاغــای، هەموویان یەکپێ بڵند بوون، غرمەی لەبەرهەســتانی ڕەفعەت ئاغــای، وەک ئەوە وابوو لەناکاو مێگەلەمــەڕ گورگ لێیدابێ‌و بڕەوێــتەوە! لە دەرەوەی دیوەخانێڕا هەســتی پێدەکرا. مەجلیس دڕیداو دیوەخان خرۆشــا، لای سەرەوەی دیوەخانێ بۆ ئاغای چۆڵ کرا. هەموو ئەو قسەوباس‌و چیرۆک‌و شۆخی‌و لاقرتێیەی لەگەڵ یەکتریان دەکرد، بە جارەکێ داخران‌و پچڕان، وەک ڕادیۆ بووبن‌و یەکێک کوژاندبنییەوە! دەست لەسەر ســینگ هەموان پێکەوە بەخێرهاتنی ئاغایان کرد، بەڵام ئاغا، هەروەک لەگەڵ ئەویشیان نەبووبێت، مێش میوانی نەبوو بۆ وەڵامدانەوەیان! ڕەفعەت ئاغا، دووجار کۆخەیەکی دەستکردی گەورەپیاوانەی بۆ کردن‌و دەنگی خۆی ســافکرد، وەک بیەوێ شەکرێک بشکێنێت: دەروێش فەرحان! بۆ چەند ڕۆژە دیــار نی بێیتــە دیوەخانێ؟ خۆ کوڕەکانی حاجی ســمایلی لە بنگوێیان نەخوێندووی‌و کاکەڕەش ئایەتی شەیتانی فێر نەکردووی؟ فەرحان گوتی: ئاغام خۆش بێــت دوور لە ڕووی جەنابت، خێزانم نەخۆش بــوو، بۆیە نەهاتوومەتە خزمەتتــان. ڕەفعەت ئاغا گوتــی: ژنەکەت چ خێریەتــی؟ دەروێش فەرحان بە شــەرمەوە گوتی: ئاغام خۆش بێت منداڵمان بــووە. ڕەفعەت ئاغا گوتی: کوڕتان بووە یان کچ؟ دەروێش فەرحان بــە خەجاڵەتییەوە گوتی: کارەکەرێکی جەنابتمان بووە. ئامادەبووانی دیوەخان هەســتیان دەکرد دەروێش فەرحان ئەو

کچ بوونەی پێ کەسری شانە. ئاخر لە نیشتیمانی سمێڵبابڕەکان تەنها حیلەی ئەسپەگون[١] ڕەواجی هەیە!

وسووی سەرکار بە شانازیو سـینگ دەرپەڕاندنەوە چووە بەردەمی ئاغای راوەسـتا، وەک لە جەنگێک سەرکەوتنی بەدەسـتهێنابێت: ئاغام خۆشبێت! ئەمن نۆکـەری تۆم پێدەڵێن، ژنەکەم کوڕی بووە! ڕەفعەت ئاغا ئەو قۆشـمەو مەزاقانەی پێ خۆشـەو دەیزانی وسـووی سـەرکار لە ڕووی جەستەییەوە لە دەروێش فەرحانی بەهێزترەو دەروێش فەرحان باشاری نابات، بۆیە گوتی: دەبێت وسوو و فەرحان خینگەملانێ[٢] بکەن، ئەگەر وسوو دۆڕاندی نیو عەربەگەنمی بداتە فەرحانـی، ئەگەر فەرحانیش دۆڕاندی، ئەو کچە هەشـت ڕۆژییەی لە کوڕە دە ڕۆژییەکەی وسـووی مارەبـکات! دەروێش فەرحان وەک جامی ژەهری بە زاریدا بکەن! بەڵام ناچارەو ناتونێ قسـەی ڕەفعەت ئاغای لەو مەجلیسەی بشـکێنێ! پشـتێنیان لە ملی هەردووکیان خسـت، ڕکابەری دەستی پێکرد، دەروێش فەرحان هەندێک خۆی چیڕکردەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی ڕکابەرەکان زۆر نابەرابەربوو، بۆیە فەرحان باشاری وسووی چەلاوخۆری دیوەخانی ئاغای نەکردو دەروێش فەرحانی لە شوێنی خۆی هەڵقەندو هەتا بەردەرگای دیوەخانێ بەدوای خۆیدا ڕایکێشـا. وسوو گوتی: نۆکەری ڕەفعەت ئاغام دەرێنێ، ئاغام خۆشبی

---

١. ئەسپەگون: لێرەدا کینایەیە بە کۆمەڵگەی نێرسالاری.

٢. خینگەملانێ: یاری و پێشبڕکێیەکە لە مابەینی دوو کەسدا بە پشتێند دەکرێ. هەریەکەیان سەرێکی پشتێندەکە بە گرێبەرانی لە ملی خۆی گرێ دەدا، ئینجا لەسەر چنگان هەریەکەیان بە لایەکدا دەڕۆن و یەکتری ڕادەکێشن، کامەیان توانی ئەوەی دیکە بە دوای خۆیدا ڕابکێشێ، ئەو بە براوە دادەنرێ.

ڕایبکێشم هەتاوەکو ماڵی خۆیان؟ ئاغا گوتی: لێیگەڕی دۆڕاندی ئەوەندە بەسە! هەر بەوشەوە بانگی مەلایان کردو کچە تەمەن هەشت ڕۆژییەکەی دەروێش فەرحانیان لە کوڕە دە ڕۆژییەکەی وسووی سەرکاری ئاغای، مارەکرد. مەزاقو پێکەنینی ئەوشەوەی ڕەفعەت ئاغاو خەڵکی دەوروبەری، کەوتەسەر دەروێش فەرحانیو گاڵتەپێکردنی لە دۆڕاندنی کچەکەی! فەرحان کچەکەی زۆر خۆشدەویست، بەڵام نەیدەتوانی لە قسەی ڕەفعەت ئاغای دەربچێتو بێ فەرمانی ئەو بکات!

گەڕایەوە ماڵێو، لەحەیفان چەند شەو و ڕۆژێک لەسەر چاوان کەوت! لەبەرخۆیەوە دەیگوت: قەیناکە هەموومان دەزانین ئاغا زاڵمە، بەڵام ئەوەی سەیرە، مەلای گوندی چۆن ئەوەی قەبووڵ کرد گرەو لەسەر چارەنووسی دوو مەلۆتکە بکرێت، کە بە هەردووکیان تەمەنیان هەژدە ڕۆژە؟ ئەوە چ دینێکە ئەوە قەبووڵ دەکات؟!

هەموو شتێک لەو ماڵەدا بۆنی دۆڕانی لێدێت، شەرمەزاری، ڕەنگ و ڕووی تەڵخ کردووە، زۆر گران بوو گوتنی یەکەم ڕستە لە بارەی ئەو دۆڕانە، لە وەها دۆخێکدا نەزانێت چۆنو لە کوێوە دەست پێ بکات، هەوڵی دەدا حەسرەتەکانی بشارێتەوە، بێئومێدی لە سیمای دەباری. لە بەرامبەر ژنەکەی نمایشێکی درۆزنانەی پێشکەش دەکرد. لە داکەوتنی شانەکانیو وشکبوونی قوڕگو زاری وەک ئەوە وابوو قورسایی شەرمەزاریی هەموو دنیای لە کۆڵ نابێت. ڕەنگی پەڕیوو و ڕوانینی وێڵ، نیگای پەرتوبڵاوی لەسەر خاڵێک، لەسەر شتێک دانەدەوەرایەوە، بە تەواوی دەستی لە باوەڕبەخۆبوون بەردابوو، هەتاوەکو بیری لەو دۆڕانە دەکردەوە، زیاتر وێران دەبوو، ئاخر یاریکردن بەسەر

نویشتی مرۆڤێک، تاوانێکی نەبەخشراوە!

کوڕەکانی حاجی ســـمایلی، لەوکاتەی وەرزی ئیشـــوکاری کشتوکاڵ ڕوو لە کەمی دەکات، دەســـتیان ئاوەڵا دەبێت بۆ ڕاوێ. هەمیشـــە تاژیی مامزکوژیان هەیـــەو تاژییەکانیان لە دەشـــتی هەولێرێ بە تایبەتی بەرڕێـــی، بەناوبانگە. کەموایە بچنـــە ڕاوێو کە گەڕانەوە کەروێشـــک یان مامزیان بە ســـامۆتەی زینی ئەسپێوە نەبێت. لەگەڵ زۆرێک لە ڕاوچییەکانی ناوچەکە برادەرایەتییان خۆشـــە. لە سیساوەیرا حەسەن سیساوە لەگەڵ برادەرێکی خۆی، میوانی ماڵی حاجی سمایلی بوون، بیستبووی حومێرەی کوڕی حاجی سمایلی، حەیرانی زۆر بەجێو ڕێو بەسۆز دەڵێو دەنگیشی زۆر خۆشە، لە ناوچەکە وەک حەیرانزانێک ئەژمار دەکرێـــت. حومێرە وەک خانەدانێکی خانەدان میواندارى میوانەکانی کرد، بۆ دڵخۆشـــیی میوانەکانی، بڕیاریاندا سبەینێ لەگەڵ چەند ڕاوچییەکی دیکـــە، ڕاوی خۆیان لە بناری زوورگەزراوی دابەخشـــن. بەیانی لە ناوبەندانی زووری، دوو کەروێشـــکی یـــەک لە دوای یەکیان دیاردی کـــرد لە گەرمەلانێ، تاژیە چوارپـــەل بەخەنەو گوێ بەڕیشـــۆرەکانیان، هەردوو کەروێشـــکەکەیان لە عەرزێ داو بە ســـامۆتەی زینیان وەکرد. بۆئـــەوەی میوانەکان بە ناوچەکە ئاشنا بکەن، لەو دەشـــتە پانو بەرینەی هەولێرو گوندەکانیو بیرو ئاو و چیای قەرەچووغیان دەپرســـی، لەو کاتەی لەسەر زوورگەزراوی دانیشتن جغارەیەک بکێشنو پشووەکی بدەن، بەدرێژایی ئەوڕۆژە حەسەن سیساوە لە ناوی گوندەکانو شوێنەکانی قەراو بیری ئاو و ڕووبارو ڕێگاکانی دەپرسی.

حەسەن سیساوە لە سەر تۆقەرەی زوورگەزراوی دەستی لە بنگوێی دەنێو بۆ یەکەمجار ئەو حەیرانە بەسەر دەشتی کاکی بە کاکیی هەولێرێدا شۆڕدەکاتەوە:

لەگەڵ کۆمەرەکێ برادەران،
ڕاوێ خۆمان داوێشتەوە داری شەکرانێ،
ئاوی بن بەردی
گەلی برادەرینە ڕاوێ خۆمان باوێنە قەرەبێتكو قەرەبۆتكان،
سەری بێژینگ بەسەری، هەورازی قەرەما بستیێ کووڕەکە...
بەینی دووسەرەو پیرداودی،
ئاقاری ترپەسپیان،
دەو ڕووباری گردلانکەی سەری گردی
چەڵتووکی بیرێ حاجی ڕەحمانی عاڵلای،
جێ لیفکەشۆڕو گەردنزەردان!
حومێرە دەستی لە بنگوێی نا:
نازانم بە کێندەرێدا هەر برێم،
دەمگۆ زەینێ خۆ بدەنە ئەستوورایی دارکەران،
گەیشتە گەروێ سەنگەران،
مارێ بابی حەیرانێم لێناپەڕییەوە لە کەندێ باشتەپەی
شۆڕبۆوە لە زوورگەزراوی،
دەیگرتەوە تەنگانەی جاستانێ،
قوناوی گورگەی، سەرچاوەی ئاوێ شەعەلی،
بیری مەحمودی سەنان،
سەر ڕێی کۆچباری مامەسێنییان،

**چەندە شیرین بوو زەینێ خۆم دەدایێ**
**هەریاندەداوە لە کۆراو و چەغەران.**

لە ناوبەندانی زوورگەزراوی، هەرکە ڕاویان بەتاڵ کرد، کاکەڕەش جڵەوی ئەسپی وەرسوڕاندەوە بەرەوئاوایی، ڕکێبی لێداو تەقرەکوت[1] بۆ ماڵێ، تاوەکو دڵنیابێتەوە ئامادەکاری کراوە بۆ دامەزراندنی میوانەکان.

حاجی ســمایل و کوڕەکانی تەنیا لە خەمی ئەوەدا نەبوون نان و چێشت بۆ میوانەکان ئامادەبکەن و جێوبالینگانیان گەرم بێت بۆ خەوتن، یان وڵاخەکانیان ئالیــک بدەن و شــوێنی حەوانەوەیان بۆ دابین بکــەن. بەڵکو بە پلەی یەکەم لە خەمی ئەوەشــدابوون جێی خەوتنی میوانــەکان بەرامبەر دەلاقەو دەرگای نەبێت و شــوێنەکەیان گولله نەیگرێتەوە، نەبادا لەوشەوەدا ئاغاو پیاوەکانیان هەڵبکوتنەســەریان و بیاندەنە بەردەســترێژی گوللــە و میوانێک بپێکرێ. چونکە وەک خانەخوێ ئەوەیان بەشەرمەزاری دەبینی بۆ خۆیان. هەموو جارێ حاجی ســمایل بە کوڕەکانی دەگوت میوان عەزیزەو خۆشەویســتی خودایە، ئەرکە لەسەر شانتان وەکو گلێنەی چاو پارێزگارییان لێبکەن، بەجۆرێک ئەگەر گولله بۆ میوانەکان بێت، دەبێ سینگی خۆتانی وەبەرنێن!

ڕاستە کە دەڵێن مارانگەستە لە گوریسی ڕەشبەڵەک دەترسێ. لەوشەوەوە کە ڕۆستەمەشــێت لەبەردەرگای حەســاری ئەوانْ خەڵتانی خوێن کراو لەسەر ڕانی کاکەڕەشــی گیانــی دا، کاکەڕەش خۆی بەرپرســیار دەبینــی بەرامبەر خوێنی ڕۆســتەمی، بۆیە هەموو هەوڵی خۆی دەخســتەگەڕ تاوەکو دووچاری

---

١. تەقرەکوت: بەغار، یەکسەر.

شەرمەزاریەکی دیکە نەبێت، بەرلەوەی شەرمەزاریی خوێنی ڕۆستەمەشێتی بشواتەوە!

هەر لە ماڵنووســـتنان هەتاوەکو مەلای ئاوەدانـــی بانگی بەیانی فەرموو، کاکەڕەش لە حەســـارێ، بۆ ســـەلامەتی میوانەکان، ئێشکی گرت. ئەوکاتانەی ئاوا بەتەنیا دەبوو، بەگژ فکرو خەیاڵەکانی خۆیدا دەچوو، بەتایبەتی نەخشەی ئەوکارانەی، خۆی لە بەرامبەریاندا بە بەرپرســـیار دەزانی و، بەر لە دەسپێکی هەرکارێـــک، بەوردی لە هێڵەگـــی دەداو پیلانی ژیرانەی بۆ دادەڕشـــت. ئەو بەیانییـــە، لەنێو خەیاڵـــی تۆڵەکردنەوەیەکدا، بە بانگـــی کەڵەباب ڕاچڵەکی، ئاخـــر دەمێکە کاکەڕەش دان بەجەرگی خۆیدا دەگرێ، بۆ ئەوەی تۆڵەی خوێنی ڕۆستەمەشـــێتی لە ڕەفعەت ئاغـــای بکاتەوە. بۆ ئەو مەبەســـتەش، لەگەڵ هاوڕێیەکانی ئامـــادەکاری وردی کردووەو لە ئانو ســـاتی جێبەجێکردنی دان، بۆئەوەی ویژدانیان ئاسوودەبێت بەرامبەر ڕوحیانەتی ڕۆستەمەشێتی.



# ١٧

پاشـــنیوەڕۆی ڕۆژێکـــی پایزیـــی خۆڵەمێشـــییە. پایـــز، جێی بـــە ڕۆژە گەرمەکانـــی هاوینێ لەق کـــردووە. ســـێبەری هـــەورەکان بەخێراییەکی زۆر لـــە هەورازو نشـــێو و گردۆلکەکان بە دوای یەکتـــردا وەک تارمایی ئاوا دەبن، هێندە بە هەرەداوان[١] بەرەو کوێستانێ هەڵدەکشان، هیچیان لەسەر هیچیان ڕانەدەوەســـتان، وەکو هەزاران تارمایی لە کەرنەڤاڵێکی گەورەدا هەڵدەستانەوەو ئامبازی یەکتری دەبوونو لێک جیادەبوونـــەوەو تێکەڵاوی یەکتری دەبوونەوە، هەورە ڕەنگ پەڕیوەکانیشـــیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشـــا! جارجار لە کەلێنی هەورەکان تیشکی ئاڵتوونیی خۆر، ســـەرەتاتکێی لەگەڵ دارو درەخت و خاک و بوونەوەرەکانی ســـەر زەوی دەکـــرد. لەو کاتەی هـــەورەکان پەرتەوازە دەبوونو دووبارە ئاوێزانی یەکتری دەبوونەوە، زەوی بە ســـیماییێکی ئەبڵەقو حەپەساوەوە لە کەرنەڤاڵی هەورەکانی دەڕوانی.

شـــەنگەبییەکەی حەسارێ وەک خاتوونێکی شـــۆخو شەنگ، قژی زەردی شانەو داوداو پەرێشان کردووە. لە حەیف و حەیبەتی ئەو هەورە سەرشێتانەی،

---

١. هەرەداوان: هەڵەداوان، بەپەلە، بەهەشتاو.

بەری ئاسمانو ڕووخساری خۆریان گرتووە، پەرچەمی زەردی دەوەراند!

لـــە پەرپەرۆچکەی ئاســـمانێ قازو قورینـــگو مراوی وەک لەشـــکرێکی ڕێکخراو، پۆل پۆل ئاســـمانیان خستۆتە ژێربالّی فڕین و بەرەو ئاقاری گەرمەسێر خلـــۆر دەبنەوە. چەند گەردەلوولێکی خـــاو و خلیچکو چکۆلە، لە پەنای دیوارو شـــوێنە لاپایەکان لوولیان دەخواردو ســـووڕیان دەدا. قەلقەلاشکو سووڕناتکو پشیلۆکەکان دەستی خرپنی کچۆڵەکانی ئاواییان گرتووەو وەک خەرمانەی مانگ جۆخینەیان بەســـتووە، یاری حێللانێ دەکەن. ئەو کچەی لە هەموویان هەراشتر، ئەو گۆرانییەی دەگوتو ئەوانی دیکەش بە حێللانێ، بۆیان دەسەندەوە:

**هە چەرمە چەرمە چەرمە... حێللانێ**
**حەز لە بووکێ خۆ شەرمە... حێللانێ**
**بوکم دیت حەلللارم دیت... حێللانێ،**
**لەگەر وسووەلارم دیت... حێللانێ،**
**وسووەلاری دووگردی... حێللانێ،**
**چەندم هێنایی‌و بردی... حێللانێ،**
**لە برای خۆم مارەکردی... حێللانێ،**
**مارە مارە هەربەزە... حێللانێ،**
**بە سنجاقو بە دەرزە... حێللانێ،**
**سنجاقۆکەی زێڕینە... حێللانێ،**
**بوکێ مە چاوی شینە... حێللانێ**

کە چاویان بە ڕیشــی ســپیی پەشــمەکیی گوڵەجووتیارە کەوت، لەشەرمان بازنەی حێلانێیان بەرداو خۆیان لە پەناو پەسێوان پەستاوت و شاردەوە. دەیانزانی سرووشـت چیدی دەسـتیان ناگرێ لە دەرەوە یاری بکەن! بەرگی هەژاری دڕا، دارو بـەردو عەرزو باڵندەی کێویو ماڵی و ئاژەڵـەکان ڕەنگیان گۆڕاوەو ڕەنگی پایزیان گرتووە. چەند نمەبارانێک بۆنی زەوییان گۆڕیوە، مارو مێروو لە کونو درزان خزاون، بڕکـو کارکەتەماتە سـەرما لێیداون. کارکەتەماتە شینەکان بەزەبری نێو (کا)ی نەبێ، سوور نابن. بێستان بەردرانو مەڕو ماڵاتیان تێبەردرا. زوورگەزراو، ڕەنگی حۆڵەمێشـیی گرتووە. گوڵەجوتێرە گوڵێکی تاقانەیە، لە پایزان دەپشـکوێ، لە قەراغ ڕێگاو سەرتخوویەکان سەریان وەدەرناوە. مێشهەنگوینەکان دەکەونە حاڵی خەڵوەتکێشـانەوە، لەنێو خەڵێفەکانیان دەرگا لەسەرخۆیان دادەخەن، تۆودەر لە ئاقاری بڵاودەبنەوە، هەریەکەی لاتێکی[1] داوەتە بەرخۆی. شوانو گاوان شەرتیان نوێ کردۆتەوە، سـەری دواییین لەودەکای گوندی سـواق دران، بووکگواسـتنەوە دەستی پێکرد. ڕۆژ، هێدی هێدی لە کورتییان دا.

کاکـەڕەش دەمێکە چاوەڕوانـی ئەو وەرزەیە کە خەڵکـی ئاوایی چیدیکە سـەرما ڕێ نادات لەدەرێو لە سەربانو سـەکۆی نێو حەسارەکانیان بخەون و، دەخزێنە ژووران. نیازمەندی تاریکەشەوێکی نمنمەی بارانبارە بۆنەوەی وەباڵی ڕۆستەمەشـێتی ڕەحمەتی لەسەرشـانی خۆی سـووک بکات. هێندەی ئەو تاریکەشەوانە خۆشدەویست، هەر بەڕاسـتی ڕەنگی شەوی گرتبوو! دیارە ئەو

---

١. لات: ١) کەسێکی بێچارە، بێماڵ، لاکەوتەو دەستەوستان. ٢) تیلمە زەوییەکی کشتوکاڵی کە ڕووبەرەکەی نزیکەی ٤٠ مەتر پان و ٨٠ مەتر درێژە. لێرەدا مەبەست دووەمیانە.

کاتەی لە دایک بووبوو، دایی‌و بـــاب نەیانزانیبوو ناوی لێبنێن، ئەگەرنا دەبوو لەجیاتی کاکەڕەش ناوی شەوگەڕ بووایە!

هەرکات تاریکایی بە دونیا وەردەبوو، ئەو دەبوو بە پاشـــای شـــەو، جڵەوی بڕیارە ســـەختەکانی دەکەوتنە دەســـت خۆی. ئەوەی بـــە ڕۆژی ڕووناک لێیان دەســـتاند لە شـــەوە ئەنگوســـتەچاوەکاندا وەریدەگرتنەوە، دایم ئەو قسەیەی دایکی وەبیردەهاتەوە:

کـــوڕم ئارامت هەبێت، بڕووشـــی مێردان بەنۆرە دەکوڵێت! لەوشـــەوەی کە ڕۆستەمیان کوشتو حاجی ســـمایل‌و منداڵێکی سەرلانکیشیان بریندارکردو ژن‌و منداڵی ئاواییان هەترەشـــبردی کرد، کاکەڕەش هەستی بە نەنگی‌و ئازاری ویژدانی دەکرد، ژەنگی ڕقێکی ئەســـتووری هەڵدێنایەوەو دەیویســـت بە نرخی بوونی ئەو شـــەرمەزارییە بشـــواتەوە. بە تایبەتی کە چـــاوی بە منداڵەکانی ڕۆستەمی دەکەوت چۆن لە ختوخۆڕایی لە بێنازییان هەڵکێشان. سووکایەتیی پێکردنی سبەینەکەی سەرجۆخینان و ڕاکێشانی کەزیی دایکیشی، لە کوشتن کەمتـــر نەبوو! ئەو دەیزانی لـــە تۆڵەکردنەوە بەدەر، هەمـــوو پێکەنینی دنیا ناتوانن خەمەکانی داکی بشارنەوە!

قســـە کەوتە زارەکی، دەکەوێتە شـــارەکی! دیاربوو کاکـــەڕەش لێرەو لەوێ هەواڵی پەتک پسانەکەی ئەو سبەینانەی موشیرئاغاو پیاوەکانی دژی باوکـــو دایکی، پێگەیشتبۆوە.

هێدۆ زۆر بەپەلەبوو، هەموو جارێ دەیگوت: با ئەوشەو بەسەریاندا بدەین، لەوەی زیاتر بێدەنگیی پێ کەســـری شان بوو! لە کەپرەشـــینەی[1] جوولەکان

---

١. کەپرەشینەی جولەکان: بۆنەیەکی ئایینیی جولەکان بوو، سەرەتای وەرزی پاییز

دەیگوت: ئێستا فرسەتە دنیا هەورو هەڵایە، ئەگەر دەستیان وەبەردەستی نەدەین و بەردێکیان نەکەوێتە بەردداني، دەمانخۆن، بەزەییان پێماندا نایە، دەیانەوێ بەجارێکی بمانتولخێننەوە، ئاخر خۆ بەلاش نەیانگوتووە مست لە درێشەی دەگەڕێتەوە!

هیدۆ دەیزانی کاکەڕەش زەلامێکی ڕەشیدو بەوەجە، بەڵام بۆ بڕیاردان لەسەرخۆو ئارامە، بۆیە هەموو جارێ دەیگوت: تاکو کاکەڕەش میزی کەفێ دەکات، کەرەک دەزێ! ئەو هەموو ڕقو تووڕەییەی لەناخی خۆی ئاخنیبوو و بەکوڵ هاتبوو، بڵقی دەدا. خۆبەرزەفتکردنی گران بوو، چونکە زوڵم و چەوسانەوەی دەرەبەگایەتی هەموو سنوورێکی بەزاندبوو، کە ناوی ئاغاکانی دەهێنا، وەک خواردنێکی پیس دەیتفاندەوە! ئەوان مارشی ڕابوون بوون لەبەرامبەر ناعەدالەتی!

زەردەپەڕەو خۆر بەرەو ئاوابوون ڕاخوشی، گەلەکۆمەی هەورەکانەو، هەناسەیان لە ئاسمان بڕیوە. لە خۆهەڵکوتانی کێشکەپاساری بۆ هێلانەکانیان، پێشبینیی بارانێکی بەلێزمە و سەربەکڵاوە دەکرێ، هەورەکان گەواڵ گەواڵ چەنگەبازو سواری سەری یەکتری بوون، ئەستێرە بێسەرو شوێنن، کەس نازانێ مانگ لە کوێیە! دنیا هێندە کشوماتە حەپەی سەگێکیش نابیسترێ. ئەوەی بەدیدەکرێ

---

ئەنجام دەدرا. لەو بۆنەیەدا جولەکەکان کەپرێکیان سازدەکرد، هەموو میووەکانی ئەو وەرزەیان پێوە هەڵدەواسی، بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ بەردەوام دەبوو. گوایە لەو ڕۆژەدا موسا پێغەمبەر بەسەر فیرعەوندا سەرکەوتووە. دوای ڕێوڕەسمەکە هەموو پێکەوە میووەکانیان دەخوارد و سپاسگوزاریی پەروەردگاریان دەکرد. زۆر ساڵ وابووە کە لەو کاتەدا باران باریووە و دوور نەبووە گەندەپەڵەیەکیش بدا.

بەس شـــۆقی بیرەنەوتەکانی ئەو دیوی زورگەزراوی لەبـــن زگی هەوران، وەک ئاگرێکی سووورباوی نێو چڕەدوکەڵ، خۆی نمایش دەکرد.

شـــەوێکی هێندە تاریکە پەنجـــەت لەنێو چاوی ڕابکـــەن، نایبنی! هەور بەجۆرێـــک زگیان بە عەرزییەوە نـــاوە، وەک بیانەوێ ئەو بۆشـــاییەی بەینی عەرزو ئاسمان پڕ بکەنەوە!

ئەوان شـــەش کەسن، هەرشەشـــیان تفەنگـو فیشـــەکدانیان پڕفیشەک، ئامادەن. ئەوشەو شەوی حیســـابە، دەمێکە چاوەڕوانی شەوێکی وان بۆئەوەی ڕۆحیانەتی ڕۆستەمەشێتی تێدا ئاسوودە بکەن. بەرلەوەی بەرەو ماڵی ڕەفعەت ئاغای بکەونـــەڕێ، کاری هەریەکێکیـــان دیاریکرا. تەنها لەســـەر ئەوە ماوە خەڵکی ئاوایی لە جێو بالینگانیان بخزێنو کرخەو بن. شـــەو ڕاشکا، خانووی ڕەفعەت ئاغای، چوار قولغەی هەیە، لە هەرگۆشـــەکی خانووەکە، قولغەیەکی لە شـــێوەی میحرابی مزگەوتی لێ دروســـتکراوە، هەرقولغەی چوار دەلاقەی بچووکـــی بە ئەندازەی لەپەدەســـتێکی تێدایە بۆ ئـــەوەی لوولەی تفەنگی بۆ شـــەڕەتفەنگێ تێڕا ببەنـــە دەرێ. هەموو قولغەکان دەرگایـــان لە ژوورێیە، لە دیوی ناوەوەی حەســـارێ ئەگەر قولغە تفەنگـــداری تێدابێت، بێگومان ئەوەی لـــە دەرەوەیە گیانی ســـالم دەرناباو دەکوژرێ، بەڵام ئەگەر کەســـی تیادا نەبێت پێچەوانـــە دەبێتەوە، قولغەکە دەبێتە مەتەرێزو ســـەنگەری ئەو کەســـەی لە دەرەوە لوولەی تفەنگەکەی لەنێو دەلاقەکە داوێ.

لە دێرزەمانەوە، هەڵکوتانە سەر قولغەو دەست بەسەرداگرتنی، کاری پیاوە ڕەشـــیدو بەوەجو لەخۆبووردەکانە، هەموو کەســـێک زاتی ئـــەو گیانبازییەی نییە! هەرچەندە هەرشەشیان زەلامی بەوەجنو ئەو کارەیان لەدەست دێت، بەڵام

کاکەڕەش پێی وایە سەلیمو هیدۆو ئەنوەر، لەبەر خۆشەویستییان بۆ ماڵی حاجی سمایلی‌و کوڕەکانی‌و ئەستاندنەوەی تۆڵەی ئەوان لە ئاغاکان، هاتوون، بۆیە ڕێی بە کەسیان نەدا شوێنە هەستیارو مەترسیدارەکان بگرن، نەبادا تووشی پێکان ببن‌و بۆ هەتا هەتایە تێیدا شەرمەزار بن!

کاکەڕەش پشتی بۆ هیدۆ و ئەنوەری داهێنایەوە، یەک لە دوای یەک بەسەر پشتیدا بۆ سەربانی ئەو خانووەی بەرامبەری دەرگای ماڵی ڕەفعەت ئاغایە، سەرکەوتن. هەرکە دامەزران، حاکمیەت‌و سەردەستی حەسارێ کەوتە بەررەحمەتی لوولەی تفەنگەکانی ئەوان. کاکەڕەش بە هیدۆی گوت: تا وەکو کەستەکێکت بۆ ناوێم، تەقە دەست پێنەکەی! ئەوانی دامەزراندو گەڕایەوە لای سێ کەسەکەی دیکە، کە سەلیمو حوسێن‌و عومێرەی برای بوون.

کاکەڕەش ڕێی بە هیچیان نەدا لە خۆی بەدەر، کەس هەڵبکوتێتە سەر قولغەکان، کە زۆر مەترسیدارو یەکلاییکەرەوە بوون. یەک لە دوای یەک قولغەکانی گرت‌و هەر قولغەی ڕادەستی یەکێکیان کردو لێی دامەزران‌و لوولەی تفەنگیان تێدا بردنەژوورێ. دووایین قولغە کە دەکاتە قولغەی چوارەم، بۆ خۆی لێی دامەزراو لوولەی تفەنگی تێهاویشت. ئەو قولغەی کاکەڕەش لێی دامەزرا، لە دەرگای ماڵی ڕەفعەت ئاغای زۆر نزیکتر بوو تا قولغەکانی دیکە، ئەو دەیزانی لەوکاتەی تەقە دەست پێدەکات، یەکەم قولغەیە کە ڕەفعەت ئاغا خۆی دەگەیەنیتێ بۆئەوەی تەقەی تێدا بکات. تەواوی خەڵکی ئاوایی نوقمی خەوێکی قووڵی زستانەن. نزیکبوونەوەی هەورەکان لە عەرزی، هێندەی دیکە بۆتە سەرپۆش بۆ داپۆشین‌و خنکاندنی هەردەنگێک.

هەوری ڕەشی وەک قیر، شۆڕابەیان بەرداوەتەوە. شەوەزەنگێکی خامۆش‌و

بەسامو بێدەنگ، هەر دەڵێی زیڕوح لەو گوندەیدا نەماوە! کاکەڕەش دەستی لە عەرزی کوتاو کەستەکێکی هێندەی هێلکەقازێکی وەبەردەستی هات. لە نیوەی شەو لایداوەو دنیا نوقمی خەوە، هەورەکان دەپرووشێننو دەڵێی ئێستا نا ئێستا دەرکی کوندەی ئاوەکەی دەکرێتەوەو دەشتودەری لە ئاوێ هەڵدەکێشن. کاکەڕەش کەستەکەکەی بۆ هیدۆی هەڵدایە سەر ئەو بانەی لەگەڵ ئەنوەری لێی دامەزرابوو، بە ئاماژەی دەستپێکردنی تەقەو دەستڕێژی تفەنگ.

هیدۆ لە خوایەکی دەویست، دەمێک بوو نیوپێشی هێنابووێ، قرمژنو شریقەو گیزەی گوللان بێدەنگی شەویان تێک بردو هاڕەی کرد! پەردەی بێدەنگی ئەوشەوەی گوندیان دڕی. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژ، وەک کاکەڕەش مەزەندەو پێشبینیی کردبوو، ڕەفعەت ئاغا خۆی هەڵکوتا بگاتە نێو ئەو قولغەیەی کاکەڕەش، بەئومێدی ئەوەی خۆی لەگەڵ ڕەفعەت ئاغا دەستەویەخە بەرەو ڕوو ببێتەوە، لوولەی تفەنگی تێهاویشتبوو. مەزەندەکەی ڕاست دەرچوو، ئەوەتا ئێستا کەوتۆتە ژێر ئاگری لوولەی تفەنگەکەی! هێندە تاریکە نەیزانی کێیە بەرەو ناو قولغەکە دێت، بەڵام دڵنیایە یان ڕەفعەتە یان مشیری کوڕیەتی. ڕەفعەت ئاغا بێئاگا لەوەی قولغەکە گیراوەو لوولەی تفەنگی کاکەڕەشی پاشای شەوی تێدایە. شریخەو قرمژنی تفەنگان لە سەرماڵی ئاغای، پەیامی دڵخۆشکەری بە کرمانجەکان دەبەخشی!

لەگەڵ یەکەم هەنگاوهەڵهێنانی ڕەفعەت ئاغا بۆ قولغەکە، کاکەڕەش پەنجەی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی داگرتو ڕەفعەت ئاغای ئەنگاوتو بۆڕەی لێهەستاندو بە پاشدا کەوت.

کاکەڕەش هەستی کرد ئامانجێکی پێکا، چونکە گوێی لێبوو تفەنگی کەسی

پێکراو کەوتە سەر زەوی و لە دەستی بەربۆوە. بەڵام تاریکییەکە ئەوەندە دژوارە، تەنانەت وەک تارماییش کەس نابینرێت، کەچی ئەو دڵنیابوو کە نەک هەر ڕەفعەت ئاغای ئەنگاوت، بەڵکو باڕووتیش چۆتە نێو برینەکەی، چونکە زۆری لێ نزیک بوو. ئۆخژنێکی لە دڵی گەڕا کە تۆڵەی سەردەری و بەردەرێی لێکردەوە!

ڕەفعەت ئاغا هاواری کرد: بمگەنێ بریندارم، کەس نەچێتە نێو قولغەکان، چونکە هەموو گیراون! تەنیا لاقەکانی لە بەردەرگای قولغەکەیە، لە پشتێنی بۆ سەری گوللە نایگرێتەوەو خۆی ئاوقای[1] دیواری کردووە. کاکەڕەش بۆئەوەی فەراقی ڕەشی لێببڕێ چوار پێنج گوللەی دیکەی پێوەناو هەستی لێبڕی. دوو بۆنی دژبەیەک ئەونێوەی پڕکرد: یەکیان بۆنی باڕووت و مردن، ئەوەی دیکەیان بۆنی یەکەم بارانی ساڵ، بۆنی خاک و بۆنی ژیان!

پیاوەکانی ئاغای، لە دیوەخان و لە ماڵێرا تەقەیان دەکرد، بۆنی باڕووت لەگەڵ بۆنی باران ئامێزیان بەیەکتردا کردبوو. دووکەڵی تفەنگەکان و بۆنی باڕووت لە حەساری داوێستا، لە گەرمەی ئەو شەڕەگوللەو شریقەی تفەنگ و گوڕەی قەوان و گیزەی گوولالانە، ژنێک هەلهەلەیەکی پشتیوانی و خۆشحاڵی کێشا، کەس نەیزانی کێیە، دەنگەکە لە لای ماڵی ڕۆستەمی ڕەحمەتییەوە هات، تەنها ئەوانەی لە دەرێ بوون ئەو هەلهەلەیەیان بیست، کە ئەوانیش کاکەڕەش و هاوڕێکانی بوون. ئەو هەلهەلەیە، تین و گوڕێکی دیکەی پێبەخشین! هیدۆ هێندەیان لێ داخدار بوو دەرگای ماڵەوەی بە گوللان دابێژا. بە بای گوللان چرایان کوژایەوە، لەگەڵ کوژانەوەی چراکان، بارانیش دەستی پێکرد.

---

١. ئاوقا: خۆ لەگەڵ جووتکردن، خۆ پیوەنوساندن.

کاکەڕەش کـــە زانی کاری خۆیان کـــردووە، لوولـــەی تفەنگەکەی لە کونی دەلاقەی قولغەی دەرهێنا، بەپەلە وەک تەشی بادراو خۆی گەیاندە هەموویانو لە سەریان ســـووڕا، هەمووی بەسەرکردنەوە، دەســـتێکی لە شانی دان: تەواو با بڕۆین! هیدۆو ئەنوەری بە کەســـتەکێک ئاگادارکردەوە. هەر لەوێ ســـەلیمو ئەنوەر هەر یەکەو بۆ گوندەکەی خۆیان بەرەو ماڵ چوونەوە، کە زۆر نزیک بوون، بۆ ئەوەی بەر لە ڕووناکی بەیانی، بگەنەوە ماڵەکانیان.

بەیانیـــی دا، نوێژکەرەکان نوێـــژی بەیانییان کردو خەڵکـــی گوندی لەخەو هەســـتان. بارانێک دەباری دەتگوت ئاســـمان هەموو کونەکانی کردوونەتەوە، وەک ئـــەوەی بیەوێ بۆنـــی خوێنو بـــاڕووتو دوکەڵی داوێســـتاوی تفەنگان بشواتەوەو قەوانەکان بسمیل بکات، بە ئومێدی ئەوەی غوسڵی زوڵمو زۆرداری لـــە ڕەفعەت ئاغـــای دەربکاتو قڕێژی پیســـیو چڵک لە نۆکـــەرو پیاوەکانی بشـــواتەوە! هەتا چاو هەتەردەکات ئاو بریقـــەی دێ، هەموو خەتە جووتەکان ئاویان تێدا داوێستاوەو باران کەلێنی ناداتێ!

کاتـــی نانی بەیانییە، خەڵکی گوندی هەر بابایـــەو بە بیانووی قەرزکردنی جامەشەکرێک، پیاڵە دەرمانچایەک، دەچنە ماڵی یەکتری، بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو شـــەڕەتفەنگەی شـــەوی ڕابردوو بۆ یەکتری بگوازنەوە. بە ماڵێکـو دووان دڵیان ئاوی نەدەخواردەوە، هەواڵەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، هەر زوو زاندرا ڕەفعەت ئاغا بە سێ گوللەی بریندارەو برینەکانی هەرچەندە سەختن، بەڵام لە پشتێنی بەرەو خوارن، هێندەی جوانەگایێکی خوێنی لەبەر ڕۆیشتووە، ئەگەر دکتۆرەکان ژیانیشی بە بەردا بکەنەوە، ئەگەری ئەوە هەیە لاقی ببڕدرێتەوە. هەر شەوەکەی ڕفاندوویانە نەخۆشخانەی شاری، گوللەیەکیان کڵاوەی ئەژنۆی هەڵتەکاندبوو و

کردبوویە بڕووش، یەکێکیش لە پیاوەکانی، شـــانی ڕاستەی بریندارە، سەردارو بنداری تفەنگی ڕەفعەت ئاغای چەند گوللەیەکی پێکەوتووە.

ئـــەو هەواڵانە، لە زاری نۆکـــەرو خزمەتکاران، لە حەســـاری ماڵی ئاغای سەریان وەدەردەنا. خەڵک وەکو جوچکە چۆلەکە، چۆن زاری دەکاتەوە بۆ ئەوەی دایکی شتێکی لە زاری بناخنێ، ئاوا زارو گوێیان بۆ هەواڵی نوێ دەکردەوە!

لە کاتی نەشـــتەرگەری برینەکانی ڕەفعەت ئاغا، کە یەکیان لە بن کلاوەی ئەژنۆی تەقیبۆوەو وێرانی کردبوو، ئاغاکان بە هیچ شـــێوەیەک قایل نابن لاقی ببڕدرێتەوە. پۆلیس لە مشیرئاغای دەپرسن: گومانتان لە کێیە؟ ئەویش دەڵێ: باوکم دەزانێ، هەتا بەهۆش خۆی نەیەتەوە ناتوانین هیچ بڕیارێک بدەین.

هەرچەنـــدە کاکەڕەش‌و هیدۆ چاوەڕوانی دەســـتگیرکردن بوون، دیاربوو ئەو دواکەوتنـــە لە بەرژەوەنـــدی ئەواندابوو. بەیانیەکەی، کاتێـــک پۆلیس هاتنە شـــوێنی ڕووداوەکـــە، هەموو قەوانەکانیان کۆکردەوە، شـــەش تفەنگ‌و ســـێ دەمانچە تەقەیان پێکرابوو، ئەوەش وای دەگەیاند تەقەکەرەکان نۆ کەس بوون، بەڵکو لەوانەیە زیاتریش! دیارە بە ئەنقەســـت بۆ تەفرەدان‌و سەرلێشـــێواندنی پۆلیس بە دەمانچەکانیش تەقەیان کردبوو، هەرواش دەرچوو. کاتێک ڕەفعەت ئاغا هاتەوە هـــۆش خۆی‌و بەو هەواڵەی زانی کە زیاتر لە نۆ کەس ئەو کارەیان ئەنجامداوە، بۆیە لە داواو ســـکاڵا تۆمارکردن لەســـەر ماڵی حاجی ســـمایلی دەســـتی ڕاگرت‌و سەرچیخ چوو! هەرچەندی دەیهێناو دەیبرد نەدەچووە ئەقڵی‌و باوەڕی نەدەکرد کە کوڕەکانی حاجی ســـمایلی لە توانایاندا بێت ئەو کارەســـاتە ئەنجام بدەن‌و ئەو هەموو خەڵکە بە تفەنگەوە ئامادە بکەن. بۆیە بە پۆلیســـی دەگوت گومانم بۆ هیچکەس ناچێ، ئێوە دەبێت سەرەداوەکان بدۆزنەوە.

دووەم ڕۆژبوو بێپسانەوە باران دەباریو کەلێنی نەدەدایێ، پیاوە بەتەمەنەکان دەیانگوت: دەشــتو دنیای ڕەباس[١] کرد! لە دوای ئەوەی شۆڕابەی هەورەکان فتراقیان داکەوت هێندەی ببارن، لە بنی هەریبرینگاندو[٢] ڕۆنی کرد. بایەک هەڵیکرد هەموو هەورەکانی شــیتاڵ شیتاڵ و پەرتەوازەکردو بەدەم ڕۆیشتنەوە، بەرمیچی ئاسمانیان دەلســتەوەو زەویش چیدی توانای قووتدانی ئەو هەموو بارانەی نەمابوو!

لە دوای ئەوەی ئاغاواتی ناوچەکەی لە نەخۆشخانە لە لای ڕەفعەت ئاغای گردبوونەوە، هەریەکەیان بە مەبەســتێکی تایبەتی تۆمەتی ئەو گوللەبارانەی دەدایە پاڵ یەکێک کە کۆنەغەرەزی خۆی لەگەڵ هەبوو و دەیویست لەوڕێیەوە، بە هەڵواسینی ئەو تۆمەتە بە بەرۆکی ئەوکەسەی خۆی دەیەویست، حیساباتی خۆی لەگەڵ ساف بکات! یەکیان دەیویســت پۆلووی بن خۆڵەمێشی چەندان ســاڵەی دوژمنداری باپیرانیان لەگەڵ بەرەبابی ئاغایێکی ناوچەیەکی دوور بۆ بگەشێنێتەوەو، ئەو دوژمنداریەیان بۆ نوێ بکاتەوە!

ئەحمەدئاغــا کە ئاغای چوار پێنج گوندان بوو، گەورەی ئاغاواتی ناوچەکە بوو، دیارە قســەی کاربڕ، دەبێ ئەو بیکات، قسەی ئەو خەڵکەی بە دڵ نەبوو، چونکە ئەوە نوێکردنــەوەی دوژمنداریی نێوان دوو بەرەبابی ئاغایان بوو: ڕۆڵە ئێوە نازانن! «گورگ زگی یەکتر نــادڕن!» ئەوجا ئەوان هیچ کۆنەغەرەزێکیان لەگــەڵ ڕەفعەتی نەماوەو نییانە، کەواتە نابێــت خۆبەخۆ دەم لە برینی یەکتر

---

١. ڕەباس: تێرئاو.

٢. هەریبرینگاند: هەڵیبرینگاند، هەڵبرینگاندن. ئەوکاتەی هەور بەربینگی ئاسمان بەردەدەن و دونیا ڕووناک دەبێ.

بنێیــن! هەموویان بەجۆرێک هێدمەگرتی بووبوون، بــەوەی چۆن زیاتر لە نۆ چەکدار زاتی ئەوە بکەن ئەو کارەســاتە بخولقێننو وەکــو بەرزەکی بانان بۆی دەربچنو هیچ ســەرەداوێک لە دوای خۆیانەوە بەجێ نەهێڵن! پێیان وابوو ئەو دەستوەشاندنو دەستوەکەرییە لە توانای کاکەڕەشو هیدۆی بەدەرە!

لە دوای چاکبوونەوەو ســاڕێژبوونی برینەکانی، لاقی ڕاستی هەر بەتەواوی ســەقەت بوو، بەجۆرێک وەک پارچەگۆشــتێکی بێگیانی پێوە هەڵواسرابێ، زۆر لــە لاقی چەپی کورتتر بووبووەوە. دەلینگی شــەروارەکەیان بۆ دەبەســتا، هێندە باریک بوو هەستت نەدەکرد ئەو لینگەشەرواره شتێکی تێدابێت! بۆیە بەناچاری، لە کۆتاییدا لاقیان لە ڕانیڕا بڕیەوە!

ڕەفعــەت ئاغا بەجنێودانەوە دەیگوت: چەندم هاوارکرد ئەوانەی خەڵکمان لــێ هان دەدەن بیانکوژن! ئەگەر بە قسەی منتان کردبایە تووشی ئەو حاڵەی نەدەبوویــن کە ئێســتا غەنیمی خۆمان ناناســین، خەڵکی دیکەشــمان پێ فێردەبێ! ئێستا سەری، لە لاقی چەپ و دوو شەقرەی[1] بنباڵی، وەستاوەتەوە! لەبەرچاوی خەڵکی نەفسی خۆ بەزۆرزانی، ڕێی پێنەدەدا ڕێگابکاتو هەستێتە ســەرپێ، نەبادا خەڵکی ببیننو چێژ لە ســەقەتبوونو نیوەئینســانبوونی ببینن! ئیدی نە ڕەختی تفەنگو نە قایشووقرۆشی دەمانچەی بە کەمەرییەوە بەنــد نابــێ! لەجیاتی گەڕان بــەدوای ڕەختی حەســیب قــادری کەرکوکیو کیفەدەمانچەی دانســتە، ناچاربوو بە دوای شەقرەی بنهەنگری نوێدا بگەڕێ! لــەورۆژەوە لە ڕەفعەت ئاغاوە بوو بە ئاغا یــەکلاق! لەجیاتی بەخۆدا چوونەوەو

---

١. شەقرە: شەققە، شەققەی بنهەنگڵ.

دەســـتبەرداربوونی ئازاردانی خەڵکی، زۆر لە جـــاران دڵڕەقترو بێبەزەییتر بووا ئارەزووی ستەمکارانەی بەجۆرێک سواری سەری بووبوو، وای دەبینی قەرەبووی لاقەکەیو ســـەقەتبوونەکەی، لە ئازاردانی خەڵکی هەژاردا دەست دەکەوێت. هەرکـــە کرمانجێکی دەبینی، لە زەینی خـــۆی وای وێنا دەکرد کە ئەو برینداری سەقەتی کردووە، یەکسەر غەریزەی تۆڵەسەندنەوە سواری سەری دەبووا

دوو کوڕی گەنج لە گوندێکی ئەوبەری ڕووبارەکە، هاتبوون بەدوای هێسترە ونبووەکەیاندا بگەڕێن. بە پشت ماڵی ڕەفعەت ئاغایدا دەڕۆن. لەو کاتەدا ئاغا یەکلاق بەخۆیو دارشـــەقەکانی بنهەنگڵییەوە لەســـەر کورسییەک لە پێش دەرگای دانیشـــتووە، تەنها لە پشـــترا ئەو دوو گەنجەی دەبینێ، هەرا دەکاتە پیاوەکانـــی: لێنەگەڕێن ئـــەو دوو گەنجە بڕۆنو دەســـتگیریان بکەنو بۆمیان بهێننە تەویلـــەی وڵاخان! ئەوانیش دەســـتگیریان دەکەنو بە پارەســـووان[1] دەیانبەنە تەویلەی وڵاخان.

ئاغایەکلاق دەڵێ ئەو کورســـییەم بۆ بێننە تەویلەی! فەرمان بە پیاوەکانی دەکات بە گوریس ســـەراوبن هەڵیانواسن! دوو گەنجەکە، هەرچەندی دەستەو دامێنی ئاغای دەبنو دەڵێن ئاغا بەخوا ئێمە هێسترمان لـێ ونبووەو بەدوایدا دەگەڕێینو کاســـبی ماڵی خۆمانین! وەلـــێ ئاغایەکلاق دەڵێ: نەخێر، ئێوە هاتوون قولغەکانی پاســـەوانی ماڵی ئێمە بەســـەربکەنەوەو سۆسەی بکەن بۆ ئەوەی شەوێ بێنە ســـەرمان، دەبێ پێم بڵێن کێ ئێوەی ڕەوانە کردووە؟ لەدوای ئەوەی ســـەراوبن هەڵیاندەواســـن، قەنەیـــەک دادەگیرســـێنێو دەڵێ: دەی،

---

١. پارەسوو: پاڵەستۆ، پاڵەپەستۆ.

دوکەڵی کای جۆیان[1] لەژێر لووتیان بکەنەوەو قامچیکوتیان بکەن هەتاوەکو دان بــە تاوانەکەیاندا دەنێن! بە دوکەڵی کای جۆی وەک ڕێوی قانگیان دەدەن. هەرچەنــدی هاواردەکەن: بێتاوانین! کەچی ئاغایەکلاق نابیســتێ یان نایەوێ بیبیســتێ، تاوەکو هەردووکیان لەهــۆش خۆیان نەچنو ئــارەزووی ئازاردانی تێرنەبێت، دەســتبەرداریان نابێت. ئەو، لە ئەشــکەنجەو سووکایەتیکردن بە خەڵک، چێژی دەبینیو دەیویســت بە دەوروبەری بڵێ وەک جاران هێزو توانای بەسەر خەڵکدا دەشکێو هەرچی بیەوێ دەتوانێ بیکات!



١. دوکەڵێ کای جۆ: دوکەڵی کای قەسەڵی جۆ، زۆر تیژەو هەناسە تەنگ دەکات.

# ١٨

دێوەزمەی دەرەبەگایەتی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشاوە، هەموو کونو کەلێنێکی ژیانی تەنیوە. ئەو تاعوونە ڕەشە، دیارنییە چارەنووسی جووتیارەکان بەرەو چ ئاقارێک دەبات! ڕۆژ بە ڕۆژ دزێوترو پڕئازارتر دەبێت. دیوەخانەکان وەک زیندانێکی کۆیلە بێخەونەکانی لێهاتووە. بە شـــانازییەوە دەڵێن بۆتە جێگای قاتیلو مەحکومان. زۆربەی گوندنشـــینان تەنها لە هەوڵی ئەوەدابوون زگـــی منداڵەکانیان تێربکەن، بۆئەوەی لەبرســـان نەمرن. ســـەرباری ئەو هەموو چەوســـانەوەو کولەمەرگییە، نەخۆشیی سیلیش خەڵکی پەرێشان و ماندوو کردبوو.

تۆفیق، تەمەنی دوازدە ســـاڵان بوو کە لێی قەوماو بە نەخۆشـــیی ســـیل دایکی لە دەســـتدا. ئاخر هێشـــتا لە خەم نەڕاســـابوو و زۆری پێویستیی بە ئامێزو ســـۆزی دایکی هەبوو. هەرچەندە ژنی ئاوایی زۆریان دڵنەوایی‌و ســـۆز بەســـەردا دەباراند، بـــەڵام هەرگیز قەرەبووی ئامێزی پڕ لـــە میهری دایکی بۆ ناکەنەوە. شـــەوان لە ئامێزی باوکی خۆی گرمۆڵە دەکرد. دیارە ڕۆژگار ئەوەشی پێ ڕەوا نەبینی‌و پێی وابووە بۆ منداڵێکی وا زۆرە، بۆیە لە دوای ســـاڵو نیوێک باوکیشـــی بە نەخۆشـــی گەروخڕە مرد. تۆفیق، لەگەڵ براگەورەکەی‌و خوشکی بەبێ دایکو باوک مانەوە. براگەورەکەی هەر زوو، نەیهێشت کفنی باوکی زەرد ببێت، خوشکەکەی بۆ خۆی بەژن داو ژن بەژنەی پێکرد. زۆر نەدارو دەستکورت

بوون، نیازمەندی نانی شــەوێ بوون، مشک لە ماڵێیان کلکی بە ئارد نەدەبوو! لەورۆژەوە بەدبەختیو چارەڕەشــی تۆفیق زیاتر دەســتی پێکرد، کاتێک کەوتە ژێردەستی براژنێکی بێبەزەیی! هەرچەندە تۆفیق پێویستیی بە سۆزو بەزەییو نازڕاگرتــن لە لایەن براژنو برایەکەی هەبوو، وەلــێ لە هیچیــان بەهرەمەند نەبــوو، ناچار بۆ خــۆ گونجاندن بە هەموو بوونییەوە هەوڵــی ڕازیکردنی براو براژنی دەدا، بەڵام بێســوود بوو، وەک دەڵێن: باری هەنجەت بارناکرێ! بە دڵو بە گیان ڕێزی براژنی دەگرت، وەک سووکەڵەیەک لەبەردەستی دەهاتو دەچوو، چونکــە ژنێکی دڵــڕەقو بەدخوو بوو، قەت بە هیچ قایــل نەبوو، زۆر خراپ ئەو منداڵەی دابووە بەرسەران، هەموو ئیشــوکاری ماڵێی پێدەکرد، تەنانەت جلەکانیشــی بۆ نەدەشووشت، دەبوایە بەو دەســتە چکۆلەو ناسکانەی خۆی، جلەکانی خۆی بشــوات. مەگەر خەڵک ســابوونێکیان بدابوایە بۆ جلەکانی، براژنی سابوونەکەشی لێدەشاردەوە. تا پاروونانێکی دەخوارد، چەندجار لەسەر نانی هەڵیدەســتاند، زۆرجــار دەینارده دەرێو دەیگوت بزانــە کێیە لە دەرگای دەدا؟ بێئــەوەی کەســێک لە دەرگای دابێــت، تاوەکو دەگەڕایــەوە قاپەکانی تێکدەناو تۆفیق بە برسێتی دەمایەوە! زۆرجار ژنانی ئاوایی بە براژنیان دەگوت: بۆ ئەو زەجرەی دەدەیە ئەو منداڵەی؟ ناترســێی لە خوای بەڵایەکت بەســەردا بێنێ؟! بەخوای ئەوەی ئەتۆ لەگەڵ ئەو تفارەی دەیکەی ڕەوای هەق نییەو خوا بەرداری نییە! بەڵام ئەوەندە زمانهەراشو لەوجڕ[١] بوو، کەس باشاری نەدەکرد. مێردەکەشی لەڕاستی، وەک جوجکەی بەرچەنگی هەڵۆی وابوو، قەت ڕۆژێک نەیگوت ژنێ ئاخر ئەوە برامە، یادگاریی دایکمو باوکمە بۆم بەجێماوە، بۆ ئاوای

---

١. لەوجڕ: نەگونجاو بەبێنوو، لە هەنجەت.

بەســەردێنی؟ ئاخر دوایی ڕابکات بۆ هەتاهەتایە نایدۆزمەوە! هەر نەیدەوێرا ئەلفازی بەرانبەری بگەڕێ. بەو دەردی ســەرییە، تاوەکو تەمەنی بوو بە پازدە ســاڵان خزمەتی براو براژنی کرد، دوایی دەســتی بە ڕێنجبەریی خەڵکی کرد، هەرچی پــارەو پولێکی پەیدادەکرد لە دەســتی براو براژنــی دەکرد، ئەوانیش بۆ تاقەجارێکیش دەســتەجلکێکیان پێ ڕەوا نەبینــی، بەردەوام جلکی کۆنی خەڵکی لەبەردەکرد، وای لێهات تۆفیق هەمموو شــوێنێکی لە ماڵی خۆیان پێ خۆشتر بوو، ئەو ماڵە تاوەکو دایکی مابوو بۆی وەک بەهەشت بوو، ئێستا لێی بۆتە دۆزەخو بــەوی بێت هەرگیز ڕووی تێنەکاتەوە! تەنها ئەوکاتانەی چاوی لە چاوی براژنی بزردەبوو، بە ژیان ئەژماردەکرا. بگرە منداڵیشی پێ بەخێودەکردو قەتیش لێی ڕازی نەدەبوو، دایم پرتەوبۆڵەی بوو. ئەگەر درەنگ چووبایەوە ماڵێ دەیگــوت: تۆفیق حالۆری[1] بووەو بە ماڵــێ ناکەوێتەوە بۆ ئەوەی کارێکمان بۆ نەکات. وای مەزندە دەکرد تۆفیق لەگەڵ برادەرەکانی، ڕەنگە خۆشــی لــێ گوزەرابێت. ئەگەر زووش دەچۆوە ماڵێ، پێیدەگوت: کێرا هاتییەوە؟ دە تۆزێک ئێرە چۆلکە! دەڵێی پاسەوانی منی! بەخوای بە کاکت دەڵێم چارەکت بکات!

تۆفیق ترســی ئەوەی بوو ئەو ژنە، براکەی لــێ هانبــدات، براش کتومت تووتی، ئەوەی ژنەکەی دەیگوت، کاوێژی دەکردەوە، دوور نەبوو ئەو ژنە زماندارە ڕۆژێک تۆمەتێکی وای بۆ هەڵببەســتێ لەگەڵ براکەی بەرانگژی یەکترییان بکات، بۆیە بەباشــی زانی هەر لەو گوندەش نەمێنێ! ڕۆیشت و لە گوندێکی نزیکی گوندەکەی خۆیان، لەلای ماڵەمەڕدارێکی خواپێداو بە شوانی دامەزرا، ئەگەر بە نانەزگیش بێت، ئامادەیــە ڕێنجبەری هەرکارێک بێ، بیکات، بەس

١. حالۆری: کاتێک بەران سەروەختی جووتبوون، بە مێگەلەمەڕی خۆی داناسەکنێ و دەچێتە گژ مەڕی مێگەلی دیکە.

لەژێر چەپۆکـــی براژنی ڕزگاری بێت! ئەو چەند ســاڵەی، هیچ کارێک نەماوە نەیکات، دەستە قەلیشاو و پەنجە کوتمەکانی، شایەدن.

بە شــەرتی ســاڵەوەختێک بە شــوان دامەزرا، دوازدە مانــگ بۆیان بچێتە بەرمەڕیو، ئیشــوکاری دیکەشــیان لەگەڵ بکات. شــەرتی شوانییەکەیشــی لــە مووچەو بــەرات بەوشــێوەیە پێکهاتن: نیــو عەربەگەنمــی قەندەهاری، دەســتەجلکێکو دوو جووت کراشی بنلاســتیکی تایەی ئۆتۆمبیل، لەنێو دوو ڕۆژان چەنگەتووتنێکی هەرتەلــێ و دەفتەرسیگاری بافرە. هەرکات شوانییەکەی تەواونەکردو شەرتی نەپەڕاند، جلکو کراشەکانی جێبهێڵێ و بڕوا.

هەموو سەرەشەرتان لەژێر فشاری براژنی، برایە گەورەکەی دەهات مووچەو بەراتەکــەی وەردەگرتو بۆ ژنەکــەی دەیبردەوە. بەو حاڵەشــەوە، تۆفیق ماڵی خۆیانی وا لەبەرچاوی ڕەش بووبوو، هەموو شوێنێکی لە بنچەپۆکی زرداکانەی براژنی پێ خۆشـــتر بوو! ڕێنجبەری خەڵکیو شەونخوونیو بەردەرگای هەموو خەڵکی پێ باشتر بوو لەو زەلالەتەی لای براژنی!

هەموو جارێ تۆفیق دەیگوت: ئەمن زانیومە چەپەرۆکی زرِدایکی، بەڵام قەت نەبیستووەو نەمزانیوە زرِبراژنیش هەیە! هەمیشە ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکرد: دەبێ بۆچی بیەوێ زەجرکوژم بکات؟ چێژو بەهرەی چییە بۆی؟

تۆفیق لەبەرخۆیــەوە دەیگوت: ڕەنگــە ئەو ڕقو کینــەی بەهۆی ئەوەوە بێت، بەخیلیی بە دەموچاو و ڕووخســاری من بێت کە ڕووخســارێکی لەبارو جوانم هەیە. براژنم بەهۆی نەخۆشــی خوریکە، دەموچاوی قۆرت قۆرت بووە، وەک پەلکە شــووتی مریشــک دەندووککوتیان کردبێــت! ئەگەرنا لە قازانج زیاتر بەقەد نووکی دەرزییەک زیانم بۆی نییە. ئەوەنییە ســاڵێک ڕەنج دەدەم،

مووچەو بەراتەکەی لە دەستی ئەوان دەکرێو دەست لە گونان دەردەچم! ئەوەی بۆم دەمێنێتەوە لەشێکی شەکەتو ماندوو و دڵێکی بریندار!

تۆفیق هەر بە تاقی تەنێ شــەوین و شــیوەخواری دەکــرد، فرچکی کارو بەرخــە تازەلەدایکبووەکانی دەداو زایمانەکانی ڕزگاردەکرد، بەرخە مێشــکەو کارەمێشــکە دایکمردووەکانی لەبەر مەڕو بزنە بێچوومــردووەکان دەباناندەوە. ئاخر ئەوە ســەری ســێ شــەرتانە لەلای ئەوماڵەی ماوەتــەوە، بەجۆرێک لە شوانیدا شارەزا بووە پێویســتیی بە ڕێنمایی کەس نییە. شەوان دەخزێتە نێو قاپووتەکەی بۆ ئەوەی گورگەخەوێکی بکات، دەستبێنی لە بەرانەکان دەگرتەوە.

ئێستا مانگەشــەوێکە، ئەســتێرە زەقەزەق دەڕواننە تۆفیقو سەگەکەیو مێگەلەمەڕەکــەی. مانگ و ئەســتێرە وەک کریســتاڵ بە تاقی ئاســمانێوە دەدرەوشێنەوە، ڕێی کاکێشانیان شارە کردووە[١]. تۆفیق کە دەبینێ مێگەلەکەی لە تێرییان مۆرو مڕ بووە، تەنها کاوێژێ دەکەن، جارجار لەگەڵ سەرڕاوەشاندنی نێرییەکەی، زرینگــەی زەنگوڵەکەی مووچڕکێکی خۆش بە لەشــیدا دێنێ. ئاگرێکی گەورەی کردۆتەوەو لەو دەشتە پانو بەرینەو لەبەر تریفەی مانگەشەو قرچەقرچی چیلکەدارەکان ئاورینگێکی وەک زەردەواڵەی ســوورو بنەوشەیی باڵدەگــرنو بە ســەر ئاگرەکەوە ســەمادەکەن، لــە دوای کوژانەوەیان لەســەر قاپووتەکەی تۆفیقیو لەسەرپشــتی سەگەکەی دەنیشنەوە. کترییە ڕەشەکەی لەبەرئاگــری ناوە، بۆئــەوەی چایەکی دێم بکات. لەوکاتەی خۆیو ســەگەکەی لەنێو بێدەنگییەکی وەرزدا، نغرۆ دەبوون، بۆئەوەی خەمەکان بەربا بدات، پەنای دەبردە بەر شمشاڵەکەی بەرپشــتێنی، بۆئەوەی ئازاری ژیانی دەرهاوێتەدەرێ.

---

١. شارە کردووە: شارەگرتن، دەورەگرتن.

لەســـەر بەردێکی دانیشـــت، بەرلەوەی تووڕەی لێبێنێ، شمشـــاڵەکەی ماچ کردو لەبەر ئەو مانگەشـــەوە زیوینە، ئاوازی تـــاڵاو و بێئەمەکی ئەو دنیایەی دەژەنی. سەگەکەشی وا فێربووبوو کە دەیبینی تۆفیق شمشاڵەکەی دەرهێناوە، لەبەردەمی بەشێوەی خۆمەڵۆســـدان بۆ شتێک بە دڵو گیان گوێی بۆ دەگرت! هەرکەســـێک گوێی لە تۆنو نەغمەی گریانی شمشـــاڵەکەی تۆفیق گرتبایە، نەیدەتوانی بەر بە فرمێســـکەکانی بگرێ، چونکە هەر دروست دەنگی گریانی دەژەنی! کوترە کوتری پەنجەکانیشـــی وەک نزگرە، دەنگێک کە لە دەنگی ڕۆحو ویژدان دەچـــێ، نووزەیەک بێعەدالەتـــی مرۆڤەکانی دەرهـــەق بەیەک ڕاڤە دەکرد! لەو مانگەشەوەدا، ئەو ئاقارەی لە غەمێکی قوڵ هەڵکێشا کە گوزارەی ســـکاڵای نیازمەندێکی ســـۆزو بەزەیی لە بەرامبەر ناعەدالەتیی مرۆڤەکان، دەبرد بۆ عەرشـــی عەزیمو کەشـــکەڵانی فەلەک! هەرپارچەیەکی هەوایەکی شمشـــاڵەکەی تۆفیقـــی، بـــۆ لایەنێکی ژیانی پـــڕ لە چەرمەســـەری خۆی و سەرنویشتی ئەو سەگانەی دەژەنی کە لە دوای پیربوونیانو لەو کاتەی کەنەفت دەبنو تواناى پاســـەوانیی مێگەلەمەڕەکانیان نامێنێ، ئیدی دەســـتبەرداریان دەبنو بەئاواتی سەپکەنانێک دەبن بیخۆن!

پارچەی یەکەم: بەئارامی سڕینەوەی ڕووخساری دایکی میهرەبانی بوو، شیوەنێک بۆ لەدەســـتدانی میهرەبانی بوو. کاتێک پەنجە ســـەرمابردەڵەو هەلاهەلابووەکانی بە کوترەکوتر لەســـەر کونی شمشاڵەکە دەبزاوتن، سەری شـــۆڕدەکردەوە نێو سینەو مەمکـــی دایکی. پەنجەکانی ترپەترپـــی دڵی دایکیان دەژمـــارد، دەنگی ترپەی پێیەکانـــی لە کاتی بـــەرەو ماڵبوونەوە بە کۆڵێک نانی گەرمـــەوە، لەژێر پێیەکانی بەهەشـــتی دەبینی. لەگـــەڵ داگەڕانی ئاوازەکە، ســـەری دادەنەوانـــد بۆ کڕنۆشو

بۆنکردنی قەنەفریەندی ملی دایکیو بۆنو بەرامەی بەرۆکی!

پارچەی دووەم: بۆ هەڵوەرینی سێبەری باوکیو بێبەشبوونی لە نازو سۆزی باوکانەو نووزەی هەتیوکەوتنی خۆی دەژەنی.

پارچەی سـێیەم: تووڕەییو دڵڕەقی ئـەو مرۆڤانەی ورد دەکـردەوە، کە ئازاری ژێردەسـتەکانیان دەدەن. دەم لە دوای دەم ئاوازەکەی گڕتـرو ڕژدتر دەژەنی، وەک لە هەڵدێرێک بچێتە خوارێ، وات هەست دەکرد کە دڵی، عەرز دادەماڵێو دەڕووشێنێ!

پارچـەی چـوارەم: لوولەی شمشـاڵەکەی بـەرەو ئاسـمان بەرزدەکردەوە، بەئومێدی ئـەوەی ئەگەر توێشـەبەرەی زەمەن ژیانێکی دیکـەی بۆ تۆفیق تێدامابێـت، هەوایێکـی بڵنـدی دوورمـەودای دەژەنیو ڕوحـی ئەنگاوتەی دەلاواندەوە. سەگەکەی نیگای چاوە کەنەفتەکانی بڕیبووە لوولەی شمشاڵەکە. ئەوەی لێی هەڵدەوەرا وەک چەم دەڕژایە پێدەشـتی گیانیەوە، هەموو هەستی بیستنی بۆ خسـتبووە سەرپشـت، ئاخر ئەویش کتومت هەر وەک تۆفیقی هەموو پارچەکانی سکاڵابوون لە بێوەفاییو دڵڕەقی مرۆڤەکان، ئازارەکانی وەک کۆرەگری بە قوڕگییەوە نووسابوو، تەنها بە نووسکانەوەیەک دەریدەبڕین!

ئەو سەگە بەستەزمانە بەحەژمەتەوە ڕۆچووبووە نێو فۆغانی شمشاڵەکەی، لە زەینی خۆی وای وێناکردبوو کە گریانێکیان بۆ ئەو کاتەیە کە تەمەنی چەند مانگێک دەبوو، هێشـتا سـنووی نەهاتبوویەوە، کە بە بەرچاوییەوە دایکیان لە تەلیسێک هاویشـتو گوندبەدەریان کرد بۆ شاری، بۆئەوەی لەوێ بەرەڵلای بکەن. لە بیرێتی هەتاوەکو دووریانیـش بەدوای ئەو ئۆتۆمبیلەدا ڕایکرد کە دایکی تێدابوو، ئەنجام، بێبەش بوو لە سۆزی دایکانە!

ئەو پارچەیەی تۆفیق بەپەلە قامکەکانی لە کونی شمشـاڵەکەی دەکوتان،

ئەو شەوانەی دەهاتەوەیاد، کاتێک لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا سەگوەڕ بوو، ئەو ڕامالّی دەبرد بۆ گورگەکان، خاوەنەکەی لێکدا لێکدا دەیگوت:

دەی کس کس! دایکم بە قوربانت بێت بۆرە! بەخوا بۆرەی من گورگخنکێنە! خاوەنەکەم لەتکەناوسێری نێو زاری خۆی دەدامێ! لەلای مەڕدارەکان دەیگوت بۆرەم بەقەدەر کوڕێکم خۆشدەوێ!

سەگەکە، لە کۆتا پارچەی، لەگەڵ بۆچوونی تۆفیقی یەک نەبوو، چونکە ئەو پێی وابوو کە شمشاڵەکەی بەرەو مانگ بەرزکردۆتەوەو دەیەوێ هۆنراوەکەی فایەق بێکەس بڵێتەوە: «ئەی مانگ منو تۆ هەردووک هاودەردین!»، سەگەکە وای لێ حاڵی بووبوو، پێی وابوو مانگ لەگەڵ ئەوان هاودەرد نییە، چونکە نە وەک تۆفیقی زڕبراژنی هەیە جەزرەبەو دەربەدەری بکات، نە وەک ئەویش خاوەنی بێوەفای هەیە کە پیرو کەنەفت بوو، بەڕەڵای بکات! بۆیە ئەو پێی وابوو مانگ، وەک ئەوانی لێ بەسەرنەهاتووە، نە وەکو تۆفیقی وێڵو سەرگەردانە بە گوندانەوە، نە وەکو ئەویش بۆ تاقەسەپکێک کلکەسووتەو نووسکانەوەیەتی بۆ خاوەنەکەی! نەبادا لەکاتی پیریو بێهێزی پێی بڵێ سەگەکەم خوێڕی بووەو خەو دەیباتەوەو توانای پاسەوانیی مێگەلەمەڕەکەی نەماوە، منداڵانی گوندی لێ هان بدات بەردبارانی بکەن!

ئەستێرەکان لەحەیبەتی کولەمەرگیی ئەو دووانە، وا خەریکە وەک قۆپچە خۆیان لە کراسی ئاسمان بکەنەوەو بەرەو زەوی لوور ببنەوە، هەرکاتێک نادادییەک دەبینن، دادەچرژێن. سەگەکە لە فکری ئەوەدابوو تۆ بڵێی جارێکی دی هەتاو لە درەختی تەمەنمان بئاڵێتەوە؟ بۆ ئەوەم نییە خۆم لە تۆ جیابکەمەوە، یان هەناوت بە گومان کرمەڕێژ بکەم، من ئێستاش نازانم

قەلەڕەشی ئیقبالم بەرەو کوێ دەفڕێ؟ لام یەقینە وەکو دایکو باوکم شوێنێک نابێت لێی بنووم‌و لاق ڕاکێشـم! مرۆڤەکان چەند بێوەفان! هەتا لەسەر شنگو تاقەتیـن لە گورگانمان بەردەدەن، کە پیربوویـنو لێکەوتین منداڵەورتکەمان تێبەردەدەن، زۆرجار شەیتان سـواری سەرم دەبێ: لێیگەڕێ با گورگ مەڕەکان بخـوا! بەڵام ڕۆحیانەتی پڕ لە وەفای بـابو باپیرانم بانگم دەکەن: هەرگیز ئەو کارە بێوەفاییـە نەکەم، متمانەی مرۆڤەکان لەدەسـت نەدەم، کە پێمان دەڵێن سەگەکان نموونەی وەفادارین!

شوانەکانی ئاوایی تۆفیقیان خۆشدەوێ، دەیانەوێ قەرەبووی بێکەسییەکەی بـۆ بکەنەوە، ئێواران بە تۆفیقیان دەگوت: بەیانی بۆ کاملای مەڕی ڕادەدەی؟ بۆئەوەی ئێمەش بێین بۆ لای تۆو فێری شمشاڵمان بکەی! ئەورۆژە مەڕیان بۆ ناوبەندانی زووری ڕادا، مێگەل تاقو جووت بوون لەو ئاقارەی. شوان خەریکی سـێبازیو کێلەبەردانێ بوون. لەناکاو مشـیرئاغا بە خۆیو دوو خزمەتکاری، بە سواری ئەسـپی لەو ئاقارەی قوت بوونەوە، یەکسـەر ئەسپەکانیان لینگدا بەرەو تۆفیقی، هەرچەندی هەوڵیدا خۆی لەبەر سینگەئەسپان لابدات، وەلـێ بێسـوود بوو، چونکە ئەوان سـێ ئەسپسوار بوون. مشـیرئاغا حەیزەرانێکی بە سـامۆتەی زینی هەڵواسـیبوو، بریقەی دەهات، دیاربوو تازە بە دیاری، بۆ ئەشکەنجەدانی کرمانجەکانی ژێر قەڵەمرەوی هێنابوویان. حەیزەرانەکەی لە سامۆتەی زینی کردەوەو دوو سێ جاری هەڵسووڕاند پێی وابوو ناکرێ بێئەوەی یەکێکی پێ دارکاری بکات، لە کیفەکەی بنێتەوە! دوو سێ جنێوی ناشیرینی بە تۆفیقی دا: هەی سەگباب! دەتەوێ مەڕی لەنێو دەغڵودانی ئێمە بکەی؟ تۆفیقیش، لە ترسـی حەیزەرانی ئاغای، هەردوو دەسـتی لەسەر سەری خۆی

دانابوو، گوتی: بە گۆڕێ داکم لێنەگەڕاوم یەک گیســک لە تخوبی بپەڕێتەوە نێو دەغری ئێوە، ئەوجا دەغلۆدان هێندە بەرزنەبۆتەوە وەبەردمی مەڕی بکەوێ! دیاربوو مشیرئاغا بڕیاری پێشوەختەی خۆی دابوو حەیزەرانەکەی تاقیبکاتەوە، حەیزەرانێکی بەهەموو هێزی خۆیو بێبەزەییانە، لەســەری تۆفیقی قایم کرد، یەکسەر خوێن کوفارەو فلوچقەی کرد. مشیرئاغا کە زانی زۆر خراپی لە تۆفیقی داوە، حەیزەرانەکەی کاریگەر بووە، جڵەوی ئەسپی راکێشاو سووڕایەوە، رکێبی لە ئەسپی داو ڕۆیشت، دوو خزمەتکارەکەش وەک یەخترمە[1] بە دووایەوە!

شوانەکانی هاوڕێی تۆفیقی لێی کۆبوونەوە، گنجیو بەرمیزەیان لە برینەکەی ئاخنی، بۆئـــەوەی بیبرژێنێتەوەو خوێنەکەی ڕابگـــرێ، جەمەدانییەکەیان توند لە برینەکـــەی پێچا. لەو فرکان فڕکانو ڕمبازیی ئەســـپان، یەک لە خزمەتکارو پیاوەکانی مشــــیرئاغای، لاقی مەڕێکی شکاندبوو. ئەوڕۆژە بە کەلوکرۆمکراوی، بە خـــۆیو مێگەلەمەڕەکەی گەڕانـــەوە گوندی. خاوەنمـــاڵ، پیاوێکی پیری کزی ڕیوەڵەی کەپوو درێژ بوو، بە هۆی نەمانی ددانەکانی، ســـەری کەپووی هێندەی نەمابوو بگاتەوە ســـەرچەناگەی. دوو کوڕی گەنجـــی هەبوون، کوڕەکانی کاتێک تۆفیقیان بەو حاڵەوە دیت، زۆر ناڕەحەت بوون، گوتیان: مشـــیرئاغا تۆڵەی قوونی بابی لە شـــوانێکی بێدەســـەڵات دەکاتەوە! ئاخر لەکوێیان گاوەو لەکوێ پڕکێشی خەنجەرێ دەکات! دەورەیان لە تۆفیقی دا، ســـەریان بە تەنتریۆی برژاندەوەو بۆیان پێچایەوە. بەڵام بابیان کە دیتی مەڕێک لاقی شکاوە، دنیای لەپێش چاوی تاریک بوو، پشـــتی کردە تۆفیقی، مەڕەکەی پێ گرنگتر بوو، نەیدەبڕییەوە خۆش خۆش دەیگوت: بەس پێم بڵێ لاقی ئەو مەڕەت چۆن شکاند؟ تۆفیق چەندجار سوێندی

---

١. یەخترمە: ئەو وڵاخەبەرزەیەی کە وابەستە و هۆگری ئەسپێک دەبێ و لەدوای نابێتـەوە.

دەخوارد کە ئەو نەیشکاندووەو پیاوەکانی مشیرئاغای شکاندوویانە، بێسوود بوو، پیرەپیـاو کەفی لە لالغـاوەی مەیی بوو: بەس پێم بڵێ بـە داری لێتداوە یان بە بەردی؟ هەرچەندی تۆفیق بە سوێندانەوە، خەریک بوو ڕەش بێت، ئەو نەدەچووە گوێی و دەیویست لەبری ئەو لاقشکانە، لە بەراتەکەی کەم بکاتەوە.

ئەورۆژە چێشـتی نیسـکێنەیان هەبوو، هەریەکەو لەگەنێکی نیسکێنە لەبەردەمی بوو، پیرەپیاو بەهیچ شـێوەیەک کەلێنی نـەدەدا تۆفیق نانەکەی بخوات، هێندی پرسیارکوتو سەرزەنشتی بکات! کوڕەکانی بە جووتە گوتیان: بابە وازی لـێ بێنە نانەکەی بخوات! ئەتۆ خەمی شـکانی سـەری تۆفیقت نییـە، خەمی مەڕەکەتە؟ ئەویش بەبنی چاوی لێـی مۆڕدەبۆوە: دە بخۆ چاو زەق بخۆ! ئەوە بـە بەردیت لێداوە، یان بە داری؟ نانەکەی لێکردە قوززەلقورت! تۆفیق بڕیاریدا شـەرتی بپەڕێ، چی دیکە لەلای ئـەو پیرەپیاوەی ڕێنجبەری نەکاتو شـەرتی نوێ نەکاتەوە، ئاخر شکانی لاقی مەڕێکی چیە؟ وا کردی بە کراسەکەی عوسمانی[1] و نایبڕێتەوە!



---

١. کراسی عوسمانی: عوسمانی کوڕی عەففان، سێیەم خەلیفەی موسڵمانان و زاوای پێغەمبەر، ئەسحابە ناڕازییەکان کوشتیان. نائیلەی ژنی کە نزیکەی حەفتا ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو، ویستبووی بەرگریی لێبکات، بە شمشێر پەنجەکانیان پەڕاند. مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، والیی شام، کراسە خوێناوییەکەی عوسمان و پەنجەکانی نائیلەی بە دارێکەوە هەڵواسی و سەد هەزار جەنگاوەری موسڵمان لە بن کراسەکەی دەگریان. بۆیە، شەڕکردن لەسەر ئەو بابەتە درێژەی کێشا و نەبڕایەوە. دواتر کراسەکەی عوسمان بوو بەئیدیۆم بۆ درێژەکێشانی هەرکێشەیەک کە نەدەبڕایەوە، بەکاردیت.

# ١٩

سابیر یەکێک لە خزمەکانی کاکەڕەشی بوو، خاوەنی یازدە منداڵ بوو، منداڵی دیکەشیان بەڕێوە بوو. بۆیە کاکەڕەش هەموو جارێ بەتەوسەوە پێی دەگوت: پێمخۆشە منداڵی زیاتر بخەنەوە، با بە وەجاخکوێری نەمری!

ڕۆژان ئەو وەختانە تاوو بان گەرم بوون و خۆر لە تاقی ئاسمانێ بوو، بەڵام ئەو بەیانییە هەورێکی ڕەش‌و قورس بەربینگی ئاسمانی گرتووە، هەر گرمەی دێ‌و تاریکتری دەکات، شریق‌و هۆڕی گەوارەو هەورەکان برووسک لە سەر برووسک دادەچرژێننە سەر زەوی‌و دەڵێن ئەوە قامچیی جبرائیلیە لە هەورەکانی دەداو نەعرەتە دەکێشێ‌و دەڵێ: دەی ببارە! هەور شۆڕابەی گەیشتۆتە سەر زەوی، وەک سوارئەسپی کارامە بیەوێ گوریسێک لەسەر زەوی هەڵبگرێتەوە، پەنجەکانی لە بەرۆکی عاردی گیرکردووە.

کۆڵان لە قیژەی هەمینێ‌و شریقەی هەورەکان ڕادەچڵەکی، هاوسێژنەکانی دەڵێن: دەگ بابانت بە قوڕێ بگیرێ هەمین! دیسان کەوتەوە سەر ژانو قەوەتان! ئەو بابانکۆرە ساڵ بێری ناکات، ڕەحمی بە خۆیدا نایەتەوە، لوولەی سارد ناکاتەوە! دیسان سابیر بۆ مامانی بەپەلان کەوت!

هەمیـــن ژنێکی پانوپۆڕی چوارگورچیلەیە[1]، پازدە منداڵی بوون، چواری مردوون و یازدە منداڵیشی بۆ ماوەتەوە. سابیر پیاوێکی سوورەی هولە[2]، بەلای کووڕپیدایە، ملی کورتەو سەرشـــانەکانی بەرزبوونەتەوە، ناتوانێ گورج ســـەری بســـووڕێنێتەوە. زۆر لە برادەرە هاوتەمەنەکانی هەر لە منداڵییەوە پێیدەڵێین ســـابیر ملبەراز! ســـابیر، هەرکە هەمینی ژنی دەبینی زگی هاتۆتە بەردمی، بەرلەوەی بکەوێتە سەرژانو قەوەتان، دەبوو بە دوای مامانیدا بگەڕێ، چونکە مامـــان لەو گوندەی ئەواندا نەبوو. جاری وا هەبوو ســـێ گوندی دەکرد، تاوەکو مامانی پەیدادەکرد. ئەو ســـبەینەیەش، هەرچەند هەمین دوو ئەســـتوورکی دووئەنگوتکی، بەماســـتی خوارد، بەڵام بە سابیری گوت: پێچم بە زگی دادێو وەختی خۆمە! ســـابیر بەپەلان کەوت. ئاخر هەموو وڵاخەک بۆ لێسواربوونی مامانی نابێ! بۆیە چووە ماڵی حاجی ســـمایلی داوای یەختەبارگینەکەی کرد، بۆئەوەی لە گوندەکەی ئەوبەری ڕووباری، مامانەکەی پێبێنێ. حاجی ســـمایل بەدەم کردنەوەی ڕێشمەی یەختەبارگینەکەیو هێنانەدەری لە تەویلەی، دەیزانی بەدوای مامانیدا دەگەڕێ، بە سابیری گوت ئەو کورتانەی لەبەردەرکی عەمبارێ بێنێ، گوتیشی: سابیر خراپ لێم حاڵی مەبە، بارگینم لە تۆ چاو نییە، ئەوەی دەیڵێـــم بۆ تۆمە، برام ئاخر ئەوەی ئەتۆ لەگەڵ هەمینێی دەکەی، کاری کردەنی نییە، پێم ناڵێی هەموو ســـاڵێ منداڵێکتان بۆ چییە؟! ئەلحەملای منداڵتان لە خۆتان زیادە، خوا دەکا ئەو مندالانەتان بە جوانی گەورە دەکەن! سابیر گوتی: مام حاجی بەشم لە هەرچوار مەزەبی خوای براپی گوناحی منی تێدانییە، ئەو

---

١. چوارگورچیلە: کینایەیە بە کەسی ئازا و خۆڕاگر و بەتاقەت.

٢. هول: خول، ملئەستوور.

هەمینە سەر بەهەشەی من هەر بەعاستەم پوشکەی بە زگیدا بێنی سبەینێ ئــاوس بووە! چما ئەمن نازانم بێجگە لەو زگەی ئێســتا، یــازدە منداڵمان بۆ ماوەتەوەو چواریش عەمری درێژیان بۆ ئێوە بەجێهێشتووە!

لەگەرمەی ئەو قســانەدابوون، هیدۆش پەیدا بــوو. لەکاتی کورتانکردنی یەختەبارگینەکە حاجی ســمایل بە ســابیری گوت: بەتەنیا مەڕۆ با هیدۆت لەگەڵ بنێرم! سابیر گوتی: کەسم ناوێ بەتەنیا دەڕۆم.

سابیر بە لۆقەو چوارناڵە خۆی گەیاندە ماڵی مامانێ. زۆری لەبەرپاڕایەوەوەو خۆی دەستەودامێن کرد، مامانەکە خۆی پێچایەوەو لەسەر تەندووری سواری یەختەبارگینەکەی بوو. سابیر لەپێشــەوە جڵەوی ڕادەکێشاو خۆیان گەیاندەوە گوندی. خەڵکی گوندی یەکەمجاریان نەبوو سابیری بە مامانەوە ببینن! سابیر، مامانی ئاوقای ژوورێ کردو چوو یەختەبارگینەکەی لە تەویلەی ببەســتێتەوە، هەتا هاتەوە مامان بانگیکرد: بڕۆ لە مزگەوتێ قورئانێکی بێنە لەپشت سەری ئەو ژنە زێســتانەو ئەو دوو منداڵەی دابنێن، مزگێنی! دوو کوڕتان بە زگەکی بووە! هەمینی شــۆخو شــەنگ دوو کوڕی کاکۆڵ زێڕینی بۆ هێناوی، ئەگەر قورئانیان لە پشتەسەری بێت، شەوە زەفەریان پێنابات!

ئەوســاڵە مەلا وەیسی مەلای گوندی بوو، پیاوێکی بەژنو باڵا کورتیلەو کز بوو. بەڵام هیممــەت و باوەڕبەخۆبوونی، کێوێک بوو! لاقی چەپی زۆر کورتتر بوو لە لاقی ڕاستی، بەشێوەیەکی ســەرنجڕاکێش دەشەلی، بەجۆرێک لەگەڵ هەرهەنگاوێکی، وەک بکەوێتە نێو قوڵکەیەک و بێتەوە دەرێ.

هەرچەنــدە مــەلای دوازدە عیلم بوو، بــەڵام مۆڵەتــی مەلایەتی و ئەو شــارەزاییەی لە ئاین هەیبــوو، وای لێنەکردبــوو ژیانی خۆی پــێ لە ژیانی

نەخوێندەوارەکان باڵاتربێ. هەمیشـــە نوێژو خواپەرســـتییەکەی بۆ ڕزگاربوون لە ناعەدالەتی و چەوســـاندنەوە بوو. لە توانای کەم کەسدا بوو پەسنی ئاکارە مرۆڤدۆستییەکەی بکاو بژمێرێ!

هەرچەندە لاقێکی ناتەواو بوو، بەڵام هەموو کارەکانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بە دەستەکانی خۆی دەکرد، نەیدەویست ببێتە بار بەسەری خەڵکیەوە. بەهۆی دەستکورتیەوە، توانای کڕینی جووتەئێستری نەبوو، بە جووتەکەرێک جووتی دەکرد. شاقەلی کەوای لەبەرپشتی دەنایەوە لە کاتی جووتکردن. لاقەشەلەکەی دەخســـتە سەر بارســـتایی خەتەجووتەکە بۆئەوەی پارســـەنگی هەنگاوەکانی بـــۆ ڕابگرێ. نێولەپی دەســـتی جیاواز لە نێولەپی زۆربـــەی مەلاکانی دیکە، قەڵشـــیبوون، ئایاتەکانـــی حەڵاڵخۆرییـــان لێدەخوێندرایـــەوە! هەندێک لە مەلاکانی ئەو نێوە، تانەو تەشـــەریان لێدەدا، گۆیا عیلمەکەی سووک کردووە، چۆن دەبێ مەلا بەدەستی خۆی کاربکات؟!

ئاغاکانیش خۆشیان نەدەویست، چونکە تەسبیح و بەرماڵەکەی نەکردبووە خزمەتیانەوە، لە پەنایدا دەســـت بۆ زاڵمان لە ملی بدات و بۆ کارە ناڕەواکانیان ببێتە خدر ئەشەدەن، بۆیە زۆرجار ئاغاکان دەیانگوت مەلا وەیسی کۆمەنیستە!

ســـابیر پێیەکی هەر لە ژووری بوو، مامانەکە گوتی: لە بیرت نەچێ، دوو بێژینگ یان سەرەند بێنە ئەو مەلۆتکانەی بە قۆنداغەیی لەسەر دابنێن! سابیر بەرلەوەی بچێتە لای مامۆســـتای، تی چاوێکی دا هەمینێ، دوو مەلۆتکەی ڕووتی لـــە دامێنی دانراوەو ژانی لێیەو قەوەتان دەکات. هەر بەپەلە چووە لای مەلای ئاوەدانی: مامۆستا قورئانێکم بدێ، ئەویش گوتی: سابیر دەستنوێژت هەیە؟ گوتی: نەوەڵڵا. بەپەلە دەســـتنوێژی هەڵگرتو مەلا قورئانێکی لەنێو

پەرۆیەکی ســـەوزی ئەستوور، دایەدەستی: سابیر، کوڕتان بووە یان کچ؟ سابیر گوتی: مامۆستا هەتاوەکو ئەو کاتەی هاتمە خزمەتی جەنابت دوو کوڕی بووە، بەڵام بە خوای لێت ناشـــارمەوە، هێشـــتا قەوەتی دەکـــردن، لەوەیە هەتا ئەمن دەگەڕێمەوە ئەو ژوورەی پڕ لە منداڵ کردبێت!

مامۆســتا پێکەنی: خوا بەخێری بگێڕێ، بە قورئانی لەســـەر ڕانی چەپم داناوە، هەمین ماین بایە، بابی هەموو پۆلیسی سوارەی هەولێریی جوانەئەسپ، هێنابـــوو! ئەوەیە ماینی باش! هیچ ســـاڵێکی خۆی بەتـــاڵ ناهێڵێتەوە، یاخوا بەرەکەت بکەی هەمین!

دیاربوو خوشکەکەی ســـابیری لەگەنێک تەرەحەلوای بۆ هەمینێ هێنابوو. ســـابیر ناقایل بوو، چونکە تەرەحەلوایەکەی پێ کەم بوو: خوشکێ! هەمین نێو هەناوی وەکی لەودەی کای چۆل بووە! کوا بەو لەگەنە تەرەحەلوایەی پڕدەبێتەوە؟! ســـابیر لەفکران ڕاچووبـــوو، دیاربوو کەوتبـــووە بنبارەکی خەمـــان: ئێمە یازدە مندارمان هەیە، بەو دوو مندارەش تازە بووینە سێزدە، سێزدە، ژمارەیەکی شوومە، دەبێ هەتا زووە مشووری ئەوەی بخۆین بیانکەین بە چواردە! ئای لەو ژمارە بەدە، ئێستاکە ناتوانین ناویشی بێنین، پێی دەڵێین زیادە!



# ٢٠

هیدۆ دەمێک بوو کەڵکەڵەی چوون بۆ شاری، تەواوی مێشکی داگیرکردبوو. زۆرجار سەردانی شاری هەولێری دەکرد، دەورێکی نێو قەیسەریو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی گەڕەکی جوولەکانی تەعجیلو، سەرێکی لای حەمامی مۆدەیشی دەدا، بەدیار چڵکاوی ئاوەڕۆی جۆگەلەی حەمامی مۆدەوە هەڵوێستەیەکی دەکرد. ئاوی جۆگەلەکە لەگەڵ سابووناو شین هەڵگەڕابوو، بۆنی دەرمانحەمامو گڵەسەرو کەفاوی بۆنخۆشو سەرئاوکەوتنی داوەپرچی ئارمووشئاساو مووی مرداری خۆتاسولووسدانی ئەو ژنانەی لە چاوەڕوانی هاوسەرەکانیاندان، بە لێواری جۆگەلەکەیەوە نوساون! هیدۆ چێژی لە بینینی ئەو دیمەنەو هەڵمژینی ئەو بۆنە مێینانە وەردەگرتو هەستی نێرینەیی دەورووژا، تەماشای ئەو پەنجە شووشو خرپنانەی ژنەکانی دەکرد کاتێک لێوی عەباکانیان پێدەگرتو لە خۆیان دەهاڵاند، کە لە حەمامکردن، سپیو پۆش هەڵگەڕابوون. ژنەکان ئەو نێوەیان پڕدەکرد لە بۆنی حەمام. ئاواتەخوازبوو بچێتە نێو حەمامەکەو لەسەر هەمان جورنەی ئەو ژنە خۆی لێشووشتییە، ئەویش خۆی بشوات! هەرچەند سەرنجی ڕووخساری ئەو شۆخە شەرمنەی دەدا، سوێندت خواردبایە سوێندت لێ نەدەکەوت، تاوەکو ئێستا نێرینەیەک

سڵاوێکی حەرامی لێنەکردووە! گرشەو بریسکەی کوڵمە بەفرو خوێنئاساکەی، برای خۆی حەیران دەکرد!

هیدۆ، بە بێنووی وەرگرتنی چەرخ یان شەمچە بۆ داگیرساندنی جگەرەکەی، لەلای ئەو پیرەمێردەی بەرامبەری حەمامێ لەسەر کورسییەکی دار دانیشتبوو، هەڵوێستەیەکی دەکرد. ئەو پیرەپیاوە ترپاتی تەڕی هیچ حەیرانێکی تێدانەمابوو، هەر بۆئەوەی پووزی ئەو ژنانە بە چاوی گەنجی کە بەپێشیدا ڕەت دەبوون، ببینێ، شووشەی عەینەکە زەڕەبینەکەی دەسڕییەوە، بەڵام شووشەی عەینەکەکەی هێندە تەڵخ بووە، چ کەلکێکی وای نەماوە! هاڵاو و هەناسەی بۆ کاتی جاحێڵی، هێندەی دیکە شووشەی عەینەکەکەی تەڵخو تاریکتر دەکرد، بێئاگا لەوەی دەمێکە کەوتۆتە لێژبوونەوە!

هیدۆ لە گەڕانەوەی بۆ گوندەکەی خۆیان، هەواڵی غەدرێکی گەورەی ئەحمەدئاغای خاوەنی گوندەکەی ئەوبەری ڕووباری، بۆ کاکەڕەشو ئاوایی هێنایەوە، کە چۆن کەرامەتی مرۆڤێکی شکاندووەو ئەتکی کردووەو جووتیارەکانیش لە داخان جەژنیان نەکردووە. کەسێک تێک چووبێت، چۆن ئاوا هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ!

ساڵێک لەمەوبەر و پێشنیوەڕۆی یەکشەمەیەک، لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە جەرگبڕەی لەدەستی قەومابوو، باری دەروونی تێک چووبوو. ئەوە لە ژیانیدا سەرەتای ڕۆژێکی کارەساتبار بوو. لەو ڕۆژەوە هەمیشە زستانان بە جلوبەرگی قوڕاویو هاوینان بە جلوبەرگی تۆزاوی بەدوای تراکتۆرەکان دەکەوت. لە هەرشوێنێک تراکتۆری دیبایە، هەرچوار تایەی پەنچەردەکرد. کەم کەس سەرگوزشتەو چیرۆکی ئەوی دەزانی کە بۆچی بۆتە قاندرو دوژمنی تراکتۆران.

ئەوەشـــیان چیرۆکێکی خەماوییە، بەڵام دنیاپەرســتی بێئەمەک هەست بەو ئازارەی ناکەن!

هەرکاتێک ژنەکەی یان هەرکەسێکی دیکە لێی دەپرسی: جەمیل بۆ کوێ دەڕۆی؟ دەیگوت: دەچم منداڵەکان دێنمەوە، سەرمایان دەبێت لە دەرێ!

ئەو ئاگرەی بەربۆتــە هەناوی، بە هیچ دڵدانەوەیــەک دانامرکێتەوە، هیچ ســەردوولکەو لاواندنەوەو حەیرانێــک ئارامی ناکاتــەوە. گیرفانی، بەدایم پڕە لە کەلاشووشــەی کوڕەکانــیو بووکەڵەی کچەکەی. ژنەکەشــی پێیەکی هەر لەســەر قەبران یان بەســەر ئەو لانکەدا دەگرێ کە هەرســێک منداڵەکەی تێــدا گەورەکردبوو. کۆڵان، پڕە لە زاقو زریقــی منداڵی گەڕەکێ. لەبەرخۆیەوە دەیگــوت: کۆڵانەکان وەکو خۆیانن، بــەس منداڵەکانی ئێمەی تێیدانین! ئەو پرســیارانە خەریک بوو مێشــکی دەهاڕی: بۆ تاقە یەک منداڵم بۆ نەماوە؟ هەرچەندی تەمی ســەر نەینۆکی ماڵەوەی دەسڕی، ئیتر نەینۆکی ماڵەکەمان منداڵەکانی ئێمەی تێدا نین! بۆچی منداڵێک نییە پێم لەسەرپشــتی دانێو بڵێم ڕۆڵە تۆزێک بۆم بشــێلە! خەمی ئەوەمە لە داهاتوودا کەس نازانێ ئێمە پێنج ســەرخێزان بووین! ئەوانەو زۆر شتی دیکەی لەبەرخۆیەوە دەگوت. ئاخر مەودای نێوانی بــە زیندوومانەوەو مردنی منداڵەکانــم هەر دوو مەترو دوو چرکە بوو. ڕۆژ تا ئێوارێ مەراقــی منداڵەکانی کۆدەکردەوە. هەموو ڕۆژێکی یەکشــەممە دەبوو مەســیح هەســتێتەوە، ئەتۆ بڵێی منداڵەکانی ئێمەش دەست بەدامێنییەوە نەگرنو هەڵبستنەوە!... هەرچەندە ئومێدی گەڕانەوەی منداڵەکانی وەک بە دیارکەوتنەوەی مەهدیو گەڕانەوەی موســایە بۆ ئەرزی میعاد! بەڵام هــەر چاوەڕوانەو، بەو ئومێدەوە هەناســەدەدات خەونەکانی، لە

پەراسووی موعجیزەیەکدا شین ببنەوە!

ئەو ئێوارەیــــە، هەموو خەڵکی گوندی لەســـەربانو شـــوێنە بڵندەکان لە چاوەڕوانی دیتنی مانگدا بوون، بۆئەوەی ئەگەر مانگ ببینن، شـــاهیدی بدەنو بەیانی بیکەن بە جـــەژن. ئەورۆژە جەمیل بێئەوەی بە خـــۆی بزانێ، چووبووە گونـــدی ئەحمەدئاغای لەوبـــەری ڕووباری، هەرکە چاوی بـــە تراکتۆری ماڵی ئاغـــای کەوتبوو، وەک ئەو خووەی گرتبووی، دەمودەســـت هەرچوار تایەکانی پەنچەرکردبوو. کاتێک ئـــەو هەواڵە گەیشـــتبووە ئەحمەدئاغای، گوتبووی: بڕۆن بـــۆم بێنـــن! پیاوەکانی بە شـــەقو زللـــە جەمیل دەهێننـــە بەردەمی ئەحمەدئاغـــای. دیارە ئەحمەد ئاغا بەوەندە لێدانـــە دڵی ئاوی نەخواردۆتەوەو کوڵـــی دڵی دانەمـــرکاوە، بۆیە فەرمان دەکات بیبەنە تەویلەی وڵاخان، ســـەرو ســـمێڵو برۆی بتاشن، سەراوین هەڵیبواســـن، دوکەڵی کای جۆی لە بن لووتی بکەنەوەو قانگی بدەنو دارکارییەکی وایشـــی بکەن، چاوی خەڵکی پێپشکێ! هەرچەندی هەندێک لە پیرەپیاوەکانی ئاوایی تکادەکەن بەو بەرەجەژنانەی لێی ببوورێ، چونکە ئەو کەسە تەکلیفی شەرعیی لەسەر نییەو تێک چووە، بەڵام ئەحمەدئاغا مکوڕتر دەبێت لەسەر سزادانو ئەتککردنی.

عەتارێک جەمیلی دەناسیو چیرۆکی هۆکاری پەنچەرکردنی تراکتۆرەکانی دەزانی. بەرلەوەی باری دەروونی تێک بچێت، ڕۆژێک منداڵەکانی، کچەکەیو دوو کوڕەکەی، خەریکـــی یاریکردن بوون، جەمیل بە تراکتۆرەکەی کشـــاوەتە دواوە، هەرســـێ منداڵەکـــەی پان کردبۆوەو مردبوون، جەمیـــل لەوڕۆژەوە باری دەروونی دەشێوێت و هەر تراکتۆرێک ببینێ، پەنچەری دەکات!

دوو ڕۆژ بوو هەورێکی ڕەشو چڵکن بەرۆکی ئاســـمانی بەرنەداوە، ڕۆژێکی

گــرژو مۆن بوو، هەواڵی ئەو غەدرە لەنێــو جووتیارەکانی ناوچەکە ئەو زار ئەو زاری دەکرد: غەدرێکی گەورەیە! هەرچی لەگەڵ ئەحمەدئاغای بیکەن بارتەقای ئەو کەرامەتشکاندنەی جەمیلی نییە! کاکەڕەش و هیدۆ بڕیاریاندا تۆڵەی ئەو غەدرە لــە ئەحمەدئاغای بکەنەوە. گوندی ئەحمەدئاغای، ســەعاتەڕێیەک لــە گوندی ئەوانەوە دوور بوو. دەیانویســت بەجۆرێــک تەمبێی بکەن بزانێ دەســتێکی پۆڵایین لەپشــتی خەڵکی هەژارەو نایەڵێ هیچ زوڵمێک بێ سزا تێپەڕێت. بۆئەوەی هیچ ئاغایەک زاتی کاری وا نامەردانە نەکات!

ئەوشــەوە کاکەڕەش و هیدۆ تراکتۆرەکەی ئەحمەدئاغایــان ئاگر تێبەرداو لەسەر دیواری حەســارێش بۆی لە کەمین بوون، بۆئەوەی کە بۆ کوژاندنەوەی تراکتۆرەکەی هاتنەدەرێ، بکەونە ژێــر ڕەحمەتی لوولەی تفەنگەکانیان. بەڵام ئەحمەدئاغا وەک ڕێوی فێڵباز ناخیچێ[1] و تێناکەوێ! هەرچەندی، کوڕەکانی خۆیان ڕادەپسکێنن بۆئەوەی بچن تراکتۆرەکە بکوژێننەوە، ئەحمەدئاغا ڕێیان پێنــادا، دەزانێ ئەوە تەڵەیە، بۆیە، هەتاوەکــو تراکتۆرەکە کڵوکۆی دامرکایەوە کەس نەچووە دەرێ بیکوژێنێتەوە.

کاکــەڕەش و هیدۆ، کاتێــک لە هاتنــەدەرەوەی ئەحمەدئاغــاو کوڕەکانی بێئومێد بوون، هەر بۆ ترســاندن و شــکاندنی لووتبەرزیی ئاغایانەیان، چەند دەسترێژێکیان ئاڕاستەی دەرگاو ماڵەکەی کرد، کاکەڕەش گوتی: نابێت بە دیار شکۆی شــکاوی هەژارانەوە باوێشــک بدەین، بەڵکو دەبێ گەرماوگەرم دەبێت هەقیان وەرگرینەوە. ئــەو تەمبێکردنە بۆ ئاغاواتــی ناوچەکە، مایەی ترس و

---

١. ناخیچێ: بەهەڵەداناچێ، بەهەڵەدانابردرێ.

دڵەڕاوکێ بوو، کە بە دوو چاوی خۆیان دەیانبینی لە جێی هەر زوڵمێکی ئەوان، دەستێکی نادیاری تۆڵە هەیە!

تەمێکی سپی وەک هوڕەی لۆکەی پەڕەکراو و لیزگەی پرپرەی زیو، خۆی لە قەدو باڵای چیای قەرەچووغ ئاڵاندووە، وەک بە دوای ونبوویەکدا بگەڕێ! سەر بە هەموو دۆڵاو گەلیو کونو کەلەبەرو ئەشکەوتێکدا دەکات. وەک پێچی مەندیل، خۆی لە بڵندایی ئاشی بای وەرپێچا. تەمێکی هێندە گشتگیرە دەرکی بازاڕگەو زوورگەزراویشی گرتەوە، شۆڕبۆوە بۆ ناوبەندانێو خۆی لە دۆڵ بە دۆڵی دەسویو ئامێزی بە هەموو گردەکاندا دەکرد. جارجار قوتکەیەکی بڵند، وەک چاوشلکانێ لەگەڵ خۆردا بکات، سەرو گەردەنی خۆی لەنێو تەمتومانێ هەڵدەکێشا. کاکەڕەش، کە لە دابەشکردنی ئەرکەکان جووتکردنی بەرکەوتبوو، لەلایەن باوکییەوە ئاگادارکرایەوە کە ئێستا کژەو زەوی نەرم بۆتەوە، کاتی شۆبڕینەو[1] پەرێزێکی زۆریان هەیە بۆ ئەوەی شۆی ببڕن.

کاکەڕەش، جووتەهێسترێکی بەکارو بارەبانی هەیەو تێرئالیکن، دەیەوێت لەو پەرێزەی لای قەلاوەیرا دەست پێبکات، چونکە هیدۆش زەوییەکەی لەو دەورو بەرەیەو لە یەکترییەوە نزیک دەبن، بۆئەوەی بەیەکەوە هاتوچۆ بکەنو لە کاتی ڕووداوی نەخوازراو و نانەوەی پیلان بۆیان، ئاگاداری یەکتری بن. هەردووکیان، یەکەو دەمانچەیەکی چواردەخۆرو چەند یەدەگ فیشەکیان بۆ ڕۆژی لێقەومان و مەبادایێ، لە جۆرکی ئالیکی ولاخەکانیاندا شاردۆتەوە.

کاکەڕەش، گاسنو هەوجاڕو مژانەو نیرو بارێنەو بنملو زەنگوڵەو

---

١. شۆبڕین: وەرد و شۆ، کێڵانی زەوی و ئامادەکردنی بۆ کشتوکاڵ.

داركراوەو سەرمژانكەو لاپووتەو قیسی جەلعەی ئاوی جوتیاری ئامادەكردو لە پێداویستییەكانی جووتكردنێ، لە هیچی کەم نەبوو. لەگەڵ بارانی حەوتووی ڕابردوو، قەسەڵ بەسەریەكتردا كەوتوونو بریقەی دەدەنەوە. پەرێز سپیكێڵ[(١)] بووە و كەروێشک لانی تێداكردوون. لەو ئاقارەی سەرسەدەی جووتەهێستری، لە سەرسەدەی جووتە گوێدرێژی، درێژترە، چونکە دووریی سەرسەدەكان بەگوێرەی توانای وڵاخەكان دیاری دەكرێ، بۆئەوەی لە كاتی هۆدانەوەی[(٢)] سەرسەدەی، پشووێک بدەن، قورسایی ڕاكێشانی گاسنو هەوجاڕیان لە سەر ملی كەم ببێتەوە. زۆربەی جووتیارەكان لە كاتی جووتكردن شەروارو دەرپێیان دادەكەنن بە گونڕووتی جووتی دەكەن، لەبەر دوو شت: یەكیان، بۆوەی شەروارەكانیان نەدڕێ. دوومیین، بۆئەوەی لە كاتی هەنگاونان سووكتربنو شەرواریان لە لینگان نەهاڵێ. دەبێ سێ جاریش زەوی بكێڵن: شۆبڕین، وەردانەوەو تۆكردن، شۆبڕینو وەردانەوە بە هەوجاڕو گاسن ئەنجام دەدرێ، هەرجارەی یەک خەت دەكێڵنو جووتیار دەبێ دەستەندووی داگرێ بۆئەوەی خەتەكەی قووڵ بێت. تۆكردن ئامێرێكی سێ گاسنەو ئەویش وڵاخ ڕایدەكێشێ. جووتیار نانی بەیانیو نیوەڕۆی لە ئاقاری دەخوات، تەنها بۆ نانی ئێوارێ دێتەوە ماڵێ.

كاكەڕەش ئاوێنەی بۆ هیدۆی ڕاگرتو قریوەیەكی كرد، بۆئەوەی جووتەكەی بەربدا، ئێوارەیە بەرەو ماڵ ببنەوە. هیدۆ دەیگوت: كاكەڕەش چاک نییە هی

---

١. سپیكێڵ: پەرێزێک كە دوای بارانی پەڵە دەكێڵدرێ وەردو شۆ دەكرێ. كەم وایە ئەو سپیكێڵانە لانی كەروێشكیان تێدا نەبێ.

٢. هۆدانەوە: كاتی سووڕانەوەی جوتێر لە سەری سەدە (لەوسەری خەتی جووتكردن) وڵاخەكەی دەنگ دەداو دەڵێ: هۆۆۆۆۆ وەرە هۆو!

تۆ جووتەهێســترەو بەهێزن، بەڵام هی من جووتەکەرن، شــەویلاگم شل دەبێ هێندەی هەچچەیان لێبکــەم! باوکمو دایکمو خێزانم دەڵێن خۆ تۆ شــەوێش ناحەســێیتەوەو هەر جووتی دەکەی، هەچچە هەچــەت دەگاتەماڵەجیرانان! بــەو خوایەی ئەگەر یەک ڕۆژم لە ژیاندا مابێت، ماڵم دەبەمە شــاری، قابیلە لەبرسان بمرم، لە شاری کاســبییەک هەر دەبێ بیکەم، بەخوای ئەمن لەسەر بەردیش خۆم دەژیێنم! یان چەرخی چەقۆو مقەســت تیژکردنەوەی دەگێڕم یان دەبمە تەنەکەچیو پریمزو فانۆسو سۆبە چاک دەکەمەوە!

کاکەڕەش بەگاڵتەوە دەیگوت: ئەوجار بۆ لە حەمامی مۆدەی هەولێرێ بەشی ژنان، نابییە ناتــر؟ بۆ ئەتوو پێتوایە لە هەموو هــەوران هەر بارانە کاکی خۆم، ئەوەی بۆ عوســە لێدە برنجەی ڕێک کەوت! وادەزانــی هەرچی چەرخی چەقۆو مقەس تیژکردنەوەی پێبێت پەسیرەکی بۆ هەڵدەکەوێ؟! باش بزانە، شار بنیادەم قووت دەدا، کاتێکیش دەیتفێنێتەوە کەڵکی هیچی پێوە نەماوە! ناکرێ بە ئاواتی خەوتن لەگەڵ پەســیرەیەکی، کرمانجی چەوســاوە بەجێبێڵی، کــە چاوەڕوانیو ئومێدی زۆریان پێــت هەیە! ئەوجا ئەدی ئێمە، برا نین؟! چۆن دڵت دێت ئەمن بــە تەنها جێبهێڵی؟ ئەمنو تۆ زۆرکاری گرنگمان ماوە بەیەکەوە تەواوی بکەین! ئەتۆ پشــتم چۆڵبکەی، دڵنیــام دەمکوژن! ئەمن بە تۆوە هەم، دەســتوەکەریو ئازایەتی تۆیە ئەمنی لەسەرلینگان هێشــتۆتەوەو کەس ددانی پێمدا ڕۆناچێ! خەڵک، هێندەیان ئەمنو تۆ بەیەکەوە دیوە، ئەوانەی ناویشمان نازانن کە بەتەنیا دەمبینــن دەڵێــن ئەدی کوا ئەوەکــەی دیکەت بۆ لەگەڵ نییــە؟ هیدۆ گوتی:

کاکەڕەش بەسەری تۆ، شارم لەبەرئەوەی پێخۆش نییە ببمە ڕیخەڵۆکخۆر[١]، لەبەرئەوەمە لە شاری ئاغای لێنییە. لە گوندی وەکی گای قەش دیارین، لە دوورڕا دەماننناسن، پیاو لە شاری خۆی ون دەکات. ئەوجا لە شاریش بم هەرکاتێک پێویستت بە من بوو ئاگادارم بکە دەلحازی دەگەمە لات، ئەمن پێم خۆشە هەموو حەفتەیەک بەسەرماڵی ئاغایەکیدا بدەین، چما ڕۆستەمەشێتم لەبیردەچێ؟ بەرلەوەی ئەوان دەستمان لێبوەشێنن، دەبێ ئێمە تەمبێیان بکەین. ئێمە، ئێستا بووینەتە دە کەسو زیاتریش، چەکمان هەیە، تەنها دوو کەسی بێچەکمان هەیە، ئەویش دوو شەو بچینەدەرێ چەکی ئەوانیش پەیدا دەکەین. ئێمە دەبێت هەوڵبدەین لە گوندەکانی دیکەش دەستیان لێبوەشێنینو تەمبێیان بکەین، چۆن دەبینی ئەوان لە بەینی کرمانجان جیاوازی ناکەن، ئێمەش نابێت، ئەوانەی ئازارمان دەدەن لە هەرشوێنێک بن، جیاوازی بکەین. ئەها ئەوێ ڕۆژێ مشیر ئاغا لە ئاقاری، ئەو شوانە بەستەزمانە، مەبەستم تۆفیقۆکەی بێ داکو بابە، ئاخر دەڵێی مەڕە، هێندە بێزەڕە، بە حەیزەرانان مارکوژی کردییەو سەری شکاندووە. ئاغاکان لە کرمانجان لە هەنجەتن، باری هەنجەتیش بە کەس بار ناکرێ. بەڕاست ڕەنگە مەسەلەی مام حەمە سەعدوونت هەر نەزانیبێ، دوێنێ مام حەمە سەعدوونی هاوسێمان نەیتوانیوە تا بەربانگێ بەڕۆژوو بێت، لەبرسان بەدزی پلکە زێڕینێ ڕۆژووەکەی شکاندووە، ئەو کاتەی پلکە زێڕینی خێزانی ڕۆیشتووە جەڕە ئاوێکی لە کۆلو بیری خۆیان هەڵبهێنجێو بیهێنێتەوە ماڵێ، مام حەمە سەعدوون بە فرسەتی زانیوە نانێکی هێناوەو ڕۆنی زەنگی تێ هەڵسویوەو

١. ڕیخەڵۆکخۆر: بۆگەخۆر. کینایەیە بەوانەی هەموو شتێک خۆن، تەنانەت ڕیخۆڵەی ئاژەڵیش.

خواردوویەتی، هەرچەندە پارشێویشـــی لەگەڵ پلکە زێڕینێ خواردووەو چۆتە بن هەرزاڵەو خەلانەی، جگەرەیەک بکێشـــێ لەترسی ئەوەی نەبادا پلکەزێڕین زوو بێتەوە، هەروەکو مارمژ قومی لە جگەرەکەی داوە، گوپ لە دوای گوپ دوکەڵی دەرداوە، بۆئەوەی هەرچی زووە جگەرەکەی تەواو بکات. وەک ئەوەی بیەوێ ڕێوی لە کونێ قانگ بدات، لە بەدبەختی مام حەمە ســەعدوونی لەناکاو پلکە زێڕین هاتۆتەوەو جەڕەکەی لەســەر ملیی هێناوەتە خوارێو لە عەرزی داناوە، دەبینێ دوکەڵ لەو ماڵەی داوێســـتاوەو بۆنی سووتان دەکات، بە جۆرێک دوکەڵ پەنگاوی داوەتەوە، ئەو کۆلکە تیشـــکەی لە دەلاقەکەوە دەڕژایـــە ژوورەکە بە هۆی دوکەڵ وەک کۆڵەگەیەکی شین دیاری دەکات، پلکە زێڕین سێو دووی لـێ ناکاو دەچێتە ناوەندی حەســـارێ، هەتا دەنگی تێدا دەبێت هاوار دەکات: هاوارە خەڵکی ئاوایی فریامان بکەون ماڵەکەمان سووتا، ئاگرمان لە ماڵێ بەربوو.

خەڵکی ئاوایی بە خاکەناسو ئاو و هەرشـــتێکی بەرچەنگیان کەوتووە لە هەموو کۆلانەکانی گوندی بەغار داڕژانە حەساری ماڵی مام حەمە سەعدوونی، هەر بابایەو دوو دوو و ســـێ ســـێ خۆیان بە دەرگایدا دەدەن، بۆ ئەوەی هەرچی زووترە فریایان بکەونو ئاگرەکەی بەرزەفت بکەنو بیکوژێننەوە، هەنگامەیەک لەو حەســارو ماڵەی بەرپا دەکەن، هەر مەپرسە، کاتێک دەچنە ژوورێ دەبینن مام حەمە ســـەعدوون لە بن خەلانەی چاوی کوسکە کوسکیەتیو دێتە دەرێ و بە کاوەخۆ دەڵێ: خزمینە ڕەبی خوا خێرتان بنووســـێ، بەڵام بە خوای ماڵمان ئاگری تێبەرنەبووە، من بە ڕۆژوو بووم بەدزی زێڕینی خێزانم ڕۆژووەکەم شکاند، چونکە زۆرم برســـی بوو و لە خۆمم ڕانەدەبینی بگەمە بەربانگێ، بە فرســـەتم زانی بەرلەوەی زێڕین بێتەوە، نانێکم هێناو ڕۆنی زەنگم تێهەڵسووی هەڵسووی و

خواردم، خەریک بوو بۆ جگەرەیەک دیق بکەم، جگەرەیەکیشم پێکرد، ئەو ژنە ئاوا دنیای وەسەرگێڕامو لە ئاوایی ئابڕووی بردم.

هیدۆ گوتی: کاکەڕەش ئەو ڕۆژووشکاندنە کێشەی مام حەمە سەعدوونییە لەگەڵ خوای خۆی یان نا، چ پەیوەندیی بە ئاغایەوە هەیە؟ بە پاڵپشتیی فەتوای مەلای گوندی کە چەند قوتەحەدیسێکی وەک بوختان بە زمانی خۆشەویستی نازدار داتاشـیوە بۆ مەحکوم کردنی مام حەمە سـەعدوونی؟ ئاغا لەسەری کردووە دەبێ نیو عەربەگەنـم کەفارەتی ئەو ڕۆژووە بداتە ئاغای لە بری ئەوەی بەبێ عوزری شەرعی ڕۆژووی شـکاندووە. ئەتۆ سەیرکە، ئەوانە نە ویژدانیان هەیەو نە شەرمیش لە خوای دەکەن، چوونەتە نێو ژیانی تایبەتی هەمووانەوە!

بە قسەکردنەوە ڕێیان بەرەو ئاوایی دەبڕی، هەرکە لە گوندی نزیک بوونەوە، بینییان دوو پۆلیسی ئەسپسوار بەرەو مزگەوتێ دەچن. کاکەڕەشو هیدۆ لەبەر دەمانچەکانیـان بەپەلە خۆیان لە چاوی پۆلیسـەکان ونکردو خۆیان گەیاندەوە ماڵێ، بەڵام هەر سـەغڵەت بوون، بۆئەوەی بزانن مەبەسـتی ئەو پۆلیسـانە لە هاتنیان بۆ گوندی، چییە! دوو پۆلیسـەکە لای مزگەوتێ لە ئەسـپەکانیان دابەزین، منداڵەورتکەی گوندی دەوریـان لێدان، لە قایشو قرۆشو قامچیو چەکەکانیان دەڕوانی، وەک شتێکی سـەیر. پۆلیسەکان داوای هەویریان کرد، بۆئەوەی ئەو کاغەزەی بەدەستیانەوە بوو بە هەویری لە دیواری مزگەوتێی بدەن: ئەوانەی ناویان لەو کاغەزەیە، ناوی سـەربازییان هاتووە، دەبێ لە (تەجنیدی) ئامادەبن، بۆئەوەی جلکی سەربازی لەبەربکەنو بچنە سەربازی.

ئێوارێ، هەرکە خەڵکی ئاوایی لەسـەرئیش گەڕانەوە، هەواڵی ئەو کاغەزەو ناوهاتنەوەی چەند گەنجێک بۆ خزمەتی سـەربازی، بووە جێی قسەوباس. هەر

بابایــەو بەهەڵەداوان بــەرەو لای کاغەزەکەی دەڕوات، بۆئــەوەی زووتر بزانێت ئــەو ناوانە کێن‌و چەند کەســن؟ هەرچەندە خوێندەواریشــیان نەبوو، بە دیار کاغەزی هەڵواسراوەوە کەڕەسیسەیان کردبوو. ئەوانەی خوێندەوارییان نەبوو زۆر بەپەلەتر هەوڵی نزیکبوونەوەیان لە کاغەزەکە دەداو دڕیان بە ئاپۆرای خەڵکەکە دەدا، پێیان لە پشــتی پێی یەکتر دەناو قۆچپەی کورتەک‌و کراسی یەکترییان دەپســاند! هەندێک کۆلکەخوێندەوارو فەقێی مزگەوتێ هاتن وەک چاوســاغ چوونــە نزیک کاغەزەکە، پووشــکەیان بەدەســتەوە بــوو، پیتەکانیان حینجە دەکردەوە، بەجۆرێک کەس لەسەر کەس ڕانەدەوەستا! وەک ئەوەی جزو عەممەی دەور بکەنــەوە، پێکۆڵیــان لە پیتــەکان دەکرد. بۆئەوەی خەڵــک پێیان نەڵێن نەخوێنــدەوار دەیانگوت: ئەوە هەر خەت نییە، کەس نازانێ چ نووســینێکە، بە کەس ناخوێندرێتەوە! لەناکاو مەلای گوندی هات، وەک بیەوێ قوڕی هەزار خشــتی شل بکاتەوە، شــاقەلی کەواکەی لەبەرپشــتی ڕۆکرد. بە مەلایەک‌و دوازدە فەقێیان، ئێســتاش بەتەواوی بۆیان لە باریەک(١) نەهاتە دەرێ، ئەوەی لێیــان هەڵکراند ئەوەبوو هەندێک ناویان بەڕاســتی خوێنــدەوە و هەندێکیان ســەروگوێ شــکاند! هەموویان هەنجەتیان ئەوەبوو دەیانگــوت خەتەکە زۆر ناخۆشە. کەس نەبوو بەڕوونی بە خەڵکەکە بڵێ کێن ئەوانەی ناوی سەربازییان هاتۆتــەوە؟ خــودا ڕوحمی کرد پۆلیســەکان لە گوندەکەی ئەوبــەری ڕووباری گەڕانەوە، خەڵکەکە چوونە پێشیان‌و دەستەودامێنیان بوون کە لە گوندی کەس نەیتوانیوە ناوەکان بخوێنێتەوە، بەڵکو پۆلیسەکان بۆیان بخوێننەوە. پۆلیسەکان

---

١. باریەک: باڵیەک، پاڵیەک، لەپاڵ یەکدا، تێک ئاخنراو.

ناوەکانیـــان هەموو خوێندەوە. تۆفیق ناوی لەگەڵ ئەو ناوانە بوو کە دەبێ بچێتە سـەربازی. تۆفیق زۆری پێخۆش بوو زوو بچێتە پێشو جلی سـەربازی لەبەر بکات، چونکە هیچ شـوێنێک نەبوو ڕووی تێبکات، دەیزانی لە سەربازی ئەو جیاوازییـە کۆمەڵایەتییە کەمرەنگە. بەو هۆیـەوە تۆفیق هەر بەڕەزامەندیی خۆی ئیمزای کرد کە لە دوای تەواوبوونی خزمەتی زۆرەملێش، ئەو خۆبەخشانە لە ڕیزی سـەربازی بمێنێتەوەو هەر بەردەوام بێت لە خزمەتی سەربازی. تۆفیق لە ریزی سەربازی هەر نەهاتەوەو پێ بە پێ پلەکانی بڕی.

زۆر بـوون ئەوانـەی سـەربازخانەکانیان پێ لە ماڵی خۆیان خۆشـترو بە خواردنتر بوو!

بەیانی ڕۆژێکی ساردو ساماڵە، هیچ پەڵەهەورێکی پەراگەندەش بە بنمیچی ئاسمانێوە نابینرێو نووزەی بای نایە. شەوێ دارو بەردی لێک بەستاوە. منداڵی ئاوایی خەریکی شـکاندنو قرچو بڕکردنی شـەختە کریستاڵەییەکانن، لێشی دەخۆنو دەستیان لە سەرمان سوورهەڵگەڕاوە، بۆ گەرمکردنەوەی دەستەکانیان لەنێو گـەڵو بنهەنگڵی خۆیانـی دەکەن، ئاویـان بە لووتیـدا دێتەخوارێو بەسەردەستی چاکەتەکانیانی دەسڕنەوە، سەردەسـتو قۆڵی چاکەتەکانیان لە چڵمی ڕەقهەڵاتوو بریقەی دێ! بەجۆرێک ئەگەر دوو ڕۆژی رەبەق لەبەر ئاوێی بنێی، نەرم نابێتەوەو ناتوێتەوە، چەند قات چڵم کەوتۆتە سەریەکو شمشێری میسریش نایبڕێ، بە ڕیز خۆیان داوەتە بەرتاوێ.

پیاوە بەتەمەنەکانی ئاوایی، لەبندیواری مزگەوتێ، ئەوانیش خۆیان داوەتە بەرتاوێ، هەربابایە بەوەی پێشـەخۆی دەڵێ: سـێبەرم لێمەکە ئەو سێبەرەی هەڵگـرە بۆ هاوینێ! حەسـەنەکوڕ، هەرکاتێک خەونی خـۆی بۆ ئامادەبوان

دەگێڕایەوە، کاکەڕەش دەیگوت: هێندە بەجێ و ڕێ و بەتام و چێژ دەیگێڕێتەوە ناتوانم بەتامەزرۆیی و تاسەوە گوێی لێنەگرم، چونکە وەک خۆم خەونەکەم دیبێ، وایە.

حەسەنەکووڕ گوتی: ئەوشەو لە خەونمدا ئەسپەکەی ڕەفعەت ئاغای لەگەڵ ئەسپەکەی عومێڕەی وەکو ئاوقات قسەیان بۆ یەکتری دەکرد، هەرشیرین بوو گوێیان لێبگری! وەک هەموو لایەکتان دەزانن، ئەسپەکەی ڕەفعەت ئاغای، ئەسپێکی زنجی قەترانی بێنیشان، دەڵێی قیرێ ڕەشە! دیارە هەر بەهۆی ئەو بێنیشانییەی بووە کە بەسەر نەگیراوەتەوەو لەلایەن خاوەنە ڕاستەقینەکەیەوە نەناسراوەتەوە. ئەسپ، وەک یاخیبوونێک لە تەویلەی ماڵی ئاغای هاتەدەرێو چاویدا ئەسپەکەوێتی عومێرەی حاجی سمایلی کە لە دەرێ بەسترابۆوە، هاتو لەلای ڕاوەستا، بە پێچەوانەی هەر ئەسپەگونێکی دیکە کە دەگەنە یەکتری چەپۆکان لە عەرزی دەدەنو دەحیلێننو دەکەونە سەرپاشوان بۆئەوەی غروورییی نێرانەی خۆیان نیشانی یەکتری بدەن! ئەوان بەس سەریان بۆ یەکتری دەلەقاند، وەک جوانووی یەک ماینو دەرکزاوی یەک ماڵ بن. ئەسپەکەوێتی عومێرەی، وەک ئەوەی وابوو بلێ: ئەوە کەی کێشەی ئێمەیە خاوەنەکانمان ناکۆکن! ئەسپەڕەشی ئاغای دیاربوو دەیویست گازاندەی دڵی خۆی بۆ ئەسپەکەوێتی دەربڕێ، ئەویش گوێی بۆ شل کردبوو: ئێمە خۆ نەبووینە مرۆڤی ستەمکارو ملهوڕ کە گەورەیی خۆمان لە بچووککردنەوەی بەرامبەرمان ببینین! یەکتری بکوژینو ڕەگوڕیشەی یەکتری ببڕینەوە! بەخیلی و خۆپەرستی کوێرمان بکات! وەکو دوو لەشکر بەربینە یەکتری! کە هێشتا شمشێرەکانیان خوێنی لێدەچۆڕێ، کەچی نوێژ دەکەنو باسی دادپەروەری دەکەن! کەوڵی مرۆڤیان کردۆتە قەڵغان

و ڕازپۆشـــی خۆیان، لە پەنایڕا هەرچی ناڕەوایەتییـــە دەیکەن، ئێمە لغاو دەکەن، کەچی ناتوانن ئەو ڕەگی یەکتر قڕکردنە لەناوەوەی خۆیان لغاو بکەن!

باوەڕدەکەی؟ ئەمن فرم بەســەر ئاغایانەوە نییە! بەهەڵە لێم حاڵی مەبە، ئەمن جوانووی دەرکزاوی کابرایەکی لای قەراجی بووم، کە پیشەی مەیتەری بوو، عاشقی ئەسپ و ماینی حدودو ڕەسەن بوو، دەیانگوت: دایکمی لەنێو عاەربان کڕیبوو، هــەر بۆئەوەی منی بۆ بخاتەوە! ئاخر دەیانگوت دایکم ســەرجەلەی هەبووە، چووزانم، وەکو دولدری ئیمامی عەلی، شەودێزی خوسرەوی، هەگبانی دەروێشـــی عەڤدی، کەوێتی قاپڕەشی ســمکۆتکی گەنج خەلیلی، کە کاوێس ئاغا دەڵێ: بە باژێری شامێدا بێتەخوارێ بەناو لەشکری عوسمانیان، نەوەک بڵێن ســوارەکی کوردە چەندی بێکاروبارە! لە بەرامبــەر نەیارەکانیان خۆیان بە ئێمە هەڵدەدەنەوە، بۆ لاواندنەوەی پیاوە مەزنەکان خۆیان بە ئێمە ڕاناوەو نیوەی ئازایەتییەکانیان بۆ ئێمە گەڕاندۆتەوە! زۆرجار خاوەنەکانمان بە ئێمەوە ناسراون. نازانم تەمەنم چەند مانگ بوو، بەڵام ئەوەم چاک لەبیرە هێشـــتا شیری دایکم دەمژی، هەرچی چاوی پێم دەکەوت دەیانگوت: کتومت دایکە حدودەکەیەتی! با گەورەبێت، لە هەموو دەشـــتی قەراجو کەندێناوەو ســەنیەو مرکییەی، ناوی دەردەکاو، یەکەم ئەسپ دەبێت!

ئەو هەواڵە بە گوندەکاندا بڵاوبووەوە، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بمدزن: شــەوێک دایکم هەســتی بە شــتێکی نامۆ کرد کە لە دیواری تەویلەکەمان تەپەی دەهات. دایکم جارجار بۆنی بــە منەوە دەکردو بە لموزی دەیهێنامەوە بەرســینگو بەرۆکی خۆی بۆئــەوەی پارێزگاریم لێبکات، چونکە ترســێکی لێنیشــتبوو، وەک خوا لەدڵی نابێت ئەمنی لێدەدزن! لەناکاو خشــتێک لە

دیواری تەویلەکەمان دەرهات، ئەوە دوو ئەوە ســێ، بوو بە شەبەقێکی گەورە، دەرگایەکیان کردەوە لە دیواری، یەک لـــە دزە دیواربڕەکان هاتە ژووری، تاریک بوو، دایکم دەیفرماندو جووتەی داوێشـــت، لـــێ، بێسوود بوو. دزەکە دەستی لـــە تاریکایی دەکوتا، دیاربـــوو بە دوای مندا دەگەڕا، ئەوەندەم زانی دەســـتی کەوتە سەرپشـــتم، دەســـتی لە ملی کردمو ناوچاوانی ماچ کردم: ئەوەتا گرتم! هەر زوو پشـــتێنەکەی لە ملی کردمو لە تەویلەیـــان بردمەدەرێو ئەمنیان لە داکم دزی. هەر ئەوشـــەوە لەدوای ڕێڕۆیشـــتنێکی دوورو درێـــژ، خۆم لەنێو تەویلەی ماڵـــی ڕەفعەت ئاغای دیتـــەوە. دزەکانیش پیاوەکانـــی خۆی بوون. بـــە هۆی ئەوەی هیچ نیشـــانەیەکم بە بەدەنیـــەوە نیە، خاوەنەکـــەم نەیتوانی بمدۆزێتـــەوە، ئاخـــۆ چەندەم بـــەدوادا گەڕابێـــت! ئومێدێکی زۆری لەســـەر گەورەبوونی من هەڵچنیبوو! لەوەتـــای لەبەرزگی دایکمیان هەڵگرتم، دووجار بەکەیفی دڵی خۆم نەمحیلاندووە! چونکە هەمیشـــە خـــۆم پێ حەرامە، ئەو جۆیەی ئاغـــا دەمداتێ حەرامە، ئەو ئاخوورەی کاو جـــۆم بۆ تێدەکەن، دەڵێن گوایە ئێسکـو پروسکی حەمەشوانێکی تێدایە کە زیندەبەچاڵیان کردووە. ئەو زینو قایشوقرۆشو بـــەرەو گولینگـو لغاوەم، هەمووی بە خەڵک کردراوە، ئەو ناڵبەندە کۆشێک منداڵی ســـەرکەو بنکەی هەیەو زۆر دەستکورتە، هەرچوار پەلم ناڵ دەکات، کەچی یەک فلســـی نادەنێ. زۆرجار لە ســـەر ئاخوورە پڕ لە کاو جۆیەکـــەم دۆش دادەمێنم: داخۆ چەندەها ئاخوری پڕ لە ئالیک لەســـەر ئێســـکـو پرووسکی خەڵکی بێدەسەڵاتو بێتاوان دروست کرابن! ئەوە ئێمەین نە کەس دەچەوسێنینەوەو نە کەس بە کۆیلە دەگرین! بەپێچەوانەی مرۆڤەکان هەرگیز نەمانگوتووە ئێمە خاوەنی ماهییەتێکی ئەفســـووناوینو فیز بەسەر

بوونەوەرەکانی دیکەدا لێبدەین! بەشایەدی هەموو دنیا هەرتەویلەیەک ئێمە تێدا بووبین، هەرگیـــز قەدەغەمان نەکردووە، نێرەکەر بە زمانی خۆی نەزەڕێو مانگا بە زمانی خۆی نەبۆڕێنی! ئەوڕۆژانە، دوو بەران شەڕەقۆچیان بوو، ئێمە کەوتینە بەینیان: چما ئێوەش بوونەتە بنیادەم؟ میراتی بابتان بەش بکەن! یان لەسەر پاوان و زەوی‌و زار ئاوا لە یەکتری دەدەن! بەسە هەی مرۆڤینە!

مام حەســەنەکوڕ، بەردەوام بوو لــە گێڕانەوەی خەونەکــەی و چۆنیەتی باگۆدانەوەی ئەسپەکەوێتی عومێرەی بۆ ئەسپەکەی ڕەفعەت ئاغای، ئەویش بــە نۆرەی خۆی دەردەدڵ و گلەیی و گازندەی خۆی کرد: مرۆڤەکان، بە قســەی خۆیان خواپەرست و ژینگەدۆستن و هەقی هەموو بوونەوەرێک دەپارێزن. ئەو قســانەیان لەگەڵ کردەوەکانیان پێکدەگرم هەرچەند دەکــەم تێک ناکەنەوە، بۆ نموونە: یەک لە کارە دزێوەکانیان وەک دیارە ئەو یەختەبارگینانەی دەیانبینی هەموویان وەکو من و تۆ ئەســپەگون بوون، لەگەڵ ماینەکان جووت دەبوون و، چێژیان لێک وەردەگرت، کەچی، لە عەرزێیان دان و بەرزەفتیان کردوون و گونیان قەڵاشــتنەوە، خەساندنیانن، هەربۆئەوەی بەهێزبن و ئارام بن! دەستکاری کاری خودایان کردو بێبەشــیان کردن لە چێژی جووتبوون لەگــەڵ ماینەکان! ئەوەی دەرهــەق ئێمە دەیکەن، عەیبێکی زۆر گەورەیە، دوور لەڕووی تەرســی ئێمە، وەک تەرس وایە بە نێوچاونیانەوە! بێجگە لەوەی دەمانخەسێنن، ڕەگەزیشمان دەگۆڕن، ئەتۆ زەینی خۆ بدەیە چ کارێکی ناڕەوایان بەرامبەر بە ئێستر کردووە، هەر بۆئەوەی باربەرێکی بەهێز بخوڵقێنن و باری قورسیان بۆ بگەیەنێتە سەر شاخی و شوێنە ئاستەمەکان!

لە خۆیان ناپرسن کێ ئەو هەقەی پێداون؟ ماینی لە کەرێ چاک بکەن کە

دوو ڕەگەزی جیاوازن هەر بۆئەوەی ئێســـتریان بۆ بخاتەوە! تاکەبوونەوەرە زاوزێ ناکاو نابێت بە داک و باب! مرۆڤەکان بە کەتنی خۆیان شــکدێت بۆیە دەڵێن ئەگەر ئێستر بزێت، دنیا کاول و ئاخیرزەمان دەبێت!

مرۆڤەکان جیاوازییان لە ڕیزی ئاژەڵەکانیشــدا کردووە: کەریان بە پلەی نزم ئەژمارکردووە، کاتێک لە ئێســتر دەپرســن بابت کێیە؟ پێی شەرمە بڵێ بابم نێرەکەرە، دەڵێ ئەسپ خاڵمە!

ئازادی بەلایەقی ئێمە نازانن، کەچی ســەرو بنی زمانیان باس هەر باسی ئازادی و دادپەروەرییە. هەررۆژەو خاوەنێکــمان هەیە، یەک بەوی دیکەمان دەفرۆشــێ. هەر ســاتمەیەک بکەین یان ســمان بەخواری دابنێین، قسەی خۆشــیان ئەوەیە: دەکک زریکە لە کونی چاوت بدات! یان دەڵێن وەشششــە! هەی داکەکەی سەحەبی هەوەڵێت دەگێم!

ئەو گاجوتانەی دەیانبینی لەبــن نیری کراون و جووتیان پێدەکەن، هەموویان جوانــەگای پەڕینێ بــوون ڕۆژنەبوو بەهۆی تیژپەڕی لەکاتــی جووتبوون، چەند چێرێک زگاوزگ نەخەنەسەر زەوی، دوای ئەوەی خەساندنیانن، ئێستا چێرەبەکەری دنیایێ بەلایاندا تێپەڕن مێش میوانیان نییەو هەر نەزەرێش ناکەن!

لــە نێری پێش مــەڕی بڕوانە، ئــەوەی زەنگوڵــی لە ملیەو پێشــەنگی مێگەلەمــەڕی دەکات، ئەویــش تەگەی نێــو بزنان بوو، جــار نەبوو لەکاتی جووتبوونێدا چەند بزنێک کووڕ نەکاتەوە، دوای ئەوەی هێلکەگونی ئەویشیان دەرهێناو خەساندیان، ئێستا بزنەبەتەگەی دنیایێ بۆتە داک و خوشکیان!

ئەســپەکەی ڕەفعەتی بەنــۆرەی خۆی هاتەوەگــۆ: مرۆڤــەکان کاریتەی لە چــاوی خۆیاندا نابینن، بەڵام زلــەکای لە چاوی خەڵکیــدا دەبینن، ئەو هەموو

ئیشــە پیســانەی خۆیان نابینن، کەچی ئەگەر یەکێکیان ڕابکشێو گەوز بدات، پێیدەڵێن: خۆ نەبوویتە وڵاخ دەگەوزی! ئەمن، بەرامبەر مرۆڤەکان بێئینســافی ناکەمو ناڵێم هەموویان خراپن، ئەگەر باشــیان تێدا نەبایــە دنیا بەجارەکی کاول دەبوو و ئاوا ڕانەدەوەســتا! دنیا لەسەرپشتی مرۆڤە باشەکان، لەوانەی وەکو ئێمە باری سەرشــانیان گرانەو هەمیشە نرکەو ناڵەیانە، ڕاوەســتاوە. زۆرم پێسەیرە ئەو هەموو خوێنــدەواریو عیلمو مەعریفەتە فێردەبن، لەجیاتی ئەوەی لە خزمەتی مرۆڤ و ئاژەڵ و ئاشــتی پێکەوەژیاندا بەکاری بێنن، کەچی دەچن لە ڕق بەرقەی یەکتری، چەکی قڕکەرو ماڵوێرانکەری پێ سازدەکەن! ئەوەی ئەوان دەیکەن ئێمە بیکەین، تەنەکەمان لە کلکی دێخنو مندارەهورتکەی دنیاییمان بە دوو دێخن!

دەســەڵاتی خۆیان بەســەر هەموو گیاندارێکدا دەسەپێننو دەڵێن: خودا فەرموویەتی بینادەمم لە ســەر جوانترین شێوە دروست کردووە، لافـو گەزافی پێوە لێدەدەن! ئێمە، هێشتا جووتەیەکمان لە یەکتری نەدابوو، ئەوان، گرم قابیل هابیلی برای خۆی کوشتو ئێستاش ئەو کوشتارە بەردەوامی هەیە! لێم ناگەڕێن ئەورۆ لەگەڵ تۆدا باســی عەرشو قورشــی بکەم، ئەوە پیاوەکانی میرغەزەبی خاوەنم بە دوامدا هاتن بمبەنەوە تەویلەی، دڵیان زۆر پیسە! بۆئەوەی تێکەڵی کەس نەبم. بەر لەعنەتێ خوای بکەون، گۆشتی زۆربەی بوونەوەرەکان دەخۆن، پیساییان لە پیسایی هەموو بوونەوەرێکی بۆگەنترە!



# ٢١

زەردەپەڕە، خۆر خەریکە لە کەلێنی تەپۆلکەکانی زووری، لە دیارو نادیاری، ئاودیو دەبێت، دەستی تەنیا بە چەند پەڵەهەورێکی پەراگەندە ڕادەگات بەرزگیان سوور بکات. تازە خەریکە مەلای نوێژی شێوان بانگ بدا. دنیا شرەکە[1] بووە، سێرە خەریکە هەڵگیرێ. تەقەی سوکانی پاسکیلەکەی ئەنوەری، لەوکاتەی خۆی بە دەرگای حەسارێدا دەکێشێ، هیدۆ دەستی بۆ دەمانچەکەی دەبات، وەک خۆئامادەکردنێک بۆ هەرئەگەرێکی نەخوازراو و لەناکاو، بۆئەوەی بتوانێ دەستوەکەری بکات، ئاخر زۆرجار دەیگوت: پیاو تەنها ئێواران لە کاتی نانخواردنێ زەفەری پێدەبردرێ! بەڵام ژنەکەی لەو کاتەدا خەریکی داخستنی دەرگای کولانەی مریشکەکانە، گوێی لە دەنگی ژنەکەیەتی لەگەڵ یەکێک قسە دەکات: ئەوە کاک ئەنوەرە، یاخوا بەخێر بێی سەرچاوی خوشکی خۆت، فەرموو، بەخوای دڵم خەبەری دابوو میوانێکی عەزیزمان دێت. ئەنوەر ماڵی لە یەکێک لەو گوندانەی بناری چیای قەرەچوغییە، هەرکە لە دەرگای ژووری نزیک بووەوە هیدۆ گوتی: فەرموو فەرموو یاخوا بەخێر بێی سەرچاوی کاکی

---

١. شرەکە: نە زۆر ڕووناک نە زۆر تاریک.

خۆت، ئەورۆ لەگەڵ کاکەڕەشی کە لە جووتی دەگەڕاینەوە باسی تۆمان دەکرد: دەمێکە دیارنییە! ئەنوەر بەدەم وەڵامدانەوەی هیدۆی، پاسکیلەکەی بەڕقەوە بە عەرزێداداو دوایی بە دیواری هەڵپەسارد، لە هیدۆی بە ژوور کەوت، لە دوای چاکو چۆنیو هەواڵپرسینو بێمزەڕەتی: بۆیە هاتمەماڵی ئێوە چونکە ئێوە لە ماڵێ دوو کەسن، لێرە ئازادین لە هەموو قسەوباسی نهێنیی بەینی خۆمان.

ئەنوەر گوتی: دوای نانخواردنێ، کاکەڕەشی ئاگادار بکەوە بێتە ئێرە، کاری زۆر گرنگم پێیەتیو هەرسێکمان ڕەئی خۆمانی لەسەر بدەین. ژنەکەی هیدۆی بەدەم هێنانی تەشتی نانەکە گوتی: کاک ئەنوەر توخوا ئەوە بۆچی زووتر نەهاتی بۆئەوەی نانێکی باش ساز بکەم، چونکە خواردنێکی وامان نییە، بە خوای نانی شەرمەزارییە، بە رووقایمی خۆم لە پێشت دادەنێم، دەی، بەلاش نییە گوتوویانە: «میوانی درەنگ وەخت نانی لەسەر خۆیەتی!» ئەنوەر گوتی: نا نا توخوا وا مەڵێ! ئەو پاسکیلە لەعنەتییە دەردێکی وای داومەتێ ئەگەر بەردانیش بخۆم وەکی نێرەعەلەشیشی حەلی دەکەم! هیدۆ گوتی: ئەرێ بەڕاست ئەنوەر کە هاتییە حەساری ئەو شەڕە دەستەویەخەیە چی بوو لەگەڵ ئەو پاسکیلە تێرعەمرەی کردت؟! ئاخر ئەوکاتەی هاتە ژوورێ، هێشتا ئاسەواری ئەو شەڕەی بە ڕوویەوە دیاربوو. دوایین قسەی لەگەڵ پاسکیلەکەی ئەوەبوو گوتی: بەبیرم نایە بەس جارێک بێگرفت ئەمنت گەیاندبێتە جێ، یان زنجیرت پساوە، یا پەنچەر بووی، یان کەلای بۆلبەرینت هەڵوەریون، یا ڕینگت خواربووەو پەیدەرت شکاوە، کوڕە چووزانم خەریکە شێت دەبم بەدەستتەوە! ئاخر ئەو پاسکیلە دەمێک بوو دەستبەرداری دنیاو ژیان بووبوو، بەڵام ئەنوەر دەستی لە یەخەی نەدەکردەوەو دەستبەرداری نەدەبوو، هیچ هەورازو نشێوێکی هەڵنەبواردبوو، دەمێکە لەنێو

جوغزی ئەو دنیایە گەورەیەدا دەخولێتەوە، رۆژێک بەخاترجەمی دانەنیشتووە، رۆژێک نەبوو هەردووک قۆچی سووکانەکەی بە دەست یەکێکەوە نەبێ‌و نەیرەتێنێ! هەر نرکەو ناڵەیەتی، هەرچی دێ سواری دەبێ، بێئاگا لەوەی چەند شەکەتو داهێزراوە. چیرۆکی سەرجەلەی، ئەو پاسکیلە گەر بەوردی بنووسی‌و هیچ نەبوێری، یەکجار دوورو درێژە!

سەرەتای هەرەتی گەنجێتی خۆی بە مامۆستایەکی تازەدامەزراوی یەک لە گوندەکان بەخشی، رۆژانە لە شاریرا دەیهێنایە گوندی‌و دەیگەراندەوە. مامۆستا تازە فێری پاسکیلی دەبوو، زۆرجار لە پڕ سەرانگرێی کەندو ئاودڕان دەبوو، هەردەستایەوەو خۆی دەتەکاندو سواردەبۆوە. سەرەرای ئەو هەموو دەردەسەرییەش، بووبووە قوربانی ناکۆکیی بەینی مامۆستاو ئاغای گوندی: ئاغا هەوڵی دەدا قوتابخانەکە داخرێ نەبادا خەڵک خوێندەوارین! خەڵکی هاندەدا کە مامۆستا زانستی شەیتانی فێری منداڵەکانتان دەکات، رێگای پێمەدەن! هەندێک قوتابی تەمبەڵی فێردەکرد سووژنو دەرزی لە تایەی پاسکیلەکەی رابکەنو پەنچەری بکەن، بۆئەوەی مامۆستا بێزاربکەنو گوندی بەجێبێڵێ. ئەو پاسکیلە، سەردەمێکە لەگەڵ خولانەوەی رینگو تایەکانی، ماشەری تەمەنی خۆی هەڵدەوێزنی، ئێستاکەش کە لە زەردەپەری تەمەنیدایە، ددانەی سینیی پایدەرەکەی‌و قەفی زنجیرەکەی، داستانی بەرائەتی منداڵەکانی، لە بەرامبەر کردەوە دزێوەکانی ئاغا حینجە دەکا!

لە دوای ئەو هەموو کارەساتەی بەسەر ئەو پاسکیلە هاتووە، تازە بە تازە کاک ئەنوەری چەمبەری دەیەوێت وەکو جوانە ئەسپی شینی قەزوانی، لە دەشتی قەراج‌و کەندێناوەی تەراتێنی پێبکات! ئاخر ئەو پاسکیلە تێرتەمەنە،

بەری ئەو تەقرو شـــەقرەی ناگـــری، هەموو ئازای بەدەنی ســـوواوە، جیرەجیری ســـپرینگی بن زینەکەی ڕۆژەڕێیەک دەڕوات! حیکایەتی زەمەنێکی یەکجار دوور دەگێڕێتەوە، چەند گەڵو قوون خۆیان بەســـەریدا هێناوە: ئی مامۆســـتا، کرێکار، قوتابی، پۆلیس و... جا کێ نا؟ ئی پان، قەڵەو، پووچ، بۆگەنی، بەموو، بێموو، بەس مەگەر کورســـی و جورنەی حەمامێ ئـــەو هەموو جۆرە قوونەی دیبێت! لەو هەموو بێنەوبەرەیەیدا هەر باشـــە ماویشە! هاوتەمەنەکانی هەر ئێسکـو پرووسکیشیان نەماوە!

کاکەڕەش بەژوورکەوت. دوای بەخێرهێنان و ئەحواڵپرسیی ئەنوەری: بەرلەوەی بێمە ژوورێ باسی شەڕتان دەکرد، ئەوە کێ لەگەڵ کێ بەشەڕهاتووە؟ ئەنوەر گوتی: ئەوە شەڕی بەینی منو پاســـکیلەکەمە، هیدۆ بۆتە پیاوی مەسڵەتان، خەریکە پێکمان دێنێ و قەزاوەتمان لە مابەینیدا دەکات! ئەنوەر، کوڵی لە پاسکیلەکەی دانەمرکاوەتەوە: هاتیتە لووتم! دەست بدەمە کوتکەکی هەموو بەدەنی بشکێنمو تێکـــی بکەمەوە، کەڵکی پێوەنەماوە! هیدۆ بە گاڵتەوە: وا بزانم دایکی مەلیکی بەو پاسکیلەی گوارزاوەتەوە، ئەوکاتەی بە بووک چووە!

کاکەڕەش دەمێک بوو دەیویســـت ئەنوەریش ئامادە بێت بۆئەوەی لە چەند قســـەو بڕیاری ســـەرەڕۆییانەی هیدۆی ئاگاداربێت، بۆئەوەی ئەویش بە نۆبەی خۆی کاریگەریی لەســـەر دابنێ کە بیر لەو چوونەشـــارەی نەکاتەوە، بۆیە ئەو کاتەی بە فرســـەت زانی: کەواتە بـــا ئەنوەریش ببێتە حاکـــم لە بەینی منو هیدۆی. هیدۆ، ماوەیەکە وڕێنەی چوونەشاری دەکات، دەیەوێت باش بە خراپ و جوانـــی بە دزێوی بگۆڕێتـــەوە، لە کاتێکدا ئێمـــە زۆر کاری گرنگمان ماوە بەیەکـــەوە تەواوی بکەین! هیدۆ گوتی: بەهەڵـــە لێم حاڵی مەبە، هەتا دەمرم

دەروێشـــی جەزمەگرتووم، تا زوڵم و زۆرداری هەبێت، بەرم ناداو ســاکین نابم!
کاکەڕەش گوتی: کاکە! ئەوســەردەمە پیسەی ئێســتا تووشی هاتووین، ئەوە ئـــی ئەورۆ نییە، ئەوە ئەو میراتەیە، کە باپیرانمان بۆیان جێهێشـتووین، نابێ ئێمەش بۆ نەوەکانی دوای خۆمانی بەجێبهێڵین!

ئەنــوەر پێوەی دیارە بۆ کارێکی گرنگ هاتووەو هەواڵێکی ناخۆشـــی پێیە، چونکە ڕەنگی پەڕیوە، خەمێک ڕووخســاری سواق داوە، لە حەژمەتان لە ناخی خۆیــدا وردوخاش دەبێ: بۆیە بەپەلە هاتم، تاکــو پێت ڕابگەیەنم ئەو گوندەی هاوسێی گوندەکەی ئێمە، ئاغای گوندی برازایەکی زۆر بێڕەوشتی هەیە، هەموو کرمانجەکانی لە زەلالەتو لە زەواق ناوە، خۆی بە جێگرەوەی مامی دەزانێ، بۆیە هەڵپەی دەسەڵات بەرچاوی تاریک کردووە، لە هیچ کارێکی نارەوا ناپرینگێتەوە، تاوەکو ئێســـتا تەنها سووخرەو بێگارو دارکاری جووتیارە بێدەسەڵاتەکانی دەکرد، بەڵام ئێستا بەو هەموو جەزرەبەیە دڵی ئاو ناخواتەوە، دەست بۆ نامووسیشیان دەبات! لەو چەند ڕۆژەی دوایی، برازای ئاغای، هەر بە کەرەزەری، پرپیداوەتە کچی پیاوێکی زۆر شەرم بەخۆ، تەنها بۆ شکاندنی کەسایەتییەکەی! چونکە پێیوایە ئەو پیاوە، ئەو ڕێزەی لەنێو خەڵک هەیەتی، لەسەر حیسابی ئاغایانەی ئەوانەو لە ڕێزی ئەوان کەم دەکاتەوە! لەو گوندەی، ژیانیان لە خەڵکی تەسک کردۆتەوە.
ئەو پیاوە، لەورۆژەوە چەندجار لە حەیفی بێدەسەڵاتیی خۆیو پاراستنی ئابڕووی کچەکەی، ویستوویەتی خۆی بکوژێ. کچێکی حەرێمگران و سەنگینو سەلار، هەموو ئاوایی باسی ڕەوشتبەرزیی ئەو دەکەن. ئێستا لە دوای ئەو سووکایەتی پێکردنــە بەجۆرێک ناوی زڕاوە، هەتا ئەو کورەی خۆشیشــیدەوێ لێی ســارد بۆتەوە، کچەی بەستەزمان نازانێ چبکا!

کاکـــەڕەش‌و هیدۆ، بەو هەواڵە ڕەنگ و ڕوویـــان تێکچڕژا. کاکەڕەش وەک خەسڵەتی هەمیشەیی خۆی، کاتێک گوێی لە شتێکی وا دەبێت، یەک قسە، تەنها هەڕەشەیەکیش ناکات! دەکەوێتە کرۆشتنی مووەکانی سمێڵی، چاوەکانی وەک چـــاوی پڵینگ پڕ دەبـــن لە پەلامار. تەنها هیـــدۆ ئەوەندەی گوت: خەم لەدوای خەم! خەم لەدوای خەم!

ئـــەو ڕووداوە ئەو زار ئەو زاری دەکرد، هەرکەســـێک چاوی بە کەســـێکی دیکە دەکەوت، یەکەم قســـەی ئەوەبوو: نەتزانیوە برازای ئاغای لە ڕێی گۆمی شیرناوێ، دەســـتی لە مەمکی کچی کرمانجێکی داوەو لەبەرچاوی ژن‌و کچی گوندی مەمکی گرتووە؟ کچەش زۆر گریاوەو زۆری دادو فیغان کردووە، وەلـــێ بێسوود بووە : «تاس بشکێ، بەس نەزرینگێ!»

کچە زۆری فرمێســـک داباراندووە، بەڵام کوا دڵی زاڵم بە فرمێســـکان نەرم دەبێ! بابی بە گریـــان نەدەگریا، نەبادا ویقاری پیاوانەی بڕووشـــێ، لە هەناودا دەگریاو دەیگوت: خۆزگە هەموو منداڵەکانیان سەر بڕیبام، تەنها دەستیان بۆ ناموسم درێژ نەکردبایە!

ئەو بە پێچەوانەی ئەوانە، قەت بۆ زاڵم نەوی نەبوو، نەویبوونی پێ کەسری شـــان بوو. لەو پیاوە بەویقارانە بوو خۆی لە بەرامبـــەر ئاغاکان نەدۆڕاندبوو، هەر ئەوەش بوو وای کردبوو ئاغـــاکان هەوڵیان دەدا حەرەمی هەڵتەکێنن، لە شـــکۆ و ماهییەتی خۆی ڕووتی بکەنەوە. ناچار هەر بە شەو و دوور لە چاوی خەڵکـــی ئاوایی، ماڵی پێچایەوە، باری کرد و زەویوزاری هەموو بەجێهێشـــت، کەس نازانێ ڕووی لە کوێ کردووەو سەری خۆی بۆ کوێ هەڵگرتووە!

ئەو حەشـــیمەتەش ئێســـتا لە گوندی ماون، حاڵیان لـــەوی چاکتر نییە،

ئەوانیش بەدەست ئاغایەوە پەرێشانن!

کاکەڕەش گوێی لە وردو درشتی قسە ئازاربەخشەکانی ئەنوەری گرت، بیرکردنەوەیەک داگیری کردبوو هەموو خەیاڵی لای تۆڵەکردنەوە بوو، بۆی دەرکەوت باوکی کچەکە، لە کاتی گەنجی کەس نەیتوانیوە چاو لە چاوی بکات، ئێستاش بە هۆی پیریو کەنەفتی دەست بۆ نامووسی درێژ دەکرێ. لەبەرخۆیەوە گوتبووی خەریکە ئەو بەشە لە خۆمدا لە دەست دەدەم کە پێی دەڵێن پیاوەتی، تۆ بڵێی ئێستا ئەمن کێ بم؟ کە نەتوانم پیاوەتی لە خۆمدا بپارێزم! هەموو ئەو قسانە ئازاری ویژدانی کاکەڕەشیان دەداو وردوخاشیان دەکرد. کاکەڕەش گوتی: براینە بۆتە ئەرکێکی ویژدانیو ئەخلاقی لەسەرشانمان، بە هەرنرخێک بێت کەسایەتی بۆ ئەو پیاوە بە ویقارە بگێڕینەوە، کارێک بکەین ڕووسووری بۆ کچەکەی بگێڕینەوەو ئەو کوڕەی دڵی پێوەیەتی، شانازی پێوە بکات. کارێک بکەین، ئەو هەستە لە لای جووتیارە هەژارەکان دروست ببێ و بزانن کە ئەوان بێکەس نینو کێویان لە پشتە! ئاغاکان دەبێ چاوشکێن بکرێن، بۆئەوەی ببڕای ببڕای دەست بۆ کەرامەتی خەڵک درێژ نەکەن، لەوە حاڵی بن کە هەموو کونێک هی دەستتێوەردان نییە، چونکە پێوەدانیش هەیە!

هەردوو برادەر بەتاسەوە گوێیان بۆ قسەکانی کاکەڕەشی شل کردبوو و تەماشای چاوی هەر یەکێکیانت دەکرد هیوای جووتیارە هەژارەکانی تێدا پەڵەی دابوو، ئامادەبوون لە پێناویان شان لە شانی مەرگ بسوون. هەرسێکیان لەسەر ئەوە کۆک بوون بە هەرنرخێک بێت هەرچی زووە گورزێک لە ئاغا بوەشێنن کەمەری برازاکەی پێوە بشکێ، بۆ حەوتپشتی لەو کارە ناڕەوشتییەی کردوویەتی، پەشیمانی بکەنەوە. یەکەم شت دەبێ زانیاری وردو دروست

لەسەر شـــوێنو ماڵو دیوەخانو چەکدارەکانی کۆبکەنەوە. یەکێک چاوساغیو دەستکێشی بگرێتە ئەســتۆی خۆیو توانای ئەو سەرکێشییەی هەبێت. دیارە هیدۆ بۆ ئەو ئەرکە پێویستیی بە کەس نییە ڕێوشوێنی بۆ دابنێ، چونکە ئەوە یەکەم کاری لەوجۆرەی نییە، کە بەسەرکەوتوویی ئەنجامی دەدا، هەزار سوێندو کەلامولّلای بخۆ، هەر دەڵێی لە ئەزەلەوە خوا بۆ ئەو کارانە دروستی کردووە!

ئەو گوندەی ماڵی ئاغای زۆر دوورەو لەگەڵ ماڵی هیدۆی چەند گوندێکیان لە نێواندایە. هیدۆ ئەوڕۆژە بۆ ئێوارێ، بە ســـواری پاسکیلەکەی خۆی گەیاندە ماڵی ئەنـــوەری، کە لەگەڵ ماڵی ئاغای هاوســـێ گوند بوو. ئەوشـــەوە لەلای ئەنوەری مایەوە. بەیانی هێشـــتا هەر تاریک بوو پاســـکیلو جلوبەرگی خۆی لە ماڵی ئەنوەری جێهێشـــت، ئەو جلەی پۆشی کە بە تایبەتی بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکـــەی لەگەڵ خۆی هێنابووی. ئەنوەر کە بـــەو جلوبەرگەوە هیدۆی بینی ســـەرەڕای ئەوەی زۆری پێ پێکەنی، زۆریش پێی سەرســـام بـــوو کە ئەو بەهرە فریودەرانەیـــەی تێدا بینی. هیدۆ بـــەرەو گوندەکەی ئاغا کەوتەڕێ. هیدۆ زۆر شارەزاو کارامەیە بۆ گۆڕینی ســـیماو ڕواڵەتی خۆیو بەلاڕێدابردنو فریودانی بەرامبەرەکەی. دروست ئەو کەســـایەتییەی لە زەینی بەرامبەرەکەی دروست دەکرد کە خۆی دەیەوێ. جلوبەرگێکی شپڕێوی وای لە بەرکرد کەموا هەیە مرۆڤی تێرئەقڵ بتوانێ لە گوندێکەوە پێی بچێتـــە گوندێکی دیکە. جەمەدانیەکی کاڵبۆوەی کۆنی لەســـەر ئەو کڵاوە ســـپیەی، کە بەس سپی نەدەچوو، هێندەی چەوری پێوە نووسابوو، دوو نووشتووی پێچراو بە پەڕۆی سەوزی پێوە دوورابوو، ئەو نووشـــتووانەش نیشـــانەی ئەوە بوو، کە ئەقڵی ناتـــەواوە. کورتەکێکی لە ئەندازەی خۆی گەورەتر کە هەموو قۆپچەکانی نابەرامبەرو لاترقەوچ هەتا بن

قورقوڕاگەی داخرابوون، شەرواڕەکەی لەگەڵ ڕەنگی کورتەکەکەی جیاوازبوو، شاقەلی کورتەکی بەسەر شەرواڕەکەیدا شۆڕکردبۆوەو پشتێنی لە پشتی نەبوو، دۆخینی نەخستبووە ناو شەرواڕەکەیو بە بەرگەدەیدا[1] شۆڕ بووبووەوەو جۆلانێی دەکرد، قۆڵی کورتەکی هێندە درێژ بوو، پەنجەکانی دەستیشی داپۆشیبوون، گۆپاڵێکی خواروخێچی بەدەستەوە گرتبوو، کەس قایل نەبوو بە دەستییەوە بێت، تەسبیحێکی بەدەستەوە بوو هەردەنکەی لە ڕەنگێکو هەرڕەنگەی لە قەبارەیەک، دوو فلووسییەکی کونکراوی لە جیاتی گورینگ بە ئیمامی تەسبیحەکەیەوە خستبوو. ئاوێنەیەکی دووڕووی لە سەر بەرکی کورتەکەکەی بوو، نێوە نێوە بەمشەوەشی دەریدەهێناو تەماشای هەر سیو دوو ددانەی خۆی دەکردو دەستی لە ددانەکانی دەداو یەک بە یەک بەسەری دەکردنەوە، بۆئەوەی بزانێ کامەیان دەلەقێو کامیان مەحکەمەو نەبزووتووە! تاوەکو گەیشتە شوێنی مەبەست لە هیچ شوێنێک لای نەدا لەترسی ئەوەی نەبادا یەکێکی ناسیاو ببینێو گومان لەو خۆگۆڕینەی بکات!

هیدۆ لەو کاتەدا گەڕایەوە کە کاکەڕەش زۆر بە تاسەو ئارەزوو بوو زوو بگەڕێتەوە. هەموویان کۆبوونەوەو چاویان لە زاری هیدۆی بوو، هیدۆش لە نووکەوە بێئەوەی کۆخەیەکی لێبپەڕێنێ دەستی بە گێڕانەوە کرد، هەموویان ڕۆچووبوونە نێو باسەکە، هەموو جەستەیان بووبوون بە گوێ! ئاخر گێڕانەوەی هیدۆی هەر دەنگ نییە بەڵکو وێنەشە، وا بۆت دەگوازێتەوە، هەڵمی چایەو زاری کەسەکانت نیشان دەدا! وەک ئەوە وابوو هەموویان لەو سەفەرە لە

---

١. بەرگەدە:خوار زگ، نێوان زگ و بەر.

تەنیشـــت هیدۆی لە دیوەخانی ئاغای دانیشتبن! لە پیشاندانو گێڕانەوەکانی هیدۆی، دەیانتوانی دیمەنی دیوەخانو پاســـوانەکانو سەماوەرو پیاڵەو خودی چایچییەکەش ببینن. دەرفەتی بۆ هیچ پرســـیارێکی ئامادەبووان نەهێشتەوە، چونکە گەشـــتێکی نێو دیوەخانی ئاغای بە هەموویان کرد: بەسەری ئێوە، وا هۆگرم بووبوون، دەیانگوت نابێ بڕۆی! دیارە لە مەبەســـتیان تێدەگەیشـــتم کە دەیانەوێ بۆ پێڕابواردنی ئەو زســـتانەی دیوەخانێ لـــەلای خۆیان گلم بدەنەوە. خەریک بوو نانی نیوەڕۆیان لەلا بخۆم، هەرچەندە زۆرم برسی بوو، بەڵام قسەیەکی بابـــم بیرکەوتەوە: کوڕم ئەگەر نانتان لە ماڵێـــک خواردو نمەکتان کرد، هەرگیز نابێت نە بەئاشـــکراو نە بەدزی، خاوەنی نمەکەکە ئازارتان بەدەســـتەوە ببینێ! چونکـــە دوایی نمەکگیری دەبن! لە دوای ماندوونەبوون لێکردنو بەخێرهێنانم گوتیـــان کاکە خەڵکی کوێیو بۆ کوێ دەچیو بـــەدوای چیدا دەگەڕێی و ناوت چییەو لەکوێوە هاتووی؟ گوتم: خەڵکی پشـــترێیەمە، جاشهێسترێکی قولەم لـێ ون بووە، نیشان بەو نیشانەی خەتەکی سپی بە تەختی نێوچاوانیدا هاتۆتە ســـەر لووتی بۆ بەینی هەردوو کونەکەپووی، نووشـــتوویەکی سەوزی لەگەڵ دوو دەنکەمووررووی شینی چاوزارێ بە ملیەوەیە، بە گشتەکێکی ڕەشبەڵەک هۆندراوەتەوەو بە دەستێکی بەدەستنوێژ لە ملی کراوە. هێشتا شیلەی[1] فڕێ نەداوەو نیری نەچۆتە ســـەر ملی، هەزار ســـوێندی بخۆی ســـوێندت ناکەوێ، دەڵێی شـــەمامکەیە چـــاوی خەڵکی ئاوایی زۆر لەســـەربوو، ســـەرەڕای ئەو

١. شیلە: ددانی شیریی وڵاخ وەک ئەسپ و ئێستر و گوێدرێژ، کە لە تەمەنی دوو ساڵ و نیویدا فڕێیدا و دوای ئەو ددانە، ددانێکی دیکە دەردەکا پێیدەگوترێ بەرازە. دیاریکردنی تەمەنی ئەو وڵاخانە بە شیلە و بەرازە دەکرێ.

هەموو نووشتووە و گشـتەکو دووعای چاوزاریّ، لە کۆتاییدا تیری قودرەتیّ هەر لێیدا! ئاخر ئەنگۆ وەکی مە بەکرشـەیتانی خێل و خوار ناناسـن، چاوی دەڵێی پێلوو و تەرازووە، چاوی هێندە پیسـە لە بەردی بدات شـەقی دەکات! سوێندتان لەسەرم نییە سواری لەسـەر زینی دەهێنێتە خواریّ! یاخوا کافری هەر حەوت دینان نەکەوێتە بەر تیری چاوەکانی! ڕۆژی پێشی جاشهێسترەکەم لـێ بزربێت، لەسـەر کۆلی ئاودانیّ بە چاوی کوێری گوتی: جاشهێسترێکی جوانە، دەبێتە هێسترێکی بارەبانو لەبەری دەحەسێیەوە! لە هەموو پشتڕێییّ جاشهێسترێکی وای لـێ نییە! یەکسەر زانیم ئەنگاوتی، چونکە هێسترەکەم زۆرینەک زۆری، وەکی بگری! هەرچەندی سـورەتی «قول ئەعوزوم» خوێندو تفم ڕۆکردو پێم لێخشـاندو فووم لە هەرچوار دەوری خۆم کرد، دەسـتم بۆ گونم بردو لاگونێکی خۆم بادا، بێفایدە بوو، هێسـتر سوورگوم بوو، خەونەکەی داکم وەڕاست گەڕا! ئەوانیش بەقایان کردو کەوتنە بن بارەکی غەمان بۆ جاشهێستری قوڵە، بەڵام ئاگام لێبوو، وردە وردە بەزمی دیوەخانیّ ئەورۆژە کەوتبووە سەر من، یەک دەیگوت: جاشهێسـترەکەت ماچەیە یان نێرەکییە؟ ئەوی دی دەیگوت: کاکە لە گوێرەی ئەوەندەی پەرۆشە دەبێت ماچە بێت! گوتم: کاکینە ماچەیە!

دیوەخان بیسـت شـەقاو درێژە دوو دەرگای داری گـەورەی پێوەیە، یەکیان کەوتۆتـە لای ڕۆژئاوایێو دیوی دەرێی حەسـاریّ، ئەوە بەس میوان هاتوچۆی پێدا دەکـەن، دەرگای لای ڕۆژهەڵاتـێ کەوتۆتە نێو حەسـاریّ، ئەوەیان بەس ئاغاو برازاکەی بۆ دیوی ماڵێ هاتوچووی پێدا دەکەن. دەرگاکان بە شمشـێرەی دادەخرێن، بە نەخشو نیگار دروسـت کراون، هەمووی بە بزماری سـەرپانی

جەنجەڕی بزمارکوت کراونو کلیلی داری پێنج پشـــکەیان[١] لەســـەرە، تاقو دیواری بەڕەفەو تاقچکەی قەزمەنووشـــتی نەخشـــێندراون. لەنێو دیوارەکان دەلاقەی باریکـو درێژی لێدروســـت کـــراوە، تفەنگی نۆبەتـــدارو خزمەتکارو پیاوەکانی ئاغاو میوانانی تێدا هەڵدەپەســـێرن. دارەڕێی وەکو پەنجەی دەستی لەپاڵ یەکن، بە قەد هەموو خانووەکانی گوندی کاریتەی تێدایە. بنمیچو بانی دیوەخانـــی هێندە بڵندە لە ماڵی خوای نزیک بۆتەوە! دیوارەکانی خشـــتونیو پانە، باوەڕ بکەن مەترەلۆزی حەوت حوکمەتان نایبڕێ هێندە مەحکەمە. لەلای خوارێ شوێنی قاوەجاغو سەماوەرو پیاڵەو فنجانی قاوە، سەماوەرەکەیان یەک کوندە ئاوی دەگرێ، هێندە زەردە دەڵێـــی زەردێنەی هێلکەیە! کوڕە چوزانم ئەوە بە قســـە تاریف ناکرێ، ئەگەر نەمرین بە چاوی خۆتان دەیبینن، ئەو سەگبابە حکومەتێکە بۆ خۆی! گوایە وەستای بە دانسقە لە هەمەدانێ بۆ هێناوە.

لێوی ســـاپیتەو ســـوانەی دیوەخانێ هەمووی بە تەنەکەی ڕەنگاوڕەنگـو قەزمەنووشتی نەخشـــێندراوە، خۆشـــبەختترین کێشکەپاساری ئەوەیە لەبن ســـاپیتەو ســـواندەی دیوەخانێ هێلانەی کردبێت، چونکە هێندە بڵندە دەستی هیچ منداڵێکی ئاوایی پێی ڕاناگات دەست لە هێلانەو هێلکەکانی وەربدات. شـــوێنی دیوەخانێ لە هەموو گوندی بەرزترە، بەسەر هەموو گوندیدا دەنۆڕێ، تەنانەت دەزانێ چ ژنێک لە ئاوایی کۆڕی کردییەو جلەکانی لەســـەر ڕســـتەی حەســـارێ هەڵخســـتووە. هەموو گوندو ماڵـــە کرمانجـــەکان، وەک ئاوێنەی لەبەرچاویانە، ئەگەر لە دووری گونـــدی لێی بڕوانی، دیوەخانو خانووی ئاغای

---

١. کلیلی داری پێنج پشکە: کلیلێکی دارینە، پێنج ددانەی هەیە. پشکە: ددانە.

وەک بەرانی نێو مێگەلەمەڕی، دیارن.

هیـــدۆ گوتی: کاتێک لە دەرگای دیوەخانێ نزیـــک بوومەوە، بە دەنگێکی نیازمەندانە گوتم: هۆی ئاوەدانی! کـــێ لێرەیە؟ ڕێبوارم دەتوانم بێمە ژووری؟ کوڕێکـــی گەنج لە دەرگای دیوەخانێ دەرپەڕیو هاتەســـەر عەتەبەی دەرگای: ها کاکە چیت دەوێ؟ گوتم: ڕێبوارم دەمەوێ ســـۆراغی جاشهێسترەکەم بکەم! گەنجەکە سەری بردەوە دیوی دیوەخانێ، دیاربوو مۆڵەتی لە کەسێکی لە خۆی گەورەتـــری وەردەگرت بۆئەوەی ڕێم پێبدات بچمـــە ژووری. فەرموویان کردمێ. کـــە بە ژوورکەوتـــم، دوازدەچاو کەوتنە ســـەرم، بەجۆرێک لە نووشـــتووەکانی کڵاوەکەمرا هەتاوەکو دەلینگی شـــەروارەکەم تەماشایان دەکردم، بۆئەوەی بزانن بە دوای چیدا دەگەڕێم. پێموابوو تەنها بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو کە لەبنەڕەتدا مەبەستی سەفەرەکەم بوو. ئەوان زیاتر چێژیان لە پێرابواردنم دەبینی. سەرتان نەیەشـــێنم، ئەوەی لێم هەڵکراندن ئەوەیە: شـــەش پاسەوانی هەیە، هەتاوەکو بەیانی بێ نێوبڕ ئێشـــک دەگرن، هەموویان تفەنگی باشیان پێیە، کەسیان لە دووڕەخت فیشەکی کەمتر پێنییە.

ئـــەورۆژە، نە ئاغاو نە برازاکەی لە ماڵێ نەبوون، لەلای ئاغایەکی ناوچەکە داوەتی نانخـــواردن کرابـــوون، بۆیە پاســـەوانەکان ئەو دیوەخانەیـــان کردبووە مەیدانی خۆیان. ویســـتم دەرگای دووەم تاقی بکەمەوە خۆم لە کووچەی عەلی چەپ (١)و گێلی دا، بە بیانووی کاری ســـەرئاو و دەســـتنوێژ شۆردن هەستام دەســـتم بۆ دەرگای برد، هەموو پێکەوە هەســـتانە سەرپێ، وەک ئەوەی دەستم

١. کووچەی عەلی چەپ: کینایەیە بە خۆنەبانکردن و خۆ لەگێلیدان لە بابەتێک. ئیدیۆمێکی خۆرهەڵاتی کوردستانە.

بۆ شـــتێکی خراپ بردبێ: نەکەی! کاکە ئەو دەرگایە بەس ئاغاو برازاکەی بۆ دیوی ماڵێ پێیدا هاتوچوو دەکەن. گوتم: کاری ســـەرئاو و دەســـتنوێژم هەیە! مەســـینەیەکیان بۆ پڕئاو کردمو کەندێکی دووری ئاواییان نیشان دام: ئێمەش بۆ دەســـت بەئاوگەیاندن دەچینە ئـــەو کەندەی. دیاربوو بـــە گاڵتەپێکردنەوە دەیانگوت: کاکە خۆ تۆ نوێژت لەسەر نییە، مەعافی! مەبەستیان ئەوەبوو کە شـــێت نوێژی لەسەر نییە. دوو ســـەگیان لە حەساری بە زنجیری بەستاوەتەوە، سەری منیان بەزارێوە دەچێ! دیاربوو لە ناو ئاغەواتی میراودەلی لە پشتدەری بە دیاری بۆی هاتبوون.

تراکتۆرێـــک لەپێـــش دەرگای ڕاگیـــراوە، هێندە نوێیە ئەو داوەلاســـتیکە ڕەشانەی بە تایەکانییەوەیە، هێشتا هێندە لێنەخوراوە لێبێتەوە، هێشتا گاسنی لە عـــەرزی نەداوە. لەو کاتەی هاتمـــەوە ژووری داوای بەرماڵەنوێژم کرد، هەر زوو بەرماڵـــی خورییان بۆ ڕاخســـتم. بەجۆرێک نوێژەکـــەم دەخوێند لە دەرێڕا گوێیان لێدەبوو، وشـــە وشـــە هەموویم دەخوارد، وەک شتێکم لە زاریدابێتو بمەوێ قووتی بدەم. کاتێک دەچوومە ڕکوع، هەردوو چۆکی خۆم وا لە عەرزی دەدا ڕمبـــەی دەهات! حەوت ڕکاتم کرد، کە ســـەلاوی نوێژەکەم دایەوە وەک لە سواری ئەسپی دابەزمو سلاو لە خەڵکی بکەم! چونکە هەر هەموویان گوتیان وەعەلەیکومەسسەلام یاخوا بەخێربێی سۆرەگورێ باغان! فووم لەسەر هەردوو شانەکانم کرد، هەرچی جنێوی سووکـو سەلیمە بە شەیتانمدا. کەوتمە ژماردنی تفەنگـو ڕەختو فیشەکدانەکان، لەبەرخۆمەوە بە فسکە فسک بە پەنجەکانم دەمژمـــاردن، ئەوان پێیان وابوو دووعا دەکەم. پاســـەوانەکان وەک تەماشـــای سەرو فەساڵی ئەقڵســـووکێک بکەن: بەخوای تەکلیفی شەرعی لەسەر نییە،

بە پێڵاوەوە دەچێتە بەهەشـــتیّ! ئەمنیش لەبەرخۆمەوە دەمگوت: وای ئەگەر دەزانن بـــە دوای چیدا دەگەڕێمو چکارەم! چۆن خوریشـــۆرم دەکـــەن! دیاربوو پاســـەوانە گەنجەکە پێدەکەنیو گاڵتەی بە شێوازی نوێژکردنو هەڵسوکەوتی مـــن دەهات. گوێم لێبوو گای بنەی[1] پێیدەگوت: ڕۆڵە ئەو پیاوە دەلووە، فرێ بەســـەر دنیاوە نییە، ڕەنگە هەر لە دینیدا وای بەســـەر هاتبیّ، بەخوای هەر بەبیّ پرســـیارو وەڵام دەچێتە نێوەندی بەهەشـــتیّ! هیچکام لە پاسەوانەکانو چایچـــیو قاوەچی ئـــەو دیوەخانەی ئاغای، خەڵکی ئەو گونـــدەی ئاغای نین، هەریەکەیان لە شوێنێکەوەو بە هۆکاری ئەنجامدانی کەتنێکەوە گەردەلوولی ڕۆژگار رایپێچاونو ناچاری ئەو دیوەخانەی کردوون. چیرۆکی هەریەک لەوانەی لەو دیوەخانەن جیاوازو تایبەتن، هەریەکەیان لە ڕووداوێکەوە پەراگەندە بوون، هەموویان ڕاکردووی بەردەمی یاسان، ئەوەش بۆتە هۆکار دیوەخان وەک خۆڵو خاشـــاک لە خۆیان لوول بدات. بە شانازییەوە دەڵێن دیوەخانەکەی بۆتە جێی پیاوکوژو مەحکومان. کە چاویان بە دیکۆرو شێوازی جلوبەرگ و هەڵسوکەوتی شێتانەی من کەوت، خەنی بوون، بە ئومێدی ئەوەی ئەمنیش ببمە ئەندامی ئـــەو خێزانە لاکەوتەو لانەوازەی ئەوان، بە تایبەتی کە دەیانبینی بەواقوڕماوی تەماشـــای دارو دیوارو تاقچکـــەو ڕەفەی دیوەخانێم دەکـــرد، مەزاقو بەزمی

---

١. گای بنەی: بەو گایە دەگوترێ کە پیرو کەنەفت بووبێتو وەکو جاران توانای نەمابێت. لە گوندا، لە کاتی گێرەکردن بە ئاژەڵ، ئەو گایە دەخرایە چەقی گێرەکە، چونکە لەبەر بێتاقەتی نەیدەتوانی باش بسوورێ. ئەو ئاژەڵەش کە جاحێڵ و بەتاقەت بوو، لە ڕیزی ئاژەڵەکان یەکەم دانە دایاندەبەست، چونکە باش دەجولاّ و ئاژەڵەکانی دیکەی لەگەڵ خۆی دەسووڕاند.

دیوەخانێیان هاوێشــــتە سەر من، دەســتیان بۆ نووشتوو و حەتۆتەی سەرشانم درێژ دەکرد، بە گاڵتەوە دەیانگوت: ئەو گونەبەرانانە چین بەســـەر شـــانتەوە؟ خۆم خڕەکردەوەو دەستم لەسەر نووشتووەکان دادەنا بە مەبەستی پاراستنیان: دەســتی نەکەنێ با هەردوو چاوتان مجرۆو کۆرە نەبــێ، ئەوە داکم لای مەلای گوندی بــۆی کردووم، فرۆجەکی ســەرقەرەمانە داوەتە مامۆســتای بۆ ئەوەی چاووزار کارم تێنەکات، نەبادا وەکو جاشهێســترەکەم، بەکرەشەیتانی چاوپیس بە چــاوم ببات! ئەوانیش دەتریقانەوە: بۆ مردوومــراو پێتوایە هێندە جوانی؟ دەڵێی قازانی قۆپاوی، کەس هەیە بەخیلیت پێببات؟ ئاخر لە ئاوێنەی سەیری خۆت کردووە دەڵێی کڵاوکوڕەی، چ کەرێک خۆزگە بە تۆ دەخوازێ؟ دەیانگوت: ئەی بۆ ئەو دۆخینەت ناخەیتەوە شــەروارەکەت؟ دەمگوت: بۆئەوەی دۆخینم نەبێتــە گرێکوێرە، جارێکیان بە منداڵی دۆخینم بوو بە گرێکوێرەو هەرچەندی کــردم بۆم نەکرایەوە، منداڵی گوندی لە هەرچوار دەورم دەســووڕانو چەپڵەیان لێدەدا: «دۆخینم کوێرەگرێیە، ڕێی ئاودەستی لە کوێیە؟» تاوەکو کار لە کارێ تــرازاو دۆخینم هەر نەبووەوە، بۆیە نامەوێ جارێکی دیکە وام بەســەربێتەوە، دۆخین ئاوا لە دەرێ بێ دەستەو ڕاسترە.

ئەوانەی قەدەر بەرەو دیوەخانێی ڕامالیبوون، هەریەکەیان لە دوای هاتنیان بۆ دیوەخانێ، پاشــناوەکیان بۆ دانابوون کە پەیوەندیی بە جۆری کەتنەکانیانەوە هەبووە، گای بنــەی، ئامۆزاکوژ، خەزوورکوژ، ســوورەی خەجــە چاوبەلیو... هێندەیان پێ کاڵفامو جێی بەزەییو کەمنەقڵ بووم، وەڵامی هەموو پرسیارێکیان دەدامــەوە، بێئــەوەی هیچ گومانێک لە پرســیارەکانم بکــەن. بۆیە بەو چەند سەعاتەی لەلایان مامەوە، پێشینەی تاوانەکانی هەموویانم زانی. هەریەکەیان

چەند ساڵە خزمەتکاری دیوەخانن، لە بەرامبەردا ئاغا ڕادەستی یاسایان ناکات، وەک دەڵێن «هەر شــەڕەک لۆ جوامێرەک!» سوودمەندی سەرەکیش ئاغایە، تا خزمەتی خۆیانی پێدەکا داڵدەیان دەدا، کە پیر بوون یان نەخۆش کەوتن، ئاغا پێیان دەڵێ: ئەوە چەند ســاڵە خزمەتتان دەکەمو بەخێوتان دەکەم، ئیدی توانام نەماوەو چارەیەکی خۆتان بکەن، بەو شێوەیە بەرەڵڵایان دەکات!

هەر بــە جارەکێ خەنی دەبوون کــە دەمگوت: وەڵامی یەک پرســیارتان نادەمەوەو قسەتان بۆ ناکەم تاوەکو ئەو تفەنگەی لە پاڵپشتی من لانەبەن، ئاخر تفەنگ شەیتانە شەیتان، ئەمن هەموو دنیام لەسەر تاپۆ بکەن ناوێرم دەستی بکەمێ! ئەوەی لە هەموویان بە تەمەنتر بوو، چاوێکی، نووکە خەنجەر کوێری کردبــوو، کاتێک دوو ئامۆزای خۆی لەســەر زەوی‌و موڵکایەتی بە خەنجەرێ کوشــتبوو، بە گای بنەی بانگیان دەکرد . ســوێندی خوارد ئەوە بیســت ساڵی ڕەبەقە خزمەتی ئاغاو دیوەخانەکەی دەکات، لە بەرامبەردا ئاغاش ڕادەســتی پۆلیســی ناکات. دەیگوت: زۆرجار معاون‌و مەئمور مەرکەزی پۆلیس هاتوون بەدوای مندا گەڕاون لەو دیوەخانەی پرســیاری نــاوی منیان لە ئاغای کردووە، ئەویش پێی گوتوون: بە سەری جەنابی معاونی کەسی بەو ناوە نەهاتۆتە ئێرە! لەکاتێکدا بەدەســتی خۆم چام لە پێش دانــاوە! ئاغا پێی دەگوتن: وا چاکە لە شــوێنێکی دیکە سۆراغ‌و شوێنپێی هەڵگرن، چونکە لەلای من دڵنیابن جێی پیاوکوژو دزو چەتان نابێتەوە، هەر بە دەستی خۆم ڕادەستیان دەکەم. ئەوانیش هۆرتەهۆرت[1] لە تەشــکی خۆیان داوەو بەرەو شار دەگەڕانەوە، دەستکەوتیان

---

١. هۆرتەهۆرت: ساڵدانە ساڵدانە، بەلۆژەلۆژ.

چەند سەرکەپەنیریکو چەند سەرکە داندۆکێک دەبوو وەک دەم چەورکردنێک!

یەکی دیکەیان، خەریکی سەماوەرو پیاڵەکان بوو، خۆشخۆش چای بۆ دێنایــن. یەکی سوورەی قوڵەخڕەی موو زەردو موو نەرم بوو. چیرۆکی هاتنەدیوەخانی ئەویش: لە گوندەکەی خۆیان کەیــنو بەینی لەگەڵ ژنێکی بەمێرد هەبووە. لەگەڵ ژنەی تەگبیرو پیلانیان داڕشتووە مێردی ژنەکە بکوژنو بەرەو شوێنێکی نادیار سەری خۆیان هەڵگرنو بڕۆن. لە شەوێکی بەبارانی زستانێدا دەیکوژنو ڕادەکەن. ئەوەندەی خەنجەر لەنێوبرینی لەقاندبوو کەس بە ڕوح نەگەیبووە سەری. چەند ساڵان بە نانو زگ چایەچی ئاغایە. خەجە چاوبەلی ژنیشی لە دیوی ژنان قەرەواشو لانکژێنی ئاغەژنییە، بە حەفتەش یەکتری نابینن، تەنها لە بەرامبەردا ئاغا ڕادەستی دادگایان ناکات. لەوانەش خۆشتر، یەک لە نۆکەرەکانی دیکە، لەوکاتەی ناوی بۆ خزمەتی سەربازی هاتبووەوەو نەچووبوو، بابی، هێنابوویە دیوەخانی ئاغایو دوو گیسکی قەڵەویشی بەدیاری بۆ ئاغای هێنابوو، تا وەک نۆکەر وەریبگرێتو لەجیاتی خزمەتی سەربازی، خزمەتی ئاغای بکات. بابی، بە ئاغای گوتبوو دڵم ناهێنێ بینێرمە سەربازی، حەزدەکەم لە دیوەخانێ خزمەتی جەنابت بکات! ئاغاش گوتبووی ئێمە خاوەن دەرکین، کەسێک بێتە دەرکێ ئێمە بەنائومێدی بەڕێی ناکەینەوە! چوارەم ساڵی خزمەتکاریو پاسەوانی دیوەخانێی تەواوکردبوو، لەجیاتی دوو ساڵ سەربازی! بەڵام هێشتا سەربازییەکەی لەسەرماوە بیکات، ساڵانەش بابی پێڵاو و جلوبەرگی بۆ دێنێو دوو گیسکی قەڵەویش بۆ ئاغای دێنێ!

چیرۆکی کەسێکی دیکەی دیوەخانێ، لەگەڵ ژنەکەی لەسەر سوێرییو تێرخوێیی نیسکێنەی بە کێشە هاتبوو: ژنێ کوێراییت دایێ، ئەو نیسکێنەیە

بۆ هێندە ســوێرە؟ ئەوە چەند چەنگە خوێت تێکردووە؟ ژنەش هەزار سوێندی خواردبوو هەر بەقەدەر جارانی خۆی تێکردووە، ســەیرە، ئەو چێشتە بۆ وا بۆتە شــۆرەکات؟ مەگەر جندۆکەو لەمەچێتر خوێیــان تێکردبێت! ئەگەر ڕەمەزان نەبایە تامم دەکرد، بەڵام بەڕۆژوو بووم لێم نەخوارد. توومەز دشــەکەی بەخیل و ئاژاوەچییەو ویســتوویەتی پەیوەندی ئەو ژنو مێردە تێکبداتو ماڵەکەیان بشێوێنێ، تا ژنە لەسەر بیری هاتۆتەوە، چووە چنگێک خوێی بۆ لە چێشتەکەی کردوون. بەو ئێــوارەی ڕەمەزانە کە ژنەو پیاوەکــە هەردووکیان بەڕۆژوو بوون، ئێســتاش خواردنێک شک نابەن زگی برسیانی پێ تێربکەن، تاو لە تاوێ زیاتر کێشەکە بەگوڕترو توندتر دەبێت، لە ئەنجامدا پیاوەکە مەنجەڵەنیسکێنەکە لەســەر ســەری ژنەکەی ڕۆدەکاتو ســەرو پرچی لە تەقەلۆ[1] دەردێ. زیرەو زریکەی ژنەکە هەمــوو خەڵکی ئاوایی بەئاگادێنێ، بەو حاڵەشــەوە پیاوەکە ســێ بەردەی تەڵاقان فڕێدەدا هەتاوەکو خۆی بڕیار نــەدا کە بگەڕێتەوە، ئەو ژنە لــەو ماڵەیدا نامێنێ! ژنەی دەبەنەوە ماڵی بابی. ئەو ماوەیەی ژنەکەی لە ماڵی بابی ماوەتەوە، پیاوەکە بە دەســت گریانو نەحەوانەوەی منداڵەکانی زۆر هەراسانو هیلاک بووە.

ئەوانەی لە گوندی ئیشوکاریان قسەهێنانو بردنو گەورەکردنیانە، کەوتنە خۆ، لەلای ژنەی گوتبوویان مێردەکەت بە نیازی ژنهێنانەو ئەو منداڵانەی دارکاری دەکات، شــەوان زیرەی ئەو منداڵە بێدایکانە دەگاتە کەشــکەڵانی فەلەک. لــەلای پیاوەکەش گوتبوویــان ژنەکەت قەت بەنیازی گەڕانــەوەی ئەو ماڵەی

---

١. تەقەلۆ: سووتانێکی زۆری جەستە.

نییەو خەتاکەش خەسوو و خەزوورتن کە ناهێڵن ژنەکەت بگەڕێتەوە.

لە ڕۆژی نۆیەمی ئەو کێشـــەیەی، کە دەیکردە دوازدەی ڕەمەزانێ، ئەوانە ئیشیان قسەهێنان و بردن بوو، پیاوەکەیان زۆر تووڕەکردبوو، پیاوەکە هەر بەپەلە خەریتەی تفەنگیی لە خۆی دەبەســتێتو تفەنگی لەبن ئەســتێرکی نوێنان دەردەهێنێت، بەهەشــتاو بەرەو ماڵی خــەزووری ڕادەکات، تفەنگەکەی لەنێو دەســتی گرتووە. لەو چرکەساتە هەستیارەدا، هەموو ئەو قسانەی دەرخواردیان دابوو، چنجرۆکیان لە هەســتی پیاوەتیی دەگرت، بەرچــاوی تاریک کردبوون، مرۆڤەکانی بەرامبەری، وەک تارمایی شــەیتانی ببینێو هیچ شتێک ساردی نەکاتەوە! کــە دەرگای لە ماڵی خەزووری دەگرێ، قســەیەک لەوێو یەک لە خەزووری، یەکســەر میلی تفەنگەکەی دێنێتەوەو یەکەم گوللەی دەتەقێنێو خەزووری سارد دەکاتەوە. خەسوو و ژنەکەی، کاتێک چاویان لە کوفارەی خوێنو لرخەی دەبێت دەزیرپێنو دەیانەوێ خۆیانی لەســەر دابنێن، بۆئەوەی گوللەی دیکەی پێوە نەنێ، یەک لە دوای یەک خەســوو و ژنە دووگیانەکەی خۆیشی دەکــوژێ. بۆ ئەوەی خۆی ڕادەســتی پۆلیسو دادگا نــەکات، خۆی دەهاوێتە دیوەخانی ئاغای. ئەو، پیاوێکی تــا ڕادەیەک مرومۆچەو خۆی لەوانی دیکە بەزۆرتر دەزانێ، چونکە لە ماوەی ئەو نۆ ســاڵەی لە دیوەخانێ پاسەوانە یاساو دابو دەســتووری دیوەخانێ شارەزا بووە کە ڕێزو گەورەیی هەرکەسێک بەقەدەر ئەنــدازەی تاوانەکەیو ژمارەی ئەوانەی کوشــتوونی. ئاخر ئەو، چوار کەســی کوشــتووەو لەوانەی دیوەخانێ کەســیان بە قەدەر دەســتکوژەکانی ئەو نین. ئاغا لە هەمووان زیاتر گرنگی پێدەدات، بۆ زۆر شــوێن لەگەڵ خۆی دەیباتو بەردەوام بە دوایەوەیە، هەرچی بیەوێ لەگەڵ نەیارەکانی بیکا، ئەو ڕادەسپێرێ.

زۆر شــەوان ناردوویەتی کلکی کەرو مانــگای زۆر لە نەیارەکانی ئاغای بڕیوەو ئەتکی کردوون! کە دەمگوت بیکەنە ڕاهی خودای ئەو تفەنگەی دووربخەنەوە با نەتەقێ، تفەنگ شــەیتانە، با یەکێکمان سلار نەکاتەوە، ئەو لە هەموویان زیاتر دەتریقایەوەو پێدەکەنیو بە ترسنۆکی دەزانیم!

لــە دیوەخانێ زاڵمان، بــۆ دەرمانیش یەکێک نادۆزیتــەوە ئەگەر کارێکی ترســنۆکانەی نەکردبێت و وەک موقناتیس هەرچی ورتکی ئاستی بێکەڵکە لە خۆی دەهاڵێنێ! بەپێچەوانەوە، دیوەخانی خانەدان و پیاوچاکان، جێی سوڵح و سەڵاحەت بووە.

کاکەڕەش، وەک خو و خدەی هەمیشەیی خۆی، لەڕقان مووی سمێڵی خۆی دەکرۆشت، چاوە پڵنگییەکانی جەرەقەو[1] ئاوریان دەهاویشت: دڵم دەسووتێ و ئاگــر دەگــرم کاتێک دەبینم کــوڕە کرمانجە هەژارەکانی گونــدان، لە دزانی خۆیان پاســەوانن! لە کاتێکدا بابو براو کەسوکاریان لەلایەن ئاغای گوندیەوە هەرچــی ناهەقیو بێگارییە پێیــان دەکرێ، لە جیاتی هەوڵــی خۆڕزگارکردن بدەن، پاســەوانی زاڵمێکی دیکە دەکەن! نەبیستراوەو نەدیتراوە نێچیر بۆخۆی بەدوای ڕاوچی خۆی بکەوێ! ئەرێ بەڕاســت هیدۆ! ئەتۆ چووبووی سۆســەو زانیاری لەســەر گوندو دیوەخانو ماڵی ئاغاو پاسەوانو ژمارەی چەکەکانیانمان بۆ بێنییەوە، یان چووی گوێت لە حیکایەتان بێ!؟ ســەرم سوڕماوە، چۆن قونت تۆتکەی گرت ئەوەندە لە شوێنێک دابنیشی؟ ئاخر ئەتۆ خۆ ناحەجمێی، دەڵێی جیوەت تێکراوە! مریشــک بای، یەک هێلکەت هەڵنەدەهێنا، چونکە ئەوەندە

---

١. جەرەقە: ئەو پرێشکەئاگرەی لە بەرد و ئاسن دەبێتەوە.

لەسـەریان کڕ نەدەکەوتی گەرم دابێن! هیدۆ گوتی: بەخوای دەنا لەبەر زمانی ئێوە نەبا، بەنیاز بووم شـەوێش لە دیوەخانـێ بمێنمەوە! گوێگرتن لە چیرۆکی ئەوانـەی ڕۆژگار هەڵیاندەداتە دیوەخانێ، بەڕاسـتی زۆر بەئازارن! ئەوانە، لە غەفڵەتدا نووستوون، لە زیللەتدا نغرۆ بوون، کەسایەتیی خۆیانیان دۆڕاندووە، هەسـت بەوە ناکەن لە زیدی خۆیان ڕەفتار دەکەن، وەک ئەوە وایە ئەو دارەی ببڕنەوە بۆخۆیان لەسەری ڕاوەستاون!

دوای بەدوای ئەو زانیاریانە، کاکەڕەش و هاوڕێکانی کەوتنە خۆئامادەکردن.

ئێوارەیەکی سـاردە، کزەبایەکی وشـک وەک گیزانی دەبڕێ، مریشک هەر زوو خۆیان خزاندە کولانەکانیان. کولانە، بەهۆی ئەو قەسـەڵو کایەی تێیدایە گەرموگوڕە. کێشکەپاسـاریو بارانبڕە، لەبن سـوانەی خانووان، چوونەتە نێو هێلانەکانیـان. پیـاوەکان جەمەدانییـان دەمامک داوەو لەسـەرو گوێلاکی خۆیانیـان پێچـاوەو لووتیـان وەک تەماتەی سـووری لێهاتووە، ئـاوی پێوە ڕاناوەسـتێ، وەکو بنی کووپەی ئاوپالێو، تکەیەک بە تـەواوی نەتکاوەتەوە، تکەیەکی دیکـە جێگای دەگرێتەوە. هـەر بابایە خەریکـی داکردنی مەڕو مـاڵاتو وڵاخەبەرزەکانیانن، بـۆ ئەوەی لە دەسـت دزو پیاوخراپان بپارێزرێن. لـە دەرگای ماڵێوە کە وەژووردەکەوی، دەبوو بە دوو بەش، بەشـێک بۆ خێزانو ژوورێکی تەنیشـتیش بۆ وڵاخەبەرزەکان. کاکـەڕەش تاژییەکانی جلکردو بۆ جێگای خۆیان وشتەی[1] لێکردن.

ئەو ئێوارەیـە میوانە چاوەڕوانکراوەکانی کاکـەڕەش یەک لە دوای یەک

---

١. وشتە: دەنگدانی تاژی. بۆ دەنگدانی سەگیش (چەغە) بەکاردێت.

دەگەن. لە سەرمان خۆیان پێچاوەو نێولەپی دەستیان لە یەکتری دەخشێنن: ئەوشەو دارو بەردی لێک دەبەستێ! ڕووباریش شەختە دەیبەستێ! کاکەڕەش‌و هیدۆو ئەنوەرو مەلا ئازاد، دەوری سۆبەکەیان داوە کە پڕە لە قشپل‌و سەرگین. سۆبە کونکونەکە، قلە قشپلە سووتاوەکانی وەک کەلا مسی سوورکراوە تێیرا دیارە، کە فەراموشی دەدایە سەرمابردووەکانی چواردەوری خۆی. مەلا ئازاد مەلا نییە، بەڵام چونکە بە منداڵی خراوەتە بەرخوێندنی مەلایەتی ئەو پێشناوەی لە حوجرەی فەقێیان پێوە هەڵواسراوە، زۆریشی لە دڵ گران دەهات کە پێیاندەگوت مەلا. ئەو مەلایە ببووە قیرو لێی نەدەبووەوە. هیدۆ وەک عادەتی هەمیشەیی خۆی، هەر بۆ ئەوەی مەلا ئازادی تووڕە بکات، لە سۆبەکە دەچووە پێش‌و هەردوو دەستی لە تینی سۆبەکە نزیک دەکردەوەو خۆشخۆش دەیگوت: مامۆستا مامۆستا! یان دەیگوت: بەسەری ئەو مەلا ئازادەی! یان دەیگوت: ئەوە مەلا ئازادیش شاهیدە! ئەو ڕێژنە مەلاکوتە، مەلا ئازادی دەکوتی‌و بە بیانووی گەرمکردنەوەی گوێ‌و لاجانگ‌و ڕوومەتی، خۆی دەدایە بەرسۆبەکەو ڕووی لە هیدۆی وەردەگێڕا، وەک گوێ پێنەدان!

وژەوژی ئەو وشکەبا ساردەی سینگی خۆی لە لێوی تیژی سوولاوکەو تەنەکەی بەرسواندەی خانووەکان دەسووی، دەنگێکی لە نەغمەی گریان‌و کڕووزانەوەی ترسناکی بە گوێی خەڵکی پەستاوتەی بنەبانی ژوورەکاندا دەدا. ئەوەی لەو سەرمایە بێمنەت بوو، سەگەکان بوون، ئەوان لەسەر ئەو عەرزە ساردەی وەرکەوتوون. بایەکە هەرجارەی بەلایەکدا تووکی سەگەکان شانە دەکات. هیدۆش هێندەی کاکەڕەشی، تاژییەبەڵەکی خۆشدەوێ: تاژییەبەڵەک دیار نییە؟ کاکەڕەش وەڵامی دایەوە: لەسەر قەسەڵ‌و کای لەسەرمان خۆیان

گرمۆڵە کردییە، دەڵێی مارە خۆی کەپکە کردییە!

لەو کاتەی ئەوان سەرگەرمی قسەوباسی خۆیان بوون، لەناکاو هەریەکەو لەگەنێک شلەساوار بەگۆشتی فرووجیان لە پێش دانان، هەڵمیان لێهەڵدەستا. تەشتی نانیو دوو سەلکەپیوازیان لە نێوەندێ دانا. مەلا ئازاد گوتی: ئۆیف! بەخوای لەجێی خۆیەتی، بەو سەرماو بایە ساردەی ڕۆژی شلەساوار بەگۆشتییە! هەریەکەیان لەگەنی خۆی ڕاکێشتە پێشە خۆیو کەرت کەرت نانی سێڵێی بە ساواری دادەدەن، دەڵێی گورگیان کوشتییە! ئەگەر بە دەستی نەخۆن، بە کەوچکی تێر ناخۆن! هەتا دەستیان بە بنی لەگەنەکانیاندا هێنا، خواردیان. کاکەڕەش گوتی: با بۆتان بێننەوە! گوتیان زۆرمان خوارد، بەشی ئەوەمان خواردووە سێ جار بچینە سەر قەرەچووغیو بێینەوە خوارێ! کاکەڕەش ئێسکو پرووسکی فرووجەکەی کۆکردەوەو بۆ گۆڵی بەڵەکی برد، هاتەوە و گوتی: ئێستا ئاسوودەم تاژییەکەم تێرکرد. گۆڵی بەڵەک، تاژییەکی مامزکوژ بوو، لە هەموو بەرڕێو پشترێیێ ناوبانگی گەیشتبووە هەموو گوندەکان. لە دوای ئەوەی تێریان خواردو گەرم بوونەوە، ئاهێکیان لە گەدەی گەڕاو گوڕاحیان خۆش خۆش بوو، مجێزی قسانیان بزووت.

هیدۆ دیمەنێکی پڕ لە وردەکاری لەسەر گوندو دیوەخانی ئاغاو ژمارەی پاسەوانەکانیو جۆری چەکەکانیان بۆ ڕوونکردنەوە، بۆی کردنە هێلکەی سپیکراو و لە پێشی دانان. ئەوانیش گومانیان لە زیرەکیی هیدۆی نەبوو، باوەڕیشیان وابوو، هەر پلانێک هیدۆ نەخشەکەی بکێشێ، سەرکەوتوو دەبێت، چونکە هەموو جووڵەکان لە کاتو شوێنی خۆیدا ئەنجام دەدا.

ئێستا کاتی ئەوەیە بزانن چەند کەسیان پێویستە بۆ ئەو چالاکییەو

ئەوانەی لە توانایاندایە بەو کارە هەستن؟ چونکە بچووکترین هەڵەو درکاندنی ئەو نهێنییە، گۆبەندو کارەســـات بۆ چەندان خێزان دەنێتەوە. یەکەم جاریانە لە شـــوێنێکی ئاوا دوورەدەســـت وەها کارێکی وا ئەنجام بدەن. ژنو منداڵی هیچ یەکێکیان، نازانن ئەوانە بۆ کوێ دەچنو چ کارێکیان بەدەستەوەیە! بڕیاردرا لەو چەند ڕۆژەی دادێ، دەست بەکاربن. بڕیاردرا برایەکو ئامۆزایەکی ئەنوەریش بەشـــداربن، تاوەکو ببنە شـــەش کەســـی تەواو، لەبەرئەوەی لە شەش کەس کەمتر، ئەو چالاکییە سەرکەوتوو نابێو لە توانایاندا نابێت جێبەجێی بکەن.

شـــەوی دەســـتبەکاربوون دیاری کـــرا، بە شـــەرتێک باران نەبێـــت، چونکە پاســـکیلەکان لە ڕێگای قوڕ ناتوانن ڕێ بکەن. ئەنوەرو براو ئامۆزاکەی، ماڵیان لە شـــوێنی چالاکییەکەوە نزیکە، بۆیە وا ڕێککەوتن ئەوان هەر بە پیادە بێن بۆ شوێنی دیاریکراو کە دۆڵێکی بناری زووری بەدیوی لای چیای قەرەچوغیدا بوو.

ئەو ئێوارەی بڕیاریاندا وەڕێکەون، کاکەڕەش ســـێ چوپی پاسکیلی زیادەی لەگەڵ خۆی هێنا، نەبادا پاســـکیلیان لـــێ پەنچەر بێت. بۆئەوەی ئەو مەودا دوورەی ســـەفەرەکەیان کەم بکەنەوە، بەرلەوەی زەردەی خۆر بپەڕێ، کەوتنەڕێ. تاریکی، دەمێکە ســـەری بە دۆڵەکانی ناوبەندانی زووریدا گرتییە. گەیشتنە شوێنی مەبەست. ئەو زوورگە، هەمووی بەردەڵانەو بۆ کشتوکاڵکردن خاکێکی نەزۆکـــە، زیاتر بۆ مەڕومـــاڵات لەوەڕاندن ســـوودی لێدەبینن. تـــا لە زووری بەسەرکەوتن زۆر هیلاک بوون. بەو سەرمای زستانەی، ئارەقەی ڕەشو شینیان دەردابوو. لێخوڕینی پاســـکیل لە ڕێگای هەوراز ئاسان نییە، بەڵام لەو دیوی زووری، کە سەربەرەو ژێرە، پێویستیی بە پایدەرلێدانو سووڕاندن نییە، هەر بۆ ئەوەی لە ڕێگا لانەدەن تەنها سوکانی پاسکیلەکانیان گرتووە. تا دێت تیژڕەوییان

زیاتر دەکات. ئەوەی پایسکیلی داهێناوە، پێدەچێ زۆر زیرەک بووبێت، ئەها حیسابی بۆ شوێنی سەرەو ژێریش کردووەو ئیستاپی بۆ داناوە! بۆیە ئەوان لە شوێنی سەرەوژێری زۆر، ناچارن تەنها ئیستاپەکانیان بەکاربهێنن، بۆئەوەی تیژڕۆیی باسکیلەکانیان تووشی کارەساتێکیان نەکات.

بایەکی سارد خۆی لە لاجانگو ملیان دەخشێنێ، لفکی جەمەدانییەکانیان ڕادەوەشێنێ، کەسیان ئەلفازیان ناگەڕێو ئەرقومی ناکەن، ئەوەی گوێت لێدەبێت تەنها وززەی زنجیرو کەلای بۆلبەرینگی پاسکیلەکانیانە. کاکەڕەش هەر لە زووەوە پێیگوتوون بە هیچ شێوەیەک نابێت لە ڕێچکۆرەکە لابدەن، چونکە ئەو زوورگە زراوە دەڵێی بە ئەنقەست قونجرکەو سێسۆت لێ تۆداوەو چاندووە، هەر لاڕێ بووی، پاسکیلەکەت پەنچەر دەبێت! ڕێگایەکە بەرەو دۆڵێکی پڕ لە کەندو ئاودڕ شۆڕدەبێتەوە، لەو کەندڕەی کە ئاو دڕیبوویو ژوانیان لەو شوێنە لەگەڵ ئەنوەرو دوو کەسەکەی دیکە هەبوو، ئاگری جغارەی یەکێکیان بەدی کرد، دڵنیابوون ئەنوەرو برادەرەکانین. گەیشتنە لایان، لە دوای ئەوەی پاسکیلەکانیان لەو دۆڵەی جێهێشت، بەپەلە یەک لە دوای یەک وەک لەشکری بە نیزام، کەوتنەڕێ. هێشتا دوو سەدە هێستر مابوو بگەنە گوندی، بەدرێژایی ڕێگایەکە هەموویان بێدەنگو خامۆش بەدوای یەکتردا ملیان نابوو. هیدۆ بست بە بستی ڕێگاگە شارەزا بوو، چاوساغیو دەستکێشی یەکجار بەباشی دەکات، گەیشتنە نزیک دیوەخانێ. دیارە سەر لە ئێواران تا ماڵنووستنان، پاسەوانی دەست پێناکات، چونکە لەو کاتەدا هەموو خەڵک بەئاگایە. ئەو ڕۆژانەی ئاغا هەر سەر لە ئێوارێ لە دوای نوێژی شێوان کە دەیزانی دیوەخان میوانی لێ نییە، دەچووەوە دیوی ماڵێ. پاسەوانەکان ئەو

جۆرە شــەوانەیان دەقۆستەوەو بە فرسەتیان دەزانی کاتەکە بە یاریو جەفەنگو چیرۆکو مەتەڵ بەسەربەرن.

لــەو کاتەی خەڵکــی ئاوایی نەخەوتــوونو بۆ ماڵنووســتنان زۆری ماوە، گونجاوترینو باشــترین کاتە بۆ ئەنجامدانو غافڵگیرکردنی هەرکەســێک کە مەبەســتتە، چونکە ئەگەر بشــتبینن دەتوانی خۆت وەک میوانو نەشارەزاو رێبوارێکی رێ لێگۆڕاو بناســێنی، بێئەوەی هیــچ گومانێکت لێبکەن، واتا رێگایەکت لەبەردەمــدا ماوەتەوە بۆ خۆ دەربازکردن لە هەررووداوێکی لەناکاو و نەخوازراو!

ئەوشەوە، یەک لەو شەوانەیە. ئاغا هەر زوو چۆتەوە دیوی ماڵێ، دیوەخان تەنها پاسەوانو چایچییەکەی لــێ ماوە، شەوی درێژی زستانیش بە چیرۆکی مەموزینو خەجو ســیامەندو کەریمو ســتیو ئەمیر ئەرسەلانو رۆستەمی مازەنــدەران نەبێت، کورت نابێتەوەو نابڕێتەوە. لەســەر پێشــنیاری هیدۆی، هەنگاو هەنگاو پلانەکەیان دەبەنە پێش.

هیدۆ بــاش لەوە حاڵی بــووە ئەگــەر وەک میوانی خۆماڵیو ناســیاو و نیازپاک خۆیان نیشــان نەدەن، مەحاڵە بتوانن زەفەر بەو هەموو پاســەوانو تفەنگدارە بەرن، لە کاتێکدا زۆربەیان لە کەســێک زیاتریان کوشتووەو تفەنگ بۆتە بەشێک لە ژیانیانو بۆخۆشیان بوونەتە پارچەیەک لە تفەنگو دەنگێک لە فیشەک!

بەرزەفتکردنو زاڵبوون بەسەر ئەوانەدا، زرنگیو ڕەشادەتی تایبەتیی دەوێ، بۆئەوەی بە جۆرێک غافڵگیریان بکەی، هەرگیز بیریان لــێ نەکردبێتەوەو لە ناوچەکە وەها کارێــک نەکرابێ. لەو گوندە تەنها کاکەڕەشو هیدۆو مەلا ئازاد

نەناســراون، کەســێک نییە بیانناســێ، بۆیە بڕیارە تەنها ئەوان بچنە ژوورێ. هەرچەندە وەک خۆپارێزی هەموویان جەمەدانییان دەمامک داوەو دەموچاوی خۆیان پێچاوە. ئەو ســێ کەسەی لە دەرێ دەمێننەوە ئەرکیان پارێزگاریکردنی ئەوانەیە کــە دەچنە ژوورێو ڕێگا نەدەن کەس لە ئاوایی بچێتە دیوەخان. لەو کاتەی شەودا هیچکەس گومانی ناحەزو پیاوخراپ و دز ناکات بێتە سەری.

لە شەوێکی ئەنگوستەچاو لەنێو خامۆشییەکی ترسناک و چرکەساتێکی هەســتیاردا، بــەرەو دەرگای دیوەخانێ هەنــگاو دەنێن! هەرچەندە ترســێکی نهێنی لە ناخی هەموویاندایە، بــەڵام بەهێزێکی باوەڕبەخۆوە هەنگاوەکانیان، ئەو مەودایــەی بەینی خۆیانو دیوەخانێ هەڵدەوێزنــن، بەجۆرێک لە دەرگای دیوەخانێ نزیک بوونەتەوە بەچاکی گوێیان لە قسەکانیانە.

دەبــێ لە ماوەی جغارەخۆرێکدا هەموو شــت یەکلایی بکەنەوە. ئەو ماوە هەستیارە، چارەنووسی ئەو پاسەوانانەی ژوورێ، دیاری دەکات.

کاکەڕەشو هیــدۆ لە پشــتی دەرگای دیوەخانێ هەڵوێســتەیەکیان کردو هەســتیان ڕاگرت، بۆئــەوەی مەزەندەی ئەوە بکەن چەند کــەس لە ژوورەوەیە. گوێیان لێبوو پاســەوانە پیرەکە کــە بە گای بنەی ناســرابوو، چیرۆکی ئەمیر ئەرســەلانی بۆ پاســەوانە گەنجەکان دەگێڕایەوە، دروســت لەوکاتەی ئەمیر ئەرسەلان ئەژدیهای لەنێو ئەشکەوتێ بە شمشێرەکەی لەتوپەت دەکردو هەموو بەدەنی خوێنی لێدەچۆڕایەوە، هیدۆ هێندە بە کارامەییو ئاســایی خۆماڵیانە دەســتی بۆ شمشــێرەی دەرگاکە بردە ئەودیوی، دەنگی خڕەی شمشێرەو دەنگی هیــدۆی لە یەک کاتدا ئاوێتەی یەکتری بوون، بە دەنگێکی ئاشــنایانەو ئارام وەک یەکێکی ئاوایی کە جێگای هیچ گومانێکی بۆ پاسەوانەکان نەهێشتەوە،

هێندە بە تێڕادیـــوی‌و یەکماڵی گوتی: ماڵێ! ماڵێ! خۆ نەخەوتوون؟ میوانی دەرنگوەخت ڕادەگـــرن؟ ئەوانیش بۆ ئەوەی سیلســـیلەی ئەفکارو گوێگرتنیان نەپچڕێ لە جێگای خۆیان هەڵنەســـتان‌و خۆیان لە گـــورە نەبرد[1]، لە دەوری گای بنەی‌و سۆبەکەی دوور نەکەوتنەوە، لە کاتێک تەماشای زاری گای بنەیان دەکرد، بێئەوەی تەماشای دەرگا بکەن، هەموو پێکەوە وەک شتێک لە یەخەی خۆیانی بکەنەوە، گوتیان فەرموو فەرموو! وەرە ژوورێ!

کاکـــەڕەش‌و هیدۆ بـــە ژوورکەوتن، مـــەلا ئازادیش بـــە دوایانەوە میلی تفەنگیـــان هێنایـــەوەو هاواریان کرد: نەبـــزوون! هەڵتۆقینی ســـێ چەکداری دەمامکدارو تفەنگ لە گۆڵمی دەســـتی، چاوی هەموویانی ئەبڵەق کرد، هەر بەجارەکی زەندەقیان چوو، قیسی هەناسەشـــیان ڕاگرت، بە ترس و سەرسامانە ســـەیریان دەکردن، چاویان باوەڕی نەدەکرد ئاوا بەئاســـانی لـــە گیر بکەون! ئەو ســـێ چەکدارە نەناســـراوە بۆ هەریەکێکیان وێنەی دووژمـــن‌و خوێندارەکانی خۆیان نیشان دەدان، کە هاتبێت هەقی خوێنی کەسوکارە کوژراوەکانیان لـــێ وەربگرنەوە! هەریەکەیان چاوەڕوانی مردنـــی خۆی دەکرد، لە دۆخێکی ڕۆحیی سەختدا هەناسەیان دەداو چرکەساتەکانی کۆتایی خۆیان دەژماردو لە جەنازەی خوێناوی خۆیان دەڕوانی!

بەجۆرێک غافڵگیرکران دەرەتانی ڕاکردن‌و دەســـتکردنەوەیان بۆ نەماوەتەوە، چونکـــە کاکەڕەش‌و هیدۆ کەوتوونەتە بەینی ئەوان و تفەنگەکانیان. هەڵبەتە بە زانایی لەوێ وەستان، دڵنیابوون ئێستا بە زیندوومانەوە، یان مردنیان کەوتۆتە دەســـتی قەدەر! کاکەڕەش پێیگوتن: ئەگەر دەتانەوێ بە زیندوویی بمێننەوە،

---

[1] . خۆیان لە گورە نەبرد: لە شوێنی خۆیان نەبووتن.

کارێــک مەکەن خوێـــن بڕژێ! کە بە هیچ شـێوەیەک ئێمـــە نامانەوێ ئەوە ڕوویدات! ئێســـتا پێمان بڵێن ئاغاو برازاکەی لـــە کوێن؟ هەموویان بۆ ئەوەی باری مەترسییەکە لەسەرخۆیان کەم بکەنەوە، بە یەکەوە گوتیان لە دیویماڵێن، لەگەڵ برازاکەی هەریەکە لە ژووری خۆیانـــن. کاکەڕەش ئاوری ڕقی دەپڕژاند، بـــە هیدۆی گوت: ئەو تفەنگانە کۆ بکەوەو بیدە دەســـتی ئەوانەی لە دەرەوەن و پێیان بڵێ تەقەی نەکەن پاسەوانەکان خۆیان ڕادەست کردووە! هیدۆ ئامێزی لە تفەنگان داو ڕەوانەی دەرێی کردن، ڕەختەو خەریتەی تفەنگەکانی دایەدەستی ئەوانەی دەرێ و بۆ فریودانی پاسەوانەکان دەیگوت ئەو پێش دەرگایەی بەردەن، جێگای هەمووتان نابێتەوە بکشـێنە دواوە! کاکەڕەش گوتی هەمووتان ڕووتان لە دیواری بکەن و نێو چاوانتان بەدیوارییەوە بنووسـێنن! هیدۆو مەلا ئازاد بە پشتێنەکانی پاسەوانەکان دەســتی هەموویانیان لەپشتەوە توند بەستا، تەنها گای بنەی دەســـتی نەبەســـترا، کاکەڕەش گوتی: کارمان پێیەتی. ئینجا پێی گـــوت: نامانەوێ ئێوە بکوژین، تەنها کارمان بە ئاغاو برازاکەیەتی، بە لوولەی تفەنگەکـــەی ئاماژەی بۆ گای بنەی کرد: هەســـتەوە چیت پێدەڵێم ئاوا دەکەی بێ زیادو کەم! گای بنەی لە ســـەریەک دەیگـــوت: بەڵێ بەڵێ ئەمر دەکەی! هەرچـــی ئەتۆ بڵێی وا دەکەم، تەنها مەمکوژن! کاکەڕەش و هیدۆو مەلا ئازاد، چونکە لە تاریکیی دەرێرا هاتبوونە بەر شـــەوقی لۆکســـی دیوەخانێ، چاویان ئازار دەدا. هیدۆ لۆکسەکەی لە پاسەوانەکان نزیک کردەوەو دوو بالیفی گەورەی لەســـەریەک دانا وەک پەنایەک بۆ شـــەوقەکە. مەلا ئازاد بەدیار پاسەوانە دەستبەستراوەکانەوە تفەنگ لە گۆڵمیدا ڕاوەستابوو.

کاکەڕەش و هیـــدۆ گای بنەیان جیا کردەوەو پێیان گـــوت: ئەگەر دەتەوێت

نەکوژرێی چیــت پێدەڵێین وا دەکــەی: ئاغا لە کوێیــە؟ گای بنەی وەڵامی دانــەوە: لە دیوی حەســارێیە، لە ژووری خۆی. ئــەدی برازاکەی؟ ئەویش لە ژووری خۆیەتی لەگەڵ ژنەکەی کە ئەوســاڵ هێناویەتی. کاکەڕەش پێیگوت: باش گوێ بگرە، بچووکترین هەڵە بکەی کارەســاتێکی خوێناوی لێدەکەوێتەوە! گای بنەی: نا نا ئینشاڵڵا قەت هەڵە ناکەم!

کاکەڕەش: ئێستا ئێمە دەبەیتە بەر دەرگای ئاغات.

گای بنەی لێکدا لێکدا دەڵێ: بەڵێ بەڵێ بەڵێ!

کاکــەڕەش: هەندێک لەو بەڵێیانە بگرەوە بــۆ ئاغات! زۆر بە ئارامیو هێدی بانگی ئاغات دەکەی، پێی دەڵێی وەرە دیوەخانێ میوانمان هاتووە، ئەگەر پرســی، نەڵێی چەکدارنو چەند کەســن! گای بنەیان وەپێش خۆیانداو لە دەرگای دووەمی دیوەخانێ کە دەچێتەوە دیوی ماڵێ، چوونە حەســارێ. دوو سەگی لای پشدەرێی هەریەکەی لە ســووچێکی حەسارێ بەسترابوونەوە، ئەو سەگانە بە دانسقە وەک دیاری لە ئاغایانی میراودەلی لە پشدەرێوە بۆ ئاغای هاتبوون. سەگی گورگخنکێن خەریکە زنجیرەکانیان بپسێننو مێخنجیرەکان لە بنڕا هەڵکێشن!

یەکەمجار دەچنە بەردەرگای ژوورەکــەی ئاغای. کاکەڕەشو هیدۆ هەردوو بەری دەرگاکە دەگرنو بە ئاماژە بە گای بنەی دەڵێن بانگی ئاغای بکە! ئەویش وەکو چۆنی پێگوتراوە وا دەکات، بە شێنەییو لەسەرخۆ بانگی ئاغای دەکات: ئاغا ئاغا! ئەگەر تەشــریفت بێی بۆ دیوەخانــێ، میوانمان هاتووەو چاوەڕوانی جەنابتن. ئاغا دەڵێ ئەوا هاتم ئەدی ئەو ســەگانە بــۆ خەریکە زنجیرەکانیان بپســێننو ئەو حەســارەی بەســەرخۆیاندا بڕووخێنن؟![١] گای بنەی گوتی:

---

١. سەگی ڕەسەنی پاسەوانی کە چاوی بە پیاوی تفەنگدار کەوت بە جارێ هاردەبێ.

ئاغام خۆشبێ، ئەوە هەستی میوانەکانیان کردییە لە دیوەخانێ. لەو قسانەدا بوون، هەستیان کرد ئاغا خەریکی لەپێکردنی پێڵاوەکانیەتیو دەیەوێ دەرگای بکاتەوە، هیدۆ گای بنەی کشاندەوە پشتەخۆی، هەرکە ئاغا دەرگای کردەوە، کاکەڕەش لێیگەڕا تا نیوەی جەستەی هاتەدەرێ، بۆئەوەی دەرفەتی گەڕانەوەی نەمێنێت، لوولەی تفەنگەکەی لە سەر سەری ئاغای دانا: ئەو دەمانچەیەی لە پشتت بکەوە! هەرچەند ئاغا گوتی: ئای ئای! ئەوە نامناسن؟ هیدۆ لوولە تفەنگێکی لە خالیگەو بنهەنگڵی دا: چاکت دەناسین، بە خۆت وەکو ئێمە خۆت ناناسی، دەمانەوێ خۆتت پێ بناسێنین کە چ تەرەسێکی خوێنمژی! هیدۆ دەمانچەکەی لێ ئەستاند کە چواردەخۆڕێکی لاکەلی قونکسۆر بوو. هیدۆ گای بنەی بردەوە ژووری لە دیوەخانێ لەگەڵ پاسەوانەکانی دیکەی بەستەوەو دەمانچەکەی دایەدەستی برادەرەکانی دەرێ، بە مەلا ئازادی گوت: هەرچی جووڵەی کرد بیکوژە! گەڕایەوە لای کاکەڕەشی، لەو کاتەی کاکەڕەش بە ئاغای دەگوت: ناتکوژم ئەگەر چیت پێدەڵێم بە قسەم بکەی، بچووکترین هەڵەو سەرپێچی بکەی مێشکت دەپرژێنم، ئێمە کارمان بە برازاکەتە، بەئارامی بانگی بکە و وا هەست نەکات بەزۆر ناچارکراوی! هەر وەک هیدۆ تەڵقینی دابوو، بانگی برازاکەی کرد: کوڕم وەرە بۆ دیوەخانێ میوانمان هاتوون، ئەویش بە دەم چەک لەخۆبەستانەوە هێشتا ئاوەزێنەی قایشی دەمانچەکەی بەتەواوی دانەخستبوو، بەپەلە پێڵاوەکانی بەسەرپێییەوە کردو دەرگای کردەوە، کاکەڕەش لوولەی تفەنگی لەسەر سەری ئەویش دانا، هیدۆ ئاغای کشاندەوە دواوەو کاکەڕەش گوتی: ئەو دەمانچەیەی دانێ ژن تڕباب، ئەگەرنا کوژراوی!

بۆیە، پیاو کاتێک بەنیازە کارێکی مەترسیدار بەدزیەوە ئەنجام بدات، سەگەکە هۆرمۆنێک دەردەدات و بەئاسانی هەستی پێدەکا کە ئەو کەسە نیازی باش نییە.

ویستی خۆی ڕاپسکێنێو چەکەکەی نەداتێ، هەر زوو هیدۆ بە لوولەتفەنگان کووڕی کردەوە! دەمانچەکەی لێستاندو لە پشتی خۆی بەست. برازا وایزانی مامی، بۆ دەسەڵات و ئاغایەتی، کودەتای بەسەرداکردووە، گوتی: مامە ئاوا؟! ئەوەکەی مامو برازایەتییە؟ مامی گوتی کوڕم سەرچیخ مەچوو، ئەمنیش وەک تۆ گیراومو چەککراوم! هەردووکیان بۆ دیوەخانێ بە پێشخۆدان، ئاغا کە بینی شەش پاسەوانی تفەنگدار لێک بەستراونو جەلەکراون، گوتی: ئەوە لێرە چی ڕوویداوەو چی روودەدات؟ باوەڕ بە چاوەکانم ناکەم، وەڵڵا بابە باش، بەڕاستی نۆبەتدارم هەیەو پیاوم ڕاگرتییە! هیدۆ گوتی: «ئەو دۆیە قابیل بەو دۆدانەیە»، بۆ نازانی ئەوانەی دەبنە نۆکەری دەستەونەزەری هەر دیوەخانێک، لەو پاسەوانانەی تۆ پیاو ترنین؟ ئەوانە لە ئەنجامی کارێکی ترسنۆکانەوە ناچار بوون خۆیان باوێنە ئەو گەوادخانەیەی ئێوە! لەدوای چاوشکاندنو تەمبێکردنی ئاغای لەبەرچاوی پاسەوانەکان، بە شەش تفەنگو دوو دەمانچەی چواردەخۆرو قۆڵبەستکردنو ڕفاندنی برازای ئاغای، لە دیوەخانێ هاتنەدەرێ. هەرچەندی ئاغا لەبەریان پاڕایەوە: بخوازن ماڵی دنیایێ بەس برازاکەی نەبەن! بەڵام ئەوان گوتیان ئێمە بەدوای ماڵی دنیاوە نین، بەڵکو بەدوای مافی خەڵکەوەین، ئەوشەو دەبێ ئامۆژگاریی بکەین! ئاخر هەموویان بە دیتنی برازاکەی کە دەموچاو و ڕووخسارێکی شەللاتیانەی بەخۆیەوە گرتبوو، خوێن بەری چاوی گرتبوون: دەبێ هەقی تاوانەکانی خۆی وەربگرێتەوە!

تراکتۆرەکەیان بە برازاکەی هەڵکردو بەرەو زووریو لای پاسکیلەکان سوار بوون. بەرلەوەی بگەنە لای پاسکیلەکان گوتیان ڕایگرە! لە تراکتۆرەکە دایانبەزاند، کەوتنە لێدانی و خوریشۆریان کرد! برازا لەترسان هەڵدەلەرزی،

ســـەروبنی قسەی لـــێ ون ببوو، دەگریا و دەیویست ئەو تاوانانەی کردوونی بە فرمێسکـو پاڕانەوە بشارێتەوە.

کاکەڕەش پێی گوت: نازانی دەســـتبردن بۆ نامووسی خەڵکی بە حیشمەت و بە عیززەت نرخی خۆی هەیە؟ دەبێ ئەوشـــەو ئەو نرخە بدەی! هیدۆ دەســـتی لە خنخنۆکەی نا خەریک بوو بیخنکێنێو فەراقی ڕەشی لێببڕێ! ئەو کەندەیان بۆ کردە تەمبێخانەیەکی وا، نەفرەت لەوڕۆژە بکات کە تێیدا بەوەلەد بووە! کاکەڕەش گوتی: ناتکوژین، دەبێ ســـێ بە ســـێ تەڵاقـــێ بخۆی بۆ مـــاوەی حەوت ڕۆژی دیکە، ئەو پیاوەی لە گوندی لەســـەرجێو ماڵو حاڵی خۆی گوندبەدەرتان کردووە، بیهێننەوە ماڵی خۆی! بە کابراش بڵێی چۆن دەستدرێژیم کردۆتە سەر کچەکەت، ئـــازادی، ئەوە ژنەکەم چـــی لێدەکەی بیکە. ئەگەر ئەوە نەکـــەی، جاری داهاتوو بێینەوە دڵنیابە دەتکوژین! برازا، هەزارجار گوتی بەســـەرچاو! تەڵاقی بۆ خواردن کە ئـــەوەی پێیان گوتووە بە موو جێبەجێیان بـــکات! کاکەڕەش وەک جەنەڕاڵی بـــراوەی مەیدانی جەنگ فەرمانی کرد: لێی گەڕێـــنو جێی بێڵن! لە خوام دەوێ چیم پێی گوتووە جێبەجێی نەکات! بۆ شـــوێنە ونکـــێ ئەنوەرو براو ئامۆزاکەی، تراکتۆرەکەیـــان برد لە بناری قەرەچووغی جێیانهێشـــت. کاکەڕەشو هیدۆو مەلا ئازاد هەریەکە دوو تفەنگیان لە پاشکۆی پاسکیلەکانیان بەستاو، لە زووری هەتا نزیک گوندی سەربەرەژێرەو، پاسکیل، پایدەرلێدانو ماندووبوونی نییە!

کزەبایەکە پەڵەهەورەکانی پەرتەوازە کرد، شەو زۆری نەمابوو. پەڵەهەورەکان وەک مێگەلەمەڕ کاتێک گورگی بەنێو دەکەوێ، هەریەکە خۆی دەربازدەکات. مانگ لەو سەرەوە وەک شوانی ئەســـتێران، حەپەساوەو بەسەرسووڕمانەوە لە گەورەیی و بوێریی ئەو چەند کەسەی ڕامابوو، بەو ژمارە کەمە چ داستانێکیان

خولقاندا! هەموو ئەوانەش لەسەر کەسێک کە نایناسن‌و نەشیانبینیووە!

شـەو ڕاشـکاوەو لە کۆتایی خۆی نزیک بۆتەوە، ئەو هەڵمەی لە کەپووی پاسکیلسـوارەکان دێتەدەرێ و بە سـمێڵیانیانەوە دەنیشێ و هەر دەمودەست دەیبەستێ‌و دەبێت بە چلوورە. گەیشـتنەوە تخوبی ئاقاری گوندەکەی خۆیان، وەلـێ شەویان زۆر بەدەستەوە نەماوە، خەریکە سەو گورگ لێک دەکرێنەوە. هوردەخووسـاریان لەسەرپشتی کەوتووە.هوردەخوسـار، خەریکە زەوی سپی دەکات و، وەک وردەکریسـتاڵ ڕژاوەتە ئـەو ئاقارەی، تابلۆیەکـی بریقەداری نەخشـاندووە. دیارە سرووشـتیش بەتوانـای خۆی دەیەوێ ئەو ڕۆسـتەمانە لـە نیهاندا پەنابـدات، تەمومژێکی چـڕی بە هەموو کۆڵانەکانـی ئاواییدا بڵاوکردۆتەوەو چاو چاوی نابینێ!

پاش ئەو چالاکییە سـەرکەوتووانەیەو حەسـانەوەیان، هەر چاویان دەبڕیە چاوی یەکتری، وزەو هەسـتێکی ئاسـوودەیی بە هەناویاندا دەگەڕا. دەتگوت گڕکانێک لە هەناویانـدا تەقیوەتەوەو دامرکاوە، گیانیان ئـارام ئارام بۆتەوە، بە تایبـەت کاتێک کارەکەیان دەنگی دایەوە. دوای چەند ڕۆژێک، ئەنوەرچووە لای کاکەرەش: برازاکەی ئاغای چۆتـە لای ئەو پیاوەی دەریکردبوو، هێناویەتییەوە گونـدی‌و پێی گوتووە ئەوە ژنەکەم لە تۆڵـەی کچەکەت چی لێدەکەی، ئازادی! پیاوەکە پێی گوتووە: ئەو ژنەت کچی منە، ئەمن وەکو تۆ بێشـەرەف نیم کاری وا نابەجێ بکەم! ئەو کوڕەش کە دڵی بە کچەکەوە بووە، بۆی پەشیمان بۆتەوەو، پێشی سەیربووە کە کەسانێکی وا هەن لەسەر خەڵکی بێدەسەلات بێنە دەنگ!



# ٢٢

ڕۆژ دابووبــە کورتیو ئێوارە کە تاریکی دەکەوت، دڵی مرۆڤ زیاتر تەنگ دەبــوو، چونکە شــەو زۆر درێژ بووبوو. زۆرجار بە هۆی بــاران و هەورو مژەوە، لێمشــتی تاریکی، ڕۆژیشی دەدایە بەرخۆی. سەرماوسۆڵەو شەختەبەند باڵی بەسەر ماڵاندا کێشابوو، ئەو شەوانەی ساماڵ بایە، دارو بەردی لێک دەبەست! چەند ڕۆژێکە هەموو بەیانییان چلوورە بە گوێســوانەی خانووەکانەوە تا ســەر زەوی شــۆڕدەبووەوە. تەم، وەک ڕیشی سپیی پیاوچاکان، خۆی لە سینگی زەوی دەســووی، دەڵێی لێفەیەکی سپییەو خودا بەســەر هەتیوانیدا داوە! مژێکی بێئامان، سەر بە هەموو دۆڵ و زەندۆڵو کۆڵانەکانی نێو گوندیدا دەگرێ، هێندە چڕ مەودای بینینی بەقەدەر گوریســێک کورت کردۆتــەوە، گوند لە مژێکی سپیدا، سپی وەک دڵی خودا... نقوم بووە.

خەڵکی ئاوایی هێشــتا لە خەوێ هەڵنەستاون. تەمەکە بێ دەرگاکوتینو مۆڵــەت وەرگرتن لە خاوەنماڵ، ســەر بە حەســارو ســەربانو حەرەمی هەمو ماڵێکدا دەگرێو بە کۆڵانان وەردەبێت، وەک جەنگی لەگەڵ هەتاو ڕاگەیاندبێت نەهێڵێ گەرمی بگاتە شــەختەو خوســارو چلوورەکان، نەبــادا نەزەرحەرامی بکاتو ئەوانیش لە شــەرمان بتوێنەوە! بەو سبەینێی ساڵحانە هەرکەس سەر

وەدەردەنێ، چاوی هەتەر ناکاتو کەس بەدی ناکات، مەگەر بە خرمەی شکانی شەختەو خوسی ژێر پێیان هەست بە ڕێبوارو ڕەوتەنی بکات!

پیاوەکانی ئاوایی لە دوای نانی قاوەڵتی کە هێشتا دوایین پارووی نێو زاری قووت نەدابوو، کیسەی تووتنی لەبەرپشتێنی دەردەهێناو جغارەیەکی لە تووتنی بۆنداری هەرتەلێ دەپێچایەوە، یەکەم مژی هەڵدەکێشاو دوکەڵەکەی بە با دەکردو لەگەڵ تەمومژەکە ئاوێزانی یەکتری دەبوون.

دەنگی کابانی میهرەبان بە ئاوازێکی نەرمونیان، مانگای دەلاواندەوە و دەدۆشی و بێدەنگی ئەو بەرەبەیانەی دەشکاند. بۆنی دوکەڵی ئاوردووی ئاگردان و نانی گەرم، دەمار دەمار خانەکانی بۆنکردنی تەژی دەکرد لەو حەسارە گەورەی ماڵی حاجی سمایلی. شوان لە هۆڵی مەڕێ خەریکی ڕزگارکردنی مەڕە ئاوسە لەسەرگوانەکان بوونو بەرخەکانیان فرچک دەداو بە دایکیان دەمژێنێ.

لەوەتای سیوادی داوەو سە و گورگ لێک دەکرێتەوە، ئەو منداڵانەی شەوی ڕابردوو لە خەونیاندا لەسەر دیوارێکی بڵند پێشبڕکێی پەلامیزە هەڵدانیان کردووە بۆئەوەی بزانن کامەیان پەلامیزەی لە هەموان زیاتر بردەکاتو دوورتر دەڕوات و دەیباتەوە، کاتێک هەر ئەوەندە دەزانن لەگەڵ ساردبوونەوەی میزەکە خەبەریان دەبێتەوە، ئەو کات تێدەگەن میزیان بەخۆیاندا کردووە! بەناچاری خۆیان لەنێو جێی دەگنخێنن، تەنها سەریان وەدەردەنێنو نایانەوێ بێنە دەرێ، نەکو بکەونە بەر تەشەرو جنێو و هەندێکجار شەقەزللەیەکی مزریش، وەربگرن! هەموو هۆشیان لای ئەوەیە چۆن بتوانن داکو بابیان فریو بدەن ئەو میز لەبن خۆکردنەی بشارنەوە. لەناکاو، دایک بە سەبەتەیەک نانو ئەستوورکی گەرمەوە کە هێشتا هاڵاوی بۆنزادی لێهەڵدەستێ، وەژووردەکەوێو لە منداڵەکەی ڕادەخوڕێ: چاوت

لە من زەقترە، بۆ هەڵناستی؟ یان دیسان زاوی؟! لە چاوانترا دیارە، ئەگەر ئەمن ماڵی خۆم بناسم ئەوشـــەویش کوندەمیزەکت لەبنە خۆت کردییە! هەر بەپەلە ســـەبەتە نانەکەی دادەنێو نووکەپێی لە قەبرغەی دەداو چمکی بەڕەی لە سەر هەڵدەداتـــەوە، هاڵاوی بۆنمیز لە ژوورەکەی پەنـــداوی دەداتەوە!: نەمگوت! بە چاوانترا دیار بوو، چونکە زۆر بەحیزی لێتدەڕوانیم! ئەمن ماڵی خۆم دەناســـم! لەپەدەســـتێکی لـــە ڕوومەتی خۆی دەدا: ئەیەڕۆ نووشـــتووی بابەشـــێخیش هیچ! فڕووجێکیشـــم ســـەرقەڵەمانە دایێ، کەچی چۆڕەمیزێکی نەگێڕایەوە! منداڵەکە هەرچەندی خۆی بە سوێندخواردنەوە ڕەش دەکاتەوە کە گوایە ئێوارێ خوشکەکەی ئاوی بۆهێناوەو جامەئاوەکەی بەسەردا ڕژاندووە، بەڵام ئەو پاساوە ســـواوەو بۆنی تیژی میزەکە هەموو گومانێک دەڕەوێنێتەوە، ئەو کڵاوە ناچێتە سەری داکی، ئەوە ئیشی یەکەمجاری نییە! بابی دەڵێ: توخمەسەگ! جارەکی دیکە درۆیان نەکەی!

پیرەمێـــردەکان بەر لـــە هەموو خەڵکی ئاوایی لە خـــەو ڕادەبنو لە ژوورێ ئۆقرە ناگرن، لە ماڵەکانیان وەدەر دەکەون، بۆ ئەو شوێنەی هەموو ڕۆژێک لێی کۆدەبنـــەوە. ئەوانەی لە هەمووان زووتر دەگەنە جێ، لەگەڵ خرمەی شـــکانی شـــەختە لە ژێر پێی هەریەکیان، بەرلەوەی ببینـــن، دەڵێن ئەوە دەنگی پێی فڵانەکەسییە چونکە شەقاوەکانی گەورەو خێران! هەتاکو دەنگی پێیەکان زیاتر دەبیسترێ، نیشـــانەی نزیکبوونەوەیەتی. تەمومژەکە هێندە خەستە، چاو دوو گوریس ئەولاتر هەتەر ناکات. شـــوێنی دامەکردنەکان وەک نەخشـــەی زەوی بە شەســـتو چوار خانەی چوارگۆشە دابەشـــکراون. بەردی داشەکان ئاونگـو خووسی شـــەوی ڕابردوو تەڕتەڕی کردوون. ئەو شـــەوە بەردەکانی هەردوولا بە

تێکەڵاوی ڕۆژیان کردۆتەوە. دامەچیەکان، هێشتا وەکو لەشکری سەفەوی و عوسمانی بە گژ یەکیاندا نەکردوون!

ڕۆژوبان جاریٚ ماویەتی گەرم بن، تا دامەزانەکان بەرامبەری یەکتری دامەزرێن، بۆیە تاکو ئێستا داشە دوو ڕەنگەکان جاریٚ شەیتان نەکەوتۆتە بەینیان و خوێن لە بەینیاندا نەڕژاوە، لە نێوەڕاستی دامەکە تێکەڵن و سەریان پێکەوەناوە. هەر شازدە بەردەی لە ڕەنگێکە، وەک دوو لەشکری دوو وڵات، وردە وردە بەرەو ڕووی یەکتر دەبنەوە، هێرش بۆ سەر قەڵەمڕەوی یەکتری دەبەن. وەکو سیٚ و دوو ددانی نێو یەک زار، وەکو بەرداش یەکتر دەسوون و دەهاڕن! دامەزانەکان لە کاتی جووڵەپێکردنی داشەکانیان هێندە بە ڕقەوە داشەکان لە عەرزی دەکوتن، هەر شەستو چوار خانەکانی دامەکە قووڵ بوون، بۆ داشەکان بوونەتە سەنگەری بەرگری و هێرشبردن. هەرلایەنەو لە هەوڵی قڕکردنی بەرامبەرەکەی دەدا. سەرکەوتنی خۆی و بە زیندوویی مانەوەی بە گەورەیی، لە قڕکردن و پاکتاوکردنی برا بەردەکانی بەرامبەریدا دەبینیٚ! بە هۆی چڕیی تەمەکە، لە دووروڕا کەس ئەوی دیکە نابینیٚ، بەڵام هەتا دێت خرمەخرمی ژێر پێڵاوی کەسەکان زیاتر دەبیستریٚ و منداڵانیش وەدەردەکەون. پیاوەکان بە منداڵانی ئاواییان دەگوت: ئەگەر دەتانەویٚ ئەو تەمومژە بڕەوێتەوە، کێهەتان نۆبەرەی دایکی خۆتانن، قوونی بەرامبەری تەمومژەکە ڕووت بکات، سیٚ جار لەسەریەک بڵیٚ: «تەمە قوون هات، تەمە قوون هات، تەمە قوون هات!» تەمەکە دەڕەوێتەوە و چاوڕووی مانەوەی نامێنێت و دنیا لەشەرمان و لەترسان ساف دەبێت و لە حەوت کێوان ئاوا دەبێت، هەتاو دیٚ و تەم دەبەزێت!

لەنێو تەمومژەکە و لە جیٚ جۆخینان، قووقەی کەڵەباب دیٚ، دڵنیا بوون

ئەو کەڵەبابە ئی خەڵکی گوندی نییە، چونکە هێشـتا لەبەر سـەرما دەرگای کۆلیتی مریشـکان نەکراونەتەوەو بەرنەدراون، بۆیە دەنگی ئەو کەڵەبابە جێی سەرسـوورمان بوو. تەمەکەش هێندە خەسـت بوو دەرفەتی ئـەوەی نەدەدا تەماشاکەن و بۆیان سـاغ ببێتەوە لە جێ جۆخینان چ خەبەرە!؟ سەگی ئاوایی لە سـەر گوفەکو زبڵدانـەکان ڕووەو جـێ جۆخینان بە کۆمـەڵ دەحەپین، ڕووی حەپینو هەڵمی زاریان بەرەو جێ جۆخینان بوو، هەر بەو ئاڕاسـتەیەش پێکۆڵیان لە گوفەکێ دەکرد! ئەوانە هەمووی ئاماژەبوون بۆ هاتنی کەسانێکی دەرەوەی گونـدی خۆیان. هێندەی نەبرد لە جـێ جۆخینان زەڕەی نێرەکەرێکیش هات، حیلەی ئەسپو بۆڕەی مانگاش، غەڵبەغەڵبی خەڵکانێکیش بیستران. منداڵەکان سـەرنجیان کەوتە سەر هەڵمی زاری سەگەکان کە بە ئەستوورایی زاریان هەڵم دەهاتەدەرێ، بۆیە کەوتنە پێشبڕکێ بۆ ئەوەی لاساییان بکەنەوە و هەڵمی زاریان تاقی بکەنەوە.

ئـەو چەند پیاوەی وەک خووی چوونەتەمەنـەوە زووتر لە خەڵکی لە خەو هەڵدەسـتن و کە لە خەو ڕا بوون وەدەردەکـەون، ڕووەو جیێ جۆخینان خۆیان داوەتە سـەر گۆمکـی گۆپاڵەکانیـانو چاوەڕێن مژەکە بڕەوێتـەوەو بزانن ئەو دەنگەدەنـگو بانگەبانگەی یەکتری، کێنو چ کارەن! دیارە ئەوانیش سـەگیان پێیەو بەرەو گوندی دەحەپنو وەڵامی سەگەکانی ئاوایی دەدەنەوە، بە هەردوولایان کردوویانەتە چەقەلوولانەیەک، هەر مەپرسە!

دوای ئـەوەی مژەکە ڕەوییەوەو هەتاو ڕژایە نێو دەرودەشـت و کۆڵانەکانی گوندی، ئاونگی سـەر لاسکە قەرسیلە ساواو سـەرمابردووە ڕەش داگەڕاوەکان، وەکو کریسـتاڵ دەبریسـکانەوە، دەوروبەر ڕووناک بووەوە، چاویان هەڵەنگوتە

سەر کۆمەڵەخەڵکێک لە ژنو منداڵو پیاو لەسەر جێ خۆخینان، هەریەکەیان بەلایەکداو چەند شۆقاوێک دوور لە یەکتری، بۆ شوێنێکی گۆڕو تەخت دەگەڕێن خێوەتەکانیانی لێ هەڵبدەن. وەک ئەوە وابوو جێ جۆخینان بە شەقاو لەسەر خۆیان دابەش بکەن! یەکێک بە ئاماژەی بانگکردن دەستی لێ ڕاتەکاندن کە گوایە شوێنێکی تەختی دۆزیوەتەوەو جێی هەموویان لەپاڵ یەکتری تێدا دەبێتەوە بارو بنەو خێوەتەکانیانی لێ هەڵبدەن.

بە باربەرەکانیانەوە دەرکەوت لە ڕێگای دوورەوە هاتوون، چونکە بە دەوری یەکتردا دەسووڕان، وەک بیانەوێ هەرچی زووە بارەکانیان بخەن، بۆئەوەی پشوو بدەن. قیسی مانگاشیان بارکردبوو، تاژیو توولە دەستیان بە ڕاوێچکە کردو کەوەکانی نێو قەفەسەکانیان دەیانخوێند. حیلەی ئەسپو زەڕەی نێرەکەرو بۆڕەی مانگاو نووسکەی تاژیو چەقەلوولانێی توولەو سەگو قاسپەی کەوەکانیان تێکەڵی یەکتر بووبوون، لە خۆشی داڕژانی هەتاو بەو نێوەیدا کەوتبوونە هەڵەکەسما. سەمفۆنیایەکی خۆزایی بە گوێی گوێدێراندا دەدات، کوتەی داکوتانی سنگی خێوەتەکانو، گریانی منداڵی نێو تێرەکان کە بەس سەریان دیاربوو، لە سەرما ڕوومەتو لێویان شینو مۆر ببوون و بە گوریس لەسەر پشتی باربەرەکان شەتەک درابوون، منداڵە ساواکان کۆچکیان لەسەر بوو، قژی منداڵە هەراشەکان وا ئاڵۆسکاو و بۆندوکەڵ ببوون، بەس خودا بزانێ چەند مانگە ئاو و سابوون و شانەیان پێنەکەوتووە! ڕوومەتی سەرمابردوو و قەڵیشاویان، کەس نازانێ ڕووی ئەو منداڵانە چ ڕەنگە. مەزەندە دەکرێ ئەو زستانە ئاویان پێنەکەوتبێت. دەموچاوی ڕەژوو فرۆشانەیان توێژاڵێکی ڕەشو چەور داپۆشیون، فرمێسکی چاوو چڵمی کەپوویان چوار ڕێچکەیان دروست

کردبـــوو و لە چەناگەیـــان دەتکایەوە. مـــرۆڤ کاتێک ســـەرنجی لە دیمەنی حاڵو گوزەرانی ئـــەو منداڵانە گیردەبوو، بەزەیی لـــە دەروونداا ئاوری دەکردەوە. ئەوانـــە، دیمەنی هەموو ئەو خەڵکە دەســـتتەنگـو بەلەنگازانەن کە بە دوای پارووەنانێکدا دەگەڕێن.

هەرچـــوار ماڵەدۆمەکە وەک لەشـــکری مەشـــق پێکـــراو، ژنو پیاویان ئیشـــی خۆی دەزانی. هەندێکیان خەریکی خســـتنی بارەکانـــن، منداڵەکان لـــە تێرکەکان دادەبەزێنن‌و بـــە گۆڕێیان وەردەکەن! ئەو بەســـتەزمانانە لاقیان ســـڕبووەو ناتوانن هەنگاو هەڵێنن، لەتاوان و لە ئێشـــی پێیـــان دەگرین و بە دەوری خۆیاندا دەســـووڕێنەوەو گۆد بوونە. قوڵکاورە و شـــوێنی ئاورکردنەوەی سازدەکەن، خێوەتەکان قیت دەکەنەوە، پێستەو ڕیخۆڵەو سیرمەکان هەڵدەخەن، کەس ناچێتە ســـەر کاری ئەوەی دیکە، کاری ئیشی هەریەکەیان لە ژنو پیاو، دیاریکراوە، کەس نیە کارێک نەکات!

کۆترەکانی ئاوایی لە سەر لیسەکانیان لە شەقەی باڵیانداو هەڵفڕین، وەک ڕۆژان، بەرەو جێ جۆخینان ڕەویان بەست، چەندجار شاباڵیان شۆڕکردەوە بۆ شوێنی خۆیان، کە چەنـــد ڕۆژە لێی دادەوەڕێن‌و چینەی لێدەکەن. بەڵام شـــوێنەکەیان گیراوەو ناچار بەرەو ئاسمان باڵدەگرنەوە. لەو کاتەدا کە شوێنەکەیان لـێ گیراوە، ئەوان لەنێو لیسەکانیان لە خەودا بوون، دۆمەکان دەستپێشخەرییان کردبوو.

یەک لە دنیادیتەکان ساتی ئەو دیمەنەی بینی کە ئەو شوێنەی کۆترەکان ڕۆژانە چینەیان لێدەکرد، ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی هەتاو بکەوێ، دۆمەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو، کۆترەکان بێوار ماونەتەوە. ئەو پیاوە پیرە دەیویست شتێک بڵێ، کە ڕۆژگاری جاحێلیی لە دەستبەسەرداگرتنی مەفتەن، بیردەخستەوە. تالاوێک

بوو دەرژایــە گیانییەوە. لەو دیمەنەی کۆترەکان، ژیانــی ڕابردووی ئاوارەبوونی خۆی بەراوردی دەکرد. لەســەرەخۆ جغارەیەکی دیکەی بەدەستە لەرزۆکەکانی لە قۆدیلەکەی دەرهێناو بە جغارەکەی دەســتی کە هێشتا نەکوژابۆوە، ئاگرداو مژێکی قووڵی پڕ حەســرەتی لێدا، لەگەڵ بە باکردنی دوکەڵەکەی گوتی: هیچ دەردێک بەو دەردەی نابێ کە وار و شوێنی ژیانت لــێ داگیربکەن و کەسیش لەســەرت نەیەتە دەنگ! ئەوەی ئەمن باســی دەکــەم زۆر دوور نیە، هەمووم بەچاوی خۆم دیتوون!

پیرەپیاوەکانــی ئاوایی بەدەم تێڕامان لە دۆمەکان قســەکانیان درێژە پێدا. یەکــی دی گوتی: بنیادەم دەیتوانی بێئەوەی خۆی تەنگەتاو بکا، بەئاســانی دڵی لە بوغز و کینە پاک بکاتەوەو مرۆڤبوونی مشــتوماڵ بکاتەوە، شەیتانی لێوەدەرنێ و، خۆی بخاتە باوەشی خوداوە. غوسڵی بەخیلیو خۆخۆری لە خۆی دەربکات، ڕۆحیانەتی پێغەمبەران شــاد بکا و دڵی خودا لە خۆی ڕازی بکات، ژیان پڕبکات لە تەبایی و حورمەت!

پیرەمێردێکی دیکە زوو زوو ســەری دێنایە پێشــێ کەلێنێکی لە قســان دەســتکەوێ: جەواڵە گەنمم بە ئامێزێ بڵندکردووە بۆ سەرپشــتی کەرێ! لە کاتێکدا نیو عەربەگەنم دوو کەس دەستباری لێدەگرنو یەکیش پشتباریان(١) دەدا، ئەوجــا باردەکرێ، ئەوەی ئەو دەیگــوت دوور و نزیک هیچ پەیوەندیی بە قسەی پیرەپیاوەکانەوە نەبوو، ئەوەی ئەو دەیگوت هەر پەلاری لە کەندەلانێک

---

١. پشتبار: دوو کەس بەیەکەوە بارێک یان جەواڵێک گەنم باردەکەن، کەسی سێیەم پشتبارە، کە لەکاتی بارکردنی جەواڵەگەنم یان هەر شتێکی دیکە، دەست بە پشتی بارەکەوە دەگرێ و ئاوای سەر پشتی باربەرەکەی دەکات.

بوو، ڕاســـتو درۆی بە سەر یەکتردا ڕشتبوو، هەر بۆئەوەی بڵێ ئەمنیش هەمو لێرەم! پیرەمێردێکی قسەخۆشو قسە لە ڕوو هەڵیدایە: خوا لە پاشی بارگینیو لە پێشی درۆکانی تۆ بمانپارێزێ!

ژیان لە چاوی ئەو پیرەمێرادنە، سادەو پڕبوو لە نیازپاکی، لە ڕابردوو ئاوایان بەڕێ کردبوو. مرۆڤ حەیران دەما، کە ژیان چ پەرجوویەکە! ئەو هەموو گیانانەی ڕەگیان تەواو لە قووڵیدایە چۆن پێک دەگەنو دەردەدڵ بۆ یەکتری دەکەنو خۆزگە بە ڕابردوو دەخوازنو لەگەڵ ئەو زەمەنە مەلعوونە ناکۆکو ناتەبان!

دەردەڵی یەکـــی دی لە پیرەمێردەکان، بـــەڵاو نەهامەتیی پیری بوو: مردن هیچ نیە، تاوێکە دێت و دەڕوا و دەبڕێتەوە، بەڵام ترسی گەورە پیرییە، نابڕێتەوە! لێتان ناشـــارمەوە ئەمن نامەوێ تەسلیمی پیری بم! ترسی پیری قەراری لـــێ هەڵگرتـــووم. پیاو ئەگەر پیر بوو، لەکن هەمـــوان ڕەزای قورس دەبێ، لەکن ژن و عەولادی، لەکـــن خەڵکی، مردنێکی درێژە و نابڕێتەوە! لە مەجریســـان، لە قەڵەباڵغیان ئەو حسێبەی جارانت بۆ ناکەن، سووک دەبی سووک! عەزابێکی قورسە هەر بۆخۆت هەســـتی پێدەکەی! هەموو هەناسێکی، مردنێ خۆت لە خوای داوا دەکەی! گەلێک جـــاران، بێئەوەی ئەتۆ هیچ پێت خۆش بێ لەباتی تۆ بڕیارت بـــۆ دەدەن! جا ئەو بەڵایە، ئەوکاتی دەســـت پێدەکات، کاتێک ژنی نارەسەن کە منداڵەکانی هەراش بوونو بوون بە پیاو، کلکیان لەگەڵ گرێ دەداو دژایەتیە مێردەکەی دەکات و دەیداتە بەرجۆتان و لووشکەکوژی دەکات! ئای، هیچ لەوەی ناخۆشتر نییە کاتێک بەشەر ئەوسەری ژیانی خۆی لـێ دیارنییەو نازانێ هەتا کوێ بردەکات!

بە زاهیر نەدەگریا، بەڵام لە ناخەوە دەبرژا!: براینە کێ حیســـابی ئەوەت بۆ

دەکات بــە گەنجی کاوڕەنێرت بە سەرشــانداداوە؟ ڕاوی نێریەکێویت کردووە؟ بەرازت وەسەریەک گێڕاوە؟ لەنێو دەســترێژی گوللەو ئاگربارانداا بە مووجیزە دەرچووی؟! ئێستا ئەوەی لێی پەشــیمانم ئەوەیە کە بە جاحێڵی، شەرم لغاوی کردووم و بەدڵی خۆمم نەکردووە!

پیرەمێردێکی دیکەش کە لە نیوەی قسەکان پێراگەیشتبوو، ئەویش پرتەو بۆڵەی بوو لەدەســت پیری و ئــاخ و ئاواتی بوو بۆ ســەردەمی جوانی: ئەرێ ئەنگۆش وەک منتان لێهاتووە؟ وەختایەکی گەنج بووم هەموو شــوێنێکم پێ لە ماڵی خۆ، خۆشــتربوو، کەم وابوو بە ماڵێ بکەومەوە، کەچی ئێستا، بچمە ماڵی شاو مەلیکیش، ئۆقرە ناگرمو هێلانەی خۆم پێ لە بەهەشتێش خۆشترە، لە جێو بالینگانی خۆم نەبێ خەوم لێناکەوێو ناحەسێمەوە! لەگەڵ ئەو قسانە، دەسترەکەی بەرپشتێنی دەرهێنا دەمو لەوسی خۆی پێ سرییەوە.

تەمومژەکــە ڕەویەوە، بوو بە ڕۆژێکی خۆش. تیشــکی خۆر ڕژایە ســەر دەرودەشــت و ئاوەدانی و بوونەوەرەکانی، پیرەپیاوەکان هێشتا هەر لەو گلەیی و گازاندانەدا بوون، چاوە کەنەفتەکانیان کەوتە ســەر بارگەو بنەی ماڵەدۆمەکان کە خەریکی قیتکردنەوەی خێوەتەکانیان بــوون. هەر زوو خێوەتەکانیان قیت کــردەوە، چوار خێوەت بوون، ئەوەش نیشــانەی ئەوەبوو کــە چوار ماڵەدۆمن، بوونەتە میوانی گوندی. دۆمەکان بەر لە هەرشت ئاورێکیان کردەوە، ستوونێکی شینی دوکەڵ بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا، ئەوەش ئاگادارکردنەوەی خەڵکی گوندی بــوو، مانای ئەوەی ئێمە لێرەیــنو بارو بنەمان هێناوەتــە گوندەکەتان، ئەگەر هەرکەسێک کاڵای دەستکردی دۆمانی دەوێ، بچێت لێیان بکڕێ.

خێوەتــی نێوەندێ، ماڵی کوێخــا نامیقەدۆمیان دەگۆتــێ، کە کوێخایان

بوو. ئەو، بەتەنیا کوێخای ئەو سێ ماڵەدۆمە نەبوو، کوێخای چەند ماڵێکی دیکەش بوو کە بە گوندەکانی ئەو نێوەدا بڵاوەیان کردبوو. لەو کاتەی گەرما دادەهات‌و دەچوونەوە گوندەکانی خۆرهەڵاتی کوردستان، کوێخا نامیق هەواری دەبردە نەڵاسێ‌و لای ڕەبەتێ[1]، ماڵەکانی دیکەش دەوریان دەدا. ئێستا کاتی کەسابەتیانە، بۆیە هەر سێ ماڵ سێ ماڵ بەسەر گوندەکانی ناوچەکەدا دابەش بوون، بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان، بڵاوەیان کردووە. ئاخر ئەوان پێ بە پێی لەگەڵ وەرزەکان شوێنی کەسابەتیان دەگوازنەوە، لە بەهارو گەرمای هاوین بەرەو ناوچە کوێستانیەکان و، لە وەرزی زستان لە گوندەکانی گەرمەسێر بەسەردەبەن. ئەوان نەیاندەگوت عێراق‌و ئێران، قەت بەشەکانی کوردستانیان لە یەکتر دانەدەبڕی‌و سنووریان نەدەناسی، هەمیشە دەیانگوت: گوندەکانی دیوی کوێستانێ یان گوندەکانی دیوی گەرمێنێ!

قەڵەمڕەوی کەسابەت‌و گەڕیدەیی دۆمەکان هەردوو دیوی دەگرتەوە. بە دیوی کوێستانێدا لە قەسری شیرین‌و ئیلام‌و کرماشان‌و سنەو موکریان‌و خوو و سەڵماس‌و ورمێ‌و هەوشار دەڕۆن، لە گەرمێنیش خانەقین‌و گەرمەسێرو گوڵاڵەو حەویجەو دەشتی قەراج‌و پێدەشتەکانی موسڵ‌و بناری چیای مەقلوب‌و شەنگال‌و زاخۆیان دەبڕی. بەڵام، بە هۆی نەژداپەرستی‌و دوژمنایەتیی کوردان لەلایەن ڕژێمەکانی تورکیاو قڕکردنی کوردان، ڕووناکەنە دیاربەکرو شرناخ، ئاخر دۆمەکان بەشێکن لە پێکهاتەکانی گەلی کورد. بەرەو بەشی خۆرئاوای کوردستانیش ناچن، چونکە بە زەحمەت دەتوانن لە ئاوی خابوور بپەڕنەوە، کەم وایە خۆی لێبدەن.

---

١. نەڵاس و ڕەبەت: دوو گوندن سەر بە شارستانی سەردەشت لە کوردستانی خۆرهەڵات.

دۆمــەکان کارو پیشــەیان دروســتکردنی هێڵەگـو ســەرەندو بێژینگـو ســیرمەپێچ کردنی شەنەی دارو تەشیو تیرۆگـو فەرشەو شانەو قەندشکێنو خولخولەو، چەندین کەرەستەی دیکەیان دروست دەکرد.

وەک ئامادەکارییەک بۆ پێشــوازیی ئەو پیــاوە بەتەمەنانەی ئاوایی کە دەچوونە بەخێرهێنانی کوێخا نامیقو خزمەکانی، ئاگردانیان لەنێو خێوەتەکان هەڵکەندو کوچاگریان وەک سێکوچکە لە دەورووی ئاگردان و کتریو قاوەجاغیان لەبەر دانان، فنجانی قاوەیان لە تێرە نەخشینەکانیان دەرهێنا.

کوێخا نامیق پیاوێکی قوڵەخڕەی چوارشانەی تێکسمڕاوە، لە شەستەکانی تەمەنیدایە، کورتەکـو شەرواڵێکی ڕەشی خەتداری مرادخانی لەبەردایە. بە جلوبەرگیەوە دیارە پلەی کۆمەڵایەتیی لەوانەی دەوروبەری باڵاترەو کەیخودای خزمەکانیەتیو پرسو ڕایان لە دەســتی ئەودایەو قســەی کاربڕو کۆتایی ئەو دەیکات. بە کێشــەکانیان ڕادەگات. ئەو بە دەســتی خۆی کارو کاسبی ناکات، تەنها بەسەریاندا ڕادەگا.

کوێخــا، هەورییەکــی ڕەشــی بە ڕیشــووی لە ســەرییە، ڕیشــووەکانی بەلاجانگیدا شــۆڕ بوونەتەوە، پازدە مەتر کەڕنەکی سپی گوڵسووری لە پشتی بەســتاوەو لە خۆی ئاڵانــدووە، هێندەی دیکە کوێخــای قەبەکردییە، زۆربەی پەنجەکانی ئەنگوســتیلەی گــەورەو نقێمداریان تێدایە. پشــتێنە گەڕگەڕو قەبەکــەی، دارجغارەو قەننەو مۆدنەو کیســەتووتنی بۆنداری لەبەرڕاکردووە. لای ڕاستی ئەستێوبەردەســتێو دەســترێکی دامەی نیوەکێشی بۆ سڕینو پاککردنەوەی دەمولەوســی لەبەرپشــتێنیە. هەموودەم ئاوێنەیەکی دووڕوو و مووکێشــێکی لە ســەر باڕکی کورتەکەکەیەتی. خەنجەرێکی سالح بەگی

پشـــکەزیوی لەبەرپشـــتێنەکەی ڕاکـــردووە، هێنـــدە تیژە زرێـــی هەڵدەگرێ! تەســـبیحێکی کارەبایی دەنک درشـــتی لە دەســـکی خەنجەرەکەی ئاڵاندووەو گورینگەکانی بە قەدەر کەشـــکێکی دەبن! خەنجەرەکەی کوێخای، بە قسەی خۆی دەڵێ دەبانە، هێندێک دەڵێن کرمانـــە، هێندێکیش دەڵێن نە دەبانەو نە کرمائیشە، تەنها شینەتیغە[1] و دروستکراوی زنجانە، ئەوەش، بۆ تووڕەکردنی کوێخایە بەتایبەتی ئەوانەی دەڵێن شـــینەتیغە، ئەو زۆر بەو قسەیە قەڵسو تووڕە دەبێت، بە جۆرێک خەنجەری لێبدەی دڵۆپەخوێنێکی لێنایە! لە وەڵامدا دەیگوت: ئەگەر خەنجەرەکەم دەبان نەبێت، چما ئەمن شێتم بەرخەنجەری[2] بۆ هەڵگرمو بیپارێزم؟ هەزار ســـوێندی دەخوارد: ئـــەو خەنجەرەی من هێندە ئەفســـووناوییە چـــاوی بە خوێنی بکـــەوێ، زەلامی بۆ بەردەمـــی تیژی خۆی ڕادەکێشـــێ! کوێخا نامیق لە لای سەرەوەی مەجلیسێ لەسەر تیکەفەرشێکی کاشـــان دانیشـــتووە، بالیفێکی گەورەی لە پاش پشتێی، هێندەی دیکە ورگـو پشـــتێنو خەنجەرەکەی بۆ پێشـــەوە دەرپەڕاندووە، کەوڵەورچێکی گەورەی بە ستوونی خێوەتەکەیەوە هەڵواسیوە، هەرکەســـێک بچێتە سەردانی، چیرۆکی کوشـــتنی ئەو ورچەی بۆ دەگێڕێتەوە. یەک لە نیشـــانەکانی دەســـتپێکردنی چۆنیەتیی ئەو داســـتانە ئەوەبوو هەورییە ڕیشـــووەدارەکەی لە ســـەری خۆی دەسووڕاندو ســـەری خۆی پێ دەخوراندو دەیگوت: ئەو کەوڵەورچەی دەبینن؟ لە کێوی دەماوەند هێرشـــی بۆ هێنـــام. ئەوانەی بەحیســـاب ئەمن میوانیان

---

١. شینەتیغ: چەقۆیەکی ئاسایی.

٢. بەرخەنجەر: قەڵەمبڕ یان چەقۆیەکی بچووکە، لەگەڵ خەنجەر هەڵدەگیرێ، بۆ بەکارهێنانی لە هێندێک کاردا لەجیاتی خەنجەرەکە.

بوومو بردبوومیان بۆ ڕاووشـــکارێ، هەموویان هەڵاتن. ورچەکە یەکسەر چاوی دابووە مـن. بەرلەوەی بمگاتێ، هەوریو پەستەکم لە دەستی چەپم پێچاو هەتا ئانیشـــکم، ڕەوانەی نێو قورگی ورچەکە کرد، بە دەســـتی ڕاستیش خەنجەری ڕووت بەدەســـتەوە، دایگژامیو دامە بەرخەنجەران. هەرچەند خەنجەرم لەنێو برینی ئەو مەلعونەی دەلەقاند، جار لەگەڵ جارێ شلتر دەبوو. ئیدی بەسەریدا زاڵ بوومو فەراقی ڕەشم لێبڕیو کوشتم.

هەرکاتێک کوێخا نامیق هەورییە ڕەشـــەکەی لەســـەری خۆی بســـوویبا، ئەوا دەیانزانی داســـتانی ورچەکە دەگێڕێتەوە. وای لێهاتبوو دۆمەکان گەورەو بچووک ژنو پیاو هێندەیان گوێ لەو داستانەی بووبوو، ڕستە بە ڕستەو وشە بە وشـــەیان لەبەرکردبوو، بەجۆرێک، فاتیحایان وا لەبەرنەبوو! تاقە یەک وشەیان لێنەدەپەڕاند، شانازییان پێوەی دەکرد کە خاوەنی کوێخایەکی ئاوا ورچخنکێنن!

کوێخـــا نامیق، ســـمێڵی جیاواز لە ســـمێڵی ئۆمەتـــی محەممەدی، بە جۆرێک هەڵپاچو داپاچ کردووە، هاوشـــێوەی زۆر کەمەو لەوانەیە هەر نیشـــە! لە بەینـــی هـــەردوو کونەلووتی بۆ خوارێ، بارســـتایی ئاوەڕۆیەک ســـمێڵی کردووە بە دوو بەشـــەوە. کوێخا بە مووکێش جۆماڵی ئـــەو ئاوەڕۆیەی کردووە. بە دەســـتکەنەکردنی مووەکان، ڕێگایەکی تاوەکو ســـەر لێوی سەرەوەی پاک کردۆتەوە. هەردوو بەشەکەی ســـمێڵی بە تخووبێک لێک جیاکردۆتەوە، وەک ئـــەوەی هەر بەشـــەی موڵکی یەکێک بێت! لە هەرســـێک لایەکەی دیکەش کەنەی لێکردبوو، لە ســـەرڕاو لەبەرڕا دابوویەوەو ســـەرکۆڵو بنکۆڵی کردبوو، لە کلکەشڕا خشـــت بڕیبووی، بەجۆرێک، هەردوو بەشەکەی وەکو دوو خانەی چوارگۆشـــە لە ئاقاری ســـمێڵی ماوەتەوە. سەرتان نەیەشـــێنم، دروست وەک

نەخشەی بناغەی دوو ژوورو هەیوانێکی دەرهێنابێ! ئەو کەرەستەو ئامێرانەی لەبەرپشتێنی کوێخای بوون، هێندەی کەلوپەلی سندووقی عەتارێک دەبوو!

ئەگەر تای ماشەری ژیانی دۆمەکان هەڵبوێرێنی، دەبینی ئەوان زۆر جیاوازن لەو خەڵکەی دانیشتووی گوندو خانوونشینن. خەڵکی گوند، دۆنمێک زەویيان لە مرۆڤ لەلا بەبەهاترەو ئامادەن لەسەر لاتەزەوییەک ئاسەوارو ڕەچەڵەکی یەکتری ببڕنەوە، برای لە داکو بابی خۆیان ساردبکەنەوە! بە پێچەوانەوە دۆمەکان، ئەوەی هەیانە و نیانە ئەوەیە کە ڕۆژانە پەیدای دەکەن و، بەرلەوەی بۆگەن بێت دەیخۆن. ئەوان نایەن لە حەوت کون تەقەتی بکەنو بیشارنەوە! لە هەریەکێکیان بپرسی، خێوەتەکەی خۆی بە کۆشکو تەلاری شاهەنشاهی ناگۆڕێتەوە! ژیان لە دیدی ئەوان زۆر سادەو ساکاربوو، پێیان وابوو بەختەوەری مەرج نییە لە کۆشکو تەلارو شاری گەورەو جوان بەدەست بێت! ئەمڕۆ زگی خۆیانو منداڵەکانیان تێرکرد، زۆر بیر لە سبەینێ ناکەنەوەو ئیسراحەتی خۆیانی بۆ ناشێوێنن. خواردنەوەی چایەکی دیشلەمەی ژێر خێوەتەکەیان بە قاوەجاغی هیچ ئاغایەکی ناگۆڕنەوە! خولاسە، چەندی بڵێی لە ژیانی خۆیان ڕازینو شوکرانەبژێری قەدەری خۆیانن.

کاتێک خەڵکی گوندی لە ژیانو گوزەرانی دەروێشانەی دۆمەکانیان دەڕوانیو لێی ورد دەبوونەوەو سەرنجیان دەدانێ، هەستیان دەکرد کە بەختەوەری، شتێکی چەندە ئاسانو سادەو کەمسەرمایەیە، بە بابۆڵەپەنیرێکو دوو چا و ئاگردانێک بەدەستدێت! خۆشییەکانیان زۆر گەورەن، چونکە پایەکانی زۆر سادەن و، لە چەند شتێکی وەک نانو ئاو و پۆشاکو هەوایەکی پاکدا دەستدەکەوێ!

شەوان ئەو سەنتوورو پیکو دووزەلەو زووڕناو دەفو تەپڵانەیان کە

بە ستوونی خێوەتەکانیان هەڵواسرابوون، دەهێناخواریێ، ئاهەنگی هێندە بەجۆش‌وخرۆشیان دەژەنی، تۆبەکاری وە سەما و سۆفی دەهێنایە حاڵ، ئەو ئاوازانەی لە دەمی زوورناو پیکو دووزەلەکان هەڵدەوەرین، ڕاستو ڕەوان بە گوێگری دەگوت: ژیان پێنجو دوو ڕۆژێکەو بۆ خەم نابێ! مرۆڤ بەجۆرێک ئەفسوونگیری ئاهەنگە سیحراوییەکانیان دەبوو، لەوەی حاڵی دەبووی کە ژیان ئەو چرکەساتەیە کە خۆشییت لێدەگوزەرێ! تاوەکو خەو بەلاوەی دەبردنو شل‌وکول دەبوون، وەک کەوی غوورەی، بەرامبەری یەکتری گۆرانیو بەندیان داوێشتە یەکتری.

دوانیوەڕۆیەکی هەتاوە، تینی خۆر زەوی شل دەکاتەوە، عەرز هەڵمی لێهەڵدەستێ و، خۆی بۆ باوەشی ئاسمانێکی ڕەنگ مسی دەکوتێت. ماڵە دۆمەکان خۆیان دامەزراندووەو خەریکی ئیشوکاری خۆیانن. خەڵکی ئاوایی، بە تایبەتی پیاوەکان دەستە دەستە دەچوونە تەماشایان. هەرخێوەتەی، چەند کەسێکی خەڵکی گوندی بەکۆمەڵ لە دەوری وەستاکان کۆبوونەتەوەو بەرامبەریان هەڵتووتاونو چاویان بڕیوەتە دەستیان کە چۆن سیرمە خۆش دەکاتو پێستە هەڵدێنێو ڕیخۆڵەکان، بۆ سەرەندو بێژینگ زیواڵ زیواڵ دەکات، خولخولە ڕەنگ دەکا، شانە دروست دەکاتو کەوانەی داری بێژینگو سەرەند دەچەمێنێتەوە.

وەستا بایز یەک لەو دۆمانە بوو، پیاوێکی ڕەشنەسمەری کوڵکن، مووی سینگی لە یەخەی کراسەکەی سەریان وەدەرنابوو، قیسی سەر کولمەکانی تاوەکو بەری چاوی هەمووی مووە، بەهۆی چەمی غوردی موو کونی گوێی دیارنەبوو، هەر بەو هۆیەوە بوو دۆمەکان پێیان دەگوت بایز گوێ کوڵکن.

گوێیە کوڵکنەکانی سەرنجی خەڵکییان بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، وەک هێڵەک ئەو هەموو قەڵاپووشــکە ســووتاوانەی ئاگردانی لەخۆی لوول دابوو! ژنەکان پێســتەیان هەڵدەخســتو ڕیخۆڵەکانیان پاک دەکردەوە. پیاوەکان، یەک لکی شەنەی داری سیرمەپێچ دەکرد، ئەوی دیکە داوی بێژینگی ڕادەچنی. ژنەکان زۆر هــاوکاری پیاوەکانن، ئــەو بەرهەمو کاڵایانەی پیاوەکان دروســتیان دەکرد، ژنەکان لە ناو تێلەگەیەک لەسەرشــانی خۆیانیان دادەناو بۆ ســاغکردنەوەیان لە دەرگای هەموو ماڵەکانی ئاواییان دەدا. ســەوداو کڕینو فرۆشتنیان بە پارەو بە شــت گۆڕینەوەش دەکرد، لەبری هەرکاڵایەک شەکرو ڕۆنو ساوەرو برویشو داندۆک و کەشــکیان وەردەگرت. قیسی شووشە، نەوتیشیان بۆ فانۆسەکانیان لەگەڵ خۆیان دەهێنایەوە.

ژنەکەی بایز گوێ بە کوڵکی، ژنێکی ڕەشی قەڵەوی دامەزراو بوو، دیاربوو بەرلەوەی بێنە ئەو گوندە لەگەڵ بایز گوێ بەکوڵکی مێردی شــەڕیان کردبوو و هێشــتا ئاشــت نەبووبوونەوە، مۆڕەیان لە یەکتری دەکردو دەنگیان لە یەکتری ڕاگرتبــوو. ژنەکە مانی گرتبوو ئــەوڕۆژە وەک ژنەدۆمەکانی دیکە نەچووبوو دەســتکردەکانی بایزی مێردی، لە گوندی ساغ بکاتەوەو نانێکیان بۆ بێنێتەوە، ئاخر زیزبوونی ژن لەنێو دۆمەکان یانی هیشــکبوونی سەرچاوەی بژێوی! گوێ بــە کوڵک و ژنەکەی، بە دارێک خێوەتەکەیــان کردبوو بە دوو بەش، هیچیان نەدەچوونە قەڵەمڕەوی یەکتریو تخوبەکەیان نەدەبەزاند. ئەگەر شــتێکیان لە بەری ئەوبەری ویســتبایە منداڵەکەیان ڕادەســپاردو، بۆی دێنان. بایز گوێ بە کوڵک، لە بەری لای خۆی خەریکی ئیشی خۆی بوو، ژنەکەیشی لە بەری خۆی، حاکمی موتڵەق بوو!

غەزرینی ژنەو نەچوونە نێو گوندی بۆ کۆکردنەوەی خواردنو پێداویستیی ڕۆژانە ڕەگی حەیاتی بایز گوێ بەکوڵکی وشک کردبوو. بایز بەڕقەوە چەکوچی لە کـــوارەی بێژینگەکە دەکوتـــیو چەند جنێوێکی مـــزری دەدا، وەک بڵێ «بووکێ لەگەڵ تۆمە، خەسوو گوێت لێبێ!».

بایز دەیزانی ئاوا بڕوا بەبرســێتی دەمێننەوەو نەوتیشــیان نییە لە فانۆسی بکەن، شــەوێ دەبــێ بەتاریکی دابنیشــن، بۆیە دەیزانی کلکی لە دەســتی ژنەکەیەتـــی! ژنەش، بـــۆ خۆخافڵاندنو زیاتر ئازاردانی بایـــز گوێ بەکوڵکیو بۆئــەوەی ناچاری بکات ڕادەســتی ئیــرادەی بێت، خۆی دابـــووە بەرهەتاوێو مێش میوانی نەبوو! خەریک بوو ســەری منداڵەکەی لە ڕشــکو ئەســپێی دەدۆزی. زۆر وشکو مۆن بوو، نێوچاوانی دوو ئەنگوستی لــێ مابۆوە! کاتێک ئەسپێی دەدۆزییەوە دەیخستە بەینی هەردوو نینۆکی پەنجەگەورەیو بەڕقەوە دەیپلیقاندەوە، دەتگوت بایزی کەوتۆتە بەرچەنگانی، دەیگوت: دەک بەنەفرەت بی! بە برای خۆمت دەگێم! بە ڕواڵەت لەگەڵ ئەســپێکەی بوو، بەڵام لە دڵدا لەگەڵ بایز گوێ بەکوڵکی بوو. بایزیش، خەریکی دروستکردنی شانەیەک بوو، ئەویش لە بەرامبەردا هەتا هێزی تێدابوو چەکوچی لە ســندانەکەی دەکوتاو بە شـــانەکەی دەگوت: عەمری ئەو ددانە خوارو خێچانەت نەمێنێ! بەخوای دوو فلوســـی سووتاو ناهێنی! ئەتۆ کەی شـــانەی؟ بە فەخری عالەم ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بێت دەبێ بتگۆڕم! لەڕقان فڕێیدایە نێو ئاگردانیو سووتاندی!

ژنەکـــەی بایزی، هیچ دەســـتی بەخۆیـــدا نەدەهێنا، نە قژی شـــانە دەکرد، نـــە لەبەرئاوێنە تیف تیفەی بســـکی خۆی دەدا، بەو ڕادەیـــەی بێئاگا بوو لە ڕووخساری، کە ئێوارەی شـــەوی ڕابردوو شووشە فانۆسەکەی لە دوکەڵو تەنی

پاک کردبۆوە، زاری خستبووە نێو شووشە فانۆسەکە بۆئەوەی هەڵمی زاری خۆی تێبکاتو پاکی بکاتەوەو ڕەشایەتییەکەی لێبکاتەوە، فانۆسەکە شۆقی زیاتر بێ، بێئاگا لەوەی هەرچوار دەوری زاری هێڵێکی بازنەیی ڕەشی دروست کردبوو، وەک ئەوە وابوو لاسایی ڕیشی ساکسووکەکانی کردبێتەوە.

تاقمێک لە جاحێڵ و بەتەمەنەکانی ئاوایی بە لۆژەلۆژ بۆ لای جێ جۆخینان شۆڕبوونەوە، بۆئەوەی سەردانو بەخێرهاتنی دۆمەکان بکەنو تەماشای سەنعەتەیان بکەن. بەتەمەنەکان چوونە لای کوێخا نامیقو گەنجەکانیش بوونە چەند بەشێکو هەر هێندێکیان چوونە لای خێوەتو وەستایەک. بازێک لەوان سەریان بە خێوەتەکەی بایز گوێ بەکوڵکیدا گرت. بێئاگا لەوەی گوێ بە کوڵک لە چ بارودۆخێکی دەروونیدایە، سەبارەت بە غەزرینی ژنەکەی، هەر خودا دەزانێ چەند وەڕسو جاڕسە بەدەستییەوە! هەندێک لە گەنجەکان بەزمانی جەستە ئاماژەیان بۆ یەکتری دەکرد: تەماشای چەناگەو ساکسووکی ژنەکە بکەن! هەریەکەیان بەچپە تەشەریان لە ژنەکە دەداو بە قسەکانی پێدەکەنین. ئەو هەڵسوکەوتەی گەنجەکان، هێندەی دی وەستا بایزی دەهری دەکرد. لە داخان هەناسەی بە لووتی دەدایەوە دەرەوەو هەر مشەی بوو. لە گەڵ مشاندندا، بای هەناسەی کە بەئەستوورایی کونەلووتی دەهاتە دەرێ، سمێڵە قیتەکەی دەبزاوتن. دەیمشاندو دەستی بە سمێڵیدا دەهێناو بۆ لای گوێیەکانی دەبردەوەو بای دەداو قورمیشی دەکردو، کلکی سمێڵیی قیتتر دەکردەوە، بەجۆرێک وەک دووپشک ئامادەی پێوەدان بێت. ئەوانە هەمووی ئاماژەبوون بۆ تووڕەبوونێکی لە ڕادەبەدەر! دەیویست پێیان بڵێ خوێن بەری چاوی گرتووەو داویەتییە کەللەم کەتنێک بکەم!

بەهــۆی ئەوەی بەینی لەگەڵ ژنەکەی نەبــوو، هەرچەند دەیکرد نەیدەزانی چۆنی حاڵی بــکات لەبەرچاوی ئەو گەنجانە وەلابچێو گــوڕی گوم بکات! لە حەیفان پەنجەت لێبدایە دەتەقیو دوور نەبوو شەیتان زەفەری پێببات. ناچار، بە منداڵەکەی گوت، وەک دیلمانجی بەینی باوکـو دایکی، کە بە دایکی بڵێ لەو شوێنەی هەستێو لابچێ! ژنەکە هەستاو خۆی خەریکی هەندێک ئیشی لاوەکی کرد کە لەوکاتەدا پێویست نەبوون، کاری گرنگتر هەبوو بیانکات، بەڵام ئەو مانی گرتبوو و نەیدەکردن. ئەو جارەیان زۆر خراپتر لە پێشــوو، وەستا بایز گــوێ بە کوڵک وای مەزەنــدە دەکرد، ئەو گەنجانە بە چــاوی حەرامزادەییەوە لەگەڵ و ســمتی ژنەکەی دەڕوانــن وا بە چاوی مانگاکڕیــن دیقەتی دەدەنێ! وەســتا بایز، ئەمجارەیان هەر بەجارەکێ ئاگری گرت! بە هیچ شێوەیەک هۆشو زەینی لە کارەکەی نەما، تاوەکو چەکوچێکی لە داری کەوارەی سەرەندەکە دەدا، دوو چەکوچی لە دەســتی خۆی دەدا! ئەوانەش هەڵچوونی دەروونیی بە گوڕتر دەکردن. ئاخر ڕاســتە دۆمەکان گەڕیدەن، بەڵام زۆر بەناموســنو بێرەوشــتی قەبووڵ ناکەنو موویان نەرم نییە! بە زمانی جەســتە لە قورمیشکردنی سمێڵ و ســوورهەڵگەڕانی ڕووخســارو پیشــخواردنەوەی، هەوڵــی دەدا گەنجەکان تێبگەیەنێ بەو هەڵســوکەوتو حریتکەحریتــکو پێکەنینە بێ هۆکارەیان نارەحەتەو لەوە زیاتر بەرگە ناگرێ، بەڵام بێسوود بوو، ئەوان لە سیکـو سەودای خۆیــان نەدەکەوتن. ئــەوەی بایزی لە دین دەردەکــرد، دیمەنی پێکەنینی ئەو گەنجە زارگــەورەو ددانگرە بوو کــە پێدەکەنیو ڕوومەتی دەچــووە بناگوێی، دووجار ویســتی بە یەک چەکوچ ددانەکانی خورد بکاتەوە، دوایی شــەیتانی

بە لەعنەت دەکرد. لەناکاو ئەو نێرەکەرە حەساوییەی[1] لە سنگی خێوەتێ بەسترابۆوە، هەتا دەنگی تێدابوو زەڕینێک زەڕی، لە تەواوی گوندی دەنگی دایەوەو لە کەندەرانی سۆر، دەنگی دەداوە!

لەوکاتەی لەنێو زەڕینەکە پشووی دەخواردەوە، سیکەیەکی لێوە دەهات، وەک فیتووی لێبدات. لەگەڵ تاقەتدانەخۆو بەرزونزم بوونەوەی زگیو بەردەوامیدان بە زەڕینەکە، ڕیزەترێکی تەڕی لێبەردەبوو، چەند نێرەکەرێکی گوندیش وەڵامیان دەدایەوە، ئەوەش گەنجەکانی زیاتر بە پێکەنین دەهێناو وەستا بایزیش هارتر دەبوو!

بایز گوێ بەکوڵک، زۆر بەتووڕەیی هەستایە سەرپێو بە دەنگێکی قەبەی پیاوانەو تۆنێکی گڕی شەڕانگێزانە وەشەو حەچەی لە کەرەکەی کرد کە دوو بەشی بۆ جاحێڵەکان بوو، دەیوست بە دارکاریکردنی کەرەکەی پێیان بڵێ زۆرم لێ لە زگی ناون، خەریکە پەتی ئارامیم دەپچڕێ، بەرلەوەی بە ڕووتاندا بتەقمەوە لەبەرچاوم ون بن، چونکە من لەو پیاوە مووو نەرمانە نیم بەرگەی ئەوە بگرم بە بەرچاومەوە خەڵک بە چاوی حەرامزادانەو گاڵتەجارانەی بێزارکەر لە ناموسم بڕوانێ، هەر لینگی دایە نێرەکەرەکەی، بەرچیغێک لە گۆڕێ کەوتبوو، دەستی دایێو بەدەستی چەپی سەرکەللەی لەسەری نێرەکەرەکەی کردەوەو شەپەکی پۆلیسیی لە بنزگی داو بە هەموو هێزی خۆی بەرچیغێکی لە کەلەکەی کەرەکەی دا، لەسەر نێکیرا گرتی هەتاوەکو سەر پیلی کەرەکە. بەزەبری بەرچیغەکە کەلەکەی قۆلکرد، تاوێکی چاک لاجەولاج[2]و تەنیشتاو

١. حەساوی: کەری گەورەی ڕەنگسپی، هەندێکجار کەری بەغداییشی پێدەگوترێ.

٢. لاجەولاج: تەنیشتاو تەنیشت، ڕێکردن بە خواری، لەدەستدانی هاوسەنگی.

تەنیشت ڕۆیشت، سەنتەری ڕۆیشتنو هاوسەنگیی هەنگاوەکانی لەدەستدابوو. ئاخر ئەو بەرچیغەی بە خەیاڵی خۆی لە گەنجەکان داوەشاند!

یەک لە گەنجەکان گوتی: دارکاریکردنی ئەو نێرەکەرەی، ئەوە بۆ ئێمە بوو! ئای چۆن داکی ئەو نێرەکەرەی گاو تراندیو سـەقەتی کـرد! وای لێدا، عارەب شـاپی وای لە حوشتریش نەداوە! باوەڕناکەم ئەو نێرەکەرە جارێکی دیکە خرمەی لە جۆی بێنێتەوە! دیسـان بەو قسـەیەش بەگورتر پێکەنینەوە، لا لمووزیو غەزرینی ژنەکەیو سـاغ نەکردنـەوەی بەرهەمەکانیو دابیـن نەکردنی نانو پێخورو لە ئیشبوونو قۆشمەی ئەو جاحێرانەش، سەربار! هەموویان نەقیزەیان لە سەبرو خۆڕاگریی بایز گوێ بەکوڵکی دەژاند!

ئەوجارەیان، وەستا بایز گوێ بە کوڵک شتێکی بە مێشکیدا هات، ئەویش دیمەنی بەسامو ترسناکی سەگە هەوشارەکەی بوو بۆ دەرپەڕاندنی گەنجەکان. گورج هەستایە سەرپێو لە توندوتۆڵیی مێزەرەکەی دڵنیا بۆوەو لەسەری خۆی سـوورڕاند، وەک ئەوەی بیەوێ شـتێکی نوێ تاقیکاتەوەو تازە بیری هاتبێتەوە نەخشـەی بۆ دانێ، هەر سێو دووی لـێ نەکرد، لەپشـتەوەی خێوەتەکەی، مێخنجیری[1] سـەگە هەوشـاری هەڵکێشاو بەدەسـتەوەی گرت. سەگەکە ئەوەندە مەعلان بوو هەستی بەوە دەکرد کە بایز گوێ بە کوڵکی خاوەنی تووڕەیە، چونکە هەر لە هەڵکێشـانی مێخنجیرەکە بە تووڕەیـیو توندی، دەیزانی یان بۆ شەڕەسـەگی دەبات یان بۆ شتێکە. بۆیە وەک گوێڕایەڵیو ڕازیکردنی دڵی خاوەنەکەی، کلکی لەسەرپشتی دانابوو، زاری لـێ داپچڕیبوو، بۆ زیادکردنی

---

١. مێخنجیر: مێغنجیر، مێخزنجیر. سنگێکی ئاسنینە، نوکەکەی تیژە و سەرەکەی نەختێک پان و ئەڵقەیەکی پێوەیە. بۆ لێ بەستنەوەی وڵاخ بەکاردێت.

نانی خۆی، ئامادەی هەمـــوو گیانبازییەک بوو. ڕامالّی دەبردو بایزی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشـــا، ئەویش بەحالّ بـــۆی بەرزەفت دەکرا، هـــەر خەریکە پیلی دەربێنێ! ســـەگە هەوشـــارەکە دیمەنێکی بە سامو ترســـناکی هەبوو، هەردوو چاوە گروانییەکانی هەتا ئاســـتی دەرپەڕین زەق کردبۆوە، وەک ئەوەی بە دوای نێچیرێکدا بگەڕێ! زەمەن، ئاســـەواری هەموو شـــەڕەکانی ڕابردووی لەســـەر ڕووخساری جێهێشـــتبوو، چونکە، ڕەنگی خۆی سپی بوو، هەردوو بەری چاوی هێلّی ڕەشی جێ کەلّبەی ئەو ســـەگانەی پێوەبوو کە شەڕی لەگەلّدا کردبوون. ملو گوێیە بڕاوەکانی دەتگوت ســـەد نووکە خەنجەریـــان پێکەوتووە! لغاوەی لـــە چەند جێیان هەلّدڕابـــوو. هەرکە لە خێوەتێ ســـووڕایەوە، بایز لەبن لێوان وەک لـــە گەنجەکانی بەریدا: دەی کس کس کس! ســـەگی تاین هەر بەجارێ هـــار بوو، چاوی دابووە گەنجەکان، بایزی بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکردو پیلی ڕادەتەکاندو هێرشی بۆ گەنجەکان دەبرد. بایز گوێ بەکولّک وای نیشان دەدا کە دەیەوێ شوێنی ســـەگەکەی بگۆڕێ، بەلاّم گەنجەکان بە بینینی ئەو دیمەنە، هەر بابا بوو فریای خۆی بکەوێو نەکەوێتە بەر کەلّبەی ســـەگە هەوشـــاری. سەرسمیان دەداو بەسەریەکتریدا دەکەوتنو قیت دەبوونەوە، جار هەبوو لەسەر چنگان دەڕۆیشتن. بە هەزار حالّ خۆیان ڕزگارکرد، ئیدی خودا بتحەسێنێتەوە! وەســـتای گـــوێ بەکولّک، مێخنجیری ســـەگەکەی لە شـــوێنی دانیشـــتنی گەنجـــەکان داکوتا، ئیدی ببڕای ببڕای هەتاوەکو لـــەو گوندەی باریان کرد، ئەو گەنجانە سەریان بەو شوێنەیدا نەکردەوە!

دوای ئەوەی گەنجەکانی ئاوایی زۆر لەو ســـەگە ترســـابوونو باســـی دڕیو ترســـناکی ســـەروکەللەی ســـەگی گورگخنکێنیان دەکرد، هێنـــدەی نەخایاند

ناوبانگی سەگەکەی وەستا بایز، وەک ئاگرو پووش بەنێو گوندیدا بڵاوبۆوە، بگرە پەڕییەوە بۆ گوندەکانی ئەوبەری ڕووباریش!

لە تاریفی ئەو سەیەدا، وەک جانەوەرێکی ئەفسانەیی باسیان دەکرد و زارەو زار ڕۆیشت. لە هەرزارەش کۆڵێک سیفەت و خەسڵەتی خەیاڵیی بۆ زیاد دەکراو سەرجەلەی سەگەکە قورستر دەبوو. وای لێهاتبوو، ژنان لەوکاتەی شەوان منداڵەکانیان نەدەنووستن، دەستیان لەپشتی منداڵەکانیان دەکوتاو بە سینگو بەرۆکی خۆیانیانەوە توندەکردنو بە دەنگێکی بەرز دەیانگوت: چەغە چەغە نەکەی! کوڕی من دەنوێ! منداڵەکانیان بەترسی سەگە هەوشاری بایز گوێ بە کولکی، دەنواند!

سیفەتەکانی سەگەکە چەند بوو، کێوێکیان خستەسەر، شتی زۆر سەیریان پێوە نا: جارێکیان هێشتا هەر گوجیلە بووەو سنووی نەهاتۆتەوە، دوو جەندرمەی ئەسپسواری لەسەر خانێ زینی هێناوەتە خوارێو چەکەکانی لێئەستاندوون! حیکایەتی وایان بۆ هەڵدەبەست، نە بایزی خاوەنیو نە خودی سەگەکەش شتی وایان لە قوتووی هیچ عەتارێک نەبیستبوو و نەدیتبوو! خەڵکەکە بە کەیفی خۆیان ڕەچەڵەکو سەرجەلەیان بۆ دەردەهێنا کە توخماتی لە چ دێڵ و گۆڵێک بەپاش کەوتییە! وەکو نانو پیوازیان لەگەڵ خواردبێت! دەیانگوت: دایکی، دێڵێکی شینی بە ناوبانگ بووەو باوکی، گۆڵێکی سپی هێندەی کەرێک گەورەبووە، زیاتر چۆتەوە سەر باوکی کە لە هەموو ناوچەی هەوشار ناسراو بوو، بەدانسقە دێڵیان لێ چاک دەکرد! پیرەمێردێک هەر لەلاڕا خۆی کردە داکبرای خاوەنی یەکەمیو بە بەئاگاترین کەس لە پێشینەی ئەو سەگە کە چۆن لە هەوشار لە دایکبووەو چەندەمین گوجیلەی دایکی خۆی بووە! ئەو کاتەی

والی تەوریز بە سەفەرێک چۆتە هەوشارو چاوی بەو تووتکەسەگە کەوتووە، بە چەند لیرەی زێڕ کڕیویەتیو بە شـــیری شێر گەورەی کردووەو دوو سەگەوانیشی بۆ گرتووە بیعاملێنن، ئەوجا باوکی ڕەحمەتـــی بایز گوێ بەکوڵکی، کوپەزێڕی دیوەتەوەو دوای حەوتوویەک مردووە، بایز، بەو زێڕە ئەو سەگەی کڕیوە!

نەدیتیو نەناسی، کەسی وا هەبوو دوور بەدووریش سەگەکەی نەبینیبوو، بە شانو باڵی ئەو سەگەو خەسڵەتە ڕەسەنەکانیدا هەڵگوتبوو، ئەگەر بایز گوێ بەکوڵکی خاوەنی هەموو ئەو پێداهەڵدانو ناوبانگـو خەســڵەتە چاکانەی بە سەگەکەیان هەڵواسیوە، زانیبایە، چما شارێکت لە سەر تاپۆ کردبایە دەیدا بە کەس؟!

لـــە ختوخۆڕایی خنکاندنی چەندیـــن گورگ و ورچو بـــەراز هەڵدڕینیان بـــە ملدا هێنابـــوو! وای لێهاتبوو ئەوەی یەکەمجار هەواڵ و خەســڵەتەکانی دروســـت دەکرد، دوای ئـــەوەی هێندەی ئەوزار ئەوزار دەکرد، کە دەگەیشـــتەوە یەکەمکەس، بە هۆی ئەوەی هێندە ئارایشـــتو تیفتیفە درابوو و شتی لێزیاد کرابوو، نەیدەناســـییەوە! ئەو هەموو پێداهەڵدانە وایکرد ناوبانگی ســـەگەکە بگاتە کاکەڕەشـــی حاجی سمایلی، بە تایبەتی ئەوەی کە دەیگوت: ئەو سەگە چاوی بە چەکداری بکەوێ تا تفەنگەکەی لێنەســـتێنێو چەکی نەکات، وازی لێناهێنێو دەستبەرداری نابێت!

لەو کاتەی زەردەپەڕی ئێوارە خەریکبوو گوندەکەی بەجێدەهێشت، کاکەڕەش بە هیدۆی گـــوت: لە دوای نانخواردنی ئێوارێ وەرە بـــۆ ماڵی ئێمە، بەیەکەوە بچین بۆ لای ئەو ماڵە دۆمانە بۆئەوەی بە هەرنرخێکی ئەوان داوای بکەن، ئەو سەگە هەوشارەیان لێبکڕین. دوای ئەوەی سەگەکەی پێشووترم ژەهرخوارد کراوە

بێ پاسەوانم.

شەوێکی ســاردەو وشــکەبایەکی وەک گیزان، هەڵیکردووە. هەرکەسێک لە ماڵــێ بێتەدەرێ، دەبــێ خۆی بپێچێتــەوەو ســەربەرگی لەبەربێت. بایز گــوێ بەکوڵک، ئاگردانی گەرم کردییەو ســێکوچکەیەکی بەســەر ئاگرەکەدا داوەو پارچە تەنەکەیەکی کونکونی لەســەر داناوە، بۆئــەوەی گڕی ئاگرەکە بۆ بنمیچی خێوەتەکە بەرز نەبێتەوەو، گەرمایییەکەی بە چواردەوری ئاگردانەکەدا بڵاوببێتەوەو بەزایە نەڕوات.

وەک سووکەرە[1] لە بەردەســتی ژنەکەی دێتو دەچێتو ئاگرخۆش دەکاو هەر ورتەی دێتو، وەک ڕێــوی، گەمەی بە کلکی خۆی دەکات! لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەڵێتو کیفەی ســمێڵی دێت، پێیەوە دیارە زۆر بەکەیفە، بایز گوێ بە کوڵکەکەی دوو ڕۆژ پێش ئێستا نییە کە لەگەڵ تڕی خۆی بەشەڕدەهات! ئەی خوایە ئەوە چ نووشــتووێکی لێکراوە؟ چ دەرمانێکی دراوەتێ؟ ئەو پیاوە ئاوا گۆڕاوە! توومەز شــەوی ڕابردوو، براژن دڵی نەرم بووەو بە شتێک، بایزی ئاشت کردۆتــەوە، کەفوکوڵــی دامرکاندۆتەوە، بەجۆرێک وەک گوڵــێ گەش بۆتەوە، ئێســتا گێرەی قونجڕکانی لەســەر زگی بکەی، تووڕە نابێــت! لەگەڵ ژنەکەی، دەڵێی بەڕوویان لە زاریدا تەقیوە، کەلێنی قسان نادەنە یەکتری، هێندە شیرین یەکتری دەدوێننو قسان بۆ یەکتری دەگێڕنەوە!

کاتێک ژنە، قســەی بۆ بایزی دەکرد، ئەگەر قســەکە قڕانێکی قەڵبیشی نەهێنابــا، بایــز، وەک بە دوو کەســان قدیلکەی بکــەن، زاری هەتا بناگوێی

---

١. سووکەرە: سووکەڵە، بەردەست، وەرگێڕکە، کەسێکی لەشسووک بۆ بەردەستی، شاگرد.

دادەپچڕێو لە پێکەنینان شـــین دەبووەوەو خۆی وە سەرپشـــت دەگێڕا! ئێستا، باشترینو گونجاوترین کاتە کاکەڕەشو هیدۆ میوانی بن. ئێستا، کاتی ئەوەیە ســەوداو داواکاری هەرشتێکی لێبکەی شانسی ســەرکەوتنت زیاترە! حەپەی سەگەهەوشاری، سەرنجی ڕاکێشـــاو بینی دوو کەس بەرەو خێوەتەکەیان دێن، بەپیرییانـــەوە چوو و پێشـــوازییەکی گەرمـــی لێکردن، هێنـــدە بە تەکلیفـو مەشرەفخۆشی دەستی بۆ ڕاداشـــتنو فەرمووی کردنێ، دەتگوت بیست ساڵە نانو پیوازی لەگەڵ خواردوون! هێشـــتا ماوەیەتی بۆ کاتی ئاهەنگی شـــەوانەی ماڵـــی کوێخا نامیق. بایز پێوەی دیارە ئەمشـــەو دەوی لە کالان ناچێو نایەڵێ گۆرانی بەر هیچکەس بکەوێ! لە دوای چاکو چۆنیو ئەحواڵپرسین، کاکەڕەش گوتی: وەســـتا بایز ئێمە داوکارییەکمان لە ئێوە هەیە. هێشـــتا وشەی کۆتایی لەســـەر زاری دەرنەچووبوو، بایز گوێ بەکوڵک، بەرێژنە بەڵێ بەڵێ، بەسەرچاو، ئەمن بەس ژنەکەمی لێدەرچێت، خاوەنی هیچ نیم بۆ ئێوە!

مامرەتی سەگەهەوشاری دەستی پێکرد. لە دوای هەڵکشانو داکشانێکی زۆر، لـــە کۆتایی پێکهاتنو لە بەرامبەردا کاکەڕەش، نێرەکەرێکی بە کورتانەوە قیسی قەوچو قەڕاسەشی لێنەکاتەوە، لەگەڵ پاڵتۆیەکی ئاودامەنی سەربازی ڕووسیو کورتەکـوشەروارێک و جووتەکۆترێکی دەندووک کورتی پێ بەپەڕی دووکڵاوەی تەقڵەباز، لەبری سەگەهەوشـــاریەکە، بدات بە بایز گوێ بەکوڵکی. دوای پێکهاتن، کاکەڕەش گوتی: چەند ساڵ لەوەی پێش، کاکم حومێرە، سەگێکی هەوشـــاریی بە هەمان نرخ لە دۆمان کڕیبوو، بەڵام ئەمن جۆتە کۆترێکیشـــم زیاتر پێدا.

بایز سێ بە ســـێ تەڵاقی خوارد: چاوی ئێوە نەبێت، کەس ئەو سەیەم بەو

نرخەی، لە حەسـاریٚ خۆی نابینیٚ! بایز لە تەلاٚقان بێمنەت بوو، چونکە شەوی ڕابردوو پێیەوە دیاربوو وای توندوتۆڵو نویٚ کردبۆوە، مەترەلۆز نایبڕیٚ!

دۆم، لـە مـاکو بنەچـەڕا کوردن، گەڕیـدەو پیشـەوەرن، هەرگیز دزی و خەراپـەکاری ناکەن، هیچکـەس دەرگای ماڵەکەی بـە ڕووی ژنە دۆمەکاندا داناخات، تەبای ژنانی ئاوایی ئازاد بوون بچن بۆ هەرماڵێک کە بیانەویٚ، ئەوان جیاوازن لە ژنە قەرەجەکان. بۆیە زۆر نیگەران دەبوون کاتێک بە یەکەوە ناویان دەهـات: دۆمو قەرەج! قەرەج، پیاوەکانیان لە ماڵیٚ پاڵ دەدەنەوەو هیچ کارێکی ناکـەن، ژنەکانیان دەیانژیێنن. ژنەکانیان دەگەڕێن خەریکی دزیو فاڵگرتنەوەو نێولەپ خوێندنەوەن، بۆیە خەڵک دەرگایان بە ڕوودا دادەخەن و بەپێچەوانەی ژنە دۆمەکان، ژنەقەرەج نەدەبوو بێنە ماڵەکەت، چونکە کەم وابوو بێنو دزیت لێنەکـەن. هێندە کارامە بـوون لە دزیکردن، هەر نەبێتـەوە، کلیان لە چاوان دەدزی! دزیەکەیان ئەوەندە بە مەعلانی دەکرد، کەمکەس هەستی پێدەکردن: دەنکەمورووی وەک دەنکەگەنمییان بە داوێکەوە دەبەستەوە بۆ مریشکەکانیان هەڵدەدا، هەر کە مریشکەکە قووتی دەدا، ئەوان داوەکەیان ڕادەکێشا، بێئەوەی مریشکەکە قیرەی لێوەبێت، بەئاسانی دەیانگرتو هەر زوو سوڕگومیان دەکرد. دزیو ماجـەراو فاڵی قەرەجەکان، ئەوەنـدە کارامەیی پێوە دیاربوو کەمکەس هەسـتی پێدەکردن. بۆیە دۆمە کاسـبکارەکان لەگەڵ ئەواندا بەراورد ناکرێن. کاتێک کێخوا نامیق، هەسـت بـەوە دەکات گەنجێکی گوندی چاوباشـقالی لەگەڵ کچێکییاندا دەکات، لەلای چەند ڕیشسـپیەکی ئاوایی گازاندەی کردو کارە نابەجێیەکانی ئەو گەنجەی باس کرد: ڕاسـتە ئێمە دۆمین و گەڕیدەین، بەڵام لە هەرشوێنێک بژین دوو شت ناکەین، دزی و گاندان! بۆیە دەمەویٚ ئەو

کوڕەتان ئاگاداربکەنەوە، با کارێکـــی نابەجێ لەگەنجەکانمان ڕوونەدا! چونکە ڕەنگە خۆیـــان پێ بەرزەفت نەکرێـــت! یەکێک لە ڕیشســـپیەکان گوتی: زۆر مەمنوونتین بە ئێمەت گوت، ئێستا وا بزانە تەمبێ کراوە!

بەیانیان کاتێـــک رۆژوبان گەرم دەبوو منداڵە دۆمـــەکان لە خێوەتەکانیان دەهاتنـــە دەرێو خۆیان دەدایە بەر تـــاوێ. منداڵێک، لەکاتی گرمەی گەواڵەو هەورەتریشقەو براچەی برووســـکـو وژەوژی با کە شڵپەشڵپی لە خێوەتەکانیان دەهێنا، تەمەنناى ئەوەی دەکرد، ئەوانیش خانوویێکی وەک خەڵکیان هەبێت، شـــەوان بە ئارامیو ئاســـوودەیی بنوون! بزمارێکی بە دەســـتەوەبوو، لە سەر عەرزەکە وێنەی خانوویێکی دروســـت دەکرد، بە دڵی خۆی، تێیدا نیشـــتەجێ بنو لە شـــەوە باراناوییە ترسناکەکان ڕزگاریان بێت. ئەو منداڵە بەپێچەوانەی داکـو بابی بیـــری دەکردەوە! ئاخر ئـــەوان، زۆر لە ژیانو شـــوێنی حەوانەوەی خۆیانو خێوەتەکانیان ڕازی و بەختەوەر بوون.

بەرنامـــەی کارو کاتەکانیان، هەر لە یەکەم شـــەوەوە کـــە پێیان ناوەتە ئەو گوندە، بە دەســـتوورو فەرمانی کوێخا نامیقی، شـــەوان لـــە دوای نانخواردنی ئێواران ناچنەوە ســـەر کارکـــردن، بەڵکو ئەو کاتە تەرخانە بـــۆ گۆرانی گوتنو ئاهەنگگێڕان، بۆ خۆیانو گوندنشینان، بۆئەوەی کەمێک شادی برژێننە روحو جەســـتەی ماندوویان. یەک لە دۆمەکان ســـەنتووری دەژەنی، یەکیان پیک و دووزەلەو ئەوەی دیکە دەفـو دمبـــکـو، بەنۆرەش گۆرانییان دەگوت، هەریەکە بەندێکیان دەگوتو بۆ یەکترییان دەســـەندەوە. جگە لە مەلای گوندیو چەند وشکەسۆفییەکی پیر کە دەستیان لە دنیا شووشتبوو، هەموو خەڵکی گوندی، پێیان سەرســـام بوون، هەر نانی ئێوارەیان لە قوڕگی ئاوادەبوو یەکســـەر بانگی

یەکترییان دەکردو خۆیان بۆ لای خێوەتی دۆمەکان هەڵدەکوتا، بۆئەوەی کاتێکی خۆش‌و دوور لە خەمی ڕۆژگار بەسەربەرن.

ئەو چەنــد ڕۆژەی دۆمەکان لەو گوندەی مانەوە، هەموو شــەوێ ئاهەنگ ســازدەکرا . ئەو گوندەیان ئاوەدان کردبۆوەو گیانیـــان بە بەرداکردبوو. خەڵکەکە خۆزگەیان دەخواســت ماوەیەکی زیاتر لە گوندەکەیان بمێننەوە، بەڵام مانەوەی ئەوان بەندە بــە ئیشــوکارەکەیان‌و داواکاری لەســەر بەرهەمەکانیان. مەلای گوندی کە پێیان دەگوت مەلای دوازدە عیلمەو قورئانی هەموو لە سینگیدایە، لە خوتبەی هەینیدا فەتوای دەرکرد: ئەو ئاهەنگەی شــەوانە دۆمەکان سازی دەکەن‌و ئێوەش دەچنە دیاری، ئــەوە دژایەتییە لەگەڵ دینی ئەڵڵای و جەنگە لەگەڵ قورئان، ئەوە گومڕابوون‌و سەر لێشــێواوییە، ئەوە لووتکەی جەهالەت و، گەڕانەوەیە بۆ ســەردەمی گاورو ئاگرپەرستان. لەگەڵ دەنگی زوورناو گرمەی دەهــۆڵ، هەرچی مەلایەکەتە لەو نێوەی نامێنن‌و لــە حەوت کێوان ئاوادەبن! بەو قورئانەی لە سەر ڕانی چەپم داناوە، ئەوەی گوێ لە گۆرانی بگرێ، لە ڕۆژی حەشــرێ گوێیکانی پڕدەکەن لە مز، قورقوشــمی گەرمی بە گەروویدا دەکەن، هــەردوو چاوی بە ســووژن هەڵدەکۆڵن‌و دەیخەنە نێو دەســتییەوە! لە ڕۆژی حەشــرێ، وێڵ وێڵ دەسووڕێتەوەو کەس بەخۆی ناگرێ، پێغەمبەر شەفاعەتی بۆ ناکاو دەڵێ: حاشــا! ئەوە لە ئۆمەتی من نییەو ناوی ڕەش کراوەتەوەو چۆتە ڕیزی گوناهبارانەوە، ســەد هەزار ســاڵ لە ئاگری دۆزەخدا دەسووتێ‌و چاوی بە یەک حۆریش ناکەوێ!

ئــەو گوندەی ئەوبەری ڕووبــاری کە دۆمەکان لــە دوای چەند ڕۆژ مانەوە لەو گوندە، پاشــان هاتبوونە ئەمبەرەی ڕووباری، بۆیە خەڵکی ئەوێ دەیانزانی

شەوان ئاهەنگ سازدەکرێو گۆرانی دەگوترێو یاریو مەتەڵو قسەو سەربردەی خۆشی لـــێ دەگێڕدرێتەوە، بۆیە هەموو شەوان مەلای گوندی، کە گەنجێکی وردیلە بوو، تازە ئیجـــازەی مەلایەتی وەرگرتبوو، لەو گوندەی ئەوبەری ڕووباری دامەزرابوو، شەوان شاقەلی کەوای لەبەرپشـــتێنی ڕادەکردو وەپێش خەڵکی گوندی دەکەوتو لە ڕووباری دەپەڕینەوەو دەهاتن بۆ گوێگرتنو بەشداریکردن لە ئاهەنگی شـــەوانەی دۆمەکان. ئەو مەلا چکۆلەیە ئەوەندە بە قەناعەتەوە بەشداری دەکردو وەپێش خەڵکەکە دەکەوت، وەک ئیمامەتی نوێژی هەینییان بۆ بکات!

یەک لە مەلاکانی ئەمبەرەی ڕووباری، هەر ساڵێک دەبوو لە جێی مەلای پێشـــوو دامەزرابوو لە گونـــدی، پیاوێکی بە قەڵافەتی زەبەلاح بوو. ســـەری هێندە گەورە بوو، بایی دوو مەلا خامی دەویست بیکات بە مەندیل! دوو مەتر قوماشـــی لە هەموو مەلای دیکە زیاتر دەویست بۆ کەواو سەڵتەی. پێڵاوی ژمارە چلو شەشـــی لەپێ دەکرد! ئەو هەیکەلـــە، زۆر یارمەتیدەر بوو بۆئەوەی هیچ مەلایەک زاتی ئەوە نەکات مشتومڕی لەگەڵ بکاو خۆی لە قەرەی بدات یان قسە لە قسەیدا بکات!

مـــەلا، بـــە کەلەش هێنـــدە گەورەبـــوو، ئەگەر قـــووڕ بوایـــە دووی وەکو مەلاچکۆلەی ئەوبەری ڕووباری تێدەبوو و بایی فەقێیەکیش قوڕ دەمایەوە! بە پاڵپشتیی ئەو زلی و لەندەهۆریە بوو پێی وابوو عەیبەیە دان بە قسەی مەلای دیکەو، بەتایبەتی ئەو مەلا چکۆلەیە، دابنێ!

لەســـەر ئەو حەرامیو حەڵاڵییەی ئاهەنگی شـــەوانی دۆمەکان، هەردوو مەلا لێیان بوو بە مشـــتومڕو مجادەلە، مەلا زلەکـــە دەیگوت: حەرامەو لە

مەکروهیــەت دەرچووە، ئەو ئامێرانــەی دەیژەنن، بە ئایــەتو حەدیس بۆت ڕوون دەکەمــەوە کە حەرامن! مەلاچکۆلەش دەیگوت: کەیفو شــادی مافی هەر مرۆڤێکەو چێژی لــێ وەربگرێتو ئیسلام بە هیچ دەقێکی باوەڕپێکراو قەدەغەی نەکردووە! بۆیە، مافی خۆمانە وەکو مرۆڤ بەشداری لەو ئاهەنگانە بکەین! بەو قســانەی مەلا گچکەی، وەکو ئەوە وابوو مێش بچێتە نێو گوێی گایەکی زل و ویزەویز بکاتو گایەکەش بفیشقێنێ! ئاخر مەلا زەبەلاحەکە قەت شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو وا بە بەرچاوی خەڵکیەوە، یەکێک کە دوێنێ بۆتە مەلا، ئاوا بە ڕوویدا بچێتەوەو مشــتومڕی لەگەڵدا بکات! بەکورتی، تووشی گونڕەشــی خۆی هاتبوو، دەیگوت: ئەوەیە کێشکەی ئەوساڵ بە کێشکەی پار دەڵێ نازانی بجریوێنی! ڕاســت ئەوەیە: لێت دەپەڕیو پێت هەڵدەپەڕی! گوێ بگرە! جارێ، پیکو دووزەلەو زوورنا، هەر حەرام حەرامە! وەک ئەوە وایە گۆشتی بەرازی بخۆی، یان لەگەڵ داکو خوشــکی خۆت زینای بکەی! بەینی ئەو دوو مەلایە وای لێهــات بووبوونە قانڵڕی یەکتری. ئەو کێشــەیە، مانگ هاتن و ساڵ ڕۆیشتن، بۆیان ســاغ نەبووەوەو نەیانتوانی بۆ خەڵکی یەکلایی بکەنەوە. لە هەموو بۆنە ئایینــی و کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکە ڕوو بە ڕووی یەکتریی دەبوونەوە. وای لێهاتبوو مەلاکانی ناوچەکەش بەشدارییان لە مشتومڕەکەیان دەکردو ئەو کێشەیە مەلاکانیشی کردبوو بە دوو بەشەوەو، لێیان بووبووە بابەتی ڕۆژ، وەک ئەوەی هیچ کێشــەی گرنگتریان نەبێت، بەســەر دوو بەرەی حەرامو حەڵاڵدا دابەش بووبوون.

مەلا گەورەکە دەیگوت: بەو دەلیلە پیکو دووزەلەو زوورنا حەرامە، چونکە پیک دەچێتە نێو دووزەلەو زوورنای، واتا نێرو مێن، یانی، ئەو شــتانەی دەچنە

نێو یەکتری، لە زینای دەچن، بۆیە حەرامن!

لــە بەرامبەردا چەنــد مەلایەکی دیکە دەیانگوت: بــەو پێیەی کەیفو خۆشــیو گوێگرتن لە گۆرانی هیچ کەراهییەتێکی نییە، حەرام نییە، چونکە زیان بە کەس ناگەیەنێ! لە پرســەو ژن گواســتنەوەو سولحو هەموو بۆنەکانی ناوچەکە، ئەو تاخمە مەلایە ملیان لەبەرملی یەکتری دەناو نەدەبڕایەوە!

کاکــەڕەش، دەمێک بوو لێی لە زگ نابوون. بــە زەردەخەنێکی مانادارەوە گوتی: باشە مامۆستا بەڕێزینە، ئێستا دنیا بەسەر زوڵمو زۆریدا کاول دەبێت، مافی خەڵکی هەژار پایەماڵ دەکــرێ، میللەت لە بێعەدالەتیدا داڕزاوە. ئەو خەڵکەی ئێوە ئیمامەتی بۆ دەکەن، پشتی لەژێرباری چەوسانەوە چەماوەتەوە، ئێوە ورتەیەکتان لــە زاری نایەت، کەچی ئاهەنگــو گۆرانــی گوتنتان کردۆتە خوێنی ســیاوەیشو نابڕێتەوە! ئەو خەڵکــە نەخوێندەوارو بەدبەختە چاوی لە زاری ئێوەیە، ئێوەش وازتان پێ لە کاکڵەی هێناونو بە دوای توێکڵی پڕوپوچتان خستوون! ئێوە لە ژیانی کولەمەرگی ئەو خەڵکە بەرپرسیاری یەکەمینن! ئەوە بۆ دوو ساڵ دەڕوا هەموو کێشەی ئێوە بۆتە ئەوە داخوا پیکــو دووزەلەو زووڕنا حەڵاڵە یان حەرامــە! ئەو هەموو زوڵمە نابینن، کەچی لەســەر ئەوەی پیک دەچێتە نێو دووزەلەی، دووزەلە دەچێتە نێو پیکی، کامیان نێرەو کامیان مێیە؟ خەریکە ورگی یەکتر دەدڕن! ئەو خەڵکەتان بەخۆتانەوە ســەرقاڵ کردووەو بەگژ یەکتریاندا دەکــەن. پێم وا نییە ئێوە ئەو ڕاســتییانە نەزانن، بەڵام بەهۆی لە دەســت نەدانی پــارووی چەوری لای ئاغــا، بێدەنگیتان هەڵبــژاردووە! پیاوی ڕاستەقینەی ئاینی، نابێت لەسەر هەق بێدەنگ بێت!

گەنجەکانــی ئاوایی تەماشــای یەکتریــان دەکردو لەگــەڵ خێوەتی ماڵە

دۆمەکان ســـەرەتاتکێیان بوو، بزانـــن کەی ئاهەنگی گۆرانـــی‌و دەنگی زوورنا بەرزدەبێتەوە، تا خۆیان لەو مەجلیســـە وشکەی مەلایان ڕزگاربکەن! ئەوشەو ئاهەنگەکەیان لە هەموو شەوان گەرمتر بوو، کوێخا نامیق پاڵی بە دوو بالیفی گەورەوە دابوو، ئەوەندە ئەستوورو بێڕەزان، شەڕە تفەنگیان لەپاڵ بکە! یەک لە دۆمەکان سەرپیکی خۆشکرد بۆ ئەو گۆرانییەی دەیگوت:

**قوربانت بم بە خۆمەوە،**
**بە چل‌و چوار ماڵی دۆمەوە**
**ماچت نەکەم نارۆمەوە!**
**لەگەڵ شەڕاب دەتخۆمەوە**



**بایدێ بسکان دەبزێوی**
**خڕ بوون نارنج و سێوی**
**سەرەند و بێژینگ ناکەم**
**بەڕیشی بابی خێوی**

کوێخا نامیق، قاوە لەسەر قاوەی فڕدەکرد، قومی لە مۆدنە کارەباییەکەی[١] دەداو گوپی پڕ لە دوکەڵ دەکرد، دوکەڵی جگەرە لەســـەر سەری گەواڵە دەکرد. ئەوشـــەوە کەیفی زۆر سازەو وەک گەنجێک هەڵسوکەوت دەکات. گەنجی دوو گوندان دەوریان داوەو هەریەکەیان وا دەزانێ ئەو گۆرانییەی بۆ خۆشەویســـتو

---

١. مۆدنەی کارەبایی: دارسیغارێکی شووشە بوو، هاوشێوەی تەسبیحی کارەبا.

ماشووقەکەی ئەو دەڵێ. وا چوونەتە نێو گۆرانییەکە، بەوان بوایە هەتا بەیانی بەردەوام بێت! لەناکاو مام کوێخا لەگەڵ گۆرانییەکە جەزم بوو، سەری بۆ پێشەوە تەکان دەداو لەگەڵ ڕیتمی گۆرانییەکە ڕیشـــووی هەوریو شەدەی، هرووژمیان دەبردە سەر ڕوومەتیو دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان. ئەو ڕیشوانەی وا دەهەژاند، وەک شـــایی ئایشـــۆکێ بکەن. لەپڕ، بە دەنگێکی بـــەرز گاڵی داو گوتی: برو بـــالا![1] گەنجێکی گونـــدی یەکپێ لە جێی خۆی بڵندبـــوو و گوڕی کردە مام کوێخا نامیقیو توند دەســـتی گرتو تۆپی کلکەئەنگوچکی کراسەکەی ماچ کـــردو گوتی: توخوا مام کوێخـــا با نەڕوا بۆ هیچ کوێیەک! توومەز فارســـی نەدەزانـــی، پێی وابوو مام کوێخا گۆرانیبێژەکـــە دەنگ دەداو دەڵێ بڕۆ! کوێخا نامیق گوتی: کـــوڕم خۆ ئەمن ناڵێم بڕۆ لێرە، دەڵێم بڕۆ ســـەرێ، یانی ڕیتمی گۆرانییەکە بباتە سەرترو، بەرزتر گۆرانی بڵێ! گەنجەکە گوتی: ئای بە قوربانی زارت بم مام کوێخا! ئاوڕی لە برادەرەکانی دایەوە: ئەوە کوێخایە، بابم! ئەمشەو تا درەنگ گۆرانییان گوت، بەیانی لەگـــەڵ گزنگی ڕۆژێ بایز گوێ بەکوڵک، لە دەوری ئاگردانەکە هەندێک گڵ و لمـــی هەڵقەندو لەبەر خۆرەتاو بۆ کەوەکانی ڕۆکرد چینەی لێبکەنو خۆیانی تێوەردەن. تاژییەکان ڕاوێچکەیانە. شەمســـی خانی کچی کوێخا نامیق، ڕەونەقێکی داوەتە نێو ئەو خێوەتانە، هەر مەپرسە! کچێکـــی باڵابەرزی نێوقەد باریکی هەتا دەســـت هەڵێنـــی کەڵەگەتو قۆڵو باســـک بادراو، دووچاوی شینی ســـیحراوی کەمێک بە لای سەوزیدا دەڕوانن، ئەســـمەرێکی خوێنگەرمو دڵڕفێن. شـــۆڕەبی لاســـایی بەژنی شەمســـیخانی

---

١. برو بالا: بڕۆ سەرێ، هەڵکشێ، وەسەرکەوە. (قسەکە فارسییە)

کردبۆوە. پیاو حەیرانو دەستەوەستانە لە تاریفی جوانی لەشولاری. ڕیزە ددانی مرواری ئاسای، ڕەواجی سەدەفی شکاندبوو، دوو کەزیی ئەستوورو ڕەشی وەکو ماری ئاشقەوباشقە لە سەر سمتی لێک هاڵا بوون. وەکو ماینێکی کەفەڵ پانو کێوی، زۆر ئارەزووبزوێنو ســەرکێش، نیگای لە نیگای هەرکەسێک ئاڵقاباپە، کۆتایی بوو! تیشــکی چاوەکانی هێندە مەســتە، نێچیری لە پەلوپۆ دەخات! لەرەی مەمکە تووڕتەکانی، ئاونگی لەزەتی لێ دەتکایەوە!

جیاوازی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکان ڕێ لە ئیشــق ناگرێ و، عیشــقیش وەک دۆمەکان هیچ ســنوورێک ناناسـێت! شەمســی خان، لە گوندێکی ئەودیوی زورگــەزراوی، لەگەڵ یەکێک لە کــوڕە ســەرۆکخێڵەکانی وێ، نیگایان تێک دەئاڵێو ئاشقی یەکتری دەبن. ئەو کوڕە ناوی (جەمیل)ــە. ڕازی دڵی خۆیان دەگۆڕنەوە. جەمیل دەکەوێتە دەردی عیشــقێکی بێئامــان کە هیچ دەرمانو حەکیمێک چارەی نــەکات، وەک دەرمانخواردکراو گێژو هوڕ دەبێت. بەردەوام نیمچەتایەکی گەرم دایدەگرێت، تەنها دیدەنی شەمســی خانێ دڵ و دەروونی ئارام دەکاتەوە. بەو هەموو شــانو شەوکەتو ســەروەتو دەسەڵاتەیەوە، خۆی وەک زەڕنەقووتەیەک دەبینێ بە چنگ هەڵۆیەکەوە!

بەهۆی داب و نەریت و قسەو قسەڵۆکی خەڵکی، هەرچەند دەکاو دەکرێنی، نازانــێ چ بکا بۆئەوەی پێک بگەن! ئاخر ئاغــا تێکەڵاوی و خزمایەتی لەگەڵ کرمانجــان ناکەن، چ جای دۆمیش بێت! لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ئای عیشــق! چەندە سادەو ساکارە، چەند ئەوەندەش بەنرخەو بەهای مرۆڤایەتیی هەیە! ئەمن چی لەو ناو و شــۆرەتو ماقوولییەی بنەماڵەکەم بکەم کە بە دەردی عیشقی من نەیەت! بە من چی، باپیرم پڵینگی کوشــتووە! بــە من چی لە دیوەخانێ

پۆلووی لەنێو لەپـــی خۆی داناوەو نەیگوتووە ئاخ! چی لە دیوەخانی بابم بکەم چەند پیّ درێژەو ســـەماوەرو قاوەچاغەکەی چەند دەولک ئاویان گرتووەو چەند نۆکەرو خزمەتکاری هەبوون! لەســـەر پشتی ئەســـپیرا لە بای غاریّ گوریسی لە عـــەرزی هەڵگرتۆتەوە، بە مـــن چی ئاخر! ئەوانە دەردی مـــن چارە ناکەن! تازە ئەمن بیر لەوە ناکەمەوە دوێنیّ چی ڕوویداوە، قســـەش لەسەر ئەوە ناکەم ســـبەینیّ چی ڕوودەداو خەڵک پاشـــەملە چیم پێدەڵێن! لای من، تەنها ئەوە گرنگە کە ئەورۆ و هەر لەم چرکەســـاتەدا ڕوو دەدات! کەواتە، ئەو عیشـــقەی من یاخیبوونی دەویّ، یاخیبوون لە داب و نەریت، لە ئەقڵی کۆن، یاخیبوون لە دەستووری خێڵ، لە دیوەخان!

جەمیل، گونـــد بە گوند بـــە دوای ماڵی بابی شەمســـی خانێدا دەڕوات، هەرجارەی بە بیانووی کارێک: بێژینگ، تیرۆگ، نانبرێشـــک و... بۆ دایکی، بەڵام لە بنەڕەتدا تەنها بۆ دیدەنیی شەمسی خانیّ بوو! ئاخر جەمیل لە کەریمو ســـتیو حەسەنو مریەم کەمتر نەبوو، یەخســـیری عیشقێکی پاکژو خودایی بوو. دوو ڕۆژ بوو لە شەمسی خانیّ بێخەبەر بوو، ڕۆژی سێیەم ئەسپی شینی قەزوانی لە تەویلەی ڕاکێشـــا دەریّو پێی لە ڕکێبیّ نا، ئەســـپی نەگرتەوە، تا گوندی لـــیّ بە دیارکەوت، لە شوێنی خێوەتەکانی ڕوانی، بەڵام لە جیّ جۆخینان یەک خێوەتی لـــیّ نەمابوو، نمە بارانێکیش بەوردی دایدا. هەتاوەکو نزیکتر دەبۆوە، نائومێدتر دەبوو، لغاوی ئەســـپەکەی توند کردو ئەســـپەکە لە دەوری خۆی سووڕایەوەو دابەزی، لە کۆچاگر و چوار ئاگردانی پڕ لە خۆڵەمێشی وەک دڵی جەمیلی ساردوسڕ زیاتر، شتێکی دیکە دیار نییە!

جڵەوی ئەســـپی لـــە باســـکی خۆی هاڵانـــدو لەســـەر ئاگردانـــی ماڵی

شەمسی خانێ دانیشت. خۆڵەمێشی ئاگردانەکە بەهۆی داباریني چەند پڕوشکەبارانێک، توێژاڵێکی وەک دەموچاوی خرووکاوی لەسەر بوو. بەهەمان شێوەی دڵ و ڕوحی جەمیلی کونجڕکونجڕ ببوو. کێ توانای لاوانەوەی ئەو بەیانیە خەمناکەی هەیە! دەیویست چەترێک لە هەناسەکانی خۆی بۆ سەر ئاگردانەکە دروست بکات، بۆئەوەی هەتا هەتایە کوێر نەبێتەوە!

لەناکاو دەستی بۆ کوچاگرێک برد، بینی خەناوکە قەنەفرەکەی خۆی بۆ لەبن ئەو بەردە جێهێشتووە، ڕەنگی بزرکا، تێگەیشت هەواریان گەلەک دووورەو ئیدی دەست لێکبەردانە! ئەگەر غروری پیاوانەی بەسەریدا زاڵ نەبوایە، بە فرمێسکان ئەو جێژوان و هەوارە چۆڵەی دەشوشتەوە! لە ڕوحیدا، جەنگێک دژی ئەقڵ و نەریتی دیوەخان، بەرپاببوو. دەیزانی برینی ئەو کۆچبارە ئی لە یادکردنو فەرامۆشی نییەو، هەموو زەردەخەنەی دنیا ناتوانێ خەمەکانی بشواتەوەو شەمسی خانی بیربباتەوە! بە دیار ئاگردانە دامرکاوەکەوە هەڵکوڕماوە، وەک ئەوەی لە پەرستگایەکی داڕووخاودا لەسەر ئەژنۆ دانیشتبیت، سەری سوڕمابوو، دڵی پڕبوو لە پرسیار: چی، منی کردۆتە ئاوریشمپۆشو شەمسەی کردۆتە گونییەپۆش؟! چی منی کردووە بە ماقوڵ و ئەو بە ناماقوڵ؟! مەگەر هەردوکمان خەڵقەندەی یەک تۆپەڵەقوڕ نین؟!

کلکتەقێنەیەک[١] بە دەوری هەوارەکەدا خولی دەداو باڵەکانی لە یەک دەداو لەسەر بەردێک بۆ سەر بەردێکی دیکە، خۆش خۆش کلک دەکوتی، وەک ئەوە وابوو پەیامێک بە جەمیلی بڵێ. جەمیل تیلەی چاوێکی دایە

١. کلکتەقێنە: کلک هەڵسەنگێنە، باڵندەیەکی وردیلەی کێوییە.

کلک تەقێنەکە: بریا وەک حەزرەتی سولەیمان زمانی هەموو تەیروتوارێکم دەزانی، بۆئەوەی لێت حاڵی بووبام و سۆراخێکی شەمسی خانم لێکردبای! ئینجا بەدیار هەواری خاڵی و خۆڵەمێشی ئاگردانەوە، لەبەخۆیەوە لاوکی شەمسی خانێی دەگوتەوە:

**دە وەرە وەرە شەمسی خانێ،**
**کەچێ ئەز سیندخۆرم بە قورعانێ،**
**پشتی بەژنەکا بلند دێمەکی سۆری گولی،**
**لمن حەرام بن دەسمالا کەسرەوانێ!**
**کچك دگۆ کوڕۆ وەز سیندخۆرم بسەرێ تەیە،**
**لپاشی کوڕەلاوکێ خۆ، مهراوانو مال و مێر لمن تۆبەیە!**
**قالا زێڕا گرێنادەم بەژنا خۆیە،**
**ئەز سیندخۆرم ناکەم مێرە،**
**ڕیڤیا گرێ نادەم دەستی شێرە،**
**بارگینا گرێنادەم سەر ئاخوڕێ وان کەحێلە!**

دۆمەکان، بارگەوبنەیان تێکنابوو بۆ دیوی کوێستانێ، چەند ڕۆژێک بوو بەڕێوەبوون، لە پشتی گرک و ڕۆستێ بەسەرکەوتن بۆ کێلەشینێ.

شەمسی خان، لە بەرایێ کۆچ و کۆچباری ڕایدەکێشا سەرێ شێوەری. ڕاستە بە کەلەش لەوێ بوو، بەڵام دڵی لە دەشتی کاکی بەکاکی هەولێرێ لێ بەجێمابوو! هێندەی ئاوربداتەوە بۆ دیوی گەرمێنێ، ئاگای لەبەرپێی

خۆی نەبوو، بە ئومێدی ئەوەی جەمیل بەسواری ئەسپی شینی قەزوانی لەگەڵ تیپەکی سواری دزەییان، لەپێش کۆچێ بسوورێ و هەر لەوێ داخوازی شەمسی لە کوێخا نامیقی بابی بکا!

لەوکاتەی بەلای شانی ڕاستەیدا بەرەو گەرمێنێ ئاوڕی دایەوە، پێی لەسەر کەپکەی مارێکی کورەوەیبابی[1] دانا، مارەکە بە بەلەکییەوە داو هێندەی نەبرد کاری خۆی کردو شەمسی خان لە چاوەڕوانیدا گیانی سپاردو لە هەورازی کێلەشینێ بە خاکیان سپارد!

شوێنەواری هەوارەکە، تەنها خۆڵەمێشی عیشقێکی ناکامی لێ بەجێمابوو، بوو بە سەرابێک، کە مرۆڤ دەبێ بۆ سندمی داب و نەریتی کۆمەڵگا بژی!



١. کورەوەیباب: قوڵەوەیباب. مارێکی قوڵەیە، ژارەکەی زۆر کوشندەیە، بە هەرکەسێکەوە بدا یەکسەر دەیکوژێ. گوایە بە کەسێکیەوە داوە و هاواری پێکردووە: وەی بابە! ئیدی ئەو ناوەی بەسەردا براوە.

# ٢٣

لە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ، لە قوتابخانەکەی گوند کچەکەی ڕۆستەمە شێتی لەنێو هەموو قوتابییەکان بە یەکەم دەرچووبوو، نمرەکانی زۆر لە سەرێ بوون، لە پێش قوتابییەکانەوە بوو، ئەوەش ڕەفعەت ئاغاو مشیری کوڕی زۆر تووڕەو هەراسان کردبوو، ئەوەش کە تووڕەییەکەی زیاتر دەکردن، ئەوەبوو کە بیستبوویانەوە کاکەڕەشی حاجی سمایلی، خەرجی جلکو بەرگو پێداویستیەکانی قوتابخانەی بۆ کچەکەی ڕۆستەمی گرتۆتە ئەستۆی خۆی. هەتا دەنگی تێدابوو دەینەڕاند: جا وەرە لە حەیفان خۆت مەکووژە! ئەو مامۆستا دەبەنگە ئەوەندە بێڕێزە هیچ جیاوازییەکی لە بەینی منداڵی نەجیبزادەو منداڵی کرمانجاندا ناکات! دیارە بۆ خۆیشی هەر وەکو ئەوان بێ ئەسڵو فەسڵە، دەنا کەی هەقە کچی شێتو شوورەکی وەکو ڕۆستەمەشێتی، بەسەر منداڵەکانی ئێمەدا زاڵ بکات و بێڕێزی بە ئاغاو گەورەی گوندی بکا! شەرت بێ دەبێ بۆ حەوت پشتی تەمبێ بکەمو فێری بکەم ئاغای گوندی یانی چی! ئاخر کوڕی من، هەر جانتاو قەڵەمەکانی، خوێنی کچی ڕۆستەمەشێتی پێدراوە!

بەو هەنجەتە، مەلای گوندی ڕاسپارد لە وتاری نوێژی هەینی بە خەڵکی ئاوایی بڵێ ئەو مامۆستایە عیلمی شەیتانی بڵاودەکاتەوەو دەیەوێ گوندەکەمان

بە بەرغەزەبی خـــوای بکەویتو بەرەکەت لە ماڵ و ســـامانمان هەڵگیرێ. بە چـــاوی خۆتان دەبینن بە گوێـــی خۆتان گوێتان لێیە دەڵـــێ عەرز وەک تۆپی منداڵان خڕە!

مەلاش بۆ ڕەزامەندیی دڵی ئاغای و هەر بۆئەوەی تۆزێک پێبکەنێ، قسەی مەلایەکی دیکەی بۆ ئاغا کاوێژ دەکردەوە، گوایە بە مامۆستایەکی قوتابخانەی گوتووە: ئەگەر عەرز خڕ بوایە، دەبوو جارێک قوونی تۆ هاتبایە سەرکۆشی من! دەستو پێوەندو خەڵکی دەوری ئاغای لە قاقای پێکەنینێکی بێتامیان دابوو. ئاخر ئەوە کـــەی دەچێتە عەقڵەوە ئەو عەرزە پـــانو تەختە، خڕبێت؟! ئەگەر عـــەرز خڕە، بۆ جارێک ئەمن لە کاتی نووســـتنێ خلۆر نەبوومەوە لای دەرکی حەوشـــەی؟ لەوەتای بە بیرم دێ هەر دیومە ڕۆژ لـــە داری دێدەوانی هەڵدێو لە قەرەچووغی ئاوادەبێت! هێندێک لەوانەی گوێیان بۆ وتارەکەی مامۆســـتای ڕاگرتبوو، لەترسی گومڕابوونی منداڵەکانیان خەم دایگرتن. لە بەینی یەکتری دەیانگوت: مامۆستای دەربکەین، بۆ دینەکەمان باشە، قابیلە مەلای دووازدە عیلم ئەو هەموو قورعانەی لە ســـینگیدایە، درۆی بکات و ئەو سەرکۆتە[1] ڕاســـت بکات؟ ئاغا یەکلاق، دەلینگی شـــەروارەکەی گرێدا، بە شـــەقرەکانی بنهەنگڵی لەو ســـەری دیوەخانێ دەچووە ئەوســـەری. بە وتارەکەی مەلای دڵی ئـــاوی نەخواردبۆوە، یەک بەخۆی نەڕاندی و لـــە خزمەتکارانی ڕاخوڕی: بڕۆن هەر ئێســـتا مەلای گوندیم بۆ بێنن، بە یەکەوە تەگبیرەکی لەو مامۆســـتا بێ ماریفەتەی بکەینو پەشیمانی بکەینەوە لەوەی کچی شێتو شوورەکی بەسەر

---

١. سەرکۆت: سەرڕووت.

کوڕی ئاغایدا گەورە نەکات! لەبەرخۆشـیەوە دەیگـوت: «بزن هەجەلی بێت، نانی شـوانی دەخوات!» شـەرتبێ دەبێ منداڵەهورتکەی ئاواییت لــێ هان دەم بکەونــە دواتو بە پەلارە بەردان لــەو مەکتەبەت دەرپەڕێنم، ئەوجا ملت بشکێنەو بڕۆ لە شاری هەر بڵێ عەرز خڕە!

کاکەڕەش بە نیازی ســەفەرێک بوو، هیدۆ، دەتگوت دەزانێ کاکەڕەش چی لە خەیاڵدایەو بۆ هێندە لەو ســەفەرە مکوڕە! بۆیە هیچ لێی نەپرسی بۆ کوێ و بۆچی دەچی؟ لەوە دڵنیابوو کە ئەو، ســەفەری بێخێر ناکاو بە دوای شــتی پڕوپووچ ناکەوێ، تەنها بە ســەیرکردنی چاوە پڵنگیەکانی، لەوە تێگەیشت بۆ شــتێک دەگەڕێ کەڵکدارە. هیدۆ، بەتاســەوە گوێی بۆ گرتبوو کە دەیگوت: گەڕانو شــارەزابوون چاومان زیاتــر دەکاتەوە. ناکرێ ڕۆژێک نەچین بۆ ســەر چیای قەرەچووغــیو نەزانین لەو دیوی ئەو چیایە چی دەگوزەرێو کێی لێیەو بــە چییەوە خەریکن! کاکــەڕەش، دەمێک بوو کەڵکەڵەی چوونەســەر چیای قەرەچووغی لە سەریدا بوو.

کاکەڕەش، ناوی چەند کەســێکی گوندەکــەی خۆیانی هێنا، کە لە هەموو عومریــان لــە گوندەکەی خۆیان و گوندی ئاشــەکە زیاتر، هیچ شــوێنێکیان نەدیبوو، نەخاســمە ئەودیوی قەرەچوغی، کە هێندە دوور نیەو ئەگەر خۆش بڕۆی، دوازدە ســەعاتەڕێ لە گوندەکەی ئەوانــەوە دوورەو زیاتر لە دە گوندیان کەوتۆتە مابەینێ. کاکەڕەش دەیەویست بزانێ داخوا ئاوی لێیە؟ ئەشکەوتی هەیە؟ داروباری لــێ دەست دەکەوێ؟ بۆئەوەی ڕۆژی لێقەومانێ بتوانن پەنای بۆ ببەنو خۆیانی تێــدا بپارێزنو یاخیبوونی خۆیــان ڕابگەیەنن! دوا بەدوای ئەوانیش دەستەکەیان، دوو کەس دوو کەس بچن و شارەزای ئەوێ بن. دەیگوت:

مرۆڤ بە گەڕانو شـارەزابوونو زانیاری لە سـەر دەوروبەری خۆی، بیرو بڕیاری حەکیمانەی فراوانتر دەبێت، لە ڕۆژی تەنگانەو پێشـهاتە لەناکاوەکان، سەری لـێ ناشێویو دەستەپاچە نابێت! هەستێکی خۆشیشە مرۆڤ کە دەبینێ لە خەڵکی دەوروبەری شارەزاترو لێهاتووترەو چاوساغییان بۆ دەکات!

کاکەڕەش لەسـەر هـەق بوو، چونکە زۆر کەس هەبـوو وایدەزانی دنیا لە گوندەکەی وی ڕەت نابێو، لەو دیـوی قەرەچوغی دنیا کۆتایی دێ! زۆر کەس هەبوو هەتـا مردیش، لە ئاقـاری گوندەکەی زیاتری نەدیبوو. هیدۆ سـەری بۆ قسـەکانی دەلەقاند. هیـدۆ، پیاوێکی زۆر بەجوڵـەو هەڕەکەت بوو، قەت نەیدەتوانی تاوێک داسـەکنێ، تەنانەت لە ژووری ماڵێش! کاکەڕەش زوو زوو دەیگوت: هیدۆ بە حەوت مانگی لە دایکبووە، نەیتوانیووە نۆ مانگان چاوەڕێ بکات، پەلەی بووە بێتە نێو خێوەتە شڕەی دنیا!

شـەوی مابوو لە گونـدی وەدەرکەوتن، هەر یەکەو نووردییەنانێکو سـێ هێلکەی کوڵاویان لەنێو پشـتێنەکانیان گرێدا. کاکـەڕەش گیرفانەکانی پڕکرد لـە داندۆکو قەسـپ. بەدەم ڕۆیشـتنەوە، هیـدۆ لە باخچەکـە چەند بنە تەڕەپیازێکی هەڵقەند. مانگ بە ئاسـمانێوە تریفەی دەڕژاندە سـەر زەوی. لە خوار دەراوی ژنان، لە سـەر گۆمێ شـوانان، هیدۆ پیازەکانـی لە ئاوەکە وەردا، ئاوەکە دەلەریەوەو پێلـی ورد وردی دەدا، وێنەی مانگو ئەسـتێرەکان لەگەڵ پێلی ئاوەکە سـەمایان دەکرد. گرشەی مانگو ئەسـتێرە ڕژابوونە نێو ئاوەکە. کاکەڕەش گوتی: هەسـتە با بڕۆین ڕێمان دوورە، ئەگەر شـەوڕۆینی بەدەمەوە نەدەین ناگەینە قەرەچووغی.

هەردووکیـان، یەکـەو دەمانچەیەکـی چواردەخۆریـان لەبەرپشـتێنیان

حەشـــارداوە. جگە لە دەنگـــی قیرەی بۆقەکانی دەو ڕووباریو خشـــپەی پێیان بەولاوە، هیچ دەنگێکی دیکە نابیسترێ. هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە کاکەڕەش چنگە قەســـپێک و سێ ســـەرکە داندۆکی دایە هیدۆی، بۆ ئەوەی لە جیاتی قاوەڵتی بەیانی، بە دەم ڕۆیشـــتنەوە بیخوات. قەســـپ و دانـــدۆک، لە کاتی پیادەڕێ کردن، وزەو تین دەبەخشن. شەوگەڕانو چوونەدەریش، هەستێکی وات دەدەنێ، شـــانازی بە خۆتەوە بکەی کە جیاوازی لەو خەڵکە دەســـتوپێ سپیانەی لەنێو نوێنەکانیانو شـــوێنی گەرم لە خەوێکی قووڵدانو هیچ بەرپرسیارێتییەک لە ئەستۆ ناگرن و، دەستبارێک لەگەڵ ئەوانەی تەمەنیان بۆ گۆڕینی ژیانی ئەوان، تەرخان کردووە، ناگرن!

تاریکی کلکی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشاو مەیدانی چۆڵ کرد، ڕووناکی هات. کاکـــەڕەش گوتی: هەموو تەقەللاو ئامانجمان ئەوەیـــە کۆمەکی لێقەوماوان بکەین تا بەلایەنی کەمەوە خۆیان بناسن، باوەڕیان بە خۆیان قایم بێ، دەروێشی دادپەروەری بن، تـــۆوی خەباتکردن لە ناخیاندا بچێنین، بۆ ئەوەی بوێرو دلێرو دامـــەزراو بـــن، تاقەتی گۆڕینی ژیانـــی خۆیانیان بێتەوەبەر. تەماشـــایەکی چاوەکانی هیدۆی کردو گوتی: ئێمە بارێکی قورســـمان خســـتۆتە سەرشـــانی خۆمان، هەرچەنـــدە ڕێیەکی دژوارو پـــڕ خەرەندە، بەڵام دەبـــێ بەئەمانەتەوە بیگەیەنینە جێی خۆی. ئەوکەســـەی بچێتە ژێر ئەو بارە قورســـە، پێویســـتە توانای دەستبەرداربوونی ژیانی تێدابێت!

لەگەڵ قسەکردندا، وەک با ڕێگا دەبڕن، ڕێ خۆی لەبەریان ناگرێت. بە هۆی بنچکە خڕنووکو حوشـــترالووکو کەبەر، لـــە ڕێ لانادەن. بەرپێ نەرمە، نە ئەوەتـــە قوڕە پێڵاوەکانیان بگرێت، نەهێندەش وشـــکو ڕەقـــە بەرە پێیان ئازار

بدات. لەگەڵ شەبەقی بەیانی، لەو کاتەی سەگ و گورگ لێک جیادەکرێتەوە، بایەکی سارد خۆی لە بناگوێیان دەخشێنێ، دەنگی کەناچەو تیترواسک ئەو نێوەیان پڕکردییە، پۆپیتە سلێمانەش گوریس گوریس لە پێشیان سەما دەکاتو شوێنی خۆی دەگوازێتەوە بۆ پێشتر. لەناکاو، لەبن پنچکە خڕنووکێک بارەکەروێشکێکی بچووکی سەپسێنکە[1]، لە لانێ دەرپەڕی. هیدۆ گوتی زۆر سەیرە، ئێستا کاتی بارە کەروێشکی ئاوا بچووک نییە، هەبێو نەبێ، یان دەبێت نەخۆش بێت یان دایکی درەنگ زاوە!

بەرلەوەی خۆر گەردنی خۆی بخاتە سەر زوورگەزراوی، ئەوان، ئاقاری سێ چوار گوندیان بڕیوە. ئێستا تیشکی خۆر، وەک گەردنبەندی ئاڵتوونی لە گەردنی بەرزی ئاشی بایو دووندە بەرزەکانی چیای قەرەچووغ هاڵاوە. هەتاوەکو لە پەنای زوورگەزراوی سینگی خۆی زیاتر هەڵدەکێشێ، تیشکی لە قەدو باڵای قەرەچووغی زیاتر بەرەو بنارو پێدەشتەکانی کەندێناوەی دادەکشێ. ئێستا دروست لەو کاتەدا چیای قەرەچووغ، وەک کێوێک لە زێڕ خۆی نمایش دەکات!

بە هەرەداوان خۆیان لە بناری قەرەچووغی نزیک کردەوە. کاکەڕەش، بە هۆی قورسی کێشی، ماندوو بووە، دەڵێ: پێت چۆنە هەروا جغارەخۆرێک بحەسێینەوە؟ نایشارمەوە زۆر ماندوو بوویمە! هیدۆ گوتی: هێز بدە بەرخۆت، وا چاکە سەرکەوین، لەبەر دوو شت، یەکەم: بۆئەوەی لەو بنارە کەس نەمانبینێ، دووەم: بچینە شوێنێکی بەرز دانیشین بۆ ئەوەی دنیامان لێوە دیاربێتو ئاوڕێک لە دوای خۆمان بدەینەوە. بەردەوامییان بە ڕێگا پێچاوپێچەکەیان دا.

---

١. سەپسێنکە: ئەو بارەکەروێشکەی کە سەگ بەدوایەوە دەپسێت و نایگاتێ. سەرنج: بارەکەروێشک: بێچووەکەروێشکی چوار پێنج مانگە.

ڕێی سەرکەوتنو گەیشتن بۆ قەرەچووغە، هەر لە لایەکەوە نییە، لە زۆر لاوە بزنەڕێی پێچاوپێچی دەچێتەوە سەر.

لە نێوقەدی چیا، لە سەرەپێچێکی توولەڕێیەکە دانیشتن، ئاوڕیان لە دوای خۆیان دایەوە، بینییان چ دەشتێکی پانو بەرینیان لە دوای خۆیان جێهێشتووە! هیدۆ گوتی: بنیادەم تەیری بێباڵە! ئاقاری گوندەکانو تخووبی زەوییەکان، تابلۆیەکی هێڵکاریی ناوازەیان نیشان دەدا. مارپێچی کەندو گردە دەستکردە تووڕەکەڕێژەکان، وەک لە سواری فڕۆکە سەیری ئەو دیمەنە ڕەنگاڵەییە بکەی، ئاوا بوو.

دووبارە بە ڕێگا پێچاوپێچەکاندا هەڵزنانەوە، گەیشتنە سەر چیای، لەنێو چیای، چڕەدوکەڵێکی شین، باریک بەرەو ئاسمان وەک ستوون هەڵدەکشاو لوولی دەخوارد، سەرنجی ڕاکێشان. بوونی ئاوەدانی لەو شوێنە یارمەتیدەر بوو بۆ بەدەستخستنی زانیاری، ئەوان یەکەمجاریان بوو سەر ئەو چیایە ببینن، کەسێکی شارەزا بۆ ئەوان ئومێدبەخش بوو، بۆئەوەی ناوی شوێنەکانو گوندەکانی دەوروبەری چیایەکە بزانن و چاوساغییان بۆ بکات.

بەرەو دوکەڵەکە دەڕۆیشتن، لە ئاسۆگەی تەپۆلکەیەک سەرکەوتن، بینییان لەو بانایییە[1] نەوراییەک باوەشی بۆ سەرەوە گرتۆتەوە، نەبادا ئاسمان بەربێتەوە، بە غەرەبەردی هەڵچنراو شوورەو حەسارکراوە. هەر زوو سەگی شوانەکان لنگیان دانێو پێیان حەپینو سەرنجی شوانەکان چووە سەر دوو کەسی ڕێبوار. یەک لە شوانەکان کوڕێکی گەنج بوو، گورجوگۆڵ وەک تەشی بادراو هەڵدەسووڕا.

---

١. بانایی: زەوییەکی بڵند کە ڕووبەرەکەی گۆڕ و تەخت بێ.

دیاربوو هێشتا تیغی لە ڕیشی خۆی نەدابوو، یەکپێ لەسەر قاپووتەکەی بڵند بوو، گۆپاڵەکەی بەدەستەوە گرت، بۆ ئەوەی سەگەکان لە میوانەکان پاس بکات. بە پیرییانەوە چوو، بەدەم ڕۆیشتنەوە لە سەگەکانی ڕاخوڕی، سەگەکان ملی گوێڕایەڵییان بۆ شوانەکە لەسەر عەرزی دەسووی‌و کلکەسووتەی وەفاداری‌و خۆشەویستییان بۆ لەقاند. شوانەکەش گۆمکەگۆپاڵی خۆشەویستی‌و ئافەرینی لە پشتەملی دان، سەگەکان بە پووتانەوەی چاویان‌و نووسکانەوەیان، دیاربوو بە زمانی جەستە دەیانگوت: دەسەڵاتی تۆمان نییەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانتین، ئەگەرنا ناهێڵین یەک بست لە سنووری قەڵەمڕەوی پاسەوانیی ئێمە نزیک ببنەوە، بەس دەستی تۆمان شکاوە!

لە دوای چاک‌و چۆنی‌و بەخێرهێنانیان، وەک ڕێزگرتنێک، قاپووتەکانیان کە بۆ دانیشتنی خۆیان لە دەوری ئاگرەکە ڕاخستبوو، لەگەڵ پاککردنەوەو دەست پێداهێنانیان، بۆ میوانەکان چۆڵکرد لەسەریان دابنیشن.

ئاگردان خڕنووک‌و کەبەرو پەرۆشەی لەبەرنراوە، کترییەکی ڕەشی هێندەی سەلکەگایەک، تەنی‌و دوکەڵگرتوو، قەپ و قۆپاو، فووڕەی هەڵمی لە لوولەی دێتەدەرێ، وەک ئەگجۆزی قیتاری خەڵووزی بەردی، هاتۆتە جۆش و جارجار سەرەکەی هەڵدەداتەوە تا هەناسەی وەربگرێ. یەک لە شوانەکان بە چنگی خۆی چای لە کترییە ڕەشەکە کرد.

شوانەکان چوار کەس بوون، هەریەکەو لەبەر مێگەلەمەڕێک بوون، بۆ شەوین‌و شیوەخوار شەوبەکێوبوون، پێکەوە هەماهەنگ بوون. تێشتەبەرەو خورجێنیی نان‌و پێخۆریان کردەوە، فەرموویان لە میوانەکانیان کرد. کاکەڕەش‌و هیدۆش نووردییە نان‌و هێلکەی کوڵاو و تەڕەپیازیان دەرهێنا. لەسەر سینگ‌و

لەنێــو ئامێزی چیای قەرەچووغ، نانێکی بەلەزەتیان خوارد. لە دوای نانخواردن قۆغە چینکۆیەکانی چایەخواردنەوەیان دەرهێنا، ســەروچای ڕەشیان بەسەردا کرد. هەندێکیان بۆ سێ قۆغەو چوارو بگرە زیاتریش هەڵکشان، قۆڕەیان لە بنی کترییە ڕەشی هێنا ســووکنایی دڵیان دانەکەوت. لەگەڵ کۆتا چا سەرقەپاغی کتری بەربۆوە، یەک لە شوانەکان کترییەکەی پڕئاو کردەوەو لەبەرئاگردانەکەی ڕاکردەوە، دیاربوو هێشــتا فتراقی لە چایەخواردنــەوە دانەکەوتووە، گوتی: با بکوڵێ دوایێ عەسرەچایەکی دەخۆینەوە.

شــوانەکان ئەوەی لــە هەموویان بــە تەمەنتر بوو، لە پەنجــاکان نزیک ببــۆوە، دەروێش مەلکۆیان دەگۆتێ. دیاربوو هیچ ئاگای لە ســەردەمی خۆی‌و ڕووداوەکانی دەوروبەری نەبوو، قسەکانی لەسەریەک نەبوون. ئەوەی سەرەدەری لێ دەردەکرد تەنها شوانی بوو! ئاخر لەوەتای دەستی گۆپاڵی گرتبوو، شوان بوو. قسەو وەڵامەکانی هەر هەڵمو بەڵم بوو، دەبوایە بۆ خۆت شتێکی لێهەڵکرێنی! هەر زوو زوو دەیپرسی: زەحمەت نەبێ ئیسمی شەریفت چییە؟ هەموولایەک بێمزەرەتن؟ ســەرەتای هەموو قســەیەکیش دەیگوت: عەیب نەبێ بیلا مانێ ســوعالەک: ئەرێ ئەو زوورگــەزراوەی لاینگۆ[1] لــەوەڕی چۆنە بۆ مەڕی؟ لاینگۆ مێگەلی گەورەی لێیە؟ ئەرێ لەو دیوی زووریش دنیای لێیە؟ ئەوێش هەر عایدی خواو پێغەمبەرییە، وە نییە؟

مەلکۆ هەموو تەمەنــی خۆی لەبەر مەڕی گوزەراندبوو، هەموو شــانۆ پیلــی داچۆڕابوو، قامەتی شــەتو خــوار بووبوو، بەلای چەپدا ســووڕابوو،

---

١. لاینگۆ: لای ئەنگۆ، لای ئێوە، کن ئێوە، کن وە.

پشـتێنێکی باریکی هێندە بەتوندی لە نێوقەدی خۆی بەسـتابوو، دەتگوت هەمبانەیە، لایەک بروێش و لایەکەی دیکە ساوەریان تێکردووە و نێو قەدیان بەسـتوە! لە ڕۆیشـتنێدا نێوقـەدی گۆپاڵەکەی توند دەگـرت، لای گۆمکی دەخستە پێشەوە، هەمیشە بە لای پێشـەوەدا ڕەتی دەبردو دەهات سەرانگرێ بێ، سـەری لە پێشەوە دەڕۆیشـت، لای قوونی نەدەهاتەوە دووێ، پشتەملی خۆی دەردەپەڕاندو چەناگەی بە سـینگییەوە دەقرمسـاند، نێو لەپی هەردوو دەسـتی زۆریان خاکەساریو کوێرەوەری پێکرابوو، سـەرما بردبوونی، قەڵیشی بوونو زبر بوون، وەک پشـتی ماسـی جوری پوولەکەدار پەرپەڕ ببوون. هیچ ژنەقەرەجێکی فالگرەوە نەیدەتوانی فاڵی بـۆ بگرنەوەو توولەرێگا باریکەکانی لەپی بخوێننەوە. کە دەسـتی بە شـەروارەکەی دادەهێنا، وەک ئەستێو بەرد براچەو جەرەقەی لێهەڵدەسـتا، هەرکەسێک بۆ تەوقەکردن دەستی لە دەستی نابایە، وەک ئەوە وابوو ژووژکی گرتبێت!

دەروێش مـەلکۆ پرسـیارەکانی تاک تاک نەدەکـرد، بەڵکو لێکدا لێکداو ڕانەدەوەسـتا وەڵامی پرسیارێکی وەربگرێتەوە، پرسیارێکی دیکەی دەکرد، وای لێهات، کاکەڕەشو هێدۆ بەجۆت وەڵامیان دەدایەوە، پرسیارەکانی وەک وڕێنەی تالێهاتـووان وابوو. چاوی لەسـەریەک دادەناو بێ نێوبـڕ دەیگوت: عەیب نەبێ، بیلامانێ سـوعالەک! دەتگوت پێشـتر سـوعالی دیکەی نەکردووە! لەناکاو، وەک غایەڵەیەکی بە مێشکدا هاتبێت، دەستی بۆ کیسەتووتنەکەی بەرپشتێنی درێژکرد، دەریهێناو پەڕەسـیغارێکی لە دەفتەرە بافرەکەی کردەوە، لێـوی پەڕەکەی بە زمانی تەڕکردو بە قەدەر قەیتانێکی لـێ کردەوەو کردییە کۆجیلـە، پڕ تووتنی کرد، لوولیداو هێندە پڕ تووتنی کرد، وەک مانگا گۆلکی

خۆی بلێسـێتەوە زمانی پێداهێناو تەڕی کرد، قوتـە دارجغارەکەی دەرهێناو جغارەکەی تێـدا باداو جێگیری کـرد. بە چیلکەدارێکی نیوەسـووتاوی نێو ئاگردانەکە دایگیرسـاند، چاوی لەسـەریەکتری داناو مژێکـی قووڵی لێداو گوتی: ئێ کاکە سـوعالەک! قەسـەم بەخوای ئەمـن قەرەچووغی خۆم بە هەموو دنیایێ ناگۆڕمـەوە! قەرەچووغ نەبێ ئەمن دەمرم! کاکە ئەنگۆ دەزانن ئێسـتا ئێمە چەند لە خوای بە نزیک کەوتوویـن! خوایە تۆبە گووم خوارد لە گووی سـەیان، ناماقووڵیم کرد! فووییێکی بە هەر چواردەوری خۆیدا کردو دوو سێ تفی کرد: شەیتانی لەعین ئەو زەللەی پێ کردم.

لە شانسی کاکەڕەشی ئەوە سـوعال نەبوو تەنها ڕاوبۆچوونو ڕوونکردنەوە بوو. دەروێش، هەر لە گۆترە نێوکی قسەکەی بە سوعال بڕیبوو!

لەگەڵ مژلێدان لە جغارەکەیو ئەو بایەی دەهات، کەلەکەی لای سـەرەوەی جغارەکەی ئاگری گرتبوو، بۆ لای دارجغارەکەی پێوەچووبوو، لە سـمێڵی نزیک کەوتبووەوە، لە کەلەکەی لای بنەوەی جغارەکەی هیچ خەبەر نەبوو، سپو ساغ بوو. لەناکاو جغارەکە ورگی دڕاو ئاگرو سـۆتەکەجغارەو تووتنی ساغو نەسووتاو کەوتنە سـەر ئەو شەروارەی هێندەی کونی سووتانی پێوە بوو بووبووە سەرەندو بێژینگ! دەروێش مەلکۆ گورج هەسـتایە سـەرپێو بەدەم یا ڕەسـولەڵڵا! یا ڕەسولەڵڵا! کەوتە خۆ تەکاندن، دەتگوت نارنجۆکی لە کۆشیدا تەقیوەتەوە! بە خۆتەکاندنەوە گوتی: عەیب نەبێ بیلا مەعنا سـوعالەک! کاکەڕەش گوتی: مام دەروێش مەلکۆ! سـووعالەکەت هەڵگرە بۆ دوایێ، ئێسـتا نۆرەی ئێمەیە پرسیاران بکەین!

ئەوجار وەختی ئەوەی بوو کاکەڕەشو هیدۆ پرسیاری خۆیان بکەن سەبارەتی

چیای قەرەچووغو دەورویەری، شوانێتیو مەڕ بەخێوکردنو مافی دەستمستی ماندووبوونی شــوان و... دیاربوو یەک لە شــوانەکان ئەو پرسیارانەی لەسەر بارودۆخی شــوانێتی، زۆر پێخۆش بوو، چونکە خۆی تێیدا دەبینییەوە، گوتی: ئەمن ئەتۆ دەناســم، بابم زۆر باسی تۆی بۆ کردووین! کاکەڕەش بە پێکەنینەوە گوتی: بابت بە چاکە باســی کردوویــن یان بە خەراپە؟ شــوانەکەش گوتی: ئاغاو چەلاوخۆری بەردەرکی دیوەخانی ئاغاکان نەبێت، کەس بەخراپە باســی تۆ ناکا! کاکەڕەش دەســتی ئافەرینی لەسەرشانی شوانەکە داناو گوتی: ئێمە هەموومان کێشەکانمان یەکنو هەریەکەمان بەجۆرێک دەچەوسێینەوەو یەک دەردمان هەیە! دەرەبەگایەتی وەک مۆتەکە خۆی بەسەرماندا کێشاوە، هەوڵی هەمووانی دەوێ ئەو زوڵمە لەسەرشانمان لابەرین.

دوو لە شــوانەکان لەبــەر مەڕی خۆیان بوونو شــوانی ماڵی خۆیان بوون، دووانەکەی دیکە بە شــەرتی ســاڵێک وەک رێنجبەر دامەزرابوونو لە دوای ســاڵەوەختێک شەرتیان هەڵدەهات، ئەو کات، شــەرتیان، یان نوێ دەکردەوە، یا لەلای مەڕدارێکی دیکە دەبوون بە شوان.

کاکەڕەش زۆر مەبەستی بوو بزانێ هەقی شوانییان بەقەدەر ماندووبوونیانە یان نا! یەک لە شــوانەکان بە دەرفەتی زانی نەهامەتیو هۆکاری شوانیبوونی خۆی بــاس بکات: ئەمن کوڕی گــەورەی ماڵی بابی خۆمــم، بابم هەتا بڵێی دەستکورتو نەدارە. لە ماڵێ، خێزانێکی زۆرین، ناچارم دەستباری بەخێوکردنی ئەو خێزانە قەوغەیە لەگەڵ بابم بگرم. هەر بۆیەشــە وازم لە مەکتەبێ هێناوە. بابم خەریکی کشــتوکاڵیە، ئــەو گەنمو جۆیەی دادەچێنێ بەشــی هەرەزۆری بۆ ئاغایە، ئەوەی بە بیســتی چــوارو دیوەخانانەو شــەقرچییانەو قاوەخۆرانە

وەریدەگری. زســـتانێ، ئاغا دەستکورتیی بابم بە فرسەت دەزانێ، کاتێک پارەی شـــەکرو چامان نامێنـــێ، ناچارە ئەو گەنمەی چاندوویەتی هەر بە شـــینی، بە ســـوودو ســـەلەم بە نیوەقیمەت بداتە ئاغا، لە بری پارەی شـــەکروچا. هاوینان ئاغا لەسەرســـەری حازر دەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو سوودو سەلەمەی لە زستانێ لەگەڵ بابمی کردووە، لە بنەتۆو باراش زیاتر هیچمان بۆ نامێنێتەوە. کە زستان هاتەوە، عەینەن تاس عەینەن حەمام! بۆیە ئەمن بووم بە شوان بۆئەوەی باری گرانی سەرشانی بابم سووک بکەم. هەر ئێمەش بەو دەردەوە ناناڵێنین، خەڵکی بێپارەی دیکە زۆرن! کاکەڕەش گفتو ڕاوێژی ئەو گەنجەی لـــێ خۆش دەهات، زانی ئەو گەنجە دەتوانێ زانیاری وردیان لەسەر قەرەچووغو دەوروبەری بداتێ، چونکە بە بەراورد لەگەڵ شوانەکانی دیکە، ئەو، زمانێکی پاراوو ڕەوانی هەبوو، داوای لێکرد هەندێک لە شوێنە دیارەکانی قەرەچووغی پێ بناسێنێ، ئەویش بەخۆشـــحاڵییەوە دەســـتی پێکرد: ئەو لووتکەیەی زۆر بـــەرزە، ئەوە دەیرێنێ بڵندی (ئاشـــی بای) بەردەوام بایەکی بەهێزی لێدێت، بیرێکی بە قووڵایی سێ مەتر بە بەرد هەڵنراوی لێماوە. دیواری نێو بیرەکە زۆری بەنێو یەکدا ڕووخاوە، دەڵێن زەمانی خۆی ئاشـــی بای لەسەر ئەو لووتکە بڵندە هەبووە، ئەوە بە بیری ئێمەو بابیشمان نییە.

هیدۆ، هەر گوێی لە ناوی ئاشـــی بای بوو، گوتی: ئەمن سەردەکەومو دەچم سەرخەوێک لە بڵندی ئاشی بای دەشکێنم، پێشینان گوتوویانە هەرچی لەسەر بڵندیی ئاشـــی بای بخەوێ، خەونی خۆش دەبینێو مرازی حاســـڵ دەبێ! دیارە هیدۆ ئەو قســـەیەی لە تێکســـتە فۆلکلۆرییەکانەوە وەرگرتبوو کە لە شاییو داوەتان دەگوترایەوە. وایدەزانی لە هەموو هەوران هەر بارانە:

**کاکە سەرێ من دێشی، غـەمان لێکرد هەڵلایە**
**دەچمە چیای قەرەچووغی سەر بڵندی (ئاشی بایە)**
**لەوێ لە خـەونێم دەدیت بە فکری من ئـەوهایە**
**دەیانگوت ماچی کیژان بۆ کوڕان تـەبەڕایـە**
**من تـەعجـوبم دەمینێ مـەلا فتـوای نـەدایـە**
**کۆلکەمەلایان بکوژن ئۆبـاڵ بـە ملم غەزایە!**

یەک لە شوانەکان گوتی: ئەو قاپووتەی لەگەڵ خۆت بەرە سەر بڵندی ئاشی، ئەگەر لەوێ بخەوی، بای سارده، سەرمات دەبێت. هیدۆ قاپووتی بەسەرشانی داداو بەسەرکەوتو کاکەڕەشو شوانەکانی لەنێو قسان بەجێهێشت.

شـوانەکە درێژەی بە قسـەکانیدا: ئەو شـوێنەی لێی دانیشتووین، ئەوە (هەوێزەخڕە)ی دەرێنێ[١]، شـوێنی ڕاگرتنەوەی مێگەلەمەڕو حەسـانەوەی شوانانە لە کاتی شەوینو شیوەخوارو شەویەکێویدا، وەک حەوشەو حەسار بە چیلەبەرد هەڵنراوەو دیوارکراوە. ئێرە ئاقاری گوندی خدرجیجەیە. ئەو گەلییە، گەلـی ئازیکەندی دەرێنێ، لە هۆ ئەولاش ئەشـکەوتی کامەلایە، ئەو بە لای قەراجییەوەیە.

ئەوەندەی زەینی بڕی کرد ناوی شـوێنەکانو گوندەکانـی دەوروبەری چیای قەرەچووغی بە کاکەڕەشـی گوتو ڕوونکردەوە. ئەو زانیارییانە بۆ کاکەڕەشی، زانیـاریو بەرچاوڕوونیـی باش بوون، سـەفەرەکەش هەر بـەو ئامانجە بوو.

---

١. دەیرێنێ: دەیڵێنێ، وای پێدەڵێن، وا ناوی دەبەن.

کاکەڕەش بینی شوانەکان مشوورو خەفتیانی ڕادانی مەڕەکانیان دەکەنو ڕۆژیان درەنگ کردییە، نەیویست لەوە زیاتر ماتڵیان بکا، هەم بۆئەوەی لەگەڵ هیدۆی بگەنەماڵی ئەنوەریو شـوانەکانیش بۆ لەوەڕاندن مێگەلەمەڕەکانیان ڕابدەن. کاکەڕەش ماڵئاوایی لێکردنو گوتـی: ئێمە چونکە ناگەڕێینەوە ئێرە، وا چاکە ئەو گەنجە تاوەکو سـەری بڵندی ئاشی بای لەگەڵم بێت، بۆئەوەی قاپووتەکەی لە هیدۆی وەربگرێتەوەو ڕێی چوونەخوارەوەشـمان پیشان بدا، ماڵتان ئاوابێت بۆ میوانداریتـان، ئەوجارەش بێمەوە، وەڵامی هەموو سـوعالەکانی دەروێش مەلکۆی دەدەمەوە، هەتا دەتوانی سوعالان کۆ بکاتەوە!

دەمێکـی باش بوو هیدۆ سـەرکەوتبوو، کە گەیشـتنە لای، لە خەوێکی قووڵدابوو، شنەی با کاکۆڵی دەبزاوت، بانگیان کرد: هەستە زەلام بێتەقە گیرای! ئەو قاپووتەی بدەوە ئەو پیاوەی با بڕۆین!

لەسـەر بڵندی ئاشی بای، هەرچەند دەیانویست بڕۆن، لـێ، نەیاندەتوانی دەسـتبەرداری تەماشـای ئـەو تابلۆیە خۆڕسـکو خودابیە ببـن، چاو لە تەماشاکردنی دەشتی کاکی بە کاکی قەراجو کەندێناوەی، تێر نەدەبوو.

کاکەڕەش سەری خستبووە سەر هیدۆی: دەبێ پێم بڵێی بزانم چ خەونێکی خۆشت بینیوە، ئاخر ئەتۆ ئێمەت بەجێهێشت بۆ ئەوەی بێی لێرە خەون ببینی! هیدۆش دەیگوت: چما ئەنگۆ هێشـتتان خەونی ببینم! گەیشـتنە سەرمو لە خەوتان هەستاندم.

هەتاوەکو چاو هەتەردەکا، گوند لە دوای گوند زەوی لە تەنیشت زەوی. کەندەکان ڕێگاو تخوویەکان دەبڕن، ڕیشۆڵە گەواڵەی دەکەن. کاکەڕەش بەر لە خاتر خواستن لە شـوانە گەنجەکە پێی گوت: سڵاوم بە بابت بگەیەنە، لەکن هیچکەس باسی

هاتنی ئێمە مەکە بۆ ئێرە! شوانەکە بەدەم وەرگرتنەوەی قاپووتەکەی و گەڕانەوە بۆ هەوێزەخڕەی، دڵنیای کردن کە باسی ئەو هاتنەیان ناکا.

کاکەڕەش و هیدۆ بۆ بناری چیای شـــۆڕبوونەوە، بڕیاریاندا ئەوشـــەوە بچنە ئەو گونـــدەی ماڵی ئەنوەری لێیەو شـــەوێ لەلای ئـــەوان ڕۆژ بکەنەوە. کات بەرەو ئێوارە ڕادەخوشـــی، بۆ چوونە ماڵی ئەنوەری، ڕێـــگا بە بەردەرگای ماڵی تەهای براگـــەورەی ئەنوەریدا تێدەپـــەڕێ. ژنی تەهای، خزمی کاکەڕەشـــییەو هێندەی برایەکانی خۆشدەوێ، قەت ناوی ناهێنێ و هەر پێی دەڵێ ماڵەباب[١]، کاکەڕەشـــیش وەک خوشکی گەورەی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات و، هەر پێی دەڵێ خوشکی لە داک و بابی!

ژنی تایـــن لەبـــەردەرگای خۆیان، کە چـــاوی بە کاکەڕەش و هیـــدۆی کەوت، شاگەشـــکە بـــوو، منداڵێکی ســـاوای لەنێـــو بەرامپیلەکەی بە پشـــتێوە بوو، منداڵەکەی بە پشتی خۆیەوە ڕاست کردو توندی کردەوە، بە گفتولفتێکی شیرین و خوشـــکانە گوتی: یاخوا بەخێربێن ماڵەباب! ســـەر هەردووک چاوی خوشکی خۆتان! کاکەڕەش و هیدۆ گوتیان یاخوا ڕووت سپی بێ خوشکی گەورە! لەگەڵ ئەو قسانە گەیشتنە ئاستی یەکتری، ژنە شان و پیلی هەردووکیانی ماچ کرد، ئەوانیش دەستی خۆیان لە سەر سەری وی ڕاگرت و پشتی دەستی خۆیان ماچکرد.

بـــە دەم فەرموو فەرموو وەرنە ژووریٰ ئێســـتا تەهاش دێتەوە، دەســـتی بە ئاڕاستەی ژووریٰ و بەدرەقەکردنیان[٢]، ڕاداشت. کاکەڕەش گوتی: دەچینە ماڵی

---

١. ماڵەباب: کینایە بە کەسوکاری ژن. ژن بە کەسی زۆر نزیک و خۆشەویستی دەڵێ، بە مانای تۆ ئەندامێکی ماڵەبابمی.

٢. بەدرەقە: ڕێگانیشاندان و هامڕاییکردن بۆ شوێنێک.

ئەنوەری شـــووبرات. ژنی خانەدانو خزمدۆســـت، بەو قسەیەی هەر بەجارەکێ تووڕەبوو: بەســـەری بابـو برایانو مەرقەدی شێخ نوورەدینی بریفکانی، نایەڵم یەک شـــەقاو لێرە بڕۆن، هەر ئێســـتا ئەنوەری شووبرامیشتان بۆ بانگ دەکەم، تەهاش حەدوســـەدی هاتنەوەیەتی، هەربینا پەیدابـــوو، ئاخر ماڵەباب چۆن دێڵم بڕۆن! کەڵەبابەکی هێندی گیســـکەکم کوشتۆتەوە، ئەو گۆشت کەڵەبابە هەر قابیلی ئێوەیە، ئاخر لە پار هاوینێوە نانو شـــێوی دەستی خوشکی خۆتان نەخواردییـــە! ئەوانیش چوونە ژووری دانیشـــتن. ژنە ئەگەر بابـو براو تەواوی عەشیرەتی خۆی میوان بان، هێندە کەیفخۆش نەدەبوو. هێندەی بڵێی یەکـو دوو منداڵێکـــی بـــە دوای ئەنوەری شـــووبرایدا نارد بێت لـــە لای میوانەکان دابنیشـــێ، هەتا وەکو تەهای مێردی دێتـــەوە، ئەویش خەریکی ئامادەکردنی خـــواردن بێت. هەر لەگـــەڵ گەڕانەوەی منداڵەکەی ئەنوەریـــش وەژوورکەوت، دوای چـــاکـو چۆنیو ئەحواڵپرســـین هیدۆ نارەحەتیـــی پێوەدیاربوو، چونکە لەو کاتەی چوونە نێو گوندی، کوتکـو ســـنگی لووتیان بە لووتی حەمەزیادی کەوت، ئەویش زانی بۆ ئەوشـــەو میوانی ماڵی تەهان، خستنیە بەرچاودێری بۆئەوەی دڵنیابێت ئەوشـــەو لە ماڵی کێ ڕۆژ دەکەنەوە، ئەوەی لە ئاسمانێ بە دوایدا دەگەڕا لەســـەر عەرزی هاتۆتە بەردەستی! هێندەی پێخۆش بوو وەک هەنگوینی لـــە دارێدا دیبێتەوە! هیدۆ گوتی: هەرچەند جاری ئەو خوێڕییەی دەبینم مووی ســـەرم دەبنە سووژن، زۆر ســـەغڵەت دەبم. ئەو ژنتڕبابە بەڵایەو خەڵکی لە زەواق نایە، کەســـێک نییە ئەو خێرەی بۆ خۆی بکاتو گوللەیەکی لە بنهەنگڵی بدا، ئۆباڵ بە ملم کوشتنی لە نوێژێ فەرزترە! دڵم شتێکی خراپم پێدەڵێ، ئاخیری خێربێ! درێژەی دایە: حەمەزیاد غەددارەیەکی پۆرسەعیدی

نوێی هێندە ڕەشــی پێبوو دەتگوت ماری ڕەشە، ئاخر ئەو بەرەڵایە لاتە، تازە لە سەر ئەسپ دزینێ لە گوندەکانی قەراجی گیرابووا ئێستا بیسووتێنی بۆنسۆی لێنایێ(١)، ئەو غەدداره نوێیەی لە کوێ بوو؟!

کاکەڕەش گوتی: داخوا چ ئاغایەک بۆی کڕیوە یەکێکی بۆ بکوژێ. ڕاستە، ئەمنیش لێی ئەمین نیم پشــتی تێبکەم، وا چاکە هەتا وەکو ماڵنووستنان لە ماڵی کاک تەهای بین، بۆ نووستنیش دەچینە ماڵی ئەنوەریو شوێنەونکەی دەکەیــنو جێگامــان دەگۆڕیــن! بێئاگا لەوەی ئەوشــەو گوند لــە غەدرێک هەڵدەکێشرێ!

ڕۆژ، سێ چوار باڵی ماوە ئاوابێ، زۆر شت هەیە قسەی لــێ بکەن، لــێ، دیتنی حەمەزیاد لێی تێکدان.

حەمەزیاد، لە تەمەنی هەشت ساڵیدا بوو کە باوکی کەوتبووە بەر برووسکی هەورەتریشقەو مردبوو، هەر لەو ساڵەدا دایکی مێردی بە پۆلیسێک دەکاتو بەبێ حەمەزیاد بۆ شاری ئۆغر دەکاتو گوند بەجێدەهێڵێ.

حەمەزیــاد هــەرڕۆژەو لــە ماڵێک نان دەخواو هەرشــەوەی لە شــوێنێک دەخــەوێو ڕۆژ دەکاتەوە. لــە ناز و پەروەردەی خێــزانو خوێندن بێبەش دەبێت. ماڵەخزمەکانــی زۆر هەوڵــدەدەن جێگای دایــکو باوکی بــۆ پڕبکەنەوە، بەڵام بەهۆی لاساری، ئامۆژگاریی کەســیان لە گوێ ناگرێو هەموو ڕەفتارە دزێوەکانی منداڵێکــی بەدخوو لە خۆیدا جــێ دەکاتەوە. هەر لە کۆتردزیــنو دەرهێنانی بەچکەچۆلەکەو پەرەســێلکەی سۆرەساقەو سەر هەڵقەندنیان، یان سەلکەسلقی

١. بیسووتێنی بۆنسۆی لێنایێ: ئاماژەیە بە پیاوی زۆر ڕووتو ڕەجاڵ و نەدار کە جلێکی وای لەبەردانەبێ کە بیسووتێنی بۆنسۆی لێبێ!

دەکوڵانــدو بۆ ســەگانی فڕێ دەدان، کــە گازیان قەپیان لێــی دەدا دەیانقوڕاندو هەڵدەهاتن، ددانەکانیان هەڵدەوەرا. حەمەزیاد هێلانە نەدەما لە بنگوێســوانەی خانووان دەســتیان تێ ڕۆنەکاو هێلکەکانیان نەشــکێنێ، نییــەتو توانایەکی شەیتانی لە بوونیدا هەبوو، وای بەسەر هاتبوو ئەگەر قورئانت بدابایە بۆ مەلای بەرێ، لە ڕێگا چوارپەڕی لێدەکردەوە! هەرشتێک بدزرابایە لە نەدیتە دەیانگوت: حەمەزیادە! شــۆرەتێکی پیســی بۆ خۆی پەیداکردبوو، تا وای لێهات لە دزینی مریشــکەکورکی ســەر هێلکانی تێپەڕاند بۆ گیســکو کاوڕو بگرە گۆلکیش. لێــرە دەیدزیو لەولاتر دەیفرۆشــتنەوە. لە تەمەنی نەوجەوانــی دوو چەقۆی لە هاوتەمەنێکی خۆیدا، بۆ ماوەیەک گیرا، ئەو گیرانە وای کرد زۆر کاری نابەجێی دیکە بکات. لە دوای ئازادکردنی لە حەپســخانەی، ماوەیەک خۆی ون کرد، کە ســەری وەدەرنایەوە، ئەســپێکی دزیبوو هێنایەوە گوندی. لە ســواریی ئەسپ، هێندە جاقی[1] و مەعلان بووبوو، بەڕووتی ئەسپسواریی دەکرد. حەمەزیاد پێ بەپێ ئیشەکەی خۆی دەگۆڕی لە خراپەوە بۆ خراپتر. ئەو ماوەیە بە ئەسپدز ناوی دەرکردبوو، ئەسپێک لەوســەری دنیا بدزرابایە دەیانگوت: کاری حەمەزیادییە! وەک دەرمانی چاوێشــەی بەدوایــدا دەگەڕان بۆئەوەی بزانن لــە کوێ خەریکی فرۆشــتنیەتیو لێی بســتێننەوە. تا وای لێهات بە پارە تەقەی لە ماڵان دەکردو کلکــی کەرو مانگای وەک ئەتک پێکردن دەبڕی. بەس پارەت بدابایە ئێســکو پرووسکی بابی خۆی بۆ لە گۆڕەکەی دەردێنایو مەمکی داکی خۆی دەبڕی!

ئــەوڕۆژە لە دەشــتی قەراجی، لە دیوی باشــووری چیــای قەرەچووغی،

---

١. جاقی: قاڵبووەوە. جا بۆ هەر بوارێکی ژیان بێ بە چاکو خراپ.

لە گوندێک ئەسپێکی ڕەسەنی بە ناوبانگی بەرچاو دەکەوێ کە لە دەرێ بەستراوەتەوە، هەر دەمودەست ڕێشمەی دەکاتەوەو بەرووتیو بێ زین خۆی داوێتە سەرپشتیو دوو پاژنەپێ لە تەنگەی ئەسپی دەداو ئەسپ لە خۆی دەنووسێ! ئەو ئەسپە لە ناوچەکە ناوبانگی دەبێ کە هێندە بەغارە، هیچ ئەسپێک تۆزی ناشکێنێ[١]. ماوەیەک بەدوای دەکەون، هەر زوو لەبەر چاوان ون دەبێتو خەڵکەکە دەگەڕێنەوەو لە گرتنی بێئومێد دەبن. هەناسەی دڵنیایی هەڵدەمژێت. بەهۆی ئەوەی ئەسپەکە یەک بەغارترین ئەسپی ناوچەکەیەو هیچ ئەسپێک نایگاتێ، دووەم لە شوێنی ئەسپڕفاندنەکە زۆر دوورکەوتۆتەوە، بۆیە، ئەوەی بیری لێناکاتەوە گرتنیەتی. بەڕێکەوت برای خاوەن ئەسپەکە دروست لەو گوندە میوان دەبێتو دوو زەلامیشی لەگەڵ دەبێ. حەمەزیاد دەیەوێ لە ماڵێک نان بخواو پشوویەک بدا، یەک لەو دوو زەلامە، دەبینێ ئەسپەکە لە پێش دەرگای ماڵێک بەستراوەتەوە، یەکەمجار وا دەزانن خاوەنی ئەسپەکە هەر خۆی میوانی ئەو ماڵەیە کە ئەسپەکەی لێ بەستراوەتەوە، دواتر دەکەونە گومانەوە: ئەو ئەسپە بۆ زین نەکراوە! لە ماڵەکە بە ژوور دەکەون کە چاویان بە حەمەزیاد دەکەوێ پێی دەڵێن زەحمەت نەبێ تۆ خاوەنی ئەو ئەسپەی؟ ئەویش زۆر بە باوەڕبەخۆبوونەوە دەڵێ: بەڵێ! ئەوانیش حەمەزیادی بە ئەسپەوە دەگرنو بە قۆڵبەستراوی دەیبەنەوە قەراجێ، ئەو شوێنەی ئەسپەکەی لێ دزیوە، لە دیوەخانی خاوەن ئەسپەکە بە قۆڵ بەستراوی بەندی دەکەن. بەر لە هەرشت وەک ئەتککردنێک سمێڵ و بڕۆی دەتاشنو سووکایەتی پێدەکەن.

١. تۆزی ناشکێنی: نایگاتێ، تەنانەت ناگات بەو تەپوتۆزەش کە لەدوای بەجێدەمێنێ.

حەمەزیاد، لەو کاتانەی بۆ نانخواردن یان هەر کارێکی دیکە دەستی دەکەنەوە، غەریزەو خـــووی خراپەکاری، ئۆقرەی لەبەردەبڕن، تیغێکی لە گیرفانی دەردێنێ لە هەر چواردەوری خۆی بەو مافوورانەیدا دەهێنێ کە لەســـەریان دانیشتووە، بێئەوەی دیاربێت، هەموو مافوورەکە زوێر زوێر[1] دەکات، بۆئەوەی ئەو شەوە بەئاســـوودەیی بخەوێ! حەمەزیاد بەو بەندکردنە زۆر هەراســـان بوو، بە دوای ڕێگەیەکدا دەگەڕا بە هەرنرخێک بێت لـــەو تەڵەیەی کە تێیکەوتووە رزگاری بـــێ. بە ڕێکەوت، ئەوڕۆژە ڕەفعەت ئاغاو مشـــیری کوڕی میوانی ئەو ئاغایە دەبـــن کە حەمەزیادی دەستبەســـەر کردبوو. حەمەزیـــاد هەرچەندە خەڵکی گوندەکەی ئاغایەکلاقی نەبوو، بەڵام بەباشـــی دەیناسین، بۆیە هەر بە بینینی ئاغایەکلاق و مشـــیری کوڕی، دەگەشێتەوە. مشـــیری کوڕی ڕەفعەت ئاغای دەچێتە بن کلێشـــەی حەمەزیادی، پرســـیاری ئەوەی لێدەکات، ئایا لەسەرچی گیراوە؟ ئەویش پێی دەڵێت کـــە بە باوکی بڵێ هەوڵی بۆ بدات، بەڵکو ئازادی بکەن، لە بەرامبەردا هەرچـــی داوای لێبکەن بۆی دەکات! ڕەفعەت ئاغا بیری کردەوە حەمەزیاد باشـــترین ئامڕازە بۆ کوشـــتنی کاکەڕەشی. ئاخر حەمەزیاد حەجمینی نییەو لە یەک شـــوێن قوونی تۆتکـــەی ناگری، وەکو مەکۆی جۆڵا لەمســـەری بۆ ئەوسەری ڕادەکات، وەکو باشـــوکە جووجکە بڕفێنێ، ئاوابوو. هەمیشە لە دۆخێکی دەروونیی ناجێگیرو نائارامدا دەژیا، خواستی تاوانێکی کوێرو ڕەش هەتا دەهات لە ناخیدا گەورە دەبوو.

بەبێ ســـێو دوو و بیرکردنەوە بە پێشـــنیارەکەی ڕەفعەت ئاغا و موشیری

---

١. زوێر زوێر: زوێڵ زوێڵ زیواڵ زیواڵ.

کوڕی ڕازی بوو و لەگەڵیان پێکهات. ئەوان، لەو تەڵەیەی تێیکەوتووە ڕزگاری بکـــەن، ئەویش لە بەرامبەردا کاکەڕەشـــی حاجی ســـمایلیان بۆ بکوژێ. لێی دەپرســـن: کاکەڕەشـــی حاجی سمایلی دەناســـی؟ ئەویش دەڵێ بێخەم بن زۆر چاکی دەناســـم، زەلامەکی کەڵەگەتی بەخۆوەیە، ڕەنگی ڕەشئەسمەرە، زۆر جار دێت بۆ گوندەکـــەی ئێمە میوانی ئەنوەرو براو ئامۆزاکانـــی دەبێتو نێوانیان زۆر خۆشە، زۆر بە ئاســـانی لە ماڵی ئەواندا دەتوانم بیکوژم، لە حەپسخانەی هەولێریش دیومە ئەو کاتەی گیرابووم.

ئاغا یەکلاق ئەوەی لەســـەر دەکات بە مەرج کە نابێت لە گوندەکەی خۆی واتـــە لە گوندەکەی ڕەفعەت ئاغای، بیکوژێ، نەبـــادا گومان لە ئاغایەکلاق و مشیری کوڕی بکەن، لە هەرشوێنێکی دیکە دەیکوژێ، ئازادە.

ڕەفعەت ئاغا ئەوەشی بۆ زیاد کرد، ئەگەر ئەو کوشتنەی بە سەرکەوتوویی ئەنجامدا دەمانچەیەکی چواردەخۆریشـــی بۆ بکڕێ. ئاغایەکلاق، بەزانابوون ئەو دەمانچەیەی بۆ زیاد کرد، چونکـــە دەیزانی حەمەزیاد هی بەقا پێکردنو باوەڕ پێکـــردن نییەو خاوەنداری لە قەولو قـــەرارو بەڵێنی خۆی ناکات، تەنها مەبەســـتییەتی ئازاد بێت، بەڵام ئەگەر تەماعی ئەو دەمانچە چواردەخۆرەی بداتێ، ســـڵ لە هیـــچ تاوانێک ناکاتەوە. بۆ ئازادکردنی حەمەزیادی، قســـەی لەگەڵ خانەخوێ هاوتا ئاغایەکەی کردو ئەویش قســـەی نەشـــکاند. دەیزانی ئاغایەکلاق کارێکی پێســـپاردووە لـــە قازانجی ئاغاواتـــی ناوچەکەیە، بۆیە گوتی لەبەرخاتری ڕەفعەت ئاغای ئازادت دەکەم، بە شـــەرتەک نابی لە قسەی دەربچی! حەمەزیادیـــان وەکو گورگی لغاوە بەخوێن بەرەڵڵای نێو خەڵکی کرد، بۆئەوەی مەرامە گڵاوەکانی ئاغایەکلاقی جێبەجێ بکاتو لەوە بەدوا بیخەنە

ژێر کۆنترۆڵی خۆیان.

حەمەزیاد زۆرجار کە گرمەی گەوارەو هەورەبرووسکە دەیشریقاند چەند تفەنگێکی بە هەورەکانەوە دەنا، وەک ڕق بەرقەیان لەگەڵدا بکات: بزانم دەنگی گوللەی تفەنگی من گەورەترە، یان شریقەی هەورەتریشقەکان! مەلای ئاوەدانیش نەیدەوێرا بڵێ حەمەزیاد بۆچی بەگژ هەورەکاندا دەچی؟! ئەو قۆڵبڕیو شەڕانگێزییەی حەمەزیادی زیاتر ئومێدی دەدا بە ڕەفعەت ئاغای کە توانای ئەو کارەی هەیە ئەنجامی بدات.

کات، ئێوارە بە تاریکایی شەو دەسپێرێ، هەورەکان پەڵەپەڵە دەسرمانە بارێک، وەک گەلەکۆمە لە ئاسمان بکەنو پیلانی داگیرکردنیان بەدەستەوەبێت. دواتیشکەکانی خۆر لەبەرزگی هەورەکان ڕەنگی ئەو خوێنەی گرتبوو کە ئەوشەو بەناهەق دەڕژێ!

تاریکی وەک جەندرمە خۆی بە کۆڵانەکانی گوندیدا دەکاو، سێرە خەریکە هەڵگیرێ. تەها بەسواری هێسترەکەی خۆی بە حەوشەیدا کرد، پێی ڕاستی ئاواکردە لای پێی چەپیو هەردوو پێی بەجووت سنجووقی لە عەرزیداو خالیدی کوڕیشی بە هەمان شێوە، چونکە دووپشتەکی[1] سواری هێسترەکە بووبوون، هەر زوو منداڵە بچووکەکان گوێیان لە زۆڕەو فڕمەی هێسترەکە بوو، ئەوەش نیشانەی هاتنەوەی تەهای باوکیان بوو، بۆیە بە یەکەوە خۆیان بە دەرگایداداو هەریەکە دەستی لەسەر زاری ئەوی دیکە دادەنا بۆئەوەی نەهێڵێ هەواڵی هاتنی کاکەڕەشو هیدۆی بە باوکی ڕابگەیەنێو خۆی یەکەم

---

١. دووپشتەکی: دوو کەس پێکەوە سواری یەک وڵاخ بن.

کـــەس بێت مزگێنیی ئەو هەواڵە بـــدا، بۆیە لە بن لەپی هەریەکیان هەندێک وشـــەی پچڕپچڕ لە کەلێنی پەنجە خرپنو بچووکەکانەوە دەردەچوو، کەس لەو وشـــە نیوەخنکاوانە شـــتێک حاڵی نەدەبوو، تەها هەردووک لەپی دەستی بە ڕوویانەوە نا، بێدەنگی کردنو گوتی:

دەی ئێســـتا هەمووتان پێکەوە پێـــم بڵێن چی بووە؟ بـــە جۆرێک خۆیان هەڵدەکووتـــا خەریک بـــوو لەگەڵ قســـەکان بچنە نێو گـــوێو زاری باوکیان. هەموویـــان بـــە یەکەوە گوتیان بابە، خـــارە کاکەڕەشو خارە هیـــدۆ هاتینە، بۆ پشتڕاســـتکردنەوەی هەواڵەکە هەریەکەو ڕستێک ســـوێندیان خوارد، کە درۆ ناکەن و لە ژووری دانیشتوون، ئەگەر بەقایان پێناکات با بەچاوی خۆی بیانبینێ!

تەها لە حەوشەیرا بەدەنگێکی بەرز گوتی: یاخوا بەخێربێن سەرچاوەکانم، با ئاوەکی بە دەستو پێمدا بکەم، دێم! هەقی شەڕەکتان هەیە لەگەڵتان بکەم، دەزانن لە کەیەوە نەهاتوون؟!

بە ڕوویەکی خۆشـــەوە ئەملاو ئەولای ماچکردن. وەک دڵی خەبەری دابێ دواپین دیدارەو ئەوشەو توخمی گوناهێک دەترووکێ! هەر لە بەینی دوو قسان سەری سێیەی دەیگوت کوڕە یاخوا بەخێربێن سەر هەردوو چاوانم، زۆرم غەریبی کردبوون، بەڕاستی پیاوەتیتان کرد بەو سەردانەی سیلەی ڕەحمتان بەجێگەیاند، کاکە ئێمە کەسوکارو پشـــتو قوەتی یەکترین، لە خوێنی یەکترین، سەرباری ئەوە، هاوفکریشن!

ژنەکەی هاتە نێو قســـان: کوڕە تەها وا دەزانی لە ئازایەتیی خۆیان بۆ لات هاتوون؟ بە مەرقەدی شێخی بریفکانێ، ڕێگام لـێ نەگرتبان، نەدەهاتنە ماڵی ئێمەو چاوت پێ نەدەکەوتن، دەیانەویست بچنە ماڵی ئەنوەری. هەزار سوێندو

کەلامولّلام لـێ خواردن، ئەوجا لایاندا!

کاکەڕەش هەر بـــۆ پێکەنین گوتی: گوتوویانە لـــە ماڵی جوولەکەی نانی بخۆو لە ماڵی مەسیحی بخەوی! ئێمەش وا دەکەین، لێرە لە ماڵی ئێوە نانی دەخۆینو بۆ نوستنێش دەچینە ماڵی ئەنوەری.

ژوورێکی گەرموگوڕ، ســۆبەی قشپلی دایســێ، لە کونەکانی سۆبەکەیڕا قشپلەکان وەکو کەلامســـی سوور سوور دیارن بە بندیوارەکانەوە لبادی لاکێش ڕاخراوە، نێوەڕاســتەکەی هەر عەرزەکی خاکییەو ســۆبەو، لەلای ســەرەوەش لامپایەک بۆ ڕووناککردنەوەی ژوورەکە دانراوە.

دوای نانی شــێوان، چەند خزمێکــی دیکەش لە خەڵکــی ئاوایی هاتنە دیدەنـــیو بەخێرهێنانـــی کاکەڕەشو هیـــدۆی. هەرچی دەهاتـــە ژوورێ وەک هەواشوناس هەواڵی سەرماو ئاو و هەوای دێنا: هەور زگی لە عەرزی ناوەو لە سەر بارینە، هەر بابایەو لەپی دەستی لە یەکتری دەخشاندو بە تینی سۆبەکە گەرمی دەکردەوە. ئـــەوەی لە دوای هەموویان هاتە ژوورێ گوتی: دایدا بارانێ! ژنەکەی تەهای هەر زوو زوو بە ســێنییە چایەکی گەرم بەســەری دەکردنەوەو بەخێرهاتنی دەکردن. ئەوانەی هاتبوون مەبەســتیان بوو گوێیان لە قسەکانی کاکەڕەشـــی بێ لەســـەر ئەو بارودۆخە ناهەموارەی ســوخرەو بێـــگاری ئاغاو لایەنگیری حکومەت بۆ ئاغاکان. ئەوانەی دەهاتن بە تامەزرۆییەوە گوێیان بۆ قسەکانی شل دەکردو ڕای خۆیشیان بۆ چارەسەر دەگوت. لایان وابوو قسەکانی کاکەڕەشی هەمیشە تامی نانو ئازادیو خاک دەدا!

قســـەکانی، هەمووی پشـــتگیریو ڕێنوێنی بوو بۆ کرمانجەکان: ئاغاکان بە پشـــتیوانیی حکومەت دەخـــوڕنو دەکوژن، ئەو مەملەکەتـــە جوانەیان لە

کرمانجەکان کردووە بە دۆزەخو پارووی دەمی منداڵەکانیان دەڕفێنن! هاتنە سەر ئـــەوەی ڕەفعەت ئاغا هەوڵ دەدا موعەلیمی گوندەکەیـــان دەربکات، بۆ ئەوەی منداڵـــە کرمانجەکان خوێندەوار نەبن و چاویـــان نەکرێتەوە. هەروەها لەداخی ئەوەی کوڕەکەی یەکەم نەبووەو لە بەرامبەردا کچی ڕۆستەمی ڕەحمەتی یەکەم بـــووە، هەنجەتی ئەوەی بـــە موعەلیم گرتووە، گوایە کافرەو عیلمی شـــەیتانی بڵاودەکاتەوە، سمێڵی مەلاشـــی چەور کردییە، گوناهەکەی ئەوەیە دەڵێ عەرز خڕە! کەچی حەمەزیاد چونکە زەرەری بۆ ئاغاکان نییە، بگرە کاری خراپەکاریشیان بـــۆ دەکات بە چاوی خۆتان دەبینن تفەنگی بـــە هەورانەوە دەنێ، کەچی یەک مەلاش لەترسی ئاغاکان ورتەی لە زاری نایە بەرامبەر حەمەزیادی!

خزمینە ناکرێ ئێمە ئەو کۆســـپانەی ڕۆژانە ساتمەیان لێدەکەین نەبینین، بە دوای شـــتی لاوەکی بکەوینو کێشە زلەکان فەرامۆش بکەین. نابێ توانای خۆمان لە شـــتی پڕوپووچ بە هەدەر بدەین، دەبێت وشـــیاربینەوە. ئەو میراتە بکوژەی باپیران بۆیان جێهێشـــتووین، نابێ ئێمەش بۆ نەوەکانی دوای خۆمانی جێبێلین! شـــەرمە لە دوای شـــکانی شووشە فانۆســـەکانمان ئەوکات هەست بـــە تاریکی بکەین! شـــەرمە لە بازاڕی گـــورگان بە مەڕایەتـــی قایل بین! لە هەندێـــک مەلا زۆر بە گلەییم کە ناداپـــەروەری نابینن، لە کاتێکدا لە منارەی مزگەوتەکانیان دیارترە!

چەندە ئێمە دەست بە کڵاومانەوە بگرینو سەرمان نەوی بکەین، پلەوپایەی زاڵمان بەرزتر دەبێتو پەتی ملمان قایمتر! پشـــتمان، وەکو باربەر لە ژێر باری چەوسانەوەدا جەو بووە، کەچی تەقەمان لەسەری نەیەت! ئێستا تەمبێکردن، کەرەستەی ڕاگرتنی ئەو جەورو ستەمەیە!

کاکەڕەش دریژەی بە قســەکانیدا. بێئاگا لەوەی چ تۆفانێکی خوێن لە دڵی تاریکی ئەوشــەوە باراناوییەدا خۆی مەڵاس داوە! یەک لە منداڵەکان دەفتەر و کتێبەکەی هەڵگــرتو هاتە نزیک لامپایەکە، بۆئەوەی لاپەڕەکانی دەفتەر و کتێبەکەی باشتر ببینێ.

دروســت لەو کاتــەدا کاکەڕەش خۆی بە لای ڕاســتدا لارکردەوە دەســتی بگاتە لامپایەکەو فتیلەکەی هەندێک هەڵکێشــێ بۆئەوەی کتێبو دەفتەری منداڵەکە ڕووناکتر بن. لە دەلاقەکەی پشت سەری کاکەڕەشی، پەلاپیتکەیەکی مەلعوون، دەستڕێژێک گوللەی دابارانده نێو ژوورەکە. لەگەڵ تەوژمو بای یەکەم گوللە، لامپایەکە کووژایەوەو ژوور بوو بە تاریکستانو تونێلی مەرگ!

کاکەڕەش تەکانیدا هەردوو دەستی دایە بەرخۆی قیت بێتەوە، دەستەکانی چوونە نێو خوێنی گەرمەوە، لرخەو هانکەهانکی دوا هەناســەکانی بەرائەتو کوفارەی خوێــنو بۆنی باروتو، ئەو تۆزو خۆڵەی لەگەڵ تەوژمو بای گوللەکان لە کاریتەو تاقچەکان هەســتا، نەفەسی هەموانی تەنگ کردبوو. بکوژ، وەک تارمایی‌و ڕۆحێکی نەگریسی غەیب، لەنێو تاریکاییدا ونە!

هەر هەموویان دڵنیابوون کە ئامانج کاکەڕەشــە، بۆیــە هەموویان لە ناو تاریکاییدا بانگی کاکەڕەشــیان دەکرد، بۆئەوەی لــە زیندوومانەوەی دڵنیابن. تەقەکان، تەنها یەک دەســتڕێژی چڕو گەرم بوو، گوێیان لە ڕمپەی پێی بکوژ بوو کە لە حەوشــەکەدا غاری دەدا بــۆ خۆدەربازکردن، تا دەنگی هەنگاوەکانی نزمتر دەبوو، نیشــانەی دوورکەوتنــەوەی زیاتر بوو. لامپاکەیــان هەڵکردەوە، لەگەڵ ڕووناکبوونــەوەی ژوورەکە ئەوەی بینییان پێچەوانــەی مەزندەی ئەوان بــوو، کاکەڕەش بەپێوە وەســتابوو خوێنی لە هەردووک دەســتی دەچۆڕایەوە

تەنها لاشـەیەکی دابێژراو، لەپەوڕوو کەوتبووە نێو خوێنی خۆی، لاشـەیەکی بێگوناه کـە هەرگیز تا لە ژیاندا بوو هەسـتی بە حەسـانەوە نەکرد، ئەویش تەهای خانەخوێو باوکی پێنج منداڵ. ژوورەکە بۆنی مەرگی لێدەهات، ترسێک چۆکی لەسـەر ئەو نێوە دانابوو، ئەو خوێنەی کاکەڕەش دەستی تێهەڵچووبوو، کوفارەو گۆمیلکـەی خوێنی گەرمو پاکژی تەهای بوو، تەنها چەند گوللەیەک لفکی جەمەدانیی کاکەڕەشـی سـمیبوو، گوللەیەک سەرچیغ ڕوومەتی لای چەپی داخکردبوو، ئەگەر بەر لە تەقەکان کاکەڕەش دەسـتی بۆ لامپاکە درێژ نەکردبایە، گوللەکان هەمووی بەسەری ئەو دەکەوتن.

زیرەی ژنو منداڵی تەهای دەچووە بەری ئاسـمانێ. ژنەکەی بە دەنگێکی پڕ لە حەسرەتەوە دوو سێ جار بانگی کرد: تەها! تەها! هەستە ئاخر ئەو کۆشە منداڵە بۆ کێ بەجێدەهێڵی؟!

یەخەی ئاسمانی ڕادەوەشاند، فیغانو نزاکانی لەوشەوە پڕ لەترسو سەرمایە، هەر بە ئاسـمانەوە دەیبەسـت! گۆمیلکەی خوێن تا لێـوی لبادەکە هاتبوو، کتێبو دەفتەری منداڵەکە چەند پرووشکە خوێنێکی پێوەیە.

منداڵەکە حەپەساو و هێدمەگرتی بووە، زمانی گۆ ناکاتو وەک پەیکەرێکی چکۆلەی بێگیان، زەقە زەق لە تەرمـی باوکیو کڵاو و جەمەدانییە پەڕیوەکەی دەڕوانی، سەرنجی جارێک دەکەوتە سەر دەستە بەخوێنەکانی کاکەڕەشیو جارێک گۆمیلکەی خوێنی بەناهەق ڕژاوی باوکیو جارێک کتێبو دەفتەرو لامپاکە.

کاکەڕەش، بێئەوەی جوامێریو ئازایەتییە خۆڕسـکەکەی لە دەست بدات، بەر لە هەرکەس سـەرو ڕیشی بە خوێنی تەهای لەسەر ڕانی خۆی داناو چەند جارێـک بانگی کرد، بەڵام وەڵام نەبوو و دەنگێکی لـێ نەبیسـت، بە گوێیدا

چرپاند: تەها! تەها! شیری داکم لە من حەرام بێ ئەگەر بهێڵم خوێنت بەفیڕۆ بڕوا، دەبێ کارێک بکەم بکوژت نەفرەت لەو ڕۆژە بکات تێیدا لەدایک بووە!

یەک لە خەسڵەتەکانی کاکەڕەشی ئەوەبوو کە هەرگیز گورز لە نەیارەکەی نەوەشێنێت تا ئەو دەستپێشخەر نەبێت! برازاکەی تەهاو ئەنوەری، یەکتاو بە هەناسەبڕکێ هاتە ژوورێ، عەلەتریکێکی سێ پیلی بەدەستەوە بوو، گوتی چەکم پێ نەبوو، ئەگەرنا حەمەزیادم دەکوشت، لە دەرگای حەوشەی بەغار هاتەدەرێ، شۆقی عەلەتریکم تێگرت، زۆر بەمشەوەشی دوو گوللەی پێوەنام، خۆم دایە پەنای سەرتیلەی[١] خانووی. ئەنوەرو کاکەڕەش لێیان پرسی: بە دڵنیایی ناسیت حەمەزیاد بوو؟ گوتی: بەڵێ! غەدارەیەکی بەدەستەوە بوو. هیدۆ گوتی پێش مەغریبێ ئەو غەدارەیەی پێبوو، کە بینیم زانیم بۆ کەتنێک ئەو غەددارەیەیان داوەتێ! هەر زوو هیدۆو ئەنوەر هەموو گوندیان بەدوای حەمەزیادیدا لێکدا، بەڵام هەڵاتبوو. خەڵکی ئاواییان بەسەر قژقژاو، هەرچی دەهات فرمێسکی پێش قسەکانی کەوتبوو، خەمێکی قورس نیشتە سەر سینگی خەڵکی ئاوایی‌و ڕوحی دەگوشین.

تەرمی خوێناویی کون کونکراوی تەهای، بۆنی ئارەقەی ڕەنج‌و بۆنی باراشی لێدەهات، هەڵیانگرت بۆ سەر تاتەشۆری مزگەوتێ. ژنەکەی، بەردەوام چەپۆکی لە سینگ‌و تەپڵی سەری خۆی دەدادا، پرچ‌و ڕووی خۆی دەڕنییەوە: هاوار ماڵەکەیان شێواندم! کۆڵەکەی ماڵەکەم شکا، کوێر بم سەرداری ماڵەکەم ڕۆ!

پڕ بە گەرووی دەگریاو پڕ بە چاوەکانی فرمێسکی گەرمی هەڵدەوەراند،

١. سەرتیلە: سووچ، سیلەی مزگەوت، خانوو، لەودەو... بە باری درێژیدا.

دەمێک جەستەی ساردی تەهای دەجوولاندەوەو دەمێک وەکو ماکەو منداڵە سەرکەو بنکەکانی لە بنباڵی خۆی دەناو ئارامی دەکردنەوە. خەڵکی گوندییش هەر بەو شێوەیە شین و شەپۆریان بوو، ئاخر تەها، بۆ تەواوی خەڵکی ئاوایی بە حاجەتو بە کەڵک بوو.

کاکەڕەش لە دڵدا دەکوڵاو گریان گەرووی گرتبوو، بەڵام دانی بەخۆیدا دەگرت، نەبادا غرورو ویقاری پیاوانەی بشکێ! بە تۆنێکی غەمگین گوتی: تەواو! ئەوەی کراوە دەستدرێژیکردنە سەر یاساکانی خودایە، تاوانێکی نەبەخشراوەو قابیلی لێخۆشبوون نییە! لە ناخی خۆیشیدا دەیگوت: تەرمی بێتاوانی تەهای بارێکی گرانە بەسەر ویژدانمەوە، وەک نوێژ بوو بەفەرزو ئەرک بە ملمەوە، دەبێ ئەو قورساییە لە سەر ویژدانم لابەم، ئەوەش بەس بە تۆڵەکردنەوەی دەکرێ! ئەنوەر بە براژنو ژنەکانی دیکەی خێزانەکەیانی گوت: ڕازی نیم بگریێن، ئێمە لە گریانێمان زیاتر لە دەست دێت! منداڵەکان بە شێوەیەکی ترسناک بەرامبەر کوژرانی باوکیان ڕووخانو، لە مابەینی شکو یەقین، ئایا باوکیان هەر بەڕاستیو بەیەکجاری مردو هیچیدی ناگەڕێتەوە؟ حەپەسابوون.

ژنەکە بەخاتری منداڵەکانی، دەیویست وا نیشان بدا کە نەڕووخاوە، وەاێ، لە هەناویدا داڕمابوو، هاڕەی کردبوو. منداڵەکانی، خالید نەبێ کە نەوجەوان بوو، ئەوانی دیکە خۆیان لەبن چارۆگەی دایکیان توندکردبوو، بە تەماشایەکی تۆقیوەوە لە تەرمی باوکیان دەڕوانی. ئاخر ئەوان لەوە بچووکتر بوون تێبگەن چینایەتی، ئاغا و مسکێن، زاڵم و مەزڵووم و چەوسانەوە، چین؟!

ئەوشەو باران، لە شەرمی ئەو تاوانەو ئەو منداڵە هەترەشچوو و هەتیوکەوتانە، زۆر بەنابەدڵی دەباری، دەتگوت لە سەر ڕوانی ڕادەکێشن، شەرم

لە داباریـن دەکات!

لەو کاتەی کوڕە گەورەکەی باوەشــی بە دایکیدا کردبوو، ئەو دایکەی تاکو ئێستا تەنها دایکی بوو، ئێستا دەبێ باوکایەتیشی بۆ بکات! دایکیشی زۆری خۆشدەویســت، دروســت وێنەی تەهای تێدا دەبینییەوە، لە هەڵســوکەوتو ڕووخســاریدا، یەک مووی لە باوکی هەڵنەبواردبوو. هەمــوو ئەو دیمەنانە، کاکەڕەشــیان ئازاردەدا، بۆیە گوتی: مردوو بــە گریان نایەتەوە! نابێت چاوەڕوان بین دڵی ڕەقی زاڵم بە فرمێسک نەرم ببێ!

لە دوای ئەو کارەســاتە، ئەو پرسیارەی کوڕە بچووکەکەیان دایکی زۆر وێران دەکرد: ئێوە هەر پێم دەڵێن ســەعی! سەعی! کەچی لامپای سەعیکردنەکەم لێدەکوژێننەوە! لەوکاتەی مامۆســتای وێنە بــە منداڵەکانی دەگوت: وێنەی چیایەک بکێشــن، منداڵەکە ئەو دیمەنــە خوێناوییەی بیرکەوتەوە کە وەک مۆتەکەیەکی ترسناک خۆی بەسەر زەینو بیرکردنەوەیدا کشاوەو هەموو بوونی داگرتــووە. تابلۆیەک کە هەرگیز لە یادەوەریی پاکژی منداڵانەی کاڵ نابێتەوە! هیچ هونەر و زمانێکی دونیا نەیاندەتوانی گوزارشت لە ساتەوەختی حەپەسانو بینینــی لەپەوڕووکەوتنی باوکیو گۆمیلکە خوێنەکــە، بکات. مەگەر تەنها ئەو تابلۆ سادە و ساکارانەی بە دەســتە خرپنەکانی خۆی دەیکێشان، کە تەنها هەر تابلۆ نەبوو، بەڵکو ســکاڵانامە بوو، دەیویست بیگەیەنێتە نووسینگەی پەروەردگاری مەزنو میهرەبان!

لــە دوای چەند ســاڵ، منداڵەکە هــەراش بووبوو. دیســانەوە ڕۆژێک بە هەمانشــێوە مامۆستا گوتی هەمووتان وێنەی گوندەکەتان بکێشن! بۆ بەیانی هەموو منداڵەکان وێنەی گوندەکەیان کێشــابوو، تەنها نیگارکێشە کارامەکە

تابلۆیەکی نەخشـێندراوی لە هەموو قوتابییەکان جیاوازتر کێشابوو، وێنەی پیاوێک ڕوومەتی کەوتبووە نێو گۆمیلکە خوێنێکی سـوور سوور، کتێبێکو دەفتەر بە چەند پرووشـکە خوێنو دوو دەستی تاوەکو زەنگە، بە خوێن سوور، لامپایەک لە سەر بنی مەنجەڵێکی دەواو نخوون. مامۆستاکەی، قەڵەمەکەی لە دەسـت وەرگرت، دەیویسـت چەند تیشـکێکی زەرد بۆ لامپاکە دروسـت بکات. منداڵەکە وەک پاڕانەوەیەک لە مامۆسـتاکەی، بە سەربادان گوتی: نابێ تیشـکی ڕووناکی بۆ دروسـت بکەیت، چونکە ئەوان بە تەقەی گەورەی بەراستی، لامپاکەی سـەعیکردنی منیان کوژاندەوە! ئەمجارە مامۆستاکەی ویستی دەسـتە بەخوێنەکان بکات بە دەستی پیاوە کوژراوەکە. دیسانەوە لێی پاڕایەوە، بەدەم سەرڕاوەشـاندنی نارەزایەتی گوتی: ئەو دەسـتانە دەستی بابم نییە، دەسـتی خارە کاکەڕەشییە! مامۆسـتا لێی پرسی: ئەی ئەو گرمۆڵە داوە ڕەشە ئاڵۆزانەی نێو خوێنەکە؟ گوتی ئەوەیان پرچی ڕناوەی داکمە!

هەر ئەوشەوە لە دوای ئەنجامدانی تاوانەکە، حەمەزیاد دڵنیابوو، ئاشکرا بـووە کە ئەو تەقەکەی کردووە، هەر دەمودەسـت ئەسـپێک لە تەویلەی ئەوماڵەی ئێوارە نانی لـێ خواردووە، دەردێنێو بەبێ زین خۆی داوێتە سـەرێو، لەگەڵ تێکوتانی پاژنەی پێی، هەی هەی لە ئەسـپی دەکات، بەرەو دیوەخانی ڕەفعەت ئاغای. بەوشەوە، ئەوەی دەبیسترێ بەس فرمەو چرپەی قورِ فرێدانی ئەسـپەکەیە. درەنگانێکی شـەو لەبـەردەرگای دیوەخانی ڕەفعـەت ئاغای، سنجوقی[1] خۆی لە ئەسپی فرێدا سەر عەرزی، وەک فەرماندەیەکی براوەی

١. سنجووقی: خۆفرێدانێکی ڕێک و چەقین لەسەر عەرز بەبێ لاربوونەوە.

جەنگ بە لەخۆباییبوونەوە لە دیوەخانێ بە ژوورکەوت. ڕەفعەت ئاغا بە چاوی خەواڵــووەوە لە ســیمای زەلامکوژانەی حەمەزیادی ڕوانی، بە دڵخۆشــییەوە لێی پرســی: ها شێری یان ڕێوی؟ ئەویش دەڵێ: شێرم، بەڵام بەتەواوی ئاشکرا بووم! ڕەفعەت ئاغا لێی دەچێتە پێشەو دەڵێ: یانی کاکەڕەشی حاجی سمایلت کوشت؟! ئەویش دەڵێ: بەدڵنیاییەوە کوشتم، بۆ دڵنیابوونی جەنابیشت، بزانە سبەینێ لەگەڵ تاوهەڵاتێ، کەلاکی دێننەوە ئێرە یان نا!

ڕەفعــەت ئاغا فەرمــان دەکات قاورمەی بۆ بێنــن! زۆری خزمەت دەکەن، پێی دەڵێ: بنوو، پشوو بدە، غەمت نەبێ سبەینێ دەتنێرمە شوێنێکی وا، نە حکومەتو نە براو کەســوکاری کاکەڕەشی دەستیان پێت ڕانەگاو ددانیان لێت ڕۆنەچی!

ئەوشەوە ئاغا لە خۆشییان شوێن بەخۆی ناگرێ! بەیانی هەر زوو، بەجۆرێک ڕیشی دەتاشێ مێش لێی بخلیســکێ! لەناکاو لە دەرکی دیوەخانێ سوارێک لە ئەســپی دابەزیو بەئاسپایی قســەیەکی لە بنگوێی ڕەفعەتی چرپاند. بە بیســتنی ئەو هەواڵە نێوچەوانی تێکناو گرژ بوو، ڕەنگی هێناو برد، شەربەتی خۆشییی لــێ تاڵ بوو! هەستا نووکە قۆندەرەکانی لە پەراسووی حەمەزیادی کووتا: هەســتە سەگی ســەگبابی درۆزن، دەڵێی کاکەڕەشم کوشتییە، کەچی پیاوێکی دیکەت کوشــتییە ناوی تەهایە، هەتا زووە لێرە برۆو دەفن بە! لەگەڵ ئەو قسانە غەددارەکەشی لێسەندو بێچەک دەریکرد: مادام کاکەڕەشی حاجی ســمایلی زیندووە، عەمری تۆ زۆر درێژ نابێ، ئەگەر چەنگ بدەیە عاسمانێ و ببیە داڵاشی پشتی هەورانیش، دەتهێننە خوارێ!

حەمەزیاد سواری ئەسپی بوو، لە تەشــکی خۆیداو ڕۆیشت. لە گوندەکانی

نزیک کەرکوکێ ئەسپەکەی فرۆشت بۆ ئەوەی بە پارەکەی خۆی بگەیەنێتە بەغدا. لە کەرکوک سواری پاسێک بوو بۆ بەغدا. لە ڕێگا، ئەوەی لە تەنیشتی سواربووبوو، زۆر ڕێز لە حەمەزیاد دەگرێو خولقی جگەرەی دەکات، دەبینێ خەڵکی نێو پاسەکە ڕێز لە یەکتری دەگرن. حەمەزیاد لە ژیانیدا ئەو ڕێزو خۆشەویستییەی نەدیبوو! چونکە بەهۆی کارە خەراپەکانییەوە، هەر لە منداڵییەوە لەو ڕێزو خۆشەویستییە بێبەش بوو! ڕۆچووە نێو بیرکردنەوەیەکی قووڵ، لەگەڵ خۆیدا دەڵێت: ئەوانە کە ڕێزم دەگرن، نازانن چ کەتنێکم کردووەو چەند منداڵم هەتیو کردوون! خۆزگەم بە ئێوە کە دەستتان نەچۆتە خوێنی کەس!

لە خورماتوو، پاسەکە ڕادەوەستێت بۆ ئەوەی سەرنشینەکان دابەزنو نان بخۆنو کاری پێویستیی خۆیان بکەن. ئەو کەسەی لە تەنیشت حەمەزیاد دانیشتبوو، پێشی ئەو دابەزی، جزدانی پارەکەی لەسەر کوشنەکەی لێ بەجێمابوو، حەمەزیاد گورج جزدانەکەی هەڵگرتو بە دوایدا دابەزی، چونکە بەدرێژایی ڕێ، بیری لەو کەسانە کردبۆوە کە چاکەکارنو خەڵک خۆشیدەوێنو ڕێزیان دەگرن، بڕیاریدا ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، چاکەیەک بکات، بزانێت چێژی چاکەکاری چۆنە! گورج دەستی لەسەر شانی خاوەن جزدانەکە داناو جزدانەکەی بۆ ڕاگرت: فەرموو، وا بزانم ئەو جزدانە هی تۆیە! کابرا سوپاس و دەستخۆشی لێکرد. ئەوە یەکەمجار بوو لە هەموو ژیانیدا کەسێک بۆ کاری چاکە دەستخۆشی لێبکات. لەوە تێگەیشت ئەگەر خەراپەکاری نەبایە، هەرگیز چێژمان لە چاکەکاری وەرنەدەگرت. بەڵام خەراپەکاری، لە ناخەوە دەستی لێ ئەستاندبوو، ناتوانێ لێی پاشگەزببێتەوەو تازە درەنگ کەوتووە!

هەرکە گەیشتە بەغدا، لەوێ، پەیوەندیی بە دەزگا جاسووسییەکانی

حکومەتەوە کردو بەڵێنی پێدان هەرکارێکی پێ بسپێرن ئەنجامی بدات. لە سەر داخوازیی خۆی، دەمانچەیەکی چواردەخــۆری نوێیان دایێ، چونکە کوردزمانە، جاسووسیو چاودێریی زیارەتکارانی مەرقەدی حەزرەتی غەوسیان پێ سپارد.

جەلیل، ئەو پیاوە بوو زۆر خۆی لە کاکەڕەشـــی نزیک دەکردەوە، هەر چەند جاری کاکەڕەشـــی دەبینی، ئامادەیی خۆی دەردەبڕی بــۆ هەرکارێکی بیەوێ. هەواڵی چوونەبەغدای حەمە زیادی بە کاکەڕەشـــی ڕاگەیاند. ئەویش دەیزانی جەلیل تایبەتمەندی هەواڵگری و سۆســـەکردنی تێدا هەیە، بۆیە ڕایســـپارد بەپەلە بچێتە بەغداو هەواڵی شوێن و هەڵسوکەوتی حەمەزیادی بۆ بێنێتەوە.

حەمەزیاد هەر ئەوەندە عومری کرد، تا هەواڵی جێو شـــوێنی گەیشـــتە کاکـــەڕەشو ئەنـــوەری. کاکەڕەش گوتـــی: تا تەنـــدوور گەرمـــە دەبێت نانی خۆمانی پێوە بدەین! دوو دەمانچەی ئوســـرەی گچکـــەی بێکوتکی بەتوورەی دایە ئەنوەرو حەمۆی برای. لە دوای دوو هەفتە مانەوە لە بەغدا، ســـبەینێی ڕۆژێکـــی هەینی، مەرقەدی حەزرەتی غـــەوس ڕێ بە بەر ڕێداری ناکەوێ، لە حەوشەش هەر جمەی دێت، لە دەرێ خاوەن عارەبانەکان بە نیسکێنە خۆرەکان ڕاناگەن، بۆن چەقەوێڕی جەرگ برژاندن ئەو نێوەی پڕکردووە، چایچییە زرنگـو مەعلانەکان وەک هێشـــووە ترێ پیاڵەو ژێرپیاڵە هەڵدەگرنـــەوە، لەگەڵ دانان لەپێش مشتەرییەکان، بۆ خۆنومایشـــکردن، زرەی لێدێنن. لەوکاتەدا دڵنیان حەمەزیاد لە ژووری مەرقەدییە بۆ چاودێریو جاسووســـی سەر زیارەتکەران، ئەنوەر لە دەرگای لای خۆرئاواو حەمۆ لە دەرگای خۆرهەڵات بۆی ڕاوەســـتان. لە دەرگای خۆرئـــاوا هاتە دەرێ. ئەنوەر چەند هەنگاوێک بە دوایدا چوو بۆ ئەوەی لە ئاپۆرای زیارەتکـــەران دوور بکەوێتەوە. پێی لە جێی پێـــی دادەنا، لەناکاو

گوێی لێیە یەکێک لەپشتی دەڵێ: حەمەزیاد! حەمەزیاد! دەزانم دەمانچەی چواردەخۆرت پێیە، بۆیە نامەوێ بە دزیو بە حیزانە بتکوژم، دەی دەستبکەوە برای تەهات گەیشتە سەرێ، با بزانین کێمان بەرخەو کێمان بەرانە! دایە بەرگوللە دەمانچانو کەوت، دەمانچەکەشی لەبەرپشتی دەرهێناو لەگەڵ حەمۆی برای سواری تەکسییەک بوون، نەهزە[1] خۆت بگرەو هاتین! هەر زوو سواری ئۆتۆمۆبیلی هەولێر بوونو ڕزگاریان بوو. بەرلەوەی بچنەوە ماڵی خۆیان، چوونە لای کاکەڕەشی، هەواڵەکەی پێ ڕابگەیەنن.

دوای بەخێرهێنانەوەو دەستخۆشی، هیدۆ ڕووی لە کاکەڕەشی کرد: بۆ من جێی سەرسووڕمانە ئاوا بە ئاسانی بڕیاری کوشتنی حەمەزیادت دا، بە قسەی خۆت ئەتۆ هەرگیز لەگەڵ کوشتن نەبووی، دەستی ئێمەشت بەستوەو نایەڵی کەس بکوژین، هەر دەتگوت دەبێ تەمبێیان بکەین! کاکەڕەش گوتی: من باوەڕم بەوە هەیە ژیان بەهای خۆی هەیە، هیچ بوونەوەرێک شایانی کوشتن نییە، نە مرۆڤ و نە گیانلەبەر، جروجانەوەریش، بەڵام چۆن دەبێ سۆزت بۆ کەسێک هەبێ کە هەموو شتێکی جوانو بێگوناه بکوژێت؟! ئێمە نابێ نابینا بین و زاهید و دەجاڵ لێک جیانەکەینەوە! ئەمن کە بڕیارمدا حەمەزیاد بکوژن، هەر لەبەر تۆڵەکردنەوە نەبوو، بەڵکو لە ڕێگای ئەو کوشتنە بتوانین ژیان بۆ ئەوانە بگێڕینەوە کە لەدوارۆژدا حەمەزیاد دەیکوشتن! ئاخر لە هەموو ئاینە ئاسمانی و هەموو کتێبە پیرۆزەکاندا باسی پاداشتو سزا کراوە، ئەوە نییە: «چاو بە چاو، ددان بە ددان!»

---

١. نەهزە: ئەو گەڕەکە بوو لە بەغدا کە گەراجی شارەکانی کوردستانی لێبوو، کورد زیاتر بە نازە ناوی دەبرد.

هیدۆ گوتی: ئەگەر ئێستا ئەو مامۆستا جەمالەی، لە حەپسخانەی هەولێرێ ئەتۆی فێری خوێندەواری کردو دەرسی پێدەگوتی، بزانێ ئەتۆ ڕەفعەت ئاغات سەقەت کردییەو لاقی لە ڕانیرا بڕاوەتەوەو پاشان بڕیاری کوشتنی حەمەزیادت داوە، چیت پێدەڵێ؟! دڵنیام لێت تووڕە دەبێت، چونکە ئەو زۆر دژی کوشتن بوو، هەمیشە باسی ژیانو مافی مرۆڤ و یاسای دەکرد.

کاکەڕەش گوتی: لە کاتێکدا دادگا بوونی نەبێ، یان ئەگەر هەشبێ تەرازووی لاسەنگ بێ، کە سکاڵات لەلا تۆمارکرد، ماف بۆ خاوەنماف نەگێڕێتەوە، ئەوەی بە ناوی دادگاش هەمانە، لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە لغاو کراوە، چۆنیان بوێ ئاوای لێدەخوڕن، بۆیە ناچار بووم ئەو دادگاییکردنە بگرمە ئەستۆ.

هیدۆ گوتی: ئەمن چوزانم ئەنگۆ هەر بە خۆتان باسی مافی مرۆڤو ئەو شتانەی دەکەن، بە خوای ئەمن سەرم لێدەرناچی. هیدۆ مەبەستی لەو پرسیارە ڕەخنەییانە ئەوە بوو هەوڵ بدات کاکەڕەشی تووڕە بکاتو تووشی هەڵچوونی بکات، تا ڕادەیەکیش لەو هەوڵەی سەرکەوتوو بوو. کاکەڕەش بە هەڵچوونەوە گوتی: دە وەرە لە داخی هیدۆی خۆت مەکوژە؟، کێ بوویتە شاعیری هەست ناسک داکۆکی لە مافی مرۆڤ دەکات! کوڕە بە هەموو ئەقڵی خۆت ئەتۆ ئامۆژگاری من دەکەی؟! ئاخر ئەمن لە تۆ بگەڕێم بە کەیفی خۆت بکەی، هەموو شەوێ دوو کەسان دەکوژی!

بە هەڵچوونەوە ڕووی لە هیدۆی کردو گوتی: کاکی شاعیری هەست ناسک! با مافی مرۆڤو ئەو شاعیرو ماعیرانەی باسیان دەکەیو دەڵێن دژی کوشتنین، با شانامەو شیعر لە سەر ئەو تابلۆیەش بنووسن منداڵێکی باوککوژراو دیمەنی ساتەوەختی کوژرانی باوکی بە بەرچاوییەوە دەکێشێت،

با لەســەر لامپا بە گوللە کوژێندراوەکەی کاتی ســەعی کردنەکەی بنووسن، ئاخر ئەوانە زەخیرەی هەزار شــیعری تێدایــە، ئەگەر لە دایک بێت، لە جیاتی قورپێوان بۆ مەرگی دڕندەیەک، با بێن بە چاوی خۆیان ببینن هەتیوەکان بۆیە برسین کە ئەو، بەخێوکەرەکەیانی کوشت، ئاغاکان بۆیان هەرس نەدەکرا بە دوو چاوی خۆیان ببینن داردەستەکەیان دەشکێنن!



# ٢٤

تەزرەو بارانێکی سەربەکراوە[١] سەربانی خانووەکانی دەکوتا، هێندە بە تاو دەباری، تــەزرە هەڵدەقۆزییەوەو پڕاوپڕی کۆڵانەکانــی گوندی ئاوی بە خووڕی لەبەر دەڕوا، بڵاچەی برووسـکـو گەواڵە، هەسـتی لە گوندی بڕیوە، گردەکانی بەرامبــەری ئاوایی بریقەیان دێ، ئاو بە هــەر چواردەوریان دێتەخوارێ، وەک بیانەوێ ســەریان بشۆن، یان دنیا بیەوێ غوســڵی گوناهەکانی بنیادەم لەخۆی دەربکا! هەورەکان کوڵی دڵی خۆیان بە زەوی دادڕشـت، لە بنیرا هەریبرینگاندو ڕوونــاک بوو، کۆلکەزێڕینەی نیو بازنەیی، هەموو ئـەو دیمەنانە تابلۆیەکی شاکاریان بەو نێوە دەبەخشی.

گـۆڕان و نەمانی سیسـتەمی حوکمڕانی، لە مەلەکییــەوە بۆ کۆماری، چووە ســاڵی سێیەمیەوە. کرمانجەکان بە گشـتیو کاکەڕەشو هاوڕێکانیشی بەتایبەتی، هەناسـەیەکی ئاســوودەییان هەڵمژیو ئاهێکیان لــە دڵدا گەڕا. گۆڕانکارییەکــی کتوپڕ و چــاوەڕوان نەکراوبوو، بەدڵی جووتیارو مســکێنی هەژار و شکانی پشتی ئاغاکان بوو. دێوەزمەی سوخرەو بێگاری و چەوسانەوەی

---

١. سەربەکراوە: سەربەکڵاوە. بارانێکە دڵۆپەکانی درشتن، لەو درشتییە کاتێک دەکەونە سەر زەوی، شێوەیان پان و قوڵەو لە کڵاو دەچن.

چینایەتی دەستی لە یەخەی کردنەوە. ئاغاکان، لە ترسی ئەوەی نەبادا خەڵک تۆڵەیان لێبکەنەوە، دەمودەســـت ماڵەکانیان لە گوندەکان بارکردو ڕوویان کردە شارەکان. گرۆرەیان(١) کەوتبووە لێژی، لەنێویشیاندا ڕەفعەت و مشیری کوڕی.

زەوی بەســـەر جووتیاراندا دابەشـــکرا. ماوەی ئەو چەندســـاڵە کەمە، بۆ کاکەڕەشو جووتیارە کرمانجەکان، بە ساڵانی زێڕین ئەژمار دەکرا، پشوویان داو حەسانەوە، قۆنگرەو قەرات و حەساری ئاغاکان کوندەپەپۆیان لەسەر دەخوێند، سەربانی خانووەکانیان گیاو گوڵی لـــێ شین ببوو، قوفڵو کلیلو ڕێزەی دەرگاو قەمتەرەکانیان ژەنگاوی بوون، جاڵجاڵۆکە لە بنمیچو گۆشەو سەردەرەی دەرگاکان تەونی سەرنویشـــتو ئایندەی ئاغاکانیان دەچنی. بـــەردەرگاو هەر چواردەوری دیوەخانێ، تۆرکەی لـــێ شین ببوو، دەوری ئاخووڕی ئەســـپی میوانان بوونە قۆپەنە قەرســـیل. تەمەنی ئەو خۆشـــیو نیمچـــە ئازادبوونە درێـــژ نەبوو، دوو ســـاڵو چەند مانگێـــک، وەک خەون وابوو. ئاغاو موڵکـــدارەکان هەموو ئەوانەی هەژموونی دەســـەڵاتی خۆیان لە دەستدابوو بە پاڵپشتیی حکومەتە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە کەوتنە پیلانگێڕی لە دژی کۆمارو ئەو سیاسەتەی گرتبوویەبەر لە دابەشـــکردنی زەوی بەسەر جووتیارانو کۆمەڵێک کاری باشی دیکە. یاخیبوونی چەکداری دەســـتی پێکرد، زۆربەی ئاغاو شێخو کوێخاکان بزووێنەری ئەو جوولانەوە چەکدارییە بوون. پاڵنەرەکانی پشتی ئەو یاخیبوونە لە ڕژێمی کۆماری، کاریان لە ســـۆزی نەتەوایەتیی خەڵکی نیشتیمانپەروەرو نەتەوەیی کرد، تێیشیدا سەرکەوتوو بوون.

ئاغاکان مەبەســـتیان ئەوەبوو بەهێزی چەکدارەکانی شـــاخ، دەســـەڵاتی لە

---

١. گرۆرە: گلۆڵە، گلۆڵەبەن.

دەستچووی خۆیان و زەوییەکانیان لە جووتیارەکان بستێننەوە. ئەوەبوو بە پاڵپشتیی جوولانەوە چەکدارییەکـە، ئاغاکان کۆچی پێچەوانەیان لە شـارەوە بۆ گوندەکان دەست پێکردەوە. بەڵام جووتیارەکان تامی ئازادییان چەشتبوو و فێری ئاوی بێلغاو بوویـوون! ئاغاکان دەسـەڵاتی جارانیان نەبوو، بەڵام هەر لـە هەوڵی گێڕانەوەی دەسـەڵاتی جارانیاندا بوون. زۆر لە کوڕە هـەژارەکان کەوتبوونە ژێر کاریگەریی هەستی نیشتیمانیو نەتەوایەتی، لەنێویشیاندا کاکەڕەشو هاوڕێکانی. ئەوەبوو کاکـەڕەشو هیدۆو سـەلیمو ئیسـماعیلو چەند کـوڕە جووتیارێکی دیکە بە تفەنگو فیشەکی خۆیانەوە پاڵیاندایە ئەو یاخیبوونە چەکدارییە.

بۆ بەرگری لە هێرشەکانی هێزی حکومەت، کاکەڕەشو هاوڕێکانی لە چیای سەفین لە پێشـەوە سـەنگەریان گرتبوو، چەند ڕۆژ بوو لە شەڕێکی قورسدا بوون، لە چوارەم ڕۆژی شەڕەکە، ئیسماعیل شەهید بوو، کەسێکی دیکەشیان برینددار بوو. لای ئێوارەی هەمان ڕۆژ کاکەڕەشیش لە قۆڵی چەپی دراو برینددار بوو، بەڵام لە دوای تیمارکردنو پێچانەوەی برینەکەی سـەنگەری پێشـەوەی بەرنەداو لە شـەڕکردن بەردەوام بوو. هەندێکیان لە سـەنگەرەکانیان خەریکی بەرگریکردن بوونو هەندێکی دیکەشـیان تەرمی ئیسماعیلیان بە شێوەیەکی کاتی لەبن داربەڕوویەک لە چیای سەفین، بە خاک دەسپارد.

دروسـت لەو کاتە هەستیارو گەرمەی شەڕەدا، ئەو کەسەی نانی بۆ هێنان، هەواڵی ئەوەی بە کاکەڕەشـی دا کە لە دوو شەوی ڕابردوو بە فەرمانی ڕەفعەت ئاغاو مشیری کوڕیو چەند چەکدارێکی جوولانەوەکە، بەسەرماڵی کاکەڕەشو برایەکانیاندا داوەو باوکیو برایەکانی تاوەکو بانگی بەیانی لە بەرگریو شەڕێکی سـەختدا بوون. ئەو چەکدارانە زۆربەیان لە کۆنە نۆکـەرو پیاوەکانی ئاغاکان

بوون، بۆیە بەکارهێنانیان لە دژی جووتیارەکان هێندە گران نەبوو، چونکە وەک هەمیشە گوێڕایەڵو نۆکەری ئاغاکان بوونو لە ناو جوولانەوە چەکدارییەکەش هەر ئاغاکان بەرپرسـیان بوون. ئەوەش بەلای کاکەڕەشو هاوڕێکانییەوە سەیر نەبوو، بەڵام ئەوەی کاکەڕەشـی بێتاقەت کرد ئەوەبـوو، چۆن دەبێ ئەو خۆیو هاوڕێکانی لەگەڵ هەمان جوولانەوەداو لە شـەڕی مـانو نەماندا بن، کەچی ئاغاکانیـش لـە هەمان جوولانەوەدا بـن، لەوکاتەی ئـەوان بەرگری لە خاکی نیشتیمان دەکەن، ئاغاو نۆکەرەکانیانماڵیان بدەنە بەر دەستڕێژی گوللە!

هیدۆ ڕووی لە کاکەڕەشی کرد: بە قسەی من بکەن لە سبەینێ زووتر نییە دەڕۆینەوە، ئەو شـەڕەی لێرە دەیکەین دەچین لەسـەر ماڵ و منداڵی خۆمان دەیکەین زۆر باشـترە! ئێمە بـە هەڵە لێرەین، ئەو جوولانـەوە چەکدارییە لە پێناوی خەڵکی هەژاردا نییە، بۆ ئاغاو کۆنەپەرسـتانە، هەر قسەی ئەوانیش دەڕوا. ئێمە، بە بۆنی کەبابەوە هاتووین، کەچی لێرە کەرداخ کردنە!

کاکەڕەش گوتـی: حەیفم لەوەی دێ شـەهیدو برینداریشـمان بۆ داون! هەرچی بێ، ناکرێ لە گەرمەی ئەوشـەڕەیدا سەنگەرەکان چۆڵ بکەین، چونکە دەبێتە بێبەڵێنیو ناپاکی. ئاغاکان کە بەرپرسو فەرماندەن، لە خوایان دەوێت ئێمە ئەوە بکەیـن، بۆئەوەی هەزار تۆمەتی ناڕەوامان بـۆ بهۆننەوە! هەرکات شەڕەکە تەواو بوو، بڕیاری خۆمان دەدەین، بە هیچ شێوەیەک ئامادە نیم لەگەڵ جووڵانەوەیەک خۆم بە کوشـتن بدەم، لە پشتەوەی من ماڵ و منداڵمان بدەنە بەر دەستڕێژی گوللە! ئاخر ئەوە چ جوولانەوەیەکە بە فیتی ئاغا ماڵی چەکداری خۆی گوللەباران بکات؟! ئەمڕۆ شـەڕ تەواو بێت، ئێمە سبەینێ دەڕۆینەوەو ئەو جووڵانەوە چەکدارییە پیرۆزی خۆیان بێت، با بزانین دەیگەیەننە کوێ!

# ٢٥

هەموو سەربانو گوێســوانەو دارو دیوارو سەری لەودە کاو کەروکەی بیرو تەنانەت پشتی مانگاکانیش هەڵمیان لێهەڵدەستێ!

هەر دوو سێ ڕۆژ دەبوو، پێش مردنی لەگەڵ منداڵی ئاوایی لەسەر گوفەکو زبڵــی، فاقیان دادەنایــەوە. ژنەکان بە دەرفەتی دەزانن هەتاوەکو ڕۆژ خۆشــەو هەتاوە، تێلەگەو پاشــوڵە زبڵی بەرپێی ئاژەڵەکانو پاشــماوەی نێو ئاخوڕەکان، لەبەررۆژێ هەڵبێخن بۆئەوەی وشــک بێتەوە، دووبارە ئەوجا، یان وەکو ئاگردوو نانو شــێوی پێ بکەن، یان بۆ ســۆبەی حەوایی[1] بۆ خۆگەرمکردنەوە. ئەو ماڵەمەڕدارانەی قشــپلیان لە وەرزی هاوین زۆر داکردبوو، حەوجەی ئەو جۆرە سووتەمەنییە نین، زۆرجار پاشماوەی هۆڵەمەڕەکان دەبەخشنە ئەو خێزانانەی قشپلیان نییەو پێویستییان بە سووتەمەنی هەیە، لەبەرتاوێ وشکی دەکەنەوەو سوودی لێدەبینن.

کێشــکە پاساریو ڕیشۆڵەکان برسین، چونکە چەند ڕۆژێکە بەهۆی ئەوەی باران خۆشــی نەکردووە کەلێنێکی بداتێ، تا بتوانن دانەوێڵەی پێویســت بۆ

---

١. سۆبەی حەوایی: ئەو زۆپایانەی کە تەنەکەساز دروستی دەکردن و لوولەیان هەبوو لەسەربان دەردەچوو، بۆ ڕاکێشانی دوکەڵەکەیان.

تێرکردنـــی خۆیـــان هەڵبگرنەوە، بۆیـــە چاوەڕوانن هەر کە ژنـــەکان بەرامپیلە زبڵەکانیان بە عەرزێ داداو ڕشـــتیان، کێشـــکە پاســـاری‌و ریشـــۆڵەکان خول دەخـــۆن‌و گەواڵەی دەکەن، چاوەڕێن هەرچـــی زووە ژنەکان زبڵەکە تێکوەربدەن‌و بڵاویبکەنەوە بۆئەوەی وشـــک ببێتەوە، ئەوەش خێری کێشـــکەو ڕیشۆڵەکانی تێدایـــە، چونکـــە دانەوێڵە جێـــماوەکان دەردەکەون‌و پێویســـتییان بە چینەو دانەدۆزە نابێت.

مـنداڵـــی ئاوایـــی، بەرلەوەی کێشـــکەو ڕیشـــۆڵەکان بەســـەر زبڵەکانەوە بنیشـــنەوە، هەردوو لەپی دەستیان لە یەکتری دەخشـــێنن پەنجەکانیان گەرم ببنەوە، تا بتوانن فاقەکان دابنێنەوە. ئاوی چاو و چڵمیان ڕێچکەی بەســـتووە، ئەوانیش بەســـەر دەستی قۆڵی چاکەت‌و ســـەربەرگەکانیان دەیسڕن، لە نزیک ئانیشـــکیانڕا تا وەکو پشـــتی دەســـتیان بە لووتیاندا دەهێنن، دەڵێی مۆسیقا لێدەدەن! سەردەســـتی چاکەتەکانیان وا ســـواقدراوە، چەند قات چڵمی ڕەقبۆوە کەوتۆتە سەریەک و وەک شوێن پێی شەیتانۆکە بریقەی دێت! قۆڵە چاکەت وا ڕەق بووە، خەنجەر نایبڕێ!

هەر بابایە خەریکی دانانەوەی فاقی خۆیەتی، ســـەرڕوومەتیان لە سەرمان شین‌و مۆر بووە، دەســـتو پەنجە ناسکەکانیان سوور سوور هەڵگەڕاون بەحاڵ گازمالووکە[1] و دەنکەگەنمی فاقەکان دەگرن. لە پەناو پەســـێو و ســـەرتیلەی خانـــووەکان چاودێریی فاقەکان دەکـــەن، داخۆ کامەیان بەختـــی هەیە دانەی داوەکەی دەکەوێتە بەر دەندووکی کێشـــکەیەک! پاڵەپەســـتۆی یەکتر دەدەن،

١. گازمالوکە: چیلکەدارێکی پێنج سەنتیم درێژ و هێندەی قەڵەمێک ئەستوورە، لە بەشی سەرەوەی فاقە بەستراوە، دانەی داوی پێوە دەخرێت.

یـــەک بە یەکێـــک دەڵێ: بێدەنگ بە لـــە فاقەکەی من نزیـــک بۆتەوە، دەی دەی هات هات، ئاییی! ســـڵی لێکردەوە! ئیدی لـــە چاوەڕوانیدا هەڵدەلەرزنو شەقەشەقی ددانیان دێ.

ئەوڕۆژە ڕەووفیشیان لەگەڵ بووە، هێشتا ئەجەل لە ڕەوی خۆی داینەبڕیبوو، سپوســـاغ بوو، هیـــچ عەلەمی نەبوو، ئاســـەواری هیچ نەخۆشـــییەکی پێوە دیارنەبوو، هەر لەدوای هێنانـــەدەری پیرەبارگینەکەی ماڵی خارە حەمەدی لە تەویلەو گەیشتنە لای منداڵەکان، هێندەی پێ نەچوو بوو بە شەڕەمنداڵێک، تیری بەچەپەی تێ برنەکاو سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسییەوە!

شـــەڕەکە لەســـەر ئەوەبوو، ژنەکەی خارە حەمەدی بارگینەکەی خۆیان لە تەویلەی دەرهێناو گەیشتە ڕاستی زبڵدانەکە، بەهۆی ئەوەی بارگینەکە هێندە پیربوو، هەرچـــی دەیخوارد هەرســـی نەدەکرد و وەک خـــۆی دەیهێنایەوە، بە تایبەتی جۆ، چونکە گەدەی ناکارا بوو، وەک گەدەی بارگینە جاحێڵەکان نەبوو پاشماوەی ئالیکە هەرسکراوەکە بپێچێتەوەو بیکات بە قەرسەقول. هەر کە لە زبڵدانەکە فیرکاندیو عەرزی داپۆشی، ئەو ئالیک جۆیەی خواردبووی، بەحاڵ زەردی کردبوو، بەساغی فڕێیدایەوە. دەتگوت دانی وە پێش مریشکان بکاو بە گۆڕێی وەربکا! ئەوەش لە بەرژەوەندیی ڕیشۆڵەو کێشکەپاساریو سۆفەقیتەو بوغـــازدا بـــوو، چونکە ڕزقێکی پـــاک و پوختەیان بۆ لەو گـــۆڕەی وەرکرابوو، هەموویان لە فاقەکان تەکینەوە و ڕوویان لە قونی پیرەبارگینی کرد!

منداڵـــەکان، بەوەی زۆر قەڵس بوون! یەکیـــان، بێئاگا لەوەی کوڕەکەی خارە حەمەدی لە پشـــتییەوە ڕاوەســـتاوە، جنێوی بە بارگینەکـــە دەدا لەبەرئەوەی چـــاوی نێچیرەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشـــا، ددانی دە جیرەوە بردن و هەتا دەنگی

تێدابوو بە ڕقەوە گوتی: ئەو بارگینە قۆترە ڕیسەکەی لێکردینەوە خوری، هەی دایکەکەی خێوت دەگێم، ئینشاللا ئەورۆ دەتۆپی!

کوڕەکەی خارە حەمەدیش، لای وابوو جنێودان بە بارگینەکەیان سووکایەتییە بە خێزانو عەشیرەتەکەیان، ئەو سووکایەتییەش قابیلی قەبووڵ نییەو ئەگەر لە قەوچەی نەداتەوە، دەکەوێتە بەرتۆمەتی ترسنۆکیو بێباکیی لە ئاست حورمەتی خێزانەکەیان. لەناکاو کۆرەمستێکی لە خالیگەی منداڵەکە ڕاکێشاو، برایەکەی ئەویش لە پشترا شاپێکی لێدایەوەو لە سەر براکەی خۆی کردەوە.

وای لێهات شەڕەکە بەرفراوان بوو، ئامۆزاو پوورزاش هاتنە نێو شەڕەکەو، هیچ منداڵێکی بێلایەن نەما بۆ نێوبژیکردن، ئەسحابەیی بەنێو یەکتری وەربوون. گەیشتە ئەوەی بەردەقانیشی تێدابەکارهات، سەرشکانیشی لێکەوتەوە. هەی لەوەی یەکێک تی بکاتەوە و بکاتە ئامانج! هەندێکجار ئەوەندە لەیەکتر نزیک دەبوونەوە، گەزەشیان لە یەکتری دەدا، دەتگوت میراتی بابیان بەش دەکەن. باش بوو پیاوەکان هاتنو بەبێ جیاوازی، هەرمنداڵێکیان بەرچەنگی دەکەوت شەقێکیان تێدەسرەواند!

لەو چەند ڕۆژەی دوایی، ملەخڕەیەکی ترسناک بەرۆکی ناوچەکەی گرتبووەوە. هەرکەسێک دەیگرت، یەکسەر دەکەوتە نێو جێی. لێرەو لەوێ چەند کەسێکیشی کوشت. نەخۆشەکە، لەدوای ملەخڕێکە نەیدەتوانی هیچ بخوات، هەتتا لیکی نێو زاریشی پێ قووت نەدەدرایەوە. ڕەووف پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو، کوڕێکی هەتا بڵێی لە بەردڵان و ڕوحسووک بوو، زەڕی کەسی نەبوو، بەهۆی زیرەکیو نەرمونیانییەوە بووبووە خۆشەویستی زۆربەی خەڵکی ئاوایی. شەڕە منداڵ، کەم واهەبوو ڕەووفی تێدا بێت. بەو

تەمەنــە بچووکەیـــەوە بناغەی کەســایەتییەکی جیــاوازو تایبەتی بۆ خۆی دارشـــتبوو. زۆر پێش تەمەن و زەمەنی خــۆی کەوتبوو، کوڕی گچکەی ماڵێ بـــوو، بە بەژنو باڵا هەرچەندە وردیلە بوو، لـــێ، زۆر زیرەک بوو. لە قوتابخانە خۆشەویستی مامۆســتاکانی بوو، لە ماڵی خۆیشیان پێگەی بەهێزبوو، وردە وردە قســەی بە هەند وەردەگیرا، ئەقڵ و هەڵسوکەوتی وەک پیاوی گەورە بوو. پەتای ملەخڕە، ترسێکی بێڕەزای خستبووە دڵی خەڵکییەوە. گوندەکان دەستی دکتۆرو داودەرمانیان نەدەگەیشتێ، هەموو ئەوەی دەتواندرا بۆ نەخۆش بکرێ ئەوەبوو شــەوێ بەرلەوەی نەخۆش بخەوێ، ســۆبەیەکی قشپلیان دادەخست، پشتی نەخۆشــیان لەبەر گەرمیی سۆبەکە ســووردەکردەوەو چەوریان دەکرد و بۆیان دادەماڵی و پاشان گەرم دایاندەپۆشی.

مردنـــی ڕەئووف، هەموو خەڵکی ئاوایی تاســاندو ئەندامانی خێزانەکەی و بە تایبەتی دایکـو باوکی، وێران کرد. لەدەســتدانی کوڕێکی ســێزدە ساڵان ئاســان نەبوو، مرۆڤی بە ئیرادەی دەویســت. لەگەڵ زریکــەو فیغانی دایکـو خوشــکەکانی، لەنێو گوندی بوو بە غەڵبەغەڵــبو تێکقڕان. هەر بابا بوو بە حەپەســانەوە ئەوی دیکەی لە مردنی ڕەووفی ئاگاداردەکردەوە. هەبوو لە سەر دیواری حەوشەیڕا ملی خۆی درێژ دەکرد و هاوسێیەکەی باخەبەردەکرد.

مەلای گوندیش، شــاقەلی کەوای لەبەر پشــتێنی ڕاکردو بە هەرەداوان بۆ ســەر تەرمی ڕەووفی بۆ ئەوەی ڕێوڕەســم چی پێویســتە، بیکات. یەک دوو ئەسپســوار بەڕێ کران بۆ ئەوەی هاواری مردنەکە بۆ خزمە نزیکەکانی بنێرن. بۆ کاری هاواربردن، بەزۆری ئەســپی خۆشــبەزو بە غار بەکاردەهێنران، پێیان دەگوترا (ئەســپی هاواری). زۆرجاریش بۆ هەواڵی گرنگیش بەکاریان دەهێنان.

هاوار بۆ بردن، تەنها خزمە نزیکەکانی مردووی دەگرتەوە.

لــە هەموو ماڵەکان، بــۆ ئامادەکردنی شــیوەغەریبە، دوکەڵی ئاگرو دوو بەرزدەبێتــەوە. ئەو شــیولێنانە، بۆ ماوەی ســێ ڕۆژ بەردەوام دەبوو. لەســەر سینی بۆ نێو پیاوانو بۆ نێو ژنان بەرێدەکرا. لــە هەرکۆلانێکی گوندی، پیاو، ژن، مێرمنــداڵ هەریەکەو ســینییەکی خواردنیان بە دەســتەوەیەو بۆ ماڵی خاوەنمردوو و بۆ مزگەوتێ. لە بەردەرگای ماڵی مردووی، شــینەک دەگەڕێ بۆ ڕەووفی جوانەمەرگ، نە ســەری دیارەو نە بن، ڕوو ڕنینەوە، سەر لەقوڕنان، پرچ دەرهێنان. دایکی، جلەکانی ڕەووفی بۆن دەکاتو هەڵیاندەتەکێنێو ســینگی خۆی بۆ دەکوتێ، هەر خوا دەزانێ چ حەشرێکی دەکرد، کەس توانای تێڕامانی نەبوو. خوشکەکانیشــی هەروەتر، هەریەکەیان کەلافەیــەک لە پرچی خۆی ڕنیوەتەوەو لە قۆڵ و باســکیان هالاندووە. بە نینۆکیان تەواوی ڕوومەتی خۆیان دەرهێنابوو، تەشــتێک قوڕیان لەسەر ســەریان ڕۆکردبوو. دایکی کاکەڕەشی، چاوەڕوان بوو ژنی کاکەڕەشــی (بووکەکەی) بگەڕێتەوە ماڵێ بۆئەوەی ماڵ چۆڵ نەبێت، ئەویش وەک ســەرەژنێکی بەتەمەنی گوندی، بەشداری شینو تازیەی ڕەووفی بکات. ژنێ کاکەڕەشی، ئەو دیارییەی چەند ڕۆژ لەوەپێش، مێردەکەی بەبۆنەی دەرچوونی کچەکەی ڕۆســتەمی ڕەحەمەتی بۆی کڕیبوو، بردبووی بۆ ماڵی ڕۆســتەمی، بۆ دەستخۆشی لێکردن بیدات بە کچەکەی، بۆ ئەوەی دڵی پێخۆش بێ و لەسەر خوێندنەکەی مکوڕتر بێت.

ژنــی ڕەفعــەت ئاغای، لەوکاتــەی بــەرەو تازییەکە دەڕۆیشــت، لە ڕێگا دیارییەکەی بەدەســتی ژنەکــەی کاکەڕەشــەوە بینی، لە دەســتی وەرگرتو تەماشای کردو هەندێک ئەودیو ئەودیوی کردو زۆری پێ جوان بوو، لێی پرسی:

ئـــەوە لە کوێتان کڕیوەو بۆ کوێـــی دەبەی؟ ئەویش دەڵێ: ئـــەوە کاکەڕەش لە هەولێرێی کڕیوەو بەبۆنەی بە یەکەم دەرچوونی کچەکەی ڕۆستەمی ڕەحمەتی، ڕایسپاردووم لەجیاتی خۆی ئەمن بۆی ببەم.

ئاغاژن تووڕەدەبێت: جا ئەو کچە شـێتو شـــوورە کەینـــێ لۆ ئەوەی دەبی دیاریـــی بدەیەی! ئەوان هـــەر فێربـــوون جلوجۆڕو ســـیپاڵی کۆنەی خەڵکی لەبەرکەن، فێری جلی نوێیان مەکەن! ئەویش دەڵێ: جلی ئاوریشم دڵی پیسی بنیادەمی ناشـــارێتەوە، کەسـێک ئەگەر هەناوی ڕەژی بێ، جلوبەرگ جوانی ناکات، بەڵام ئەگەر بەفر بوو، گونیەشی لەبەردابێ هەر جوانە!

هـــەر ژنێک دەهاتـــە تازییەکە، بۆ گریاندنی زیاتری کەســـوکاری مردووەکەو ژنـــەکان، چاوی دەگێڕا بۆئـــەوەی بزانێ کامەیان لەو ســـاڵەدا یەک لە عەزیزانی خۆی لەدەســـتداوە، نیشـــانی دەکرد، بۆئەوەی بیکاتە زەخیرەی گەڕێکی گریاندنی ئامادەبووان. یەکەمجار دەستی لە ملی دایکی مردووەکە دەکرد، تێر دەیگریاند، بە دوای ئەو ئاکارە جوانانەی مردووەکەدا دەگەڕا کە دایکی زیاتر پێی دەکولێتەوە، هەرچی ڕەوشـــتی بەرزو جوانی مرۆڤەکان هەیە، بە مردووەکەیەوە هەڵدەواســـێ، دوایی هەســـتی کرد ئـــاوی چاوەکانی خەریکە چک دەکەن، ئەوجارە دەســـتی لە ملی خوشکەکانی دەکرد، بە نۆرەو بە هەمانشێوە، ئەوانیشی دەگریاندەوەو برینی دەکولاندنەوە: لە خۆتان بێکەسێ، لە خۆتان بابانوێرانێ!

ئامانجیش لەو نمایشـــە ئۆینبازییە، بەس ئەوەبوو خۆی وەک دڵسۆزترین تازیەبارەکان نیشـــان بدا! ئەو جارەیان ڕووی لەو ژنە دەکرد کە ماوەیەک پێش، ئەویش یەک لە خۆشەویشـــتانی لەدەســـت داوە، ئامێزی بۆ دەگرتەوەو بەرەو پیلی دەچوو، دەســـتی لە ملـــی دەکردو دەکورکایەوە، نـــاوی مردووەکەی ئەوی

دەهێنا زمان: لە فلانکەسـت دێخم![1] دووبارە هەموو ژنەکان وەک فیکە بۆ عەلیشیش بکەی، لە قلوقلوویان دەداو دەیانکرد بە لشمەلیشم!

ئینجـا ژنێکـی دیکە بـە سـەردوولکەیەک وەڵامی دەدانـەوە. ئەوەی سـەردوولکەی کاریگەرتر بووایە، بە چاوی ڕێزەوە تەماشـا دەکرا. ئەویش بە دوای ئـەو پێهەڵدانو دەسـتەواژانەدا دەگەڕا کە گورچکبـڕو ناخهەژێن بوو. سـەردوولکەی گریێنەر لە تازییەکاندا ئەو زار ئەو زاری دەکرد. دەستە دەستە ژنی حەوت گوندی دەوروبەر بە جلی سەرتاپا ڕەشەوە لە گردۆلکەو ئاسۆگەکان، وەک ڕەوەقـەل بەرەو تازییەکە دەهاتن. بەشـداربووی تازیـەی ژنان، بەزۆری ژنە لەزگ وەسـتاوەکانو ژنە بەتەمەنەکان بوون، لـە تازیەکە کۆمەڵ کۆمەڵ دەوریان لە یەکتر دەداو جۆخینەیان دەبەسـت. هەریەکەو باسێک، هەرباسەی لـە ئاوازێک، ئەوەی دەیڵێن نایڵێنەوە، باسـی عەرشو قورشـی دەکەن، وەک لەوەپێش ئەو گریانو فیغانە هەر ئەوانیش نەبووبن!

- بووک درەنگ لە خەوێ هەڵدەستێ، کورەکەم بۆتە عەبدی ژنێ!

- کچـێ لەوەتای ئەو ژنـەی هێناوە، ژنە گەورەکـەی بەجارەکێ فەرامۆش کردییە.

- مێردە ملپانەکەی بۆتە عەبدی، شەش تاکبازنی زێڕی بۆ کڕیوە، بەخوای بازنەکان ناهێنێ!

- بە مەرگی ئەو ئەولادانەم ئەو داو و دەرمانەی نەکات، سـەگ بێزی نایە تەماشای بکات!

---

١. لە فلانکەست دێخم: بۆ مردوویەک دەگوترێ کە لەوە پێش مردووە، بە مەبەستی وەبیرهێنانەوەی خاوەنەکەی.

- بەخوای ئەو پیاوە لەوەتـــای چۆتە تەمەنەوە، جەرگی کۆڵیوم بە جاحێری وا نەبوو.

- دەڵێـــی نان لە ماڵی بابی دەســـت ناکەوێ، ئەو مێردە هەر نانو شـــەقی دەداتێ!

ژنە میهرەبانو ســـەلارو بێ قسەو قســـەلۆکەکانیش، دەستیان لە ئەژنۆیان وەردێنن‌و بەڕاستی هاوبەشـــیی خەمی خاوەنمردوون، کڕ دانیشتوون، مەتح و زەمبی کەس ناکەن!

ئەوڕۆژە بەڵقیس، هەرچەندە لە گوندێکی دیکەڕا هاتبوو، دەیویست شینی مێردەکـــەی خۆی لە تازییەکەدا نوێ بکاتـــەوە. لەوەتای مێردەکەی کوژرابوو، تازیەی نەدەبوارد!

بەڵقیس شۆڕەژنێکی هەتا دەست هەڵێنی کەڵەگەتو چاو و برۆ ڕەش بوو، لە جوانی، هیچی بۆ کەس نەهێشتبۆوە! هەر دەلعازی لەگەڵ چۆ ژووری، چاوی هەموانی چۆ ســـەر! ئەو ژنانەی بەلقیسیان دەناسی، لە هۆڕژنی گریانێیان داو ســـەد جاریان مێردەکەی لە ڕەووفی خست! هەرکە گریان دامرکایەوە، یەک لە دوای یەک دەچوونە بن هەنگڵی بەلقیســـی‌و ڕاسپاردەبارانیان کرد، هەریەکەو بـــۆ پیاوێک کە مێردیان پێبکا چ بـــە ژن یان بـــێ ژن. داواکارەکان هەمەجۆر بوون. ئاخر مێش، لە هەنگوینی دەهاڵێ! بەڵقیس بۆ هەموویان یەک وەڵامی هەبوو: هەرکەسێک تۆڵەی مێردەکەی بکاتەوەو بکوژی مێردەکەی بکوژێتەوە، مێردی پێدەکات.

ژنی دەمهەراشی بەدگۆی بەڕواڵەت داوێنپاک، زوو یەکتری دەدۆزنەوە، کە زمانیان لە زەم و زەمکاری، کەسی لـێ دەربازنابێ: کچێ ئەوە کەنگێ تازیەیە!

ئەوی دیکە دەڵێ: ئەیەڕۆ بابانت شێوێ، خۆ شەرمی نەکرد، لە کنەخۆی کوڕی مردووە، تێروپڕی نانخوارد، چەند دڵڕەقو بێڕەحمە! یەکی دیکە: تەماشای ئەو خوشــکانەی، لە حریتەحریتی خۆیان ناکەون، هەر دەڵێی براشــیان نەمردووە، ئەمن برام مرد دوو ســاڵان نە بنێشــتم جووی‌و نە ســەری خۆم لە خەنەی نا، ئەلعانیش کەس ددانی نەبینیم![1] ئێســتا دنیــا زۆر بێڕەحم بووە! بەوانەش دەڵێن خوشــک! لە کنەخۆ برایان مردووە، ئێســتاش دوو داوە پرچی خۆیان بۆ ئــەو برا جوانەمەرگەیان دەرنەهێناو دوو چەپەڵۆکیان لە ڕوومەتی خۆیان نەدا، شوێنێکی خۆیان نەڕنییەوە!

پیس گەرم داهاتوون! هەی لەوەی زووتر بێتە نێو قسان. هەبوو لەتاو ئەوەی کەلێنیان نەدەدا قســان بکا، بە نقورچان لە ڕانی ژنەکەی تەنیشتی خۆی دەدا بێدەنگ بێتو گوێی بۆ شــل بکات، بەڵام ئەو هــەر بەردەوامەو نۆرەی نادا بە کەس! بەڵام خۆ دەبێ ســەرەداوی بابەتێکی ســەرنجڕاکێش دەست پێبکات: ئەمــن لە بن باڵی خودایمە، نامــەوێ غەیبەتی کەس بکەم، چونکە فیتنەی لێدەکەوێتەوە! کە نــاوی فیتنەیان گوێ لێبوو بێدەنگ بوون و، ئەو، دەســتی پێکرد: دەڵێن بووکی فلانکەسی پەرۆکەی سوور نەکردییەو هەر لە ماڵی بابی ژن بووە، بابانی بە قوڕێ بگیرێ! ئەگەر لە ڕێی ســەراوێش خۆی بادەدا، دەڵێی مــەڕی بە دامێن‌و بەرۆکــە خۆی دەلەنگێنێ! وەک نەبــای دیبێ‌و نە باران. هێندە چاو و ڕووی قایمە، بە زمانی من نەبێت، خوایە بە خوای کەس لە زمانی منی نابیستێ! خوایە بە غەیبەتم بۆ نەنووسی!

---

١. کەس ددانی نەبینیم: کینایەیە بە نەکردنەوەی دەم بۆ قسەکردن و، بەتایبەتییش بۆ پێکەنین.

تاقمەژنی وا هەبوون خەونی چەند ساڵ لەوە پێیشیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. هەمووشیان دەیانگوت: هەر منداڵ منداڵ بووم ئەگەر بە مێردیان دام، لەنێو مندالأن مووروانێم دەکرد!

لە باریْ سەرەوە، سەرەژنی سەر بەهیزار دانیشتوون، نێوە نێوە بە دەنگێکی بـــەرز داوا لە ژنەکان دەکەن: ناوی خوای بێنن! ئێـــرە تازیەمانەیە، توخوا ژنینە بێدەنگ بن! هەندێک ژنی کامڵ، بێ خۆدەرخســـتن هەڵدەســـوورێن، نایانەوێ خاوەن تازیەکە، لە خزمەتو کەمنەهێنانی نانو چێشـــت، شەرمەزار ببێ، بە ڕوویەکی خۆش پێشـــوازی میوانان دەکەنو بەرێیان دەکەن. پێیانەوە دیاربوو ئەوان بەڕاســـتی بۆ یارمەتیو هاوخەمیو بارســـووکی خاوەنمردووەکە هاتوون نەک بـــۆ مەجلیس گەرمکردنو زەمو قســـەو قســـەلۆک. قۆڵیـــان لە کاریْ هەڵماڵیوە، هەریەکەیان خۆی بەرپرسیارو خاوەن تازە دەبینی.



# ٢٦

بەڵقیس، پێیەوە دیارنەبوو مێردی کردییە، یەکێک نەیناسیبا دەیگوت کچە! کەزییەکانی لەپشتەوە لە پشتێنی بەرەوخوار بوو، هێندە درێژبوون. هەموو خەڵکی ناوچەکە دەیانگوت: بەڵقیس جوانترین ژنی گوندەکانی دەشتی هەولێرییە، لەسەر چاوی کوێری دابنێ ڕوونی دەکاتەوە. کە لە حەوشەی دەهاتو دەچوو، بە کچێکی جحێڵی ماڵەبابان دەچوو. کە مێردەکەی کوژرا، ئەوەندەی بۆ گریا، ئەگەر تاقە یەک مردوو بە گریانو شیوەن زیندوو ببایەوە، دەبوایە مێردەکەی وی، یەکەم کەس بوایە کە دەژیایەوە، ئەوەندەی بۆ گریا! وای لێهاتبوو، منداڵە یەک ساڵانەکەی ڕاهاتبوو، بە دەنگی گریانو لاوانەوە نەبوایە خەوی لێنەدەکەوت! بەڵقیس، هەم دەگریاو هەم سەردولکەی ناخهەژێنی بە ئاوازێکی غەمناکەوە بۆ مێردەکەی دەگوت. لەدوای مێردەکەی، سەرافەتی کاری کشتوکاڵو ئاژەڵداری گرتبووە ئەستۆ، وای بەسەرهاتبوو بە ڕۆژ خەریکی کارەکانی بوو، شەوانیش گریانو لاوانەوە بۆ مێردەکەی. ئەوەندە غەمگین بەسەر تفەنگو ڕەختو ڕانکوچۆغەو خەنجەرو ئەو جلوبەرگانەی کە لە ناو بوخچەیەکی گوڵداردا هەڵیگرتبوون، دەگریا، کەم کەس هەبوو توانای گوێ لێگرتنی هەبێت! لەوانەی ڕۆژێک بەلقیسیان بینیبێت، کەم کەس

مابوو لە پیاوی بەژنو بێژن، خەڵکی لـــێ ڕانەسپاردبێ مێردی پێبکات، هەر هەمووی ڕەتدەکردنەوە. زۆرجار، لـــەو کاتانەی هێور دەبۆوە، لە فکرانڕا دەچوو، لەگەڵ خۆی دەدواو پرســـیارگەلێکی لەلا دروست دەبوو: ئەو کەسەی یەکێک دەکوژێ، خۆیشـــی یەکێک لە ماڵەوە چاوەڕێیەتی، ئەگەر ژنی هەیە لە دوای ئەنجامدانی کوشـــتنەکە، ژنەکەی خۆی لە ئامێـــز دەگرێ؟ منداڵەکانی ماچ دەکات؟ هەستی خۆشەویستی دەمێنێ؟! تام لە خواردنو خواردنەوە دەکات؟ ئایـــا پێکەنینی بیرناچێتەوە؟! چێـــژ لە بۆنی یەکەمبارانی ســـاڵ وەردەگرێ؟ بۆنـــی نان دەکات؟ لەگەڵ جۆلانێی کچۆلەکان دڵی جۆلانە دەکات؟! ئەتۆ بڵێی شەوان لەسەربان لەسەرپشـــتێ ڕابکشێو لە ڕێی کاکێشان مانگـو ئەستێران ڕابمێنێ؟ تۆ بڵێی قاتیل، حەزی لەوە بێت بەیانیان دەرگای کولانەی مریشکان بکاتەوەو دانیان بە بەر ڕۆبکات؟ تۆ بڵێی هەستی بۆنکردنی خەناوکە قەنەفرو سینگـو بەرۆکی داکیو بۆنی ئارەقەی کارکردنی بابە حەلاڵخۆرەکەی مابێت؟! ئەدی ئەتۆ بڵێی بکوژ، ڕۆژی جەژنێ کە دەبینێ یەک لە خێزانەکەی لەســـەر نانی جێژنێ ئامادە نییە، بیری بکات؟!

بەڵقیس، بەو چیرۆکـو داســـتانانە نەبێ کە تێیاندا بکوژ بە ســـزای خۆی دەگەییو تۆڵەی لێدەکرایەوە، وەڕەزیی بە هیچ نەدەشکا! بەلقیس، لە چاوەڕوانی کەســـێکدایە تۆڵەی مێردەکەی بۆ بکاتەوە، لەبەرامبەریشـــدا خۆی لەقەبەر بکاتـو لایەقی ئەوە بێت بێتە نێو پێخەفی مێردەکەی. هەموو هۆشـــی لەلای بینینی مەرگی ئەو کەسەیە کە هەموو ژیانی وێرانکرد!

دایم غەمبار و دڵشـــکاو، چاو بەفرمێســـک، خەو لێزڕاو. شەوەهای شەو تاوەکو یەکەم تیشـــکی خۆری بەیان لە دەلاقەی ژوورەکەیرا دەکەوتە سەر جێی

خەوتنەکەی، هەر بێدار بوو. خەیاڵ و خەونی شـەوانەی، وەک تەم و تارمایی هەموو شتەکانی لـێ تێکەڵ دەکردو، کەسیش هەستی بەوە نەدەکرد، لەنێو بەڵقیسـدا دوو بەڵقیس هەن دەستیان لە تیتکی یەکتر ناوە، هەر بەڵقیسەیان دەیەوێ بەڵقیسەکەی دیکە بە دوای خۆیدا پەلکێش بکات: بەڵقیسێک، ئەو کاتانەی بەئاگابوو، دەکەوتە ژێر فشـاری ڕق و تۆڵـەو تووڕەیی‌و وەرگرتنەوەی خوێن! بەڵقیسێکیش، لەو کاتەی کە شەو ڕادەشکا، لە بەینی خەو و بێداریی، ئەو شەوە خۆشانەی ڕابردووی، بەرۆکیان دەگرت، ئەستێرە بە ڕەوە دەرژانە سینەو بەرۆکی، حـەزی دەکرد تا خەو دەیباتەوە خۆی لە ژێر تریفەی مانگدا بشـوا. کاریتەکانی بنمیچـی ژوورەکەی، یەک یەک لەبەرچـاوی خەواڵووی دەبوون بە پیاوی سـینگ کوڵکن! لەو کاتەی کە خۆر هەڵدەکشاو بانگی ڕادەهێشتە بونەوەرە غەمگینەکان، بەلقیسی نەریتە باوەکان، جارێکی دیکە جاڕی دەدایەوە: تا تۆڵەی مێردە خۆشەویسـتەکەم، بابی کوڕە تاقانەکەم نەسێندرێتەوە، لەخۆ خۆش نابم، ڕۆژبازاڕی قیامەتێ لەسـەر پردی سـیراتێ دێتو یەخەم دەگرێو لێناگـەڕێ بپەڕمەوە! نا نا ویژدانم ڕێم پێنادا کوڕە تاقانەکەم لەژێر سـێبەری زڕبابی گەورەبێت! مەگەر ئەو کەسـەی تۆڵەی بابـی بکاتەوە، دەنا کەس بۆی نییە بێتە نێو جێو بالینگانم!

لـە دوای ئەو هەموو ڕاسـپاردانە، بـۆ هەموان وەڵام یەک ڕسـتە بوو: هەرکەسێک خوێنی مێردەکەم بسـتێنێتەوە، مێردی پێدەکەم، دەنا، هەتا ئەو ڕۆژەی کەزی سـپی دەهۆنمەوە، کەس سـەری خۆی لەگەڵ من لەسـەر یەک سەرینی نابینێ!

باپیر، شوفێری لۆرییەکی عەنتەرناشی سوور بوو. ڕۆژێک، چەند کەسێکی

خاوەن زەوی دەیانەوێ زبڵی سەر گوفەکی گوندەکان بکێشنەوە بۆ زەوییەکانیان، بۆئەوەی بەپیتو بەبرشت بن. لەگەڵ باپیری ڕێک دەکەون چەند کاروانێک زبڵیان بۆ بێنێ. لەو ڕۆژەدا دەست پێدەکا کە دەچنە ئەو گوندەیماڵی بەلقیسی لێیە. دوای ئەوەی باپیر لۆرییەکەی ئاوقای زبڵدانەکە دەکات، کرێکارەکان خەریکی بارکردن دەبن. باپیر لە پێشەوەی لۆرییەکە دانیشتبوو، لەناکاو نیگای دەکەوێتە سەر بەژنو باڵای ژنێک، پاشۆڵێک زبڵی لە بەرامپیلەکەیڕا هێنابوو بیرپێژێ. باپیر یەکسەر دڵی دەچێتە سەری، ئۆقرەو حەجمینی نامێنێ، بەلقیسیش بێئاگایە. باپیر باڵایەکی بەرز، سوورو سپی، هەتا بڵێی جوان، دوو چاوی قاوەیی ڕەشباو، ئەهلی کەیفو سەفاو جوانپەرستو دنیایی، هێندە قۆشمەچیو زمانێکی فریودەرانەی پێوەیە، کەم کەس لە چەنگی ڕزگاری دەبێت! بەهۆی ئەو تایبەتمەندیانەی، برادەرەکانی پێیدەڵێن باپیر سێبەندی[1]. لەنێو لۆرییەکەیڕا، لە ئەندامو لەشولاری بەڵقیسێ ورد دەبێتەوە، لێ، هەرچەندی دەمو چاوی لە جامی پێشەوەی لۆرییەکە نزیکتر دەکاتەوە، هەڵمی زاری، شووشەکە زیاتر تەڵخ دەکات و باش نایەنگێوێ. ڕۆژی دواتر، باپیر خۆی ڕێکپۆش دەکات، نیگای لە نیگای بەلقیسێ دەئاڵقێ، وەک هەڵۆ ڕۆیێتە کێشکەی، تێکیدەشکێنن، قەڵەمی دەستو پێی دەشکێ و، ئاشق و گرفتاری دەبێ.

باپیر کەوتە سۆراغی وردەکاریی ژیانو ڕابردووی بەڵقیسیو جێو ڕێو پێگەی کۆمەڵایەتی. کە زانی بێوەژنەو تاقە یەک منداڵی هەیە، هێندەی دیکە ڕۆچووە نێو بیرکردنەوە بۆ ئەوەی بە هەرنرخێک بێ بەدەستی بێنێ.

---

١. سێبەندی: ساختەچی، فێڵباز، قۆڵبڕ.

کەوتە پرسیارکردن لە سەر مەرجەکانی بەڵقیسێ. باپیر دەیگوت خۆشم نازانم لە دوای ئـەوەی چاوم لە چاوی چەقی، چۆن کۆتایی بە ژیانم نەهێناو ئێستا زیندووم! باپیر، لەگەڵ دڵی خۆی دەدواو بەڵێنی پێدەدا کە هەرچی دەبێ، نابێ دەستبەرداری بەڵقیسێ ببێ!

بەڵقیس هەموو شـەوێک، لەو کاتەی کە شـەو رادەشـکێو خەڵک لە شیرینخەودان، سەری سندووقە دارینەکەی، کە بە تەنەکەیەکی ڕەنگاوڕەنگی تەنـک ڕووپـۆش کرابوو، بـە بزماری وردیلـەی زەردی سـەرپان بزمارکوتو نەخشێندرابوو، وێنەی دوو بۆراقی لە بەرامبەر یەکتر تێدابوو، هەڵدەدایەوە. تایبەت بوو بـەو کەلوپەلانەی لە مێردەکەی بەجێمابوو: تفەنگێکی بڕنۆی کورتی سەرتۆپی خانەپان، قوتەبڕنۆیان دەگۆتێ، باریکایی قۆنداغەکەی، تۆقی تێل بازنی زیوی تێکرابوو، چوار ڕەخت فیشـەکی ئەسـڵی وەرەمانێو، قایشی خەریتەکان لە قایشـی هەمەدانـێ بوون، خەنجەرەکی دەبانـی جەوهەردارو تەزبیحـی زەردی کارەبا، بوخچەیەکی گوڵداری پەمەیـی جلوبەرگی تێدابوو، لە قەپرغەی لای ڕاسـتی سـندووقەکە، دەسـتێک ڕانکوچۆغەی مەرەزی گورگەیـیو پشـتێنی مەخمەر، جۆتە هـەوری سـۆرو بەلەکپێچی مەرەزی گوڵینگدار، پەسـتەکێکی مەرەزی بەخوێنو قیسـی پاکەتو شقارتەکەشی هەڵگرتبوو. هیچ یەک لە کەلوپەلەکانی هاوسـەرەکەی نەبەخشیبوو، وەک وەفاداریو بیرەوەری هەڵیگرتبوون.

لەلاکـەی دیکـەوە، باپیر دیمەنی ئـەو بێوەژنە شۆخوشـەنگە کەوتبووە خوێنیەوە. هەسـتی دەکرد بەڕوحیدا ڕۆدەچنو هەناوی دەکەن بە کەلاوە. شەو و ڕۆژ لە فکری ئەوەدابوو لە چ ڕێگایەکەوە دەسـتی بەو ئاوی حەیاتە ڕابگات!

هەزارو یەک بیرۆکەی بە مێشـــکیدا دەهات، هەر هەموویشی ڕەتدەکردنەوە. کاتێک دەگەیشـــتە بنبەســـت، دەکەوتە سەرزەنشـــتی خۆی: ئاخر پێم نالێی ئەتۆ چ ســـێبەندییێکی ئەگەر ئەو کارەت لەبەر عاســـی بێت، هەقە پاشناوی سێبەندیت لێوەربگیرێتەوە، ناوت ببێتە باپیرەگێژ!

چیرۆکی باپیرو بەلقیس، نە ســـەری دیارەو نە بـــن. باپیر نوقمی خەیاڵاتی خۆی بووە، هەرچەند دەکۆشێو سەردێنێو ســـەردەبا، نازانێ کێ ڕابسپێرێ بۆ لای بەڵقیســـێ دڵی بەدەستبێنێ. بۆ ئەوەش دەبێ متمانە لای بەڵقیس بەهێز بکا. لەناکاو پەنجەگەورەی خۆی گەســـت، شـــتێکی گرنگی وەبیرهاتەوە، ئەو پیرەژنـــەی هاتەوە یاد کە جارێک نێولەپی خوێندبـــۆوەو فاڵی بۆ گرتبۆوە. ئەو گەوهەرە مەگەر هەر لە ڕێگای ئەو پیرەژنەوە بەدەست بێنێ. ئاخر هاوڕێکانی هەر وا لە خۆڕایی نییە پێی دەڵێن باپیر سێبەندی! هەیپێی لێکرد بۆ لای ئەو پیرەژنەی قاوەی دەگرتەوە، بەری دەســـتی دەخوێندەوە، کاری پێناوی[1] دەکردو جارجار دەبوو بە بەربووکیش، بە ئامەخێل ناسرابوو.

ئامەخێل، زۆر لە باپیری ســـێبەندیتر بوو! بۆیە ڕایسپاردە لای بەلقیسێ. پیرەژن لە خۆشـــییان وریتەی دێ، ئەو کارەی هەر پێ ئاوخواردنەوە بوو، چونکە زۆر تەڵەی زەمانەی بە کلکی تەقاندبوو. هەر بۆ جوانیو دەرکەوتنی ددانەکانی پێشـــەوەی لە کاتی پێدەکەنێ، بەشـــی پێشـــەوەی ددانەکانی سەرێو خوارێ کیفزێڕ کردبوو. لە نێوەڕاســـتی لێوی خوارێرا تا ســـەر چەناگەو لەوێشەوە بۆ

---

١. پێناو: پلکەپێناو، دەلاڵ، ئەو ئافرەتەی لە گۆندا بە شێوازی خۆی، نێوانی کچ و کوڕێک یان ژن و پیاوێکی ڕێک دەخست. قسە و ڕاسپاردەی یەکێکیانی بۆ ئەوی دیکە دەبرد.

ســـەر قورگ و قۆڵتی گەردنێی، کوتابوو، چەناگەی کردبوو بە دوو بەشەوە، لە هەردووو بەری هێڵەکەش دوو ڕیز خاڵی وردو کوتراو نەخشێندرابوو.

گیرفانەکانی پڕ لە حەتۆتەو کشـــتەکـو حەوتدەرمانەو قوزەکەمتیار بوو. ئەنگوســـتیلەکانی دەستی، ســـەریان بە نقێمی ڕەنگاوڕەنگ گیرابوو. لە کاری پێناوەتیو بەیـــەک گەیاندنی ژن و پیاو، بێهاوتابوو، کەس باشـــاری نەدەکرد. خەڵکی دەیانگوت: چەنـــد ژنی بە مێردی لەبەردڵـــی پیاوەکەی ڕەش کردبوو و بـــە تەڵاقدانی دابوو. خەڵک ســـوێندیان دەخوارد بە چـــاوی خۆیان دیویانە دەنکەجۆی بە دیواری هەڵبردووە! تەسبیحێکی سەدو یەک دەنکی ڕەنگشینی لەگەڵ هێشـــووە نووشـــتەیەک، ڕاســـتو چەپ حەمایل کردبوو. ئامەخێل هەمیشـــە گیزانێکی تیژی لە گیرفانی بن کەوێیەکەیدا بوو بۆ خەتەنەکردنی کچان. دانیشتوانی زۆربەی گوندەکانی ناوچەکە، بۆ خەتەنەکردنی کچەکانیان ڕوویـــان دەکردە ماڵی ئامەخێلی. کچ لێی تۆقیبوون، نەک تەنها کچەکان، ژنە گەورەکانیش لێی دەترسان، ئاخر ناهەقیان نەبوو، ئامەخێل میتکەی دوو نەوەی ناوچەکـــەی بڕیبوو، لەگەڵ بینینی ئامەخێلی، هەر ژنەو ئازاری خەتەنەکردنی خۆی وەبیر دەهاتەوە!

وای پیشـــان دەدا کە بەرێکەوت ڕێگای کەوتۆتە ئەو گوندەو لەو گوندەشـــدا ئەو ماڵە. بەدەم بیسمیلڵایەکی درێژەوە: بیسسسسسسسسمیللا، بەدەستی من نەبێ بە دەستی عەیشێ و فاتمان بێ! لەو کاتەدا بەلقیس لە نێوەندی حەوشەی جلی لەسەر تەنافی هەڵدێخست. یەکەمجار، کە هێشتا ڕووخساری میوانەکەی نەبینیبـــوو، تەنها گوێی لە دەنگە گڕو پیاوانەکەی بوو، بۆیە بە دەم داپۆشـــینی دەرپێیە شـــووراوەکەی، ســـێ جاری فەرموو فەرموو لێکردو دەستی بەرەو ژووری

ڕاداشــت بۆئەوەی بەدرەقەو ڕێنمایی بکات. بەڵام ئامەخێل گوتی: یاخوا ڕووت سپی بێت کچە جوانەکەم، خوا مرازت حاسڵ بکاتو ئاقیبەتت خێربێت! دەیزانی ئەگەر بە کــچ بانگی بکات، خانەخوێیەکــەی وەک هەرژنێکی دیکە، دڵخۆش دەبێت بەوەی کە هێشــتا پێیەوە دیارنییە مێردی کردووەو وەکو کچ خۆی نیشــان دەدات! گوتی: کچە جوانەکەم دەمەوێ دەستنوێژێ بشۆم، چونکە بێ دەستنوێژ پێ ناخەمە هیچ ماڵێکەوە، نەبادا خێرو بەرەکەتی لــێ هەڵبگیرێ!

لە دوای دەستنوێژو چوونەژوورێ، داوای سینییەکی کرد. بەڵقیس بەپەلە بۆی هێناو لەبەردەمی داینا، پیرەژن دەستی لە گیرفانی بن کەوێیە مەخمەرییەکەی ڕۆکرد، جۆرکێکی چەرمی بە نیفــۆی دەرهێناو، وەک هەموو جارەکانی دیکە، گوتــی: ئەو جۆرکە لە چەرمی کوڕەبەشــە دروســتکراوە. نیفۆی جۆرکەکەی شلکردەوەو هەڵیتەکاند، چەند جگــو ددانەگورگــو ڕێویی، لەسەر سینییەکە ڕووکرد. جگەکەی لە نێوەڕاســتی سینییەکە داناو چەند جارێک ددانەکانی بە دوای یەکتــردا لە دەوری جگەکە خولاندەوە، لەناکاو جگەگورگەکەی بە قایم لە ســینییەکە کوتاو گوتی: ئەو گوندەی لای خۆرهەڵاتێ ناوی چییەو ڕێگای بە کوێدا بۆ دەچێت؟! بەڵقیس ناوی گوندەکەو ڕێگاکەی پێگوتو پرسی: پوورێ ئەوە بەدوای چیدا وێڵیو چیت لــێ ونبووە؟ ئامەخێل بە نەغمەیەکی گریاناوی گوتی: کچم چیت لــێ بشــارمەوە، بە دوای جەرگم، بە دوای کوڕەتاقانەکەم، کــوڕە بە دینو ئیمانەکــەم کەوتووم! چەند ڕۆژە، چــاوی دایکت کۆرەبی ڕۆڵە، لە داخی ئەو جیرانە نوێژنەکەرو تاریکولســەلاتە سەری خۆی هەڵگرت! کوڕە شــیرینەکەم دەیگوت: مەلای گوندی گوتوویەتی: هەرکەســێک جیرانەتی نوێژنەکەرو تاریکولســەلاتێ بکات، نە نوێژی بــە بەردەکەوێو نە ڕۆژووی بۆ

دەنووسرێ! ئێمە خێزانێکی ڕوو لە خواین، بەس لەبەر نوێژەکەم ڕووم لە ماڵی ئێوە کرد! لەناکاو منداڵەکەی بەڵقیسی بەئاگا هاتو گریا. ئامەخێل خۆی لە ناشارەزایی دا: ئەو منداڵە ئی کێیە؟ بەلقیس گوتی: کوڕی منە. ئامە بەسەرسووڕمانێکی ساختەکارانەوە: هیچ پێتەوە دیارنییە مێردت کردبێ، یان دەتەوێ پووری خۆت فریو بدەی؟! ئیدی سەری قسان بۆوەو بابەت گەرم بوو، دەردەدڵو گازاندە لە ڕۆژگار، یەکتریان پرسیارباران کرد. دوای ئەوەی گرێی دڵی خۆیان بۆ یەکتری کردەوە، هاتنەسەر هۆکاری شوونەکردنەوەی بەلقیسێ، کە ئەوە کاکڵی مەبەستەکەیە!

ئامە گوتی: ئەمن پیاوێکی زۆر ئازاو بەدەستوقامم پێ شک دێ، پشت لە شێری ناکا، دەستڕەش، بە دەستوبرد، زەلام کوشتنو ئاوخواردنەوەی پێ یەکە! مەگەر ئەو پیاوە لەتوانایدا بێت، بچێتە ژێر باری مەرجە قورسەکانی تۆوە! جا، چەندە بەوەجو ڕەشیدە، دوو هێندەش جوان و نەجیبە! بە مەرگی کوڕە تاقانەکەم، هێندەی داوە پرچەکانی منی، پیاو کوشتوون! باپیر!... ئەو داواکاریانەی تۆ هەر بە باپیری مەیسەر دەبێ! لەو گوندانەی کنە خۆمان منداڵی پێ دەنوێنن! باوەڕناکەم ڕۆستەمی مازەندەرانێ هێندەی وی زەلام کوشتبن! کەچی ئاوا ناوی دەرکردووە. ئەمن هیچ ناڵێم کچی خۆم، ئەگەر بە خۆت مەیلت هەیە بچمەوە باپیری دەنێرم بێتە کنت، قسەو قەولو قەراری خۆتی لەگەڵ ببڕێنەوە، حەزدەکەی پێی بڵێ کوێخای حەوت گوندانم بۆ بکوژە، هیچی لەبەر عاسێ نابێ. بەڵقیس گوتی: چوزانم! ئاخر هەندێک چوزانمی ژنانە، بەڵێی لێدەتکێ! ئامەخێل گوتی: کچی خۆم ئەوەی ئەتۆ لێی دەگەڕێی باپیرە باپیر، دڵنیاشم ئەگەر یەکتری ببینن هەردووکتان یەکترتان بەدڵ دەبێ!

ئامە، ئەوەندەی لەبەر بەلقیسـی خوێندو ئەوەنـدەی بە پیاوچاکی‌و ئازایەتی‌و بەخشـندەیی باپیریدا هەڵگوت، دەتگوت هەر لە ئەزەلەوە خودا باپیری وەک فریادڕەسێک‌و موعجیزەیەک بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەڵقیسێ دروست کردبێت! بەڵقیس، جارجار پووشکەی لە عەرزی وەردەداو دوو دڵی‌و دڵەڕاوکێی پێوە دیاربوو، لە بەینی شـک و یەقیندا، لەبەینی ئەوەی ئایا ئەو پێشـنیارو ڕێنوێنیکردنە خێری پێوەدەبێ یان شـەڕ! بەڵام ئامەخێل بە هیچ شـێوەیەک بواری بیرکردنەوەو بڕیاری پێنەدەدا. لەگەڵ قسەکانی، هەرجارەی بە قونەخشکە زیاتر لێی نزیک دەبۆوەو وەک ئەوە بێداری بکاتەوە، دەسـتێکی لە ڕانی دەدا، بۆئەوەی لەنێو گێژاوی بیرکردنەوە دەریبێنێ‌و ناچار بەو بڕیارەی بکات کە ئامە خۆی، مەخسەدیەتی و لە مێشکی ویشدا بیچەسپێنێ.

هەژدەر هەژدەر قسـەی لە زاری دەهاتنە دەرێ. لەو کاتانەی دەهات قسەی لـێ ببڕێ، ناچار ئەو بۆشاییەی بەبێ بۆنەو، بە پێهەڵدانو تاریفی بەڵقیسێ، پڕدەکـردەوە: ئەتۆ ژنێکی فامیدەی! ئەقڵێکی چاکت هەیەو لەشـێکیش، کە ئەوەندە هەسـتی بە گەرمایی لەشی پیاوان نەکردووە، کە پێویستییەکی ژیانە! مخابن جوانێکی وەکو تۆ بێموراد بێ! ئەتۆ ئەو ژنە نی چاکەو خەراپەو قازانج‌و زیانی خۆت نەزانی‌و بوێری بڕیاردانت نەبێت، ڕێویت هاتۆتە سەرسـەدەی، لە کیسـە خۆتی مەدە! دیارە کە ژنێکی سەلاری بۆیە خەڵک ئەوەندەیان لە زاری خۆشە کە بانگت دەکەن بەلقیس خان!

کۆتایی قسـان ئەوەبوو، هەفتەی ئایندە بەڵقیس چاوەڕوانی باپیری دەبێت، لـە ماڵەکەی خۆی. بۆئـەوەش نهێنیی کارەکـە پارێزراو بێـت، باپیر لەگەڵ ئامەخێلیـدا بێت، نەبادا هەواڵی ئەو ڕێککەوتنە بە گوێی بکوژی مێردەکەی

بەڵقیسێ بگاتەوەو جێی خۆی بگۆڕێو خۆی ون بکات!

بەڵقیس، ئەورۆژانــەی یەکێک برینەکانی دەکولاندنەوەو نەیاندەهێشــت قەتماغە بگرێ، شــیوەنەکەی لــێ نوێ دەبووەوە. ئەو شــەوانەی لە غەمی تەنهایی خۆیو فیکــرو خەیاڵی هاوســەرەکەی بە لاوانــەوەو پێداهەڵدانیدا بەســەردەبرد، لاوانەوەیەکــی ســەرلەبەر فرمێســکو هەناسەســاردی بوون، کەمکــەس هەبوو گوێی لێبــێو بتوانێ بەری فرمێســکەکانی خۆی بگرێ! بەڵقیس، چونکە دایکی لە کوردەکانی باکوور بوو، لاوکبێژەکی دەنگخۆش بوو، ئەو لاوکانەی لە دایکییەوە بۆ مابۆوە.

ســەری ســندووقی بۆراقەکــەی هەڵدەدایــەوەو بەســەر کەلوپەلەکانی هاوسەرەکەیدا دەیگوت:

**بە دەشتێ مووسڵێ داکەتم عەردێ پانە**
**تفەنگێ دەستێ کوڕەلاوکێ من تێل بازنە خانە پانە**
**ئەزێ ڕابم کراسەکێ سۆرێ فیستانێ بکەمە بەرخۆ**
**بەردەرکێ ماڵێ بابێ خۆ بە مسکو عەمبەرو گوڵاوێ بڕەشینم**
**ئەنگۆ نزانن کوڕەلاوکێ من لە بەژنێ میوانە**
**دە وەرە وەرە بە قەراتێ دوێنێ داکەتم ڕێ لسەرە**
**کوڕۆ تە بە ڕۆژێ قاچاغێ دەولەتێ بە،**
**شەوێ لە سێبارێ نیوە شەوێ خۆ باوێ بن چەپەران، هێدی هێدی وەرە**

**حەیفێ من ئەو حەیفە هەرچەندی حەکیمو لوقمانان دەینمە سەرە**

**لتالعێ من خوێنێ سۆر لە بن پەستەکان نایەنە دەرە**

**ئێوارە ڕۆژ گەلەك درەنگە**

**ئەنگۆ زەینێ خۆ بدەنێ لە داری شەکرانێ گەرمەشەڕە**

**لە گوێ من خۆشدێ دەنگی کچك چاپو**

**جامبێزارو سێباری ماهوزەڕە**

**دەستە مەرهەمەکێ بگرمەوە**

**بدەمە بەر شەوبایێ شەوێ**

**بورجی ئەستێران دانێمە سەر برینێ**

**کوڕە لاوکێ خۆ برین هەری لە ژانو هەری تەڕە!**

کە لەسەر جێگاکەی ڕادەکشا، چاوی دەبڕییە کاریتەکانی بنمیچەکەو لە فکران ڕۆدەچوو و، بە هەناسەساردی لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ئای فەلەک چەند خاینی بە من! چەندت سووڕاندم و هەڵتەکاندم! چەندت بەملاو ئەولایدا دام! هێشتاش نازانم لەو چەرخو خولەتدا بە کوێمدا دەدەیو چ پەندێکم بەسەردێنی! لە ناخی خۆیدا جەنگێکی بێئامانی بەرپاکردبوو، لە مابەینی ژیان و غەریزەو لەزەتو هەوەسو چێژوەرگرتن لە ڕەگەزی بەرامبەرو، لەلایەکیش، دابو ڕەسمی کۆمەڵگا کەلەپچەی کردبوو. لەو دووڕیانە حەپەسابوو نەیدەزانی کام ڕێگەیان بگری، یان ئەوەتا بۆ خۆی بژی یان بۆ خەڵکو دەوروبەری. بە هەناسەیەکی ساردەوە خۆی وەرگێڕا: وا ڕۆژگار ماشەری هەودای تەمەنم هەڵدەوێژنێ، هاوارە لە

من، دنیای ڕووناک‌و خۆشی جاران، لە من ڕەشهەڵگەڕاو لە تاریکایی وەرپێچرا! سەرێکی لە دەرگای بردە دەرێ بۆ حەوشەی، هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵمژێ.

هەرچەندی لە ئاسمانێ هەڵدەڕوانم ئەستێرەیەکی گەش نابینم دڵی خۆمی پێخۆش بکەم. ئەستێرەکانیش کاڵ بوونەتەوە! کە پەنجەرەش دەکەمەوە هەوایەکی غەریبو غەمناکی لێدێت، وەک دڵم خەبەری دابێت، دەمێک بوو لەو ڕۆژە دەترسام، ئەوا تووشی بووم! ئەمن هیچ ئەو سەرزەمینەی جارانم وەبەرچاو نایە کە مانگ ڕووناکی دەکردەوە! هیچ شتێک وەک خۆی نەماوە، دەڵێی خۆشمم ون کردووە!

زۆرێک لە ڕازو گلەییەکانی لە ژینگەیەکی تەواو مێینەدا هەڵدەقوولان. سەرما شانو پیلی تەزاند، ناچار بوو بچێتەوە ژوورێ، لەبەرخۆیەوە: دەی با بزانین ئەو باپیرەی قەرارە گرێو تەلیسمی بەختمان بکاتەوە، بزانین ئەو چی لە باراندایە! ئای چەند لە پیاوی درۆزن دەترسم! ترس لەوەی ژیانم لەوەی ئێستاش وێرانتر بکات! نا، کێ دەڵێ درۆزنە! خۆ ئامەخێل لەسەر دوو گردی نوێژی، ئەو هەموو سوێندەی هەروا نەخوارد کە باپیر پیاوێکی ڕاستگۆو سەرڕاستەو سەری خۆتی پێ بسپێرە! دەی خۆ لە قسەو قسەلۆکی خەڵکیش ڕزگارم دەبێت، چیدیکە لە تازیەو سەراو و دەراوان خەڵک پێم ناڵێن: ئەرێ بەلقیس خان خۆ ئەتۆ جوانو جحێلی بۆ مێردێکی ناکەیەوە؟ کەس لە دوای کەس ژیانی پێ تەرک ناکرێ، گوناهە لەسەر منداڵێکی سارەوەختی دابنیشیو کەزی سپی بهۆنییەوە، ئەتۆ تازە سەرەتای ژیانتە، ئاوزەی تۆ هێشتا مێردیشیان نەکردییەو هەر کیژن لە ماڵەبابان! دەی! هەر نەبێ ماڵەبابیشم کەلەکەیان دەکەوێتە عەرزی لەڕاستە من. چونکە دڵیان هەر لە چەنگیانە، نەبادا ڕۆژێک گوێی

شـــەیتانی کەڕبێت، بەهۆی منـــەوە لەنێو خەڵکی مێزەریـــان خواربێت! ئەو بیرکردنەوەو هێنان و بردنانەی، هەموو لە بەرژەوەندیی باپیریدا بوو!

ئێوارە ڕۆژ لەســـەر زەردییەو بەرەو ئاوابوون ڕادەخوشی. باپیر، تی چاوێکی هەمیشـــە لەو ڕێگایەیە ئامەخێل پێیدا دێتەوە. تازە دەهات سێرە هەڵبگرێ، هەواڵـــی ڕاگەیاندێ: ڕاســـپێردراوەکە بەســـەرکەوتوویی هاتۆتـــەوە، بەڵقیس هەفتەی ئاینده چاوەڕوانیەتیو ئامادەی میواندارییەتی! باپیر، گەز گەز باڵای دەکرد، خەریک بوو باڵ بگری لەخۆشـــیان، ئافەرینی لە ئامە کرد. ســـەرباری هەرێی کـــراسو کەوێیەکـــی مەخمەر، دەستخۆشانەیشـــی پێـــدا. لە بیری ئەوەیدابوو داخوا ئەو ڕۆژە چۆن پێشـــوازی لێدەکرێ، کەوتە جووڵەی ئەوەی کە تفەنگو ڕەختو ئەو کەرەســـتە جەنگیانە لە کوێو لـــەلای کێ پەیدا بکات! بەرلەوەی ئامە جێی بهێڵێ گوتی: دەمزانی ســـەرکەوتوو دەبی. دڵنیام ئەگەر منو تۆ یەک بگرین، ئاوقاتی حەوت دەوڵەتان باشارمان ناکەن!

خەڵکـــی ئەو چەنـــد گوندانە، هەموو لـــە بنەچەکرا یەکتریی دەناســـن. کاکەڕەش هەموو جارێک، کە باســـی باپیر سێبەندی دەهاتە گۆڕێ، دەیگوت: باپیر هەرکاتێک لەگەڵ قســـان زمانی بردە عاســـمانی زاری، هەســـت دەکەم فێڵێکی لەبن سەرییەو دەتوانێ مەلای دوازە عیلم لە دین وەربگێڕێ!

باپیر، بەدەم قســـەکردنەوە دیقەتی کەوتە ســـەر دەنکەمێوژێکی سووری قاوەیی باو، لەســـەر لێواری ئەو دەلاقەیەی تەنیشـــتی، هەڵیگرت و دوو فووی بەهێزی لێکرد لە تۆزو خۆڵ پـــاک ببێتەوە، هەڵیدایە زاری. بەڵام هەرچەندی دەیجوویی، لەبن ددانەکانی چڕتر دەبوو، تامیشـــی لە جیاتی ئەوەی شـــیرین بێت، بە لای سوێریدا دەچوو، بۆیە بە دەم مڵچەمڵچی دەنکەمێوژەکەوە گوتی:

ئامەخان ئەو دەنکەمێوژە بۆ وا سوێرەو ناجورێ؟ ئامەش گوتی: خۆ مانگێک دەبێ دەنکێک مێوژمان لە ماڵێدا نییە! باپیر گوتی: لە سەر لێواری ئەو دەلاقەیەم هەڵگرتەوە. ئامەخێل وەبیری هاتەوەو قاقایەکی کێشا، خەریک بوو هەموو ددانە کیفزێڕەکانی دەرپەڕن: کوڕە خۆ ئەوە مێوژ نەبوو، میتکەی ئەو کچە هەراشەی بوو کە چەند ڕۆژ لەوەی پێش خەتەنەم کردو میتکەکەم لە سەر لێواری دەلاقەکەی دانابوو، دوایی لە بیرم کرد. ئامەخێل هەر پێدەکەنیو باپیریش میتکەی دەتفاندەوەو زاری خۆی پاک دەکردەوە. ئامە گوتی: دەی خۆ ئەتۆ سەری تێدا بکوڵێنی ئۆخەت نایێ!

باپیر بۆ گەیشتن بە بەلقیسێ، ئامادەیە بەرگەی هەموو شتێک بگرێ کە لەو ڕێگایەدا دووچاری دەبێت. هەر نێوە نێوە ڕووی لە ئاسمانێ دەکرد، هەزار جار دوعای بۆ ئەو ڕێکەوتو قەدەرە دەکرد و شوکرانە بژێری خوای کرد کە لەوڕۆژەدا ئەو ژنەی ناسیو ئێستاکە خەریکە پێی دەگا! بەر لە وادەی سەفەرەکەی، پێویستە سیماو جلوبەرگی بگۆڕێت، کەوتە خواستنەوەی تفەنگو خەریتەو ئەو کەرەستە سەربازییانەی کە دیمەنی پیاوکوژێکی دەدەنێ! ڕانکوچۆغەیەکی مەرەزی ڕەنگ پووشی لەبەرکرد، دوو هەوری سووری لەسەری نا، هەتا چۆکان خۆی هاوێشتە نێو بەلەکپێچی مەرەزی بە گوڵینگان، نیو تۆپە پشتێنی کەڕنەکی سپی گوڵپەمەیی لە پشتی هاڵاند، خەنجەرێکی دەسک سپی پشکەزیوی لەبەرپشتێنی ڕاکرد، تەسپیحێکی دەنک گەورەی تێهاڵاند، ئەگوستیلەیەکی زێڕی گەورەی لە پەنجەی کرد، ئەگەر چەکو تەقەمەنییەکەی نیشانەی پیاوێکی شەڕکەری وێنا دەکرد، ئەو ئەنگوستیلەیەش نیشانەی پارەداریو خواردەیی پیشان دەدا. تەراشێکی

کردبوو، ڕوومەتی، کێچ خلیسکی لێدەبرد! دوو خەریتە فیشەکی لە پشتی بەستو دوو خەریتەشی ڕاستو چەپ لە شانی کرد.

تفەنگێکی پەڕەشووتی تەیارەشکێنی لە شانی کرد، پاکەتەجغارەیەکی غازیو شقاتەیەکی لە گیرفانی نا، دووربینی بە ملی خۆیدا شۆڕکردەوە سەر سینگی. باپیر، زمانە فریودەرانەکەی چەندە پاراو و کاریگەر بوو، بۆ گۆڕینی ڕواڵەت و کەسایەتیشی، وا خۆی گۆڕیبوو داکو بابیشی نەیاندەناسییەوە!

زۆر قسە هەبوون کە دەیزانی دەرپەڕاندنیان گومان دروست دەکەن، پێش ئەوەی لە زاری بێنەدەرێ، بە مەڵاشووی دەیگرتنەوە!

ئەو کەرەستانەی هەر هەمووی لەلای برادەران بە ئامانەت وەرگرتبوون، چونکە باپیر شوفێری لۆری بوو، ئەو شار ئەو شاری دەکردو بەزۆری پانتۆری ئەفەندی دەپۆشی، بەس بۆ فریودانی بەرامبەر، ئەوڕۆژە ئەو هەموو جلوبەرگو تڕوتفاقو کەرەستەجەنگییەی بەخۆیەوە کردبوو، ئەوانەش، ڕواڵەتی پیاوکوژێکی پیشەیی‌و مەعلانی پیێ بەخشیبوو!

هەرچەندی تەماشای باپیرت دەکرد، ئاگری لێدەباری! لەو باڵاو قەڵافەتەی، جێی درهەمەکی بە دەرەوە نەبوو، هەمووی چەکو ئەسبابی جەنگی بوو. بەهۆی ڕەختو قرتەو ئاوەزێنان، هەر لە دوورڕا بریقەی دەهاتو دەبریسکایەوە. بەو خۆقایشپێوەکردنەو، شێوازی تفەنگ لەنێو دەستگرتنەی، پیاو نەبوو لێی نزیک بێتەوە! بە زمانی جەستەو چاوسوورکردنەوەی بە خەڵکی دەگوت: دڕەن لە پێشم! ئەوەی لە ماڵێ خۆی زیاد نییە لێم دوور بکەوێتەوە! لەو کاتەی گەیشت، تەواوی منداڵەورتکەی ئەو گوندەی بە دوای کەوتن، دەتگوت عاجباتی، یان تەنێکی نامۆ ڕووی لە گوندەکەیان کردووە! هەموو وایان

لێدەڕوانی، لە شـێوەی تفەنگی لە گۆڵمیدایەو شەقاوان بە توندی لە عەرزێ دەکوتـی، ڕەنگە یەکێکی بکـوژێ! بۆیە، هەموو منداڵـەکان حەزیان دەکرد ئەو کردەیە ببینن کە لە زەینی منداڵانەی خۆیان دایانڕشـتبوو. باپیر لەناکاو سـەنگرایەوەو ڕووی بۆ لای دواوە وەرگێڕا، منداڵان هەر یەک بەلایەکدا خۆیان دایە بەرپەناو پەسێوان تا نەکەونە بەر غەزەبی باپیری! لـێ، ئەو دڵەڕاوکێیەی منداڵان زۆری نەخایاند، باپیر هەتا دەنگی تێدابوو گوتی: منداڵینە ئەو گوندە دوکانـی لێیە؟ منداڵەکان، بەو پرسـیارە ئاهێکیان لە دڵی گەڕاو گەشـانەوە، هەموویان پێکەوە گوتیان: بەڵێ مامە، لەلای مزگەوتێیە، پێت پیشان بدەین؟ هەریەکەیـان هەوڵـی دەدا، بۆ ئەوەی باپیر لە خـۆی ڕازی بکات، بەڵێ بەڵێ مامە، شـەکرۆکەی کیرە قـازیو ڕازیانەو بەداملی هەیـە! منداڵێکی دیکە ئەوەشـی لـ زیاد کرد: ڕەحەتەلوقمیشـی هەیە! منداڵان پێشبڕکێیانە لەسەر ئـەوەی هەرچی زووتر باپیری بگەیەننە لای دوکانەکە. دەسـتیان ڕاداشـت: ئەوەتا لەو کۆڵانەی دەسووڕێینەوە دەگەینە دوکانەکەی! بەرلەوەی لە دوکانەکە بچێتـە ژوورێ، تفەنگەکـەی لەسەرشـانی دانـاو لوولەکەی بە دەسـتێوە. دوکانەکە بۆ هەڵسـووڕانو خۆفشـکردنەوەی باپیری بچـووک بوو، هەرچەند جاری دەسـووڕایەوە بۆ سەیرو تەماشای شـتەکان بە قۆنداغەی تفەنگەکەی ڕستەیەک شووشەفانۆسو شووشـەلامپای دەشکاند! دوکاندارەکەش بۆئەوەی باپیری لـێ توورە نەبێت، خەتای شکانی شووشەفانۆسو لامپاکانی لە ئەستۆی بچووکی دووکانەکە دەئاخنی! کاتێک باپیر داهاتەوە، ڕەختەکانی پشـتی بووە جێی سەرنجی یەک لە منداڵەکان، دیاربوو لە ماڵێ ئەهلی تفەنگ بوون:

مامە مامە! ئەو ڕەختانەی پشـتت سەراوین بەسـتراون، دەبێ گوللەکان

نووکیـــان لەلای خوارێ بێو قەوانەکان لەلای ســـەرێ بن! باپیر بۆئەوەی تەریق نەبێتەوە: ئەوە شەوێ بۆ شوێنێک دەچووم، تاریک بوو نەمدیوە.

بەرلەوەی بچێتە ماڵی بەلقیســێ، ئامەخێل گەیشتبووەجێ، بە بەلقیسی گوتبـــوو، ئەمن لەو دیووەی ڕادەکشـــێم، هەرکاتێک باپیر گەیشـــتەجێ، ئێوە قسەی خۆتان تەواو بکەن! باپیر لە منداڵەکانی پرسی: پوورم لە ماڵی بەلقیس خانیە، ماڵیانم پیشان دەدەن؟

لە دەرگای حەوشـــەی ماڵی بەلقیســـێ وە ژوور کـــەوت، ئەوەندە بەتوندی نێوقەدی تفەنگەکەی گرتبوو و لە حەوشەی بە چاشمیشی لە هەر چواردەوری خـــۆی ڕادەمـــا، وەک ئەوە وابـــوو ئەو کەســـەی دەیەوێ بیکـــوژێ، لە یەک لـــەو ژوورانەدا بێـــت، ئاوا ئامادەو لەســـەرپێیە! ئەوەندە بەتونـــدیو لە ناکاو هەڵدەسووڕاو دادەســـووڕا، وێنەیەکی خولەپیزانەی بەخۆی دابوو، چەرخەلەی دەدا، مێش حەدی نییە پێیەوە بنیشـــێ! سەرنجێکی درۆزنانەی دایە هەموو پەناو پەسێوێکی ئەو ماڵەی، نەبادا بۆی لە کەمین بن!

بەڵقیس کاتێک ئەو پیاوەی ئاوابینی گوتی: بیســـمیللا! ئەو پیاوە زەڕێکی بەنێوچاوانییەوەیە! لەلایەکی دیکەشـــەوە ئومێدی بۆ پەیدابوو، ئەو کەسەی بەدوایەوە عەبداڵە، بەپێی خۆی هاتۆتە بەردەستی!

باپیـــر، لە هەموو ئـــەو پیاوانەی داوایـــان لە بەڵقیســـی کردییە مێردیان پێبکاتـــەوە، زەلامکوژتر دیاربوو! کۆخەیەکی درۆینەی، وەک ئاگادارکردنەوەی خاوەنمـــاڵ بۆ کـــرد، قورگی خۆی ســـاف کـــرد، دووجار بـــە دەنگێکی بەرزی نێرانە گوتی: ماڵـــێ! ماڵێ! کێ لە ماڵێیە؟ ئـــەرێ میوانی ڕادەگرن؟ هێندە بە هەســـتیاری پێی لەســـەر زەوی دادەنێ دەڵێی دێوجامـــەی پێیەو دەچێتە

پارێزی کەوان! بەلقیس بە دەنگێکی مێینانەو گفتولفتێکی شیرین وەک خانەخوێیەکی خانەدان فەرمووی لە باپیر کرد بۆ ژوورێ. باپیر خەریکە لە خۆشیاندا باڵ بگرێ. بەڵقیس، وەک ڕێزلێنانێک، هەرچەندی دەستی ڕاداشتو بەدرەقەی کرد بۆ لای سەرەوەی ژوورەکە بچێو دابنیشێ، بەڵام باپیر خۆی وەک دووژمندارێک دەنواند، بۆیە نەچووە لای سەرەوە، لە بەرامبەری دەرگای حەوشەی دانیشت، وەک ئامادەبوون بۆ هەر ئەگەرێک!

بەڵقیس زۆری بەخێرهاتن کردو لێی پرسی: کاکە زەحمەت نەبێ پرسیارێک! ئەویش گوتی فەرموو! ناوی بەڕێزت! گوتی: باپیرم. بەڵقیس گوتی: ئەگەر ئەمن هیچ بزانم، ئەتۆ ئەو باپیرەی ڕاسپاردەکەت ناردبوو؟ ئەویش سەرێکی بۆ لەقاند، یانی بەڵێ!

پاکەتە جغارە غازییە بریقەدارەکەی دەرهێنا، جغارەیەکی بە ئاگرکردو پاکەتو شقاتەکەی لە تەنیشت تفەنگەکە لە پێشەخۆی لەسەریەک دانا. بەو دەستەی کە ئەنگوستیلە زێڕە گەورەکەی تێکردبوو، جغارەکەی بۆ زاری دەبرد. لەگەڵ هەر مژێک، دوکەڵو درۆ بەیەکەوە لە زاری دەهاتنە دەرێو وەک کشتەکی ڕەشبەڵەکی دوعایان، تێکدەهاڵان!

هاتنە سەر ئەسڵی قسان. هەندێک داواکاریو مەرجیان بۆ یەکتری باس کرد. باپیر، بەهارێکی لەو ژوورەیدا سازکردبوو، نەبێتەوە! قەرسیلو گیای بۆ بەڵقیسی هێنابووە چۆکان! دیاربوو هیواکانی بەڵقیسیش لە چاوانی باپیریدا پەڵەی دابوو!: تا لەو دنیا وێرانو بە قوڕێ گیراوەیدا دەژیم، گیرۆدەی ئەو پەیمانەم بەخۆمم داوە، ئەگەر قەتاو قەت لە سێبەری خاترجەمیش دانەنیشم! مەگەر لێرە بەدواوە خودا دەرگایەکم بە ڕوودا بکاتەوە! باپیر، دەست لەسەر دڵ،

لە چاوەڕوانی دوابڕیاری بەڵقیســـێ، جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند! داواکاری بەڵقیسێ تەنهاو تەنها یەک قسەیە: کوشتنەوەی بکوژی مێردەکەیەتی! باپیر هەستایە سەرچۆکان، سوێندی خوارد ئەگەر بچێتە حەوت تەبەقەی ئاسمانێ، لەسەرپشـــتی هەوران بخەوێ، دەیهێنمەوە خوارێ! حـــەوت ڕوحی دەبەردابن هیچیانی پێ ناهێڵم! حەوت عەشـــیرەت لە پشـــتی بن، پیاو نەبم ئەگەر وەکی گورگی نێو مێگەلەمـــەڕی بەنێویان نەکەومو کەلوکرۆمیان نەکەم! با کەس بە باپیر بانگم نەکات! ئینجا هەندێک کوشتنی خەیاڵی بۆ گێڕایەوە، کە چۆن هەر دەکوژێو ناشیانشـــارێتەوە! جار وا هەبوو هێنـــدەی زیاد پێوەدەنا، هەر بەخۆی زەردەیەکی بۆ درۆکانی دەهاتێ! بەڵقیس ناوی بکوژو جێو ڕێی بۆ باپیری بەیان کرد . دیاربوو باپیر، بەهۆی ئەوەی شـــوفێری لۆرییەو هەموو شوێنێک دەچێو وەک گەڕیدەیەک دەگەڕێو گەڕاوە، کەمێک شارەزایی لەو شوێنە هەبوو.

بەڵقیس، وەک خەمخۆرییەک بۆئەوەی کارەکەی بەسەرکەوتوویی ئەنجام بدا، گوتی: زۆر ئاگاداری خۆت بە، چونکە ئەو پیاوەی بۆ کوشتنی دەچی، دوو براو ســـێ ئامۆزای خۆی لەگەڵە. باپیر، زەردەیەکی درۆزنانەی بۆ کرد، بێئەوەی بیر لە قسەکەی بکاتەوە: ئەگەر ئەتۆ مەیلت لەسەربێ هەر پێنجیان دەکوژم! بەڵقیس گوتی: پێنج نین، شەشـــن! باپیر گوتی: کـــوڕە خوای دەکرد نۆ کەس دەبوون، ئەمـــن ئەو ڕێگایەی هەر دەکوتمـــەوە، ماندووبوونەکەی هەر دەکەم، بـــۆ من جیاوازی چـــی هەیە؟ جگە لە چەند فیشـــەکێکی زیاتر! چ یەکێکی بکوژم، یان شەش کەس!؟ ما بەڵقیس تکای لێبکات کە لە یەک کەس زیاتر نەکوژێت، ئەویش بکوژی مێردەکەیەتی. کەوتبووە بن بارێکی خەمان، دەترسا باپیر قەســـابخانەیەکی وا دروســـت بکات، باب بۆ نەوەی بگێڕێتەوە١ گوناهی

ئەو قەتڵ و قیتاله بکەوێتە ئەســتۆی بەڵقیســێ! بەرلەوەی باپیر ماڵئاوایی بکات بە زەردەخەنێکەوە گوتی: بەڵقیس خان! دوای ئەوەی ئەمن ئەو کابرایەم لە لەوەڕکردو ڕوحم لەســەر خوای کردەوە، ئەتۆ لە بری ئەوە بە نۆرەی خۆت چی بۆ من دەکەی؟ وا چاکە لە ئێستاوە قەولو قەراری خۆمان ببڕێنینەوە! بەڵقیس گوتی: دەتکەمە سەرداری ماڵەکەمو وەرەوە سەر ماڵێ، چووزانم هەرچی ئەتۆ بڵێــی! باپیر کە بینی ڕیزی ســواره[1] گوتی: ئەمــن زۆرم ڕق لە درۆیە، بۆیە نامەوێ لێتی بشــارمەوە یان درۆت لەگەڵدا بکــەم، ئەمن ژنو مندالّم هەیە، دەتوانم هەر هەفتەی لــە لای یەکێکتان بمێنمەوە! بەڵقیس گوتی: پیرەژنەکە هەموو شتێکی لە بارەی تۆوە بۆ باسکردووم، بۆیە ئەمنیش پێمخۆشە ماڵەکەم تێک نەدەمو لەســەر جێگاو ڕێگای خۆم نەجووڵێم، بــۆ ئەوەی کوڕەتاقانەکەم بــە جوانی پەروەردەو گەورە بکەم، خەڵکی ئەو گونــدەش زۆر ڕێزم دەگرن، هەر بــە بەلقیس خان بانگم دەکەن. بۆ مێردکردنەوەش کەســوکارم ئازادیان کردووم، چونکە دەزانن مەرجەکانی من بۆ ئەو کەســەی مێــردی پێدەکەمەوە، هێندە قورسە، بە هەموو کەس ناکرێن. دوای ئەوەی ئەتۆ ئەو خوێنەم بۆ دەستێنیەوە، دڵنیام دەبیە جێی متمانەی کەســوکارم، ڕێزێکی شایستە بە خۆتت لێدەگرن. بەو پیاوەت دەزانن کە ببیە ســەرداری من. باپیر دەســتی دایە تفەنگەکەیو ماڵئاوایــی لە بەڵقیس کردو دڵنیای کرد نایەڵێ بگاتــە نیەتی ڕەمەزانێ، یان ســەری خۆی لەســەر دادەنێ یان کورتەکـو شــەرواری خوێناویی کابرای بۆ دێنێتەوە! لەســەر عەتەبەی دەرگەی حەوشــەی، گورگەئاوڕێکی لە بەڵقیسێ

---

١. ڕیزی سواره: لە یاریی (سێرپیزکانێ و نۆرپیزکانێ)وە هاتووە. کینایەیە بە کەسی زاڵ و براوە لە کێشە و بابەتێکدا بەسەر بەرانبەرەکەیدا.

دایەوەو ســـەرێکی بۆ لەقاند، یانی، چاوەڕێ بـــەو بمبینە! باپیر هەر لە گوندی وەدەرکەوت، کەیفەکەرانەیەک هەموو گیانی داگرت، کەڵکەڵەی ســـەرکەوتن کەوتبووە مێشکی، دەستی لە بن گوێی ناو دەستی بە گۆرانی گوتنێ کرد، لەو ئاقارە چۆڵەی باش بوو کەس گوێی لێنەبوو، لاوک، حەیران، قۆریات، عەرەبی، بەستەی شایو گۆرانی و هەموو شتێکی دەگوت!

کاتێـــک باپیر گەڕایـــەوە ماڵێ، بۆ ژنەکەی جێگای سەرســـووڕمان بوو کە مێردەکەی بەو چەکو کەرەستە ســـەربازییانەوە بینی، کە بۆ یەکەمجارە ئاوا خۆی لە فیشـــەکاندا زەرد بکا! ئاخر ئـــەو هەزار جار گوێی لە خودی خۆی بووە کە دەســـتێک کۆنکانی نایلۆنی ئەســـڵیم پێ لە هەزار تفەنگی چاکترە! ئەو، هەرکەسێک تفەنگی هەڵگرێ قوماریشی لەگەڵ ناکاتو دەڵێ تفەنگ ئیشی شـــەیتانیە توخوا لایبە! بەسەرسووڕمانەوە گوتی: ئەیەڕۆ باپیر ئەوە خێرە، ئاوا خۆت لە فیشـــەکاندا زەرد کردووە؟ ئەتۆ ڕقت لە پشتێنیە، ئێستا دەبینم خۆت قایشـــپێچ کردییە! کوڕە خۆ ئەتۆ نازانی تفەنگێ ســـوارکەی! ئەتۆ نەتدەگوت ڕقی ئەو دنیایەم لە تفەنگێیە! ئەوە ناترســـی شوان تفەنگەکەت لێبستێنن؟ خۆ بە مستەپارەکی لە بن دەرنایەی! ناکا بۆ ڕەسمگرتنێ ئەو هەموو ئەسبابەت وەرگرتبن؟ باپیر بە قســـەیەکی ناوەخندار گوتی: سەبرو ئارامت هەبێ ئافرەت، ئینشاڵڵا ناگاتە ســـەری نیەتی ڕەمەزانێ، دەزانی ئەو کەرەستەی سەربازییەم بۆچـــی بووە! ژنەکەی بێئـــەوەی لێی تێبگا گوتی: دەی، خێردارە ئینشـــاڵڵا با بزانین، باپیر ســـێبەندی مێردمان، چی لە بن سەرییە! ناکا بۆ چێشتی جێژنێ نێرییە کێویمان بۆ ڕاو بکەی!

ســـاڵ لەسەر کەس ڕاناوەســـتێ، کۆتایی زستانێو ســـەرەتای بەهارێیە، لە

دەرەوە بارانێکی سـەربەکراوەی بە تەزرەوە دەبارێ، هێنـدە بە توندی دایدەکا، گوێسـوانەو سـەریانەکان دادەکوتێ، وەک تۆز لە سـەریانەکان هەڵبسـتێ! هەرکەس لەبەرخۆیەوە سـەڵاواتێک لێدەداو دەڵێ: خوایە بێئافات بێ! باپیر لەسەر جێگاکەی گینگڵ دەداو خەو لە چاوەکانی میوان نابێ، زوو زوو کەلەکان دەگۆڕی، نوقمی خەیاڵان بووە، کە چۆن لەگەڵ بەڵقیسـێ لەبن لێفەو دۆشەکی قەدیفە تێک دەهاڵێ و چێژ لە هەموو شـێوەکانی جووتبوون وەردەگرێ! سەر لەسەرسـەرینێکی کورکەچینی، لێو لەسـەر خاڵی گەردەنێ، دەردێنێ جووتە شـەمامەکانی ڕۆسـتەم بەگی، دەم بە گۆمـی لەزەتەوە دەنـێ هەتا هەڵدێن ئەستێرەکانی لەپاش پێڵوویە!

خەڵک لە مێژە کرخەو بوون، بەڵام باپیر لە بەر فکرو خەیاڵان بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەک کە دڵی بەلقیسێ ڕازی بکات، خەوی لـێ ڕۆییوە. لە هەموو ئەو چیرۆکانەی بەدڵیدا دێن، تەنها یەکیان دەبوو بکرێ بە حەقیقەت. پێشان باپیر، هەمیشە پێی خۆش بوو گوێی لە ڕمبەی باران بێت، وەلـێ ئێستا بە پێچەوانەوە، حەز بە بێدەنگی دەکات بۆئەوەی خەیاڵەکانی پەرت نەبن. هەوڵدەدا ئەو مەودا ئەفسـانەییەی لە نێوان خەونو ڕاسـتیدا هەیە تێکبشـکێنێتو بیکات بە واقیع. هێشتا بۆ خۆیشـی لەسەر شتێک ساغ نەبۆتەوە، چونکە بیرۆکەیەکی دیاریکراوی لە پلاندا نییە ئیشـی لەسەر بکات. هەمیشە لەبەرخۆیەوە وەک وڕێنە بکات: دەبـێ پلانێکی وا دابڕێژم کەمکەس لەوە پێشـتر بینیبێتیو بیسـتبێتی! ئیدی ئەو چەند ڕۆژانە، بۆشاییەکی تاقەتپڕووکێن لەنێو خەیاڵی جەنجاڵی باپیردابوون، سەدان بیرۆکەی بە مێشکدا تێپەڕدەبوون!

باپیر بە هۆی پیشـەو کارەکـەی، بە بەراورد لەگەڵ خەڵکـی دەوروبەری،

چاوکراوەتـــر بوو. ئـــەو، وەک گەڕیدە هەررۆژە لە شـــوێن و لە شـــارێک باری باردەکردو دادەگرت، بۆیە کێشەی شارەزابوونی نەبوو. لە زۆربەی شوێنەکانیش ناسیاوی هەبوو. دوای سۆراغ بۆ شوێنی نیشتەجێی بکوژی مێردی بەڵقیسێ، وەبیری هاتەوە کە برادەرێکی لەو گوندەدا هەیە، ئەوەش ئومێدبەخش بوو بۆی، کە ئەو برادەرەی هاوکاری بکات بۆ دۆزینەوەی. لە دواییشدا هەر وادەرچوو، لە ڕێی ئەو برادەرەیەوە دەرگای جێبەجێکردنی پلانەکەی بۆ خرایە سەرپشت، چۆن لە زەینی خۆیدا دایڕشتبوو، موو بە موو بێزیاد و کەم، بۆی جێبەجێ بوو.

بەرلەوەی بگاتە گوندی، کەمێک لاڕێ بوو بۆ کاری پێویســـت. ڕێوییەک لەنێو ئاودڕێک دەرپەڕی، باپیر دڵی خۆش بوو بەوەی کە ڕێویی هاتۆتە ســـەر ڕێ، کە دەڵێن ئەگەر لە کاتی ســـەفەرکردن ڕێوی بێتە ســـەر ڕێت، ئەوە خێرت دێتەڕێ و سەرکەوتوو دەبیت!

گوند بە گوندی تێپەڕاندو دەشتەکانی بەدوای خۆیدا بەجێهێشتن. نوقمی خەیاڵەکانی بووبوو، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: هەر خوا بکات ئەو برادەرەم لە ماڵ بێ! خۆ ئەگەر لە ماڵ نەبێت ڕیســـەکەم لێدەبێتەوە خوری‌و دووبارە لە نووکەوە دەبێ دەست پێبکەمەوەو ڕۆژێکی دیکە بێمەوە! کوا ئەو درەنگەش بەو زووەی ڕادەگات!

خـــۆی گەیاندە گوندی، پرســـیاری ماڵی برادەرەکەی کـــردو دۆزییەوە، دوای هەواڵپرســـی‌و بەخێرهێنان، خانەخوێ ڕووی کردە باپیری‌و بەو هاتنە کتوپڕەی، سەرســـوورمانی خۆی بۆ بەیانکرد. ئەویش تـــەواوی چیرۆکی پلان و ئامانجی خـــۆی وردو باریک بۆ گێڕایەوە. خانەخوێ گوتی: ئەو کەســـە خزمی ئێمەیەو هەر دوای ئەو پیاوکوشتنە پەنای بۆ ئێمە هێناوە. ئێستا لە خانوویێکی خراپی

ئێمەدا ژیانێکی کولەمەرگی نەمرو نەژی دەبەنەسەر، ئەو زستانە، بەهۆی بارانبارینی زۆرەوە بەردەوام دڵۆپەیان هاتووە. بە هەرحاڵ ئەو پلانەی داترِشتووە زۆرم بە دڵییە، ئێمەش ئاسوودە دەبین لەو دڵەڕاوکێیە رزگارمان دەبێ، ئاخۆ کەی دەیکوژنو تۆڵەی لێدەکەنەوە. دڵنیابە یارمەتیدەرت دەبم، چونکە بۆ خودی خۆیشی ئەوها باشترە. باپیر گوتی: هەر ئەوەندەی سەختە هەتاوەکو زمانم دەیگاتێ. منداڵێکیان نارد بزانن لە ماڵە یان نا، منداڵەکە گەڕایەوەو گوتی: لە مزگەوتێیە نوێژی بە جەماعەت بکات. ئەو لەدوای پیاوکوشتنەکە بۆتە ئەهلی مزگەوتو جومعەو جەماعەت. ئاخر ئەوانەی زۆر بە خوێنساردی کەسێک دەکوژن، لە دواییدا ڕوو لە خوداپەرستی دەکەن!

دوای نوێژ، باپیرو خانەخوێیەکەی چوون بۆ ماڵی کابرای. زۆری بەخێرهێنان و یەکەم پرسیاری لە خزمەکەی ئەوەبوو دەستی بۆ باپیری ڕاداشتو گوتی: ئەو برادەرەی ناناسم! باپیر دەرفەتی نەدا خانەخوێیەکەی بیناسێنی، دەستی لەسەر سینگی خۆی دانا: ناوم باپیرە، بۆ کوشتنی تۆ هاتووم، بەڵام ڕاستیت دەوێ مریشکێکیشم پێ لە ئاو ناکرێو نازانم تفەنگێ سواربکەم! باپیر، هەرچەندە لە جلوبەرگو ڕەنگوڕواڵەتی زۆر دەستوپێ سپی دیاربوو، بەڵام زمانی شتێکی دیکە بوو، هەر زوو، باوەڕی تەواوی بەرامبەرەکەی بەدەستهێنا. ئەویش بە زەردەخەنەیەکی سادەو واتادار لێی ڕوانیو گوتی: یاخوا بەخێربێی بکوژی من، ئەی بۆ تفەنگێک، دەمانچەیەک، خەنجەرێک، شتێکت پێنییە؟ بوو بە پێکەنین. باپیر گوتی دڵنیابە تەمەنت دووسەد ساڵ دەبێت، ئەگەر من بکوژت بم، چونکە بە ژیانم تفەنگم نەبووەو ڕقیشم لە تفەنگە، بەڵام ماڵی دڵم بە قوڕێ گرت، هەموو کارێکی بە پیاوی دەکات! حەزدەکەم لەوە دڵنیابی

کە من ڕاسپێردراوم تۆ بکوژم، تکایە باش گوێم لێبگرەو بیری لێبکەوە، نرخی کوشتنی تۆ کەم نییە، ئەویش بەدەستهێنانی جوانترین شۆڕەژنی ناوچەکەیە کە خەڵک قوڕاوی بۆ دەخۆنەوەو خۆیان داوێنە سەر نووکی چەقۆی! ژنێک بەو هەموو جوانییە، وەک گەوهەرێک خۆی کردۆتە نرخی کوشتنی تۆ! تا بەڵقیس نرخی کوشتنی تۆ بێت، ئەجەل لە بناگوێتە! ئێستا سووتاندنی ئەو کارتەو نرخە لە دەستی خۆتدایە، دەتوانی بیهێڵیەوەو هەموو کاتێک دێوەزمەی مەرگ لەبەردەرگات پێکۆڵ دەکات، دەشتوانی لەسەر خۆتی لابەری‌و بەئاسوودەیی بژیت. جا، ئەگەر بە قسەی برای خۆت دەکەی ئەمن پلانێکم هەیە کە بۆ هەردووکمان بەسوودە، هەم من بە ئاواتی دڵی خۆم دەگەم‌و هەم ئەتۆش سەرت سەلامەت دەبێت! بکوژیش هەموو لەشی بۆ کردبوو بە گوێ‌و نێوە نێوە دەیگوت: بەڵێ، باشە، وایە. باپیر گوتی: ئەو کاتەی ئەمن بەڵقیسم دەست دەکەوێ، یانی مەسەلەی کوشتنی تۆ کۆتایی هاتووە!

دوای وردەکاری پلانەکە، هەردوولا بەوە ڕازی بوون بەیانی کە سپیادی دا، پلانەکە جێبەجێ بکەن. ئەو بەیانییە، ئەوەی گیانی لەدەستدا ئەو گیسکە بوو کە کوژرایەوە، بۆئەوەی کورتەک‌و شەرواری بکوژی هاوسەری بەڵقیسێ لە خوێنەکەی وەربدەن. ئەوەی کاری باپیری ڕاهی دەکرد، بەس ئەو کورتەک‌و شەرواره بەخوێنەبوو!

براو ئامۆزاکانی بە خەمباری گەڕانەوە گوندەکەی خۆیان. هەواڵی کوشتن‌و شاردنەوەی تەرمی بکوژی مێردی بەڵقیسێ وەکو ئاگرو پووشوو بە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە. بکوژیش سەری خۆی هەڵگرتووەو ڕۆیشتووە بۆ ورمێ‌و تەورێزێ.

بەرنامەکە وەک باپیر دایڕشتبوو جێبەجێ کرا. باپیر کورتەک‌و شەرواره

بەخوێنەکەی لە بوخچەیەک گرێداو بە گۆمکی گۆپاڵی سەرشانی هەڵیواسیو کەوتەڕێ. لە خۆشی سەرکەوتنی پلانەکەی ڕێگا خۆی لەبەرناگرێ١ بۆ شەوێ گەیشتەوە ماڵی خۆیان، بوچخەی لە کادێنێ شاردەوە. ئەوشەوە لە خۆشی ئەوەی بەیانــی بەڵقیس خۆی لە قەبەردەکاتو بە ئاواتی خۆی دەگات، چرکەســاتێک خەو نەچووە چاوەکانی. بەیانی تفەنگو خەریتە ئامانەتەکانی لە خۆی بەستاو سێ پاکەت فیشەکی لە پێشــەوەی خەریتەکە دەرهێناو بەجێیهێشت. بەرەو ماڵی بەڵقیسێ باڵی گرت. لەگەڵ وەژوورکەوتن لە حەساری ماڵی بەلقیسێ، ئەو بوخچەیەی بە لوولەی تفەنگەکەیەوە هەڵواسیبوو، بە فیزەوە بوخچەکەی وەکو دیارییەک فڕێدایە بەردەمی، ئەویش بەپەلەو بەتاسەوە کردیەوە. لەگەڵ چاوی بە کورتەکو شەرواری بەخوێن کەوت، شاگەشکە بوو، لە خۆشییان فرمێسکو پێکەنین، شادیو خەم، لە سیمای ئەبلەقی بەڵقیسێدا دەخوێندرانەوە، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشــاو گوتی: خۆزگە کەس کەسی نەدەکوشــت! باپیر نێوە نێوە دەســتی لە خانە چۆڵەکانی خەریتەکەی دەداو دەیویست سەرنجی بەڵقیسێ بۆ شــوێن پاکەتە فیشەکەکان ڕابکێشێ. پەنجەکانی بە ئاماژەی ژماردنی ئەو ســێ پاکەت فیشەکەی کە گوایا بۆ کوشــتنەکە تەقاندوونی، دەیویست وا لە بەلقیسێ بگەیەنێ پازدە فیشەکی لە کابرای داوە! بە لەخۆباییبوونێکەوە گوتی: بەهۆی ســەری نیەتی ڕەمەزانێ پەلەم کرد لە کوشتنەکە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: لە ڕەمەزانێ کوشــتن حەرامە! بەڵقیــس لەگەڵ هەڵتەکاندنی جلە خوێناوییــەکان، هەڵدەپەڕی. هەر زوو کەڵەبابێکی بۆ باپیری کوشــتەوە. نەیدەزانی بە چ ڕابگات، کیســەخەنەیەکی بۆ دەستو پێی گرتەوە، کراسێکی ســووری زەمانی بووکێنی لەبەرکرد، دەیویست ئەو شتانەی تاوەکو ئێستا شەرم

بوو بــۆ مێردکوژراوێک، هەموویان بەســەریەکەوە بکات. ئاخر بەحیســابی خۆی بە دوو ســەران لە خۆشیدابوو، ســەرێکیان تۆڵەی مێردەکەی کردۆتەوەو سەرەکەی دیکە لە تەنیاییەکی کوژەردا ڕزگاری دەبێتو مێرد دەکاتەوە!

دوای نانخــواردن، باپیر و بەڵقیس یەک لە یــەک بەپەلەتر! بەچاویانەوە دیاربوو کە دەیانەوێ بۆ ئەوشــەو هەموو شــتێک تەواو بکرێ. نوێژی شێوان باوک و برای بەڵقیســێ لەگەڵ مەلای ئاوەدانیو دوو شــاهید، بەڵقیسیان لە باپیری مارەکرد . بەڵقیس قسەکانی پەرتو بڵاو و هەمەجۆر بوون، تێکەڵەیەک لە خۆشــیو نیگەرانــی: ئای خوایە! نرخــی ئاســوودەیی زۆر گرانە بە کڕین نایە، ئەوە مرۆڤەکانــن دەبێ بۆ یەکتری دابینی بکەن. ئاســوودەیی لە دڵەوە هەڵدەقوڵێ، شــت نیە لە دووکانداران بیکڕی. ئەوەی چاڵ بۆ کەسێک هەڵقەنێ بۆ خۆی تێیدەکەوێ!

باپیر بە هۆی درۆو ســاختەکارییەکەی، بەدرێژایی سێ ساڵ پێکەوە ژیان، دەیزانی شــتێک لە ڕەمزو ڕازی ترسناک بەڕێوەیە، ئەوڕۆ یان سبەی، ئاگر لەو بەختەوەرییە بەردەدا. لەترسی ئاشکرابوونی درۆیەکەی، قەت ڕۆژێک ویژدانی ئاسوودە نەبوو و بە خاترجەمی دانەنیشت! زۆرجار لە ناخەوە دەیگوت: تا درۆ وێرانمان نەکات هەســت بە چێژو جوانییەکانی ڕاستی ناکەین! هەمیشە لەوە دەترســا ئەو سەرکەوتنەی هەموو بوونی بەڵقیســی داگرتبوو، زوو بڕەوێتەوەو شەرابی کامەرانی لــێ قلْپ ببێتەوە، ئەو کاتە کێ دەزانێ ئەو خۆشەویستیو متمانەیە دەبێت بە چ ڕقێکی ماڵوێرانکەر!

لە دوای ســێ ســاڵ پێکەوەبوون، بەڵقیــس هەرکات بیری دەکــردەوەو بە ناوەخۆیــدا ڕۆدەچوو، بەراوردی لە بەینی ئــەو کارەی گوایە باپیر بۆی کردووەو

ئاکارە دزێوەکانی دەکرد، نیگەران دەبوو بەوەی باپیر کە دنیا زۆر تاریک دەبێت شـــەوان ناوێرێ بچێتە دەرێ، ســـاختەچێتیو درۆو ترســـنۆکیو زمانلووســـی بێکردارو هەموو ئەو خەسڵەتانەی بە درێژایی سێ ساڵان لە باپیری بینیبوونی، تێکی دەبردنەوەو لێکی دەکردنەوەو دەیخســـتنە ســـەریەک، نەدەچووە ئەقڵی پیاوێـــک هەڵگری ئەو ڕەفتارانە بێت، وەفـــا بە بەڵێنی خۆی بکات، جێی باوەڕ نەبوو، ئەتۆ بڵێی باپیر بتوانێ مریشـــکێک لە ئاو بکات! بۆیە هەموو جارێ دەیگـــوت: خوایە ئاخیـــری خێر بێت، هەرچەندە تازە هیچـــی تێدا نەماوە، نە بەشی خێرو نە بەشی شـــەڕ بکات! دواتر لەبن لوتیەوە دەیگوت: ئای ئێمەی ژن چەند ساویلکەو بەدبەختین! بە هەموو درۆیەکانی پیاوان باوەڕ دەکەین!

لەوەتای زانیویەتی لەنێو هاوڕێکانی پێیدەڵێن باپیر ســـێبەندی، تا دەهات بـــە کردار ئەوەی زیاتـــر تێدا دەبینـــدرا. دیاربوو لە گوندیش بـــەو لەقەبەیان زانیبوو، ئەوانیش لە پاشـــملە پێیان دەگوت باپیر سێبەندی. هەرکاتێک باپیر گوێی لە قسەی بەرزو نزمی بەڵقیسێ دەبوو، گوێی قوڵاغ دەکردو وای مەزەندە دەکرد، درۆیەکەی لـێ ئاشکرابووە. لە کۆتاییدا ئەورۆژەی لێی دەترسا، تووشی بوو! دیاربوو کابرای بکوژ، ســـێ ساڵ زیاتر نەیتوانیبوو بەرگەی دووریو ژیانی ســـەختی ئێرەوئەوێ بگرێتو لە شـــارەکانی ورمێو تەورێز دوور لە کەسوکاری بژێـــت، گەڕاوەتەوە دیوی گەرمێنێو دەنگۆی بـــە زیندوومانەوەی، وەک ئاگرو پووش بە ناوچەکەدا بڵاوبۆوەو ئەو زار ئەو زاری دەکرد.

باپیر لە ژوورێ خەریکی تەراشـــی ڕیشی بوو. لەناکاو وەک هەورەتریشقە، گوێی لە دەنگێک بوو پڕ ئێش و مەترسیدار! هەناسەی خۆی بۆ ڕاگرت، چاوی نەدەترووکاند، بەحەپەســـانەوە گوێی بۆ ئەو دەنگـــە ڕاگرتبوو، یەک بەدەنگی

خۆی دەیقیژاند! هەنووکە هەســتی بە ژانی ئەو دڕکە کردبوو، کە سێ ساڵ بەر لە ئێستا چەقیوەتە پێی. گوێی لە بەلقیسێ بوو بە کۆمەڵێک قسەی تێکەڵ بـــە دادو فیغانو گریـــان، هەتا دەهات تووڕەییەکەی هەڵدەکشـــا. لە باپیری وە ژوور کەوت، بە چاوی پڕ لە فرمێسکو گریانەوە هاواری کرد، هاوارێک هەر لە دەربوونی کولکو قونێرو ناسوور دەچوو! هەموو زمانەکانی دونیا نەیاندەتوانی گوزارشـــت لە ئازاری ناخی هەڵقرچاوی بکەن: ئاخر چۆن توانیت ئەو ناپاکییە لەگـــەڵ مندا بکەی؟! ویژدانت ئازارت نادات؟ بە تـــۆش دەڵێن پیاو؟! ئەمن عەزیزترین شـــتم دایە دەستت ئەویش جەستەی خۆم بوو، کە بە هیچ قەرەبوو ناکرێتەوە هەی بێویژدان!

باپیر دەمی بۆتە تەڵەی تەقیوو، ڕەنگی بۆتە زەعفەران، جگە لە شکاندنەوەو تەقاندنی پەنجەکانی دەستی، هیچیدی بۆ نەمابۆوە. دەزانێ، بۆ پەشیمانی لە درۆو کارە ساختەکەی، درەنگ کەوتووەو تازە دادی نادات. بە دوای ڕستەیەکدا دەگەڕا لەبری داوای لێبوردن هەر نەبێ کەمێک هێوری بکاتەوەو تووڕەییەکەی کەمکاتەوە.

ئێستا گەیشـــتوونەتە قۆناغی هەســـتکردن بە چێژی ڕاستگۆییو ئازاری درۆکردن، خۆشەویستیو خیانەت، جوانیو ناشیرینی. بەڵقیس گوتی: بەلانی کەم ئێمە هەموومـــان دەزانین ئەوەی کردووتە، تـــاوانو گوناهە، ئەوەش هیچ پاســـاوێکی بۆ نییە. باپیر تانی لە خۆیدا بۆ ئەوەی نوتقێک بکات گوتی: ئایا کێشـــە نییە ژیانمان لەپێناوی شتی بەســـەرچوو وێران بکەینو بۆی غەمبار بین؟ بەو پاساو و قسە بێ جێ و ڕێیانەی باپیری، هەر بە جارەکێ هاربوو، وەک ئەوە بوو داری لە شارە زەنگەسوورەی وەردابێت، گوتی: لەجیاتی داوای لێبوردنو

بەخشـــین بکەیت کە قابیلـــت نیە چونکە خەتاییّکی گـــەورەت ئەنجامداوە، دێی باســـی شتی بەسەرچوم بۆ دەکەی؟! قسەکانی ئەو جارەی بەڵقیسێ وەک سوژن بە هەســـتو غروری پیاوانەی باپیریدا چەقی! بەڵقیس، وەک پووش و پـــاوان ئاگری گرتبوو: کورە وەرە خـــۆت لە داخان مەکوژە، خۆ چاو و ڕووی هەیە قســـانیش بکات! ڕووقایمیش ئەندازەی هەیە، ئەی خوایەگیان چۆن باوەڕم بەو پیاوە کرد، هەرچی کاری ســـووک و ســـاختەیە دەستی بۆ دەبات بەس بۆئەوەی بەمەرامی خۆی بگات و بێنەوەی بیر لە ئەنجامەکەی بکاتەوە.

بەڵقیس چەنگی لە ئەستێران دەدا: نامەوێ ئەلفازت بگەڕێ، واز لە قسەی قۆڕو تەڕاوز بێنەو ناچێتە گوێم!

باپیر، لە بەردەم چارەســـەرێکی ناستەمدا بوو. بەڵقیس، وەک ئەوەی پێشتر هیچ هاواری نەکردبێ، دیســـانەوە نەڕاندییەوە بەســـەریدا: چۆن دەبێ پاوێک بە قســـەی خۆی خۆشەویســـتی داگیری کردبێت، کەچی پەنا بۆ ڕەفتاری دوژمنانە ببـــات! لالێوی کەفـــی کردبوو، چاوی ســـوور هەڵگەڕابوو، باپیر! ئەتۆ هێشـــتا بەڵقیســـت وەک خۆی نەناســـیوە! بەڵقیس ئەو بوونـــەوەرە جیاوازەیە تۆڵەت بە دووقات لێدەکاتەوە! هەتا ئێرەو تەواو، ناتوانم لەگەڵ درۆزنو فریودەرێک سەر بە یەک ســـەرین بکەم، لە یەک لەگەندا نان بخۆم، گەورەترین مێردەزمە بۆ گیانی من مانەوەی تۆیە لەو ماڵەیدا. باپیر، بەو هەموو سێبەندییەی خۆیەوە کەوتۆتە گێژاوێک، ســـەرەدەری لێدەرناکات، دەرەتانێک شـــک نابات لە تووڕەیی بەڵقیسێ دەربازبێ. کە بینی بڵێسەی ڕقی بەڵقیسێ تاو لە تاوێ بەگوڕترە، وای بە خەیاڵدا هات بۆ ماوەیەک تا ئەو کاتەی تووڕەیی‌و نەفرەتی بەڵقیســـێ دادەمرکێتەوە، ئەو نێوە بەجێ بهێڵێ، بۆیە بە ناچاری ملی شـــۆڕکردو دەست لە گونان شۆڕتر، بەرەو

کەونەهەوار، بۆ لای ژنەگەورەکەیو حەوت منداڵەکەی گەڕایەوە.

هەرچەنـدی بیری لێدەکردەوە، ڕازیکردنی دڵی بەڵقیسـێ وەک قەڵایەکی سەخت دەهاتە بەرچاوی کە هیچ ڕێی نەچنێ! کێچی کەوتە کەوڵیو حەجمینی لێبڕاوە. دواجار وای بەباش زانی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە خۆی باوێتە دیوەخانی (کوێخا ڕەفیق)ی، کە تازە لەدوای مردنی باوکی، بۆتە کوێخای سێ گوندان. لە تەمەنی سیو پێنج ساڵیدایە، برادەری قومارو کۆنکانیەتی زۆرجاریش شەریکەقومار بوون. ماڵی بابی بەڵقیسێش کرمانجو ڕەعیەتی کوێخا ڕەفیقنو لە قسەی دەرناچن.

ژنانی ئاوایی لە بەڵقیسیان دەپرسی: ئێستا لەگەڵ باپیر سێبەندی حاڵت چۆنە؟ دەیگوت: هەتاوەکو مێردم نەکردبۆوە خەڵک پێیان دەگوتم بەڵقیس خان، ئێستا پێم دەڵێن ژنەکەی باپیر سێبەندی، ئای ژنینە سێبەری پیاوی ڕەندو برنجی، بۆ ژنێ چەند گەورەیە و پێی بەرزدەبێتەوە! سێبەری پیاوی کەم و سووکیش، هەر شەرمەزاریو ڕیسوابوونی بەدواوەیە! ئەنگۆ تەماشای ژنی کاکەڕەشی بکەن، نە ژنێکی هێندە هەڵکشاوو داکشاوە، نە هێندەش قسەزانە، کەچی بچێتە هەر تازیەیەکی ئەو گوندانەی دەوروبەرمان، مەجلیسی ژنان یەکپێ لەبەری هەڵدەستن!



# ٢٧

کوێخـــا ڕەفیق، لە هەڕەتی گەنجیدایە، پیاوێکی ســـوورو ســـپی ڕەقەڵەی کەڵەگەتـــە، دوو چـــاوی زەق، دوو برۆی ئەســـتوور بۆ چاوەکانی بـــوون بە نوا. دەمانچەیەکی چواردەخۆری ســـێ غازی دەســـکزەردی بە پێنـــج یەدەگەوە بە قایشوقرۆشـــی زەردی بریقەدار لە کەلەکەی دەبەستی. زۆر شایی بەخۆیەتیو لە خۆی ڕادەبینێ لە باوکی کوێخاتر بێت. دەمێکە کوێخا ڕەفیق لە مام کاکلی هەڵدەکێلیو تەشـــقەڵەی پێدەکات، هەرچەند دەکات نازانێ بە چ بیانوویەک ئازاری بـــدات، بۆ ئەوەی جووتیـــارەکان هان نەدات لە دژی ســـوخرەو بێگارو، گەنجەکان فێری یاخیبوونو خۆناســـین نەکات، ئەوەندە باســـی چەوســـانەوەی چینایەتـــی نەکات، وەکو باقی خەڵکی دیکە مل ڕاکێشـــێو شـــوکرانەبژێری قەدەری خۆی بێت!

مام کاکل لەگەڵ کاکەڕەشـــی هاوبیـــرەو خزمایەتیشـــیان هەیە. پیاوێکی دەســـتەپیاوە، ڕیشـــی تازە ماشو برنج بووە، هێندەی کوێرەوەریو خاکەســـاری بینیوە، ئاسەواری خۆی لەسەر ڕووخساری جێهێشتووە. ماڵ و منداڵێکی زۆری بە ملیەوەیـــە، بێجگە لە ژنو منداڵەکانی خـــۆی، ژنو منداڵی جوانەمەرگی کوڕیشی بەخێو دەکات. ئەوانیشـــی هێناوەتە لای خۆیانو هەموویان پێکەوە

دەژیـــن، ژیان و بەخێوکردنی هەموویان کەوتۆتە ئەســتۆی مام کاکلی. ژیانی یەکپارچــە ڕەنجو ئارەقە ڕشــتنە، لەبــەر چاندنو دروێنەو ئاژەڵداری، ســەری خۆیشی بۆ ناخورێندرێ. بەو حاڵەشەوە زگی ئەو ڕەشەخێزانەی بۆ تێرنەدەبوو! لــە هەژارییان بکۆخیبوایە دۆخینی دەپســا! لەگەڵ تاریکـو ڕوونی بەیانی لە خەو هەڵدەستا، خاکەناسەکەی دەخستە سەرشانی و دەچووە سەر ئیش. لەگەڵ هەموو ئەو کوێرەوەرییانەشــدا، کوێخا ڕەفیق هەنجەتــی ئەوتۆی پێدەگرێت، دوورو نزیک پەیوەندیی بە مام کاکلەوە نیەو هەر ئاگایشــی لێی نییە. کوێخا ڕەفیق بــە هۆکاری ئەوەی تازە لە جێی باوکی بۆتــە کوێخا، دەیەوێت قودرەتی خۆی نمایش بکات، بۆ ئەوەی ئەوانەی بوونەتە دەستوپێوەندو نۆکەری، زیاتر بە چۆکدا بێنو وابەستەی خۆیانی بکاتو ئەوانەش ملکەچی نابن، بەزەبری هێزو ترس سەریان پێ شۆڕبکاتو تەسلیمی بنو ستایشی کوێخایەتییەکەی بکەن!

کوێخا ڕەفیق، لەوەتای خەڵکی بێعیززەتو نەفســنزمی لە دەوروبەرین، بۆ خۆشیرینکردنو خۆڕەپێشــکردن بۆ دیوەخانێ، ڕۆژانە قسەوباسی مام کاکلی بــۆ دەگوازنەوە، کــە گوایە جووتیارەکان هــان دەدات لــە دژی دەرەبەگایەتیو چەوســانەوە، دەڵێت: هەتا کەنگێ ئێمە لەنێو زەویەکانمان ئارەقی شینو مۆر دەرکەین، ئاغاو کوێخاش لە بەرســێبەرێ بە ئیسراحەت بەروبومەکەی بخۆن! لــە هەموو لایەک ڕوونە کە کوێخا ڕەفیق بۆ ئەو دەمڕاســتیو گەورایەتیەی نابێ، جا بۆ ســێ گوندانیش! ئەو، توانای ئــەوەی نییە ئالیکی دووکەران بەش بکات! چما پیاو بڕاون تاوەکو قومارچییەکی لەســەرخۆمان بکەینە کوێخا؟! ئەوەو، کۆمەڵێک قســەو هەواڵی دیکەیــان لە باخەڵی خۆیــان دەردێناو بۆ کوێخایان دەبردن. وەک ئاگری بن کایێ، باری مام کاکلییان زۆر قورستر دەکردو

دەورێکی یەکجار خراپیان دەبینی. لە کاتێکدا ئەو قسانەی مام کاکلی هەر هەمووی لە بەرژەوەندیی ئەو چەلاوخۆرانەشدا بوو! مام کاکلیش لەبەرامبەر ئەوەدا دەیگوت: «دەستی کوێریان بۆسەر خەزێنەی ڕادەکێشا، کەچی دەستی خۆی دەکێشایەوە!» دروست ئەو خەڵکە ئاوایە.

مام کاکل، هەرچەندە ڕۆژ بەڕۆژ بەرداشی زەمانە دەیهاڕیو ڕۆژگاری مەلعون زیاتر زەفەری بە تەمەنی دەبرد، بەڵام هەرگیز کۆڵی نەدا. قسەکانی وەک نەشتەر دەچەقینە غورووری کوێخایانەی کوێخا ڕەفیق، بۆیە، بۆ مل پێکەچکردنو دەمکوتکردنی، پەنای دەبردە بەر هەموو کەسێکی کۆیلەسفەت و هەموو کارێکی نامەردانە. چاوشکاندنی جووتیارەکانی لە چاوشکاندنی مام کاکلیدا دەبینی. دەیزانی بارو گوزەرانی، بەهۆی زۆرخێزانی و بیستی چوار لە بەرهەمەکانی، زۆر خراپەو نانی شەوێی نییە بیخوات، بۆیە کوێخا هەوڵی دەدا لەو ڕێیەوە زەفەری پێبباتو بە زەبری برسیکردن بەچۆکیدابێنێت.

باپیر خۆی هاویشتە دیوەخانی کوێخا ڕەفیقیو وەکو لێقەوماوێک خۆی دەرخست، باپیر لە خۆنمایشکردن زۆر زانابوو. کوێخا ڕفیق کە بینی باپیر خۆی هاویشتۆتە دیوەخانەکەی و بە پەنایەکی قایمی دەزانێت، زانی تازە ڕیزی سوارەو باپیر مەجبوورێتی بۆ بەدەستهێنانەوەی بەڵقیسێ یارمەتیی بدا، بۆیە خۆی لە سەر گرانکرد. بەرلەوەی گوێی لێبگرێ، بە یەک دوو کۆخەی دەستکردی خۆ بەگەورەگر، قورگی خۆی سافکرد، ڕێی نەدا باپیر شەکوای حاڵی خۆی بکات گوتی: باپیر دەزانم هەتاوەکو ئیشێکتان نەکەوێتە لای من ڕێی دیوەخانێ پێ نازانن‌و کوێخای خۆتان بەسەرناکەنەوە، بەڵام قەیدی ناکا، ئێمە دڵمان گەورەیە. ئێستا ئەتۆ بەژنت درێژەو پەیژەت ناوێ. ئەوشەو لەگەڵ ئەو پیاوانەم، بڕۆن

لەو کۆنەئاشەی بەرگوندی، دەڵێن پڕ لە کۆترە کێویلکەو گاپەلەیە، هەرچەندی توانیتان زۆرترم بۆ بگرن ئەوە باشترە، هەر لەوێش سەریان ببڕنو چاکیان بکەن، شەو دوورو درێژە، ئاگرەکی گەورە بکەنەوە مل لەبەر کۆتربرژاندنێ دەنێین! باپیر ڕەنگە سەد جاری گوتبێتی بەسەرچاو! هێندە مەمنوون بوو کە کوێخا زاتەن بە لەفزی خۆی ڕایدەسپێرێ بۆ وەها کارێک. تاوەکو لە ڕاوە کۆتری گەڕانەوە، کوێخا ڕەفیق لە فکری ئەوەدابوو لە بەرامبەر قایلکردنی دڵی بەڵقیسێو گەڕانەوەی باپیری بۆ لای کە دەرگای لێبکاتەوە، لە بەرامبەردا چ کارێک بە باپیری بکات!

دەمێک بوو چاوەڕوانی کەسێکی زمانلووسی وەکو باپیری دەکرد کە دەستی لە عەرزو عاسمانێ بڕابێتو کارەکەیشی بە وی نەبێ، بە کەسی دیکە چارەسەر نەکرێت! ئێستا، وەک ڕێوی بە سەرسەدەی جووتیدا هاتبێت، وایە بۆ کوێخای! ئاخر کوێخا ڕەفیق شەڕێکی دەروونی دژواری لەگەڵ کرمانجەکان دابەستووە، بە تایبەتی مام کاکل. وای مەزەندە دەکرد، ئەگەر مام کاکلی تێکنەشکێنێ ڕەنگە جووتیارەکانی دیکەش چاوی لێبکەنو سەرئێشە بۆ کوێخایەتییە نوێیەکەی دروست بکەن.

دوای ئەوەی کوێخا ڕەفیق تێروپڕی گۆشت کۆتر خوارد، دەمو لەوسی خۆی سڕییەوە، داوای خلتانی[1] کرد کەلێنی ددانەکانی لە گۆشت کۆتر پاک بکاتەوە. ڕووی لە باپیری کرد: کارێکم پێتە! بەرلەوەی قسەکەی تەواو بکا، باپیر بەلێبارانی کرد: بەڵێ بەچاوان هەر ئیشی جەنابت بێتو بە خولامی خۆت بکرێ، ئەمر بکەو لە من بگەڕێ! کوێخا بە دەنگێکی گڕ

١. خلتان: کۆمەڵێک داروچکەی پێکەوەنوساوی ڕووەکێکە، کە وشک بوو، بۆ خاوێنکردنەوەی کەلێنی ددان بەکاردێت.

گوتی: مردووت مریٚ دە کەلیٚن بدە قسـەکەم تەواوبکـەم! باپیر! دەزانم ئەتۆ هی دەسـتو قامی نی، لە دەسـتو پلت ڕانابینم، بەڵام زمانت بیٚ قسـوورەو درۆی وەک ڕاسـتی دەرخـواردی خەڵکی دەدەی، گویٚ بـدیٚ، مام کاکلی باش دەناسـیو دەزانی ڕۆژانە هەر لە گەردی بەیانـی هەتا تاریک دادیٚ، خەریکی پیٚمەڕەکارییە، دەمەویٚ سـبەینیٚ بچی هەنجەتیٚکی پیٚبگـریو لە گەڵی بە شەڕبیٚیو دوو لە پیاوەکانیشم دەنیٚرم دوور بە دوور چاودیٚریتان بکەنو لە کاتی پیٚویست یارمەتیت بدەن، نەبادا مام کاکل داخی برسیٚتیو منیش، بە تۆ بڕیٚژیٚ، بۆئەوەی بەر لـە کوتەککاریت، فریات بکەونو لە دواییشـدا لە بەرژەوەندیی تـۆ دژی مام کاکلی ببنە شـاهید. لە بەرامبەر ئـەو کارەی بۆ منی دەکەی، قایلکردنی بەڵقیسیٚ، خەمیٚ من بیٚ، بۆت جیٚبەجیٚی دەکەم. باپیر لەخۆشیان، وەک ڕیٚـوی پشـکەبەزی دیبیٚت، زمانی لە لالیٚوی دەدا! بـۆ پلاندانان، باپیر سـیٚبەندی حەوجەی بە کەس نییە ڕیٚوشـویٚنی بۆ دابنیٚن، ڕەش سـپیکردنو سپیی ڕەشکردن، کاری لە میٚژینەی خۆیەتی! پیٚشنیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، خۆی ئامادەکـرد بەرەو کیٚڵگەی مام کاکلی کەوتەڕیٚ، هەر لە دووررا بینی مام کاکل خاکەناسیٚکی کلک دریٚژی بەدەسـتەوەیە، خەریکی کاری خۆیەتیو ئاگای لە مەحموودی بیٚزەواد نییە. ئەوڕۆژە پنچکە خڕنووکی کۆدەکردەوە سەری تەبەقەی شـەتڵەتەماتەو باینجانو بیبەرەکانی پیٚ داپۆشیٚ، تاوەکو چۆلەکەو جوقەی زەرتکە نەیانخوات. هیٚندەی نەماوە بۆ نویٚژی نیوەڕۆ، ڕۆژ بە تاقی ئاسـمانەوە. مـام کاکل خۆی لە ئارەقەی شـینو مۆر کردییە، ئارەقە بـە نیٚوچاوانو لاملو ڕوومەتی دادەچۆڕیٚتەوە، یەکەمجار بە خاکەناسە تیژەکەی پنچکە خڕنووکەکان لە بنەوەڕا دەبڕیٚو کۆمەڵیان دەکات، لە ترسی دڕکە تیژەکانی ناتوانیٚ بەباوەش

هەڵیانبگرێ و بیانگوازێتەوە سەر تەبەقەکان، ناچار بە شەنەی لک ئاسن، هەرجارەی باوەشێک هەڵدەگرێو دەیانگوازێتەوە.

باپیر لاپووتەیەکی[1] بەدەستەوەیە، بێئەوەی سڵاوێک لە مام کاکلی بکات دەچێتە سەر کۆمەڵە خڕنووکێکی مام کاکلیو خڕی دەکاتەوە سەریەکو وەک ئامادەکردنێک بۆ گواستنەوە، وەک ئەوەی بە دەستی خۆی کۆیکردبنەوە، مام کاکلیش وای مەزەندە کرد ڕەنگە ئەوی نەبینیبێو بەهەڵە چووبێتە سەر ئەو کۆمەڵەخڕنووکە، بۆیە هەرای کردێ: باپیر ماندوونەبی! ئەوە لەجیاتی یارمەتی مامی خۆت بدەی، بۆخۆتیان دەبەی؟!

باپیر وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوەو گوتی: ئەوە هی منەو مافی تۆی پێوە نییە! مام کاکل گوتی: بە پیاوانە داوات بکردایە دەمدایەی، بەڵام نایەڵم بەزۆری یەک پنچکەخڕنووکی ببەی! ئەوە دانە ڕۆژێکە خەریکی ئەوەندە خڕنووکەم، ئەتۆش دەتەوێ بێیە سەر حازرەکی؟! باپیر گوتی: ئەمن دەیانبەمو ژنی ئەوەم نەگاوە ناهێڵێ بیانبەم، ئەوە عەرزو ئەوە گەز! مام کاکل لەبەر لێوانەوە گوتی: ڕاستیان گوتووە: شەڕو تڕ بەدەستی پیاوی نییە! چار نیە، ئەگەر شەڕ هاتە بەردەرکێ، خوا دەتگری ئەگەر نەیکەی! مام کاکل لنگی دایێ، تازە بە ملیدا هات لەسەرماڵی خۆی بێتە دەنگ: هەی ناپیاو ئەوە قسەیە بە منێکی ڕیشسپیی دەڵێی؟ لەسەر چیش؟ لەسەر هەقی خۆم، ئاخر بەلاش نییە پێت دەڵێن باپیر سێبەندی، لەگەڵ ئەو دارِسانە، گەیشتە سەریو خاکەناسی بڵند کرد، باپیر وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی ناوشانی

١. لاپووتە: ئاسنێکی سەرپان و دەمتیژی هێندەی لەپەدەستێکە، کلکێکی دارینی هەیە، بۆ پاککردنەوەی گاسنی جووت و بژارکردنی بێستان بەکاردێت.

دایێ، دوو پشتەخاکەناسی لە نێوشانو قۆرنجی باپیری داو تۆزی لــێ برندکردو نققەی لە باپیری بڕی، وەک کاغەزی سپی خوێندبێـــتەوە گوتی: ئەوە شەوێ دی لە دیوەخانی کوێخا ڕەفیقــی فێریان کردی بێیو بە گژمدا بچی؟ ئەو دوو پیاوەی کوێخـــا ڕەفیقی لە نزیکەوە چاودێریی شــەڕەکەیان دەکرد، غاریاندا بە بیانـــووی بەڕەوانیو نێوبژیکردن، مام کاکلیان بەرزەفـــت کرد. باپیر هەتا زاری گرتـــی، تفێکی بە سەروســـیمای مام کاکلیدا کردو چەنـــد جنێوێکی بازاڕیی پێدا. مام کاکل خۆی لەدەســـت ڕاپسکاندن، هەرسێکی دانە بەر خڕکەبەردان. ڕاستە ئەوان ســـێ کەســـن، بەڵام کوا باری کوڕە کرمانجێکی جاقیو قاڵبووی نێو گێژاوی شـــەڕەخڕکەی گەڕەک بە گەڕەک دەگرن! خەڵکی ئاوایی، هەرکەس لە ڕاســـتەخۆیان غاریانداو گەیشتنێو نێوبژییان کردن. پیلانی شەڕەکە، وەک شەوی پێشوو پیلانیان بۆ دانابوو، چووە پێش. کوێخا مەبەستی خۆی پێکا. بۆ ئێوارێ کوێخا ڕەفیق دوو لە پیاوەکانی بە دوای مام کاکلیدا نارد. زۆری نەخایاند، مام کاکلیان چەنگ لەســـەر چەنگ بۆ دیوەخانێ هێنا. کوێخا ڕەفیق بێئەوەی بەخێرهاتنی بکاتو وەڵامی سەڵاوی بداتەوە، وەک حیساب بۆ نەکردنو نادیدە گرتنێک، خۆی بە قرتـــەی کیفکە دەمانچەکەیەوە خافڵاندبوو، بە بێدەنگی لە مام کاکلی خێس بووەوە، ســـمێڵە خنچکەیەکی لە خۆباییبوونو گاڵتەئامێزی کردو گوتی: کاکل وات لێهات وەکی بەرانی، حالۆری بیو کەس بە پیاو نەزانیو لـــە پیاوەکانی من ڕاســـت بییەوە؟ ئەوجا ئەو باپیـــرە پیاوێکی غەریبەیە لەو گونـــدەی، هانای بـــۆ ئێمە هێناوە، لـــە جیاتی ئەوەی یارمەتیـــی بدەی، دەچی کۆمەڵەخڕنووکی لـێ زەوت دەکەی؟ لەسەر ئەو حاڵەشەوە بە پشتەخاکەناسان هەموو ئازای بەدەنی دەشـــکێنی؟! بۆ مەملەکەت بێخاوەنەو گەورەکی لـــێ

نییە تەمبێت بکا؟! هەرچەندی مام کاکل ڕاستی هۆکاری شەڕەکەی خستەڕوو و ڕاستگۆیانە بۆی گێڕایەوە، بەڵام کوێخا ڕەفیق گوێی نەدایێو لەسەر دوو بیستی[١] خۆی نەهاتەخوارێ، چونکە ئەو بڕیاری پێشوەختەی خۆی دەربارەی مام کاکلی دابوو، گوراندی: کاکل دەبێت یەک عەربەگەنم جەزا بدەی، بۆئەوەی تەمبێ بیو جارێکی دیکە زاتی ئەوە نەکەی شەڕ لەگەڵ کەس بکەی، نەخەسمە لە غەریبەیەکی وەکو باپیری، ئەگەر ئەو عەربەگەنمەش هەرچی زووە نەهێنی، فەرمان دەکەم حەوت شەو و حەوت ڕۆژان لە تەویلەی وڵاخان سەراوبن هەڵتواسنو دوکەڵی کاجۆشت بە بن لووتیدا بکەن. پێیان دەڵێم دکرێکت پێبکەن، ژنی خۆتت پێ قایل نەبێ! هێندە بە دڵڕەقیو بێبەزەییانەوە ڕەفتاری دەکرد، هەموو سنووری ڕەوشتی مرۆڤانەی بەزاندبوو! مام کاکل ئەوەی شکی دەبرد لە عەرزو عاسماندا تەنها ئەو عەربەگەنمە بوو، عەشتەبای لە ماڵێدا نەبوو، ئەوەشی دانابوو بیکات بە دوو باراش بۆ منداڵەکانی، بەڵکو پێی بگەنە سەر جۆخینان[٢]. بۆ برسینەبوونی منداڵەکانی، تەنهاو تەنها ئەو دوو باراشەئاردەی شک دەبرد، ئەویشیان لێسەند! دوای ئەوەی کوێخا ڕەفیق، وەک دەرکردنێک لە مام کاکلی ڕاخوڕی: ئێستا بڕۆ هەرچی زووە لە بەرچاوم ونبەو ئەو عەربەگەنمەی بێنە بۆ دیوەخانێ، هەر دەلحازی لە دوای باوکەو براگەورەکەی بەلقیسی ناردو هاتنە دیوەخانێ. کوێخا فەرمانی پێکردن: هەر

١. دوو بیست: لە هێندێک شوێن، بۆ نموونە پشدەر و موکریان دەڵێن سێجار بیستە. کینایەیە بە سووربون لەسەر قسەی خۆ.

٢. پێی بگەنە سەر جۆخینان: گەیشتنە سەرجۆخین. گیشتنە کاتی گێرەی دەغڵ و دان و خەرمان سوورکردن، گەیشتنە وادەی ئەوەی گەنمی تازە بێتەوە ماڵێ.

ئێستا بەڵقیس‌و باپیری ئاشت بکەنەوە! بەوشێوەیە، باپیر تا کۆتایی تەمەنی بەشەرمەزاری ژیانی بەڕێ کرد، کەسایەتی‌و پێگەی خێزانیی، لە بەرانبەر کەسایەتیی بەڵقیسی، ئەوەندە نزم بوو، بەجۆرێک کەس نەیدەزانی کە ژن‌و مێردن! بەڵقیس بەرەو ڕووی باپیری دەیگوت: ئەمن‌و ئەو سێبەندییەیان نەگوتبوو، بەڵام ئاخ ئابڕووم پێوەی چووە، ئاخر مام کاکل پێڵاوەکانی لە باپیری پیاوترە! ئەو سێبەندییە ئێمەی شەرمەزاری خەڵکی ئاوایی کرد، ئاخ سێبەری پیاوی درۆزن‌و نۆکەرسیفەت، بۆ ژنێ چەند ناخۆش‌و شەرماوەرە!

مام کاکل بۆ منداڵەکانی، بۆنی ئاردی دەدا! ئاخر ئەو دەمێک بوو نانی دەپەرست لە پێناوی ئەوەی بژی. دوای ئەوەی عەربەگەنمەکەیان لێئەستاند، مام کاکل، بۆئەوەی پارێزگاری لە شکۆو دەروونبەرزی هەژارانەی خۆی بکات و، نەیدەویست دەوەخوارکەی[1] لە بەرکەس بکات، چونکە ماڵیشی لە پشترێیێ بوو، ئەسڵەن نەیدەویست گەنمی باراشی لە خەڵکی پشترێی قەرزبکات، نەبادا کوێخا ڕەفیق پێی دڵخۆش بێت، ناچاربوو بۆ دابینکردنی ژیانی منداڵەکانی، سەری خۆی هەڵگرت بۆ گوندەکانی بەرڕێی، بە تایبەتی دەو ڕووباری، چونکە خزم‌و ناسیاوی باشی لەوێ هەبوو. لەوێ دەیتوانی گەنم لە خزمێکی قەرزبکات تاوەکو دەگەنە گەنمی نوێ و، هەروەها دەردەدڵی حاڵی پەرێشانی خۆیشی بۆ کاکەڕەشی حاجی سمایلی بکات، بەڵکو ڕێگاچارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە، یان ئەگەر لە توانایدا بێت کوێخا ڕەفیقی تەمبێ بکات. بەدەم ڕێگاوە، لە حەیبەتی ئەو بێدەسەڵاتی و ئەو زوڵمەی لێیکراوە، فرمێسکی بە

---

١. دەوەخوارکە: پاڕانەوەو لاڵانەوە لەبەرخەڵک.

ڕیشـــە ماش‌و برنجییەکەیدا دەهاتە خواری‌و چەناگەی تەڕدەکرد، مەگەر هەر خوا هاواری بێدەنگی حاڵی بێ!

خزم شمشـــێری پشت کەندووێیە، هەرکات لێت قەوما، دەستی بۆ دەبەی و فریات دەکەوێت. لـــەوێ، دوو باراش گەنمی لە خزمێکی قەرزکردو پێیگوت: ماڵـــت ئاوابێت، هەر کە گەنمی نوێ پێراگەیشـــت، هیـــچ ناکەم هەتا ئەو دوو جەواڵەگەنمەت بۆ دەهێنمەوە، خوا لە خزمایەتیت کەم نەکات!

دواتر ڕۆیشـــتە لای کاکەڕەشـــی و هیدۆش لەوێ بوو. دوای ئەحواڵپرسی‌و بەخێرهێنان، هەردووکیان تەماشای یەکتریان کرد، دیاربوو شڕی جلوبەرگی مام کاکلی زۆر بێتاقەتی کردن. ئەوان مام کاکلیان زۆر خۆشدەویســـت، هەرجارەی دەچوونە پشـــترێیێ، میوانی مام کاکلی دەبوون، بۆ وان هەم قۆناغ و هەم جێی متمانە بوو. بەر لە هەرشـــتێک کاکەڕەش گوتی: مـــام کاکل حاڵت چۆنە بە دەســـت کوێخا ڕەفیقیەوە؟ ئێســـتاش بەردەوامە لـــە ئەزیەتدانت؟ مام کاکل بەو پرســـیارەی بە جارەکی برینی کولاوە، گوتی: قیرڕوســـیا برســـیمان دەکات‌و حاســـڵاتمان دەخوا، ئەوەی لە برسێتی بەئازارترە شـــکاندنی کەرامەتە! کوێخا ســـەنەگەم لەســـەر هەڵناگرێ، کورت‌و کرمانجی، دەیەوێت لە گوندی‌و لە سەر زەویی و ماڵی خۆم دەرمپەڕێنێ، تێکمبشـــکێنێ‌و تەسلیمی ئیرادەی وی بم. ماجەرای ئەو چەند ڕۆژەی بەینی خۆی‌و کوێخا ڕەفیقی لە نووکەوە بۆ گێڕانەوە، کە چۆن دارو نەداری عەربەگەنمێک بووەو ئەویش کوێخا بە ناوی جەزاکردنەوە لێی سەندووەو کەوتۆتە ســـەر ساجی عەلی، بۆ ئاردی منداڵان مەجبوور بووە گەنمی قەرزبکات. ئەوە دوو ســـاڵە دەمەوێ کورتەک‌و شـــەروارێکی بەرادان بـــدەم، هەرچەندی دەکـــەم پێڕاناگەم، دەڵێم قیروســـیا با خـــۆم ڕووت بم، بەڵام

منداڵەکانم زگیان تێربێت، ئێستا ئەو قەرزەشی هاتەسەر! مام کاکل، پینەی سەر جلەکانی، نیشانی دەدا کە پیاوێکی خاوەن عیززەتو ویقارە. بەو حاڵەشەوە دەیگوت: ئەخلاق ئەوەیە کۆڵ نەدەینو تەسلیم نەبین، کورو نەوەکانیشمان فێری بەگژدا چوونەوەی زاڵمان بکەین.

هیدۆ گوتی: ئەو کوێخایە پیاوێکی زۆر ناحاڵی و نامەردە، باشە، پار ئەو هەموو تفەنگەمان بە ماڵییەوە نا، هەر تەمبێ نەبووە؟! چار نیە، وەک ڕۆژووی ڕەمەزانێ فەرز بووە بەسەرماندا دەبێ تۆڵەی ئەو منداڵە برسییانەی لێبکەینەوە.

لەوساتەوەی مام کاکل باسی ئەو زوڵمەی بەو دوواییەیان بۆ دەگێڕێتەوە، کاکەڕەش هەر سمێڵانی دەکرۆژێو خۆی دەخواتەوە. چاوە پڵنگیەکانی، برسیکەی تۆڵەیان لێهەڵدەستێ: مام کاکل ئەتۆ سەبرێکمان لێبگرە، با ماڵ بچنە سەر شینایی، ئەوکاتی بزانە چی بەسەردێنین! دەبێت بەجۆرێک تۆڵەی تۆی لێبکەینەوە، ئەوڕۆژە بەنەفرەت بکات کە تێیدا بەوەلەد بووە! ئەو زاڵمانە تەنها لە زمانی گوللە حاڵی دەبن! ئێستا ئەو حەوشو حەسارو سەگەدڕانەی کوێخا ڕەفیقی هیچیان لەگەڵ ناکرێو کەلێنمان نابێ، بەڵام کۆتایی بەهارێو هەوەڵی هاوینێ، لەوکاتەدا ماڵی کوێخا ڕەفیقی دەچێتە سەر کەپرو شینایی، لەوێ، سەگەکانیان لەگەڵ مێگەلەمەڕی دەڕۆن. قەولی پیاوان بێ، تۆڵەی ئەو عەربەگەنمەی قووتی منداڵەکانت بە دە قات دەنک دەنک لە گەرووی بێنمەوە دەرێو، قەرەبووکردنەوەی تۆ، لەوڕۆوە لە ئەستۆی منو هیدیۆی برایە. لە ئێستاوە وا بزانە قەرزاری کەس نی، ئەو عەربەگەنمە بە دوو قات لەسەر ئێمەیە.

مام کاکل بەو قسانە، گەز گەز باڵای دەکرد، بەوەی کەسانێک هەن خەمی

دەخـــۆنو داکۆکی لێدەکەنو لە بەردەمی کێردی زاڵمان بەتەنهای ناهێڵنەوە. تا ڕادەی یەقین باوەڕی بەو قسانەی کاکەڕەشی هەیە، کە خاوەنی بەڵێنی خۆیەتی. چاک دەیزانی ئەو دوانە ئەگەر نەشیکوژن، ڕەفیقی بۆ تەمبێ دەکەن. زۆر سەیر ورەی بەرزبووەوەو گەشـــایەوە: ئەوجا ئەمن پیاوی وەکو ئێوەم لە پشت بێت، لە هیچ باکم نیە. بە دڵێکی خۆش و دەماخێکی بەرزەوە گەڕایەوە ماڵێ. هاوسێو خزمو کەســـانی ئاوایی هاتنە لای بۆ دڵدانـــەوەو هاوخەمی لەو زوڵمەی کوێخا لێی کردووە. پشـــتیوانیکردنی تەنها بەقســـە، کە هیچی تێناچێو هەزینەی نییە! بێئەوەی کەســـیان ئامادەبن بایی بەرەهەویرێکی ئاردی بدەنێ! لەو ورەو مکوڕبوونـــەی مام کاکلی، هەموویان حەپەســـا بوون، خـــۆ بەخۆ دەیانگوت: بەڕاســـتی مایەی سەرســـوورمانە دوو باراشـــە گەنمت لە ماڵێدا بێ و، لەو وەختەی ســـاڵێ، هەردووکت لێبســـتێنن، جلوبەرگێکت لەبەردابێ، پینەیەکی ڕابکێشـــن چوار پینەت لەدوای دەستی بێت، بەڕاستی ئەوە غیرەتە! توخوا بە ئێمەش دەڵێن پیاو! کوڕە مام کاکل جەرگی هەندی سێرەکیە!

کاکـــەڕەش و هیدۆ، هەرکاتێـــک غەوارەیەک لەژێر هەرناوو پیشـــەیەکی وەک: دۆم، ســـەفارچی، کیربڕ، خۆشناوی ترێ و گروان و مازیفرۆش، پینەدۆز، دێوەرە، عەتار، گڵەســـەرفرۆش و ســـۆفیی گەڕیدەو... دەهاتنە سەر گوفەکی گەورەی گونـــدی، ئەوانیش ئامادە دەبوون، چونکە هەواڵ و ڕووداوی گوندەکانی ناوچەکە لە زاری ئەو پیشەوەرەگەڕۆکانەوە، بڵاودەبوونەوە.

ئەو ڕۆژە، ئاسمان وەکو پیرۆزەی شین خۆی نمایش دەکات، پیاوێکی ڕیشسپی، ڕیشی هەر کتومت هوڕەی لۆکەیو پەشمەکی سپی، قیسی برۆکانیشی سپی بوون، وەکو کڵۆ بەفر لەسەر چاوەکانی نیشتوون. مەندیلێکی خامی سپی لەسەر

کڵاوێکی ســـپی لەسەری بەستووە، کەواو سەڵتەی ئاودامێنی سپی پۆشیووە، کڵاشێکی بن ئیسفەنجی سپیو گۆرییەی سپی لەپێیدایە، دەفەیەکی سپی بە شانییەوە هەڵواسیوە، سواری کەرێکی حەساوی سپی بێنیشان بووە، ئەو جۆرە کەرە پێیان دەگوترا بەغدایی. قیسی کورتانو تێرەی سەرپشتیی کەرەکەش هەر ســـپی بوون. لە تەوقی سەری تا دەگاتە بنی پێی، سپی بوو، وەک مرۆڤێک لە بەفر. تەنەها دوو خاڵی ڕەش لە دەمو چاوی دیاربوو ئەویش هەردوو کونەلووتی بـــوون. لەناکاو لە ماڵی حاجـــی ئەحمەدی عەولاّ چینکـــۆی، بە ژوورکەوتو بەویقارەوە ســـڵاوی لێکردن. حاجیژن بەدەســـت خۆی نەبوو گوتی: بیســـمیللا بیســـمیللا فەرمووو پیری زونهاری گەڕیدە بەخێربێی سەرســـەرو ســـەرچاوان، خێرو بەرەکەتت هێنا، ماڵەکەت ڕووناک کردینەوە. دەستی بۆ ژووری میوانان ڕاداشـــت: فەرموو ئەو ژوورە بەنوێژە! هەر بەپەلە بە کوڕە هەشت ساڵانەکەی گوت: بڕۆ بانگی بابت بکەوە، بڵێ میوانێکی سپی سپیمان هاتووە، نایناسین! منداڵەکەش بە دیتنی ســـیمای ســـپیی میوانەکە، زۆر سەرســـامو حەپەساو بوو، لە لایەکیش دڵخۆشـــبوو. هەر بەغاردان نێـــو گوندی گەڕا، تاوەکو باوکی لە یەکێک لە ماڵەکانی ئاوایی دیتەوەو زۆر بەپەشـــۆکاویو نائاســـاییی گوتی: بابـــە بابە! خێراکە وەرە بچینەوە ماڵێ، میوانمـــان هاتووە! حاجی ئەحمەدیش، بەهۆی ئەوەی منداڵەکە، زۆر نائاســـاییو بەپەلەو پەشۆکاوی شەرواڵی باوکی ڕادەکێشـــاو پەلەی چوونەماڵەوەی لێدەکرد گوتی: ڕۆڵە ئەو پەشۆکانەی ناوێ، میوانەکە کێیە؟ منداڵەکەش بە دەم ڕاکێشـــانی شـــەرواڵی باوکییەوە گوتی: میوانەکە یان خدری زیندەیە یان حەزرەتی غـەوســـە! هەرچەندی باوکی گوتی: کوڕم شـــتی وا نابێ وا مـەڵێ گوناهت دەگاتـــێ، حەزرەتی غـەوس مردووە! بەڵام

کوڕەکە هێندە دڵنیابوو لەو دووانە، یەکیانە، قسـەی باوکی بە گوێدا نەدەچوو، چونکە ڕەنگی خدری زیندەو حەزرەتی غەوسی بە سپی و پاکژو بێگەرد لە زەینی منداڵانەی تۆمارکرابوو!

بابە ئەتۆ بڵێی خدری زیندە گوێی لە دوعاکانی من بووبێت؟! یان بە دوای نوێژەکانی تۆدا هاتبێ؟! بابە بەکوێدا هاتۆتەخوارێ لە عاسمانێ؟! توخوا بابە مەهێڵە لەماڵی خۆمان بڕوات! خۆ ماڵی ئێمە خاوێنەو هەمووی بەنوێژە، ئەی بەخۆت نەتدەگوت خدری زیندە لە شوێنە خاوێنەکان دەبێت؟ پێی دەڵێم داکم هەمیشە باسی تۆ دەکاتو داوای یارمەتی لە تۆ دەکات، تکایە یارمەتیی دایکم بدە! بابە توخوا مەهێڵە بڕوات، بەو خوایەی بێعاری ناکەم، ئاقڵ ئاقڵ دادەنیشم، ئەدی نەتدەگوت خدری زیندە منداڵی خۆشدەوێ! ئەوە نییە ئەمن منداڵم خۆ هەر گەورەش نەبووم.

ئەو، وەک تارمایی ڕوحیانەتێکی پیرۆز میوانەکەی دەبینی. باوکی پێیگوت: کورم ئەوە خدری زیندە نییە. ئەوە سۆفیە سۆفی، سۆفیەکان دەف لێدەدەن. دەگەڕێن، ئەو گوندو ئەو گوند دەکەن، سروودی ئاینی دەڵێنەوە، خەڵکیش، بە گوێرەی توانای خۆیان شتێکیان بۆ دەبەن.

گوفەکی گەورەی نێوەڕاستی ئاوایی، وەک گردۆلکەیەکی لێهاتووە. بە تێپەڕبوونی کات، لای سەرەوەی بووبووە پێخوست، خەڵکی ئاوایی تەنها لاتەنیشتێکی وەک زبڵدان بەکاردێنن، ئەو تەنیشتەی وەک تەلانێک وابوو، زبڵەکەیان پێدا شۆڕدەکردەوە. لای سەرەوەی، وەکو گڵێکی ڕەش خۆی دەنوێنێ، هێندە کۆنە بۆتەوە گڵ. تەنها لەسەر ئەو گوفەکە بڵندە، بانگەوازو ئاگادارکردنەوە بڵاودەکرایەوە، هەتا خۆشناوەکانیش کاتێک گروانو جەفتو

بەڕوو و ترێیان دەهێنایە گوندی، لەسەر بڵندایی ئەو گوفەکەی هەتا دەنگیان تێدابوو دەیانگوت: دە وارنە[١] ترێیان، سەر بەسەر بە گەنم، یەکو نیو بە جۆ!

بڵندایی گوفەکی گەورە، جاران، بەسەر گوندیدا دەڕۆنی، لە ئێستادا کەوتۆتە نێوەڕاستی گوندیو بۆتە چەقی گوندی. بۆ تاریفکردنی هەرماڵێک، گوفەکی گەورە وەک خاڵی ناونیشان وەردەگرن. ئەگەر چاوساغی بۆ یەکێک بکردبوایە دەگوترا: ماڵەکەی کەوتۆتە خۆرهەڵات، یان لای سەرەوەی گوفەکی گەورە. ئەوڕۆژانەی هەتاو بوون، خەڵکی گوندی لەسەر ئەو گوفەکەی کۆدەبوونەوە. ئەوانەی لە ژیاندا مابوون لە ژنو پیاو، کەسیان وەبیریان نەدەهات تەمەنی ئەو گوفەکەی چەندە، بەڵام دڵنیابوون هاوتەمەنی گوندەکەیە. هەموو پیرەمێردەکانی ئاوایی بەمنداڵی یارییان لەسەر ئەو گوفەکەی کردبوو. هەرچی پیرەژنو پیرەمێردی ئاواییە، تاقە یەک کەسیان نییە یادەوەری منداڵی لەگەڵ گوفەکی گەورەدا نەبێت، یان یادەوەرییەک بگێڕێتەوەو ناوی گوفەکی گەورەی تێدانەبێت، وەک تابلۆو شوناسی گوندەکە تەماشا دەکرا. لە چەند بەندو گۆرانی ناوی هاتبوو. زۆرجار وەک جێژوانو یەکتربینین دیاری دەکرا. هەرچی دێوەرەو بەقاڵو گرەسەرفرۆشو کیربڕو ئەو خۆشناوانەی تووتنیان لە هەرتەلێڕا دەهێناو ئەو وەستایانەی چەقۆو سیکاردو تەورداسیان سەقاو دەمەزەرد دەکردەوە، هەر هەموو، لە سەر گوفەکی گەورە بانگەوازیان بۆ دەکرا. سەرتیلەی دیواری مزگەوتێش کەوتبووە لای گوفەکی گەورە.

١. دە وارنە: دە وەرنە. دە وەرن بۆ... بزوێنی درێژ (ا)ی وەرنەی، لە بنەڕەتدا بزوێنی کورتە (ە) بەڵام لە کاتی جاڕدانەکەدا بەهۆی ئەوەی (وەرنە)کە درێژ دەردەبڕدرێ، دەبێتە بزوێنی درێژ.

هێندەی پێنەچوو، ئەو پیاوە دەفژەنە سپیپۆشــە، لە سەر گوفەکی گەورە قیت بۆوە، منداڵی ئاوایی جۆخینەیان لە دەورەی بەست. دەتگوت مانگەو لەسەرپشتی هەوران دەف بۆ ئەســتێرەکان دەژەنێ! تابلۆی ئەو دیمەنە ئەفسووناوییە خەڵکی ئاوایــی مەســت کردبوو، هەموو ماڵــەکان پڕ ببوون لە دەنگی دەف. شــەوانی خەڵوەتی زیکری خودای وە بیر دەهێنانەوە. دەنگی خەمباری دەفەکە، هەموانی خرۆشـــاندبوو. جارجار دەفەکەی بەرزدەکردەوە بــۆ قاپی خودا، کە نەوی دەکردەوە، هێندە بە مەعلانی‌و وەســـتایانە دەفەکەی دەژەنی، تاقە یەک پەنجەشی هەڵەی نەدەکرد! ئاوازەکەش وەکو جلوبەرگــو ســـیمای سپی بوو! دەنگی دەف ئەو دۆڵو دەشـــتو کەندانەی پڕ پڕ کردبوو لە ڕوحی سپیی پیاوچاکان. نێوە نێوە دەفەکەی ڕادەگرتو دوو بەندی پێهەڵدانی بە شــێخەکەی دەگوت، بۆئەوەی بناســرێ سەر بــە چ تەریقەتێکەو موریدی چ شــێخێکەو شــێخەکەی خاوەنی چ کەشــفو کەرامەتێکەو غەیبناسییەکەی هەتاوەکو چ ئەندازەیەکە:

**وەرن خزمینــە با بکەین موناجات**
**هەر لە لای خۆیتی کەشف‌وکەرامات**
**پاشای مەدینە یا سەیدولبەشەر**
**شـەفاعەتکاری ڕۆژەکەی مەحشـەر!**

هاواری دەکرد: خەرج‌و مەخاریجم بۆ بێنن، خودای لە خۆتان ڕازی بکەن، هەر ئەوەتان فریادەکەوێت، جۆی بێنن بۆ کەرەکەم! ئەوجارە هێندە بەتووڕەیی دەفەکەی هەڵدەسووڕاند، هێندەی نەمابوو هەموو ئەڵقەو پرپرەکانی بەرەو ئاسمان هەڵفڕنو خۆیان لەو سەرســـوڕانە ڕەهابکە. بەجۆرێک گێژەنی پێدەدان، دەفەکە لە دەستی

وەزاڵە هاتبوو. ئەوجارە کە ڕێچکەی خەڵکی بینی وەک مێرووستان بەرەو ڕووی دێنو هەریەکەی بڕێک دانەوێڵەی بەدەستەوەیە، لەگەنە ساوار، بڕوێش، گەنمە کوتاو، داندۆک، کەشک، منداڵەکانیش کۆشیان پڕ لە جۆ دەکردو لە پێش کەرەکەیان ڕوودەکرد. ئەو کەرەیان پێ لە کەرەکانی خۆیان پیرۆزترو مەقام بەرزترە، چونکە پیاوێکی لە خوانزیک سواری سەرپشتی دەبێت! خەڵکی وا هەبوو قەرەپوولی بەدەستەوەبوو، کە ئەوەیانی لە هەمووان زیاتر پێ خۆشترەو شێتی ئەو زرینگەیەیە کاتێک هەڵیاندەدایە دەستەسڕەکەی بەردەمی و یەک دوو جار هەڵدەبەزیەوەو زرینگەی دەهات!

سۆفی دەستی پێدەکردەوە:

**بە خۆت قادری، هەر بە خۆت قودرەت**
**برژێنە سەرمان ڕێژنەی بەرەکەت**
**ڕێگای بریفکان سەرەو هەورازە**
**چاوی شێخی من مەخسوودو مرازە**

هەرکەسێک چەندەی بێنێ بۆ من وەک قەرزە، لەلای خودا سەد هێندەی دەرژێنێتەوە ماڵەکەی! فەزاییێکی خولقاندبوو، وەک پەرجوو خەڵکەکەی شەیدایانە پەلکێش دەکرد، بە شێوەیەک، کەس ماڵی خۆی نەدەهاتە بەرچاوی! دەنگی دەف دەچۆ پەرپەرۆچکەی ئاسمانێ!:

**شێخم ڕاوەستا لە بەرهەیوانێ**
**دڵم لە بەرپێ دەکات جۆللانێ**

**خـــاکی بریفکان بە چـاو دەکێڵم**
**دەرکی شێخی خۆم قەت جێ ناهێڵم**
**من گوناهبارم هەر خۆم خەجاڵەت**
**ســـەگی دەرگای تۆم تاکو قیامەت!**

دوای ئەوەی باری نێرەکەرە ســپییەکەی شیشــکوت لــە ئازووقە داگرت، خۆی هەڵدایە سەرپشــتی، کەر ئەوەندە تێرجۆ بوو، لەگەڵ یەکەم حەچە، وەک برووسکە لە سووچەی کۆڵانێ سووڕایەوەو لە بەرچاوان ون بوو.

نی وا هەبوو، هەزار ســوێندی دەخوارد بە چاوی خۆی بینیویەتی، هەتا لە زوورگەزراویش ئاوابــووە، کەرەکە، وەک دوڵدوڵی باڵی لێک بڵاوکردووەو فڕیوە! ئاخر ناهەقیــان نەبوو، چونکە زۆریان وایاندەزانی، ئــەو تێرە زەخیرەیەی بۆیان داگرت، بۆ پشــتی هەورانی دەبات! لەوێ، لە ئازووقەخانەی ئاســمانێ وەبەر مەلایەکەتەکانی وەردەکات! منداڵ لێیان بوو بە کێشــەو بەشەڕهاتن، لەسەر ئەوەی کاتێک کەرەکە باڵی گرتووەو هەر چوار ســمی لە عەرزی بڕاوە، ســۆفی سپیپۆش، بە عارەبی فەرمانی بە کەرەکە کردووە کە بفڕێ! هەندێک منداڵیش دەیانگــوت: بە گوێی خۆمان گوێمان لێبووە ســۆفی بە کــوردی حەچەی لە کەرەکەی کردووەو ئەویش بە قسەی کردووەو لێی حاڵی بووە! منداڵێکی دیکە ئەوەی لـــێ زیادکردو دڵی خۆی بەوەی خۆش دەکرد: ئێ خۆ کەرەکە ئێستاش جۆی ماڵێ مەی لە زگیدایە، لە عاسمانێ کەرەکە نابێت تەرسی بکات؟!

مانگ و ســاڵ ڕاناوەستن، چەرخو خولی خۆی پەک ناخات. وەک شەپۆلی دەریا هەموو شــت دەداتە بەرخۆی، هەر لرفەی دێو هەڵدەلووشێ، ئەوەی لە

دوای جێدەمێنێ، پاشەڕۆییەکە پێیدەڵێن مێژوو! دروست ئەو شتەی کە ئێستا ئێمە کنەی لێدەکەین!

ئێستا نێرینەی بەهارێیە، تۆڵەکە لەنێو گوندیو لە چواردەوری، هەتا نزیک پشتێنی پیاوی بەرزبۆتەوە. زەمەندی گژوگیا وا ملی داوەتە یەک، سوار بەحاڵ لێی بردەکات. برژانگی گەنمی گەییە ڕکێبی سواریو لە بەرزگی ئەسپی دەدا. بنی ڕکێبی، وەک دەستی هەتیولاوێن بەسەر گوڵەگەنمەکاندادێتو نازیان هەڵدەگرێ. پەڕەسێلکە بە نمایشی سەماییێکی ئەفسووناوی، وەک ڕێزگرتنێک لە پیرۆزی نان، بەرززگی خۆی لە گوڵەگەنمی قەندەهاری دەخشێنێ. گۆشەی چاوەکانی لە برژانگی گوڵەگەنمی ڕەشگوڵ دەسووی و، لەجیاتی کلو کلدان چاوی خۆی پێ ڕەش دەکات.

هیدۆ هێندە بەپەلەیە بۆ بەجێگەیاندنی ئەو بەڵێنەی بە مام کاکلیان دابوو، زوو زوو وەبیر کاکەڕەشی دەهێنایەوە: ئەتۆ بڵێی کوێخا نەچوویێتە سەر کەپرو شینایی‌و، هەواری هاوینەی ئاوەدان نەکردبێتەوە؟ شەوێک بەخزمەتی بگەینو بۆ حەوت پشتی تەمبێی بکەین!

ئێوارەی ڕۆژێکی نێوقەدی بەهارێیە، گیا نێر بووە. لە شوێنە چەقێنو بڵندەکان جۆ خەریکە زەرد دەبێو بۆرەی[1] تێکەوتووە. کوڕە گەورەکەی مام کاکلی، بەسواری پاسکیلی گەیشتە ماڵی کاکەڕەشی. هەروا سەعاتێک دەبوو کاکەڕەشو هیدۆ چووبوونە دیار ئەو پینەدۆزەی پێڵاوان کە لە بەردیواری مزگەوتێ سندانی خۆی داکووتابوو، بۆ پینەکردنی پێڵاو و دەورەگرتنی کڵاشە

---

١. بۆرە: گۆڕانی ڕەنگی دەغڵ و دان و گیاوگۆڵ بەرەو وشکبوون.

بە چەرم و پێســـتی ئاژەڵ. ئەو پینەدۆزە، ساڵی یەک جار دێتە گوندی، ئەوەی کاری پێڵاوچاککردنـــەوەی هەبێت دەچێتە لای. دوو جــۆر دەورەگرتنی کڵاش هەبوو، دەورەو نیو دەورە. ئەوانەی دەورەی تەواویان دەگرت، بۆ ئیشـــێ بەکاریان دەهێنـــا، ئەوەی نیوە دەورەی دەگرت، بۆ جوانـــیو نێو ئاوایی لەپێی دەکرد. لەو کاتەی پێڵاوەکانی هیدۆی بزمارڕێژ دەکرد، منداڵێک بە هەناسەبڕکێو غاردان هات و، ڕووی لە کاکەڕەشی کرد: مامۆژنم، مەبەستی هاوسەری کاکەڕەشی بوو، ناردوومی: بە مامت بڵێ میوانمان هاتیە، با هەرچی زووە بێتەوە. هەرچەندی کاکەڕەش پرسیاری کرد: نەتنانســـی؟ ناوی چییە؟ بە تەنیایە؟ چەکی پێیە؟ پیر یان گەنجە؟ لە وەڵامدا هەر ئەوەندەی گوت: کوڕێکی لە من زۆر گەورەترە.

کاکەڕەش بە هیـــدۆی گوت: ئەمن دەڕۆمەوە ماڵـــێ ئەتۆش تەواو بووی، وەرە. بەپەلـــە گەڕایەوە. کە چـــووە ژوورێ بینی کوڕەگەورەکـــەی مام کاکلییە. مانـــدوو نەبوونی لێکردو کوڕەکە گوتی: باوکم ســـڵاوی هەبوو و گوتی ئەوەندە بە کاکەڕەشی بڵێ: شینە شـــاهۆیەکە لە جێگای پارهاوینێ هیلانەی کردووەو هەڵنیشتووە! ئەو بەخۆی حاڵی دەبێت. کاکەڕەش تێگەیشت کە کوێخا ڕەفیق چۆتە ســـەر کەپرو شینایی‌و بە تەنیا لەوێ دەخەوێت. لەگەڵ هیدۆ بەو هەواڵە دڵخۆش بوون. ئاخر دەمێکە ئارامیان گرتووە. کوڕەکەیان بەڕێ کردەوە: بە بابت بڵێ چاوەڕوانی تەزرە بێت!

ڕۆژی دوایی خۆیان ئامادەکرد، تەنها دوو کەس، ئەویش کاکەڕەش‌و هیدۆ. نانی نیـــوەڕۆو ئێوارەیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت بۆئـــەوەی لە هیچ گوندو هیچ ماڵێـــک لانەدەن بـــۆ نانخواردن. چونکە هـــەرکات ئەو دووانە لە شـــوێنێک ببینرێن‌و شـــتێک ڕووبدا، دەڵێن لەو دوانە هەڵنەبـــاردووەو کاری ئەوانە. هەم

دەیانەوێ بەر لە خۆرئاوابوون بگەنە دەوروبەری کەپرو شـــینایی کوێخا ڕەفیقی بۆئەوەی سۆسەیەکی ورد بکەن. بە هیچ شێوەیەک نایانەوێ کەس بیانبینێ‌و بەرگومـــان بن. کەپرەکە بریتییە لە ژوورێکی بچووک، دیوارەکەی لە خشـــتی قوڕ دروســـتکراوە. بۆ ئەوەی فێنکایی بای، لەوسەری بۆ ئەوسەری تێڕابڕوات، هەر چواردەوری بەڕیز دەلاقەی لێکراوە. ســـەری بـــە دارەڕێ‌و بانەکەی بە قوڕ سواق دراوە، بۆئەوەی لەسەری بخەون. شەوانی سەر ئەو کەپرانە زۆر تایبەتن: کاتێک مرۆڤ لەســـەر گازەرای پشـــتێ، لە بەرتریفەی مانگەشەوێکی ڕەنگ مسی ڕادەکشێ، ئەستێرە گرشـــەیان دێ و بە چواردەوری مانگەوە پرشوبڵاون، وەک ملوانکەی یاقووت‌و مرواری گەردنبەندی مانگ بن‌و، داوەکەی پســـابێت و دەنکەکانی بەسەر سینگی ئاسماندا بڵاوبووبنەوە! بەڵام ئەفسووس، کوا دڵی ڕەقی زاڵمی خودانەناس هەست بەو جوانیانە دەکات!

شـــەو ڕاشـــکا، مانگ‌و ئەســـتێرە بە تاقی ئاســـمانێوە لە چاوەڕوانییێکی تاقەتپڕووکێن بەهەســـتیاری‌و ســـەرنجەوە لـــە ڕووداوەکە دەڕوانـــن. کۆتایی بەهارێیەو لە شـــەوە کورتەکانی هاوینێ نزیک دەبنەوە. شـــەوی هاوینان زۆر کورتن و خەویش لە بەرکزەبای شەماڵی‌و بورجی ئەستێران، زۆر خۆشە.

کاکـــەڕەش‌و هیـــدۆ خۆیان لـــەو کەپرەی نزیـــک کردەوە کـــە کوێخا ڕەفیق لەســـەری خەوتووە. هەرچەنـــدە کوێخا ڕەفیق پیاوێکـــی ڕەقەڵەی کەڵەگەتەو کێشـــەی قەڵەوی نییە، بەڵام پرخەی دێت. ئـــەو پرخەیە، یانی خەوێکی قووڵ! زۆر لەو پیاوانەی چەک هەڵدەگرن لەنێویشیاندا کوێخا ڕەفیق کوشتنی خۆیان لەلا خۆشـــترە لە چەککردن، هەرکەسێک چەکی لێبســـێندرێ، لەوە بەدوا لە مەجلیســـی پیاوان چاو و ڕووی قسەکردن‌و ســـەربەرزکردنەوەی نامێنێ کوێخا

ڕەفیــق بە پەیژەیەکــی دار ســەرکەوتووە، دوای ئەوەی چۆتە ســەر کەپرەکە، پەیژەکەی هەڵکێشــاوەتە لای خۆی، بۆئەوەی کەس دەستی پێی نەگاو زەفەری پێ نەبەن. لەو چرکەســاتە هەستیارەدا، بەئاگاهاتنی کوێخا، بەمانای کوژرانی هەردووکیانە. بەڵام گەرموگوڕیی جۆشی تۆڵەی مام کاکلی، سڵیان پێ لە مەرگ ناکاتەوە! لە هەر چواردەوری کەپرەکە ســووڕان، بە ئومێدی ئەوەی شوێنێک بۆ ســەرکەوتن بدۆزنەوە، بەڵام بەهۆی بڵندی کەپرەکە ناتوانن سەربکەونو چ ڕێی ناچنێ. کات لــە بەرژەوەندییاندا نییە، ئەگەر کوێخا بەئاگا بێت، کوشــتنیان وەک ئاوخواردنەوەیــە، چونکە دروســت دەکەونە بن دەســتی کوێخای، بۆیە دەبێت پەلە بکەن بۆ ئەوەی هەرچی زووە ســەربکەونە سەر کەپرەکەو دەستی خۆیان بوەشێنن، بەرلەوەی دەستیان لــێ بوەشــێندرێت. کاکەڕەش پیاوێکی کەڵەگەتو چوارشــانەیەو کێشــی دوو هێندەی کێشــی هیدۆیە، ناچار بوون کاکەڕەش پشتی بۆ هیدۆی دانەواندو ئەویش چووە سەرشانی. هیدۆی بڵندکردو توانی سەربکەوێتە سەر کەپرەکە، بەپەلەو وریاییەکی زۆرەوە پەیژە دارەکەی بۆ کاکەڕەشی شۆڕکردەوە، ئەویش سەرکەوتو وەک چۆن لەسەری ڕێککەوتبوون، بۆ دابەشکردنی ئەرکەکان، کاکەڕەش دەمانچەی بەڕووتی بەدەستەوەیەو لەسەر سەری کوێخای ئەوبەر ئەوبەریان گرتووە. هیدۆ دەستی لەبن بالیفی ژێر سەری کوێخا ڕەفیقی ڕۆکرد، دەستی لە دەمانچەو قایشو قرۆشو یەدەگەکان گیرکردو ڕایکێشا، بێئاگا لەوەی کوێخا چەنگەبازی دەبێت! چرکەساتێکی هەستیارە لە مابەینی سەرکەوتن و کارەســات و شکستدا. لەگەڵ ڕاکێشانی دەمانچەکەی، کوێخا ڕەفیق پێشــبینیی ئەو جۆرە ڕووداوانەی کردووە، قایشی سەر شانەکەی لە قۆڵو باسکی خۆی گرێداوە.

ڕاکێشانی دەمانچەکەی لەلایەن هیدۆی، بوو بە یارمەتیدەر بۆ هەستانەوەی کوێخا ڕەفیقی، یەکسەر هەستایە سەرپێ، یەکەم قسەی گوتی: هەی سەگباب ئێوە کێن؟ دەمانچە لە بەینی هیدۆو کوێخای دەبێتە کێشــمەکێش، یەکتری دێنن‌و دەبەن، هەرجــارەی کاکەڕەش دەیەوێت یارمــەتیــی هیدۆ بدات، کوێخا چونکــە لەوی بەهەرەکەتتــرەو قەڵافەتــی گەورەترە، هیــدۆی وەک قەڵغانی پارێزگاری لە خۆی بەکاردێنی‌و دەیداتە پێش خۆی نەوەکو کاکەڕەش ناچاربێت بیکوژێ. مرخێش مرخێشــێکە بەریدە، بەری نــادەم، یەکتری دێنن‌و دەبەن. کاکەڕەش فیشــەکێکی لێدەخوڕێتە بەر دەمانچەی‌و ســواری دەکات، کوێخا هیــدۆی دەداتە بەرلوولــەی دەمانچەکــەی بۆئەوەی ئەگــەر تەقاندی هیدۆ بەربکەوێ. ئەوجارە کاکەڕەش لوولەی دەمانچەی لەسەر سەری کوێخا ڕەفیقی دادەنــێ: بەریدە ســەگباب ناچارم مەکە بتکوژم! ئەویــش دەڵێ بەزیندوویی بەری نــادەم، مەگەر بمکوژی ئەوجــا دەمانچەم لێبســتێنی! کوێخا هیدۆی دەســووڕێنی‌و پرزەی لێبڕیوە. لەو هێنان‌و بردنە، هیدۆ شل بووەو کوێخا زاڵە، ئەگەر دەمانچەکەی لە هیدۆی بســتێنێتەوە ڕەنگە هەردووکیان بکوژێت. ئەو بڕیــاری خۆی داوە، تاوەکو نەیکوژن دەمانچەکەیــان بەزیندوێتی ناداتێ. لەو بگرەو بەردەو کێشمەکێشــمە، ژن‌و منداڵ بەئاگا دێن کە لەخوارێ نووستبوون. دەیکەنە زاق‌و زریق‌و قیژەو تێدەگەن لەســەر کەپــرێ ململانێ‌و زۆرانبازییە. هیدۆ هاواری لێهەڵدەســتێ‌و شــل دەبێــت، دەڵێ: کوڕە بیکــوژە! کاکەڕەش دەمانچەی لەســەر ســەری کوێخای داناوە، دووبارە دەڵێ: ســەگباب بەریدە، دەتکوژم! وەلــێ، بێسوودە لەگەڵ کوێخای. لوولەی دەمانچەی کاکەڕەشی بە بناگوێی کوێخایەوە لەو چرکەساتە هەستیارە پڕ لەمەترسییە لەبەینی مەرگی

کوێخاو کاکـــەڕەشو هیدۆی، کاکەڕەش دەیەوێ دواهەوڵی خۆی بدات بۆئەوەی نەیکــوژێ، بەڵام کوێخا تێناگات. کاکەڕەش ســـوێندی لێدەخـــوا: کوڕە ئەتۆ بۆ هێنـــدە کەری؟ ناڵێم دەتکوژم؟ دە بگـــرە! پەلاپیتکەی دەمانچەی داگرتو شـــریقەی هات. کوێخا ســـەری خۆی ڕاوەشـــاندو دەســـتی لە دەمانچەی شل بـــوو، یەک بەخۆی هۆڕاندی، ژنو منداڵی قیژاندیان، دڵنیابوون لە کوشـــتنی کوێخـــای، وایان زانی ئـــەو گوللەیە کەللەی کوێخای ســـمی لە هیدۆی وا بوو کاکەڕەش کوێخای کوشت، کوێخا خۆی لە کەپرێ فڕێدا خوارێ بەنێو کەردووە تەماتاندا بە دەرپێی سپی خوتبەیەوە دەکەوتو هەڵدەستایەوە. هەر زوو لەنێو بامیان لە بەرچاوان ون بوو. کاکەڕەشو هیدۆش بەپەلە لە کەپرێ دابەزینو ئەو نێوەیان جێهێشت. هیدۆ گوتی کاکەڕەش دەستت خۆشبێ نەتکوشتبوایە حاڵ شڕ بوو! کاکەڕەش گوتی: خۆ نەمکوشت! هیدۆ سەری سوڕما!

کاکەڕەش ڕاســـتی گوت، چونکە بە مەعلانیو لێزانانە تەنیشتی لوولەی دەمانچەکـــەی بە بناگوێی کوێخایەوە نابوو، بۆئـــەوەی بیتۆقێنێو گوللەکەش بەســـەری نەکـــەوێ، نەبادا بیکوژێ. هیدۆ گوتی: بەڕاســـتی پێم ســـەیربوو، دەمگوت گوللەی بە کەللەی ســـەری کەوتووە، کەچی ڕادەکاو هەڵدەستێتەوەو دووبـــارە دەکەوێتەوە، بەڵام دوایی کە حەوایـــی دەمانچەیەکی دیکەت پێوەنا، هەر بەجارەکێ باڵی گرت!

دوای چەند ڕۆژێک لـــە گەڕانەوەیان بۆ ماڵێ، هەواڵیـــان بۆ هات گوللەی دەمانچەکە کرۆژەی گوێی گرتووەو کەلی کردووە. هیدۆ دەیگوت: کوێخا ئێستا پارەی زیاتر دەکات وەک چواردەخۆری بۆتە لاکەل!

لـــەدوای بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە بەنێو خەڵکدا، ئەو جووتیارانەی زۆریان

جەزرەبە بە دەستی کوێخاوە دیتبوو، پێیاندەگوت کوێخا گوێبڕاو. کرمانجە چەوساوەکان بە ژنو پیاویانەوە، ئەو هەواڵەیان ئەو ماڵ ئەو ماڵ پێدەکرد. ئەوەندە دڵخۆش بوون بێئەوەی بزانن ئەنجامدەرانی کاری ئەوشەوە کێن! هەزارجار خۆیان بە قوربان دەکردن. پیرەمێردی وا هەبوو پڕ بەدڵ دەیگوت: ئای لە بابی منتان کەوێ زەلامی شەوێ! ئەی بۆ دەڵێن پیاو نەماون! ئەمن هەمیشە دەڵێم ئەگەر فیل هەیە، کەرکەدەنیش هەیە!

کاکەڕەشو هیدۆ لەدوای گەڕانەوەیان بۆ ماڵێ، زۆر هیلاکو ماندوو بوون، شەو و ڕۆژێک هەر نووستن. بە ژانی پێیەکانیان خەبەریان بۆوە، پێیان ئاوسابوو و بلۆقی کردبوو، نەیاندەتوانی پێیان لە عەرزێ دابنێن، گۆدو کۆڵەوار بووبوون، هێندەی بە پیادە بڕۆن. هیدۆ گوتی: کاکەڕەش پێت ناخۆش نەبێت ئەمن چی دیکە ناتوانم بۆ ئەو شوێنە دوورانە بە پێیان بڕۆم، وا چاکە ماتۆڕێک بکڕین. کاکەڕەش پێی پەسەند بوو: ڕاستە، ئێمە بمانەوێ سنوورو ئاقاری گوندەکەمان تێبپەڕێنین، پێویستیمان بە ماتۆڕێکی زۆر باش هەیە، بۆئەوەی دەستمان بە شوێنە دوورەکانیش ڕابگات. شانسی خۆمان ئێرە دەشتاییە، تەنها چیای قەرەچوغی لێیە، ئەویش بۆ ئەوەی نابێ لێی یاخی بین، چونکە داروبارو جەنگەڵی لێ نییە، حکومەتو ئاغاکان هەر زوو دەماندۆزنەوە، ناچارین وەکو ئێستا کارەکانمان بەشەو ئەنجام بدەین. ڤیروسیا، ڕۆژ بۆ ئەوانو شەویش بۆ ئێمە بزانین دەگەینە کوێ لەگەڵیان!

لە کۆتایی، ماتۆڕێکی مەجلیسی[١] ڕەشیان کڕی. کاکەڕەش هەندێک

١. ماتۆڕی مەجلیس: مۆدیلێکی ماتۆڕسکیل بوو، شەستەکانی سەدەی بیست دەرکەوت، ناوەکەی مەجلیس بوو.

پارەی هەبوو، ئەو بڕەشی لەسەریان دەمایەوە، پاش ماوەیەک بیدەن. کاکەڕەش ماتۆڕەکەی لێدەخووڕیو هیدۆش لە دواوەی تفەنگی لە پێشـەخۆی دادەنا. لە پاسکیلو پیادەڕۆیی شـەوو نیوە شەوان ڕزگاریان بوو. هیدۆ ئەوەندە خۆشحاڵ بوو بەو ماتۆڕەی، بە کاکەڕەشـی گوت: کاکـە ئەوجا بێمنەتم، حەزدەکەی بڵێ سبەینێ دەچینە سـەر ماڵی متەسەڕیفی هەولێرێ! هێندمیان ماتۆڕی تایین هێنـاو برد، کاکەڕەش هەر زوو زۆر بەچاکـی فێری لێخوڕین بوو. چونکە ئەو، چەند ساڵ بوو پاسکیلی لێدەخوڕی. یەکەم سەفەریان بڕیاردا، کاکەڕەش گوتی: دەچین بۆ گوندەکانـی لای گوێڕی، بۆئەوەی لە ناو عارەبـان ئەو دەمانچەیەی لەمەڕ کوێخا ڕەفیقی بفرۆشین. لە پارەکەی، پارەی دوو عەربەگەنم و کورتەک و شـەروارەک و جەمەدانی و بەشـی ساڵێک شـەکر و دەرمانچا بدەینە مام کاکلـی، ئەوەی مایەوە بیدەینە هەقی ماتۆڕەکەی کە لە سـەرمان ماوە. هیدۆ زۆری پێخۆش بوو، مام کاکلی پۆشتەو پەرداخ بکەنەوەو قەرزەکەی بۆ بدەنەوە کە کوێخا تووشی کردبوو.

لە یەکەم گوندی عەرەبنشـین، دەمانچەکەی کوێخای دەفرۆشن. تاپڕێکـو دەمانچەیـەکـو بڕێـک فیشـەکیان پێدەمێنێ، بـۆ فرۆشـتن. کاکەڕەش دەمانچەیەکـی چواردەخۆری تایبـەت بە خۆی پێیەو هیـدۆش تفەنگێکی برنـۆی ڕەقەم حەڤدەی دارشووشـەی وەکـو گەرووی ماری ڕەشـی لەگەڵ دوو خەریتە فیشـەکی برنۆی پێیە. لەو کاتەی دەیانەوێ بچن بۆ گوندێکی دیکە، هەردووکیان لەسەرپشـتی ماتۆڕەکەیانن، لەنێو کۆڵانی گوندی بەهۆی دەنگی ماتۆڕەکەیـان ئاگایان لە مەحموودی بێزەواد نییە، تا ئۆتۆمبیلێکی پۆلیسـی گوێـڕی دەگاتە سـەریان. لوولەی ڕەشـاش برێنیان تێـدەکاتو هۆڕینیان بۆ

لێدەدات، بە ئاماژەی ڕاگرتنیان. کە کاکەڕەش‌و هیدۆ بەوە دەزانن لە پشتیانەوە گەمارۆدراون‌و بەخۆیان نەزانیوە. کاکەڕەش بە هیدۆی دەڵێ: خۆم لە ناحاڵیبوون دەدەم تا دەگەینە ئەو تەندوورەی لە پێشـــمانەوەیە، هەر ئەتۆ دەتوانی ســـەری من‌و ماتۆڕو چەکەکانمان بکڕییەوە، بتبینم‌و نەتناسم! هەر ئەوەندەو لە نزیک تەندوورەکە ڕایدەگرێ.

هیدۆ هەر لە بای غارێ خۆی هاویشتە پەنای ئەو تەندوورەی ژنە عارەبەکان سووریان کردۆتەوە بۆ ئەوەی کولێرەی پێوە بدەن، کاکەڕەش هێشتا لەسەرپشتی ماتۆڕەکەیـــەو ماتـــۆڕ کاردەکات‌و خامۆش نەکـــراوە، دەزانن تـــازە کار لە کار ترازاوەو کەوتوونەتە شـــوێن‌و کاتێکی هەڵەوە! معاونی پۆلیس لە پێشـــوەی ئۆتۆمبیلکەیـــان دادەبەزێ‌و بەر لە هەرشـــت ئەو تێرە بچووکەی سەرپشـــتی ماتۆڕەکە دەست دەداتێ کە دەمانچەیەک‌و تاپڕێک‌و بڕێک فیشەک‌و چەند کاغەزێکی مەمنووعـــی تێدایە. هیدۆ لەو کاتەی بینـــی معاون تێرکەکەی دایە دەســـتی پۆلیســـێک‌و بردیان بۆ نێو ئۆتۆمبیلەکە، زانی کات بە فیڕۆدان لە بەرژەوەندییاندا نییە، پێویســـتە دەســـت بەکاربێت، بۆیـــە کە معاون ڕووی وەرسووراندەوە، لای کاکەڕەشـــی بۆ ئەوەی بیپشکنێ، ئاخر لەو وەختانەدا تەنها ئازایەتی‌و غیرەتی بنیادەم فریای دەکەوێ، لەو ڕووەشەوە هیدۆ هەڵەو کەوتن‌و کات بەفیڕۆدانی لە مەزەبدا نییە! فیشەکی لێخوڕییە بەرتفەنگێ‌و، نیشانەی لـــە نێوچەوانـــی کڵاوی معاونی گرت، لە معاونی ڕاخوڕی: لە شـــوێنی خۆت ڕاوەســـتەو بزانە چیـــت پێدەڵێم، ئەگەر هەڵە بکەی، لەگەڵا یەکەم فیشـــەک کە دەیتەقێنم جامی ســـەرت هەڵدەگرم‌و مێشـــکت دەپرژێنم! معاون دەستی بە خۆیدا شـــۆڕکردەوە. هیدۆ بە دەنگێکی بوێرانەوە گوتی: ئەو تێرەی لەســـەر

ماتۆڕەکەی لە شوێنی خۆی دانێوە، بەو پۆلیسەش بڵێ لوولەی ڕەشاش برێنەکە بسووڕێنیو ئێمە بە ئامانج نەگرێ، وەکی پیاوان سواری ئۆتۆمبیلەکەت بەو لەو نێوەی نەتانبینمەوە، ئەگەر دەتەوێ بە زیندوویی بمێنییەوە هەرچی زووە چیت پێدەڵێم ئەوە بکە!

معاون هەر دەپاڕێتەوەو دەڵێ: ئێمە براین، ناکرێ یەکتری بکوژین! هیدۆ دەڵێ: ئەوە لوولەو سێرەی تفەنگێیە بۆتە شیربرا، دەنا ئێوە بە بنئامۆزاش ئێمەتان قەبووڵ نییە، چجای برا!

معاون کە دەزانێ ناتوانێ لە خشتەیان بباتو کاکەڕەشیش چۆتە تەنیشت هیدۆیو کارتێکی بۆ فشار خستنەسەری نەماوە، هەموو ئەوانەی هیدۆ پێیگوتن، جێبەجێیان کردو سواری ئۆتۆمبیلەکەیان بوونو هەر بەهەڵاتن، هەڵاتن!

لەو کاتە هەستیارەدا ژنە عارەبە خەزێمو عەڕانە[1] لە کەپووەکان، دەستیان بە هەلهەلەلێدانێ کرد، بۆ ئەو ئازایەتییە. هیدۆ هێندەی دیکە غیرەت سواری سەری بوو، دوو تفەنگی بووکانی، بەسەر معاونیدا تەقاند، ئەوەش لە کن پیاوی تفەنگدار، بە واتای بە بووک بردن بوو!

عارەبی گوندیان لێ گردبوونەوە، لبادی لاکێشیان ڕاخستو سوێندیان خوارد هەتاوەکو قاوەی عارەبی نەخۆنەوە، ناهێڵن بڕۆن، کاوڕێکیان هێنا بۆئەوەی بۆیان سەرببڕن لە پاداشتی ئەو ئازایەتییەی کە ئەو گوندەی سەرسام کرد. کاتێک کاکەڕەش بینی لە ڕێگای گوێڕێ تۆزی چەند ئۆتۆمبیلێک دیارە، زانی ئەوانە پۆلیسنو معاون هێناونی بۆ سەر ئەوان، بە سرتە لە بناگوێی هیدۆی دەڵێ:

١. عەڕانە: وەک تاکگوارەیەکی بە پرپرە وابوو، ژنی عەرەب لەو گۆشتەی بەینی هەردوو کونەلووتی دەخست.

بڕوانە ئەوانە بۆ گرتنی ئێمە دێن. بەو شێوەیە خۆیان شلوێ ناکەنو ماڵئاوایی لـــە عارەبەکان دەکەنو دەڕۆن. هەر زوو لە گونـــدی وەدەرکەوتن، ماتۆڕ وەک با ڕێدەکا، تەنها نەرمەتۆزێک بەســـەر خڕنووک و پەرژەگەنمەکاندا جێدەهێڵێ. کاتێک بەتەنیشت گوڵەبەڕۆژەکاندا تێدەپەڕین، هەروەکو با، خۆیان لە برژانگی گوڵەبەڕۆژەکان دەسووی، ئەو باڵندانەی قەراغ ڕێگا لە ناکاو هەڵدەفرین، بەحاڵ دەیانتوانی خۆیان لەبەر تەوژمی تیژڕۆیی ماتۆڕەکە دەربازبکەن!

کاکەڕەش پێشنیاری کرد بەرلەوەی بچنەوە ماڵی خۆیان، بچنە لای مام کاکلی، تازە بوونەتە خاوەنی ماتۆڕو، تەیری بێباڵن، هەر کوێیان بوێ بەئاسانی دەیگەنێ. ئـــەو ماتۆڕە هێنـــدە بۆیان گرنگ بوو، هەمـــوو ژیانی ئەوانی گـــۆڕی. دەچن بۆ هەرگوندێک خەڵک لە دەوری ماتۆڕەکە کۆدەبنەوەو بە تیژڕەوییەکەی سەرسامن.

لـــە ڕێگا ماتۆڕەکەی لە کەندێک ڕاگرت، نـــزە ئاوێکی پێدادەهات. کاکەڕەش هەردوو دەســـتی دایە بەرخۆی لەسەر زگ ڕاکشـــاو دەمی بە ئاوەکەوە نا تا تێری خواردەوەو هەناســـەی هاتەوەبەر. هەردوو لەپی دەســـتی شوێنەواری لەسەر ئەو لمە بەجێهێشت کە نزە ئاوەکە هێناویەتی، گوتی: هیدۆ بخۆوە، ئاوێکی شیرینە.

لە ئاســـمانی پڕ لـــە فرین و ڕەنگاڵەیـــی دەڕوانی. لە ســـیماو چاوەکانیدا ناڕەحەتییەک دەهاتو دەچوو، ترسێک ئارامی لێهەڵگرتبوو، بیرکردنەوەیشی پەرت کردبـــوو. هێدۆش هەســـتی پێکردبوو. بۆیە بەرلـــەوەی هیدۆ هۆکاری نیگەرانییەکـــەی لێبپرســـێ گوتـــی: دەزانی لـــەو چەنـــد ڕۆژەی منداڵمان پەیدادەبێـــتو دەبم بە بـــاوک! ئەو بیرکردنەوانە داگیـــری کردبوو، بەوەی چۆن دەبێت هاوسەرم منداڵی ببێتو ئەمن لە ماڵێ نەبم!

دوایـــی، هەر بەخۆی دڵی خۆی دەدایـــەوە: دەی، خۆ پیاو لە دیار ژنان نابن

لــەو کاتەی منداڵیان دەبێت، ئەوە نییە دایکــم بە دیارییەوەیەو هەر بۆ خۆی مامانیو ناوکیشی دەبڕێ!

زەردەپەڕەو گەیشــتوونەتەوە ئاوایی، مریشــک لە کولانان خزاونو دەرگای کولانەکانیان دادەخرێـــن، گاڕان بەنێو گوندی وەربووە، هەریەکەو بە کۆڵانێکدا بەپەلــە بەدەم بۆڕینــەوە ڕێ دەکەن، گۆلکەکان بە قۆڕەیــەک دایکیان حاڵی دەکەن کە لێرەن. ماتۆڕ گەیشــتە بەردەرگای ماڵــی مام کاکلی، یەکەمجار بە دەنگــی گرەی ماتۆڕەکە گوێ قولاغ بوون، دوایی کە زانییان کاکەڕەشو هیدۆن، بەجارەکێ گەشــانەوە. مام کاکل ئەوەندە خۆشــحاڵە، کەس ناتوانێ گوزارشت لەو خۆشــییەی بکات. ئەگەر کوڕە جوانەمەرگەکەیشــی زیندووبوایەوە، هەر ئەوەنــدە دڵخۆش دەبوو! ماتۆڕەکەی بێننە ئەو ژوورەی کۆترەکان! باوەشــی بۆ گرتنەوەو هەردووکی مــاچ کردن. بە چاوی بــاوکــو کوڕایەتی لێی دەڕوانین. هەســتەکانی بەرامبەریان زۆر وەپشت خۆشەویستی کەوتبوو. شەوێ، کەسە نزیکـو خزمەکانی مام کاکلی هاتن بۆ لای ئەو دوو میوانەی.

ئەوشەوە بە قســەی خۆشو گێڕانەوەی بیرەوەرییەکان، شەویان درەنگ کرد، کاتی نوســتنێ بوو، هەمووان بڵاوەیان لێکــرد . ژنو منداڵی مام کاکلی، دوای ئــەوەی جێگای خەوتنیان بۆ میوانەکان هێنا، چوون لە جێگای خۆیان خەوتن. مام کاکل لەخۆشــی میوانەکان خەو لە چاوانی تۆرابوو، لێی دەڕوانین و چاوی لەسەر نەدەگواستنەوە. بەجۆرێک لە چاوە پڵینگیەکانی کاکەڕەشی ورد دەبۆوە، وەک بەدوای ئەو شتەدا بگەڕێ کە دەمێکە لێی ون بووە!

بەرلــەوەی بخــەون، کاکەڕەش بــڕە پارەیەکی لەپێش مام کاکلــی دانا: ها ئەوە قەرزەکەت! غرورو عیزەتــی هەژارانەی مام کاکلی، ڕێی پێنەدا پارەکەی

هەڵگرێت. کاکەڕەش‌و هیدۆ سوێندیان خوارد ئەگەر ئەو پارەیە هەڵنەگرێ، جارێکی دیکە چاویان پێی ناکەوێتەوەو لە ماڵی خۆی نایانبینێتەوە. گوتیان: ئەوە پارەی ئێمە نییە، وا دابنێ چەتەیەک ڕووتی کردووی، ئێمەش توانیومانە بۆت وەربگرینەوە! کاکەڕەش گوتی: ئەگەر بێدادی‌و زوڵم نەبوایە، ئەوەندە چێژمان لە تۆڵەکردنەوە نەدەبینی، ئەگەر برسیکردن نەبوایە، نانمان نەدەپەرست. ئێمە بۆ خەونەکانمان دەژین‌و، بۆ وەدیهێنانیان ئامادەین لەو ڕێگایەدا بمرین! دەی، شەومان درەنگ کرد، با بنووین، وەک بشزانم بەیانی دەچن بۆ تازیەی ئەو گوندەی ئاشەکەی لێیە.



# ٢٨

ئەو گوندەی ئاشــەکەی لێیە هەر نیو ســەعاتەڕێ دوورە، خەڵکی زۆربەی گوندەکانی ئەو دەوروبەرە بۆ باراشهاڕین ڕوو لەوێ دەکەن. هەندێک لە گەنجانی ئاوایی تەگبیریان کردووە بەیانی بەرلەوەی تاو هەڵبێت، باراشەکانیان باربکەنو بــەڕێ بکەون. یەک لە باراشــهاڕەکان محەمەدی مامۆســتایە. تەمەنی نۆ ساڵان بوو کە دایکی بە گرانەتای مرد. تەمەنی دوازدە ساڵان بووە کە ناونووس هاتۆتــە گوندی. مەلای باوکی، بۆ ئەوەی محەمەد درەنگ بچێتە ســەربازی، بە شــەش ساڵانەی ناونووس کردبوو، شەش ســاڵ بچووکتر لە تەمەنی خۆی. ئێستا تەمەنی بیستو چوار ساڵەو هەڕەتی گەنجییەتی. هێشتا تامی تلدانو گەوزینو دەســتلەملانێی لەگەڵ کچان نەچەشتووە. لەبەر دوو شت زرڕدایکی نایەڵێ مەلای باوکی، ژنی بۆ بێنێ، یەک: هەر لە نۆ ساڵییەوە هەموو ئیشێکی ماڵێ و دەرێی پێــدەکا. دوو: حەزناکات وەک شــەریکەمیراتی منداڵەکانی خۆی بیبینێو هەوڵی دەدا بەلایەکدا بیرەتێنێ بەرلەوەی ژنی بۆ بێنن و منداڵ بخاتەوە. کەسی هاوتەمەنی محەمەدی لە گوندی نەمابوو ژنی نەهێنابێ!

بەیانی لە خەو هەستا، هەســتی بە وزەو حەزێکی زۆر کرد وەک گڕکان لە ناخی نێرانەیدا بڵقی دەدا. جۆشــێکی زۆری ئارەزووی سێکسکردنی هەبوو، بۆ

تێرکردنی ئەو حەزەش مێیینەیەک شک نابات، گڕی دەروونی دابمرکێنێتەوە. هەموو هەستو نەستی لە هەوڵی تێرکردنی ئەو حەزەیدا چڕ بووبۆوە. بە هاوکاری یەکتری باراشەکانیان لە هێسترو بارگینو کەرەکان بارکرد. ئەوەی ئەوان دەیکەن ململانێیە لەگەڵ ژیان بۆ بەردەوامیو مانەوە، ئەگەر ئەو ململانێیە نەبوایە ژیان ئەو چێژەی ئێستای نەدەبوو، ئەگەر برسێتی نەبوایە، تێری، هیچ چێژێکی نەبوو. ژیانیش بەبەهاترینە، بۆیە پارێزگاری لێدەکەن. هەرگیز ئاشیان ئاوا بە چۆڵی نەبینیوە. ئاشەوانەکە وەکو ڕێزێک بۆ مەلای، گوتی: یەکەم کەس باراشی ماڵی مامۆستای بێنن. باراشەکان سێ جۆر بوون، هەر جۆرەی پەیوەندی بە باری ئابووریی خاوەن باراشەوە هەبوو. جۆری یەکەم: ئەوانەی دەوڵەمەندبوونو باری گوزەرانیان باش بوو، باراشەکانیان ساف گەنم بوو، نانی سپییان دەخوارد، ئەوەش لە توانای هەموو کەسدا نەبوو.

جۆری دووەم: مزاش، گەنمو جۆ بە تێکەڵاوی، ئەوانە چینی نێوەڕاست بوون. جۆری سێیەم: نانی جۆ، هەژارەکان باراشیان جۆی ساف بوو، چونکە هەرزانترین بوو. هەموو جۆری باراشەکان بە پێوان لەسەر دۆرەدانی[1] ئاشی دەکرا. بۆ هەر بەرمیلێکی بچووک قۆدییەک مزەی[2] لێ دەدرایە ئاشەوانەکە. محەمەدی مامۆستای هەر زوو باراشی خۆی لەسەر دۆرەدانەو قەرۆمەی[3] ئاشی کرد و جەواڵەئاردی گەرمی ڕاکێشا. هەندی بڵێی یەکو

---

١. دۆرەدان: دۆڵەدانە، حەوزێکی دارینە، لە سەرەوەی بەرداشی ئاش بەستراوە، گەنم و جۆی باراشی تێدەکرێ بۆ هاڕین.

٢. مزە: هەقدەست، دەستمست.

٣. قەرۆمە: کونی ژێرەوەی دۆرەدانی ئاشە، کە دانەوێڵەکەی پێدا دێتە خوارێ بۆ نێو بەرداشی ئاش.

دوو باراشی خۆی بارکردو حەچەی لە کەرێ کردو بەڕێ کەوت.

هەموو باراشـــهارەکانی هاوڕێی واقیـــان وڕمابوو، بەسەرسـوووڕمانەوە لە یەکترییان دەپرســی: ئەرێ محەمەدی مامۆســتای دەبـێ چ کارێکی خێری بەدەســـتەوە بێت، ئەو پەلەپەلو هەلەهەلەی بۆ گەڕانەوە لە چیە؟! بۆ ویستی بە تاقی تەنها بگەڕێتەوە؟ ئەوانەو زۆر پرسیاری دیکەش.

لە گوندیش، پیاوە بەتەمەنەکانو مـــەلای گوندی، دەیانەوێ بچنە تازیەی مردوویەکی گوندی ئاشـــەکەی. محەمەد گەیشـــتە نیوەی ڕێگا. لە مابەینی هەردوو گوندان کەندێکی قووڵ هیچ کەســـی تێڕا دیارنییە، لای وابوو باشترین شـــوێنە بـــۆ خۆخاڵیکردنەوە لـــە ماکەرەکـــەی، بەردێکی پانی ســـەرتەخت، بەرزاییەکەی ســـێ بســـتو قولانجێک دەبوو. کەرەکە باری هێنـــدە گرانە خوا خوایەتی پشوو بدات، گوێی لە هەر وشەیەک بێت پیتی (ش)ی تێدابێت، بە (هۆشششششـــش!)ی تێدەگا، لە هەنجەتەو ڕادەوەستێ، محەمەدیش ئەوەی دەوێ. کەرەکە تەس دەکاتەوە لای بەردەکەو بۆ خۆی دەچێتە سەر بەردەکەو مل لەبەر کەرگانێ دەنێ.

هەموو جەستەی، وزەو جۆشی سێکسکردنی تێگەڕاوە، بێئاگا لەوەی مەلای باوکی لەگەڵ چەند ڕیشســـپیی گوندی دەچن بۆ گوندی ئاشەکە. سەر دەکەونە سەر ئاسۆگەی، چ ببینن؟ محەمەد بەهۆی نرکەو ناڵەی شەهوەتبازانەی، ئاگای لە دنیایە نەماوە. هێندەی لـێ نزیک بوونەتەوە، هیچ گومانێک هەڵناگرێ.

مامۆستا دەڵێ: ئەرێ ئەوە محەمەدی کوڕم نییە ئەو کەرەی بەو بارەئاردەوە وا بە بێئینسافی دەگێ؟! خۆ دەڵێی ماڵی کافری داوەتە بەرێ! تف تف! غەریقی لەعنەتێ خوای بی! جا وەرە ئەو ئاردەی بکە نانو نوێژو ڕۆژووت بەبەربکەوێ!

محەمەد هەستیکرد کەسانێک لێی نزیک بوونەتەوە. دەستی چەپی لەسەر عەورەتی خۆی داناو بە دەستی ڕاستی شــەروارەکەی هەڵکێشاوە. دەمارەکانی گرژبوون، گڕو گەرمای هیچ هەوەســێک خاویان ناکاتەوە. بە ســەرو سیمایەکی پەشــۆکاو و خەم لێنیشــتوو لە بەرامبەر جنێوەکانی باوکیدا سەری کزکرد. لە خوا دەپاڕایەوە هەر ئەوشــەوە عیزرائیل ڕوحی بکێشــێو لەو شەرمەزارییەی ڕزگاربکات. لە ماڵەوەش، ئەو قەڵا ســەختەی نەمابوو کــە پێیدەڵێن دایک، پارێزگاری لێبکاتو باڵی بەزەیی بە ســەردا بکێشــێو هەڵەکانی بۆ داپۆشێ. هەموو ئەو ڕۆژانــەی لە یارمەتیدانی خەڵکو هەرەوەزو کەســێکی بەکەڵک لــەو گوندەی، بە کەرگانێک وێرانی کرد! هەزارجار نەفرەتی لەو حەیاو حورمەتە دەکرد کە بە کەرگانێک بشــکێو بەسەریەکدا بڕمێ. ئەوەی لەنێوانی کەسێک کە فریشــتەیەو کەســێکی دیکەی ئەهریمەن، تەنها ئاشکرابوونی کردەیەکی ناباوە. ئەوشــەوە، لە بنەبانی کادینێ چاوەکانی کوسکەکوسکیان بوو، ئومێدی ژیان لەو گوندەی، بۆ ئــەوی تێدانەبوو. تاریف ناکرێ چ حەژمەتێک لە ناخەوە هەڵیدەقرچانــد، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: خۆ زۆربەی خەڵکی ئاوایی بە گەنجی، نەک هەر کەر، هێستریشیان گاوەو هەر خۆیشیان وەکو شانازییەک دەیگێڕنەوە. ئەی خێرە تەنها بە من دەڵێن بێنامووس؟! هەموو نێرینەکان کەسێک دەگێن، مێینەکانیش دەگایرێن، کەچی تەنها بەوەی لێی ئاشکرادەبێت هەمووان دەڵێن بێناموسە. لەوڕۆژە بەدواوە، ئەو بەردەی محەمەد کەرەکەی لە پەنای گا، ناویان لێنا (بەردی کەرگانێ). دوای ئەو ناولێنان و سوکایەتییە، بەردەکە شەوان دەهاتە خەونی زۆربەی خەڵکی ئاوایی، بە یەک شێوەو هەمان گلەیی.

بەردەکە پێی وابوو لەوەی ئەو ناوەیان بەســەردا سەپاندووە، زوڵمی لێکراوە.

پێی وابوو ئەوە شـــکاندنی شکۆی بەردبوونیەتی. بۆیە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ئەوەی دەرهەق بە من دەکرێ سەپاندنەو زۆرەملێیە، کەی ڕەوایە لە جیاتی من بڕیاربدەن چ ناوێکم لێبنێن! ئاخر نەبووەو نەکراوە بەردێکی زرتو زەلامی وەکو من بێئەوەی پرســم پێبکــەن، هەر لەخۆوە بە کەیفی خۆیــان ناوێکم لێبنێن، ئەویش چ ناوێک؟! بەردی کەرگانێ! لە دەســتیان دێت بێئەوەی پرسم پێبکەن ئاینێکیشــم بۆ دانێن! مرۆڤەکان هــەر بەوەندەش نەوەســتاون، جیاوازیان لە نێوان بەردەکانیشــدا کردووە، هەر گردۆلکەیەکی گەیشــتنێ بێئەوەی تەرمی پیاوچاکێکی تێدانێژرابێ، کۆمەڵەبەردێکیان لــێ کۆکردەوەو بە پیرۆزیان کردن! داوایان لێدەکەن مرازیان حاسڵ بکەن. ئەوە لە کوێی یەکسانیدا جێگای هەیە، ئــەو بەردانەی لە چــاکـو مەرقەدەکاندان بە پیرۆز بکرێنو بەبێ دەســتنوێژ هیچکەس بۆی نەبێت دەستیان بۆ ببات! لەبەرچاوی هەمووتان دیارە ئەو بەردانە لەلایەن زیارەتکارانەوە هێندە ماچکراونو لەسەرو سیماو چاوانیان خشاندوون، وەکو هەســانی، لووس لووس بوون، مەگەر ئەوانیــش هەروەکو من بەردنین؟ یان لە هەسارەیەکی دیکەڕا هاتوون؟! ئەوە ئەوپەڕی ناعەدالەتیی مرۆڤەکانە، ئەوانیان بە پیرۆزکردووەو ئێمەش بەنەفــرەت لێکراو! ئەوانە چ مەخلوقێکن، بەردی خۆیان ئاوا سووکـو ڕیسوا دەکەن و بەردی خەڵکی دیکەیش ماچدەکەن!

ئەی خەڵکینە، دەست لەسەر ویژدانتان دانێن، ئەمن چیم لە بەردی مرازان کەمترە؟ ســەری خۆم بــۆ کوێ هەڵگرم؟ نا نا ناڕۆم، ئاخــر ئەمن مێژوویێکی کەونارای ئــەو دەڤەرەم، ئەوانەی بڕیارە بڕۆن، ئەوانەن کە ڕیشــاڵی مێژوویان لەسەر ئەم خاکەدا نییە. ناوی چیای مامرەشانو بلباسانیان کردبووە قەرەچووغ. هەرچی دەکەوتە ســەرڕێیان قەرەیەکیان بە قونێوە دەنا. قەرە وەکو دڵی خۆیان،

قــەرە وەکو ئاڵاکەیان، ڕەش ڕەش وەکو ڕەشــیی ناخو مۆخیــان. ئەوان دوژمنی باوەکوشتەی کوردانن، هاتوون ئێمە بسڕنەوەو ڕێڕەوی ئاومان بگۆڕن. زۆرجاران لەبن سەری من عاشــقو مەعشــوقەکان جووت بوون. زۆر چاکم لەبیرە، لەو ســاڵانەی دوایی بوو، نێرو مێیەک هاتن لە پەنای مــن، ئا لێرە، جووت بوون، دەمیان بــە کانیی لەززەتی یەکترییەوە نا، کاتێک مێیەکە هەســتایەوە خۆی داتەکاند، لەســەر عەینی پشتم دانیشــت، دوو پڵەی تەڕی لەسەر قۆرنجی گیرکردم، باوەڕبکەن ئێســتاکەش قۆرنجم تەڕەو بۆنی شــەهوەتی عیشقێکی یەکجار شــێتانەی گرتووە! ئێ خۆ دەکرا لەو ڕۆژەوە ناوم لێبنێن بەردی عاشقان! ئەی بۆ باســی ئەو شەڕانە ناکەن کە لە پەنای مندا کراونو پیاوی ڕەند و بەوەج منی بەردیان دەکردە سەنگەر، خۆیان لە پەنامدا دەپاراست! خۆ دەکرا ناوم بنێن بەردە قەلغان، بەردی ســەنگەران، خۆ ئەمن لە ســەرەتای بوونمەوە دەموچاوم ئەوها کونجر کونجر نەبوو، من خوریکەم نەگرتووە، ئەو چاڵە وردو بچووکانەی سەر ڕووخســارم، جێی هەزاران گوللەیە، دەیانکردم بە نیشانە، جۆرەها گوللەم پێوەیە: گوللەی ســێتیر، گوللەی جامبێزار، گوللەی ماهوزەڕ، گوللەی قۆنداغ بەگرێ، گوللەی مانێر، گوللەی حوســلە، گوللەی کەنەدی، گوللەی ئینگلیزی، کوڕە لە دەمانچەو تاپڕان هەر گەڕێ! ئێ خۆ دەکرا ناوم بنێن بەردەنیشــان! ناو بڕا لە عەرزو ئاسمانێ، تەنها ناوی کەرگانێ! پەکووف کە نەزان و بێویژدانن!

شــەماڵ بە گوێیدا چرپانــدم خەم دامنەگــرێ، نەوەیەکی جیــاوازو نوێ بەڕێوەیە، نە دەترســێو نە دەپرسێ، دەســتم دەگرنو دەمبەنەوە ڕیزی هەموو بەردە پیرۆزەکان، دەبم بە بەردی بناغەی تەلاری بەرزی نیشتیمان.

محەمــەدی مامۆســتای گوندیش، بەرگــەی ئەو شــەرمەزارییە ناگرێ،

هەرچەند دەکات لە دیواری بیرو زەینی نابێتەوە. تیرو توانجی زڕدایکیش لەوێ ڕاوەستێ. بەڵام لەپڕ، دەرگایێکی دیکەی بۆ ژیان لێکرایەوە، ئەویش ئەوەبوو لەو کاغەزەی بە هەویر لە دیواری مزگەوتێ درابوو، ناوی ئەویشی بۆ سەربازی تێدابوو. ئاخر لەو کاتەدا ژیانی دۆزەخیشی پێ لەو گوندەی خۆشتر بوو، ژیانیش لەو کادێنەیدا دوور لە خەڵک ناچێتە سەر! لە خۆشییان شاگەشکە بوو، بارانی ڕەحمەت داباریبە سەر مەزرای ئومێدیو دەرووی خێرانی لێکرایەوە.

سێ ڕۆژی ماوە بۆ ڕۆژی پەیوەندیکردنی بە سەربازییەوە. محەمەد هەر ڕۆژی دوایی بەرلەوەی خەڵک بیبینن، هێشتا دنیا هەر تاریک بوو، هەیپێی لێکرد بۆ جادەی قیر، هەولێر خۆت بگرەو هاتم! بۆ ماڵی پوری (خوشی دایکی)، کە دەمێکە چوونەتە شاری. بەو هیوایەی ئەوان دەنگۆی ئەو کەرگانەیان نەبیستبێتن! لە ماڵی پووری وە ژوورکەوت، پووری ئامێزی بۆ گرتەوەو لە باوەشی گرت. لەوەتای دایکی مردووە، کەسێک ئاوا ئامێزی بۆ نەگرتۆتەوەو لە باوەشی نەگرتووە. منداڵێکی چڵمنی ماڵی پووری تەمەنی هەر دووساڵ دەبوو، چووبووە سەرشانی باوکیو داوای لێدەکرد باوکی بۆی بچەمێتەوە بۆ ئەوەی بچێتە سەرپشتی: بابە بابە حەچە کەرە! محەمەد هەر لەخۆیەوە قوشقی بوو، کێچی کەوتە کەولی، ئەتۆ بڵێی بەو کەرگانەیان زانیبێتو بەرلەوەی ئەمن بێم باسیان کردبێت! خۆشییەکەی زۆری نەخایاند بە گومانەوە لە هەمووانی دەڕوانی. ئەو حەچە کەرەیە بۆی بوو بە گرێکوێرەو لەسەردڵی بوو بەگرێ. زۆربەی ئەوانەی لە ماڵەوە زڕدایکیان هەبوو، زۆر دەرەتێندرانو جەستەیەکی شەکەتو ماندوویان هەبوو، لەسەر ئەو حاڵەش پڕ بە زگی خۆیان تێریان نەدەخوارد. کاتێک دەچوونە سەربازی، لەوێندەر زگیان تێردەکرد.

سەرەڕای خزمەتی زۆرەملێی سەربازی، خۆبەخشانە مۆریان دەکرد سەربازی بکەن بە پیشە. ئەو دەرفەتەش بۆ محەمەدی دوو شەش بوو، مۆری کرد لە سەربازی بمێنێتەوە، خۆ هەر نەبێت لێرە تێرەو کەس شتێک لە ڕابردووی ژیانی گوندی نازانێ، بە تایبەتی شەرمەزارییەکەی. تازە ئەو گوندە چێژی ژیانی بۆ محەمەدی تێدا نەمابوو، بە ئازارێکی شەرمەزارییانەوە کۆتایی هات. لە لایەک ئاسانیش نەبوو، چونکە هەموو تەمەنی منداڵیو گەنجی لەو گوندە بەسەربردبوو، دابڕانی لە گوندەکەی، گیانی ئازار دەداو فەرامۆش نەکردە نییە. ئەگەر ئەو کەرگانە نەبوایە، ئاخر ئەو و سەربازی کوجا مەرحەبا!

دوای دەرچوونی لە گوندەکەیان، بەردەوام بیرەوەرییەکانی لەو گوندەدا بیردێتەوە، کە بە منداڵی یاری لێکردووەو بە گەنجی تێیدا ژیاوە. هەرگیز ئەوەی لە یاد ناچێت کە لەو گوندەدا بەسەری هات. ئاخر ئەو ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی لە کوڕێکی گوندی ببێتە دەرەجەدارێکی سەربازی. هەرچەندە تا ڕادەیەک ژیانی سەربازگە بۆ محەمەد نامۆ بوو، بەڵام کاتێک چەرمەسەریو جەزرەبەدانی خۆی لە لایەن زڕدایکییەوە وەبیردەهاتەوە، هەوڵی دەدا لەگەڵ ئەو ژیانە تازەیە خۆی ڕابێنێ. وەبیری دەهاتەوە ئەو شەوانەی خەونی بە کچێک یان ژنێکەوە دەبینیو نێو پستێری شەروارەکەی تەڕدەکرد، ناچار بەیانی کە لە خەو هەڵدەستا، مەسینە مسەکەی باوکی، ئەو مەسینەیەی لە حەجێ بە دیاری بۆیان هێنابوو، پڕ ئاو بکاتو لەبەر ئاگردانی دابنێت، بۆئەوەی شیرتێن بێت، لە سەرشۆرکێ غوسڵی پێ لەخۆی دەربکات. لە هەمووی ناخۆشترو شەرمەزاریانەتر، ئەوەبوو کاتێک ژنانی ئاوایی بەقونەبانی سەرشۆرکێدا ڕەت دەبوون، دەیانبینی لە کونی ئەو لوولە تەنەکەیەی لە سەرشۆرکێ گیراوەو

چۆتـــەوە دیوی کۆڵانێ، بەو بەیانییـــە زووە ئاو ڕژاوە، هەناســـەیەکی ئیرەییان هەڵدەکێشـــا. ژنان لە یەکتری زۆر بە چاون، بۆئەوەی بزانن سەرشـــۆرکی ماڵی کامەیان لە هەموو سەرشـــۆرکەکانی ئاوایی زیاتر تەڕو زوو زوو تەڕدەکرێتەوە! بۆیە بە مەلاژنێیان دەگوت: لەخۆت خەنی، بەلاش نییە هەر وریتەت دێو هەر جوان دەبی، بەختو یەغبارت باشـــە بووی بە مەلاژن، لاڵ بم مێردەکانی ئێمە هێندە مانـــدوون هەر لە مەلابانگدانێ هەتا ڕۆژ لە هەموو شـــاران ئاوادەبێو تاریک دادێ، هەر غاردەدەنو پێڕاناگەن، لە تاریکی بۆ تاریکی هەر خەریکی کوێرەوەرین. بۆیە ئێواران هەر نـــانو چایان لە قورگی ئاوابوو پەلەواژ دەبنەوەو خرپە خەویان لێدەکەوێت. هەر بۆیەشـــە سەرشۆرکی ئێمە هیشکو برینگە! مامۆســـتا چونکە ئارەقەی ناکاتو ناچێتە بەر ئەو سوورەتاوەی ئیشێ بکات، لەبەر سێبەری حەساوەیە، دەبینی شەویێری ناکاتو سەرشۆرکی هەر تەڕەو ئەو کۆڵانـــەی کردۆتە زەنەکاو! مەلاژن بەو قســـانە یەکجاری برینی دەکولایەوە: بە خوای مەلاش لەبەر متالای کتێبان هۆشـــی ئێمەی نییە، ئای پێشینان بەلاش نییە گوتوویانە: نەکردیو نەخواردی لە سمێڵان مەیی! بە مەرقەدی حەزرەتی غەوس ئەو ئاوەی لە سەرشـــۆرکێ ڕژاوە، نـــە ئی منەو نە ئی مەلایە، ئەوە ئی محەمەدییە، شـــەو نییە خەونی حەرام نەبینێو ســـبەینێکەی غوســـڵی لە خۆی دەرنەکات. بەو حاڵەی، هەموو خەڵکی گوندی پێیانزانی کە محەمەدی مامۆستای هەموو شەوێ شەیتانی پێ پێدەکەنێ!

ئێســـتا هەر نەبێ لە سەربازگە ئاو لەبرانەو کەسیش پێی ناڵێ خەونەکانت حەرامن!

بەردەوام لە هەوڵی بەرەوپێشـــبردنی توانا ســـەربازییەکانیدا بوو، چونکە

سەربازی، تازە بوو بە پیشەی هەمیشەیی بۆی. بەهۆی لێهاتوویی و ڕاپەڕاندنی ئەرکە سەربازییەکانی، دوای دوو ساڵ خزمەت، خەتێکیان داییێ بوو بە (جوندی ئەوەل). کەوتە بیرکردنەوە لە هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی و خزم و کەسوکاری گوندی، ئەو یادەوەریانە ڕۆژ بە ڕۆژ ئۆقرەیان لێدەبڕی، لەتوانایدا نەمابوو چیدی بەرگەی دوورییان بگرێ، بۆیە بڕیاریدا مۆڵەتێک وەربگرێ بۆئەوەی سەردانێکی گوندی و کەسوکاری بکات. بە ئومێدی ئەوەی پاش ئەو ساڵانە، ئەو شەرمەزارییەی ڕێگای ئاشیان بیرچوویێتەوە، یان هەر نەبێ بەهۆی ئەو خەتەی وەریگرتووە، چاوپۆشی لێبکەن و ئەو مەسەلەیە بیرخۆیان بەرنەوە. بەڵام هەرکە پێی خستە گوندی و خەڵکی ئاوایی بینییان، بە گوێی خۆی گوێی لێبوو، خەڵکی ئاوایی هەر لە منداڵ و ژن و گەورەو بچووک، یەک هەواڵی بەوەی دیکە ڕادەگەیاند کە محەمەد کەرگێ هاتەوە! بۆیە، لە دوو ڕۆژ زیاتر نەیتوانی بەرگە بگرێت و لە گوندی بمێنێتەوە. هەرچەندە هێشتا مۆڵەتەکەی لە سەرەتایدا بوو، ڕۆژانێکی زۆری مابوو، گوتی: مۆڵەتم تەواو بوو! گەڕایەوە بۆ سەربازگە.

ئەو ناوەی لە یەخەی هەر نەبۆوە، وەکو قیرو بنێشت بە بەرۆکییەوە نووسابوو. هەتاکو بوو بە (نائیب زابت)یش، ئەو ناوە قەرە بە قەرەی دەڕۆیشت، ئینجا پێیاندەگوت نایب زابت محەمەدی کەرگێ. لە کۆتاییدا، ڕۆژگار لەگەڵ ئەو ناوە ڕایهێنا!



# ٢٩

دایکی بانگی کوڕە بیستو سێ ساڵانەکەی کرد: عومەر کوڕی خۆم بەڵاگێڕت بم بەئازایی قوڕی دوو سێ ڕیز دیوار بگرەوە، تاکو بابت لە شاری دەگەڕێتەوە دەبێ قوڕەکە ئامادەبێت، ئاخر بابت نایەوێت ئیشێکی بە قوربانی ئیشێکی بکات، دەیەوێت هەررۆژەی چەند ڕیزێکی دابنێت و، ئیشی سەرەکی ڕۆژانەی خۆی پەک نەخاو پیکابەکەی ڕانەگرێت!

ڕاستی دەکرد، زۆربەی بژێوی ژیانیان لەسەرپشتی ئەو پیکابەیە، بۆیە دەیەوێت هەردوو کارەکە پێکەوە ئەنجام بداتو کات بەفیڕۆ نەدات.

ئێوارەیە ڕۆژ لە زەردییە. زەردەپەڕ ئاسمانیی ئەو ئێوارەیەی خوێناوی کردووە، مۆتەکەی تاوانێک، خۆی بەسەر سینگی ئاواییدا کێشاوە، خۆر بە لێژایی ئاسماندا خلۆر دەبێتەوە.

عومەرخەریکی قوڕگرتنەوە بوو، دایکی هێشتا سەری لەسەر بەرماڵ هەڵنەگرتووە، هەر بایی ئەوە سەری لە سوجدە بەرزدەکاتەوەو هەردوو دەستی بڵند دەکاو خوا دەدوێنێو داوای یارمەتیی لێدەکات ئەو خەوە ناخۆشەی شەوی ڕابردوو بینیویەتی، بۆی بەخێر بگێڕێ: خودایە دوو بەرە ئەستوورکی تەندوورێم خێر بێت ئەو خەونە جڕناوفڕنایەی شەوێ دیم بۆ بەخێر بگێڕی!

لە حەژمەتـــی ئەو ئێـــوارە درەنگوەختەدا ترســـێکی نادیـــار حەجمینی لێهەڵگرتـــووە. هـــەردوو دەســـتی ڕاســـتو چەپ لـــە بنهەنگڵی نـــاونو لە چاوەڕوانییەکی بێزاردا نیگای چاوی لەسەر ڕێگای شاری گیرکردووە، بە ئومێدی ئەوەی تەپوتۆزێک لە ڕێگاکە هەڵبستێ، یان شووشەی پێشەوەی پیکابەکەی بریســـکە بدات! لە قوڵی ئەو چاوەڕوانییەو دواکەوتنی هاوســـەرەکەی هەزارو یەک غایەلەی بە مێشـــکیدا دەهـــات، هەتا کات درەنگتـــر دەبوو و خۆر بۆ ئاوابوون ڕادەخوشی، ئەویش نیگەرانتر دەبوو.

پیکابەکەی مام محســـینی جیـــاواز لە ڕۆژانی بـــەرێ، ئەوڕۆکە باری زۆر قورســـە، چونکە خەمێکی گرانـــی بارکردووە، خەمێک گەر بە ســـەر خەڵکی ئاواییدا بیبەشـــنەوە، بەشی هەر هەموویان دەکات! ئێستا خەمی ئەو دوو ڕیز دیوارەی نییە کە هەموو ڕۆژێ دایدەنێن، تەنها لە خودای داوایە مام محســـنی بۆ پارێزراو بێت.

لە خوار چاکی، تەپوتۆزێکی زۆریان بەدیکرد، گەواڵ گەواڵ بەنێویەکدا لوول دەخواو تێکدەهاڵێ. چونکە ڕۆژ لە سەر زەردییە، دەستیان داوەتە پشتچاویان، یەکێـــک دەڵێ: خۆیەتی ئەوە نییە ڕەنگی شـــینە! یەکێکـــی دی دەڵێ: ئەوە پیکەبی مام محسینی نییە، چونکە مام محسین لەسەرخۆ شوفێری دەکات، ئەو تـــۆزە یەکجار تیژڕەوە، ئەو پیکابە وەکو ئـــەوە وایە هاوارێکی بەدەمییەوە بێت، هێندە بە هەشتاوی لێدەخوڕێ!

بەجۆرێک ڕێگا قووت دەدات، گەردەلوولی تەپوتۆزێکی یەکجار خەستی لوول پێدەخـــوارد. پیکابەکە تا نزیکتر دەبێت، دڵنیایی زیاتر دەبێ کە پیکابی مام محســـینە، بەڵام شـــوفێر بۆ خۆی نییە. تیژڕەوییەکە لە هەموو شتێک

زیاتر سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، مەزەندە دەکرا هەواڵی ناخۆشی پێبێت، بە تایبەتیش بۆ ماڵی مام محسینی!

ئـــەوەی نەدەبوایە ببێ، ڕوویدا. ئەوەی بووە جێی سەرســـووڕمانی خەڵکی، ئەوەبوو کاتێک پیکابەکە وەســـتا، شوفێرەکە کەســـێکی نەناسراو بوو، شوفێر بۆچی بەتەنها لە پێشـــەوەیەو دوو کەســـی دیکەش لە پشتەوەی پیکابەکە بە پێوە وەستاون؟! شوفێرەکە بێئەوەی سڵاو بکات، پرسیاری ماڵی مام محسینی کرد، هەر یەکەمکەس هاوســـەری مام محسین گوتی: ئەمن خێزانی ئەوم، بە قوربانت بم چی ڕوویداوە؟ ئەی محســـین بۆ خۆی لە کوێیە؟ سەلامەتە؟ چی بەســـەرهاتووە؟ دە توخوا دەی زوو پێم بڵێ بۆ خۆی بۆ نەهاتۆتەوە؟! شوفێرەکە توانای پێگوتنی نەبوو، نێوچاوانی لە ســـوکانی پیکابەکە کووتا، ئەوەش ئاماژە بوو بۆ کارەســـاتێکی دڵتەزێن. هەرچەندی پیلی ڕاوەشـــاند، بەڵام شـــوفێرەکە ئەرقوومی نەکردو ئەلفازی نەگەڕا. ژنە بەپەلە سووڕایەوە پشتەوەی پیکابەکە، ئەوەی بینـــی ماڵوێرانیو کۆســـتێکی گورچکبڕ بوو، تەرمـــی خوێناوی مام موحسینی بینی، جەمەدانییەکەی خۆیان بەسەرداکێشاوە. ئیدی ئەوەی هەر ژنێکی هاوسەرکوژراو لە دادو فیغان هەیە بۆ مێردەکەی، کردی!

گوند یەکپارچە خرۆشاوە، تەمی مەرگێکی نادیار باڵی بەسەردا کێشاوە، لە ماڵی مام موحسین شینو ڕۆڕۆو واوەیلایەکە، نەبێتەوە!

بەپەلە سەریان لە جانگی دووریو کفنیان کرد. مردوو هەتا زوو بنێژرێ خێرو پاداشـــتی بۆ خاوەنەکەی زیاترە! ئەوە مەلا گوتی. قەبرســـتان لەسەر زوورگێکی

ئەوەنــدە ڕەقــە، قازمــە کاری تێناکات، بۆیە زۆربــەی قەبرەکە بــە بارییەی[١] لێدەدرێ، تەنها ســێ بستی لای سەرەوەی نەبێ، قازمەو خاکەناسو پێمەڕە کاری تێدا دەکات، ئەگەرنا ئەوەی دەمێنێتەوە، لەگەڵ نووکی قازمەو بارییەی، پریشکو جەرەقەی ئاگری دەدا. فانۆسو لۆکسیان هێنابوون، چونکە دنیا تاریک داهاتبوو بەردەستی خۆیان نەدەبینی قەبرەکە بکۆڵن. ئیشەکەیان بە گرانی لەبەر دەڕوات، خەڵکی ئاوایی، وەک ئەوەی خۆڵو دۆت بەسەردا کردبن، نوقمی خەمێکی قووڵ بوون. قەبرکۆڵینو ناشــتنەکە تا درەنگانێکی شەوی خایاند. پیاوێکی بەکەڵکی ئاواییان ژێرخاک کرد. ئەو ســێ کەسەی تەرمەکەیان هێنابۆوە، چونکە خەڵکی ئــەوێ نەبوون، وەک هاوخەمیو نەریتێک کە پێویســتە چۆنیەتیی دۆزینەوەو هێنانەوەی تەرمی مام محســینی بۆ کەســوکارو منداڵەکانــی ڕوون بکەنەوە، نەڕۆیشتنەوەو لەوێ مانەوە، ئەوەشیان کرد.

هاوسەری مام محســینی، بە ئاوازێکی خەمناک شیوەنی بۆ مێردەکەی دەکــرد. منداڵە بچووکەکانی، بە ســیمایەکی حەپەســاوەوە خۆیان خزاندبووە بنباڵو چارۆگــی دایکیان. خەڵکی ئاوایی هەموو دڵیان توند بوو، ســەگەکان بــەرەو ئاســمان دەیانلووراند. خەڵک، هەر دوو دوو و ســێ ســێ ســەریان پێکەوەنابوو، ســەریان لەو کوشتنەی ســوڕمابوو، هەریەکەو لە زەینی خۆیدا بکوژێکی داتاشیبوو، کەسێک دەیگوت: پارەی گەنمی پێبووە، هەر بۆ پارەکەی کوشــتوویانە. یەکێکی دیکــە دەیگوت: نا نا ئەوە نییــە پارەکەیان نەبردووە!

١. باریە: پارچە ئاسنێکی پتەوە، درێژیەکەی نزیکەی مەتر و نیو و، تیرەکەی دوو بۆ سێ سم دەبێ، بۆ کاری هەڵکەندن یان بەرزکردنەوەو جیاکردنەوەی شت و کەلوپەلی قورس لە زەوی بەکاردێ کە بە دەست نەکرێ.

ئەی بە چـــاوی خۆمان نەماندیت لە گیرفانـــی کورتەکەکەی گوللە بە عەینی پارەکەی کەوتبوو، هەمووشـــی شـــەلاڵی خوێن بوو، ڕەنگە بەهەڵە لە جێگەی کەســێکی دوژمندار کوژرابێت! بەتەمەنەکان دەیانگوت: ئەوەی ئێمە باسی دەکەین ئەوە بەبیری ئێوە نییە، مام محسین بیستو شەش ساڵ بەر لە ئێستا ئەو ژنەی خۆی لــە گوندەکانی دەوزێییی هەڵگرتبـــوو، ئێمە هەر ئەوەندەمان پێ شــک دێــت، باوەڕیش ناکەین ئەوان بــن، با پیاو لە خۆیـــەوە تفەنگی بە تاریکییـــەوە نەنێو خۆی گوناهبار نەکات! ئەتـــۆ بڵێی هێندە ملهووڕو دڵڕەق بن، لە دوای زیاتر لە بیست و شەش ساڵان ئەو دوژمنارییەی نوێ بکەنەوە؟! پیرەمێردێکی دیکە چەناگەی خستبووە سەر گۆمکی گۆپاڵەکەی: ئەمن ماڵی بابی ئەو ژنەی مام موحســـینی باش دەناسم، زۆر دەوڵەمەندن، وردو درشتیان زەلامەکیـــان تێدا نییە، نەک هەر زەلامی پێ بکوژرێ، ناتوانن مریشـــکێکی لە ئاو بکەن! دەبێت ئەوەش بزانین مام محسین لەوانە بترازێ کەسی دیکەی دوژمن نییە! لە گوندی خۆیشمان، ئەوە بابی موحسینی، زیاتر لە شەست ساڵ دەبێت لێرەیەو لەگەڵ ئێمەدا دەژی، قەت ڕۆژێک کێشـــەو ناکۆکی لەگەڵ هیچ کەسدا نەبووە، بگرە خەڵک هەر زۆریشیان خۆشدەویست. ئەوجا چاکە، بەتەنێ بە لایەکی ناکرێ، ئەویش کاری خەڵکی ئاوایی ڕایی دەکردو پیاوێکی بەکەڵک بوو بۆ ئاوەدانی! ژنەکەی بە گریانەوە دووعای دەکردو لەبەر خودای دەپاڕایەوە: هەرچی زووە ئەو سـەرەی هەڵماڵێو بکوژ چۆن سـفرەی ماڵو منداڵی ئێمەی سەراوین کرد، ئەویش ئاوا سفرەی سەراوین ببێت! ژنانی تازییەداریش هەموو پێکەوە دەیانگوت: ئامین!

تازیە تەواو بوو، خەڵک چوونەوە ماڵی خۆیان. منداڵەکانی مام موحسینی

بەتەنیا لە ماڵێک مانەوە کە زەردەخەنە و خۆشیی تێیدا باریکردووە! پیکابەکە، بێ شوفێر مایەوەو تۆزی لەسەر شووشەو دەشبوولی نیشت، وردە وردە تایەکان هەوایان دابەزیو کەوتنە سـەر ویل. مەنجەڵە ماسـتی مـەڕدارەکان لە بن سەوەشیران ترشان، کەسێک نەبوو لەباتی مام محسینی بیانبات بۆ کەرکوکێو بیانفرۆشێ. مام محسین، کەلێنێکی دیاری لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی ئاوایی دروسـتکرد . هێشـتا بۆ کەس مەعلوم نەبووە، بۆچی کـوژراو کێش بکوژە. ڕاستە ئەگەر گوتویانە کەس لەدوای مردوان دنیای تەرک نەکردووەو ژیان هەر بەردەوام دەبێت. لەدوای تەواوبوونی تازیە، دەلعازی، شـێرەژن قۆڵی هەڵماڵی لەجیاتـی ئەوەی سـەرکز بکاتو فینگەفینـگ بهۆنێتەوە، ئـەو قوورەی بۆ دیوارەکە گیرابۆوە، خەریک بوو وشـک دەبۆوە، خۆی هەڵکردو پشـتی گرێداو قوڕەکەی شـلکردەوە، لەو شـوێنەی مام محسین جێیهێشـتبوو دەستی بە دیوارکـردن کردو دوو ڕیز دیـواری قیت کردەوە، هەرچەند لـە فکران ڕادەچوو و پێکی دەگرت، بۆی سـاغ نەدەبۆوە مام محسـین لە سەرچی کوژراوە، تەنها ئەوەی لە ژیانیدا کردبووی کە لەگەڵ دابونەریتی ناوچەکەو دژی نەریتە باوەکان بێت، خۆبەشـوودانیەتی لەلایەن خۆیەوە، ئەوەش بەر لە بیستو شەش ساڵ، کە زۆر لەمێـژەو خەریک بوو پێکەوە پیروخەڕۆ بنو خاوەنی هەشـت منداڵ بوون، کچیان بەمێرد و کوڕیشـیان هی ژنێیە! کارەکـە بەجۆرێک کاڵ بۆتەوە، خەریکە لەبیر خەڵکی دەچێتەوە. مام محسین بێئاگابوو لەوەی چەند ڕۆژێک پێش کوژرانی، منداڵی ماڵی باوکـی ژنەکەی لەگەڵ چەند منداڵێکی ئاوایی خۆیان، بەشەڕهاتبوون، منداڵەکانی ئاوایی پێیان گوتبوون: بڕۆن تۆڵەی قوزی پورتان بکەنەوە، ئەوە چەند ساڵە بە دووکەوتییەو بۆتان دەتەقێننەوە! هێی پوور

بەدووکەوتوو! پوور بەدووکەوتوو! ئەوانیش بەگریان دەڕۆنەوە ماڵێو هەست بە سووکایەتی دەکەن. یەکەمجارە ئاوایان پێبڵێن، تووشی شۆک بوون، لە ماڵێ بۆ گەورەکانیان دەگێڕنەوە، ئەوانیش لە حەژمەتان مووی سەریان دەبێتە سووژن، ئەو سووکایەتییەیان لێ نوێ دەبێتەوەو برینی کۆنیان دەبێتەوە گەرمەبرین.

دروست لەو سەروبەندەدا، پیاوێکی دراوسێی گوندیان، دەچێتە داخوازیی کچێکی ماڵی باوکی هاوسەری مام محسینی، ئەوانیش گوتبویان دوایی وەڵامت دەدەینەوە. لەنێوەخۆیان پرسوڕایان بە یەکتری کردبوو، پیلانێکیان لەلا گەڵاڵە بووبوو. ناردبوویان بە دوای ئەو پیاوەی داخوازی کچەکەیانی کردبوو، پێیان ڕاگەیاندبوو دەتوانێ بێتە پێشو قسەی لێدەکەین. کاتێک خوازبێنیکەر هاتبوو پێیان گوتبوو: بە مەرج ئەو کچەت دەدەینێ: دەبێت مام محسینمان بۆ بکوژی! ئەویش بێ سێو دوو، ڕازی بووبوو. مام محسینیشی باش دەناسی، لەگەڵیشی سواری پیکابەکەی بووبوو، قسەیشی لەگەڵدا کردبوو. ئەوڕۆژە مام محسین پیکابێک گەنمی بردبوو بۆ شاری، لە دوای ئەوەی گەنمەکە دەفرۆشێو بۆیان خاڵی دەکاتو پارەکەی لە تەڕاحەکان وەردەگرێ، بەپەلە دەبێ بگەڕێتەوە گوندی، چونکە بناغەی خانوویێکی دانابوو، هەر ڕۆژەی دوو بۆ سێ ڕیز دیواری لێدەکرد. لە ڕێگای گەڕانەوەی، کابرا دەستی لێڕادەگرێ سواری بکات بۆ گوندی. ئاخر لەگەڵ مام محسینی جیرانەگوند بوون. هەرچەندە بەپەلەش بوو، بەڵام چونکە ناسیاو بوو، بۆی ڕادەگرێ. بکوژ داوا لە مام محسینی دەکات، گونییەیەک کەلوپەلی قورسی پێیەو لە کەندێی داناوە، لە پیکابەکەی بێتەخوارێ لەگەڵی باربکات. بەوجۆرەو بە بیانووی بارەکە، مام محسین دەباتە کەندەکەو لەوێ دوو فیشەکی پێوەدەنێو دڵی دەسمنو مام

محسین بۆ هەتا هەتایە چاوەکانی لێک دەنێت!

هاوسەری مام محسینی، تێکەڵاوی و هاوسێیەتی لەگەڵ ماڵی حاجی سمایلی زۆر باش بوو، بە تایبەتی لەگەڵ کاکەڕەشی، بە هۆکاری ئەوەی لەگەڵ مام محسینی برادەربوو. بەردەوام هاموشۆی ماڵی یەکترییان دەکردو جێی متمانەی یەکتری بوون، وە چونکە چاوکراوەترەو زۆر دەگەڕێو برادەری باشی لە هەموو شوێنێک هەیە، بەو هۆیانەوە، کاکەڕەشی بە باشترین کەس زانی کە متمانەی پێبکات، ڕایبسپێرێ سۆراغی هۆکاری ئەو کوشتنەو کەسی بکوژی بۆ بکات. کاکەڕەش بەڵێنی پێدا وەکو ئەرکێکی ویژدانی و هاوسێیەتی، بۆخۆی بە دواداچوونی بۆ بکاتو هەموو برادەرەکانی بۆ ئەو مەبەستە رابسپێرێت.

دوای چەند ڕۆژێکی کەم، کابرای بکوژ، لە هەقدەستی کوشتنی مام موحسینی، داوای کچەکەی لە ماڵی کابرا کرد. بەڵام ئەوان ئامادەنەبوون کچەکەی بدەنێو لە سەودایەکە پەشیمان بووبوونەوە. کارەکەش تازە کرابوو، ئەوان بە مەرامی خۆیان گەیشتبوون! بکوژ دەڵێ: ئەگەر ئەو کچەی نەدەنێ، ئامادەیە پیاوێکیش لەوان بکوژێ! وەک دەڵێن قسە بکەوێتە زارێکی، دەکەوێتە شارێکی! ئەو کێشەیە، بازنەکەی فراوانتر دەبێتو خزمو کەسوکاری هەردوولایان پێدەزانن کە لە بنچینەدا لەسەر چییە.

دوای چەند هەفتەیەک، کچەکە بەزۆر لە بکوژ مارەدەکەن، کە نە هاوتەمەنو ئاوزەی یەکترنو نە هیچ پەیوەندییەکی خۆشەویستیو خزمایەتیشیان لە نێواندا هەیە. کچە، چەندی دادو فیغان دەکات، بێسوودە، بەزۆری دەستی پێ لە خوێندن هەڵدەگرن. ئەو کێشمەکێشە وای کرد زۆر بەئاسانی وردەکاریو هۆکارو پاڵنەری پشتی کوشتنی مام محسینی، بۆ هەموو کەس ئاشکرا ببێت. کاکەڕەش وردو

باریک بۆ ژنەکەی مام محسینی کردە پیازی سپیکراو.

عومـــەری کوڕەگـــەورەی مام محسـیـنی، لـــە دوای تازیـــەی، دووچاری بیرکردنەوەیەکی قوڵو ڕۆچوون بەنێوەخۆیدا بووبوو، هۆکارەکەیشـــی، پاشخان و باگراوندی مزگەوت بوو. ئەو چەند ڕۆژەی تازییەکە، مەلای گوندیو مەلایەکانی دەوروبەر کە دەهاتنە تازیەکە، ئەوەندەیان باسی غەزاو پاداشتەکانی بەهەشت: حەفتاو دوو حۆری، قەسرو باڵەخانە، گۆشت لەبڕان، ڕووباری شەرابو، هەرچی ئەو شـــتانەی لێرە قەدەغەن، لەوێ بە زیادەوە بـــۆت فەراهەم دەکەن! عومەر شەوان تا درەنگانێک، شەونوێژان دەکاتو لەبەرخوای خۆی دەپاڕێتەوە، بەڵکو غەزای بە نەسیب بکات. عومەر تەمەنی بیستو سێ ساڵانەو ژنی نەهێناوە. هەرکە ئافرەتێک دەبینێ هەر ئەوەتە نایخوا! بۆیە، بەدەستهێنانی ئەو هەموو حۆرییـــە بۆ عومەری، پێداویســـتییەکی زۆر گرنگ بـــوون. لە ماڵێ، کاتێک مریشـــکێک بۆ دە ســـەرخێزانی بێ مێوان، ســـەردەبڕن، عومەر لەسەرەباری زیاتری بەرناکەوێت، پێی شـــک نایەت ڕۆژێک تێر گۆشـــتی خواردبێت، بۆیە خواردنی گۆشـــتی ئەو هەموو تەیرو قەلو قازەی بەهەشـــتێ، ئاوی بۆ لەزاری دێو ڕۆژ نییە بە خەیاڵ پاروویان لـێ بانەداو زگی برسی پڕپڕ نەکا لە گۆشت!

کە بیر لە کۆشکەکانی بەهەشـــتێ دەکاتەوە بە بەراورد لەگەڵ ئەو خانووە سەرگڵەی خۆیان، زۆر لە شـــەوانی باران باریندا دڵۆپە دەکاو لە خەوی شیرین قیتـــی دەکەنـــەوە بۆئـــەوەی جێگایەکەی بگوازنـــەوە. بۆیە، ئەو کۆشـــکەی بەهەشـــت، عومەر لە هەموو کەسێک پێویســـتی زیاتری پێیەتی! هەموو ئەوانەی مامۆستاکان باسیان دەکرد، عومەر ئاواتی بۆ دەخواستن و دەیویست بە هەرنرخێک بێت، بە دەستیان بهێنێت. دیارە کورتترین ڕێگاش بۆ گەیشتن

بەو نیعەمەتە، غەزاو شەهیدبوونە لە ڕێگای خوا.

دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر، عومەر کەڵکەڵەی غەزای کەوتە مێشکی و لە فکران ڕادەچوو و لەگەڵ خۆیدا دەیگوت: ئەتۆ بڵێی مامۆستا شوێنێکی پێ شک نەیەت لەو دونیا پانو بەرینەی خوا، بۆی بچمو بە ئارەزووی خۆم غەزا لە دژی کافران بکەم؟ ئەتۆ بڵێی خودا غەزام بە نسیب بکات؟! ئەو، لە ژیانو ماندووبوونی سەر دنیا وەڕەز بوویوو، بێئومێد بوو لەوەی بتوانێت ئەو دەستکەوتانە لەسەر دونیا بەدەست بێنێ، بۆیە گەڕابووە لایەکەی دیکە، کە ئەویش غەزاکردن بوو لە پێناوی خودا. عومەر کەوتبووە دونیای خۆی، لە خەڵکی ئاوایی ورد دەبۆوەو سەرنجی دەدان، هەریەکە ماندووی دوای گرتنەوەی گۆلکێک، مژاندنی کارەمێشکەیەک، تەشیرستنێک، ڕاچاندنی بەڕەیەک، ئاودانی هێسترێک، خوێ دانە بەرانێک، بژارکردنی زیوانو دانبژێری گەنمەکوتاوێک، دۆشینی مانگایەکو دەیان وردەکاری دیکە بوون. زەردەیەکی دەستکردی گاڵتەئامێزی بۆ دەکردن، کە گوایە جاهیلو نەزانن، بۆیە ڕێگای بەختەوەری نادۆزنەوە، کە خۆی لە غەزاو بەدەستهێنانی دەستکەوتەکانی بەهەشتدایە! بۆ ئەوەی گومڕا نەبێو خوا غەزەبی لێنەگرێ، نایەوێ لەو گوندەیدا دەستەوەستان دابنیشێو زادو زەخیرەیەک بۆ دوارۆژی کۆنەکاتەوە. ڕۆژێک بینی مەلای گوندی لە بندیواری مزگەوتێ لەگەڵ مەڕدارێک کێشەیەتی لەسەر ئەوەی ئەو گیسکەزەکاتەی بۆ ناردووە، قەڵەو نییە لە ڕووی شەرعەوە گیسکەزەکات دەبێ لە هەموو گیسکەکانی دیکە قەڵەوتربێت، ئەگەرنا وەک ئەوە وایە زەکاتی دەرنەکردبێتو هیچی بۆ نانووسرێ! مەڕدارەکە ڕۆیشت گیسکەکەی بە یەکێکی قەڵەو بۆ مەلای بگۆڕێ، عومەر خۆی لە مەلای

نزیک کردەوە، بە هەلی زانی پرسـیاری خۆی لێبکا. بە سـیمایەوە دیاربوو کە نیازی پرسیارێکی لە مەلای هەیە، مەلا درکی بەوە کردبوو: ها عومەر دەڵێی پرسـیارێکت هەیە؟ گوتی: بەڵێ مامۆسـتا! دەسـتی مامۆستای ماچکردو ئەویش دەستی بەسـەری عومەریدا هێناو هەواڵپرسی دایکیو منداڵەکانی لێکرد. ئەو هەواڵپرسـینە بووە هۆی ئەوەی عومەر شـەرمی بشـکێو ڕێگا خۆشـبێت بۆ ئەوەی پرسیارە شـەرعییەکەی لە مامۆسـتای گوندی بکات. مەلاش وەک هەسـتی شەشـەمی پێیگوتبێت عومەر پرسیارێکی شەرعی هەیە، گوتی: عومەر کوڕم ئەگەر پرسیارێکی شەرعیت هەیە شەرمێ مەکەو بێ پێچو پەنا پرسـیارەکەت بکە! عومەر گوتی: مامۆستا حەز دەکەم خودای لە خۆم ڕازی بکەم! مامۆسـتا گوتی: کاری چاک دەکەی. بۆ ڕازیکردنی خودا حەز دەکەم بچمە غەزایێ، ئێسـتا لە حاڵی حـازردا لە کوێندەرێ غەزات پێ شک دێت؟ دەمەوێ بڕۆم بۆ ئەوێ. مەلا گوتی: زەمانی ئەسحابان لێرەش غەزا لەبەردەسـتی خۆمان هەبوو، ئەوە گەلەک لەمێژە بە بیری ئێمە نییە، ئەگەر ئەسـحابە لە مەککەو مەدینەیڕا هاتوون بۆ ئێرەو غەزایان کردووە، ئەو کاتی هەر لەو کوردستانەی خۆمان غەزا بەدەست دەکەوت بیکەی، بەڵام ئێستا تەنها لە فەلەستین غەزا هەیە لە دژی جووەکانی ئیسرائیل، تاکو تەرا خەڵک لێرەوە ڕۆیشـتوون بۆ فەلەستینو بوون بە فیدایی بۆ ئیسلام، بۆیە لەو دەمو دەستەی تەنها ئەوێم پێ شک دێت بچی داکۆکی لە قودس بکەی، هەرکەسێک ئیمانی بەقووەت بێت، دەتوانێ بچێ لە فەلەسـتینو لوبنانو ئوردن خۆی بگەیەنێتە مەیدانـی غەزایێ، خودا بە نەسـیبمان بکات! هەرکەسـێک لەو مەیدانی غەزایانە شـەهیدبێت، بە پێڵاوەوە دەچێتە بەهەشتێو لەوێ حۆری چاوەڕوانی

دەکەن! خۆشــییەکەی لەوەیدایە لەوێندەرێ داری لەســەر بــەردی دانانێیو ئارەقـــەی ناکەی، تەنها دەکەیو دەخۆیو پاڵدەدەیەوە! عومەر کەوتە بن بارەکی خەمان، چۆن ئەو هەموو پاداشـــتانە وەربگرێ؟ لەکاتێکدا لەنێو ئیشــوکاری جووتیاریو ئاژەڵداری بێزارو ماندوو و شەکەت بووە! ئێستا پێویستە لە خەمی ئەوەدابم چۆن خۆم بگەیەنمە فەلەستینو لەپێناوی خوادا بجەنگم!

چەند ڕۆژێــک بوو عومەر لەگــەڵ دایکو خوشــکو براکانی خەریکی نۆکرنینەوە بوون. هەموویان لەپی دەســتیان بلۆقی کردبــوو و ئاویان تێزابوو، کاتێکیــش بلۆقەکانیـــان دەتەقــیو نێو لەپیـــان تەڕدەبوون، لەگەڵ ســوێری لاچکەنۆکــەکان دەچــووە نێو بلۆقـــە تەقیــوەکان دەتگوت خوێ بـــە برینـدا بکەن. ئەو برژانەوەیـــە ئەوەندە بە ئازار بوو، منداڵـــەکان لەبەری دەگریان، بە تایبەتی بەیانییان پەنجە ناســـکو وردیلەکانیان ڕەق دەبوو، بە ئاســـتەم بۆیان دەنووشتایەوە. ناچاربوون پنجەنۆکەکان بە شلی بگرن، ئەوەش وایدەکرد نۆکەکە لە دوای دەســـتیان نەیەتو زیاتر ئازاری نێو لەپیان بدات. شـــەونەبوو خەونی جرِناو فرِنا بە دەســـتکەنەی نۆکێوە نەبینن. لە ترســـی نـــۆک هەڵکەندنەوەی بەیانـــی، چێژیان لە خەویش نەدەبینی. شـــەویان زۆر کورتە، وەکو تارماییەک بەســـەریاندا تێدەپەڕێ، خەونی منداڵانەیان نەدەبینی: لـــە گۆماواندا مەلە بکەن، لەگەڵ منداڵی گوندی تۆپتۆپێنو مووروانێو هەی ڕێوی ڕێویو یاریی منداڵانە ببینن. ئەوان سوور دەیانزانی کە سبەینێ، زوو دێتەوەو پنجەنۆکەکان لە چاوەڕوانیاندان!

هێندەی لەســـەر چینچکان بـــڕۆن، دەمارەکانی ڕەفیســـکیان کورژ کورژ بووبوونـــەوە. وەختێک هەڵدەســـتانەوە، نەیاندەتوانی قامەتـــی خۆیان ڕێکـو

قیت ڕابگــرن، وەک گلۆرەیان[١] لێدەهــات. دایکیان دەیگــوت: ئەتۆ بڵێی حازرخۆرەکانی بەرســێبەرێ، کاتێک پارووی نۆکی بادەدەن پێی بزانن نۆک بەو کوێرەوەرییە ڕەنێو دێ! تا دوعایەکی بەخێر بۆ ئەو دەستەقەڵشیوانە بکەن کە زگی ئــەوان تێر دەکەن! ئای خوایە ئەتۆ بڵێی بزانــن دەنک دەنکی ئەو نۆکە، ڕوومەتی چەند منداڵی بێبابی لەسەر هەتاوگاز بووە!

ئــەو ئێوارەیەی عومــەر بە دایکی گوت دەڕۆم، هێشــتا بابی دوو ڕۆژیان دەســتکەنەی نۆکێ مابــوو. دایکی وایزانی تەنها دەچێتــەوە گوندی، گوتی: ڕاوەســتە هەموو پێکەوە دەڕۆینەوە، منداڵەکان ماندوو بوون بەتەنها مەڕۆ و بەجێــمان مەهێڵە! عومەر زانی دایکی لێی حاڵــی نەبووە، دووبارەی کردەوە: گەردنم ئازاد بکە، نەبادا نەمبینییــەوە! دایکی هەر هۆپەکی لە خۆی زانی: بیســمیللا! ئەوە شێت بووی؟ وەڵڵا بابە خۆش! خێرمان دیت لە عەولافات![٢] ئەتۆ کوڕی گەورەی، لەجێی بابتی، ئەمن و ئەو منداڵانە بۆ کێ بەجێدەهێڵی؟ هەر بەڕاســت بۆ کوێ دەڕۆی؟ ئاوا دوورەو، گەردەنئازادبوونی دەوێ؟! عومەر گوتی دەچمە فەلەستین! دایکی گوتی: ئەو منداڵانە چاویان لە دەستی تۆیە لەدوای خوای ئەتۆ شــک دەبــەن، ئەگەر تاکو ئێســتا براگەورەیان بووی، لێرە بەدواوە دەبێ باوکایەتیشــیان بۆ بکــەی! دایکی زۆری گوت و، عومەر کەمی

---

١. گلۆرە: گلۆلە، گرۆڵە، گلۆڵە، گلۆڵەبەن، تۆپەبەن.

٢. خێرمان دی لە عەولافات: عەولافات دواگوندی کەندێناوەیە لە دەشتی هەولێر بە لای (سەربەشاخ) و (پەڵکانە)یدا. ئاوەکەی ناسازگار و سوێرە. مەڕدارێک بۆ مەڕلەوەڕاندن دەچێتە ئەو گوندە، بەهۆی سوێری و خراپیی ئاوەکەی، ئاژەڵەکانی دەمرن. بۆیە کابرای مەڕدار بە تەوسەوە دەڵێ: وەڵڵا بابە خێرمان دی لە عەولا فات. لەوکاتەوە ئەو قسەیە لە دەشتی هەولێر بۆتە ئیدیۆم بۆ شتی بێکەڵک و بێخێر.

لێبیســت: دایە ئەمن دەچمە فەلەســتین دەبمە فیدایی بۆ ئیسلامو غەزای لە دژی جوولەکان دەکەم! لەوەتای مامۆســتا باســی غەزاو ئەجری غەزای بۆ کردووم کە لەســەر موســڵمانان فەرزە، ئەمن لە گوناهبــاریو گومرایی خۆم شــەوان خەوم لێناکەوێ، هەرچەند دەکەم نازانم چۆن پاک ببمەوەو گوناهەکان بشــۆمەوە! مەگەر غەزا پاکم بکاتەوەو خودام لــێ خۆشبێت! دایکی گوتی: کــوڕی خۆم بــە قوربانت بم! ئەو ڕێیــە دوورەی بۆ دەدەیــە بەرخۆتو نزیکان لــە خۆت دووردەکەی؟ غــەزای تۆ لێرەیە هەر لێرە لەو گونــدەی و لەو ئاقارو نێو ئەو دەســکەنەی، هەر بەخۆی غەزایە! بەڕاســتی غەزای تۆ بەخێوکردنو چاودێریی ئەو خوشــکو برایانەتە، ڕۆڵە، هەتا مارە، لــە مزگەوتێ بەتارە! بە زەردەیەکی خەمناکو ماناداڕەوە گوتی: وەڵڵا بابە باش! هەر ئەوەمان کەم بوو! ئەو هەموو عارەبەی دنیایێ پەکیان لەســەر عومەرۆکەی کوڕم کەوتییە ببتە فیدایی و بچێ فەلەســتینیان بۆ ڕزگاربکا! ئەوە کــێ لە بناگوێی خوێندی؟ ئەدی خێرە؟ بەخۆی بۆ ناچێ بۆ غەزایێ؟، یان ئەو دەســتی لە گۆزەیدا عاسێ بــووە؟ کوڕی خۆم بە قوربانی ئەو بەژنەت بم، یاخوا لەدەوری ســەرت گەڕێمو بەڵاگێڕت بم! بە قســەی دایکی خۆت بکەو لەســەر کوتکو ســنگی خۆت داسەکنێ! ئاخر لە خۆتت نەپرسییە ئەمەو فەلەستین کوجا مەرحەبا؟ ئەوجا، هێشتا کفنی بابت زەرد نەبووە، لە تۆ زیاتر کێمان هەیە باراشێمان بۆ لە ئاشی بکا؟ ئاخر ئێمــە زەلامەکی وەک تۆ لە داری دەتاشــین، هێندەمان ئیحتیاج بەسەرپەرشــتیکارێکی وەکو تۆ هەیە، بە قســەی دایکی خــۆت بکەو ئەو خوشــکو برا جوانانەت بەجێمەهێڵە، ئەوە لە غەزایێ خێری زیاترە! هەرچەند لەبەری پاڕایەوەو دەســتەوداوێنی بوو و خۆی لە دەوری سەری گێڕا، بێسوود

بوو، وەک ئەوە وابوو گوێزی بۆ بژمێری! بۆ خاتری پاداشتەکانی بەهەشتێ، ئامادەبوو هەموو کارێک بکات. لەتاو تەنیایی شەوان، شەو نەبوو خەونی حەرام بە حۆرییەکانی بەهەشتێوە نەبینێ. ئۆقرەی لێبڕابوو!

منداڵەکان بە سەرسامی و چاوی ئەبڵەقەوە لە کاکیان دەڕوانی، چونکە دەیانزانی بۆ شەڕو کوشتار دەچێت. وەک لایەنگری قسەکانی دایکیان، هەر هەموویان وەکو جووجکەهەوێردە لە دەوری دایکیان گردبوویوونەوە، بە مانای ئەوەی ئێمە لەگەڵ قسەکانی دایکمانین! دایکی، ئەهدو چاری کرد، یەخەی ئاسمانێی ڕاوەشاند! ئاخر دەبێ دایک حاڵی چۆن بێت لەوکاتەی جگەرگۆشەکەی دەچێتە دۆزەخی جەنگ! منداڵەکان، خوشکو برا هەتیوەکان بە تەماشایەکی هەتیوانەو بە زمانی جەستە، لەبەر کاکیان دەپاڕانەوە جێیان نەهێڵێ، بەڵام ئەو هەر پێداگربوو، هەر ئەوشەوەی لێرە ماوەو بەیانی لەگەڵ تاریکو ڕوونی، دەڕوا. شەو زرینگایەوە، بەڵام عومەر هێشتا خەو لە چاوەکانی میوان نەبووەو بیر دەکاتەوە، دەبێ چۆنو بە کوێدا بۆ فەلەستین بڕوا؟ نەیدەزانی فەلەستین کەوتۆتە کوێی دونیا؟ ئەو لە زەینی خۆیدا وای دانابوو، دروست ئەوەی مەلای گوندی لە بارەی شەڕەکانی بەدرو خەندەق لە مێشکیدا چاندبووی، ئەوێ، پڕە لە ئەسحابەی نوورانی!

هەر دوانیوەڕۆی ئەوڕۆژە، لە هەولێر چووە نووسینگەی ناونووسین. خۆبەخشانە بۆ چوونە فەلەستینو شەڕکردن لەگەڵ ئیسرائیل عومەر خۆی ناونووس کرد. پێیان ڕاگەیاندن هەر ئەمڕۆ دەستەیەک بەڕێ دەکرێ، ئەگەر ئامادەیی تێدایە دەتوانێ هەر ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو دەستەیەی چەند ڕۆژێکە چاوەڕوانن، بڕوات. عومەر هەر زۆری پێ خۆشبوو دەمودەست بەڕێ بکرێ.

لە وێستگەی شـــەمەندەفەری هەولێر سواری شەمەندەفەری کەرکوک بوون. لە بڵندگۆی وێستگەکە کە سـێجار بانگیان ڕاهێشت: گەشتیارانی کەرکوک ئـــاگادار دەکەینەوە، نیو کاتژمێری دیکە شـــەمەندەفەر جووڵە دەکات، تکایە ئامادەبـــن! ئـــەو بانگەوازە، لەگـــەڵ دەنگی بانگی نوێژی عەســـرێ تێکەڵ بە یەکتری بوون. دەنگی بانگێ، ناو هەمووفارگۆنەکانی شەمەندەفەرەکەی پڕکرد. لە گجۆزی شەمەندەفەرەکە چەند لوولەدووکەڵێکی ڕەشی یەک لەدوای یەکی لـــێ بڵندبوو، وەک فوو لە ئاســـمان بکات! دوایین ئاگادارکردنەوەو هۆڕنێکی دوورودرێژی شـــەمەندەفەرەکە لە دیوارەکانی قەڵاتـــی هەولێرێ دەنگیدایەوە. خەڵکی شـــاری هەموو زانییان شـــەمەندەفەرەکە بەرەو کەرکوک بەڕێکەوت، لەوێشـــەوە بەرەو بەغدا. لە هەولێـــرێ وەدەرکەوتن، لە هـــەردوو بەری هێڵی ئاســـنینەکە خەڵکی گوندەکان خەریکی کاری سەپانیی خۆیان بوون. عومەر وەبیری هاتەوە هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر، عەرزی کشتوکاڵی ئەوان دەکات بە دوو لەت. دروست ئەو پەڵە نۆکەی دایکیو خوشکو براکانی دەستکەنەی لێدەکەن، دەکەوێتە لای دەستەڕاســـتی ڕێگاکەی ئەوان، بۆیە، بەرلەوەی بگەنە ئەوێ، داوای لە هاوگەشـــتەکەی کرد یارمەتیی بدات بچێتە شـــوێنەکەی ئەو کە دەکەوێتە دەستەڕاســـتی ڕێگاکە، بۆئەوەی دوایینماڵئاوایی لە پەنجەرەی شـــەمەندەفەرەکەڕا لە دایکیو خوشـــکو براکانی بکات. بەرلـــەوەی بگەنە ڕاســـتیان، عومەر لـــە پەنجەرەکەڕا هەتاوەکو پشـــتێنی، خـــۆی دەرهێنابوو، ئەو شـــەپقە ســـەربازییەی لە هەولێرێ دابوویانێ، بە ئاماژەی ئاگادارکردنەوە، ڕادەوەشـــاند. هەتاوەکو دەنگی تێدابوو بانگی دایکیو خوشکو براکانی یەک بە یەک، دەکرد. ئەوانیش دەســـتیان لە دەســـکەنەی نۆک هەڵگرت، بێجگە

لە دایکی، هەمووان دەســـتیان بۆ بەرزکردەوە. دایکی بە نیشانەی ناڕازیبوون، پشـــتی تێکرد. خوشکە هەرەبچووکەکەیان بە دەســـتێکی ئەو دەسکەنۆکەی ڕادەوەشـــاند کە تازە هەڵیکەندبـــوو، وەک بانگکردن نۆکەکەی ڕادەوەشـــاند: وەرە مـــەڕۆ جێمان مەهێڵە! بە دەســـتەکەی دیکـــەی، بەردێکی هەڵگرتبوو، بە دوا شـــەمەندەفەرەکەدا ڕایدەکـــرد، بۆئەوەی ئەو بـــەردە بخاتە بەرپێچکە ئاســـنینەکەیو ڕایبگرێ و کاکیان لـــێ دوورنەخاتەوە! چەند هەنگاوێکی بە غـــاردان بڕی، لەبەرئەوەی چـــاوی لەبەر پێی خۆی نەبوو، هێندەی ســـەرنجی لەســـەر کاکیو شەمەندەفەرەکە بوو، کراسەکەی لە قولەقاپی هاڵاو دەمەوڕوو کەوتە ســـەر زەوی، دەســـکەنۆکەکەی بەلایەکدا کەوتو بەردەکەی دەستیشی بەلایەکەی دیکەدا، ڕوومەتی کەوتە ســـەر عەرزیو چاوەکانیشی هەر لەسەر شەمەندەفەرەکە بوو. تا دەهات لەبەرچاوی بچووکو بچووکتر دەبووەوە، تا وەکو بوو بە خاڵێکی بچووکو، ئەویش ون بوو.

دوایین نوزەی بە نەغمەی پاڕانەوە، کاکەیەکی درێژو لەرزۆک و، چەندجار قوچانەوەی پەنجە خڕنەکانی بوو، بە ئاماژەی، وەرە مەڕۆ، توخوا مەڕۆ!

تـــا دێت مـــەودای دابڕانی عومـــەرو دایکو خوشـــکو براکانـــی زیاتر دەبێت. چەندین شـــارو شاخو دەشتو بیابانو بگرە وڵاتیشیان کەوتۆتە بەینێ. پێکەوەبوونیان بەرەو لە یەکتر دابڕانێکی مەودادوور، مل دەنێ، کە لەو وەختە ناسکەدا، بۆ ئەو خێزانە برینداره ئاسان نەبوو. عومەر لەو شوێنەی مەبەستێتی خەریکە نزیک دەبێتەوە، عیشقو خۆشەویستی بۆ غەزایێ، هەموو شتێکی لە عومەری ئەســـتاندۆتەوە. چ لەو شتانەی ڕۆژانە لە دەوروبەریدا بەرخوردی لەگەڵیانـــدا هەیـــە، چ خاوەندارێکردن لە خوێنی باوک و دایک و خوشـــک و

براکانی، لەو نابەرپرسیارێتییەی عومەری، نیگەرانو لێی بێئومێد بوون. دەیانزانی عومەر کەوتۆتە دنیای خۆی، لەڕاستیدا دایکی چاوەڕێی ئەو ماڵئاواییە لەناکاو و ناخهەژێنەی جگەرگۆشەکەی نەبوو، ئەوەی بیری لێ نەدەکردەوە، ئەو دابڕانە کتوپڕە بوو، بەجارەکێ پردی قیامەتی لێ پساند! دایکی، لەبەر دڵی منداڵەکانی بەسەرخۆی نەدەهێناو دەیویست درۆزنانە بە ئاسایی لێی بڕوانێ! هەرچەندە، کاتی ماڵئاواییەکەی، کە پشتی لە دایکی کرد، لەبەرچاو ون نەدەبوو. لەناخەوە بە فریادێکی بێدەنگ، گریا، گریانێک، فرمێسک لە چاوەکانی جۆگەلەی بەست، دەتگوت هەر ئێستا، تەرمی خوێناوی مام محسینی هاوسەری لەپێش درێژکراوەو بەسەریدا دەگریێ. ڕۆژ نەبوو ئەو چەند ڕستەیە لە زەینو بیرکردنەوەی دووبارە نەبنەوەو گوێی لەو گریانەی خۆی نەبێتەوە، کە بەتەواوی ئاواییدا بڵاوبۆوە: کوڕی خۆم! لەجیاتی ئەو کارەی بە تەمای بیکەی، کاری خێرتر هەیە بیکەی! ئەمن دڵنیام گەر نەکوژرێیو گیانی سالم دەربەری، بەردی پەشیمانی لە ئەژنۆی خۆت دەدەی، بە چنگی پڕ لە پەشیمانی بۆم دێیتەوە! ئەوەی ئەتۆ دەیکەی دەرهەق بە منو ئەو منداڵانە، خۆدزینەوەیە لە سەڕافەتیکردنی ئەخلاقیو ویژدانیو ئاینی! گوناهی برسێتی ئەو هەتیوە بێباوکانە لە ملی تۆیە، کە بەخێوکەریانیو بەبرسێتی جێیان دێڵی! لەبیریەتی، ئەوکاتەی عومەر گوتی: ئەمن لە خۆشەویستی خودا ئەوە دەکەم! دایکی گوتبووی: ئەتۆ لە خۆشەویستی حاڵی نابی، ئەوەی ئەتۆ بەتەمای بیکەی، ئەوە ڕقە، خۆشەویستی ئەوەیە دایکێک، باوکێک، براگەورەیەک، نەهێڵێ بێچووەکانی، ئەوانەی کە تەنیا ئەو شک دەبەن، بەبرسێتی بمێننەوە!

ڕۆژ نەبوو، ئەو گفتوگۆیە پڕ لە داخو کەسەرەی بەینی خۆیو عومەری

کـــوڕی، ســـەدجار دەور نەکاتەوە! ئەوەشـــی لە بیـــرە کە ســـەری دادەنەواندو بێدەنگییەکەی، ترووسکایی ئومێدێکی پێدەبەخشی، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو ئومێدە کزە، عومەر بڕیاری کۆنکرێتیی دابوو.

دوای کوژرانی مام محسینی هاوسەریو ڕۆیشتنی عومەری کوڕەگەورەی، بۆ فەلەستین، ئەوماڵەی خۆیانی لێ ببوو بە چۆڵەوانی، لێ، بەو حاڵەشەوە دەســـتەو ئەژنۆ دانەنیشت. ڕاستە تا ماوەیەک خەڵکی ئاوایی، لە هەرەوەزیو بردنەپێشـــەوەی کاری کشـــتوکاڵی و قوڕپەســـتی ســـەری خانوو و زۆر کاری دیکە، قسووریان نەکرد. بەڵام ئەو وەک شـــێرەژن، غرووی ژنانەی ڕێی پێنەدا چاولەدەســـت بمێنێتەوە، بۆ چرکەیەک ڕێی نەدا ژیانی ئاســـایی لەو ماڵەیدا بوەســـتێت، بەهیمەتو باوەڕ بەخۆبوونەوە قۆڵی لێ هەڵماڵی. لە کشتوکاڵو ئاژەڵـــداری لە پێش خەڵکـــی ئاوایی بوو. ڕۆژانە دوو ڕیـــز دیواری ئەو خانووە نوێیەی دادەنا کە مام محسین لە دوای خۆی جێیهێشتبوو، تاوەکو خانووەکەی تەواوکرد. ڕێگای نەدا نەهامەتیو کۆسپەکانی ژیان لەسەرشانی کەڵەکەبنو لە بنیان نرکەو ناڵەی بێت، بەڵکو هەمووی کردن بە پەیژەو بەسەریاندا سەرکەوت. تا وای لێهات، قسەی لەنێو قسان هەبوو، هەموو سنوورەکانی ژنێکی دەستوپێ سپیلکەو بێوەژنی تێپەڕاند! سەختی ژیان دڵی شکاندبوو، بەڵام خۆی هەرگیز نەدەشـــکا! هەرچەند لێت دەڕوانی، ڕەفتار وڕواڵەتی بە ژنێکی بێوەژنکەوتووی مێردکوژراوو کوڕێکی ســـەرهەڵگرتووی فیدایی فەلەستینو حەوت هەتیوی بەسەرداجێماو نەدەچوو، بەڵکو، لە هەڵمەتو قۆڵ هەڵماڵینو گرێدانی پشت، بە فەرماندەیەکی ســـەربازیی گیان لەسەردەســـتو بـــراوەی مەیدانی جەنگ دەچوو، مەیدانی لە ژیان دەخواست. یەکەم ژن بوو پاشناوی بێوەژنی ڕەتکردەوەو

خەڵکی ئاوایی ناچارکرد بە ناوی پیاوێکەوە گرێ نەدرێت پێی بڵێن ژنەکەی مام محسین، بەڵکو وەکو مرۆڤێکی ئازادو سەربەخۆ بەناوی خۆیەوە بانگ بکرێ!

کۆسپ و کارەسات، نەیانتوانی بەردێکی دیواری باوەڕبەخۆبوونی بجوولێنن! پاڕانەوەو سەرکزکردن لە مەزەبیدا نەبوو، لەسەرکەوتن کەمتر، بە هیچ شتێکی دیکە ڕازی نەدەبوو. قایل نەبوو ژیانی ئێستاو ئایندەی، لەپێناوی شتی بەسەرچوو، وێران بکا. پێی وابوو ژیان لەو بەیانییە زووەڕا دەست پێدەکات کە ئەو لە خەو ڕادەبێ‌و سەری مەیدانێی لێدەگرێ! نە کەس مابوو نە چاوەڕوانیشی لە کەس هەبوو، بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکات! بۆیە بۆ هەموو شتێک، لە وردی تا درشتی، تەنها پشتی بەخۆی دەبەست. ئاخر مرۆڤە شکۆدارەکان، بەو شێوەیە لە دایک دەبن!

فیداییەکانی کوردستان، لە نووسینگەی بەغدا لەگەڵ فیدایی پارێزگا عەرەبییەکان، دوای ئەوەی کەمێک خەرجی‌و جلوبەرگی سەربازییان وەرگرت، تێکەڵاو بەیەکتری کران. فیداییە عەرەبەکان زۆربەیان بەناوی منداڵەکانیان بانگ دەکران، تەنانەت ئەوانەی منداڵیشیان نەبوو، دەیانکردن بە باوکی منداڵێک: ئەبو فاتیمە، ئەبو ئەحمەدو... ئەو ماوەیە، عومەر ئوردن‌و لوبنان‌و فەلەستینی بینی، بەردەوام سەرقاڵی مەشق‌و ڕاهێنان بوو. ئەوەندە مکوڕبوو، لە زۆربەی کاری ڕۆژانە بە پلەی زۆرباش دەردەچوو. لە چالاکییە سەربازییەکان هەمیشە لە پێشەوەبوو و دەبووە پێشەنگ. فیداییەکان ئەوەندە عومەرناویان زۆرە، زۆرجار کە بانگی عومەرێکیان دەکرد، دەستەیەک لە عومەرەکان بەیەکەوە وەڵامیان دەدایەوە، بۆیە، عومەریان کرد بە عومەر کوردی، بۆئەوەی لەگەڵ عومەرەکانی دیکە، بۆیان جوودا بکرێتەوە. عومەر، ماوەی دوو ساڵی فیداییبوونەکەی، چەند

جارێک بــە مۆڵەت هاتەوە گونــدی، هەرچەند جاری دەهاتــەوە، پاکەتەجغارەی ڕیــمو چەند جۆرێکی دیکەی لەگەڵ خۆی دەهێنا. خەڵکی ئاوایی، ئەو پاکەتەی وێنەی مامزێکی لەســەر بوو، هەمیشە باسی خۆشیی ئەو جگەرەیەیان دەکرد. کە دەچوونە لای عومەری، ســەرو جغارەی دەدانێ. عومەر، لە پاداشتی ئەوەی مەلای گوندی، ڕێگای غەزاو مســۆگەرکردنی بەهەشتی نیشانداوە، هەرجارێک دەهاتەوە، لەگەڵ دەســتی خۆی پارچە پاکەتێکی ڕیمی مامزداری بۆ مامۆستای دەهێنا. دوای گەڕانەوەی بۆ یەکەکەی، شەوێک بۆ کەمین دەردەچوون، شەوێکی زۆر تاریــکو تنوک بوو. کاتێک دنیــا دەهات ڕوون بێتەوەو ســیوادی بەیانی بدات، ســەربازێکی جوولەکەی ئیســرائیلی لە یەکەکەی خۆی دابڕابوو، کەوتە بەر چەنگی عومــەرو هــاوڕێ فیداییەکانی دیکەی. دیلەکە ناوی شــالۆمەو تەمەنی ۳۰ ســاڵ دەبێت. لە هەموو فیداییەکان زیاتر عومەر پێداگری لەسەر گوللەبارانکردنی شالۆمی دەکات، چەندجار تفەنگەکەی سواردەکرد بیکوژێ، بەڵام بەرپرسە سەربازییەکەی ڕێی پێنەدەدا. هەرچەندی عومەر ناڕەزایەتی دەردەبڕیو دەیگوت: ئەمن لە کوردســتانڕا هاتووم غەزایــێ بکەم، چۆن ئێوە ڕێم پێنادەن؟ بەرپرسە ســەربازییەکەی عومەری، هۆکاری ڕێگا پێنەدانەکەی بۆ ڕوون کردەوە کــە ئەوان دیلیان لەلای ئیســرائیلییەکان زۆرە، ئەگەر ئێمە قایل بین شــالۆمی بەربدەینو ئازادی بکەین، ئیسرائیلیش ئامادەیە هەموو دیلەکانمان ئازادبکات، بە کوشتنی شالۆمی، ڕێگا لەبەردەم ئازادکردنی هاوڕێکانمان دادەخەین.

بەوشــێوەیە، عومەر دەســتبەرداری گوللەبارانکردنی شالۆمی دەبێت، بە ئومێدی ئەوەی لەئەنجامی گۆڕینەوەی، چەند برادەرێکی فیدایی‌و موسڵمان ئازادبکرێــن. ئەو یەکەســەربازییەی عومەر خزمەتــی تێدادەکرد، خەڵکی

زۆربەی وڵاتە عەرەبیو ئیسـلامییەکانی تێدایە: عێراقی، سووری، میسری، ئوردونی، لوبنانی، توونسی، یەمەنی، سعوودیو... عومەر لە هەمووان زیاتر لە لای بەرپرسـەکان جێگای باوەڕو متمانەیە، چونکـە درک بەوە دەکەن کە عومەر چ ڕقێکـی بەرامبەر جوولەکەکان لە دڵدایـە، بۆیە، بەزۆری عومەر کوردی پاسـەوانی ئەو ژوورەیە کە شالۆمی تێدا بەندە. شالۆم هەرچەند جاری گوێی لێدەبوو فیداییەکان بانگیان دەکرد: عومەر کوردی، لە ناخەوە تووشـی هەژانێکی دەروونی دەبوو کە خوێنی بڵقی دەداو سەرسـام دەبوو، لەبەرخۆیەوە دەیگوت: دەڵێی خەون دەبینم، ئەوە چ قەدەرێکە بۆ ئێمە بڕاوەتەوە، بە هەزاران میـل دوور لە خاکـو زێدی خۆمان لێرە کوردێک بە دەسـتی کوردێکەوە دیل بێـت! هەرچەند جاری بانگیـان دەکرد: عومەر کوردی! ئەو هەسـتە لە لای شـالۆمی دووبارە دەبۆوە. عومەر بێئاگا لەوەی شـالۆم کوردە، هەموو ڕۆژێک جنێوبارانـی دەکرد، لـە کۆتاییش دەیگوت: ئاخ خۆزگە بەو دەسـتانەی خۆم دەمکوشـتیو دەستم کەسـک بێت! بۆئەوەی کە گەڕامەوە گوندی بە مەلای گوندەکەمان بڵێم بەو دەسـتانەی خۆم جوولەکەم کوشتووە! شالۆم هەرچەندی تینو غیرەتـی دەدایە بەرخۆی، نەیدەتوانی عومەر کـوردی بدوێنێ، چونکە هەستی دەکرد چ ڕقێکی بەرامبەری هەیەو ڕۆژانە چۆن ددانی لـێ بەجیرەوە دەباو ئارەزووی لەنێوبردنی دەکات! ئاخر شالۆم دەیزانی عومەر کوردی چەقۆی بۆچی هەڵگرتـووەو چ جانەوەرێک لە ناخیدا خۆی مەڵاسـداوە کە چ تۆفانی خوێنێک لە ناخیدا خەوتووە، کێ بوێری ئەوەی تێدایە پێی بڵێ تۆزێک ناخت پاکژ بکەوە، بۆئەوەی مرۆڤدۆسـتی ڕووناکی بڕژێنێتە سەر دەروونی تاریکت! ئەوجا چ هێزێک، چ کەسـێک، ئەو توانا سیحراوییەی هەیە بیگەیەنێتە ئەو

باوەڕەی کە پێویستی بە سپیکردنەوەی ناخی لەو ڕەشایەتییە هەیە؟

نا نا، هیچکەسێک نییە ملی خۆی لە کێردی عومەری کوردی بسووی، ئەوە شالۆم وای دەگوت. چ هێزێکی ئەفسووناوی لە توانایدایە بیگەیەنێتە ئەو ڕاستییەی وەکو کوردێک ئێرە هەرگیز جێگای ئەو نییە، بەهەڵە کەوتۆتە ئێرە! شالۆم لەبەرخۆیەوە گوتی: مردن مردنە لنگەفرتێ مانای چیە! ئەگەر بەیانی خوێن سەلکان ببات بەڵێن بێ کوردبوونی خۆم بۆ عومەر کوردی بەیان دەکەم، ئەوکات چی دەبێت با ببێت. بەیانی خۆی ئامادەکرد چەند وشەو ڕستەیەکی شیرین‌و ئارامبەخشی کوردی ئامادەکرد، چەندجار لەبەرخۆیەوە گوتییەو دووبارەی کردنەوە، بۆئەوەی زمانی تەتەڵە نەکاتو وشەکان تێکنەئاڵێن، بۆئەوەی بە ئاسانی بیانگەیەنێتە گوێی عومەر کوردی. چاوەڕوان بوو پاسەوانی ئێشکگری پێش عومەر ئەرکەکەی ڕادەستی عومەر کوردی بکات، لە کەلێنی شیشەی پەنجەرە نیومەتر بە نیومەترییەکەوەوە کۆخەیەکی قورگ سافکردنی بۆ کرد، پیتی کافی لە زاری دەرچوو، بەنیازبوو بڵێ کاک عومەر، گرمەی مووشەکێک پاشماوەی وشەکەی پێ قووتدایەوەو ڕستەکەی لە قورگی خنکاند، یەک دنیا خۆڵی بەسەرداکرد، شالۆم بانگی کرد: کاک عومەر لەو شوێنەی هەستە خەتەرناکە وەرە ئەو چاڵەی دەستەڕاست، گۆشەی مردووە، مووشەک نایگرێتەوە، تکایە خێراکە! یەک بەخۆی هاواری دەکرد. عومەر کوردی بێئەوەی بزانێ خاوەنی ئەو دەنگە کێیە، لەنێو ئەو تۆزو خۆڵەدا کەس دیار نییە، بەڵام بە قسەی کرد، شوێنەکەی خۆی گواستەوە، لە فکری ئەوەدا بوو ئاخۆ ئەو دەنگە کوردییە کێ بێت! تۆزی مووشەکی یەکەم نەڕەویبووەوە، مووشەکی دووەمی دروست لەو شوێنەدا کە پێشتر عومەر کوردی لێیبوو!

ئاخر شالۆم زۆر شارەزای بواری سەربازی بوو، چەندین مەشقو ڕاهێنانی کردبوو. ئەو چاڵەی عومەر کوردی بۆ نارد، لە ڕووی سەربازییەوە پارێزراوترین خاڵ بوو. دوای تەواوبوونی بۆردوومانەکە، عومەر کوردی، زانی لە لێواری مەرگ گەڕاوەتەوە، تۆزو خۆڵی لە خۆی داتەکاندو چووە بەر پەنجەرە بچووکەکە، چونکە بە گومان بوو ئەو دەنگە کوردییە شالۆم بێت، بەڵام لەوە دڵنیابوو سۆزی هاوزمانی ئەو دەنگە کوردییەو هاوخوێنی بووە هۆی بە زیندوومانەوەی. ئەو وای مەزەندەکرد بەرلەوەی ئەو پاسەوانییەکە وەربگرێ، کوردێکیش لەگەڵ شالۆمی لەو ژوورە بەندکرابێت. لە پەنجەرەکەڕا بە ژوورەکەیدا ڕووانی، بەڵام لە شالۆمی بەدەر، کەسی دیکەی تێدا نەبوو. شالۆم بە دەرفەتی زانی: کاک عومەر کوردی بە دوای چیدا دەگەڕێی؟ عومەر کوردی لەگەڵ ئەوەی سەری سووڕما کە شالۆم بە کوردی قسان دەکات، گوتی: یەک بانگی کردم، ئەتۆ چۆن کوردی دەزانی؟! شالۆم گوتی: کاک عومەر ئەمن بووم بانگم کردی ئاخر منیش کوردم، چما خوێن دەبێت بە ئاو! پێم ناخۆش بوو کوڕێکی هاوزمانم لەبەرچاوم بمرێ، عومەر کوردی گوتی: ئەتۆ جوولەکەی، کورد نی! شالۆم گوتی: ئەمن کوردێکی جووم خەڵکی قەڵادزێم، بۆ بیست ساڵ دەچێت لە قەڵادزێی زێدی بابوباپیرانم دەریانکردین، بەناچاری ڕۆیشتین بۆ ئیسرائیل. یەکەم هەنگاو، ئەوەی مەبەستی بوو گەیاندی. سەرەتا عومەر نەیدەویست گوێی لێبگرێ، وەلێ شالۆم یەکجار لێزانانەو ئارام ئارام بە ئیسفەنجێک غوبارو تەڵخی سەر شووشەی هزری دەسڕیو لە سەر هێڵی شەمەندەفەری توندڕەوی ئاینی دەیترازاندو هەوڵی دەدا بیخاتە سەر هێڵی نەتەوەییو هاوزمانیو هاوخوێنی و مرۆڤایەتی. گوتی: کاک عومەر ئێمە مرۆڤەکان لە

بنیادرا وەک یەک لە دایک بووین، دوایی بێئەوەی پرســمان پێبکەن، ناویان لێنان، بەکەیفی خۆیشیان هەریەکەو ئاینێکیان بۆ دانان‌و مەزهەبێکیشیان پێ هەڵواســین. هەر ئەوانیش فێریان کردین کێ فریشتەیەو کێ ئەهریمەنە؟ کێ لەســەر هەقە؟ کوشتنی کێ غەزایەو کوشــتنی کێ حەرامە؟ بۆ دەبێت ئێمەی مرۆڤ لە ســەر شــتێک یەکتری قڕو قەڵاچۆ بکەین کــە لە ئەزەلەوە کەم‌و زۆر، دەستی ئێمەی تێدا نەبووبێت‌و لێی بەرپرسیار نەبین؟ بەڵکو وەکو قوربانییەک بەســەرماندا ســەپێندراوە. هەرئاینە دەیەوێ ئاینی بەرامبەری خــۆی لووش بدات. بۆ بەپیرۆزکردن‌و بەجێهێنانیشــی وەک ئەرکێکی ئاینی، کوشــتارو قڕکردنی ئاینەکانی دیکە بە ڕەوا دەبینێ. بەهەقناســاندنی خۆی‌و، بــە ئەهریمەنکردنــی بەرامبەرەکەی، تەنهــا ئاینەکەی خۆی بــە قازییەکی یەکســانیخواز دەبینی! مرۆڤی ناخسپی‌و خاوەنویژدانی زیندوو و ژیر، گوفتار و ڕەفتــاری خــۆی بە ڕازیبوونی خەڵکــەوە گرێ نادات! گرنــگ نییە خەڵکی دەوروبەرت چی دەڵێن‌و چۆنت هەڵدەســەنگێنن کە ئایا تۆ زاڵمی یان مەزڵوم، گرنــگ ڕازیکردنــی ویژدانی خۆتە! بــۆی هەیە زۆرینە هەڵــە بێت! عومەر کوردی، هەرچەندە بە ڕوواڵەت مــۆن‌و بێدەنگ بوو، بەڵام هێدی هێدی لەگەڵ شالۆمی بە قســە دەهات، بۆ یەکەمجار ئەلفازی لەگەڵی گەڕا، بە پرسیارێک مۆنی‌و بێدەنگیی شکاند: بە چی دیارە ئەتۆ کوردی‌و خەڵکی قەڵادزێی؟ چۆن دەتوانی بیســەلمێنی؟ شالۆم ئەو پرسیارەی پێ خۆشبوو، بۆئەوەی ڕاستگۆیی خۆی بســەلمێنێ‌و باوەڕ بە عومەریش بهێنێت: نزیکەی بیســت ساڵ بەر لە ئێستا ماڵمان لە قەڵاتێ بوو لە قەڵادزێ. بە هەموو جووەکانی قەڵادزێ، چل‌و نــۆ موڵکی تاپۆمان هەبوو، بێجگە لەو موڵکــە تاپۆیانەش چەندین عەرزی

کشتوکاڵی‌و بێ تاپۆشـــمان هەبوو، زۆربەی زێڕینگرەکانی قەڵادزێ لەوسەری بازاڕی بۆ ئەوسەری بازاڕی، جووەکان بوون. مامو خاڵمو چەند جووەکی دیکە لە بەناوبانگترین زەڕینگەرەکان بوون. لە ڕانییەو خۆشناوەتیش خزممان هەبوون. لـــە بێتواتە (مالم) هەبوو، ئەویش هەر خزمی ئێمە بوو لە ژنانڕا. نەک تەنها لەو شـــوێنانە، بەڵکو لە سەرانســـەری عێراقدا جووەکان بڵاوبوون، دەسەڵاتی ئابووری بەغداو زۆربەی شارەکان لە دەســـتی جووەکاندا بوو. کۆچی جووەکان، لە ڕووی ئابوورییەوە کاولکاری‌و دارمانی لەدوای خۆی بەجێهێشـــت. تەمەنم دە ســـاڵان بوو، پێش ئەوەی لە قەڵادزێ وڵاتبـــەدەر بکرێین، چاکم لە بیرە خاڵم پیاوێکی مووســـڵمانی فێـــری زێڕینگری کرد، ناوی چی بـــوو! ناوی چی بوو؟ ئا، بیرم هاتەوە، ئەبرام، ئەبریم شـــتێکی وایان پێدەگـــوت، هەڵە نەبم چاوێکی کوێر بـــوو، دووکانی زێڕینگەرییەکەی لە نێوەڕاســـتی بـــازاڕی قەڵادزێ بوو. هەندێکمان، لەوانەی بەزۆری ئاینیان پـــێ گۆڕین، دەیانگۆتنێ بنجوو، یەک لەوانە حەمەدەمین، ژنێکیش ناوی عاســـمە ناحوم شـــلمۆ ئەوە هەر ئامۆزای دایکمـــە، ئەویش بنجووە، چەند بنجووی دیکـــەش. عومەر کوردی بەچاکی گوێی بۆ شـــالۆمی شلکردبوو، بەڵام نەیدەویست وا پیشان بدا کە گوێگریەتی. هەرچەندە یەقینی پەیداکردبوو کە شـــالۆم کـــوردەو هاوزمانی خۆیەتی، بەڵام بـــۆ قەڵادزێبوونەکەی دڵنیـــا نەبوو. هەرچەند جاری نۆرەی ئێشـــکگری ئەو بوایە، پێی خۆشـــبوو ئەو چیرۆکانەی بۆ بگێڕێتەوە. یەکێک لەو جارانە شالۆم گوتی: ڕق لە مـــاکـو بنچینەدا دایکی هەموو نەهامەتـــی‌و بەڵاکانە، بۆیە دەبێ بەر لە هەرشت ڕق لە ناخماندا بکوژین، تاوەکو کەسی پێ نەکوشتووین! لەسەر ئێمەیە لە ڕووی پێکەوەژیانەوە، گەردوون بۆ سەرەتاکەی بگێڕینەوە کە

مرۆڤایەتی یەک بنەچەی هەبووە، لە دەوری یەک ئاگردانی ژیان کۆبوونەتەوە. ئەوکات هێشـــتا مرۆڤـــەکان بەکەیفی بەرژەوەندیی خۆیان ئـــەو هەمووە لکـو پۆپەیـــان لێ جیا نەکردبۆوە. ئەمن وەکو جوویـــەک، ناڵێم هەق هەمووی لای ئیسـرائیلە، ڕەنگە ئەویش لە ڕەشـــەکوژی گلابێتو دەستی چووبێتە خوێنی پاکژی ژن و منداڵ و خەڵکی بێتـاوان. ئەمن باسی ئەوە دەکەم ئەگەر زلهێزانی بەرژەوەندپەرەست، ئێمە بەگژیەکدا نەکەن، بۆ دەبێت من کوردێکی قەڵادزەیی ببمە دیلی دەستی کوردێکی دەشتی هەولێری!

عومەر بە هەلی زانی درۆیەک لە شـالۆمی سـپی بکاتەوە،: ئەتۆ چۆن دەزانی ئەمن خەڵکی هەولێرم؟ شـــالۆم گوتـــی: زاراوەی هەولێریان دیارە، تەنیا هەولێریەکان وشـــەی دەرێم بەکاردێنن. شـــالۆم درێژەی بە قسەکانیدا. ئەگەر تەماعکاری بۆ ســـەر ماڵو موڵکـو زێرو زیـــوی کوردە جووەکان نەبوایە، ئەمن ئاژەڵداریـــی خۆم دەکرد، یان لە دوکانی زێڕینگەری لە بازاڕی قەڵادزێ خەریکی کڕینو فرۆشـــتن دەبووم. ئاخر ئەمنو ئۆرشـــەلیم کوجا مەرحەبا. لە گەرمەی قسەکانی شالۆمدا لەناکاو دەنگی فیداییەکی میسری قسەی شالۆمو گوێگرتنی عومەری لێک ترازاند: هاتم عومەر کوردی هاتم، بمبوورە درەنگ کەوتم، چارەگە ســـەعاتێک کاتی حەرامم خواردو دواکەوتم، با لە سەرم قەرز بێت، یان گەردنم ئازاد بکە! فیداییە میســـرییەکە بە عارەبی ئەو قسانەی لەگەڵ عومەر کوردی کرد، بێئاگا لەوەی ئەگەر هەموو پاسەوانییەکەی لەجیاتی فیداییە میسرییەکە بگرتبوایە، هەستی بە تێپەڕبوونی کات نەدەکرد، بەجۆرێک نوقمی نێو ڕووداوە نەبیســـتراوەکانی جووەکان بووبوو. هێدی هێدی ئەو باوەڕەی لا دروست بوو کە پێی ناوەتە ســـەرزەمینێکی هەڵەوە کە ســـەرزەمینی ئەو نییەو نە پاراستنی

ئەرکی ئەوە. دوای ئەوەی ئێشکگرییەکەی ڕادەستی میسرییەکە کرد، ڕۆیشت.

عومەر کوردی لە سەر جێگاکەی خۆی ڕاکشا، چاو بە مۆلەق هەموو ڕابردووی خۆی تەتەڵەکرد، پێی وابوو هەرگیز ژیان شەپازلەی ئاوای پێدا نەکێشاوە! ئەو هەستەی لەلا دروست بوو، ئەو لە جیاتی ئەوەی لە جیهانی واقیع نزیک بێت، کەوتۆتە جیهانی چیرۆکە خەیاڵیو ئالۆزیکییەکانو لە خەونی خەڵکانی دیکەدا دەژی! هەستی دەکرد بەو کارەی ئێستا دەیکات، جگە لە پەشیمانی، هیچی دیکەی بۆ نامێنێتەوە. جێگرتنەوەی باوکو خۆشەویستیی دایکیو سۆزی خوشکو براکانیو متمانەی خزمو خەڵکی ئاوایی لەدەستداوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: نا، نا، پەلە ناکەم. وەک هاتنەکەم بۆ ئێرە کە دوورو نزیک پەیوەندیی بە منەوە نییە، بڕیاری عەجوولانە نادەم. کێ دەڵێ ئەو جووە درۆ ناکات! هەر کە بەمۆڵەت چوومەوە کوردستان، بەوردی بە سۆراغی ئەو قسانەی شالۆمیدا دەچم، بۆئەوەی بگەمە ڕاستیو دروستی ئەوەی کە کوردێکی قەڵادزێ بووە؟ ئاخر کێ دەڵێ ئەو درۆ ناکات! خۆ بە گوێگرتن گوناهبار نابم، با هەموویم بۆ بگێڕێتەوە موو بە موو وشەکان لە زەینم تۆمار دەکەم، خوام لەو خوایەی درۆی بکات!

ئازاری گێڕانەوەی شێوازی دەرکردنی جووە کوردەکان لە زاری شالۆمی، لەگەڵ قسەی چەند موسڵمانێکی توندڕەوی گوندەکەی خۆیان، بەراورد دەکرد و پێکی دەگرتن، دژ بەیەکی و ئالۆزیی دژواریان لە هزری عومەر کوردیی دروست دەکرد. ئاخر ئەگەر ئەو قسانەی شالۆمی ڕاست بن، مانای ئەوەیە کوردە موسڵمانەکان زوڵمیان لە کوردە جووەکانی هاوزمانو هاوخوێنی خۆیان کردووە، نا نا، نابێ خۆشباوەڕ بم. لە نۆرەی پاسەوانیم، با هێندەم قسان بۆ بکات تاوەکو

زاری شـــلو کول دەبێت! چوزانم، هەرچی قســـان دەکات هەر خۆی پێ هەقەو، کەس بوێری‌و ویژدانی ئەوەی نییە ماف بداتە بەرامبەرەکەیشی‌و تاوێک خۆی بخاتە شوێنی ئەوەوە. وەڵڵا، ئەگەر ئەوجارە دەچمەوە، هیچ ناکەم هەتاوەکو ئەو قسانەی شالۆمی وەک پیازی سپی نەکەم، ئەوکات ئەگەر زانیم درۆی دەکات، دەبێت بەو دەســـتانە ڕەوانەی دۆزەخی بکەم! جوولەکـــەی کافر! ئەوکات دەڵێم تفەنگم لەدەســـت دەرچوو، چیم لێدەکەن با بێمنەت بن! ئەی ئەگەر قسەکانی ڕاست بوون‌و کوردە موسڵمانەکان ئەو دکرەساتەیان بەسەرداهێنابن!

لە دەروونی خۆیدا جەنگێکی بێئامانـــی بەرپاکردبوو. ئەی خوایە ئەوە چ قەدەرێکە؟ شـــالۆم کوردبێ‌و خەڵکی قەڵادزێ بێ و، هەر خەڵکی شـــارەکەی خـــۆی، بە تای کراســـی دەریانکردبێ! نا نا ئاخر ئەگـــەر درۆ بکا، بۆ هەرچەند جاری ناوی قەڵادزێ دێنێ هەناســـەیەکی ســـارد هەڵدەکێشـــێ؟ هەندێکجار فرمێسکیش بە چاویدا دێنەخوارێ، بۆ هێندەی چاو لە قەڵادزێیە؟ بە قسەی خۆی یادەوەری دە ساڵی منداڵی لەگەڵ ئەوشارە هەیە! هەرچەند دەکەم ناچێتە ئەقڵم، قەڵادزێ لە کوێ‌و ئۆرشەلیمی ئەوپەڕی دنیایێ لە کوێ؟!

نەخێـــر ئەگەر خەڵکی قەڵادزێ نەبوویێت چـــۆن دەکرێ ئەو هەموو ناو و وردەکارییانە بزانێت! وا چاکـــە پەلە نەکەم‌و بڕیاری عەجوولانە نەدەم، ئەوجارە مۆڵەتـــم وەرگرت، هەرچۆنێـــک بێت دەچم بۆ قـــەڵادزێ و وردو باریک دەچمە بنج‌و بناوانی و، ئەو قســـانەی شالۆمی لە بنجووەکان دەپرسم. ناشزانم قەڵادزێ دروســـت کەوتۆتە کوێ، هەر ئەوەندە دەزانم دەڵێن لەســـەر سنوورییە. یەکی شـــارەزا لەگەڵ خۆم دەبەم. ئەمن ئەو هەمـــوو ماندووبوونەی بکەم، ئەوجا لە خوام دەوێ نـــاوی بابی‌و خاڵی‌و مامی‌و زێڕینگرو جۆڵاو گلینجانو... کوڕە خۆ

هەموویم لەبیرە! ئەگەر یەک قسەی درۆ بێت، دەزانم چی بەسەردێنم!

ئەو بە شانو باڵی قەوارەی ئیسرائیلو زایۆنیدا هەڵناڵێ، تەنها داخو حەسرەتی ئەوەیە کە لە قەڵادزێ نیشتیمانبەدەریان کردییە. ئەگەر ڕاست بێت، دەبێت ئەوکات بیرێک لە حاڵی خۆم بکەمەوەو لە خۆم بپرسم ئەمن بۆ لێرەم؟! ئەو چەند ڕۆژانە عومەر کوردی لە دڵەڕاوکێدا دەژیت، خەیاڵە بەدو بێزارکەرەکانی وازی لێناهێنن. پێشتر کە شالۆم قسەی بۆ دەکرد، عومەر وەک گرنگینەدان بە قسەکانی، سەرنجی ڕووخسای نەدەدا، بەڵام ئێستا دەیەوێ تەواوی سیماو ڕووخساری لەکاتی قسەکردندا لە یادەوەریی خۆیدا تۆماربکاتو بیهێڵێتەوە.

ئەوجارە ئێشککگری عومەر کوردی کەوتە شەوێ، تامەزرۆی گێڕانەوەی چیرۆکەکانی منداڵی شالۆمی بوو لە شاری قەڵادزێ. شالۆم کە زانی عومەر کوردی گوێی بۆ دەگرێ، بە دەرفەتی زانی بەپەلە هەموو ئەو قسەو باسانەی ڕابردووی بۆ بگێڕێتەوە. عومەر نەیدەتوانی لە تاریکایی ژوورەکەدا، بەهۆی تیشکی کزی ئەو مۆمەی لەسەر لێواری دەلاقەکە دانرابوو بەچاکی ڕووخساری شالۆمی نەدەبینی. عومەر بەباشی گوێی لە قسەکان بوو، بەڵام پێی خۆشبوو، دەموچاو و شێوەیشی ببینێ، بۆ ئەوەی لە گۆڕانکارییە جەستەییەکانی سەر ڕووخساری شالۆم، لە کاتی گێڕانەوەکاندا، هاوتەریب پێکیان بگرێو هەڵیانبسەنگێنێ، پێی وابوو زۆر شتی دیکە هەیە ئەو دەبێت بیانزانێتو لێیشیان دڵنیا بێت.

عومەر کوردی بەرلەوەی بچێتە فەلەستینو لەوێ ببێت بە فیدایی، هەموو ژیانی لە گوندێکی دابڕاو لە جیهان، بەرێ کردبوو، وای دەزانی ئاقارو تخوبی خوداپەرستی لە سەر تیلەی مزگەوتی گوندەکەی ئەوان تێپەڕناکاتو

ئاینــــی هەموو دنیاش هەر ئەو ئاینەیە کە عومەر پەیڕەوی لێدەکات، بەڵام لە دوای ئەوە ئەو ماوە دوورودرێژەی کە لە قەپێلکی گوندەکەی خۆیان هاتەدەرێو چـــاوی دنیای بینیو تێکەڵاوبوونی لەگەڵ گـــەلانو کولتووری جیاواز، هەر لە مەســـیحییەکانی لوبنانو ئوردنو عەرەبەکانی فەلەســـتینو میسرو یەمەنو سووریاو لیبیاو بگرە تا ناسینی شالۆمو بیستنی زۆر چیرۆکی نوێی نەبیستراو کـــە یەکەمجار بوو بەرگوێـــی دەکەوتن، لـــە دوای هەموو ئەوانە ســـنووری بیرکردنەوەو تێگەیشـــتنی بۆ ژیـــانو دەوروبەرو خوداپەرســـتی گۆڕانکارییان بەســـەرداهات، لەوە تێگەیشـــت چەند ئاینێکی ئاســـمانیو یەکتاپەرستیی دیکەش هەنو پەیڕەوکاریشیان هەن.

تا ڕادەیەک لە فراوانیی دونیا تێگەیشـــتو گەیشتە ئەو باوەڕەی تاکو ئێستا بۆ خۆیو خەڵکی دەوروبەریشـــی تائەوپەڕی ســـادەییو بێ بیرکردنەوەو سەرنج نەدانە دەوروبەرو، بێئاگا لە گەورەیی دونیا، کاتیان بەڕێ کردووەو دابڕاوانە ژیاون.

ئـــەو بیرکردنەوانەش مێشـــکی عومەریـــان داگیرکردبـــوو و هەوڵی دەدا بەو توانســـتە ســـادەو کەمەی هەیەتی، زیاتر قوڵبێتـــەوە. عومەر بێئەوەی باگۆی قســـەکانی شـــالۆمی بداتەوە، نە بەچاکو نە بەخراپ، شالۆمی وەکو ڕادیۆیەک هەڵدەکردو گوێی لێدەگرت، وەک ئامێرێکی دەنگی باســـی ژیانی منداڵی خۆی لەگەڵ هاوتەمەنەکانی، بۆ دەکرد. تاوەکو ئێشکگرتنەکەی تەواو دەبوو، گوێی لێدەگرت، جارجار بۆ ئەوەی نەکوژێتەوە پرســـیارێکی دوو وشەیی لێدەکرد: بۆ پێت وایە ئیســـرائیل لەســـەر هەقە؟ شالۆم دەیگوت: نەخێر من شـــتی وام نەگوتووەو ناشـــڵێم، چونکە ئەمن بەچاوی خۆم بینیومە ئیسرائیل ڕەشـــەکوژی ئەنجامداوەو ژنو منداڵی بێتاوانیان خەڵتانی خوێن کردووە. لەو

جیهانە بێڕەحمەدا، هێز لەلای کێ بێت، ئەو لەسەر هەقە! من قسەم لەسەر هەقبوونی یەک لە لایەنە بەشەڕهاتووەکان نییە، ئەوەی منی شۆک کردووەو بۆ من جێگای سەرسوورمانە ئەوەیە، ئێمە دوو کورد، بۆ لێرە کەوتووینەتە بەرامبەری یەکتری؟ هۆکار چییە؟ دەمانەوێ یەکتری بکوژین؟! ئێمە هەردووکمانو هەموو مرۆڤەکان، تاپۆی ژیانکردنمان هەیە کە یەک خودا بەدەستی خۆی مۆری کردووە، بۆ دەبێت کەسانێک هەبن ئەو هەقە بە خۆیان بدەن، ئەو تاپۆیەمان لێ بستێننەوە! لەنێو قساندا، جارجار براچەی تۆپو مووشەک ئەو نێوەی ڕووناک دەکردەوە، بەڵام لەوان دوورەو نەبۆتە هۆکار بۆ بڕینی قسەکانیان. عومەر زیاتر حەزی بە چیرۆکەکانی منداڵی شالۆمیو شاری قەڵادزێ دەکرد، چونکە خۆی تێدا دەبینیەوە، ئەوە لەلای بووبووە گرێکوێرە کەسێک ئەوەندە گرێدراوی زێدی لە دایکبوونو منداڵیی خۆی بێت، ئاخۆ دەبێ هۆکار چی بێت بەر لە بیست ساڵ، شالۆمی گەیاندبێتە ئیسرائیل!

شالۆم هەستی بەو بیرکردنەوە قوڵەی عومەر کوردی دەکرد، هەناسەیەکی وەک حەسرەت بۆ دەرکردنی لە قەڵادزێ و ژیانی منداڵی لەو شارە، هەڵکێشا: وەکو ئێستام لە بیرە کوڕێکی منداڵ، هەر تۆزێک لە ئێمە باخۆشتر، نازانم ناوەکەی چی بوو، ناوەکەی... ناوەکەی، ئا، بیرم کەوتەوە گەزۆیان پێدەگوت. ئەو گەزۆیە سەر ڕێگای دوکانی لە خوشکو خزمو کەسوکاری جووەکان دەگرت، دەیگوت نایەڵم یەک کچی جوولەکە بچێتە دوکانو شت بکڕێ، هەتاوەکو ماچی نەکەم، هەر هەمووی ماچ دەکردن، لە کاتێکدا هەموو دەمانزانی لە دابی ئێمەی کورد ئازاری شەرەف لە ئازاری قامچی بەسوێترە. مامی دایکم لەگەڵ دوو کرێکاری دیکە کە هەردووکیان کوردی موسڵمان بوون بەیەکەوە

لە گڵێنجانی کرێکارییان دەکرد، گڵیان هەڵدەقەندو لەسەرپشتی کەرەکانیان لە تێرێیان دەکرد، بۆ سەربانی خانووەکانی نێو شاری، بۆئەوەی دڵۆپە نەکات. نیوەڕۆیەک لەکاتی نانخواردن گەرماییێکی زۆر بوو، دەیانەویست پشوو بدەنو هەر لە گڵێنجانەکە نانی نیوەڕۆ بخۆن، سێبەری کەندەڵانی گڵێنجانەکە تەنها جێگای دوو کەسی تێدا دەبۆوە، دوو کوردە موسڵمانەکە بە کوردە جووەکەیان دەگوت: ئێمە موسڵمانین دەبێت لە سێبەرەکە نان بخۆین، ئەتۆ جوولەکەی دەبێ لەبەر خۆرەتاوەکە نان بخۆی! ئەویش دەیزانی ئەگەر زۆرهات قەباڵە بەتاڵە! دەڵێ: باشە کێشە نییە!

لەو کاتەدا گڵێنجانەکە هاڕە دەکاتو دەڕووخێ، هەردوو کرێکارە کوردە موسڵمانەکە دەبن بە ژێرەوە. کرێکارە جووەکە لە حەژمەت ئەوەی هیچی پێناکرێو لە توانای ئەو بەدەرە بەغاردان دەڕوا بۆ قەڵادزێ و خەڵکی لە ڕووداوەکە ئاگاداردەکاتەوە. دایکم دەیگوت: ئەگەر قسەی هەندێک لە پیاوچاکانی شارەکە نەبوایە مامەیان دەکوشت، گوایە ئەو گڵێنجان ڕووخانە، خەتای ئەو بووە! هەندێک کەس هەر لە خۆڕا دەیانگوت: چۆن دەکرێ جوولەکەیەکی غەیرەدین بە سەلامەتی دەربچێتو جووتە موسڵمانێک ببن بە ژێرەوەو بمرن!

کەسانێک هەبوون ژیانیان لەگەڵ ئێمەی جوو پێخۆش بوو، ئەوانە کەمیش نەبوون، ئازاریان نەدەدایین، بەڵام ئەوانەی بەردەوام ئازاریان دەدایین زۆرینە بوون. باپیرم دەیگوت هەندێک لەو مەلایانەی لە شارە گەورەکان دەستی عوسمانییەکانیان لەپشت بوو و، وەک سمێڵ چەورکردن لیرەی زێڕیان وەردەگرت، کاریگەرییان لەسەر چەند مەلایەکی شارە بچووکەکانو گوندەکانیش

هەبــوو بۆ هاندانی خەڵکی لە دژی ئێمــەو دەرپەڕاندنمان. ئەوان پێیان وابوو هەر لە ئەزەلەوە، خودا ئەوانی لــە مەعدەنێکی ماقووڵترو جیاوازتر لە ئێمە، دروستکردووە! نیشتیمانبەدەرکردنی ئێمەی کوردە جووەکان، پەڵەیەکی شەرمە بە تەوێڵیانەوەو هەتا دونیا بە دونیایە هەر دەمێنێت.

شالۆم درێژەی بە قســەکانی دا: لە کۆتایی چلەکان کاتێک ئێمەیان وەک پنجکەگیایەک لە ڕەگوڕیشــەوە هەڵکێشاو وەک شتێکی پیس هەڵیاندایە ئەوپەڕی دنیا، ناچارکراین، ڕابردوو و خەونەکانمان لەوێ بنێژین، دروست لەگەڵ لیــرە زێڕەکان ژێر خاکمان کــردن. ڕێیان پێنەداین پەڕەتیــرەک[1]، بزگوڕێک چییە، لەگەڵ خۆماندا ببەین، قیســی کتێبو تێنووســی مەکتەبیشــیان لە من سەندەوەو لە دەستیان ڕاســتاندم. هەر هەموو ئەوەی بە درێژایی ژیان، بە ماڵداریو خاکەساری وەسەریەکمان نابوو، براکوردە هاوزمانەکانمان تاڵانیان کرد. داپیــرم هەندێک لیرەی زێڕی لە ناو کوببەو کفتــەو نۆردییە نانەکانی بۆ ڕێگا ئامادەکردبوو، شــاردبوویەوە، ڕێگایان لێگرتینو ئەوانیشیان دۆزییەوەو لەسەر دابەشــکردنی بەسەرخۆیاندا لێیان بوو بەشــەڕ، خەریک بوو یەکتری بکوژن! باپیرم هەتاوەکو مردیش بە حەسرەت بوو تەمەن مەودای بداتو جارێکی دیکە بچێتەوە سەر گردی حوسنیو گردمەیتەری. ئێمە کاتێک لە مەوتەنی خۆمان دەریانکردین، هێندەیان ســەرەدار بە ورگیەوەناینو ســووکایەتییان پێکردین، ناچاریان کردین ئیســرائیل بکەینە نیشتیمانی دووەم، کەسێک نەبوو داکۆکی لە مافەکانمان بکاتو بڵێ ئاخر ئەوانە حەوت پشتیان لەسەر خاکی کوردستان

---

١. پەڕەتیر: پەڕەمووچ، بوزگوڕ. کینایەیە بە شتی زۆر بچووک و کەمنرخ.

براوەتەوە، چۆن دەبێت لە سەر جیاوازیی ئاینی دەربکرێن‌و ماڵ و موڵکیان تاڵان بکرێ؟! ئێمە هیچ گلەییمان لە عارەبان نییە، گلەییمان لە برای هاوخوێن‌و هاوزمانی خۆمانە! ئێمە نامانەوێ لە کوردبوونمان ڕابکەین! باوەڕ بکە کاک عومەر کوردی، ئەوەی بۆم باسکردی، مشتێکە لە خەروارێک، بەشێکی زۆر کەمی ژیانی کولەمەرگیی ئێمە بوو لە نیشتیمانی ڕەسەنی خۆمان. ئێستاش شەوان خەون بە مەلەوانی چۆمی خاسی‌و خشخشۆکەی گردی حوسنێوە دەبینم. لەگەڵ منداڵانی قەڵادزێ بە دوای قەنگەلاشکان دەکەوتین. ئێمە ڕیشاڵی مێژوویمان لەسەر ئەو خاکەی باب‌و باپیرانمان داکوتابوو، وەک ڕەشەبا هەڵیانکەندین. دەستێکی ڕەشی لەعنەتی لە ڕەگوڕیشەی هەڵتەکاندین. بابم هەتا مردیش، بەردەوام باس و بیری قەڵادزێ و ژیانی ئەوێی دەگێڕایەوە. عومەر وای بەسەرهاتبوو هەستی بە کاتی پاسەوانیەکەی نەدەکرد، چۆن تەواو دەبوو! لەبەرخۆیەوە دەیگوت: ئەگەر وابێت من دەمێکە خۆم ونکردووەو بەر لە هەرشت دەبێ خۆم بدۆزمەوە! ژیان چ موجیزەیەکە ئەو گیانانەی ڕەگیان لە قوڵایی یەک خاکدا ڕۆچووە، چۆن پێک دەگەن‌و ڕەگیان دەگاتەوە سەر یەک! نائومێدی، تەواوی ڕووخساری عومەری سواق دابوو، وای هەست دەکرد بە دەستبەرداربوونی لە ماڵ و گوندەکەی‌و هاتنی بۆ فەلەستین، کە دوور و نزیک هیچ پەیوەندییەکی پێوەی نییە، بەو کارەی بەهای خۆیشی دۆڕاندووە!

لە دوای مەشق‌و ئەرکە سەربازییەکانیان، فیدایيە کوردەکان لە یەکتری کۆدەبوونەوەو کاتە بەتاڵەکانیان بە چیرۆک و جگەرەکێشان بەسەردەبرد. بێئاگابوون لەوەی عومەر کوردی لە کاتی ئێشکگرتنیش چیرۆکخوانی هەیە، بۆیە زۆر گرنگی بە چیرۆکەکانی ئەوان ناداو کەوتبووە دنیایەک کە پڕبوو لە

دڵەڕاوکێو ململانێ لە مابەینی درۆو ڕاستیو شکو یەقین!

هەندێک لە هاوڕێکانی هەستیان بە ناجێگیریی ڕەفتاری عومەر کردبوو، بۆیە سەریان دەخستە سەری: عومەر هەمیشە لەبەرخۆیەوە دەڵێ ئەوجارە بچمەوە یەکلای دەکەمەوە! دیارە مەبەستی ژنهێنانە، بۆیە تەنها بە جەستە لەلای ئێمەیە، ئاوا نوقمی خەیاڵاتی خۆی بووە! ئەو لەدڵی خۆیدا بڕیاری دابوو، ئەگەر بگەڕێتەوە کوردستان، ئەوجارەیان هیچ ناکات، تا کوردبوونو قەڵادزێیبوونی شالۆمی پشتڕاست نەکاتەوە، بۆ ئەوەی هەرچی زووە خۆی لەو دڵەڕاوکێیە ڕزگاربکات. لەو سەرو بەندەدا، ڕۆژی دوو پاکەت جگەرەی ڕیمی دەکێشا!

تازە پاسەوانیەکەی ڕادەستی ئەو فیداییە کردبوو کە دوای ئەو پاسەوان بوو. توورتوورەی گردبوونەوە فیرەی لێوەهات، هەردەمو دەست مەیدانی سەربازی پڕبوو لە فیدایی. لە سەرەتادا هەواڵی چالاکیی فیداییانەی هەموو بەرەکانی شەڕ خوێندرایەوە، دوایی، ناوی ئەوانەیان خوێندەوە خۆیان ئامادە بکەن بەیانی نۆرە مۆڵەتیانەو کاتی گەڕانەوەیانە بۆ لای کەسوکاریان. یەک لەو ناوانە ناوی عومەر کوردی بوو. عومەر بەیانی زوو ڕیشی تاشیو خۆی ئامادەکردو نانی بەیانی بەپەلە خواردو چایەکەی هەر بە گەرمی فڕکرد، وەک لەسەر ئاو و ئاگر بێت وابوو. بەڵگەنامەی مۆڵەتەکەی وەرگرت. ڕۆژی یەکەم لە ڕێگابوو بەرەو بەغداو ڕۆژی دواتر بۆ هەولێرو پێ بە پێ گەیشتەوە گوندی. سێ ڕۆژ لە مۆڵەتەکەی گوزەرابوو. خەڵکی ئاوایی دەستە دەستە دەهاتنە لای بەخێرهاتنەوەی لێبکەن. ئەوجارەیان جیا لە جارەکانی پێشوو، ئەو پیاوەپیرانەی دەهاتنە لای، عومەر لێی دەپرسین: جووە کوردەکان بەزۆری لە کوێ نیشتەجێ بوون؟ نەریتو بۆنە و جەژنەکانیان بەئاشکرا دەکەن؟ زۆر پرسیاری دیکەش.

یەک لە پیرەمێردەکان گوتی: خۆ (بەسە بنجوو)و (مریەم بنجوو)ی گوندی خۆمان لەوانن، ئەگەر بوێرن قسەی ڕاستت بۆ بکەن، هەردووکیان جوو بوون، ئیسلامیان کردن. ئەو هەولێرە پڕە لە بنجوو، فەقێ عەولاو کوڕەکانی هەموویان جوو بوون، سەنەگەیان لە سەر هەڵنەگرتن تاوەکو ئیسلامیان کردن.

مەلای گوندی هەر زوو گەیشتە لای عومەری، بۆئەوەی بەخێرهاتنەوەی بکاتو پارچە پاکەتە ریمەکەی وەربگرێ، بەڵام عومەر ئەوجارەیان نەپرژابووە سەر کڕینی دیاری بۆ هیچ کەس بە مامۆستاشەوە، بۆیە مەلا بە نیگەرانییەوە لە ماڵی عومەری وەدەرکەوت، بێئاگا لەوەی عومەر ڕەنگە هەر نەچێتەوە بۆ فەلەستین. مەلا لەسەر کۆسپەی دەرگای ئاوڕێکی دایەوەو وەک خاوەنقەرزێک لە قەرزارەکەی بڕوانێ: وا نەزانی لە بیرم دەچێت، ئەوجارەیان کە هاتییەوە دەبێت دوو پارچەپاکەت لەگەڵ خۆت بێنی! عومەر گوتی: خوا گەورەیە! دوای بەڕێکردنی مامۆستای ئاوایی، دیسان کەوتەوە ژێر باری خەمان، خەمی ئەوەی هەرچەندی سەری خۆی دێناو دەبرد، نەیدەزانی چۆن بچێتە قەڵادزێ، ئاخر نەک قەڵادزێ، ئەو، کۆیەشی نەبینیوە! لە خەیاڵی چۆنیەتیی چوونە قەڵادزێیدا بوو، کاکەڕەشو هیدۆ بۆ بەخێرهاتنەوەی وەژوورکەوتن. دوای هەواڵپرسینی یەکترو کورتەباسێکی شەڕەکانی ئیسرائیلو فەلەستین، عومەر ڕووی کردە کاکەڕەشی: ئەتۆ پیاوێکی، لە زۆرکەس پەیوەندی کۆمەڵایەتیت فراوانترەو زیاتر دەگەڕێیو لە هەموو شوێنێک برادەرو ناسیاوت هەن، دەمەوێ بچمە قەڵادزێ، نەشارەزامو کەسیش ناناسم، هەندێک ڕاسپاردەو پرسیاری گرنگم هەیە. کاکەڕەش وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی، دوو داوی سمێڵی دەکرۆشتو لە فکرانڕاچوو، بۆئەوەی ناسیاوێک، برادەرێکی قەڵادزەیی هەبێتو

بیری بکەوێتەوە. هیدۆ لەناکاو وەک شـــتێکی بەهاداری ونبووی دۆزیبێتەوە، هەستایە سەرچۆکانو بە دەنگێکی مژدەبەخشانە گوتی: دۆزیمەوە، ئەو برادەرەی لە حەپســـخانەی هەولێرێ لەگەڵمان بوو! کاکەڕەش لە هیدۆی ڕامابوو. هیدۆ گوتی: کوڕە ئەوەی بە کەرەمستانێی دەگوت جۆرابێن! ناوەکەی ئەرێ وەڵڵا بیرم هاتەوە، مام شەخسە، مام شەخسە! کاکەڕەش گوتی: ڕاست دەکەی، ئەوشەوەم هەر لەیادە، نیوەی شـــەوێ هەمووماني بەئاگاهێنا: ئەوەی تەنیشـــتم پەتۆی منی گۆڕیوە، ئەو پەتۆیە لە پەتۆی من تەســـکترە، پەتۆی من ئەســـتوورترە، لەجیاتی بڵێ تەنکترە، دەیگوت تەسکترە. ئەوڕۆژەی پۆلیسەکە مزگێنیی پێدا ئازادەو لە حەپسخانەی بێتە درەوە، پوولی دۆمینەکەی فڕێداو گوتی: حەللەلا توخـــوا بەرم دەدەن؟ عومەر زۆر دڵخۆش بـــوو، خەریکە ئەو گرێکوێرەیەی بۆ دەکرێتەوەو کارەکەی خەریکە ئاسان دەبێت!

کاکەڕەش گوتـــی: مام شەخســـە زۆر لەگەڵ هیدۆی برادەر بـــوو، هەر لە حەپسخانەی هەرێی پێدابوو ئەگەر ئازاد کراین بچین سەری لێبدەین، کەواتە ئێســـتا بە بەردێکی دوو کێلان دەشـــکێنی! بەیانی زوو لەگەڵ عومەری بڕۆنە قەڵادزێو ســـەلامی منیشی پێ ڕابگەیەنن! مام شەخســـە پیاوێکی ناندەرو دەســـتو دڵ کراوەو دیاربوو، ئەوە نەبوو هەموو جارێ دەیگوت: جێو ڕێم زۆرە بیست سوارئەسپم میوان بێت، هەموویان دادەمەزرێنم، زەخیرەو تفاقیشم زۆرە، ئەوەندە بێمنەتم لە میوانان، میوانو ژنێ خۆم پێ وەکی یەکە!

کاکەڕەشو هیدۆ هەگبەی یادەوەریی خۆیان لەگەڵ مام شەخســـەی بە نۆرە هەڵدەڕشت. کەوتنە سەر گێڕانەوەی قسە خۆشەکانی مام شەخسەیو ڕۆژانی حەپسخانەی هەولێرێ. مام شەخســـە بە تۆمەتی ساختەکردنی بەڵگەنامەو

هێنانی کەسێکی ئێرانی بۆ نێو خاکی عێراق تۆمەتبار کرابوو، ئەو کەسە بە تەسکەرەی مام شەخسەوە لە هەولێرێ گیرابوو. مام شەخسەش دەیگوت: ئەمن هیچ کارێکی خراپم نەکردووە، ئەو کەسە خزمی خۆمەو ماڵیان لە کوێستانێیە، هاتبووە ماڵی من لە گەرمێنێ، حکومەت هەر لە ختوخۆڕایی ئەو عیراقیو ئێرانییەیان بە قوونێمەوە نووساندووە، ئەوجا ئەمن خۆ بۆمبم نەداوەتێ بچێت لە هەولێرێ بیتەقێنێتەوە، پارچە کاغەزۆکەی بێزەڕی هێندەی لەپەدەستێکم داوەتێ پێی بچێتە هەولێرێ و بێتەوە! بەندییەکان بۆ ئەوەی مام شەخسەی تووڕە بکەن دەیانگوت: ئەوە قانوونە قانوون، ئەتۆ بە گوێرەی یاسا خەتات کردییە! مام شەخسە دەیگوت: کوڕە ئەمن دە قانوونێو نێمو لە یاسای بێتەدەرێ! بەندییەکان دەیانگوت: حکومەت ئەوەی نازانێ! مام شەخسە دەیگوت: ئەوجا حکومەت چ دەزانێ بە تڕێی هەڵمیزمو لە فسێ دایەی بەم!

کاکەڕەشو هیدۆ، دوای ئەوەی بڕیاریاندابوو بەیانی لەگەڵ سیوادی دا، هیدۆ و عومەر بۆ قەڵادزێ بەڕێبکەون، عومەریان جێهێشتو بەرەو ماڵی خۆیان گەڕانەوە. لە ڕێیە کاکەڕەش بە هیدۆی گوت: هەرچی لە تواناتدا هەیە یارمەتیی عومەری بدە! ئەوەشی لێ زیاد کرد: هەست دەکەم عومەر ئەو عومەرەی جاران نییە، ئەقڵی گۆڕاوە! بینینی چەند وڵاتێکی وەکو سوریاو لوبنانو ئوردنو فەلەستین، گۆڕیویەتی! تێکەڵاوبوونی بە کەلتوورو دابو نەریتی خەڵکانی دیکە لەو سێ ساڵی فیداییبوونی لە فەلەسەتین، بیرکردنەوەو دنیابینی لە پێشوو فراوانتر بووە. ئای گەڕان چۆن مرۆڤەکان دەگۆڕێتو چاوکراوەیان دەکات! هیدۆش هەمان سەرنجو تێڕوانینی لەسەر ئەو گۆڕانکارییە هەبوو کە بە سەر هزرو بیرکردنەوەی عومەریدا هاتبوو.

هیـــدۆ و عومەر، بە درێژایی ئەوڕۆژە هەر بـــە ڕێگاوە بوون بۆ قەڵادزێ، ڕۆژ هەر دوو باڵێکی مابوو خلۆربێتەوە ئەودیوی کێوەڕەشـــی، گەیشـــتنە قەڵادزێ. لەوســـەری بازاڕی بۆ ئەوســـەری بازاڕی، لە هەرکەســـێکیان دەپرسی ماڵی مام شەخســـەی لە کوێیە؟ هەرجارەی بۆ ماڵی شەخســـەیەکیان بەرێ دەکردن، بەڵام کاتێک لە دەرگایان دەداو چاویان بە خاوەنماڵی دەکەوت، لەگەڵ ئەو شەخسەیەی ئـــەوان هەر خوایان یەک بوو، ئەو شەخســـەیە نەبـــوو، بەنائومێدی دەیانگوت ئـــەوەش هەو نەبوو! هیدۆ ڕووی لەو دوو گەنجە کرد کە وەکو شـــارەزاو چاوســـاغ ماڵی شەخســـەکانیان پیشـــان دەدان، پێـــی گوتن: ئەرێ کاکە ئەو شـــارە چەند کەســـی تێدایە ناوی شەخســـە بێت؟ یەکیان گوتی: وەڵڵا ئێرە باشـــترە، ئەگەر بچییە هەڵشـــۆیێ هەر لە ســـەر گردی بانگ بکەی هۆ شەخسە، یان جوونەت، نیوەی گوندی وەڵامت دەدەنەوە. ســـێرە هەڵگیـــراو هێدی هێدی تاریک دەکەوت، خەڵـــک لە مزگەوتێ دەهاتنەدەر، ئەو خۆهەڵکوتانو خۆشـــڕۆییەی گەنجەکانو بەدواکەوتنی هیـــدۆ و عومەری، بوون بە جێگای ســـەرنجی نوێژخوێنەکان، لە گەنجەکانیان پرســـی: ئەوە چی ڕوویداوە؟ خێرە ئاوا بەپەلە دەڕۆن؟ گوتیان: ئەو دوو برادەرە لە هەولێرێوە هاتوون ماڵی مام شەخســـەیان دەوێ. لەو دەمەدا هیدۆ وەبیری هاتەوە: ئەو مام شەخسەی ئێمە دەمانەوێ دوو بۆ سێ ساڵ بەر لە ئێستا لەگەڵ ئێمە لە حەپســـخانەی هەولێرێ گیرابوو لەســـەر ئەوەی تەسکەرەی خۆی دابووە کەســـێکی ئێرانی، ئەویش ســـەفەری هەولێری پـــێ کردبوو. حاجییەک گوتی: ئێ ئێ دە وا بڵێن! ئەوە شەخســـەی ئامۆزامە، ماڵەکەی ئەوەتا لە پشـــت مزگەوتێیە! بەو درەنگانەی پاشنوێژی شێوان دەرگای ماڵی مام شەخسەیان کوتا. دەنگێک لە ژوورێوە هەستا: فەرموون فەرموون! بێئەوەی بزانێ کێن. گەنجەکان

بــۆ بەرچاوڕوونی گوتیان: مام شەخســـە میوانی هەولێرت هاتـــووە، وەرە دەرێ! لەگەڵ ئەو قسانە، گەیشتنە نێو حەوشەی. مام شەخسەش خۆش خۆش‌و بەدەم هاتنەپێشـــوازیی میوانەکان، بە گفتولفتێکی شـــیرین‌و یاخوا بەخێربێن، خێرو بەرەکەتتان هێناو ســـەرچاوم هاتن! هەرکە ســـەری وە دەرناو چاوەکانی لە هیدۆی چەقی، لە خۆشییان شاگەشکە بوو، باوەشی بۆ کردەوەو دەستی عومەری گوشی‌و فەرمووی لە گەنجەکان کرد، بەڵام گەنجەکان ماڵئاواییان کردو ڕۆیشـــتن. یەکەم پرســـیاری مام شەخســـەی ئەوەبوو: ئەی کوا؟ بۆ کاکەڕەشت لەگەڵ نییە؟ ئەدی قەولتان پێنـــەدام بەیەکەوە بێن بۆ قەڵادزێ‌و ســـەردانم بکـــەن؟! هیدۆ گوتی: کاکەڕەش زۆر زۆر ســـڵاوی بۆت هەبوو، لە هەواڵی دەپرســـیت، کاری هەبوو بۆی نەکرا لەگەڵمان بێت، بۆ کارێکی پێویســـت ئێمەی بۆ لای تۆ ڕاســـپاردووە. هەر کاری ئێوە، بە سەر هەردووک چاوم! سۆبەی بۆ گاڵدان‌و ژوورەکەی گەرم کرد. هەر لە بەینی دوو قسان دەیگوت: یاخوا بەخێربێن، سەر هەردووک چاوانم! نان خوراو چا خورایەوە، گوێزو مێوژو لەتکە هەنجیر لە ســـەر ســـینییەک، لە نێوەڕاستی مەجلیســـێ دانرا. لە گەرمەی گێڕانـــەوەی یادەوەریەکانی حەپســـخانەی بوون، لەناکاو لەو ماڵەی هاوســـێی دیوار بەدیواری ماڵی مام شەخسەی، بوو بە شەڕو فەرتەنەو زرمەی پێکدادان! مام شەخسە گورج هەستایە سەرپێ: دیسان کابرای ناڵبەندە لەگەڵ ئەو ژنە فیلەتەنەی کردوویە بەشـــەڕ، هەموو جارێش لێدانێ بە دەســـتی ژنەکەی دەخواو تەمبێش نابێت! کابرای ناڵبەند یەک بە خۆی هاواری دەکرد: هاوارە مام شەخسە فریامکەوە، بمگەیێ ئەو قەحپەداکە کوێری کردووم، هەرچی زووە بمگەنێ!

مام شەخسە ڕایکرد، هیدۆ و عومەر بەدوایەوە بۆ ماڵی ناڵبەندی. لە دەرگای

سوورِانەوە خۆیان بە حەوشـــەی ماڵی کابرایدا کرد، بینییان ژنێکی کەڵەگەتی بەخۆوەی ئەســـپەژن، ڕستەناڵێکی بەدەســـتەوەیەو ڕێک دەڵێی ڕستەبامیەی وشـــککراوەیە بە تەلێکەوە کراون! کابرای ناڵبەندیش لە نێوەڕاستیّ حەوشەی کە مەیدانی شـــەڕەکەیە، هەڵتووتاوەو هەردوو دەســـتی بە لاچاوییەوە گرتووەو لـــە بەینی پەنجەکانییەوە خوێن دێتەدەریّو بـــە چەناگەیدا دەچۆڕایەوە. دیارە لەگەڵ لێدانی ئەو ڕســـتەناڵە، لاجانگی هەڵتەکاندووە، وەک تاپڕی بە بناگوێی کەوتبێت! مام شەخســـە بەپەلە چاوی بە هەر چواردەوری خۆیدا دەگێڕا پارچە نایلۆنێک لەویّ کەوتبـــوو هەڵیگرتەوەو لوولیداو چەرخی لە گیرفانی دەرهێنا، ئاگری لە بابۆڵە نایلۆنەکە بەرداو ســـەرەوژێر ڕایگرت، بۆئەوەی بەباشـــی ئاگر بگری. بە ناڵبەندەکەی گوت: دەســـتت لابە دەســـتت لابە! لەو کاتەدا دەستی خـــۆی لە بەر نایلۆنە تواوەکە ڕاگرت، گۆڵمی پڕبوو لە نایلۆنی تواوە، لە ئازاری سووتانی دەســـتی جنێوێکی داو ئەو نایلۆنە قاڵبووەوەی لە لاجانگـو بناگوێی کابرای ناڵبەند هەڵسووی، هەر بە جارەکی شێتی کردو لە خۆی هەڵداو هاواری کرد: وای بابە سووتام! پێستی بەری دەستی مام شەخسەیو چەرمی لاجانگی کابرای ناڵبەندو نایلۆنی تواوە تێکەڵاو بە یەکتری بوون. توومەز مام شەخسە ئەو نایلۆنەی بە پارچەپەڕۆک زانیوەو چەند جار بینیویەتی سۆتەکی پەڕۆیان، وەک چارەسەرێکی ســـەرەتایی، لە ســـەر برینان داناوە. کابرای ناڵبەند هاوارو ناڵەی دەچووە ئاسمانیّو شوێنی بە خۆی نەدەگرت!

مام شەخســـەو میوانەکانی، وەک ســـیّ پاڵەوانـــی دۆڕاو گەڕانەوە ماڵیّ! هەندێک دەرمانی خۆماڵیو کوردەوارییانەیان لە دەســـتی مام شەخسەی داو لێی نووســـتن. بەیانی کاتێک لە خەو ڕابوون، مام شەخســـە گوتی: ئەری خۆ

ئەوشـــەو لەبەر ژانی نێو لەپم خەو لە چاوەکانم نەکەوتووە، خوا بکات دەســـتم سەقەت نەبێت باشـــە. دوای نانو چای بەیانی بە دەســـتی هەڵبەستراوەوە بە پێـــش میوانەکان کـــەوت بۆ بازاڕی. دووکەڵێکی شـــین تویژاڵێکی لەســـەر تەواوی شـــاری قەڵادزێ دروست کردبوو، شاباڵی دەگەیشتەوە بەری مام قاسمە و ســـەرتەپکان و داریَ والـــی و گربداغی. هەندێک لە لوولەی دوکەڵکێشـــی ســـۆبەکان بەجۆرێک جۆشـــدراون، بســـتێک ئاگریان لە لوولەیەوە دەردەچێت! مام شەخســـە دەیەوێت میوانـــەکان بەرێتە ئەو چایخانـــە بچووکەی بە زۆری پیرەمێردەکانی لـــێ کۆدەبوونەوە، کاتەکانیان بە گێڕانەوەی ڕابردووی خۆیان بۆ یەکتریو حەســـرەتی ئەوەی لە کیس چوو و ژیانی رابردوو و گلەیی لە ڕەفتاری خەڵکی ئێســـتا، بەســـەردەبرد، لە هەردوو بەری شـــەقامی نێو بازاڕی، یەک لەدوای یەک دوکانەکان دەکرانەوە. غرەی قەپەنکو دەڕابی دوکانەکان ئاماژە بوو بۆ بەیانییەکی نوێ. هەندێک خەریکی هەڵواســـینی کاڵاکانیانن و هەندێکی دیکەش بۆ نمایش هەندێک شتومەکی دوکانەکانیان دێننە دەرێ بۆ بەرچاوی خەڵک. لە چایخانە بچووکەکە وەژوورکەوتن، دوکەڵی جگەرە پەنگی داوەتەوە، دەڵێی ڕێوی قانگ دەدەن! سۆبەی داران لرفەی دێ، لە هەواکێشەکەیەوە جارجار فیشـــقەی دەکردو گوڕی ئاگری لـــێ دەردەچوو. چەند کورسییەکی داری سێ نەفەری بە بندیواری چایخانەکەوە دانرابوون، کاتژمێرێکی گەورە بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە، دوکەڵ ڕەنگی زەرد کردووە، لەگەڵ ئەژماردنی چرکەکان مڵچەیەکی وای لـــێ دێت دەڵێـــی حەچەی لە کـــەرێ دەکات، یان وەک چای دیشـــلەمە بخواتەوە، وابوو. بۆنی ســـووتانی داری نێو سۆبەکە پیاوی مەندەهۆش دەکرد. پیرەمێردەکان لە دەوری سۆبەکە لەنێو دوکەڵی جگەرە چاویان کوسکەکوسکی

بوو، بەحاڵ تروسکەی چاویان دەهات. بەخێرهاتنی مام شەخسەو میوانەکانیان کرد. بۆئەوەی میوانەکانیان چێژ وەربگرنو نامۆییان بشکێت، سەریان خستبووە سەر پیرەمێردێکی قسەخۆش کە چۆنیەتیی داخوازیکردنی کچێک بۆ حاجی ئەحمەدی ئامۆزای بگێڕێتەوە، ئەویش گوتی: ئەوە حاجی ئەحمەدی ئامۆزاشم بۆخۆی لێرە دانیشـــتووە، بەرەو ڕووە بۆیە بۆتان دەگێڕمەوە. ئەو ساڵەی ژنەکەی مردبوو هـــەزار ڕەحمەتی خوای لێبێت، حاجی ئەحمـــەد هاتو گوتی دەبێت لەگەڵم بێیت بۆ یەک لە گوندەکانی نزیک گەناوێ، دەڵێن گەورەکچێکی وەنێو ســـاڵ کەوتووی لێیە، مێردی نەکردووە بە تەنها لەگەڵ داکیدا دەژی، وەک باس دەکەن ئەو گەورەکچە بۆ من زۆر باشە، ئەگەر خوا بەقسمەتی بکات. ئەمنیش لەگەڵی چووم، گەیشـــتینە گوندەکەو ماڵی کچەکەمان بە پرسیار دیتەوە. کە چووینە ژوورێو سڵاومان کرد ژنێکی ڕەقەڵەی کەڵەگەت هەرچی گۆشتە پێوەی نەبوو، لەبەر چاوانم وەک نەخۆش بێت، بەخێرهاتنی کردین. حاجی ئەحمەدی ئامۆزام هـــەر زوو گوتی بە خوای ئەمن زۆرم بەدڵییـــە. گوتم ئەدی داکت لە کوێیە؟ گوتی چۆتە باوزێ بۆ تازیەی خزمێکمان ئەمری خودای بەجێهێناوە. چوو لەنێو ژێر پیاڵان هەندێک نۆکی برژاوی بۆ هێنایـن، ئەمن هەر زوو گوتم: دایکەکەم لە پێشـــە منی دامەنـــێ چونکە ددانی ئەو نۆکـــە ڕەقانەم نەماوە پێیان بهـــاڕم! حاجی ئەحمەد گوتی: داینێ ئەمـــن دەیانخۆم، ئەوجا با حاجی ئەحمەدی ئامۆزام بە خۆی بۆتان بگێڕێتەوە، چونکە ئەو خۆشتری دەگێڕێتەوە! جاجـــی ئەحمەد گوتی: ئەمـــن وا حاڵی بووم کە ئـــەو نۆکەڕەقانەی بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە هێناوە بزانێ ددانم ماون یان نا! ئەمنیش بە فیزێکەوە لەوکاتەی هێشـــتا لێی دەڕوانیم، دوو دەنکەنۆکم هەڵگرتو گەنجانە هەڵمدانە نێو زارم،

دوو ددانم لە پشـــتەوەی حەوشـــەی زارم پێ شـــک دەهات، یەک ددانیشیان لـــە بەرامبەردا مابوو، لە دارەتی دنیایێ ئەو ســـێ ددانەم مابوون. بە زمانی، هەردووک دەنکەنۆکەکانم بردە ســـەر ددانەکان بە ددانە تاقانەکەی ســـەرێش هەتاوەکو هێـــزم هەبوو دامگرت بۆئەوەی کچەکە گوێـــی لە خرمژنی هاڕینی نۆکەکان بێت. هەرسێک ددانم لەگەڵ دوو دنکە نۆکەکان شکانو چاوم تاریک بوو، وام مەزەندە کرد شەویلاکیشـــم شـــکابێت! کچەکە لـــەو کاتەی دڵنیابوو نۆکەکانم شـــکاند، ڕۆیشـــتە دەرێ، ئەمنیش بە فرســـەتم زانی بۆ ئەوەی بزانم ددانەکانم چییان بەسەرهاتووە، قەفی پشتێنەکەم کردەوەو هەموویم تفاندەوە نێو پشتێنەکەم، پارچەی شکاوی هەرسێک ددانەکانمو هەردووک دەنکەنۆکەکان لە خوێنێدا ســـوور هەڵگەڕابوون. گوتم هەستە با بڕۆین ئەمن ئەو ژنەم ناوێ، هێشتا نەمهێناوە ئەوە سێ ددانم لەسەر دانا، ئەگەر بیهێنم داخوا چ پەندێکم بەســـەرێنێ! ئەگەر هەموو ســـاڵێ دوو کوڕی دووانەی کاکۆڵ زێڕینیشـــم بۆ بێنێ ئەوجا هەر نامەوێ! ئەو بەسەرهاتەو چەند قسەی دیکەیان هەمووی بۆ ئەوەبوو میوانەکان شەرمیان بشـــکێو هەندێک پێبکەنن. ئەوکات بەکاوەخۆ گوتیان کا شەخســـە ئەو میوانانەت لە کوێرا هاتوونو بۆ کوێ دەچنو خەڵکی کوێن؟ مام شەخســـەش گوتی: ئـــەو میوانانەم خەڵکی دەشـــتی هەولێرێن، هاتوون بۆ چەند پرسیارێکـو سۆراخی ئەو جووانەی لە کاتی خۆی لە قەڵادزێ بوون، لە بابـو باپیرانەوە خەڵکی قەڵادزێ بوون. یەک لە پیرەمێردەکان دەستی دایە گۆپاڵەکەیو لە چایخانەکەی وە دەرکەوت، باریکەی دایێو خۆی دزییەوە. حاجی ئەحمەد گوتی کاکە ئەوەی ئێســـتا ڕۆیشـــت یەک لەو بنجوانەیە، کە موسڵمان بووە. عومەر ناوی هەموو ئەوانەی هێنا کە شالۆم بۆی باسکردبوون.

ڕووداوەکان هەموو، ڕووخانی گلینجانەکەو هەر هەموویان بە زیادەوە پشتڕاست کردەوە. یەکیان ئەوەشـــی گوت: کە ژنیان بۆ هێنام بەسواری، ماینێ جووێکیان ناچارکرد جڵەوی ماینەکەی بووکێ ڕابکێشێ، چونکە پێیان شەرم بوو موسڵمان ڕێشمەی ماینی بووکێ ڕابکێشـــێ! یەکیان گوتی: ئەبریمەکوێر خزمی منە، ئەوەی فێری زێڕینگری کرد ناوی شـــالۆم بوو. عومەر ئەوەی مەبەستی بوو بە زیادەوە دەستی کەوت.

عومەر کوردی گەیشـــتە ئەو باوەڕەی ئەو چیرۆکانەی لـــە بارەی ئازاردانو سووکایەتی پێکردن بە کوردە جووەکانو نیشتیمانبەدەرکردنیانو تاڵانکردنیان، زۆر لەوە زیاترە شـــالۆم بۆی باســـکردووە. ئەوەی ئەو باسی کردووە مشتێکە لە خەروارێک، ئەوەی زاندراوەو ئاشـــکرابووە بەشێکی کەمە لەوەی بەسەر کوردە جووەکانیان هێنـــاوە! عومەر بڕیاریدا نەگەڕێتەوە فەلەســـتینو لە گوندەکەی خۆیان، ببێتە کۆڵەکەی ماڵەکەی خۆیان، ببێتە ئەو ســـێبەرە ئارامبەخشە بۆ سەر سەری دایکو خوشکو براکانی کە دەمێکە پێویستییان پێیەتی خەندە بخاتە سەر لێویان و، ژیانێکی نوێ دەست پێبکاتەوە. بەتەواوی خۆی یەکلایی کـــردەوەو لە دڵەڕاوکێو ڕاڕایـــی خۆی دەربازکرد، لەبەرخۆیـــەوە دەیگوت: ئەو ســـڕو تەلیسمە چییە پێیەکانم لەسەر خاکی گوندەکەمانو لە بەردەرگای ماڵی خۆمان هێندە مەحکەم چەسپیوە؟!

هـــەر کە یەکجـــاری بڕیـــاری نەگەڕانەوەی بۆ فەلەســـتینو دەســـتبەرداری فیدایبوونی دا، وەک ئەمانەتپارێزییەک جلوبەرگو شەپقەو پۆستاڵ و شتەکانی ڕێکخراوی ئازادیی فەلەستینی، لە گونییەک خستن و لە نووسینگەی هەولێری ئەو ڕێکخراوە بۆی ڕەوانە کردنەوەو دەستبەرداربوونی خۆی لێیان ڕاگەیاند.

بە بڕیاری نەگەڕانەوەی بۆ فەلەستین، شادیو بەختەوەری ڕووخساری هەموویانی داپۆشی، بە تایبەتی خوشکە بچووکەکەی، شەوان بەرلەوەی بخەوێ، پشتێنەکەی کاکی لە دەستی خۆی گرێ دەداو سەرەکەی دیکەی لە دەستی کاکی، وەک دەستبێنی شوانی، بۆئەوەی هەرکاتێک کاکی ویستی بڕواتەوە، بە ئاگابێتو ڕێگای نەدات بڕواو جارێکی دیکە جێیان بهێڵێت! هەستیان دەکرد ئیدی تەنها نینو، کوڕەکەیان دەبێتە چەتر بۆ خێزانە بێسەرپەرشتەکەی.

مەلای گوندیو چەند کەسێکی کەم لە نزیکەکانی، لایەنگری ئەوەبوون عومەر بگەڕێتەوە بۆ فەلەستین. بە تێڕوانینی ئەوان دەبوایە ئەو غەزایە تەواوبکات کە بەر لە سێ ساڵ دەستی پێکردبوو، تاوەکو جوولەکەی سەر زەوی نەفع دەکەنەوەو ئیسرائیل لەسەر نەخشە دەسڕنەوە. لە کاتێکدا ئەوان هیچیان ئامادە نەبوون کوڕێک یان برایەکی خۆیان بۆ ئەو غەزایە بنێرن!

عومەر، لە ئەنجامی گەڕان بە چەند وڵاتێکی عەرەبیدا، لەوێ بینیبووی کێڵگەی بەخێورکردنی پەلەوەر هەیەو چەند هەزار مریشکێک بە یەک جار بەرهەمدێنن. ئاواتەخواز بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەگەر گەڕایەوە، پرۆژەیەکی لەو جۆرە دروست بکات، خەڵکی گوندی لەو پێشکەوتنە ئابوورییە ئاگاداربکاتەوە، بۆئەوەی لە گوندەکانی دەوروبەریش چەند کێڵگەیەکی لەو جۆرە دروست بکەنو بەرهەمەکەی بچننەوە. بەڵام هەرچەندی ئەو گوتی، کەس نەبوو گوێی لێبگرێو بە دەنگییەوە بێت، باوەڕیان بە شتی لەو جۆرە هەر نەبوو، پێیان وابوو خەیاڵپڵاوە، باوەڕیان بەوە نەدەهێنا بە ماوەیەکی کەم، چەندهەزار مریشکێک لەنێو یەک هۆڵ بەرهەم بێت! دەیانگوت: ئەوە ناچێتە ئەقڵەوە، ڕەنگە عومەر

ئەقڵی لەدەستدابێت!

عومەر، ڕۆژانە پاچو خاکەناسی دەخستە سەر ملیو دەچوو بۆ ئەو زوورگە بەردەڵانانەی کە بە کاری کشتوکاڵ نەدەهاتن، بە نیازی ئەوەی بە تاقی تەنها جێگای دەواجنێک خۆش بکاتو هەر بەتەنهاش ئەو کارەی دەست پێکرد. بەڵام عومەر نە پارەی هەبوو نە دەستی کارو نە کەسیش باوەڕی پێدەکرد ئەم بیرۆکەیە سەربگرێ، بۆیە کەس لای لێ نەکردەوە. عومەریش مکوڕ بوو لەسەر بەجێهێنانی خەونەکەی کە دەمێک بوو بەڵێنی بە خۆی دابوو، ئەگەر گیانی بەسەلامەتی دەربازبێتو بگەڕێتەوە گوندەکەی، یەکەم کارێک کە بیکات ئەو پرۆژەیە دەبێت. تا وای لێهات خەڵکی گوندی دەیانگوت: ئەو کوڕە عەلەمی لێ نەبوو، ئێستا ئاوا تێک چووە! ئێمە لەوەتای بە بیرمان دێت مریشک هەر لە کۆلیتو کولانەو گۆشەی خانوویەکدا دەنرێتەوەو جووجکەی هەڵدێنێو قەت نەمانبیستووە مریشک لەو دەشتە چۆڵەی بندرێتەوە! بەشێکی گوندنشینان هەر بە عاجباتییان دەزانیو دەیانگوت خوا لێی گۆڕیوە، داخوا چ بێ ئەمرییەکی خوای گەورەی کردووە!

ئەو چوونەدەشتەو، دوورکەوتنەوە لە قسەوقسەڵۆکی خەڵکو جەنجاڵی گوندی، ئارامی پێدەبەخشی. لەجیاتی ئەوەی بێن لێکدانەوە بۆ ئومێد و ئاواتەکانی بکەن، قسەی سەیروسەمەرەیان بۆ دروست دەکرد، یەک دەیگوت: عومەر ڕۆژ تا ئێوارە لەجیاتی مریشک قالۆچان کۆ دەکاتەوە، هەبوو دەیگوت: قومقومۆکان دەکوژێو بەدوای مارمێلکان دەکەوێ، ئای خوایە حاڵان لە کەس نەگۆڕێ! ئاخر بڵێ، ئەتۆ ژنی مریشکەکورکی دابنێیتەوە! هەموویان زاریان لێدەکردەوەو پێدەکەنین، بێئاگا لەوەی زۆربەیان پێویستییان بە پزیشکی

دەروونـــی هەبوو، نەیاندەزانی بیماری دەروونین! تەنها کاکەڕەش‌و هیدۆو چەند کەسێکی کەم گوێیان بۆ عومەری ڕادەگرت‌و گواستنەوەی ئەو ئەزموونەیان لا پەسەند بوو. لە شانســـی عومەریش، ئەوان نە پارەی پرۆژەیەکی وایان هەبوو، نە کاتی یارمەتیدان‌و دەستگیرۆیی عومەریان پێدەکرا. عومەر دەیگوت زۆری دەوێ هەتاوەکـــو خەڵک لە خەونەکانم تێبگەن، ئەمن پیاوێکی ســـاغم، تاکە کێشەم ئەوەیە خەڵک لێم تێناگەن‌و ناشـــیانەوێ تێمبگەن، ئەو جیاوازییەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوان ئەمن بە شـــێت بزانن. مەلای گوندیش لەگەڵ چەند کەســـێکی دەوروبەری خۆی، دەیانگوت: ئەو کوڕە خـــودا لێی گۆڕیوە، هەقە بیبەن بۆ ئۆمەرمەندان‌و دەســـتەو دامێنی شـــێخان بن‌و خۆیان باوێنە ماڵی پیاوچاکان، لەوانەی شـــێت‌و هاریان لە دەرکێ چاک دەبێتەوە! مەلا دەیگوت: بە قورئانی لەســـەر ڕانی چەپم داناوە، بچێتەوە فەلەستین‌و غەزای جوولەکان، عەلەمی لـــێ نامێنێ! مـــەلا ڕۆڵێکی گەورەی لـــە دژایەتیکردنی پرۆژەکەی عومەری هەبوو و بە کارێکی شـــێتانەی دەزانی. هەتا دەهات عومەری زیاتر گۆشەگیر دەکرد، چونکە خەڵکی دەوروبەری، وەک خەڵەفاوێک هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد. هەموو کێشـــەو جیـــاوازی‌و بگرەو بـــەردەی عومەری لەگەڵ دژەکانی ئەوەبوو، عومـــەر دەیگوت: ئەمن بەچاوی خـــۆم کێڵگەی پەلەوەرم بینیـــوە، ئەوانیش ئەقڵیان نەیدەبڕی. عومەر، هێنـــدە لەو خەڵکەی پڕ ببوو، لە حەیفان خـــۆی دەخواردەوە. ناهەقی نەبوو، لەباتیی ئەوەی پشـــتگیری ئەو پرۆژەو بیرۆکە جوانەی بکەن، کەچی پێیان دەگوت: بە ئاشکرا دیارە تێکچووە، لەجیاتی ئەوەی تۆڵەی خوێنی بابی بکاتەوە، جێی دایکی گرتۆتەوەو دەیەوێت مریشـــکەکورکی دابنێتەوەو جووجکە مریشـــکان بەخێوبکات! ئەو توانجە

بریندارکەرانە، ئەو قسە هەڵیتو پەڵیتانەی خەڵکی، وایان لێدەکرد، هەست بە لاوازی بکات. مەلای گوندیش هەر لەسەر دووجار بیستی خۆی بوو، عومەری هەر لەنێو دوکەڵی جگەرەی ڕیمدا دەبینیو هەستی بە بوونی دەکرد، خەمی لە دەستچوونی دوو پارچە پاکەتە ڕیمەکەی، پێ لە خەمی عومەری گرنگتر بوو، هەموو هەوڵی خۆی دەدا ناچاری بکات بچێتەوە فەلەستینو درێژە بە فیداییبوونەکەی بدات. زۆربەی خەڵکی ئاواییش تەماشای زاری مەلایان دەکرد، بۆیە دووریان لە عومەری دەکردو بە شێتییان دەزانی. عومەر دووچاری بارێکی دەروونی ئاڵۆز بووبوو، ڕۆژگارێکی لێوڕێژ لە پلار و لۆمەکاری بەسەردەبرد، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وێرانتری دەکرد.

سەرەڕای تۆمەتی شێتیو خوا لێگۆڕینی، بێغیرەتیو خاوەنداری نەکردن لە خوێنی باوکیشی هاتبووە سەر. هەموو هەوڵی خۆیان چڕکردبۆوە بکوژی باوکی پێ بەکوشت بدەن. عومەر، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئافاتی زیاتر دادەبارینە سەر تەبارەی ئومێدی. زۆربەی خەڵکی دەوروبەری، بە باسی پیاوانەو تۆڵەسێنی هانیان دەدا، بۆئەوەی بەسەر تەڵەیەکیدا بدەن. جۆشێکی گەرمی تۆڵەسەندنەوە لە دەمارەکانیدا دەگەڕا، وەک بیەوێ گڕکانێک لە ناوەوەیدا بتەقێتەوە. دایکی، بەهۆی ئەو تۆمەتو لۆمەو تیروتوانجەی ئاڕاستەی دەکرا، هەستی بەو بارە دەروونییەی کوڕەکەی کردبوو. ناچاربوو مەیلی دایکانەی خۆی، لە دوعا بێکۆتاییەکانی خۆیدا ئارام بکاتەوەو تا ڕادەیەک ئومێدیان لەسەر هەڵبچنێ، بەڵام دەمێکە گوتوویانە: ئەگەر بە دوعا دەبوو، قشپل بە خورما دەبوو! عومەر گەیشتە ئەو باوەڕەی، ئەو خاکەی تێیدا گەورەبووە، جێگای ئەوی تێدا نابێتەوە، پێی لەسەر هەرکوێ دادەنێ، وەک پێی لەسەر دۆزەخ دابنێو، لە ناخۆشترین

ڕۆژگارەکانی تەمەنی خۆی دەژیا! لە سیوادی بەیانی تاوەکو زەردەپەڕی ئێواران، لە دەشتودەرو ئاقاری گوندی بەسەردەبرد، قسەی خەڵک وێرانی کردبوو: لۆمەی عەبدان لـــە عـەزابی قەبری بە ئازارترە! جگە لە بڕیاردان بۆ کوشـــتنی بکوژی باوکـــی، هیچ ئاوێـــک تواناى شووشـــتنەوەی ئەو شـــەرمەزارییەی نییە، هیچ ڕێگاشـــی بۆ دەربازبوون لە بەردەمدا نەماوەتەوە. ئەو بڕیارەی تەنها لەبەرئەوە نەبـــوو، تا تۆڵەی خوێنی باوکی بکاتەوە، بەڵکو بۆ دەمکوتکردنی خەڵکی بوو، لایەنی کەم تۆمەتی بێغیرەتی لەسەرشـــانی خـــۆی لا بدات. هەرچەندە بڕیاری دابوو بـــۆ خۆی بژی، بەڵام ئەوە نییە خەڵک دەســـتی لە یەخـــەی ناکەنەوە بە ئارەزووی خۆی بژی! تا دەهات گۆشەگیرتر دەبوو، لە ژیانی نێو خەڵکی بێزار بوو، خووی بـــە چۆڵەوانییەوە گرتبوو، بێدەنگـو کزۆڵە لەگەڵ خۆی دەدوا: ئاخر ئەمن گوناهێکی گەورەم کرد، گوتم وا چاکە کێڵگەی پەلەوەر دروســـت بکەین! ئێستا بۆی ئاشکرا بوو، بیرۆکەی پرۆژەی لەو جۆرە، چەند قات لە سەرووی تێگەیشتنو ئەقڵی ئەوانە، لە جیاتی ئەوەی بێن مەبەستی من شەنوکەو بکەن، دەمکەن بە شێتو گاڵتەجاڕ! سەیرە، ئەو هەموو سوخرەو بێگارو نادادییە دەبینن قسەشیان لەسەری نییە، کەچی کێشەیانە لەسەر شێتیو ئاقڵیو بەغیرەتیو ترسنۆکیی من. ناکرێ ئاوا ســـووکـو ئاسان وەکو گاجووت ملم بۆ نیری کۆمەڵە کەسێکی گەوجو نەزان درێژ بکەم، چۆنیان بوێ ئاوام لێبخوڕن!

عومـــەر تەنها کاکەڕەشو هیدۆی بە هاودەنگـو پاڵپشـــتیی خۆی دەزانی، لەوکاتەی خۆی لە گێژەنێکدا دەبینییەوەو کەوتووەتە پەلەقاژەو کەسێک شک نابات دەستی بگرێت، دروست لەو کاتەدا، کاکەڕەشو هیدۆ تاژییان لە ڕستێدا بوو لەو ئاقارەی خەریکی ڕاوەکەروێشـــکی بوون. لـــە گردۆلکەیەکی بەردەلان

سـەرکەوتن، بینییان عومەر خەریکی پاچکارییەو خۆی لە ئارەقەیدا شـینو مۆر کردیە، سڵاوی لێدەکەنو هەواڵی دەپرسن. دەبینن بەراورد لەگەڵ ئەوکاتەی لە فەلەسـتین گەڕایەوە، ئێستا زۆر کزو بێورە دێتـە بەرچاو! عومەریش کە ئەوان دەبینێ، دروسـت لەوکاتەی لـە فکری ئەواندا بوو، سـەری ڕادەژەنێو واقـی وڕدەمێنێ! کاکەڕەش گوتی: هەرکارێکـت بە ئێمە ڕایی دەکرێت بۆتی دەکەیـن. عومەر گوتی: تەنها ئەوەی لە ئێـوەم دەوێت بڕە پارەیەکم هەیە بۆم بە دەمانچەیەک بدەن، چونکە من لە نرخو باشـیو خەراپی هیچ شـارەزاییم نییە. ڕۆژانە بەتەنها لەو دەشتە چۆڵەیمە حەز دەکەم دەمانچەیەکم پێ بێت. کاکەڕەش گوتی: بەسـەرچاو بۆ دەمانچە کڕینەکە خەمت نەبێتو وا بزانە لە بەرپشـتێنتە، تەنها داواکارییەکم لێت هەیە، ئەمـن دەزانم تۆ ئەو پرۆژەیەی باسـی دەکەی بە چاوی خـۆت بینیوتە، بـەڵام ئەوە پارەیەکی زۆرو دەسـتی کاری دەوێت، کەسـیش ئامادە نییە هاوکاریت بکات، بۆیە پێم باشـە دەستی لێهەڵبگریـت! بەڵام کوا عومـەر ئەو ئامۆژگارییەی بە مێشـکدا دەچێتو گوێیان لێدەگرێت.

عومەر بە هۆکاری ئەوەی لە خەونەکانی تێناگەنو شکسـتیان پێی هێنا. بڕیاریـدا لەدوای کوشـتنی بکوژی باوکـی هەرگیز نەگەڕێتـەوە بۆ گوندیو دەسـتبەرداری ماڵی خۆیشیان بێت، سـەری خۆی هەڵبگرێتو بۆ شوێنێکی هێندە دوورەدەست بڕوات، دێوەرەو گڵەسەرفرۆشیشی نەگەنێ! وەک خوا لە دڵی نابێت، دواپین دیداریەتی لەو گوندە، ئیدی تاوهەڵاتن لەو گوندە نابینێتەوە!

دوای ئـەوەی دەمانچەکەی بەدەستگەیشـتو جێو ڕێـی بکوژی باوکی دۆزییەوە، کەوتە پلاندانان بۆ کوشـتنی. بکوژەکە تـا ڕادەیەکی زۆر دڵنیایی

هەیە ئەگەری کوشتنی دوورکەوتۆتەوە، چونکە کەسی وا نییە مشووری کوشتنی بخوات، تەنها عومەر کوڕی گەورەیەتی، دوای هەواڵی شێتبوونی عومەرىو بە دەشتێ کەوتنی، جۆرێک لە دڵنیایی بۆ دروست بووبوو، بەو حاڵەشەوە هەمموودەم دەمانچەی سواری لە بەرپشتێنیدابوو.

ئەوڕۆژە، خۆر لە کەلێنو پەنای هەورەکانەوە چاوشێلکانێی لەگەڵ حەشیمەتی خەڵکی هەولێرو بازارییەکاندا دەکاو هەر زوو هەڵیدەبرینگێنێو دەبێت بە هەتاو. لە کەلێنی هەورەکانەوە خۆر لە قەڵاتێ دەداو لە بن قەڵاتێ دەبارێ، بە جۆرێکە نە دەتوانی بڵێی ڕۆژ خۆشو هەتاوە، نە دەتوانی بڵێی هەورو بارانە، زوو زوو پێچەوانە دەبێتەوە. بکوژی باوکی عومەری، بەبێ ماستی مەڕی پشترێیێ ئیدارە ناکات، پیاوێکی ڕەقەڵەی داڵەی مسریگۆشتە، دوو چاوی زەقی گروانیو سمێڵێکی ڕەشی پێوەیە، بەرەو ئەو دوکانە کەوتۆتەرێ کە مەڕدارەکانی گوندی مەنجەڵەماستەکانیان لەلای وی دەفرۆشن. مەنجەڵەماستێکی مەڕی دەکڕێ، بێئاگا لەوەی لەو ماستە ناخوات! دوو کەس بۆ هەتا هەتایە لەبەرچاوان ون دەبنو دەبنە خەونو خەیاڵ! خەڵکی گوندیش تەنها ئەوەندەیان بۆ دەمێنێتەوە بڵێن: کوڕێک هەبوو ناوی عومەر بوو لە خوێنی باوکیدا ون بوو، ئیدی کەس نەیبینیەوە. لە بەینی چایخانەکەی قەرداران[1] و پردی تەعجیلی، دروست لە

---

١. چایخانەی قەرداران: چایخانەی قەرزداران. ساڵی ١٩٦٠ کرایەوە، سەرەتا ناوی (ئەستێرەی شەوان) بوو. دوایی، بەهۆی ئەوەی کورەچییەکانی هەولێرێ، سەلەمیان بە سەرکەپووچ وەردەگرت بۆ هاوینێ. لەگەڵ ئەو کەسانەی قەرزەکەیان دەدا، واتا قەرزدار و خاوەنقەرز، لەو چایخانەیە کۆدەبوونەوە، بۆیە، ناوەکەی گۆڕدرا و بوو بە چایخانەی قەرزداران.

مەیدانی کۆتری ئاشـــتی، عومەر هەرکە چاوی بە دوژمنی بابەکوشتەی خۆی کەوت، برووســـکێک بە چەشـــنی ئاگر لە دەمارەکانیدا گەڕا، بە دڵێکی باوەڕ بەخۆ، شانی لە شانی مەرگدا، لە سەرەتا بۆئەوەی کەسی بێتاوان بەرنەکەوێت، تەنها ئامانجەکە بپێکێ، چەند هەنگاوێک پێی لە شـــوێنی پێی ئەو دادەنا. خەڵکی شـــاری وەک مێروولـــە هەریەکەی بەلایەکدا دەڕواو ســـەرقاڵی کاری خۆیانن. کۆتری ســـەر منارەی مزگەوتەکان دەندووکیان لەنێو دەندووکی یەکتر ناوەو ڕازو نیازی خۆیان دەکەن، تەقەی پوولی دۆمینەی یاریزانەکانی چایخانەی قەرزدارانو زرینگەی پیاڵەو ژێرپیاڵەو کەوچکەچای شاگرد چایەچیو هاواری مەزادی ئەو دەلاڵەی مافوورێکی ســـەرەنازی بەســـەر شانییەوەیە، بانگی ئەو عارەبانچییەی یەک بەخۆی بانگ دەکات: وەرن بۆ کێشـــکەو ڕیشۆڵەی کولاو، عەرەبانچییەکـــی دیکە بانگ دەکات: وەرە بۆ شـــێلمی کولاو، دەرمانی کۆخەو پەســـیو، ئەو فەقێیانەی لە مزگەوتی حاجی نووری هەریەکەو پوشـــکەیەکی بەدەستەوەبوو حینجەی سیپارەو جزو عەممەیان دەکرد، قرموهۆڕی تەقاندنی یەدەگە فیشـــەکێکی دەمانچەی، هەمـوو ئەوانەی بەراواژوو کردنەوە! عومەر دەمانچەکەی ســـوار بووەو لە مەودای یەک مەتردا کابرای داوەتە بەرگوللەی، تاوەکـــو یەدەگـــی خاڵی کرد، کابـــرا بە هیچ ڕانەگەیشـــتو لەپـــاوڕوو کەوتە ســـەرجادەی، مەیدانی کۆتری ســـەلام بوو بە مەیدانی توندوتیژیو کوشتارگە، دەلحازی فەراقی ڕەشی لێبڕا، کەسی بە قسە نەگەیشتە سەریو ئەلفازی لەگەڵ کەســـدا نەگەڕا. تەرمی بێگیانی کەوتە سەر زەوی، مەنجەڵەماست بە گۆڕێ وەربوو، ماستو خوێن لەسەر جادە قیرەکە بە جۆرێک تێکەڵاو بووبوون، وەک تابلۆکێش ڕەنگەکانی تێکەڵاو کردبن، تابلۆی ئەوڕۆژەی هەولێر بکێشێتەوە!

لەگەڵ قرمەژنی گوللەدەمانچان، کۆترەکانی سەر مزگەوتێ لە شەقەی باڵیانداو بەرەو قەڵاتێ هەڵکشان، هێندە بەپەلە باڵەکانیان دەکوتا وەک ئەوەی بیانەوێ خۆیان دەربازبکەن، پەیامی قەومانی کارەساتێکیان بۆ قەڵاتێ دەبرد. پۆلیسی هاتوچۆ توورتوورەی لە زاری دەرپەڕی، پاشایەتی شەقامی بۆ هەیاسی[1] بەجێهشێت، خێرا خۆی دەربازکرد. خەڵکەکە بەئەستوورایی جادەی، بەرەو باتەی ڕایاندەکرد، هەندێک بەرەو خۆراوئاوا بۆ لای حەمامی مۆدەی، هەندێکی دیکەش بەرەو خۆرهەڵات بۆ لای نادی موزەفانو هەندێکیش بەرەو پردی تەعجیلی تێیاندەقووچاند. لە مەنجەڵی کێشەکەو ڕیشۆڵەی کولاوی سەر عارەبانەکان هەڵم هەڵدەستێتو بێخاوەن بەجێماون، چەند قاپێکی نیوە لێخوراوی کڕیارەکان بە نیوەچڵی بەجێماون. تەنها هەیاسە شێت وەک پەیکەرێکی سەربازی بەپێوە وەستاوەو ڕاناکات، هەتاوەکو دەنگی تێدایە هاواری دەکرد: هەڵمەیەن، ڕامەکەن! هیچ نییە، کرمانجی دەشتەکی یەکترییان کوشت! عومەر بە دالانە قەفاوقەفو پێچاوپێچەکانی جوولەکانو کوورەچییەکانی گەڕەکی تەعجیلیدا بەرەو غاباتی محەتەی هەڵات، لە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا پشتی ون بوو، بۆ هەتا هەتایە نە کەس بینییەوەو نە کەسیش سۆراغێکی لێ زانی، وەک عەرز قووتی دابێت، دیار نەما. هەبوو دەیگوت: چۆتەوە فەلەستینو لەوێ کوژراوە، یەک دەیانگوت: حکومەت شوێنبزرو سوورگومی کردووە. لێ، ئەوانە هیچیان ڕاست نەبوون، تەنها عومەر خۆی دەزانێ سەری خۆی بۆ کوێ هەڵگرتووەو خۆی لە چ وڵاتێک سوورگوم

---

١. هەیاس: شێتێکی دەستوەشێنی شاری هەولێرێ بوو.

کــردووە، یان لە چ کەلێنێــک مردووە. خۆر بە ئاســمانێوە جارجار لە کەلێنی هەورانرا بەحەپەســاوی لــەو خوێن بەخوێن شووشــتنەوەیەی دەڕوانی! دوای بڵاوبوونەوەی دەنگۆی کوژرانی بکوژی مام محســینی بە دەســتی عومەری کوڕیو تۆڵەکردنەوەی خوێنی باوکی، خەڵکی گوندی ئەوجارەیان مەوجەکەیان گــۆڕی، عومەریان وەک پاڵەوانێکی ئەفســانەییو پیتــۆڵو زرنگی ڕۆژگاری خــۆی وێنا دەکرد، جۆرەها شــانامەو پێهەڵدانیان بۆ دەهۆنییەوە، دروســت بە پێچەوانەی تیرو توانجەکانی پێشوویان. هەبوو دەیگوت: خزمینە ئەمن هەر لــە ئەوەلیەوە دەمگوت ئەو کوڕە زۆری لــە باراندایەو کەمی دەردەخات، وەڵڵا بابە مام محسین وجاغی کوێر نییە، کوڕە بابم عومەر، بەرخبەرانە نایدۆڕێنێ! یەکی دی دەیگوت: دەڵێن لە کاتی کوشتنی کابرایدا، پۆلیسەکان ویستوویانە بیگرن، عومەر بە دەمانچان کەوتۆتە ســەریان، ئەو هەموو معاونو پۆلیسەی لە قشــرەی ســوارەی پەســتاوەتەوە، حکومەت بەو گەورەییەی خۆی نەیوێراوە خــۆی لە قەرەی عومەری بدات. یەکی دیکە دەهاتە نێو باســەکەوە: عومەر لەسەر عەینی بڵندایی قەڵاتی هەولێرێ وەک شێر نەڕاندوویەتی: ئەمن لێرەم ئەگەر حکومەت پیاوەو بەحەڵاڵی لە پشــتی باوکی خۆیەوە بە پاشکەوتووە، با بێتە مەیدانێ، بزانین کێ بەرخەو کێ بەرانە! قەسەم بە خوای عومەر زۆر لە بابی بە پشــتکەوتووە، دەگێڕنەوە لە فەلەستینیش کە فیدایی بوو لە سەحرای سیناو شەڕی شەش ڕۆژەو هەموو ئەو شــەڕانەی عومەری تێدابووە جەیشی ئیســرائیلی خۆی نەگرتییە، ئۆبــاڵ بە ملم عومەر پشــتێنی بۆ متفەڕیک دەبێتو لە ڕیزی مشایەخانە.

لە چایەخانەی قەردارانیش، چەند ڕۆژ بوو باس هەر باسی ئەو تەقەکردنو

پیاوکوشتنە بوو، بە تایبەتی باسی هەڵاتنی پۆلیسەکەی هاتوچۆ و چۆنیەتیی خۆدەربازکردنی لە شوێنی ڕووداوەکە، دروست لەکاتی تەقەکانی عومەرو قڵیشانەوەو شێواندنی بازاڕو، فرکان فرکانی خەڵکی بۆ خۆ ڕزگارکردن.

چەند مانگێک بەسەر ونبوونو بێسەروشوێنی عومەری تێپەڕیبوو، دایکی زۆر سەغڵەت بوو، دڵی هەزارو یەک خەتەرەی دەکرد، دەترسا نەبادا لە دوای ئەو تۆڵەکردنەوەیە، حکومەت سوڕگومی کردبێت، یان لە شوێنێک کوژرابێت، تاسەباری هەواڵێکی کوڕەکەی بوو. هەرچەندی سەری خۆی دەهێناو دەبرد نەیدەزانی چ کەسێک باشە ڕایبسپێرێت سۆراغێکی بۆ بکات. لە کاکەڕەشی زیاتر کەسی دیکەی بە مێشکدا نەهات کە جێی متمانە بێتو بەدڵسۆزی ئەو کارەی بۆ بکات، چونکە ئەو لە خەڵکی دیکە چاوکراوەترە. خۆی گەیاندە لای کاکەڕەشیو زۆری خۆ لە دەوری سەری گێڕاو خۆی بەقوربان کرد سۆراغێکی عومەری بۆ بکات. لەو کاتەدا هیدۆشی لەلابوو، دیاربوو بەرلەوەی دایکی عومەری بچێتە لایان ئەوانیش باسی ئەو ونبوونەی عومەریان دەکرد، کە چۆن دەکرێ پیاوێک ئاوا سووڕگوم بێتو کەس نەزانێ چی بەسەرهاتووە!

کاکەڕەش بە دایکی عومەری گوت: پێش تۆ باسی ئەوەمان دەکرد، هیچ خەمت نەبێت ئەمنو هیدۆ دەچین بۆ هەولێرو نزیک شوێنی ڕووداوەکە، لەوێ دۆستو برادەری بە بەقاو متمانەمان هەیە کە بۆ ئەوە دەبن سەری خۆتیان پێ بسپێری، داوایان لێدەکەین بە دوادا چوونمان بۆ بکەن، ئاخر ئەوان لە قشرەی سوارەش پۆلیسی خزمیان هەیە بۆ ئەوجۆرە ڕاسپاردانە.

کاکەڕەش دەمانچەی چوونەشاری جیاواز بوو لەو دەمانچەیەی ڕۆژانە لە بەرپشتی بوو، بۆئەوەی بتوانێ بەئاسانی لە چاوی پۆلیس بیشارێتەوەو جوان

حەشـــاری بدات. دەمانچەیەکی ئوســـرەی گچکەی بێ کوتکـــی بەتوورەی لە بەلەکی خۆی دەبەستو شەروارەکەی دەکەوتەوە سەری، بۆئەوەی ئەگەر پۆلیس بیپشکنن نەیدۆزنەوە، چونکە پۆلیس بە زۆری بەرپشتێنی پیاوان دەگەڕان.

بڕیاریاندا لەگەڵ هیدۆی چ لە بەیانی زووتر نییە بچن بۆ هەولێرێ، لەوێش بچنـــە دوکانی بایز بـــەزازی کوتاڵفرۆش، کە دوکانەکەی لەنێو قەیســـەری لە کۆڵانی زێڕینگەرەکانەوە نزیکە. بایز هەم دۆســـتو برادەری کاکەڕەشـــی بوو، هەم بۆرەخزمایەتییەکیشـــیان هەبوو. ڕۆژێـــک دوای ئەوەی کاکەڕەش و هیدۆ ڕۆیشتن بۆ شـــاری، دروست لەوکاتە هەستیارە نامەیەکی عومەری گەیشتبوە دەســـتی دایکی. لەورۆژەوەی عومەر کوردی ســـەری خۆی هەڵگرت، بووبوە هاوکۆچی شاعیرێک کە فەتوای کوشتنی درابوو، لەسەر ئەوەی لە شیعرەکانی گوتبووی: زەوی خڕە، مرۆڤ دەتوانێ بچێتە ســـەر مانگـــێ و... هەندێک لە شـــیعرەکانی لەگەڵ بەرژەوەندی دەســـەڵاتدارو عەقڵییەتی دۆگمای خێڵەکیو خورافاتـــی کۆنەپەرســـتی بەرانگژی یەکتری دەبـــوون. دوای چەند ڕۆژێک لە ڕێ ڕۆیشـــتن بەرەو نادیار، هەریەکەیان چەند جارێک چیرۆکی سەرهەڵگرتنو ڕاکردن لە نیشتیمانیان بۆ یەکتری شەنوکەو کرد، بۆیە لەسەر داوای عومەری، کاکی شاعیری شـــاربەدەرکراو، نامەیەکی بۆ خوشـــکە بچووکەکەی نووسی. ئـــەو نامەیە دوای چەندیـــن مانگ لە بێسەروشـــوێنبوونی عومەری، یەکەم نامەو کۆتانامەی بوو گەیشتە دەســـتی دایکی، کە تێیدا هاتبوو: «خوشکە بچووکە نیازمەندەکەم، چاوە گەشـــەکانت ماچ دەکەم، بەر لە هەرشت بمبوورە کە نەمتوانی خۆشحاڵت بکەم، مرۆڤە پەستو بەدخووەکان سەنەگەیان لەسەر هەڵنەگرتـــم، لێم نەگەڕان ببمە چەترێک بۆ ژوور ســـەرت، ببمە جۆلانەیەکی

ئارام بۆ ڕاژاندنت، ببمە پەناگەیەک بۆ پاراســـتنت، لایەنی کەم ئەو کەسە بم کە خۆم دەمەویست، هەرگیز لە یادت ناکەم، تۆ وەکو دنکە مرواری، بە گەردنی زەینمەوە نووساویت، بۆیە بڕیاری ڕۆیشـــتنم دا، بە ڕەوام نەزانی مرۆڤکوژێک لەســـەر خاکی پیرۆزدا بژی، جا ئەو کوشـــتنە لە ژێر هەر بیانوو و پاساوێکدا بێت، دەمەوێ بڕۆم بۆ شوێنێک ئاوێنەی لـێ نەبێت، بۆئەوەی هەموو ڕۆژێک چرۆچـاوی مرۆڤکوژێـــک نەبینم، نەمدەویســـت لە مەملکەتـــی بەخیلیو دووڕوویـــیو نەخوێندەواری درێژە بە ژیان بدەم، ئـــەو ژیانەی دەوروبەر بڕیارت بۆ دەدەن بتکەن بە چیو چ پەندێکت بەســـەر بهێنن! ئەو مافە بەخۆیان ڕەوا دەبینن بتکەن بە شـــێت، بە ترســـنۆک، بە دڕندەو پیاوکـــوژ، هەر لەو گۆڕەی بتکەن بە شـــێخ، بە دیندارێکی ڕیاکار، بـــە قارەمان، چوزانم، بەکەیفی خۆیان چۆنیان بوێت بتکەن بەو شتە! لەو نیشتیمانە کە یەکەم شت مندالەکانی پێ فێردەکـــەن، جنێودانە: دەی تفێکی لە بابەی بکەو پێی بڵێ ســـەگباب! دەزانم بڕیارێکی سەختم داوە، کاتێک لە دەلاقەی تەنیاییو گۆشەگیریی خۆمەوە، لە مرۆڤەکانی دەوروبەرم دەڕوانی، هیچ ترووسکەی ئومێدێکم لێی بەدی نەدەکرد، پڕ بووم لـــە نەگونجانو پێکـــەوە هەڵنەکردن. ڕێگەیان پێنەدام لەســـەر ئەو سەکۆیەی خودا ئامادەی کردووە، ڕۆڵ بگێڕمو خۆم بم. شانازیکردن بە پیاوکوژیو ئازاردانی خەڵک شـــتێکی هیچـــە، کەچی لەپێناوی ئـــەو هیچە، ئامادەین خۆمانی بۆ بە کوشت بدەین، ئەوانەی کە پێیانوایە بەختەوەرن، کێشەیەک لە بیرکردنەوەیاندا هەیە، ئەمن نە بە تاریف و پێهەڵدانیان دڵخۆشم، نە بە توانجو بوختانەکانیان دڵتەنگم. بیر لەوە بکەوە بزانی ڕاستیی مرۆڤ چییە؟ بۆ هاتۆتە دونیاوەو بە کەڵکی چـــی دێ؟ گەیاندبوومیانە ئەو باوەڕەی کە من بە کەڵکی

هیچ نایەم! بۆیە بڕیارمدا شتی بێکەڵک فڕێبدرێتە شوێنێکی دوور! ژیانکردن لەنێو ئەوانەی دوو کەسایەتییان هەیە، یەکیان بۆ فریودانو نمایشی ساختە لە دەرەوەی ماڵو نێو کۆمەڵگە، دووەمیان ڕووی کەسایەتی ڕاستەقینە لەنێو ماڵو خێزان. جلوبەرگی جوان دەپۆشن لەجیاتی ئەوەی ڕوحیان جوانو سپی بکەنەوە. ئێستا لە هیچ ناترسم چونکە شتێکم نەماوە لە دەستی بدەم. لەگەڵ هاشەی چوونەخوارەوەم بۆ نێو ئەشکەوتی مرۆڤ ونکەر، یەک بەخۆم قاقا پێدەکەنم! لێرە بە کەس خۆم هەڵنادەمەوەو خۆم ڕانانێم کە کوڕی کێم! یان بە خێڵو بەرەبابی دەستوەشێنو خاوەنهێز خۆم بە هەیبەت نیشان بدەم. لێرە لایان گرنگ نییە سواڵکەر بم یان زەنگین، جلوبەرگی بەکەیفی خۆم هەڵدەبژێرم، چ ڕەنگێکم پێ جوان بێت بێ گوێدانە دەوروبەر دەیپۆشم. سمێڵم لە کارتەی دەتراشم[1]، بێئەوەی کەس لۆمەم بکات، لێرە شەرم لە کەس ناکەم، لێرە کەس پێم ناڵێ سەرکۆت، نە کەس دەکوژمو نە کەسیش هەوڵی کوشتنم دەدات، لێرە کەسێک لێم ناپرسێ، ئەسڵەن بەلاشیانەوە گرنگ نییە ئەهلی مزگەوتو کڵێسام یان لایەنگری شەیتانم! لەسەر ئەوەی ژن ناهێنم یان وەچە ناخەمەوە لۆمەم ناکەن، پاشملە پێم ناڵێن نێرەمووکە، ئەگەر زوو دەمرم بابەتێک نییە بۆ نیگەرانی، ئەوە زۆرژیانە دەبێتە مایەی نیگەرانی! ئەو شوێنەی ئێستا منی لێم مەودای نێوانی لەگەڵ بەستەڵەکی جەمسەرەکانی خورافات یەکجار دوورە. ئێرە، نە فەتوای ڕق دەیگرێتەوە، نە بەردی ڕەجمیشی دەگاتێ! لێرە من وەکو کاکەڕەشی، چەکی لەگەڵ خۆم نابەمە سەرشۆرکێ لە کاتی خۆشوشتن، یان هەرڕۆژەو لە

---

١. سمێڵم لە کارتەی دەتراشم: تاشینی سمێڵ لە بنی بنەوەڕا، پاکتاشینی سمێڵ.

زیندانێک خۆم ببینمەوەو ڕاپێچی بەردەمی دادوەرێکی داخلەدڵ بکرێم!

گوڵی کاکەی! هیوادارم ئەم نامەیەت بەدەست بگات، چونکە دڵنیابە ئەمە کۆتا نامەی منە، نازانم سەرم بە کوێ دەگاتو ڕۆژگار بە چ تاشەبەردێکمدا دەداتو خۆڵەمێشی لاشەکەم دەکەوێتە چ ئۆقیانووسێکەوە! بۆ چاوساغیو پرسو ڕا تەنها قسەی کاکەڕەشی بە هەند وەربگرن، چونکە پارێزەرو گیانفیدای هەژارانە. خۆشحاڵم ئەو کاتەی دەمرم، کەس دڵتەنگ ناکەم، ئەگەر لەبەر بۆنەکەم نەبێت، خۆیانم پێوە خەریک ناکەن بمنێژن.

برای بێ ناوونیشانت... عومەر.

بایز، پیاوێک بوو هەتاوەکو خوا حەز دەکات نهێنیپارێزو ڕەوشتبەرزو مرۆڤدۆست. بۆ پاکی، لە ئەسڵدا بنەچەی دەچۆوە سەر ڕەگەزی ئاو! کاکەڕەش هەموو جارێک بە هیدۆی دەگوت: حەزم دەکرد بایز برای لە دایکو بابم بوایە، ڕاستە کە گوتوویانە دنیا لەسەرپشتی مرۆڤە باشەکان وەستاوە، بێگومان بایز یەک لەو پیاوانەیە. بایز تەنها کوتاڵفرۆش نەبوو، میهرەبانیو ئاکارو ڕەوشتبەرزیشی بەسەر کڕیارەکانیدا دەبەخشییەوە.

بایز تەمەنی لە چل ساڵێک دەدا، کورتەکو شەروارێکی فاسۆنی ڕەشی لەبەردابوو، کڵاوێکی بە سیمی دزەییانەی لەسەری دەناو جەمەدانییەکی پێنج ڕیز جەلەی لەسەر دەئاڵاند، سەرو سیماو کۆفییێکی جوامێرانەی پێدەبەخشی، دوو سێ تاڵی لەسەر چەناگەی سپی بووبوو، ئەو تاڵەموانە پێش زەمەنی هەقەسپیبوون[1] کەوتبوون. کاتژمێرێکی زنجیرداری بە یەخەی

---

١. هەقەسپیبوون: سەروەخت و تەمەنی سپیبوونی سەر و ڕیش.

کورتەکەکەیەوە بوو، هەرچەند جاری دەیویست لە کاتژمێرەکەی ڕابمێنێ بزانێ چ وەختی ڕۆژێیە، لە گیرفانە بچووکەکەی سەر بەرکی دەریدەهێناو پەنجەیەکی لە ناوەڕاستی قورمیشەکەی دەدا قەپاغەکەی قیت ببێـــتەوە، ئەو کاتە میلو پنتی ئەژمارکردنی کاتەکانی دەبینی و، دەیزانی چ وەختە.

هەمـــوو جۆرەکانی پارچـــەو کوتاڵی ژنانە لـــە دوکانەکەی بایزی دەســـت دەکـــەوت، تەنهـــا کوتاڵی چاوپانی بەرامپیلی عەیبداپۆشـــی نەدەفرۆشـــت. وانەکانی نهێنیپارێزیشـــی فێری کرپارەکانی دەکرد، بانگی ڕەوشتێکی یەکجار بەرزی دەدا!

دوکانەکەی پڕبوو لە پارچەی مەخمەرو قەدیفەی شـــەرمداپۆش. ڕۆژێک ژنێکی شۆخ‌وشەنگ، لەگەڵ‌ئەوەی عەبایەکی ڕەشی لە خۆی هاڵاندبوو، ڕوومەتی وەک بەفری بەرهەتاو بریقەی دەدا، منداڵێکی سێ ساڵانی بەدەستەوەبوو، بۆ کڕینی کراســـێک ڕوودەکاتە دوکانەکەی. لەو کاتەدا منداڵەکە چمکی عەبای دایکی ڕادەکێشێ ئاگاداری بکاتەوە کە قەیتانی ئەو پێڵاوەی تازە بۆی کڕیبوو، شـــل بۆتەوە، بەڵکو بۆی توند بکاتەوە، ژنەکەش دادێتەوەو هەڵدەتوتکێ بۆی توند بکاتەوە. لەو هەڵتووتەکانە لەســـەر چینچکان بایەکی لێبەردەبێت، ژنە، دەموچاوی لەشـــەرمانو لە حەیفان ســـوورهەڵدەگەڕێ، هەر ئەوەندەیە نابێتە تنۆکێـــک ئاو و بەزەویـــدا بچێتەخوارێ! هەر قســـەیەکی دەیویســـت بیڵێ، دەریببڕێ لە گەروویدا دەخنکا. دروســـت لەوکاتـــەدا، بایز خۆی بە تەکاندن و ڕێکخســـتنی کوتاڵەکانەوە دەخافڵێنێ. ژنەکە بـــە ڕەنگی پەڕیوو و زمانێکی تێکەڵوپێکەڵەوە دەستی لەسەر پارچەیەکی داناو گوتی: ئەو پارچەیە مەتری بە چەندەو کراســـی چەند دەکەوێت؟ شـــەرمو حیدەت بەتـــەواوی ژێی دەنگی

گۆڕیبوو! بایز، وەک لەگەڵ ئەویشـــی نەبێت، وەڵامی نەدایەوەو خۆی لە ئیش نەکرد، وای نیشاندا کە گوێی لـێ نەبووە، دووەمجار لێی دەپرسێتەوە، ئەمجارە بایز ســـەری خۆی بۆ ڕاســـتو چەپ بادەدا، وەک هێمای سەرسووڕمان گوایە گوێی لە هیچ نییەو گوێی گرانـــە، ژنەکە ئەمجارە بە تۆنێکی بەرزتر تێکەڵاو بە زمانی جەستە هەمان پرسیاری دووبارە کردەوە. بایز گوتی: کچم ئەمن گوێم گرانە، بە دەنگێکی بەرزتر قسە بکە، نازانم چیت دەوێ!

ئەو خۆکەڕکردنەی بایزی، وەک ئەوە وابوو بە ئیسفەنجێکی نەرمو دەستێکی فریشتانە، ئاوێنەی شەرمەزاری ڕووخساری ئەو ژنە شۆخە بسڕێ. بایز گوتی: کچم نەتبیستووە دەڵێن: نە بۆ کوێران هەڵپەڕەو نە بۆ کەڕان گۆرانی بڵێ! هەر خودا دەزانێ ئەو خۆکەڕکردنەی بایزی، چ ئارامیو دڵخۆشـــییەکی ڕژاندە سەر هەستو ڕۆحی ئەو ژنە شەرمن و شەرم بەخۆیە.

چەند ســـاڵ دوای ئەو ڕووداوە، چەندجاری ئەو ژنە دەهاتەوە دوکانی بایزی، هەموو جارەکان بایز نمایشـــی نابیستێکی لە تەکدا دەکرد. زۆرجار کڕیارەکانی دیکەش ئەگەر بە دەنگی نزم پرســـیاریان لێبکردایـــە، وەڵامی نەدەدانەوە، کە ئەو ژنە لە دوکانەکەی بوایە. مەگەر دەنگیان زیاد لە پێویســـت بەرز بکردایە. زۆرجـــار ژنەکە بە کڕیارەکانی دەگوت: کاک بایز گوێی گرانە بە دەنگێکی بەرز مامرەتی لەگەڵدا بکەن.

ئاخر بایز ئەو جۆرە مرۆڤە بوو، بۆیە کاکەڕەش بەخیلی بە برایەکانی دەبردو ئاواتەخواز بوو بایز برای لە دایکیو باوکی ئەو بوایە.

کاکەڕەشو هیدۆ بایزی کوتاڵفرۆشـــیان ڕاســـپارد ســـۆراغی عومەریان بۆ بکات، ئەویش ئامادەیی خـــۆی دەربڕی ئەوەی لە توانایدا بێت درێغی ناکات.

هەر لە دوکانی بایزی، هەواڵێکی گورچکبڕ بە کاکەڕەشــی گەیشــت، کاتێک بایزی کوتاڵفــرۆش گوتی: لەو هەفتەیــەی ڕابردوو، ئەو چــوار ئەفەندییەی لەسەر شوعیەت گیرابوون، دادگایی کران. دووانیان بە زیندانی هەتا هەتایی‌و دوورخرانەوە بۆ باشــوور و، دوانــی دیکەش لە ســێدارەدراون. کاکەڕەش بەو هەواڵە زۆر تێکچوو، گوتی: بەڕاســتی حەیف بۆ ئەو گەورەپیاوانە، زۆرم سوود لە زانیاریەکانیان بینی، وەک مامۆســتایەک لە زیندان پەروەردەی دەکردین‌و بە مافەکانمان ئاشــنای دەکردین. ئەو پیاوە چرای تاریکەشەوان بوو، مێژووی هەولێریان خنکاند!

بایزی کوتاڵفرۆش گوتی: زانیاریم هەیە ژمارەیەکی دیکە لەو تێکۆشەرانە، نمایشــنامەیەکی ســاختەیان بــۆ ئامــادە بکەن بۆئــەوەی ڕەوایەتــی بە لە سێدارەدانیان بدەن.

کاکەڕەش‌و هیدۆ ویســتیان ماڵئاوایی لە بایزی کوتاڵفــرۆش بکەن، بەڵام بایز بەدەم گرێدانەوەی ئەو جۆرکەی قەرەپوولی پێنج فلســی‌و دەفلســی‌و نیو درهەمی‌و درهەمیی تێدابوو، داوەکەی لە زارکی بەســتاو نایەوە بەرپشتێنی، سوێندی لــێ خواردن هەتا نانی نیوەڕۆیێ لە ماڵی ئەوان نەخۆن، نایەڵێ بڕۆن، ئەوەشی گوت: بەیانی ئەوکاتەی لەسەر کۆسپەی دەرگای حەساریێ دەمویست بێمــە دەریێ خێزانم گوتی: بایز نەکەی لە بازاڕی نانی بخۆی، چونکە برووشــم لە ئاویێ کردییەو کفتەو ترشــی بە سلقەسوورەی لێدەنێم، جا بۆیە ئێوەش دەبێت لەگەڵمدا بێن‌و ئەو کفتەو ترشەم لەگەڵ بخۆن‌و لە کیس خۆتانی مەدەن، دەزانم کاکەڕەش کفتەو ترشــی پێخۆشــە. ئەوانیش ملیاندا لەگــەڵ بایزی بچن ئەو کفتەو ترشەی بخۆن.

بایز ئەو چەند تۆپە کوتاڵەی بۆ بەرچاوی کڕیارەکان لە بەردەرکی دوکانەکەی دانابوون، هێنایـــە ژووریٚ، قەپەنگی دوکانەکەی دادایەوەو دوو قوفڵی گەورەی لێدا، دەســـتی لە گیرفانەکانی ڕاکـــرد دڵنیابێت کلیلەکانی لـــە ژووریٚ لە یاد نەکردووە، ئینجا قفڵەکانی کلیلداو بەرەو ماڵ کەوتنەڕیٚ. ماڵی بایزی کەوتۆتە پەرگەی شارو لە لای غاباتی محەتتەی شـــەمەندەفەری. بەنێو زێڕینگراندا، بە تەنیشـــت مزگەوتی حاجی نووریو چایخانەی قەرداران شـــۆڕ بوونەوە. لە گۆڕەپانی کۆتری ئاشـــتی شـــوێنی تەقەکردنو زەلام کوشتنەکەی عومەری پیٚ پیشـــاندان. لە نزیک پردی تەعجیلی دایانەوە کۆڵانە تەنگو پێچاوپێچەکانی گەڕەکـــی جوولەکان، هەرچەند تەماشـــای ئەو تاقو دیوارە نەخشـــێندراوانەی دەســـتکردی وەســـتا جووەکان دەبینن، زیاتر بەو هونەری تەلارسازییە سەرسام دەبن. لە گەڕەکی کوورەچییان تێپەڕینو گەیشتنە ماڵی بایزی.

بایز فەرمووی لێکردنو وەژوور حەســـاریٚ کەوتن. ژنەکەی بایزی خەریکی شـــێلانی بڕوێشـــی کفتەی بوو، بایز بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئافرەت ئەوە لە کوێی میوانـــی عەزیزو خۆشەویســـتت بۆ هاتن. ژنەکـــە هەرچەندە هەردوو دەســـتی بە بڕوێش بوو، خەریکـــی پێچانەوەی ئەنگوتکی کفتـــەی بوو، بەو حاڵەشـــەوە دەرپەڕییە دەریٚو بە ڕوویەکی گەشو ئەوپەڕی میواندۆســـتییەوە وەک دوو بـــرای لە دایکو باوکی میوانی بنو دەمێـــک بێت نەیبینیبن، ئاوا هەڵســـوکەوتی لەگەڵدا کردن. کاکەڕەشو هیدۆ بە هیچ جۆر هەستیان نەدەکرد لـــەو ماڵەی میوانن، وەکو خزمێکی پشـــتیٚ، قۆڵـــی هەردووکیانی ماچ کرد. کاکەڕەش ســـەری لە بنگوێی هیدۆی نا: هەرچەنـــدی لێیان ورد دەبمەوە نازانم نە کاک بایز میواندۆســـتترو پیاوترە، نە ژنەکەی خانەدانو نەجیبزادەترە! پیاو

لە مەردایەتی ئەو جۆرە ژنانە شـەرم لە پیاوبوونی خۆی دەکات! جا دەستتاوی چەند خۆشە!

تاوەکو نانو چێشت ئامادەبوو، ڕەنگە هەزارجار بەخێرهاتنی ئەو میوانانەی کردبێـت. بەرلەوەی نانی بـۆ میوانەکان دابنێ، هەر لەسـەر دیوارێڕا بانگی ژنەکەی عەدالەتی هاوسـێیانی کردو داوای ئەوەی لێکرد هەردوو کچۆڵەکەی بنێرێ یارمەتیی بدەنو بەردەسـتی بکەن. ژنەکەی بایزی هێشـتا نەگەڕابۆوە ژووری ئەو دوو کچۆڵە گەیشتن. توومەز ئەو بانگکردنە بە بیانووی یارمەتیدان هەروەک نهێنییەکە بۆ فریودانی عەدالەتی باوکیان. دەنا لەڕاستیدا ژنەکەی بایزی پێویسـتیی بە یارمەتی نەبـوو، بە تایبەتی یارمەتیـی ئەو دوو کچە بچووکە، مەبەسـتی تایبەتی خۆی لەو داواکاریو بانگکردنە هەبوو، ئەویش ئەوەبوو دەیویست بەرلەوەی خۆیانو میوانەکان نان بخۆن، ئەو دوو کچۆڵەیەی عەدالەتی تێربکات، چونکە عەدالەت پڕ بە زگی خۆیان تێری نەدەکردن، لەگەڵ کوڕەکان جیاوازی پێدەکردن! هەردوو کچەکە لە ترسی ئەوەی نەوەکو عەدالەتی باوکیـان بزانێ لە ماڵی بایزی نانیان خواردووە، هەر زوو دەسـتو دەمی خۆیان جوان پاککردەوە. ئێستا وا پیشان دەدەن وەک هیچیان نەخواردبێت. تکایان لە ژنەکەی بایزی کرد لە لای هیچکەسـێک نەڵێ لە ماڵی ئەوان نانیان خواردووە! ئەویش دڵنیای کردن کە بە هیچ شـێوەیەک باسی ناکات. هەردووکیانی وەکو کچی خۆی ماچ کردو بۆ ماڵی خۆیان بەڕێیکردنەوە.

عەدالەت، تەنها عادل نەبوو، پیاوێکی ڕەشـتاڵەی قوتیلەی ورگنو سەری خۆی بە تیغی سـفر دەتراشی بۆ ئەوەی نەچێتە لای سەرتاشی. سەری هەموو جێگای کەونەبرین بوو، شـوێنەواری کۆنەشـکانی زۆری پێوەبوو، هەمیشـە

جغارەی بە لالێوییەوە بوو، کام تووتن کارتەو بنپەلکی هەرزانە، ئەوەی دەکێشا. هەتاوەکو دوو سێ داوەمووی لە سمێڵی نەسووتاندبا، جغارەکەی فڕێ نەدەدا، نەبادا بایی مژێکی تووتن تێدا مابێت! تووڕەو تووشەک بوو، لەگەڵ تڕی خۆی بەشەڕدەهات! دوو چاوی چکۆلەی ژووژگئاسای پێوەبوو، کە لە قسەکردن دەوەستا لە بن چەرمی شەویلاگی ددانەکانی بەسەریەکدا دەقرمساند، وەک شتێک بجوی یان ڕقی لە یەکێک هەستابێت، یان شتێک بژمێری. دوو کوڕو دوو کچی هەبوو، کچەکانی لە کوڕەکان گەورەتر بوون. چونکە ماڵەکەی لەلای پەڕگەی شاری بوو و، ڕووی کەوتبووە غاباتی محەتەی شەمەندەفەری، دوو مانگای ڕاگرتبوو، شیرو ماستەکەی دەبرد بۆ بازاڕی دەیفرۆشت، نەیدەهێڵا ئەو ماڵو منداڵەی پڕ بەزگی خۆیان شیرو ماست بخۆن، نەبادا بۆ فرۆشتن جامێک کەم بکات. ماستی تەنها دەدایە کوڕەکان. کە شیرو ماستەکەی دەفرۆشتو دەگەڕایەوە، عەشتەبای لەگەڵ خۆی بۆ ماڵێ نەدەهێنایەوە، جگە لە دوو سەموون بۆ هەردوو کوڕەکەی، سەموونی بۆ کچەکان نەدەکڕی، دەیگوت کچ سەموونی بۆچییە، پاشی چەند ساڵێکی دیکە مێردی دەکەنو دەچنە ئەو گۆڕەی، کچ بۆ من نییە بۆ خەڵکی بەخێوی دەکەم، خۆ کوڕ نییە بۆم ببنە پشتو قەوەتو کاسبیم بۆ بکەن! ئەمن چما شێتم کچان بە سەموونی بەخێو بکەم، پاشی چەند ساڵی دیکە خەڵک پێیان خەنی بێت! بەدیار چاوی کچەکانەوە ئەو دوو سەموونەی دەدایە کوڕەکان.

کاکەڕەش سەری سوورمابوو، بێئاگا لەو ناعەدالەتییەی عەدالەتی، بۆیە بەتاسووقەوە لە بایزی پرسی ئەو کچۆڵانە باوکیان نەماوە، یان هی خۆیان نین؟! بایز گوتی: باوکیان ماوەو بە هەموو کەیفی خۆیشی ناوی عەدالەتە! بەڵام

دەرهەق بــە ژنو منداڵەکانیو بە تایبەتی ئەو دوو کچۆڵە بێدەســەڵاتە، زۆر ناعادیلە. بایز دەیگوت: هەموو جارێ دەڵێم کاک عەدالەت گوناهت دەگاتێ ئەو کچانەش منداڵو جەرگی تۆن، لە تۆ زیاتر کەســیان نییە، کەســی دیکە شــک نابەن پاروەنانێکیان بداتێ، چۆن ویژدانت ڕێگات پێدەدا ئەو جیاوازییە لە بەینی جگەرگۆشەکان بکەی؟ چۆن دڵت بەرووەست دەدات، ئاخر کچو کوڕ چ جیاوازییان هەیە؟ هەردووکیان نیعمەتی خودان، نابێت ناشــوکرییان پێبکەی! عەدالــەت دەیگوت: کاکە بایــز خۆ ئەتۆ لە خوای باشــتر نازانی، ئەوە نییە بە شــەرعی خوای گەورە لە میراتیش کچ نیوەی دەبــات! ئەتۆ کو نێرو مێی دێنییە تای یەک تەرازووی؟! بایز گوتی: باشــە کاکە هەر بە قسەکەی خۆت ڕازیم، کوڕەکان هەریەکەو ســەموونێکی ساغیان بۆ بێنە کچەکان هەریەکەو کەرتێکیان بدێ، ئاخر نەفسن! چاویان لێیە براکانیان بە دیارییانەوە سەموونی دەخۆن، خۆ کچەکان لە کوڕەکان هەراشتریشن! عەدالەت نایەتە ژێربار: مەلا لە مزگەوتێ فەرمووی دوو ژن بە شــاهیدێک دەشــێن، پیاوێک دەتوانێ چوار ژنــان بێنێ، ئەوەندەی ئەمــن بزانم لەوەتەی دنیا دنیایــە ژنو پیاو، نێرو مێ، جیاوازییــان هەر هەبووە، کاکە ئەتۆ ئەهلی مزگەوتێ نی، بۆیە لە هیچ نازانی! بەخۆم گوێم لە مامۆســتای بوو: پیاوان دەســەڵاتیان بەســەر ژناندا پێدراوە، چونکە زاناو عاقڵو خاوەن ویلایەتنو مەسرەفی ماڵێ دەکەن، بەڵام ژن عەقڵو دینیان نووقســانەو نابنە خاوەن دەسەڵات. خۆ بێحیکمەت نییە چوار ژنیان بۆ یــەک پیاو داناوە! تا دەهات عەدالەت تووڕەو تۆســنتر دەبوو، خۆی لە بایزی تووڕە کرد: ئەتۆ هەقی ماڵی منت چییە؟ هاوســێیەکی بوویو نەبووی! خۆت لێکردوومە بە فریشتەو نەسیحەتکەر، پڕ ماڵێ نانی مزاشە، باگەلەکی بخۆن!

ئەمن ســەدجارم گوتووە فەعلی کچان خرا ناکەم، فێری ســەموون خواردنیان بکەم! ئێ کاکە نیمە! پــارەم نییە! لەگەڵ نەبوونی هیچ دەکرێ؟ کەس عانەکم بەلاش دەداتێ؟ ئەگەر پارەم نەبێ لە کوێی بێنم؟ ڕاســتیان گوتووە: تێر ئاگای لە برسی نییە! ئەتۆ گوێزان لە هەمبانێ خۆت دەژمێری! پارەم هەبایە سەموونم بۆ کچەکانیش دەکڕی!

تازە لە نانخواردنی نیوەڕۆ دەســتیان کێشــابۆوەو خەریکی چاخواردنەوێ بوون. دروســت لەو قسانەدا بوون، لەناکاو لە ماڵی عەدالەتی بوو بەنەڕەنەڕ و هەراو هەنگامەیەک ئەوســەری دیارنەبێ! زرووکەی کچەکانو قیژەی ژنەکەی عەدالەتــی، وەک ئــەوە وابوو ورچێکــی بریندار بەنێو ئەو مــاڵو منداڵەی کەوتبێــت و هەی لەوەی خۆی لەبەر لابدا! بۆت جیانەدەکرایەوە کامیان لەوەی دیکە دەداو لە سەرچی ئەو تێکقڕانە دروست بووە! کەس نازانێ ئەو هاتوهاوارە لەسەر چییەو کێ هەقە و کێ ناهەقە!

بایــزو ژنەکەکــەی غاریاندا، کاکــەڕەشو هیدۆش بە دوایانــەوە بۆ ماڵی عەدالەتی. هەر لە کۆڵانێ دیاربوو هاوســێکان هەر بابایــەو هەڵدەکوتێ بۆ ماڵی عەدالەتی، دوو دوو و ســێ ســێ خۆیان بە دەرکەی حەســارێدا دەدەن. لەو کاتەی عەدالەت خەریکی نانخواردن بوو، بە فرسەتی زانیبوو کە هەموو لەسەر نانخواردنن، بچێت سەری پارەکەی هەڵبداتەوە کە لە بەرپێی مانگاکان لــە تەنەکەیەکدا ژێرخاکی کردبــوون. ژنەکەش وای زانیبــوو ئالیکی دەداتە مانگاکان خۆش خــۆش بانگی دەکات: عەدالەت عەدالــەت وەرە چایەکەت ســارد دەبێتەوە، چایەکەت بخۆ! عەدالەت کاتێک سەری تەنەکە پڕ لە پارەکە هەڵدەداتەوە دەبینێ پارەکەی هەمووی بۆتە پارچە کاغەزی ژەنگاوی، هەر کەس

نازانێ پارەش بووە! بەرلەوەی دادو فیغان دەســـت پێبکات، هەموو خێزانەکەی دارکاری کردبوو، پیاڵەو ژێرپیاڵە چایەکەی لە نێوچاوانی ژنەکەی دابوو، ســەر برۆی چەپی شــکاندبوو. ژنی تایین لە بەرهەیوانێ لەســەر کەلەکە کەوتبوو، خوێن لە ســەر بــرۆی مەیی بوو، لەشــکرێک مێش لە بریــنو خوێنەکەی هاڵابــوون. دوو کوڕەکەی ســەریان بەیەکەوە نابوو لــە قوژبنێکی هەیوانەکە سەریان بە نزگرانەوە خەریکە هەڵقەنێ! دوو کچۆڵەکەی هەریەکەو دەستێکی دایکیان لە ئامێز گرتووەو بە ســینگی خۆیانەوە نووساندووە. بە دەستەخرپنو ناسکۆڵەکانیان هەوڵدەدەن مێشــەکان لە برینی نێوچاوانی دایکیان دەربکەن، پرچی ئاڵۆزی شــانەنەکراوی ئەو دوو کچۆڵە بێناز بێگوناهە نیشانەی گرنگی پێنەدانیان پێوە دیاربوو. پەرچەمیان، بە دڵۆپە درشــتەکانی فرمێســکیانەوە بە ڕوومەتیانەوە نووســاوە. دەیانەویست بە دایکیان بڵێن دەستبەردارت نابین پێویستیمان پێتە هەســتەوە! عەدالەت لە نێوەڕاستی حەسارێ چوارمشقی دانیشــتووە، تەنەکەیەکی دارزاوی ژەنگاوی دەمەو نخوون کردۆتەوەو زوو زوو بەســتەیەک لەو کاغەزە ژەنگاویانــەی بە میزی مانگا ســووتاو و هەلاهەلا بووانەی، دەردێنێو لێکیان بڵاودەکاتــەوە بەئومێدی ئەوەی چەند دانەیەکیان لەنێو سەفتەکان بەســاغی مابێتەوە. ئەو کاغەزە نیوەســووتو ژەنگاوییانە، بە هەردوو دەســتی بەســەر ســەری خۆیدا دەکاتو بەو نێــوەدا بڵاودەبنەوە، وەک بیەوێ خۆی پێ داپۆشــێت، ئەو پارە بەسەرخۆدا کردنە وەک ئەوە وابوو قوڕ بۆ عەزیزێکی لە دەســتچووی بپێوێ! بەحــاڵ نووزەیەکی لەبن لێوانەوە لێدەبیسترێ، کەس نازانێ مەبەســتی چییەو چی بە دەوروبەری دەڵێ! تەنها یەک وشە گۆ دەکات: پارەکانم! پارەکانم! لە چاوی ئەو کچە هەترەشچووانە داد

و سـکاڵا بەرزدەبوونەوە! لەگەڵ هەر بڵمەیەکی نێرانەو باوکسالارانەی باوکیان وەک ورچێکی بریندار، مینایەکی ناسکی ناخی ئەو کچە چاو بەفرمێسکانەی وردو خاش دەکرد، شکانێک کە پارچە وردەکانی بە هیچکەس کۆنەکرێنەوە!

ئەو خەڵکەی لە حەسـاری ماڵی عەدالەتی کۆبووبوونـەوە، لە ژنو پیاو، هەریەکە لەبەرەخۆی بە سەرسووڕمانەوە دەیانگوت: چما ئەو هەموو پارەیەی هەبـوو! کاتێک دەمانگوت ئەو ژنەی بۆ نابەی بـۆ دکتۆری؟ دەیگوت: پارەم نییە، چ لەگەڵ نەبوونێ دەکرێ! دەک مستەهەقت بێت پیسکەپیاو، دە بیخۆ! دەبێـت ئەو پارەیەی بۆچـی هەڵگرتبێت؟ بۆ قیامەتێ! تاکە یەک کەسـت نەدەبینی پەرۆشی بێتو بۆی دڵتەنگ بێت!

عەدالەت ئەو سـاڵانەی ژیانی، هەرچی پارەی کۆی کردبۆوە، بەنیاز نەبووە بهێڵێ جارێکـی دیکەی بای سـەر دنیاییان پێبکەوێتـەوە! هەرچی پارەی هەیبووە لە تەنەکەیەکی ڕۆنی ئاخنیوەو بـەدزی ژنو منداڵەکانی لە ژێرپێی مانگاکانـی، بنخاکی کـردوون. بە درێژایی ئـەو ماوەیە میـزی مانگاکانی چۆڕاوەتـەوە نێو تەنەکەکـەو پارەکانی هەموو داڕزانـدووە، بەجۆرێک، کەس نازانێ هەر پارەش بووە! هەر دەسـتی بۆ دەبەی هەڵدەوەرێ، تاقەیەک دیناری بەساغی بۆ دەرنەچووە!

هیدۆ بەتەوسـەوە گوتی: ئەگەر عەدالەت ماڵی لە دەشتێ بوایە، هەقی ئەوەی هەبوو شەوەکێ سەری چاک بکەینەوە![1]

دوای ئەوەی گەڕانـەوە ماڵی بایزی، چایان خواردەوە، بایز کەوتە پێشـیان،

---

١. سەری چاک بکەینەوە (سەرچاککردنەوە): کینایەیە بە تەمبێکردن و دەرسدادان، یان لێستاندنی بڕێک پارە یان هەر شتێکی دیکە.

کاکەڕەش‌و هیدۆش بەدوایەوە بەرەو قشـرەی سـوارەی، بەمەبەستی سۆراغی عومەری لە چەند پۆلیسێکی خزمی بایزی. کاکەڕەش بێئاگا لەوەی نەیارەکانی هەموویان کۆکن لەسـەر ئەوەی ئەمجارە پیلانێکـی دۆزەخیانەی ئەوتۆی بۆ دابرێژن، یەکجاری بۆ هەتاهەتایە خۆی لێ ڕزگاربکەن‌و لەکۆڵ خۆیانی بکەنەوە. ئەوانەی دەسـتیان تێکەڵ بـەو پیلانگێڕییە کردبـوو، هەریەک مەرامێکی تایبەت بەخۆی هەبوو، بەڵام لە بنەڕەتڕا هەر هەموویان دژی کەسـانی دیارو دەسـتەبژێری نێو کۆمەڵگان، ئەوانەی هێماکانـی خانەدانی‌و مەردایەتییان پێوە دیاربوو بە تایبەتییش ئەوانەی خەسـڵەتەکانی پێشەنگایەتی‌و ڕووحی یاخیبوونیان لە ئاسـتێکی بەرزدایەو ترس‌و تۆقاندن پاشەکشـێیان پێناکات! دەیانەویست ئەمجارە کاکەڕەش لەگەڵ پۆلیس‌و یاسا بەرانگژی یەکتری بکەن.

خـۆ ئەگەر کاکەڕەش ڕادەسـتی پۆلیس نەبێت‌و بەرەو ڕوویـان ببێتەوە، ئەوا بەدەسـتی پۆلیس دەکوژرێ‌و کۆتایی بە ململانێیەکە دێت، ئەگەر دەستگیریش کـرا، ئەوا هـەر بەخۆیان دەزانن چۆنیان بـۆ تێگوشـیوە! وەک دەڵێن هەتاوەکو ماشـە[1] هەبێت دەستی خۆیان نەسـووتێنن! پۆلیس بکەنە کەلۆژی سەموون دەرهێنان، ئەو تۆمەتەی بۆیان داتاشـیوە، سـزاکەی هەتاوەکو لە سێدارەدانیش دەڕوات.

نەیارەکانی کاکەڕەشـی، هەموو لایەنەکانی یاساییان پیلانرێژ کردبوو، هەر لە پارێزەرو شاهیدی ساختەو... پەیداکردنی ئەوجۆرە مرۆڤانە لە کۆمەڵگایەک کـە غەرقی بەخیلی‌و ڕق‌و نەزانی‌و نەریتی کۆنەپەرسـتییە، هێندە سـەخت

---

١. ماشە: مقاش.

نییە، وەک هەموو بەسەرهاتەکانی مێژووی کەونارای ئەم گەلە پڕن لە ناپاکی لە یەکتریکردنو کرۆشـتنی ئێسکی برای لە دایکو بابی یەکتریو خۆخۆریو پەیمانشکێنی.

قرێژەکانـی کۆمەڵگا، ئەوانەی بۆ چنگەنانێکـی پیس، ئامادەن مەمکی دایکی خۆیان ببڕن، ئەوەی نەدەبوو بیکەن، کردیان بەرامبەر کاکەڕەش. چ لەوە داماویترو پڕ شەرمەزاریترە؟ لە سەر سینگی خۆت چوارمشقی دابنیشیو بە سووژن هەردوو چاوی خۆت کوێر بکەی!

دەمێکە کەسـێکی نزیکی کاکەڕەشیان بەکرێ گرتووە، بەجۆرێک خۆی لە کاکەڕەشـی نزیک کردبۆوە، بووبووە جێگای باوەڕی کاکەڕەشی. جەلیل، ناپاکی خوێنـی ئالوودەکردبوو، بەخیلی لە جیناتیدا گـەرای دانابوو. هەرچەندە کوڕە جووتیار بوو، بەڵام شوناسی چینایەتیی خۆی ونکردبوو، ناپاکی دەرهەق چینی خۆی کردبوو. کاکەڕەش چەندجار جەلیلی ڕاسـپاردبوو بـۆ کاری زۆر گرنگو نهێنی و سـەرکەوتووانە ئەنجامی دابوو، هەر ئەوەش بوو کاکەڕەش متمانەی تـەواوی پێی هەبێت، بێئاگا لـەوەی پارەو چاوچنۆکی، جەلیلـی وا لێکردووە دەستبەرداری ڕەوشتو ئاکاری هاوڕێیانە بێتو ناپاکی دەرهەق کاکەڕەش بکات.

تەنها جەلیل ئاگاداری ئەوەبوو کاکەڕەشو هیدۆ دەچنە شاری بۆ لای بایزی کوتاڵفرۆش بۆ سۆراغی عومەری. جەلیل نەیارەکانی کاکەڕەشی ئاگادارکردبۆوە، تەنانەت باسـی ئەوەشـی کردبوو کە کاکەڕەش دەمانچەی لـە بەلەکی خۆی دەبەستێو بێچەک ناچێتە نێو فەرمانگەکانی میریشەوە! دیاربوو نەیارەکانی کاکەڕەشی هەموو کونو کەلەبەرو برگەکانی ئەو پیلانەیان ئامادەو کوتاوەتەوە، تەنها لەسـەر ئەوە وەسـتاوە جەلیل پێیان ڕابگەیەنێت کاکەڕەش فڵان ڕۆژی

دەچێتە شـــاری‌و بەس، ئەوان، هەر لە پۆلیســـێکی ســـادە تـــا دەگاتە معاون‌و مەئمورمەرکـــەزو چەنـــد دادوەرێکی نادادپەروەر، هـــەر هەموویان لە پارەیدا خنکانـــدوون! کاکەڕەش بێئاگا لەوەی جەلیل ســـیخوڕێکی دەستڕۆیشـــتوو و جێگای متمانەی دەستگا هەواڵگرییەکانی حکومەتە.

راپۆرتێکی تێروتەســـەلیان ڕادەســـتی لایەنی پەیوەندیدار کردبوو، تێیدا کاکەڕەشـــیان وەک کەسێکی یاخی لە یاساو دامودەزگا حکومییەکان دانابوو، گوایە خەڵک هان دەدات لەدژی حکومەتەو بە بیروباوەڕ شـــیوعیەو، سەر بە پارتێکـــی قاچاغـــی دژی دەوڵەتە. ئەرکدار کراوە لە کاتی چـــوون بۆ دەوام یان گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، متەسەڕیفی بکوژێت. بۆ ڕاستی هەواڵەکەش دەمانچەی لە بەلەکی خۆی بەستاوە، بۆئەوەی لە کاتی پشکنین، پۆلیس نەیدۆزنەوە.

لە ماڵی بایزی، کاکەڕەش دەمانچەی هیدۆشـــی لە بەلەکی خۆی بەستا، بە هیدۆی گوت: خوا نەخواستە ئەگەر گیراین با هەر ئەمن تاوانبار بکرێم، خۆ چ دەمانچەیەکم پێبێت‌و چ دووان، هەر یەکەو هەر نەبێت ئەو کاتە ئەتۆ ناگیرێی! بەڕێوە بوون بەرەو قشرەی ســـوارەی، کە دیوی لای جادەی متەسەڕەفیەت بوو. ڕێککەوتەکە وابوو کاتی تەواوبوونی دەوامی فەرمی‌و هەستانی متەسەڕیفی بوو. مەبەستیان ئەوەبوو سۆراغی عومەری لە چەند پۆلیسێکی خزمی بایزی بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ گوندی، هەواڵێکی عومەری، بۆ دایکی بەرنەوە.

بێئـــاگا لەوەی خەفییەو پۆلیســـیان بە دواوەیە، یەکســـەر پۆلیس‌و معاون دەوریان گرتن، تفەنگیان لەســـەر ســـینگی دانان‌و دەستگیریان کردن، هەر زوو دەمانچەکانیان دۆزییەوە، وەک ئەوەی بەدەستی خۆیان شاردبێتیانەوە! دەستیان کەلەپچەکردن‌و زنجیریان کردن. هـــەر لەوێ بایزیان ئازاد کرد، چونکە معاون‌و

پۆلیسەکان دەیانناسیو هاتوچۆی دوکانەکەیان کردبوو.

ئەو تۆمەتەی بۆیان داتاشـیبوون، زۆر لەڕاسـتی دەچـوو، وەک ئەوەی، کاتی دەوام تەواوبوونەو متەسـەریف هەڵدەستێت، شوێنی دەستگیرکردنەکە، هەڵگرتنـی دوو دەمانچە، ئەوانە هیچیان لە بەرژەوەندی کاکەڕەشـی نەبوون، بەڵکو یارمەتیی نێوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەی دەدا!

هەواڵی دەستگیرکردنی کاکەڕەشیو هیدۆی، وەک ئاگرو پووش بە هەموو گوندەکاندا بڵاوبۆوە، کە هەوڵی کوشتنی متەسەریفیان داوە. هەموو ئەوانەی لە ڕووی چینایەتیو فکریو کۆمەڵایەتی و تەریقەتی کاکەڕەشیان بە مەترسی دەزانی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیان، کەوتنەخۆ بۆ گرانکردنی باری دۆسییەکەی. ئـەو دەمێک بـوو کەوتبووە بـەر تەوژمی شـاڵاوێکی چوارسـەرەی: نیری سیستەمی دەرەبەگایەتی، پاشخانی ئەقڵیەتی دۆگمای خێڵەکی، تەنگبینیو پاوانخوازیی پارتە بۆرژواکان، بەستەڵەکی جەمسەرەکانی جەهالەتو خورافاتی کۆنەپەرسـتی. لەدوای ئەشـکەنجەو ئازاردانێکی زۆر، نەچوونە ژێرباری ئەو تۆمەتە داتاشراوەوە، بەڵام شاهیدە ساختەکانو دروستکردنی بەڵگەی زاڵمانە، ڕاسـتییەکانی دەبڕی، بابەتەکە وەک ئەوە وابوو کە دەڵێن: مەلا نەسـرەدین کەرت نەگاوە بەڵام لەگینە! دۆسـیەکەیان خستبوویە قاڵبی سیاسیو هەوڵدان بۆ ڕووخاندنی حکومەت.

لە دوای چەندان دانیشتنی دادگا هیدۆ ئازاد کرا، بە هۆی ئەوەی لە ڕاپۆرتە هەواڵگریەکە ناوی هیدۆی نەهاتبوو، چەکیشی پێ نەگیرابوو، کاکەڕەشیش لە وتەکانی گوتبووی تەنها خزمێتـیو هەر لەوێ بینیویەتی، جغارەخۆرێک بەر لە گیرانەکە هاتووە.

حاجی سمایلی باوکی کاکەڕەش‌و برایەکانی، لە کارو کاسبی بوون، ئەوەندەی بەدوای ئازادکردنی کاکەڕەشـــیدا ڕابکەن، هەرکەسێک لە دەوڵەت ئالیکی دوو کەری بەدەستبوو، بە تەنەکە هەنگوین‌و کاوڕو قەڵو دەستو دیاریان بەسەردا دەڕشت و لە دەرکەیان دەدا! لـێ، بێسوود بوو. ئەو خێزانەیان لە ڕووی دارایییەوە ڕووتاندەوە، هەموو ســـەروەتی خۆیان لە پێناوی ئازادکردنیدا دانا، ئەگەر هەر نەبێت ســـزاکەی لە سێدارە بۆ بەندی هەتا هەتایی بێت. هیدۆش ماڵەکەی بۆ شاری بارکرد، هەمیشە پێیەکی لە حەپسخانەی بوو بۆ لای کاکەڕەشی.

ڕۆژانی دانیشـــتنی دادگای تاوانە قورســـەکانی هەولێر، خزم‌و برادەرەکانی کاکەڕەش حەساری دادگایان پڕدەکرد لە خەڵک، بۆیە دادگای هەولێر بە بیانووی ئەوەی ســـزادانی کاکەڕەشی ڕەنگە کێشەی کۆمەڵایەتی گەورەی لێبکەوێتەوە، وایان بەباش زانی کاکەڕەشـــیان بە زنجیرکراوی لە قەفەزێکی ئاســـنین لەگەڵ دۆســـییەکەی حەواڵەی بەغـــدای پایتەخت کرد، چونکـــە دادوەرەکانی ئەوێ نەناســـراون‌و دەســـتیان کراوەیە هەر ســـزایەکی قورس بەســـەر کاکەڕەشـــیدا بســـەپێنن. دۆســـییەکەیان هێنـــدە نادادپەروەرانە بۆ داڕشـــتبوو کە بە هیچ شێوەیەک درزێکی بچووکی تێدا نەبێت بۆ ئازاد کردنی!

لە دوای دووجار دانیشـــتنی دادگای بەغدا، کاکەڕەش ســـزای بەندکردنی هەتا هەتایی تاوەکو مردنی بەسەردا سەپێندراو ڕەوانەی زیندانی سزادراوان و قاوشی سزا قورسەکان کرا. لەو قاوشە پیاوێکی سوورو سپی‌و کەڵەگەت هەمان ســـزای هەتا هەتایی وەکو کاکەڕەشی بۆ بڕابۆوە. ئەو پیاوە نووسەر بوو، لەسەر نووســـینەکانی گیرابوو کە گوایە بە نووســـینە سیاســـییەکانی هانی خەڵکی کرێکارو زەحمەتکێشـــی داوە لە دژی دەوڵەتو هەولی ڕووخانی سیســـتەمی

حکومڕانی داوە.

بەڕێکەوت کاکەڕەش شـــوێنەکەی کەوتە تەنیشـــت ئەو نووسەرە. ئەویش هەرکە چاوی بە کاکەڕەشـــی کەوت، نزیکایەتی لەگەڵدا دروستکرد. ئەو پیاوە خەڵکی کەرکوک بوو، کاتێک کاکەڕەش باســـی ژیانی خـــۆیو گوندییەکانی بۆ دەکرد هەموو ئەندامەکانی جەســـتەی دەبوون بە گوێ، وەک نووســـەرێک دەیگـــوت ئەوە مێـــژووی گەلێکە، ئاوێنەی یەک لـــە قۆناغەکانی ململانێی چینایەتییـــە، داواکارم بە وردی بۆم بگێڕییـــەوە بۆئەوەی ئەگەر تەمەن مەودا بدات، وەک ئەرکێکی سەرشـــانم بیبیاننووسمەوەو بەئومێدی ئەوەی سوودێک بە نەوەکانی دوای خۆمان بگەیەنیـــن. بۆیە منیش بە نۆرەو ئەرکی خۆم وەک نووسەرێک، دەمەوێ ئەو ســـاتەوەختانەی ژیانی ئێوەی گوندی بکەم بە وشەو بیاننووســـمەوە. بۆ ئەو مەبەستە هەرچەندجارێ کاکەڕەش بەسەرهاتی خۆی و گوندیەکانی دەگێڕایەوە، نووسەر قەڵەم و کاغەزی لەپێش خۆی دادەناو دێڕ بە دێڕ دەینووسیەوە.

کاکـــەڕەش لـــە گێڕانەوەی دایکیڕا دەســـتی پێکرد کە چۆن لە شـــەوێکی ئەنگوستەچاوی نمەنمەی بارانباردا، لە بنەبانی خانوویەکی بنمیچ دوکەڵاویی گڵین، بەدیار چرا ڕەشـــکەیەکەوە چاوی بە تاریکایـــی هەڵێناوە، تا دەگاتە ئەو چرکەساتەی لە قاوشـــی سزاقورســـەکانی بەندیخانەی بەغدا، یادەوەریەکانی دەگێڕێتەوە.



Novel

# KAKARASH

Pashay shaw

نووسینەوەی مەملەکەتی گەنم و هەتاو...

پێدەشتێک، هەتا چاو بڕدەکات، پڕاوپڕ
لە سەربوردە و بەسەرهاتی فەرامۆش
کراو، هەرچەندی لێی ورد
دەبیەوە،هەموو دۆڵەکانی ناوبەندانی
زورگەزراوی، وەک پاوانێکی
دەستنەخوردە، بوونەتە تاقچکەی
حیکایەتە نەنووسراوەکان...

نرخ ١٣٠٠٠

AWER

HAZIMI ALI KUTIK